# مسوڵمانی کامڵ

## بەشی دووەم

## خواپەرستیی مسوڵمان



بەرگی دووەم

عەلی باپیر


چاپی یەکەم

٢٠٠١ز ١٤٢٢ك

# مسوڵمانی کامل

## بەشی دووەم

# خواپەرستیی مسوڵمان

بەرگی دووەم

## عەلی باپیر

ameer.maktab@yahoo.com

/AliBapir /AliBapir /MediaAmeerOffice

www.alibapir.net

چاپی یەکەم

١٤٢٢ك ٢٠٠١ز

14/7/2001

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

# وماخلقتُ الجِنَ والإنسَ إلاّ لِيَعْبُدون

## لەجیاتی پێشەکی

خوێنەری بەڕێز! لەبەرگی یەکەمی ئەم بەشی دووەمەی مسوڵمانی کامڵ دا (خواپەرستی مسوڵمان) جگە لەبابەتی یەکەم و دووەم و سێیەم، کەدەربارەی (خواپەرستی بەگشتیی)و (پاك و خاوێنیی) و (بنچینە گرنگەکانی هەڵس وکەوتی شەرعیی یانەو ژێرانە لەگەڵ وردە بابەتە خیلافیی یەکان)دا بوون، لەبابەتی چوارەمیشدا کە دەربارەی پێنج دروشمەکانی خواپەرستیی یە، یەکەمین و گەورەترین دروشمی خواپەرستیی کە: (نوێژ بەرپاکردن)ە، خرانەڕوو، جا خوا پشتیوان بێ لەم بەرگەش دا چوار دروشمەکانی تر کە (ماڵ بەخشین و ڕۆژووگرتن و حەج و عومرەو زیکری خوا)ن دەخەینەڕوو.

بەوجۆرەش لەدوو توێی هەردوو بەرگەکەدا هەم خواپەرستیی بەگشتی و هەم خواپەرستی یە تایبەتی یەکانیش کە پێنج دروشمەکانن بەتوێژینەوەی وردو قووڵەوە روون کراونەتەوە.

## پێشکەش بێ

بە بەندە ڕاستو ڕەسەنەکانی خوای تاکو بێ وێنەو هاوەڵو پاک کە بە مانای ڕاستەقینەو فراوانی پەرستن، خوا دەپەرستنو، لە پەرستنیدا گیرۆدەی شیرکو لەشێوەی پەرستنیدا دووچاری بیدعەت نابن، واتە تەنها ئەو دەپەرستنو تەنیا بەوشێوەیەش کەخۆی دیاری کردووە دەی پەرستن.

# ڕێ خـــۆشـــکردن

خوێنـەری بـەڕێزو خۆشەویسـتم ! مـاڵو سـامان بەخشـین لـەڕێی خـوادا یـەکی دیکەیە لە درووشمو نیشانە گرنگو بنەڕەتییەکانی خواپەرستییو بەندایەتی بۆ خوا کردن.

وە جـێی سـەرنجە کـە خـوای کاربـەجێ مـاڵو سـامان بەخشـینی بـە خەسـڵەتێکی بنچینەییو گەورەی ئینسانی مسوڵمانو کۆمەڵی مسوڵمان داناوەو لـەقورئانی مەککیدا پێش مەدەنی لە چەندان ئایـەتدا خەسـڵەتی مـاڵ بەخشـین لـەڕێزی خەسـڵەتە گـەورەو بنەڕەتییەکانی دیکەی تاکو کۆمەڵی مسوڵماندا خراوەتەڕوو! بۆ وێنە:

*(فَمَا أُوتِيتُمْ مِنْ شَيْءٍ فَمَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَمَا عِنْدَ اللَّهِ خَـيْرٌ وَأَبْقَى لِلَّذِيـنَ آمَنُـوا وَعَلَـى رَبِّـهِمْ يَتَوَكَّلُونَ(٣٦)وَالَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَائِرَ الْإِثْمِ وَالْفَوَاحِشَ وَإِذَا مَا غَضِبُوا هُمْ يَغْفِرُونَ(٣٧)وَالَّذِينَ اسْـتَجَابُوا لِرَبِّهِمْ وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنْفِقُونَ(٣٨)وَالَّذِينَ إِذَا أَصَابَهُمُ الْبَغْـيُ هُـمْ يَنْتَصِرُونَ) الشورى

وەك دەبینین خەسڵەتی ماڵ بەخشین لەڕیزی: ئیمان، پشت بەخوا بەستن، خۆپاراستن لە گوناحە زلو ناقۆڵایەکان، لێبوردن لەکاتی تووڕەییدا، بەدەم بانگی خواوەچوون، نوێژ بەرپاکردن، ڕاوێـژ بەیـەکتر کـردن لـەکاروباردا، وە تۆڵـە سـتاندنەوە لـەکاتی دەسـتدرێژی کرانـە سـەردا، بـاس کـراوە! کـە بێگومـان هـەر هـەموویان خەسڵەتو پێکهێنـەری گرنـگو بنەڕەتی هەم کەسایەتی تاکی مسوڵمانو هەم کۆمەڵگای مسوڵمانیشن.

*(أَفَمَنْ يَعْلَمُ أَنَّمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ مِنْ رَبِّكَ الْحَقُّ كَمَنْ هُوَ أَعْمَى إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُوْلُوا الأَلْبَابِ ،الَّذِينَ يُوفُونَ بِعَهْدِ اللَّهِ وَلا يَنقُضُونَ الْمِيثَاقَ، وَالَّذِينَ يَصِلُونَ مَا أَمَرَ اللَّهُ بِهِ أَنْ يُوصَلَ وَيَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ وَيَخَافُونَ سُوءَ الْحِسَابِ، وَالَّذِينَ صَبَرُوا ابْتِغَاءَ وَجْهِ رَبِّهِمْ وَأَقَامُوا الصَّلاةَ وَأَنفَقُوا مِمَّا رَزَقْنَاهُمْ سِرًّا وَعَلانِيَةً وَيَدْرَءُونَ بِالْحَسَنَةِ السَّيِّئَةَ أُوْلَئِكَ لَهُمْ عُقْبَى الدَّارِ) الرعد:١٩-٢٢.

لێرەشـدا بەهـەمان شێوە مـاڵ بەخشـین لـەڕێی خـوادا بەپەنـهانیو ئاشـکرا خراوەتـە ڕیـزی: زانیـاری هـەبوون بەڕاسـتیو هـەقێتی قورئـان، وەفـاداری بەپـەیمانی خـواو نەشکاندنی ئـەو بـەڵێنو پەیمانـە، گـەیاندنی پەیوەندییـە کۆمەڵایەتییـەکان بەتایبـەت خزمایەتی، سامو هەیبەت هەبوون بەرانبەر بەخوا، ترسان لە لێپرسینەوەی ڕۆژی دوایی، ئارام گرتنو خۆڕاگری لەبەر خاتری خوا، نوێژ بەرپاکردن، بەچاکە پاڵپێوەنانی خراپە! کە بێگومان ئەمانیش سەرجەمیان بۆ پەروەردە بوونێکـی ڕاسـتو دروسـتی ئینسـانی مسوڵمانو هاتنەدی کۆمەڵگایەکی ئیسلامی هاوسەنگو تێرو تەواو پێویستن.

وە ماڵ بەخشین لەقورئاندا مەگەر چۆن دەنا هەمیشە کراوە بەپێشەکی گیان بەخشین، وتەعبیری: (وجاهَدوا بأمـوالهمْ وأنْفُسِهِمْ في سبيل الله) دووجار، لە: (الانفال:٧٢)و(الحجرات:١٥)، وە تەعبیری: (وجاهَدوا في سبيل الله بأموالِهِمْ وأنفسهم) جارێك لە: (التوبة:٢٠)، وتەعبیری: (جاهَدوا بأموالِهِمْ وأنْفُسِهِمْ) لە: (التوبة:٨٨)، وە تەعبیری: (تجاهدون في سبيل الله بـأموالكم وأنفسـكم) لە: (الصف:١١)، وە تەعبیری: (أنْ يُجاهدوا بأملوالِهِمْ وأنْفُسِهِمْ) (التوبة:٤٤)، وە تەعبیری: (أن يجـاهدوا بأموالِهِمْ وأنفسهم في سبيل الله) لـە: (التوبة:٨١)، وە تـەعبیری: (وجـاهدوا بـأموالكم وأنفسـكم في سَبيل الله) لە: (التوبة:٤١)، هـەر کـام یـەکی جارێك لـەقورئانیدا هـاتوون!! چونکـە لەڕاستیدا جەنگو جیهاد لـەپێناوی خـوادا بەرلـەوەی پێویسـتی بـەڕووح بـێ پـەکی لەسـەر مـاڵو سامان کـەوتوە، وە ئـەو کەسـەش کـەدڵی لەبەر ماڵو سـامانەکەی نەبێتـەوە کـە لـەڕێی خـوادا بیبەخشـێ ڕێی تێناچێ بتوانێ گیانەکەی فیدا بکـات پێشـینانیش گوتوویانـە: بەردی زل نیشانەی پێدا نەدانە!

بەڵێ ماڵو سامان بەخشـین لـەپێناوی خـوادا جـۆرە خواپەرستییەکی زۆر گـەورەو گرنگە چونکە چەرخو دۆلابی ئەم ژیانە دنیاییە چ لەحاڵەتی جەنگو چ ئاشتیدا لەڕووە ماددییەکەیەوە داینـەمۆو جووڵێنەرەکەی ماڵو سامانە ئـەوەتا خـوای زانـاو کاربـەجێ تبارك و تعالی لەو بارەوە فەرموویەتی: (وَلَا تُؤْتُوا السُّفَهَاءَ أَمْوَالَكُمُ الَّتِي جَعَـلَ اللَّـهُ لَكُـمْ قِيَامًـا وَارْزُقُوهُمْ فِيهَا وَاكْسُوهُمْ وَقُولُوا لَهُمْ قَوْلاً مَعْرُوفًا) (النساء:٥)، واتـە: وە ئـەو مـاڵو سامانانەتان کە خـوا گێڕاونی بەمایەی ڕاوەستانو بەڕێوەچوون – ی ژیـانو گـوزەران – تـان مەدەنـە دەست نەفامەکانتان، بەڵکو بژێوو پۆشاکیانی تێیاندا دابین بکەن، وە –لەوبارەوە– قسەی خۆشو چاکیان لەگەڵ بکەن.

وەك دەبینین خوای پەروەردگار ماڵو سامانی بە ڕاگرو بەڕێوەبەرو چاککەری ژیانو گوزەرانی کۆمەڵگا ناوبردووە، وە لە مسوڵمانانیشی قەدەغە کردوە کە بیدەنە دەست ئەو جۆرە کەسانە کە لەبەر نەفامیو نەزانیو کاڵوکرچی نازانن و ناتوانن کە وەك پێویستو لەشوێنو مـەقامی خـۆیدا ئەو ماڵو داراییـە بەکاربێنن، وەجـێی سـەرنج ئەوەیـە کـە خـوای پـەروەردگار مـاڵو سـامانی بـەموڵکی کۆمـەڵگای ئیسـلامی دانـاوەو هـەموو ئەندامەکانی کۆمەڵگاش لەبەردەم پاراستنیو بەزایە نەچوونیدا بە بەرپرسیار لەقەڵەم داوە![1]

جا ئێمە خوا پشتیوان بێ بەم شێوەیەی خوارێ ئەو درووشمە گرنگەی خواپەرستیو سێیەمین پایەو کۆڵەکەی ئیسلامەتییە دەتوێژینەوە:

---

[1] بڕوانە: (الجامع لأحكام القرآن) القرطبي ج٣ص١٣٣٥، ١٣٣٦، وە: (تفسير القاسمي) ج٣ص٣٨.

**بەندی یەکەم**: ماڵ بەخشین بەگشتی

**که لەم خاڵانەی خوارێ پێك دێ:**

**١-ماڵ بەخشین لەڕێی خوادا یانی چیو چ پلەو پایەیەکی لەئیسلامدا هەیە؟!**

**٢-ماڵ بەخشینی فەڕز.**

**٣-زەکات دان.**

**٤-زەکاتی سەرفترە (زكاة الفطر)**

**٥-ماڵ بەخشینی سوننەت (خێرکردن - التصدّق)**

**٦-چۆنیەتی ماڵ بەخشین: چەند ئەدەبو ڕەوشتێکی بەرزو جوان.**

**٧-سەرەنجامی ماڵ بەخشینی ڕیاکارانە.**

**بەندی دووەم**: چەند تێبینی‌یەکی گرنگ دەربارەی زەکات.

**کە ئەم بەندەش سەرجەم لەچوار خاڵان پێك دێ:**

**١-زەکات دانو وەرگرتنیو دابەش کردنی.**

**شایانی باسە ئەم خاڵە چواردە (١٤) تێبینی گرنگی وەخۆ گرتوون.**

**٢-زەکاتو کۆسپو گیروگرفتەکان.**

**ئەمیش هەشت (٨) تێبینی تێدان.**

**٣-زەکاتی ئاژەڵو بەرووبوومی کشتوکاڵو میوەجات.**

**ئەمیش لە دە (١٠) تێبینی‌یان پێك هاتوە.**

**٤-چەند جۆرە زەکاتێك.**

**که ئەمیش حەڤدە (١٧) تێبینی گرنگی گرتوونەخۆ دەربارەی حەڤدە جۆرە زەکات دان.**

**بەندی سێیەم**: بەراوردێك لەنێوان زەکاتو باج (ضريبة)دا.

**کە ئەمیش لەم هەشت خاڵە پێك هاتوە:**

**١-ماهیەتی زەکاتو باجو خاڵە هاوبەشو جیاوازەکانیان.**

**٢-بنەمای مەبدەئی‌ی زەکاتو باج.**

**٣-زەکاتو باج لەچی‌دەدرێن؟!**

**٤-پرانسیپەکانی دادگەری لەنێوان زەکاتو باج دا.**

٥-ڕێژەیی و هەڵکشێن (النسبية والتصاعدية) لەنێوان زەکاتو باج دا.

٦-دەستەبەرکەرەکان (ضمانات)ی زەکاتو باج.

٧-ڕەوابوونی باج وێڕای زەکات دان.

٨-ئایا باج وەبری زەکات دەکەوێ؟!

## بەندی چوارەم: بەرهەم و شوێنەوارەکانی ماڵ بەخشین لەڕێی خوادا

کە لەچەند خاڵێك دا بەرهەمو شوێنەواری چاكو پەسەندی ماڵ بەخشین لەڕێی خوادا لەژیانی تاكو کۆمەڵ دا تێدا خراوەتەڕوو.

لەخوای پەروەردگارو بەخشەریش داواکارم کە بەرەکەتو پیرۆزیی وا بخاتە ئەم توێژینەیەوە بۆ خوێنەران مایەی شارەزایی و بەرچاو ڕوونی چاکترو زیاتر بێتو لەبارەی یەکێك لەپایە گرنگەکانی ئیسلامو درووشمە بنەڕەتی‌یەکانی خواپەرستییو، بۆ بەندەش مایەی پاداشتی دوا ڕۆژو قورس کردنی تا تەرازووی کردەوە چاکەکانم بێت.

# بەندی یەکەم

## ماڵ بەخشین بەگشتی

١-پێناسەو پلەو پایەی ماڵ بەخشین لەڕێی خوادا.

٢-ماڵ بەخشینی فەرز.

٣-زەکات

٤-زەکاتی سەرفترە (زكاة الفطر)

٥-ماڵ بەخشینی سوننەت

٦-چۆنیەتی ماڵ بەخشین: چەند ئەدەب و ڕەوشتێکی بەرزو جوان.

٧-سەرەنجامی ماڵ بەخشینی ڕیاکارانە.

# ١- پێناسەو پلەو پایەی ماڵ بەخشین

"راغب الأصفهاني" گوتوویەتی[٢]: (نَفَقَ الشيءُ مَضى ونَفِدَ.. والأنفاق قد يكون في المال وفي غيره وقد يكون واجباً وتطوعاً..... والنَّفَقةُ إسمُ لِما يُنفَق) واتە: (نَفَقَ الشيء)یانی ئەو شتە ڕۆیو بڕا.. وە (إنفاق) لەماڵو سامانو غەیری دیش دا دەبێ، وەفەرزو سوننەتیشی هەیە،... وە (نفقة) ناوە بۆئەوەی کە سەرف دەکرێ.

کەواتە: وشەی (نفق)یان (انفق) کە بەهەموو صیغەکانیيەوە (٧٣)جار لەقورئانێدا هاتوە، لە بنەڕەتی زمان دا یانی نەمانو بڕانو تەواوبوونی شتێك، بەڵام شەرع بۆ سەرف کردنو بەخشینی ماڵو سامانی بەکارهێناوە کە لەڕێی خوادا دەبەخشرێو دەدرێ بەو کەسو شوێنانەی کە شەرع دیاری کردوون.

جا هەرچەندە لەئەسڵدا وشەی ماڵ سەرف کردن (إنفاق المال) هەرجۆرە ماڵو سامان خەرج کردنێك دەگرێتەوە چ بۆ خوا بێت چ بۆ غەیری خوا، وە چ لەڕێیەکی شەرعیو ڕاستەوە بێت، چ نا، بەڵام لە بەکارهێنانی قورئانو سوننەت دا مەگەر بە نیشانەیەك جیاکرابێتەوە ئەگەرنا مەبەست پێی ماڵ بەخشینە لەڕێی خواداو بەگوێرەی شەرعی خوا.

ئنجا هەرچەندە زەکات کە یەکێکە لەپێنج پایەو بنچینە گەورەو گرنگەکانی ئیسلام مەزنترینو کاریگەرترینو بەپیت وپیێزترین و بەرهەمدارترین جۆری ماڵ بەخشینە، بەڵام وەك دواتر ڕوونی دەکەینەوە ماڵ لەڕێی خوادا بەخشین زۆر لە مەسەلەی زەکات دان فراوانترەو قووڵترو ڕیشەدارتریشە.

جا ئێستا کە تا ڕادەیەك زانیمان ماڵ بەخشین لەڕێی خوادا یانی چی! با لەبەر تیشکی چەند دەقێکی قورئانی بەپیێزو سوننەتی پێغەمبەری بەڕێزدا ﷺ هەوڵی دەرخستنی پلەو پایەی بدەین، هەرچەندە لە (ڕێخۆشکردن)یش دا چەند دەقێکمان بەنموونە هێنانەوە بەڵام لێرەشدا چەند دەقێك بەنموونە دێنینەوە بەهەردووك باری ئیجابیو سەلبیدا بۆ ئەوەی هەم گرنگیو گەورەیی ماڵ بەخشینو هەم تاوانو زیانی ڕژدیو چرووکیو دەستگرتنەوەو نەبەخشینمان بۆ ئاشکرا بن، جا ئەوکاتە پلەو پایەی ماڵ بەخشینو (مَحَلُّ الأعراب)ی لە ئیسلامدا زۆر بەڕوونی دەزانرێ:

---

[٢] بڕوانە: (معجم مفردات الفاظ القرآن) ص٨١٩، لفظ (نفق)

أ-(إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي جَنَّاتٍ وَعُيُونٍ(١٥)آخِذِينَ مَا آتَاهُمْ رَبُّهُمْ إِنَّهُمْ كَانُوا قَبْلَ ذَلِكَ مُحْسِنِينَ(١٦)كَانُوا قَلِيلًا مِنَ اللَّيْلِ مَا يَهْجَعُونَ(١٧)وَبِالْأَسْحَارِ هُمْ يَسْتَغْفِرُونَ(١٨)وَفِي أَمْوَالِهِمْ حَقٌّ لِلسَّائِلِ وَالْمَحْرُومِ (١٩)) (الذاريات)

واتە: بێگومان پارێزكاران لەنێو باغاتو سەرچاوان دان. ئەوەی پەروەردگاریان پێی بەخشیون وەری‌دەگرن لە سۆنگەی ئەوەوە كە ئەوانە لەمەوبەر چاكەكار بوون. عادەتیان وابوو كەمێك نەبێ لەشەوگار نەدەنووستن - و هەر سەرگەرمی طاعەت بوون -. وە ئەوانە بەر لەبەرە بەیانیان داوای لێبوردنیان - لەخوا - دەكرد. وە لەماڵو سامانیان دا هەقی سواڵكەرو نەداریان دابین دەكرد.

ب-(لا حَسَدَ الا في إثْنَتَين: رَجُلٌ آتاهُ الله مالاً فَسَلَّطهُ على هَلَكَتِهِ في الحَقّ، ورجلٌ آتاه الله حِكْمةً فهو يَقضي بها ويُعَلِّمُها) متفق عليه عن ابن مسعود رضي الله عنه.

واتە: تەنیا لەدوو شتان دا شایستەیە كە مسوڵمان خۆزگە[3] بەخاوەنیان بخوازێ پیاوێك كە خوا ماڵو سامانێكی -حەڵاڵی - پێبەخشیوەو واشی لێكردوە كە لەڕێی هەقو شەرعی‌دا خەرجی بكات، وە پیاوێك كە خوا زانیاری‌و لێزانی پێداوە ئەویش خۆیشی ڕەفتاری پێ‌دەكاتو فێری خەڵكیشی دەكات.

ج-(يا ابن آدم! إنْ تَبْذُلِ الفَضْلَ خَيرٌ لك، وإن تُمْسِكْهُ شَرٌّ لَكَ، ولا تُلامُ عَلىٰ كفافٍ، وابدأ بِمَنْ تَعُولُ، واليَد العُليا خيرٌ من اليَدِ السُّفلى) رواه مسلم عن ابي أمامة صُدي بن عجلان رضي الله عنه.

واتە: ئەی ئادەمیزاد! ئەگەر ئەوەی لێت زیادە بیبەخشی قازانجتە، وە ئەگەر دەستی لێ‌بگریەوە زەرەرتە، وە لەسەر ئەوەندەی كە ژیانو گوزەرانت پێویستیەتی جێی گلەیی‌نی، وە - ئەگەر ماڵت بەخشی - لەو كەسانەوە دەست پی‌بكە كە دابین كردنی بژێویانت بە ئەستۆوەیە، وە دەستی بڵند لەدەستی نزم چاكترە. (واتە دەستی بەخشەر لەهی وەرگر چاكترە).

د-(ثلاثةَ أُقسمُ عليهنَّ وأُحَدِّثُكُمْ حديثاً فاحفظوه: ما نَقَصَ مال عَبْدٍ من صَدَقَةٍ، ولاظُلِمَ عبدُ مَظْلمةً صَبَرَ عليها إلاّ زادَهُ الله عِزاً، ولافَتَحَ عَبْدُ بابَ مَسْألَةٍ الاّ فتح الله عليه باب فَقْرٍ -أو كلمة نحوها- وأُحدثكم حديثاً فاحفظوه قال: إنما الدنيا لأربعة نَفَر: عَبْدٌ رزقه الله مالاً وعلماً فهو

---

[3] بۆیە (حسد)م وا لێك دایەوە چونكە زانایان فەرموویانە مەبەست لە (حسد) لێرەدا (غبطة)یە (غبطة)ش ئەوەیە كەتۆش خۆزگە بخوازی بۆ چاكەو نیعمەتێك كە لەمسوڵمانێك دا دەیبینی، دیارە (حسد)ش یەكێكە لەگوناهە زلەكانو بریتیە لەناڕەحەت بوون بەچاكەو نیعمەتی خەڵكیو خۆزگە خواستن بەنەمانی.

يتقي فيه رَبَّهُ ويَصِلُ فيه رَحِمَهُ ويعلم لله فيه حقاً، فهذا بأفضل المنازل، وعَبدُ رزقهُ الله علماً ولَمْ يرْزقهُ مالاً فهوَ صادق النيةِ يقول: لَو أنّ لي مالاً لَعَملتُ بعملِ فلان فهو بنيتـه فأجرهُما سواء وعبد رزقه الله مالاً ولم يرزقه علماً فهو يخبط في ماله بغير علمٍ ولايتقي فيه ربَّـهُ ولايَصِلُ فيه رَحمهُ ولايَعْلَمُ لله فيه حقاً، فهذا بأخبَثِ المنازلِ، وعَبْدٌ لم يَرْزقْهُ الله مالاً ولاعلماً، فهو يقول: لَـوْ أنَّ لي مالاً لَعَمِلْتُ فيه بعمل فُلانٍ فهو بنيَّتِهِ فوِزْرُهُما سواءٌ) رواه الترمذي عن ابي كبشة عمر بن سعد الأنماري رضي الله عنه.

واته: سێ شت سوێندیان لەسەر دەخۆم وە قسەیەکتان بۆ دەکەم چاکی وەربگرن:ماڵی هیچ بەندەیەك بەهۆی بەخشینەوە کەم ناکات، وەهیچ بەندەیەك ستەمێکی لێناکرێو لە بەرانبەریدا خۆڕاگر نابێ، مەگەر خوا عیززەتی بۆ زیاد بکات، وەهەر بەندەیەك دەرگای داواکردن - ی ماڵ- لەخۆی بکاتەوە حەتمەن خوا دەرگایەکی هەژاری لێدەکاتەوە - یان وشەیەکی لەو بابەتە -، وە قسەیەکتان بۆ دەکەم باش وەریبگرن! - فەرمووی:- ژیانی دنیا تەنیا چوار جۆرە کەسی تێدان: بەندەیەك کە خوا هەم سامانو هەم زانیاریشی پێ بەخشیوە، جا لە ماڵەکەی پارێزکاری لە پەروەردگاری دەکات وە پەیوەندی خزمایەتی پێ جێبەجێ دەکات، وە مافی خوای تێدا دەبینێ، ئەم کەسە چاکترین پلەو پایەی هەیە، وە بەندەیەك کە خوا زانیاری پێداوە بەڵام ماڵی نەداوەتێ، جا ئەو کەسە نیەتەکەی - لەگەڵ خوادا - ڕاستەو دەڵێ: ئەگەر سامانم ببوایە وەك فلانە کەسم دەکرد، جا ئەمیش بەپێی نیازو مەبەستی خۆیەتیو پاداشتیان یەکسانە، وە بەندەیەك* خوا ماڵی داوەتێ بەڵام زانیاری پێنەداوە بۆیە - بەهۆی نەزانییەوە - شەلم کوێرم بەماڵەکەی دەکات بەبێ زانیاری، وە پارێزکاری تێیدا لەپەروەردگاری ناکاتو، پەیوەندی خزمایەتی پێ پتەو ناکاتو، مافی خوای تێدا ڕەچاو ناکات، جا ئەم کەسە خراپترین پلەو حاڵەتی هەیە، وە بەندەیەك کە خوا نە ماڵ نە زانیاری نەداوەتێو دەڵێ: ئەگەر هاتباو ماڵم هەبووایە وەك فلانە کەسم پێدەکرد! دەجا ئەمیش بەگوێرەی نیاز - ی گلاوی - یەتیو گوناحیان وەك یەك وایە.

دیارە پێشینانیشمان کە گوتوویانە: (ماڵی دنیا هەم دین بەرە هەم دین هێنەرە) ڕاستیان گوتوە.

٥-(پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك (معاذ بن جبل)ی ڕەوانەی یەمەن کرد پێی فەرموو: (إنَّكَ تأتي قوماً من أهل الكتاب فَلْيَكُنْ أوَّلَ ما تدوعوهم اليه: شهادة أن لا اله الا الله، وأن محمداً

رسول الله، فان هم أطاعوك لذلك، فَأَعْلِمْهُمْ أنَّ الله آفترض عليـهم خمـس صلـوات في اليـوم والليلة، فان هم أطاعوك لذلك فاعْلِمْهُمْ أن الله قَدْ افترض عليهم صدقةً تؤخَـذُ مـن أغنيـاءهم فَتُرَدُّ في فقراءهِمْ) متفق عليه.

واته: بێگومان تۆ دەچیە لای کۆمەڵێك لەخاوەن کتێبەکان (مەبەست جوو و دیانەکانن) جا با یەکەمین شت کە ئەوانی بۆ بانگەواز دەکەی شایەتمان هێنان بێ بەوە کە جگـە لـەخوا هیـچ پەرسـتراوێك نیـەو موحەممـەدیش پێغەمبـەری خوایـە، جـا ئەگـەر بۆئـەوە فەرمانبەرییان کردی ئەوە ئاگاداریان بکە کەخوا لەشەوو ڕۆژێك دا پێنج نوێـژی لەسـەر پێویست کـردوون، ئنجا ئەگەر ئەوەشیان بەقسە کـردی ئـەوە ئاگاداریـان بکـە کـە خـوا صەدەقەیەکی لەسەر فەرز کردوون کە لە دەوڵەمەندەکانیان وەردەگیرێ‌و دەگێڕرێتەوە بۆ هەژارەکانیان.

دیارە لـەم فەرموودە بەپێزەشەوە دەزانین کە ئیسلامەتی بـەر لەهـەموو شتێك ئیمـان‌و عەقیدەیە کە لەشایەتمان دا خۆی دەنوێنێ، ئینجا دوای ئیمان‌و عەقیدە خواپەرستی‌یەکە لـەنوێژە فـەرزەکان دا خـۆی دەنوێنـێ‌و، دوای خواپەرسـتییش یەکسـەر مـاڵ‌و سـامان بەخشینە!

و-وە پێم وایە ئەوەندە بەسە بۆ زانینی پلەو پایەی بەرزی ماڵ‌و سامان بەخشین لـە ئیسلام دا کە خـوای پـەروەردگار زەکات دانـی - کـە گرنگـترین جـۆری مـاڵ بەخشـینە - بەیەکێك لەچوار ئەرکە گەورەو گرنگەکانی کۆمەڵی بڕوادار لەقەڵەم داوە کە لەکاتێك دا لە زەوی‌دا سەقامگیر دەبن‌و ئایینی خوا بەرپا دەکەن ئەنجامیان دەدەن: (الَّذِينَ إِنْ مَكَّنَّاهُمْ فِـي الْأَرْضِ أَقَامُوا الصَّلَاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ وَأَمَرُوا بِالْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا عَنِ الْمُنْكَرِ وَلِلَّهِ عَاقِبَـةُ الْـأُمُورِ) (الحج:٤١) واتـە: ئـەو کەسانـەی کـە ئەگـەر دەسـتەڵاتدارمان کـردن لـەزەوی‌دا نوێـژێ بـەرپا دەکـەن‌و زەکاتـێ دەدەن، وەفـەرمان بەچاکـە دەکـەن‌و ڕێگـری لەخراپـە دەکـەن. وە سـەرەنجامی کاروبارەکانیش هەر بەدەست خوایە.

ئنجا با چەند دەقێکیش لە بارەی سزاو تۆڵەی چرووکی‌و ڕژدی دەستگرتنەوە لە خێرو چاکەو ماڵ بەخشین بێنینەوە:

ز-(يَوْمَ يُحْمَى عَلَيْهَا فِي نَارِ جَهَنَّمَ فَتُكْوَى بِهَا جِبَاهُهُمْ وَجُنُوبُهُمْ وَظُهُورُهُمْ هَذَا مَا كَنَزْتُمْ لِأَنفُسِـكُمْ فَذُوقُوا مَا كُنتُمْ تَكْـنِزُونَ) (التوبة:٣٥)، واتـە: وە ئەوانـەی زێـڕو زیـو پـەزمندە دەکەن‌و لـەڕێی خوادا نایبەخشن ئەوە موژدەی ئازارێکی بە ئێشیان بدەیە! ڕۆژێك کە لەئاگری دۆزەخدا

گەرم دەکرێ – وەك ئوتوو – ئنجا تەوێڵو لاتەنیشتو پشتیانی پێداغ دەکرێ – و پێیان دەگوترێ:– ئەمە ئەوەبوو کە بۆ خۆتانتان خڕ دەکردەوە، دەجا بیچێژن – سزای – ئەوەی کە پەزمەندەتان دەکرد.

ح-(فَأَمَّا مَنْ أَعْطَى وَاتَّقَى، وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَى، فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَى، وَأَمَّا مَنْ بَخِلَ وَاسْتَغْنَى، وَكَذَّبَ بِالْحُسْنَى، فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْعُسْرَى، وَمَا يُغْنِي عَنْهُ مَالُهُ إِذَا تَرَدَّى) (الليل:٥-١١)،

واتە:ئنجا ئەو کەسەی کە ببەخشێو پارێز بکا. وە بەعەقیدەی هەرە باش – کە خوا بە یەککرتنە – بڕوا بهێنێ. ئەوە بۆ گرتنەبەری ڕێبازی ئاسان – کە شەریعەتی خوایە – وەری دەچەرخێنین. بەلام ئەو کەسەی ڕژدی بکاتو خۆی بەبێ نیاز بزانێ. وە بڕوا بەچاکترین وشە – کە وشەی خوا بەیەککرتن (توحید)ە – نەهێنێ. ئەوە بەرەو گرتنەبەری ڕێچکەی قورسو زەحمەت – کە غەیری ئیسلامە – وەری دەسووڕێنین. وەکاتێك دەکەوێتە چاڵی دۆزەخ – یان مەرگ – ەوە سامانەکەی دەفریای نایەت.

وەك دەبینین خوای کاربەجێو دادگەر وەك چۆن ئیمانو تەقواو بەخشینی کردوە بەپێناسەی ئینسانی بڕوادارو مسوڵمان، بەپێچەوانەشەوە بەدرۆ زانینو خۆ بەئاتاجی خوا نەزانینو نەبەخشینیشی کردوە بەپێناسەی بابای کافرو بێدین.

ی-(انَّ الله فَرَضَ على أَغْنياءِ المسلمين في أموالِهِم بِقَدَرِ الّذي يَسَعُ فُقراءَهُم، ولَـنْ يُجْهَدَ الفقراء اذا جاعوا أو عَرَوْا إلاّ بما يَصْنَعُ أغنياؤهم، ألا وان الله يحاسِبُهُمْ حساباً شَديداً ويُعذِّبُهُمْ عذاباً أليماً) رواه الطبراني في الأوسط والصغير.

واتە: بێگومان خوا بە ئەندازەی ئەوە کەبەشی هەژارانی مسوڵمان بکات لەماڵو سامانی دەوڵەمەندانی مسوڵمان دا پێویستی کردوە، وەهیچ کاتێك هەژاران کەنەفت نابن کاتێك برسی دەبنو ڕووتو ڕەجاڵ دەبن مەگەر بەهۆی ڕەفتاری دەوڵەمەندەکانیانەوە، جا بزانن کە بێگومان خوا بەتوندی لێیان دەپرسێتەوەو بەئازارێکی بەئێشو ژانیش سزایان دەدات. پێم وایە ئەم دەقانەش وەك چەند نموونەیەك بەسن بۆ ڕوون کردنەوەو پێشاندانی پلەو پایەی ماڵ بەخشین لەئاینو بەرنامەی خوادا.

# ٢-ماڵ بەخشینی فەرز

ئاشكرایە كە زەكات دان گەورەترین و گرنگترین جۆری ماڵو سامان بەخشینە لەڕێی خـوادا، هـەر بۆیـەش بەیـەكێك لـەپێنج پایـە بنەڕەتـە مەزنـەكانی ئیسـلام دانـراوە، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (بُنِيَ الأسلام على خَمْسٍ: شهادة أن لا اله الا الله وأن محمداً رسول الله، وإقام الصَّلاة وإيتاءِ الزكاة، وحَجِّ البَيْتِ وصَوْمِ رَمَضانَ) متفق عليه.

واتە: ئیسلام لەسەر پێنج - پایە - ان ڕۆنراوەو بنیات نراوە: شایەتمان هێنان بەوە كە بێجگە لەخوا هیچ پەرستراو نـین وە كـە موحەممـەد ﷺ ڕەوانـەكراوی خوایـە، وە نوێـژ بەرپاكردن، وە زەكات دان، وە حەجی ماڵی خوا، وە گرتنی ڕۆژووی ڕەمەزان.

بەڵام بەسەرنج دانی دەقەكانی قورئانو سوننەت بۆمان دەردەكەوێ كە ماڵ بەخشینی فەرز تەنیا زەكات نیەو لەودا كورت هەڵنەهاتوە.

بۆ وێنـە: خـوای پـەروەردگار فەرموویـەتی: (لَيْسَ الْبِرَّ أَنْ تُوَلُّوا وُجُوهَكُمْ قِبَلَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ وَلَكِنَّ الْبِرَّ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَالْمَلَائِكَةِ وَالْكِتَابِ وَالنَّبِيِّينَ وَآتَى الْمَالَ عَلَى حُبِّهِ ذَوِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ وَالسَّائِلِينَ وَفِي الرِّقَابِ وَأَقَامَ الصَّلَاةَ وَآتَى الزَّكَاةَ....) البقرة:١٧٧، واتـە: چاكـەكاری - دینداری - ئـەوە نیـە كـە ڕووی خۆتـان بـەرەو ڕۆژهـەڵاتو ڕۆژئاوا وەرسووڕێنن، بەڵكو چاكـەكاری - مسوڵمانەتی تـەواو - ئەوەیە كە كەسێك بڕوا بەخواو ڕۆژی دواییو فریشتەكانو كتێبو پێغەمبەران بهێنێ، وە ماڵێك كە خۆشی دەوێ بیبەخشێ بەخزمانو هـەتیوانو نەدارانو ڕێبـوارو سـواڵكەرانو كۆیـلان، وە نوێـژێ بـەرپا بكاتو زەكاتێ بدات...

وەك دەبینین خوای زاناو پەنهان بین لەپێناسەی ئینسانی چاكەكارو چاكەكاریدا دوای ئەوەی بنەمایەكانی بیروباوەڕی ئیسلامی خستوونەڕوو، یەكسەر بەماڵو سامان بەخشین پێناسـەی كـردوە، ئنجا دوای ئـەوە بـە نوێژكـردنو زەكـات دان وەسـفی كـردوە! لەمـەوە دەگەینە ئەو ئەنجامە كە ئەو ماڵو سامان بەخشینەی كە لەدوای ئیمانو عەقیدەو پێش نوێژو زەكات باس كراوە، حەتمەن دەبێ شتێكی گرنگو پێویست بێ نەك تـەنیا كارێكی سـوننەت ئەگـەرنا پێـش نوێـژو زەكـات دان نـەدەخرا ! هـەروەها پێغەمبەریشـمان ﷺ فەرموویەتی: (إنَّ في المال حَقّاً سوى الزَّكـاة) رواه ابن ماجة والدارقطني والترمذي وقال: هذا حديث ليس إسناده بذلك.

واتە: بێگومان جگە لەزەكات هەقی دیكەش لەماڵو سامان دا هەیە.

ئنجا زانایانیش لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە هەر کاتێك مسوڵمانان دووچاری کێشەو گرفتێك بوون کە بە زەکات دان چارەسەر نەدەکرا، ئەوە لەسەر دەوڵەمەندەکانیان فەرزە کە بایی چارەسەریی لەماڵو سامانی خۆیانی بۆتەرخان بکەن! وە (مالك) گوتوویەتی: (لەسەر خەڵکی فەرزە دیلەکانیان ئازاد بکەن ئەگەر هەرچی سامانیشیانە سەرفیان کردبێ) وە ئەمەش ئیجماعی زانایانی لەسەرە[4].

جا لێرە بە پەسەندی دەزانم چەند قسەیەکی گرانبەها لە زانای ناودارو بوێر (ابن حزم)ەوە بخوازمەوە، کە کۆمەڵێك دەقی قورئانو سوننەتی لەو بارەوە هێناونەوە:

{وە لەسەر دەوڵەمەندانی هەر شوێنێك فەرزە کە مشووری هەژارەکانیان بخۆنو پێداویستییەکانیان جێ بەجێ بکەن، وە حوکمڕان بەزۆر ئەو ئەرکەیان پێ جێ بەجێ دەکات، مادام زەکاتەکانی موسڵمانانو باقی خێراتیان بەشیان نەکات، دەبێ بژێوی پێویست و پۆشاکی زستانەو هاوینەو خانوو جێگای ئەوتۆ کە لەبارانو سەرمای زستانو گەرمای هاوینو تیشکی ڕۆژ و چاوی هاموشۆکەران دەیانپارێزی بۆیان دابین بکرێ، بەڵگەی ئەوەش فەرموودەی خوای بەرزە: (وَآتِ ذَا الْقُرْبَى حَقَّهُ وَالْمِسْكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ) الاسراء:٢٦، وە خوای بەرز فەرموویەتی(وَاعْبُدُوا اللَّهَ وَلَا تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا وَبِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَالْجَارِ ذِي الْقُرْبَى وَالْجَارِ الْجُنُبِ وَالصَّاحِبِ بِالْجَنْبِ وَابْنِ السَّبِيلِ وَمَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ) النساء:٣٦، وەك دەبینین: خوای بەرز مافی نەدارانو ڕێبوارو بەردەست (کۆیلە)ی لەگەڵ هەقی خزمان پێویست کردوە، وە چاکە کردنی لەگەڵ بابو دایكو خزمانو نەدارانو دراوسێو بەردەست، فەرز کردوە، ئینجا بێگومان چاکە لەگەڵ کردن ئەوەی گوتمان هەمووی دەگرێتەوە، وە نەکردنیشی خراپە لەگەڵ کردنە!

وە خوای بەرز فەرموویەتی : (مَا سَلَكَكُمْ فِي سَقَرَ، قَالُوا لَمْ نَكُ مِنَ الْمُصَلِّينَ، وَلَمْ نَكُ نُطْعِمُ الْمِسْكِينَ) المدثر: ٤٢ – ٤٤، وەك دەبینین خواردن دان بەنەدارو نوێژکردن لەتەرازووی خوادا جووتو هاوسەنگن.

وە لەچەندان ڕێی زۆر ڕاست (صحیح)ەوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ پێمان گەیشتوە کە فەرموویەتی (من لايَرْحَمُ الناس لايرحمهُ الله) .. ئینجا بەتەئکید کەسێك – خواردنو پۆشاکی زیندەی هەبێو برای موسڵمانیشی بەبرسێتیو ڕووتو ڕەجاڵی ببینێو ... فریای نەیەت، بەزەیی پێیدا نەهاتۆتەوە.

---

[4] بڕوانە: (فقه السنة) ج١ص٥٥٦.

..وه (ابو عثمان النهدي) گێڕاویەتەوه كه (عبدالرحمن بن ابی بكر الصديق) خوالێیان ڕازی بێ گوتوویەتی: (اصحاب الصُفَة) خەڵكێكی هەژار بوون وه پێغەمبەری خوا ﷺ لەبارەیانەوه فەرموی: (مَنْ كان عنده طعام إثنين فَلْيَذهَبْ بِثالثٍ، وَمَنْ كان عنده طعامُ أربَعَةٍ فليذهب بخامسٍ أو بسادسٍ) رواه البخاري، جا دیاره ئەمەش خوودی قسەی ئێمەیە.

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (المسلم أخو المسلم، لا يَظلِمهُ ولا يُسْلِمُهُ) رواه البخاري و مسلم، دەجا بێگومان هەركەسێك -مسوڵمانێك- وێڵ بكات برسیو ڕووت بێت له حاڵێك دا كه توانای خواردن پێدانو پۆشتەكردنی هەبێ ئەوه بەدەستەوەی داوه!

دیسان (ابو سعيد الخدري) خوا لێی ڕازی بێ گێڕاویەتەوه كه پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (من كان مَعَهُ فَضْلَ ظَهْرٍ فَلْيَعُدْ به على مَنْ لاظَهْرَ لَهُ، ومن كان لَهُ فَضْلٌ مِنْ زادٍ فَلْيَعُدْ به على مَنْ لا زاد لَهُ، فذكر من أصْنافِ المال ماذَكَر، حتى رأينا أنه لاحَقَّ لأحَدٍ مِنّا في فَضْلٍ)[5]

.. جا دیاره ئەوەش ئیجماعی هاوەڵانە خوا لێیان ڕازیبێ كه (ابو سعيد) هەواڵی پێدەدات، وه ئێمەش ئەو فەرموودەیە چی دەگەیەنێ ئەوه بیروڕامانە.

هەروەها (ابو موسىٰ) خوا لێیڕازی بێ لەپێغەمبەری گێڕاوەتەوه كه فەرموویەتی: (أطعموا الجائعَ وفكوا العاني)[6] رواه البخاري، وه دەقەكانی قورئانو فەرمووده ڕاست (صحيح)ەكان لەوبارەوه یەكجار زۆرن.

وه لەڕێگای: (عبدالرحمن بن مهدى) له (سفيان الثوري) له (حبيب بن أبي ثابت) له (ابي وائل شقيق بن سلمة) ەوه گێڕاومانەتەوه كه (عمر بن الخطاب) خوا لێی ڕازی بێ گوتوویەتی: (لَو ٱستَقْبَلْتُ من امري ما ٱستَدْبَرْتُ لاخَذْتُ فُضولَ اموالِ الأغْنياء فَقَسمتُها على فقراء المهاجرين)[7]

وه ئەم زنجیره (إسناد)یە لەوپەڕی ڕاستیو بەرزی دایه. (مەبەستی سەنەدی ئەو قسەیەی عومەره خوا لێی ڕازی بێ).

---

[5] واته: هەر كەسێك وڵاخی زیادەی پێیه با بیگێڕێتەوه بۆ ئەو كەسه كه وڵاخی پێنیه، وه هەر كەسێك خواردنی زیادی پێیه با بیگێڕێتەوه بۆ ئەو كەسەی كه خواردنی پێ نیه... بەو پێیه جۆرەكانی ماڵو سامانی باس كرد هەتا قەناعەتمان وابوو كەهیچ كەسێك له ئێمه مافی ئەوەی نیه شتی زیادی هەبێ.

[6] فەرموودەكه ئاوایه: (اطعموا الجائع وعودوا المريض وفكوا العاني)واته: خواردن بدەنه برسیو سەردانی نەخۆش بكەنو دیل ئازاد بكەن- (واته: بەپاره دیل بكڕنەوەو ئازادی بكەن).

[7] واته: ئەگەر لەسەر ئەم كارەم كه ماوەیەكم لێ بەڕێ كردوه بمێنم، ماڵو سامانی زێدەی دەوڵەمەندەكان وەردەگرمو بەسەر كۆچكەره هەژارەكان دا دابەشی دەكەم.

دیسان لەڕێی (سعید بن منصور) لە (أبي شهاب) لە (ابي عبدالله الثقفي) لە(محمد بن علی بن الحسین) لە (محمد بن علی بن ابي طالب) گێڕاومانەتەوە کە گوێی لە (علي بن ابي طالب) خوا لێیان ڕازی بێ بووە کە گوتوویەتی: (إن الله تعالى فَرَضَ على الأغنياء في أموالِهِمْ بِقَدَرِ مايكفِي فُقراءَهم، فأن جاعوا او عَرَوْا وجُهِدوا فَبِمَنْع الأغنياء، وحق على الله تعالى ان يحاسِبَهُمْ يوم القيامة ويُعَذِّبَهُمْ)[٨]

وە لە (ابن عمر)ە وە (خوای لێی ڕازیبێ) گێڕراوەتەوە کە گوتوویەتی: (في مالِكِ حَقٌّ سوى الزَّكاة) وە لە (عائشة ام المؤمنين) و (حسن بن علي) و (ابن عمر)ەوە هاتوە (خوا لێیان ڕازیبێ) کە بەو کەسەیان گوتوە کە داوای لێیان کردوە (هاوکاری بکەن): (إن كُنْتَ تسألُ في دَمٍ مُوجِعٍ او غُرْمٍ مُفْظِعٍ او فَقْرٍ مُدْقِعٍ، فَقَدْ وَجَبَ حَقُّكَ)[٩].

وە لەڕێی ڕاستەوە هاتوە کە (ابوعبیدە بن الجراح) و سێسەد (٣٠٠) لەهاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ - لەغەزایەك دا - هەندێکیان خواردنەکانیان تەواوبوو، جا (ابو عبیدة) فەرمانی پێکردن و هەموو ئەو خواردەمەنییەی پێیان مابوو لەدوو ناندێن (مِزْوَد)دا کۆیان کردەوەو ئەویش بە یەکسانی لەو خواردەمەنییە دەیدانێ، جا دیارە ئەمەش یەکدەنگی (اجماع)ێکی قسە هەڵبڕە لەهاوەڵانەوە (خوا لێیان ڕازیبێ) و هیچ کەس لەوان ڕای جیاوازی نەبووە.

هەروەها لەڕێی ڕاستەوە ئیسپات بووە کە هەرکام لە (شعبي) و (مجاهد)و(طاوس)و غەیری وانیش گوتوویانە: (في المال حَقٌّ سِوى الزَّكاة)..

وە بێجگە لە (ضحاك بن مزاحم) نەمانزانیوە هیچ کەس ڕای لەمە جیاوازبێ، چونکە ئەو گوتوویەتی: زەکات هەموو هەقێکی دیکەی لەماڵ و سامان لابردووە!.. بەڵام (ضحاك) ئەوەی کە ڕیوایەتیشی دەکات بە بەڵگە ناشێ چ جای ڕاو بۆچوونی!!

ئنجا سەیر ئەوەیە کە ئەو کەسەی بەڵگە بەم قسەیە (کە زەکات هەموو هەقێکی لابردووە) دێنێتەوە خۆی یەکەمین کەسە کە پێچەوانەی ڕەفتاری کردووە! چونکە پێی وایە لەماڵ دا جگە لەزەکات چەندان هەق و ماف هەن، لەوانە:

*أ- مەسرەف کێشانی باب و دایکی ئاتاج.*

---

[٨] واتە: بێگومان خوای بەرز بەئەندازەی ئەوە کەبەشی هەژارەکان بکات لەسەر دەوڵەمەندەکانی فەرز کردوە کە لەماڵەکانیان ببەخشن، جا ئەگەر هات و برسی بوون یان ڕووت و کەنەفت بوون ئەوە سووچی دەوڵەمەندەکانە، وە خوا هەقیەتی کەڕۆژی دوایی لێیان بپرسێتەوەو سزایان بدات.

[٩] واتە: ئەگەر داوای هاوکاری دەکەی بۆ خوێن (دیة)ێکی باری شان قورسکەر، یان فەرزێکی زۆر نارەحەت و کەنەفت کەر، یان نەدارییەکی داماوکەرو بەزەوییەوە چەسپێنەر، ئەمە هەقت پێویست بووە. (کە یارمەتیت بدرێ و هاوکاری بکرێی).

ب- مەسرەف كێشانی ژن.

ج- مەسرەف كێشانی كۆیلە.

د- مەسرەف كێشانی ئاژەڵو گیانداران.

ه- دانەوەی قەرزەكان.

و- بژاردن -ی خوێنو هەرجۆرە زیانێكی دیكە كە شەرع ماڵو سامانی لەبەرانبەردا داناوە -.

ئنجا ئەگەر گوترا: ئەدی چ لەم دەقانە دەكەن كە لەڕێی (ابن ابي شيبة) ەوە گێڕاوتانەتەوە كە (ابن عباس) گوتوویەتی: (مَنْ أدّى زكاة ماله فَلَيْسَ عليه جُناحٌ ان لايتصدَّقَ)، وە لەڕێی (حكم) لە (مقسم) ەوە لە (عكرمة)ەوە كە (ابن عباس) -خوا لێیان ڕازی بێ- لەبارەی فەرموودەی خوای بەرز: (وآتوا حَقَّه يوم حَصادِهِ) الانعام:١٤١، گوتوویەتی: دەییەكو نیوەی دەییەك حوكمی ئەم ئایەتەیان لابردوە؟!

-لەوەڵام دا دەڵێین - جاریٚ ئەوەی (مقسم) گێڕاویەتەوە لەبەر بێ هێزی لەبەڵگە كەوتوە، ئنجا ئەگەر گریمان ڕاستیش بێ پێچەوانەی قسەی ئێمە نیە.

ئەوەی (عِكّرِمة)ش گێڕاویەتەوە مەبەست خێركردنی سوننەتەو ئەمەش ڕاستە، بەڵام بەدەمەوەچوونو هاوكاریكردنی بابای لێقەوماوو كەنەفت ئەوە فەرزو دینداریەو خێركردنی سوننەت نیە.

ئنجا - سەیر ئەوەیە كە - دەڵێن: هەر كەسێك تینووی بوو و لەمردنێ ترسا ئەوە لەسەری فەرزە لەكوێ ئاوی چنگ كەوت پەیدای بكات وە جەنگی لەسەر بكات! دەجا چ جیاوازییەك لەنێوان:

ا- مردن لەسۆنگەی تینوێتییەوە.

ب- مردن بەهۆی برسیەتیو ڕووتییەوە؟! كە بۆ لابردنی مردنی یەكەم جەنگ كردنیان بەڕەوا زانیوە، بەڵام بۆ هی دووەم ڕێیان نەداوە! كە بێگومان ئەمە پێچەوانەی قوڕئانو سوننەتو ئیجماعو قیاسیشە![10]

ئنجا (ابن حزم) لەكۆتایی قسەكانیدا گوتوویەتی: وە هەر مسوڵمانێك بەهۆی برسیەتییەوە سەغڵەت بوو بۆی ڕەوا نیە كە مردار یان گۆشتی بەراز بخوات لەحاڵێك دا كە خواردنی زیاد بەهاوەڵەكەیەوە شك دەبات، چ هی خۆی یان مسوڵمانێكی دیكە یان ئی كافرێكی هاوپەیمان بێت! چونكە لەسەر خاوەن خواردەمەنی فەرزە كە خواردن بدات بە بابای برسی، جا مادام وابێ بەناچارو ئاتاجی مردارو گۆشتی بەراز دانانرێ...

---

[10] خوا پاداشتت بداتەوە (ابن حزم) بۆ خۆتو بەڵگەی بەهێزتو قووڵ تێگەیشتنو بوێریتو بەرگریت لەهەقو مافی هەژارو نەدارو كۆست كەوتوانو لێقەوماوان!

وە بۆشی هەیە کە لەو پێناوەدا بجەنگێ، جا ئەگەر کوژرا ئەوە کوژەرەکەی تۆڵەی دەکەوێتە سەر، وە ئەگەر بابای نەبەخشەریش کوژرا ئەوە بەرەو نەفرینی خوا دەچێ، چونکە مافێکی زەوت کردوە، وە ئەو کەسە حوکمی کۆمەڵی یاخی (طائفة باغیة)ی هەیە، خوای بەرز لەوبارەوە فەرموویەتی: (وَإِنْ طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا فَإِنْ بَغَتْ إِحْدَاهُمَا عَلَى الْأُخْرَى فَقَاتِلُوا الَّتِي تَبْغِي حَتَّى تَفِيءَ إِلَى أَمْرِ اللَّهِ فَإِنْ فَاءَتْ فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا بِالْعَدْلِ وَأَقْسِطُوا إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ) (الحجرات:٩)

وە زەوتکەری مافیش یاخیو دەستدرێژکارە بۆ سەر ئەو برایەی کە هەقی هەیە، هەر بەم بەڵگەیەش (ابوبکر الصدیق) خوا لێی ڕازیبێ لەگەڵ زەکات نەدەران دا جەنگا.)[11]

منیش دەڵێم: لەڕاستیدا – وێڕای ئەو هەموو بەڵگانەی کە (ابن حزم) و زانایانی دیکە هێناویاننەوە – ئەگەر بەوردی سەرنجی سوورەتی (الماعون) بدەین هەر خۆی بەتەنیا چاکترینو بەهێزترین بەڵگەی تێدایە لەوبارەوە، با بزانین چۆن!

بسم الله الرحمن الرحيم

(أَرَأَيْتَ الَّذِي يُكَذِّبُ بِالدِّينِ(١)فَذَلِكَ الَّذِي يَدُعُّ الْيَتِيمَ(٢)وَلَا يَحُضُّ عَلَى طَعَامِ الْمِسْكِينِ(٣)فَوَيْلٌ لِلْمُصَلِّينَ(٤)الَّذِينَ هُمْ عَنْ صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ(٥)الَّذِينَ هُمْ يُرَاءُونَ(٦)وَيَمْنَعُونَ الْمَاعُونَ(٧)) (الماعون)

واتە: بەناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە. ئایا دیت ئەو کەسەی کە بڕوای بەئایین –یان سزاو پاداشت – نیە؟ ئەوە ئەو کەسەیە کە بەتوندی پاڵ بەهەتیوەوە دەنێ. وە – نەبۆ خۆی دەبەخشێ – وە هانی –خەڵکیش – نادات لەسەر خواردن دان بەنەدار. جا سزای سەخت بۆ نوێژکەران. ئەوانەی کە لە نوێژەکەیان بێئاگان. ئەوانەی کە ڕووپامایی دەکەن. وە یارمەتی – هەژارو نەدار – دەگرنەوە.

وەك دەبینین خوای دادگەرو دووربینو کاربەجێ پێناسەی ئینسانی بێبڕوا – بەئاین یان بەدوارۆژ بەم شتانە دەکات:

أ–تووڕەبوون لەهەتیوو پاڵ پێوەنانیو دەرکردنی لەجیاتی دەست بەسەردا هێنانیو هاوکاری کردنیو دەستگرتنی.

ب–هان نەدانی خەڵکی بۆ خواردن بەخشین بە بابای نەدارو برسی، لەجیاتی ئەوەی خۆشی ببەخشێو هانی خەڵکیش بدات.

ج–نوێژ کردنێکی بێئاگایانەی بێ ڕووحو گیان، بەڵکو تەنیا بۆ سەرنج ڕاکێشانی خەڵكو خۆبەمسوڵمانی باش پێشاندانو کڵاو لەسەری خەڵکی سادەنان.

د–دەستگرتنەوەو نەبەخشینی هەرجۆرە شتێكو نەکردنی هەرجۆرە هاوکارییەك کە توێژە هەژارو نەدارو بێهێزو بڕستو کەمدەستەکانی کۆمەڵگا – وەك هەتیو، برسی،

---

[11] بڕوانە: (المحلّى شرح المجلّى) ج٦ص١٠٥تا١٠٨، مسألة:٧٢٥.

ڕووت و ڕەجاڵ، بێ ماڵ و حاڵ. هتد - پەکیان لەسەری کەوتوەو سەریان تێی وەستاوە، چونکە پێشەوای توێژەرەوانی قورئان (ابو جعفر الطبري) لە تەفسیری ئەم سوورەتەداو لە لێکدانەوەی وشەی (الماعون)دا گوتوویەتی:[12] (قوله: (ويمنعون الماعون) يقول: ويمنعون الناس منافع ما عندهم، وأصل الماعون من كُلَ شيئٍ مَنْفَعته، يقال للماء الذي ينزل من السَّحابِ: ماعون...) واتە: فەرموودەی خوا: (ويمنعون الماعون) دەفەرموێ: ئەو سوودو بەرژەوەندییانەی کە لەبەردەستیانە لەخەڵکی دەگرنەوە، وە ئەسڵی (ماعون) لەهەر شتێك دا سوودو کەڵکەکەیەتی، بەو ئاوەی کە لەهەوری دێتە خوارێ دەگوترێ: (ماعون).

پاشان دوای ئەوەی لە (علي بن أبي الطالب) خوا لێی ڕازیبێ و لە (ابن عمر) خوا لێیان ڕازی بێ و لە (مجاهد) و (حسن البصري)یەوە دەگێڕێتەوە کە (ماعون) یان بە (زەکات) لێکداوەتەوە.

وە لە (ابن عمر) ەوە دەگێڕێتەوە کە دەربارەی (يمنعون الماعون) گوتوویەتی: (هو منع الحق) نەدانی هەق و مافە.

وە لە (ابن مسعود)ەوە خوا لێی ڕازی بێ دەگێڕێتەوە کە دەربارەی (ماعون) گوتوویەتی: (هُوَ ما يَتعاورهُ النَّاسُ بينهم: الفأسُ والقدرُ والدَّلْوُ) واتە: ئەوەیە کە خەڵکی لەنێوانیان دا لە یەکتری وەردەگرن وەك: تەورو مەنجەڵ و دۆڵچە.

وە لە (ابن عباس)ەوە خوا لێیڕازی بێ دەگێڕێتەوە کە (ماعون)ی بە (عارية)و بە (متاع البيت) لێکداتەوە، کە لەکوردیدا پێی دەڵێن: حەواج، واتە ئەو شتانەی هەموو کەس پێیان ئاتاجە. وە لە (سعيد بن المسيب) و (زهري)یەوە دەگێڕێتەوە کە گوتوویانە: (ماعون) بەزمان و زاراوی قورەیش ماڵ و سامانە.

بەڵێ دوای ئەم قسانە هەموویان (طبري) دەڵێ: (وأَولىٰ الأقوال في ذالك عندنا بالصَّواب، إذا كان الماعون هو ما وَصَفْنا قَبْلُ وكان الله قد أخْبَر عن هؤلاءِ القوم وانهم يمنعونه الناس، خَبَراً عاماً، من غير ان يخص من ذلك شَيئاً، ان يقال، ان الله وصفهم بأنهم يمنعون الناس مايتعاورونهُ بينهم ويمنعون أهل الحاجة وَالمَسْكنة ما اوْجَبَ الله لَهُمْ في أموالِهِمْ من الحقوق، لأن كل ذلك من المنافع التي ينتفع بها الناس بعضهم منْ بَعْضٍ)

واتە: وە بەلامانەوە نزیکترین قسە لەڕاستییەوە لەوبارەوە - مادام (ماعون) ئەوەبێ کە لەمەوبەر باسمان کرد، وە مادام خوا لەبارەی ئەو کۆمەڵەوە هەواڵێ داوە کە لەخەڵکی دەیگرنەوە، بەگشتی بێئەوەی شتێکی لێ تایبەت بکات - ئەوەیە کە بگوترێ: خوا ئەوانەی بەوە پێناسە کردوە کە ئەو شتانە لەخەڵکی دەگرنەوە کە حەواجن و لەنێو خۆیان دا لەیەکتریان وەردەگرن، وە ئەو مافانەی کە خوا لەماڵ و سامانیان دا بۆ خەڵکی ئاتاج و

---

[12] بڕوانە: (جامع البيان) تأليف: ابي جعفر محمد بن جرير الطبري، ج١٥ص٤٠٥تا٤١٣.

نەدار پێویستی کردوون لێیان دەگرنەوە، چونکە هەموو ئەو شتانە لەو بەرژەوەندییانەن کە خەڵکی هەندێکیان لەهەندێکیانەوە لێیان بەهرمەند دەبن.

ئنجا ئاشکرایە کە بەپێی ئەم لێکدانەوەیە بۆ وشەی (ماعون) وێڕای زەکات هەموو جۆرە یارمەتیی و هاوکارییەکانی دیکەش دەگرێتەوە کە ژیانو گوزەرانی کۆمەڵگا بەتایبەت چینو توێژە کەمدەستو نەدارەکان پەکیان لەسەریان کەوتوە، ئنجا مادام گرتنەوەی (ماعون) یەکێك بێ لەخەسڵەتە بنچینەیییەکانی باباى بێبڕوا! دیارە فەرزو پێویستەو بابای دەستگرەوە لەسەری تووشی ئازارو ئەشکەنجەی دواڕۆژ دەبێ با ئەو کەسە مسوڵمانیش بێ، چونکە بابای کافرو بێ بڕوا جیاوازی لەگەڵ مسوڵمانان ئەوەیە کە خەسڵەتە پیسو بەدەکانی وەك: کوفرو شیركو بێڕەحمیو ڕژدیو.. هتدی تێدا هەن هەروەك مسوڵمانیش بەسیفەتو خەسڵەتە بەرزو جوانەکانی وەك: ئیمانو تەوحیدو پارێزکاریی و دادگەریو بەزەییو بەخشندەییو.. هتد بۆتە مسوڵمانو مژدەی بەهەشتو ڕەزامەندی خوای پەروەردگاری لەسەر ئەو بناغەیە پێ دراوە، ئەگەرنا وەنەبێ هەر لەخۆوەو بە بەلاشو تەنها لەبەر ناوی ڕووت بەهەشتی لەسەر تاپۆکرابێو، پاکانەی قوتاربوون لەدۆزەخو ئازارو ئەشکەنجە نەچێشتنی دواڕۆژی بۆ کرابێ.

بەڵێ بەسەرنج دانی دەقەکانی قورئانو سوننەت کە دەربارەی ماڵو سامان بەخشینەوە هاتوون بەڕوونو ڕاشکاوی بۆمان دەردەکەوێ کە ئەو ڕایەی دەڵێ جگە لەزەکات هەقی دیکەش لەماڵو سامانی مسوڵمانان دا هەیە زۆر بەهێزەو لەگەڵ ڕووحی گشتی ئیسلامیشدا گونجاوترە کەهەمیشە کۆمەڵگای مسوڵمان بۆ هاوکاریو برایەتیو دەستبار بۆ یەکتر گرتنو بەتەنگ یەکترەوە بوونو بەدەم یەکترەوە چوون هەڵدەنێو هان دەدات.

وە لەچەندان دەقی قورئانو سوننەت دا کۆمەڵو کۆمەڵگای مسوڵمان وەك جەستەیەك تەماشاکراوە کە سەرجەم ئەندامەکانی لەخۆشیی و ناخۆشی یەکتردا بەشدارنو بۆ یەکتر بەپەرۆشو بەمشوور و غەمخۆرن، ئنجا ئاشکراشە کەبەبێ ئەو هاوکاری یەکترکردنو بەدەم یەکترەوە چوونە ماددیو ئابوورییە وێڕای سەرهەڵدانی چەندان دەردو نەخۆشی کۆمەڵایەتی بەهۆی ناهاوسەنگییەوە، برایەتیو یەکڕیزیو یەکڕەنگی مسوڵمانانیش دەبێتە شیعاری بێکردارو قسەی ڕووتی سەرزار، کە ئەمەش شتێکی ناشایستەو نەگونجاوە بۆ کەسانێك خۆیان بەشوێن کەوتووی بەرنامەی تێرو تەواوی خوای پەروەردگار بزانن.

# ٣-زەكات دان

خوێنەری بەڕێز: بێگومان باس و لێکۆڵینەوە دەربارەی زەکات هەویرێکە ئاوی زۆر دەوێ، بۆیە بە پەسەندم زانی بەدوو قۆناغ ئەوکارە ئەنجام بدەین، لەقۆناغی یەکەمیان دا - کە ئێرەیە - هەوڵ دەدەین لەحەوت بڕگان دا هێڵە گشتیی و سەرەکیی‌یەکانی بابەتەکەمان بخەینەڕوو، کە ئەمانەن:

<u>یەك:</u> *زەکات یانی چی و کەی فەرز بووە؟!*

<u>دوو:</u> *حوکمی زەکات نەدان.*

<u>سێ:</u> *زەکات لەکێ وەردەگیرێ؟!*

<u>چوار:</u> *زەکات لەچی وچی دەدرێ و چەندە وەردەگیرێ؟!*

<u>پێنج:</u> *زەکات دەدرێ بەکێ و کێ؟!*

<u>شەش:</u> *حوکمی گواستنەوەی زەکات.*

<u>حەوت:</u> *زەکات بەکێ خێرترە؟!*

پاشان لەقۆناغی دووەم دا کە بەندی دووەم (چەند تێبینی‌یەکی گرنگ دەربارەی زەکات دان) مان بۆ تەرخان کردوە خوا یاربێ لەدوو توێی چوار سەرباس و چل و نۆ (٤٩) وردە خاڵ دا هەموو ئەو باس و بابەتە وردو گرنگانەی کە بە پێویستیان دەزانین و قەبارەی ئەم کتێبە دەرفەتمان دەدات بەکورتی و گوشراوی دەیانخەینەڕوو، هیواداریشم لەئاکام دا بتوانین سیمای جوان و گەش و درەوشاوەی ڕاستەقینەی زەکات تا ڕاددەیەکی باش وەك خۆی ڕابنوێنین.

## یەك: زەکات یانی چی و کەی فەرز بووە؟!

بێگومان زەکات (الزکاة) وشەیەکی عارەبی‌یەو بەسەرنج دانیش لەفەرهەنگەکانی زمانی عارەبی بۆمان دەردەکەوێ کە ڕیشەو ئەسڵی وشەی زەکات کە (زکی یزْکو) یە سێ مانای هەن: أ-(طَهُرَ) پاك بۆوە، ب-(نَما و زادَ)، گەشەی کردو زیادی کرد، ج-(صَلُحَ) چاك بوو، کەواتە: وشەی زەکات لەزمانی عارەبی‌دا بەهەرسێك مانای لەیەك نیزیکی، پاکبوونەوەو گەشەکردن و چاکبوون دێ، وە لەڕاستی‌دا ئەم سێ مانایەش هەرسێکیان پێکەوە پەیوەست (متلازم)ن، چونکە هیچ شتێك بەبێ پاکی و پاکسازی گەشەو نەش و نوما ناکات، وە لەئەنجامی گەشەکردن دا شت چاك دەبێ[١٢].

[١٢] بڕوانە: (مفردات الفاظ القرآن) ص٣٨٠، ٣٨١، وشەی (زکاة)، وە بڕوانە: (مُعْجَم الفاظ القرآن الكريم) ج١ص٥١٧، ٥١٨ وشەی (زَکو)، وە: (المعجم الوسيط) ص٣٩٦.

وە زەکات لەزاراوی شەرع دا شەرعزانەکان بەچەند شێوەیەك پێناسەیان کردوە کە لە نێوەڕۆکدا دەبنەوە بەیەك بۆ وێنە:

ا- (نووي) گوتوویەتی:[14] (هو اسمٌ لأخذِ شيءٍ مَخْصوصٍ، من مالٍ مَخْصوصٍ، على أوْصافٍ مَخْصوصةٍ، لطائفةٍ مخصوصةٍ) واتە: ناوە بۆ وەرگرتنی ئەندازەیەکی تایبەت، لە ماڵێکی تایبەت، بەگوێرەی چەند مەرجێکی تایبەت، بۆ کۆمەڵێکی تایبەت.

ب-(ابن حجر)یش ئەم پێناسەیەی پەسەند کردووە: (إعطاءُ جُزءٍ من النّصابِ الحَوْليّ الىٰ فقيرٍ ونحوه غيرِ هاشمي ولا مُطّلبي)[15] واتە: بەخشینی بەشێك لەماڵێکی زەکات لێکەوتووی ساڵ بەسەردا سووڕاوە بەهەژارێك و هاوشێوەی جگە لە بابایەکی هاشیمی و موطەللیبی - کەزەکاتیان پێ ناشێ -.

ج-(صَنْعاني) لە پێناسەی زەکات دا گوتوویەتی: (إسمٌ لجزءٍ من المالِ قدَّرَهُ الشارعُ يُخْرِجُه المُسْلمُ في وقتٍ مخصوص لطائفةٍ مخصوصة بالنية)[16] واتە: ناوە بۆ بەشێك لەماڵ کەشەرع دانەر (جلّ جلالە) دیاری کردوە، مسوڵمان لەکاتێکی تایبەت دا بەنیەتەوە بۆ کۆمەڵێکی تایبەت - لەماڵی خۆی - دەری دەکات.

دیارە جگە لەزەکات هەم لەقورئان و هەم لەسوننەتیش دا وشەی (صَدَقَة)ش بۆ هەمان شت بەکارهاتوە، بۆ وێنە: ﴿خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِمْ بِهَا وَصَلِّ عَلَيْهِمْ إِنَّ صَلَاتَكَ سَكَنٌ لَهُمْ وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾ التوبة:١٠٣، (صدقة)ش وەك (نووی) گوتوویەتی: (وسُميتْ صَدَقةً لأنها دليلٌ لتصديق صاحبها وصِحّة إيمانِه بظاهره وباطنه)،[17] واتە: وە بۆیە ناونراوە صەدەقە چونکە بەڵگەیە لەسەر بڕواو ئیمانی خاوەنەکەی و دامەزرانی بەڕواڵەت و پەنهانی‌یەوە.

ئنجا بێگومان خوای کاربەجێ کە وشەی زەکاتی وەك ناو بۆ ئەو پایە گرنگ و گەورەیەی ئایینەکەی هەڵبژاردوە، ئەوپەڕی حیکمەتی تێدایە چونکە بەڕاستی زەکات هەم هۆکاری پاکی و چاکی و گەشەکردنی ماڵ و سامان و هەم هۆکارێکی یەکجار کاریگەریشە بۆ پاککردنەوەو پاك ڕاگرتنی کۆمەڵگا هەم لەخەسڵەتی پیس و بەدی ڕژدی و چرووکی و هەم دەردو نەخۆشی ناکۆکی و دووبەرکی و ناتەبایی کە لەئەنجامی قڕی و پڕی چینایەتی‌دا

---

[14] بڕوانە: (المجموع) ج٥ص٢٨٨.

[15] بڕوانە: (فتح الباري شرح صحيح البخاري) ج٤ص٥.

[16] بڕوانە: (العدة على إحكام الاحكام شرح عمدة الأحكام) ج٣ص٩٠.

[17] بڕوانە: (شرح صحيح مسلم) ج٤ص٢٦٩٦.

لەنێو توێژەكانی كۆمەڵگادا پەیدا دەبێ، هەروەها زەكات مایەی چاكسازیو گەشەو نەشەو بەرەو پێش چوونی كۆمەڵگایە نەك هەر لەبواری ئابووریدا بگرە لە بوارەكانی كۆمەلایەتیو ئاوەدانیو جیهادیو زانستی... هتددا چونكە وەك دواتر ڕوونی دەكەینەوە زەكات پەیوەندییەكی توندوتۆڵی ئیجابییانەی بەهەموو ئەو بوارو لایەنانەی ژیانو گوزەرانی كۆمەڵگاوە هەیە لەكاتێك دا بەشێوەیەكی شەرعییانەی دروست وەردەگیرێو لەشوێنی خۆیدا دادەنرێ.

بەكورتی: زەكات هەروەك چۆن نەسڵی مانایەكەی هەركام لە (پاكیو چاكیو گەشەكردن) دەگەیەنێ، بەكردەوەو لەسەر زەوی واقیعیش هەركام لەو سێ شوێنەوارو بەرهەمە گەورەو گرنگە لەژیانو گوزەرانی تاكو كۆمەڵ دا دەرەخسێنێ لەهەردووك بواری ماددیو مەعنەویدا.

ئنجا وەك لەباسەكانی داهاتووش دا ڕوونی دەكەینەوە زەكات وەك زۆر كەسی لەئیسلام بێئاگا گومان دەبات خێرو خێراتێك نیە كەهەر كەسە بەپێی ئارەزووی خۆیو هەرچۆنێكی كەیفی لێبوو بیبەخشێ! بەڵكو مافێكی ڕەوای هەشت جۆرە لەتوێژە ئاتاجەكانی كۆمەڵگایە كە دەستەڵاتی شەرعی بۆیان وەردەگرێو بەسەریان دا دابەشی دەكاتو هەركەسێكیش لاملی بكات و نەیدات - وەك لەبڕگەی دووەم دا باسی دەكەین - لەسەر دەستەڵاتی شەرعی ولات فەرز دەبێ كە بەزۆر لێی بستێنێو سزاو جەزرەبەشی بدات، وە ئەگەر كۆمەڵێكی خاوەن تواناو دەستەڵات بوون جەنگیان لەگەڵ بكاتو ملیان پێنەوی بكاتو تەمبێیان بكات.

بەڵێ خوێنەری خۆشەویست ! خوای زاناو كاربەجێ بێ حیكمەت نیە كە زەكات دانی كردۆتە سێیەمین پایەو كۆڵەكەی هەرە گەورەو گرنگی ئیسلامەتی، بەلام گرنگ ئەوەیە ئێمەش وەك پێویست لەپایەو بنچینەكانی بەرنامەی خواو دەستوورو یاساكانی حاڵی بینو بەهۆی واقیعی ناشەرعییانەو پڕ هەڵەو پەڵەی مسوڵمانانەوە لەناسینی ئیسلام دا دووچاری چەواشە بوون نەبین.

دەربارەی كاتی فەرزبوونی زەكاتیش لەسەر مسوڵمانان، دوای ئەوەی كە لەچەندان ئایەت دا بەگشتی فەرمانیان پێكرابوو بەماڵ بەخشین، زۆربەی[18] هەرە زۆری زانایان دەڵێن لەساڵی دووەمی كۆچیداو بەر لەفەرزبوونی ڕۆژووی ڕەمەزان پێویست كراوە.

---

[18] بروانە: (سبل السلام شرح بلوغ المرام) ج٢ص٧٨٧.

## دوو: حوكمی زەكات نەدان:

زەكات دان كەوەك پێشتریش باسمان كرد یەكێكە لەپێنج پایە گەورەو گرنگەكانی ئیسلام، لەچەندان دەقی قورئان و سوننەت دا فەرز بوونی خراوەتەڕوو، بۆ وێنە لەچەندان جێگای قورئانی بەرێزدا تەعبیری:

(یُقِیمُونَ الصَّلاةَ وَیُؤْتُونَ الزَّكَاةَ) المائدة:٥٥، وە: (فَأَقِیمُوا الصَّلاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ) الحج:٧٨، وە (وَأَقَامُوا الصَّلاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ) التوبة:٥. هاتووە، وە هەڕەشەی توندوتیژو بێڕەزا لەو كەسانە كراوە كە زەكات نادەن، بۆ وێنە:

*(وَلا یَحْسَبَنَّ الَّذِینَ یَبْخَلُونَ بِمَا آتَاهُمُ اللَّهُ مِنْ فَضْلِهِ هُوَ خَیْرًا لَهُمْ بَلْ هُوَ شَرٌّ لَهُمْ سَیُطَوَّقُونَ مَا بَخِلُوا بِهِ یَوْمَ الْقِیَامَةِ وَلِلَّهِ مِیرَاثُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِیرٌ) آل عمران:١٨٠، واتە: وە با ئەوانەی ڕژدی دەكەن لەبەخشینی ئەو - ماڵو سامان -ەدا كە خوا لەچاكەی خۆیەوە پێی‌داون وانەزانن كە ئەو -ڕەفتار - ە لەقازانجیانە؛ بەڵكو ئەوە مایەی زیانباری‌یانەو لە ڕۆژی دوایی‌دا ئەوەی چرووكی‌یان تێدا كردوە لەگەردنیان دەئاڵێنرێ..

*(عن أبي هريرة رضي الله عنه عن النبي ﷺ قال: مَنْ آتاهُ اللهُ مالاً فَلَمْ يُؤدِّ زَكاتَهُ مُثِّلَ لَهُ يوم القيامة شُجاعاً أَقْرَعَ لَهُ زَبِيْبَتانِ يطوقهُ يوم القيامة، ثم يأخذ بِلِهْزِمَتَيْه – يعني شِدقَيه – ثم يقول: أنا كَنْزُكَ: أنا مالُكُمْ تلا هذه الآية، (ولا يَحْسَبنّ الذين يبخلون بما آتاهم الله من فضله...) ) متفق عليه.

واتە: هەر كەسێك خوا ماڵێكی بداتێ و زەكاتی لێ دەرنەكات، لەڕۆژی دوایی‌دا بۆی دەبێتە نێرە مارێكی كەچەڵ كە دوو خاڵی ڕەش لەپشت چاوەكانی‌یەوە هەن و ڕۆژی دوایی لەگەردنی دەئاڵێ. پاشان بەقەپ هەردووك لا شەویلاگەی دەگرێ و دەڵێ: من خەزێنەكەتم، من پارەو سامانەكەتم، ئنجا - پێغەمبەر ﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە: (ولا يحسبنّ الذين يبخلون بما آتاهم الله من فضله..).

وە زانایان لەسەر ئەوە یەكدەنگن كەهەر كەسێك ئامادە نەبوو زەكات بدات لەسەر حوكمڕان و گەورەی مسوڵمانان فەرزە بە تۆبزی لێی بستێنێ، ئەمە لەحاڵێك دا نكووڵی لەفەرز بوونی نەكات، بەڵام ئەگەر نكووڵی لە فەرز بوونی كرد وە تازە مسوڵمان و بێ‌ئاگاش نەبوو[19]، ئەوە پێویستە بكوژرێ و لەگۆڕستانی مسوڵمانانیش نەنێژرێ چونكە بە ئینكاری كردنی فەرزبوونی زەكات كافر بووەو هەڵگەڕاوەتەوە، شایانی باسیشە نكووڵی كردن لە فەرز بوونی هەر شتێكی دیكەش هەر هەمان حوكمی هەیە مادام فەرزێكی

---

[19] بڕوانە: (المجموع) ج٥ص٣٠٠.

ئاشكراو زانراوبێت، دیسان نكووڵی كردن لەقەدەغەكرانی هەر حەرام كراوێكیش بەهەمان شێوە، ئەوە لەلایەكەوە، لەلایەكی دیكەشەوە زۆرێك لە زانایانی پێشین ئەنجام نەدانی چوار پایەكانی ئیسلام (نوێژو زەكاتو ڕۆژوو حەج) یان بەكافرو لەئایین دەرچوو داناوە، بەتایبەت نوێژو زەكات كە لەچەندان دەقی قورئانیش دا هەر پێكەوە جووت كراون و وێكڕا باس كراون، وە لەڕاستیدا لەئەنجامی زاڵبوونی بیروبۆچوونی (مُرْجِئَة)كان بەسەر دڵو مێشكی مسوڵمانانداو قبووڵ كرانو سەلمێنرانی بیروبۆچوونی ناوبراو لەلایەن هەردووك قوتابخانەی فیكریی و كەلامیی ئەشعەرییەكانو ماتوریدییەكانەوە ئەو هەڵوێستە ساردو سڕو شلوپلەی مسوڵمانان لەبەرانبەر ئەو درووشمە بەرزو مەزنانەی مسوڵمانەتیو دینداریدا پەیدابوو، هەرچەندە من پێم وایە تەنیا نوێژ ئنجا بەپلەی دوەمیش زەكات بەڵگەی بەهێز لەسەر كوفرو لەئایین دەرچوونی جێبەجێنەكەرانیان هەیەو ڕۆژوو و حەج وانین[20].

ئنجا دەربارەی ئەوە كە ئایا بابای زەكات نەدەر وێڕای زەكات لێ ئەستێنرانو تەمبێكران، هیچ ماڵو سامانی دیكەی وەك سزاو تۆڵە لێدەستێنرێ، یان بەس زەكاتەكەی لێوەردەگیرێ؟ زانایان ڕایان جیا جیایە، (احمدو شافعي) لەڕای كۆن (القول القديم)ی دا دەڵێن دەبێ نیوەی ماڵو سامانەكەیشی لێ بستێنرێ، بەڵام زۆربەی زانایان ڕایان وایە كە بێجگە لەزەكاتەكەی هیچی دیكەی لێوەرناگیرێ، بەڵگەی (شافعي واحمد) – كە لە (إسحاق وأوزاعي)یش گێڕڕاوەتەوە – ئەم فەرموودەیە:

(...ومَنْ مَنَعها فَانّا آخذوها وشَطْرَ ماله عَزْمَةً مِنْ عَزَماتِ رَبِّنا تبارك وتعالىٰ) رواه أحمد والنسائي وأبوداود والحاكم والبيهقي عن بهز بن حكيم عن أبيه عن جدّه.

واتە: وە هەر كەسێك نەیدات ئەوە ئێمە وەك فەرمانێكی جەخت لەسەر كراوی پەروەردگاری پایە بڵندو بەرزمان زەكاتەكەشو نیوەی سامانەكەشی لێوەردەگرین.

زۆربەو جەماوەری زانایانیش چەند شتێك بە بەڵگە دێننەوە كە یەكێكیان ئەم دەقەیە كە بە فەرموودەی دەزانن: (لَيْسَ في المالِ حَقٌّ سِوى الزَّكاةِ) رواه ابن ماجة، بەڵام وێڕای ئەوەی كە ئێمە پێشتر بەچەندان بەڵگەی پتەوو نكووڵی لێنەكراو سەلماندمان كە جگە لەزەكات هەقی دیكە لەماڵو سامان دا هەیە، ئەم دەقەش هیچ كام لەفەرموودەناسانی [illegible] بەفەرموودەیان دانەناوە، بۆ وێنە: (نووي) كە بۆ خۆی پشتگیری ڕای جەماوەریش دەكات

---

[20] بڕوانە: (ظاهرة الأرجاء في الفكر الأسلامي) ج٢ص٦٤٥تا٦٧٠ د.سفر الحوالي.

- کەڕای شافیعیشە لەقسەی تازە (القول الجدید)ی‌دا -، دەربارەی ئەو دەقە گوتوویەتی:[21] (واما حديث: (لَيس في المال حق سوى الزكـاة) فضعيف جداً لايُعْرَفُ، قال البيهقي في السنن الكبيرة: والذي يَرويه أصحابنا في التعاليق: (لَيْسَ في المال حق سوى الزكاة، لا احفظُ فيه إسناداً، رواه ابن ماجة لكن بسند صعيف)ئنجا هەرکام لە دەعوای نەسخ کرانەوەی فەرموودەکەی (بهز بن حكيم)، یان بە بێ‌هێز (ضعيف) دانانی‌زانایان بەرپەرچیان داونەوەو[22]، واپێ‌دەچێ ڕاست ترین ڕا ئەوەبێ کە بگوترێ:

مادام زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە دەبێ زەکات نەدەر یان دواخەر تەمبێ بکرێ[23] و زەکاتەکەشی هەر لێ‌بستێنرێ، مەسەلەی سزا دارایی‌یە (العقوبة المالية) کەش لەسنووری دەسەڵاتی فەرمانڕەوا دایەو بەئیجتیهادی خۆی‌و ئەنجوومەنی شوڕا دیاری دەکرێ، جا چ نیوەی ماڵەکەی بێ چ کەمتر.

دیارە ئەوەی ڕابرد دەربارەی زەکات نەدەرێکی تاکە، بەڵام ئەگەر هات‌و کۆمەڵێکی خاوەن هێزو دەسەڵات کە توانای بەرهەڵستی‌یان هەبێ نەچوونە ژێر باری زەکات دانەوە، ئەوە زانایان لەسەری یەکدەنگن کە دەبێ جەنگیان لەگەڵ دا بکرێ هەتا گەردن بۆ حوکم‌و بڕیاری شەرع کەچ دەکەن‌و زەکات دەدەن، جا بەڵگەی ئەو هەڵوێستە یەکدەنگی‌یەی زانایانیش بێجگە لەئاماژەی[24] قورئان دوو شتە:

<u>یەکەم</u>: فەرموودەی: (أمرتُ أن أقاتل الناس حتّى يَشهدوا أنْ لا اله الاّ الله وأن محمداً رسول الله ويقيموا الصلاة ويؤتوا الزكاة، فأذا فعلوا ذلك عَصَموا مني دمائهم وأموالَهمْ الاّ بحق الأسلام وحِسابُهُمْ على الله) رواه البخاري ومسلم عن ابن عمر رضي الله عنهما.

واتە: فەرمانم پێ کراوە کە لەگەڵ خەڵکی‌دا بجەنگم هەتا شایەتمان دێنن کە بێجگە لەخوا هیچ پەرستراو (معبود)ێك نیە، وە کە موحەممەدیش ڕەوانە کراوی خوایە، وە نوێژێ بەرپادەکەن‌و زەکاتێ دەدەن، جا ئەگەر ئەوەیان کرد ئەوە مەگەر بەهەقی ئیسلام دەنا خوێن‌و ماڵی خۆیان لە - سزاو تۆڵەی بەرنامەی - من پاراستوە، وە لێپرسینەوەشیان عایدی خوایە.

---

[21] بڕوانە: (المجموع شرح المهذب) ج٥ص٢٩٨.

[22] بڕوانە: (فقه الزكاة) ج٢ص٧٧٩ تا ٧٨٤.

[23] بڕوانە (فقه الزكاة) ج٢ص٧٧٩.

[24] مەبەست ئایەتی: (فان تابوا واقاموا الصلاة وآتوا الزكاة فخلوا سبيلهم) التوبة:٥، یە.

دووەم: هەڵوێستی (ابوبکر الصدیق) خوا لێی ڕازی بێ کەپاش کۆچی دوایی پێغەمبەری خوا صەڵاوات و سەلام و بەرەکاتی خوای لەسەر بێ، لەدژی هەڵگەڕاوان (مرتدین) و زەکات نەدەران (مانعي الزكاة) جاڕی جەنگی داو (عمر بن الخطاب) خوا لێی ڕازی بێ ڕەخنەی لێگرت و فەرموودەی (أمرتُ أن أقاتل الناسَ حتى يشهدوا أنْ لا اله الا الله ويؤمنوا بي، وبما جِئْتُ بِهِ، فاذا فعلوا ذلك عصموا منيَ دماءهمْ وأموالَهُمْ إلا بِحَقِها وحِسابُهُمْ على الله) متفق عليه عن ابي هريرة رضي الله عنه، بە بەڵگە هێنایەوەو گوتی: چۆن جەنگ لەگەڵ خەڵکیدا دەکەی لەسەر زەکات نەدان، لەکاتێک دا کەپێغەمبەری خوا ﷺ ئاوای فەرمووە؟ ئەبووبەکریش گوتی: (والله لأُقاتِلَنَّ مَنْ فرَّقَ بَيْنَ الصلاة والزَّكاة، فأن الزكاة حَقُّ المالِ، والله لو مَنَعوني عناقاً كانوا يؤدونَها لرسول الله لَقاتلتُهُمْ على منعها) واتە: بەخوا لەگەڵ کەسانێک دا دەجەنگم کە جیاوازی‌یان خستۆتە نێوان نوێژو زەکاتەوە، چونکە زەکاتیش هەقی ماڵ و سامانە، بەخوا لەسەر کاریلەیەک کە کاتی خۆی داویانە بەپێغەمبەری خوا ﷺ و ئێستا نەمدەنێ لەگەڵیان دەجەنگم، ئنجا عومەر گوتوویەتی: (فو الله ماهو الا أن قَدْ شرح الله صَدْرَ أبي بكرٍ للقتالِ، فَعَرفتُ أنه الحَق) رواه الجماعة الا ابن ماجة، واتە: بەخوا هەر کە دیتم خوا سینەی ئەبووبەکری بۆ جەنگ کردن – لەگەڵ زەکات نەدەران – گوشاد کردوە زانیم کەهەر ئەوە هەق و ڕاستە.

ئاشکراشە کە سەرەنجام ئەو هەڵوێستەی[25] ئەبووبەکر وعومەر خوا لێیان ڕازی‌بێ تێکڕای هاوەڵان خوا لێیان ڕازی‌بێ لەسەری کۆک و یەکدەنگ بوون و بەوجۆرە ئەو مەسەلەیە وێڕای بەڵگەی قورئان و سوننەت بەڵگەی (إجماع)یشی لەسەر دروست بوو[26].

---

[25] وا دیارە تا ئەو کاتە (ابوبکر و عمر) خوا لێیان ڕازی‌بێ ئەو فەرموودەیەی کە (ابن عمر) هێناوییەتی پێیان نەگەیشتوە نەگەرنا لەوبارەوە مشت و مڕیان نەدەکردو نە (عمر) ڕەخنەی دەگرت و نە (ابوبکریش) خوا لێیان ڕازی‌بێ بەقیاس کردنی زەکات بۆ سەر نوێژ بەڵگەی دەهێنایەوە، بڕوانە: (نيل الأوطار) ج٤ص١٧٨، هەروەها قسەکەی (ابوبکر)یش ئەوە دەگەیەنێ کەجەنگ لەگەڵداکرانی کۆمەڵێکی نوێژنەکەر – یا بڵێن بڕواشمان پێیەتی – لەنێو هاوەڵان دا شتێک بووە جێگای یەکدەنگی (اتفاق) بووە ئەگەرنا (ابوبکر) نەیدەکردە بەڵگەو قیاس لەسەرکراو (مقيس عليه) حوکمی زەکات نەدان.

[26] دەربارەی حوکمی زەکات نەدان بڕوانە: (المجموع)ج٥ص٢٩٦تا٣٠٢، وە بڕوانە: (نيل الاوطار) ج٤ص١٧٠تا١٨٢، وە بڕوانە (فقه السنة) ج١ص٤٦٦، ٤٦٧.

## ٣-زەكات لەكێ وەردەگیرێ؟!

زانایانی ئیسلام لەسەر ئەوە یەكدەنگن كە لەسەر هەر مسوڵمانێكی عاقڵو باڵغو ئازاد كە خاوەنی ئەندازەیەك ماڵو سامان بێ كە شەرع زەكاتی تێدا فەرز كردوە بەو مەرجانەوە كە باس كراون، پێویست دەبێ[٢٧].

وە لەسەر ئەوە یەكدەنگن كە لەسەر غەیری مسوڵمان فەرز نیە، چونكە وەك پێشتر گوتمان زەكات دان یەكێكە لەپێنج پایە گرنگەكانی ئیسلامەتی و كەسێكیش بڕوای بەئیسلام نەهێنابێ، پابەندبوونی بەڕێساو یاساكانی (الدساتیر والأحكام)ی‌یەوە لەسەر پێویست ناكرێ، هەروەها هەر كاتێكیش بابای نامسوڵمان هاتە نێو ئیسلامەوە داوای لێ ناكرێ كە وەك قەرز دانەوەی ساڵانی ڕابردوو زەكات لەماڵو سامانی دەربكات[٢٨].

باشترین بەڵگەش لەوبارەوە ئەو فەرموودەیەیە كەپێشتر لەخاڵی یەكەم دا هێنامانەوەو[٢٩] پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمان بە (معاذ) دەكات كە سەرەتا خەڵكی نامسوڵمان بۆ مسوڵمان بوونو شایەتمان هێنان بانگ بكات، ئنجا كە هاتنە نێو ئیسلامەوە نوێژكردنو زەكات دانیان بخرێتە بەرچاو، كەواتە – وەك زانایان گوتوویانە – پێش مسوڵمان بوون بابای كافر ئەركو بەرپەرسیارێتی بەرانبەر بە پایەو فەرزەكانی ئیسلام ڕووی تێناكات[٣٠].

ئنجا نەك هەر زەكات لەسەر غەیری مسوڵمان پێویست نیە، بەڵكو ئەگەر بەنیازی خواپەرستی‌یەوە بابای نامسوڵمان زەكاتیش بدات لێی وەرناگیرێو هیچی لەلای خوا بۆ حیساب ناكرێ، چونكە شتێكی ڕوونە كەبەبێ ئیمان كردەوە باشەكان وەك دیواری بێبناغە وانو دانامەزرێن.

بەڵام دەربارەی زەكات دران لەماڵو سامانی منداڵو شێت (الصبي والمجنون) زانایان ڕایان جیاجیایە، هەرچی زۆربەو جەماوەریانن وەك (نووي)[٣١] گوتوویەتی كە هەركام لە (مالك و ثوري و شافعي و أحمد و إسحاق و ابوثور)یشیان لەنێودان ڕایان وایە كە ماڵو سامانی ئەوانیش زەكاتی لێدەدرێ، هەندێكیشیان دەڵێن لێی نادرێ كە (ابوحنیفة) یەكێك لەو زانایانەیە.

هەڵبەتە بەسەرنج دانی بەڵگەكانی هەردووك لاشیان بەڕوونی دەزانرێ كەڕای جەماوەر بەهێزترە چونكە:

---

[٢٧] بڕوانە (المجموع) ج٥ص٢٩٠.

[٢٨] هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص٣٠٢.

[٢٩] ئەو فەرموودەیە (بخاري ومسلم) گێڕاویانەتەوە.

[٣٠] بڕوانە: (المجموع) ج٥ص٢٩١، ٢٩٢

[٣١] هەمان سەرچاوە ج٥ص٢٩٦.

١-ئایەتی: (خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِمْ بِهَا وَصَلِّ عَلَيْهِمْ إِنَّ صَلاتَكَ سَكَنٌ لَهُمْ وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ) التوبة:١٠٣، **حوکمەکەی گشتی‌یەو هیچ هەڵاواردن (إستثناء)ی تێدا نیە.**

**٢-پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إِتَّجِروا في أموالِ اليَتامىٰ لاتَأكُلْها الزكاةُ)** رواه الطبراني عن انس بن مالك، **واتە: بازرگانی‌و مامەڵە بەماڵی هەتیوان بکەن با زەکات تەواوی نەکات.**

**هەر هەمان مەبەستیش (شافعي) لە (یوسف بن ماهك) ئەویش لەپێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕاویەتەوە، کە هەرکام لە (بیهقي و نووي) گوتوویانە: (إسنادە صحیح) ئەوەندە هەیە (یوسف بن ماهك) یەکێکە لە (تابعین) و پێغەمبەری ﷺ نەدیوە بۆیە ئەو فەرموودەیە بەجۆری (مُرْسَلْ) دادەنرێ.**

**٣-زەکات دوو لایەنی هەیە: لایەنێکی عیبادی‌و شەخسی، وەلایەنێکی کۆمەڵایەتی، جا ئەگەر (منداڵ‌و شێت) لەزەکات دانیان دا لایەنە عیبادی‌و شەخسی‌یەکەیان تێدا نیە، ئەوە بێگومان لایەنە کۆمەڵایەتی‌یەکە لەزەکات دانەکەدا هەیەو بۆ سوودو بەرژەوەندی‌و کەلێن گرتنی خەڵکی زەکات پێ‌شیاو، جیاوازی لەنێوان ماڵی منداڵ‌و شێت‌و خەڵکی دیکەدا نیە.**

**بۆیە ئەو قسەیەی کە (ابو حنیفە)و هاوڕایەکانی بە بەڵگەی دێننەوە، کە (منداڵ‌و شێت نیازی خواپەرستی (نیة العبادة)یان نیەو زەکاتیش جۆرێکە لەجۆرەکانی خواپەرستی) بە لەبەرچاوگرتنی ئەم بەڵگەی سێیەمە هێزو پێزێکی وای نامێنێ[٣٢].**

## چوار: زەکات لەچی‌و چی دەدرێ‌و چەندە وەردەگیرێ؟!

**خوێنەری بەڕێز! ئەم بڕگەیە هەم لەڕووی گرنگی‌و بایەخ‌و هەم لەڕووی قەبارەشەوە بەکاکڵ‌و جەوهەری باسی زەکات دادەنرێ، بۆیە بە پەسەندی دەزانم کە بۆ ڕێ بۆخۆشکردن‌و چوونە نێوی لەدوو ڕوونکردنەوەدا هەم پێناسەی ماڵ‌و سامان بکەم‌و، هەم مەرجە گشتی‌یەکانی زەکات دانیش بخەمەڕوو:**

**١-ڕوونکردنەوەی یەکەم: ماڵ‌و سامان چی‌یە؟!**

**مادام خوای پەروەردگار فەرموویەتی: (خُذْ من أموالِهِمْ صدقــة...)** التوبة:١٠٣، **کەواتە هەر شتێك لەزمان‌و عورف یان زاراوی شەرع دا بەماڵ (سامان) دابنرێ زەکاتی لێ‌دەدرێ، وشەی (ماڵ) یش کە کۆیەکەی (أموال)ە لە فەرهەنگەکانی زمانی عارەبی‌دا ئاوا پێناسە کراوە:[٣٣] (المالُ: كُلُّ مايملكه الفَرْدُ أَوْ تَمْلِكُه الجماعَةُ من مَتاعٍ او عروضِ تِجارةٍ او عِقارٍ او**

---

[٣٢] بڕوانە: (فقه الزكاة) ج١ص١٠٥تا١١٩.

[٣٣] ئەمە دەقی (المعجم الوسيط )ە ص٨٩٢، وە بڕوانە: (لسان العرب) وشەی (مال) وە (القاموس المحيط) ج٤ص٥٢، وە: (النهاية في غريب الحديث والأثر) ج٤ص٣٧٣. ابن الأثير.

نقودِ او حَيْوانٍ) واته: ماڵ (سامان) بریتیە لەهەر شتێك كە تاك یان كۆمەڵ خاوەنیەتی لەشمەكو كەلوپەل یان ئەو شتانەی بازرگانیيان پێدەكرێ، یان زەوی‌وزار یان دراو یان ئاژەڵ.

بەڵام شەرعزانان (الفقهاء) لەپێناسەی ماڵو سامان دا ڕایان جیاوازە، هەرچی زۆربەن كە (شافیعی‌یەكانو مالیكی‌یەكان و حەنبەلی‌یەكان)یشیان لەنێودان ڕایان وایە كە هەر شتێك جێگای سوودو كەڵك لێوەرگرتن بێو ئەسڵو سەرچاوەكەی لەبەردەست دابێ، ئەوە ماڵە، بۆ وێنە: كەسێك كە سەییارە یان خانوو یان زەوی یەكێكی دیكەی بەدەستەوەیەو لێی بەهرەمەند دەبێ - بەپێی ئەم پێناسەیە - لەدەمی سوودو كەڵك لێوەرگرتنی‌دا بەموڵكی وی دادەنرێ، بەڵام حەنەفی‌یەكان دەڵێن هیچ شتێك بەماڵ (سامان) دانانرێ هەتا دوو مەرجی تێدا نەیەنەدی؛ یەكەم: بخرێتە ژێر ڕكێفو كۆنترۆڵەوە، دووەم: بەشێوەیەكی ئاسایی سوودو كەڵكی لێوەربگیرێ، بەڵام هەر شتێك یەكێك لەو دوو مەرجەی تێدا نەبن بەماڵ دانانرێ بۆ وێنە: تیشكی خۆر چونكە ناخرێتە ژێر ڕكێفو دەستەڵاتەوە، هەرچەندە ئەوپەڕی سوودو كەڵكی لێوەردەگیرێ بەموڵكو ماڵ دانانرێ هەروەها چەنگە خۆڵێكو دەنكە گەنمێك هەرچەندە لەژێر ڕكێفو لەچنگ دابن، لەسۆنگەی بێ كەڵكیو بەرژەوەندی پێ دابین نەكرانەوە، دیسان بەموڵكو ماڵ دانانرێن.

دیارە دوای سەرنج دانو وردبوونەوەش دەردەكەوێ كە پێناسەی حەنەفی‌یەكان ڕاست ترو واقیعی‌یانەترەو چاكتریش بەسەر زەكات دا دەچەسپێ، چونكە زەكات دەبێ خودی شتان (اعیان الأشیاء) بێت، نەك سوودو كەڵكەكەیان، بۆیە زانایان دەڵێن: كەسێك لەجیاتی زەكات هەژارێك بخاتە خانووەكەیەوە، بۆی وەبری زەكات ناكەوێ هەرچەندە كەڵكیشی لێوەردەگرێ، چونكە خودی شتێكی تەسلیمی بابای زەكات پێشیاو نەكردوە، بەڵكو تەنیا دەرفەتی بەهرە لێوەرگرتنی شتێكی بۆ ڕەخساندوە، بەڵام زەكات دەبێ خودی شتێكی بەهاداری سوودبەخش (عینُ شيء مُتَقَوَّمه ذاتُ نفعٍ) بێت[٣٤].

**٢-ڕوونكردنەوەی دووەم: مەرجە گشتی‌یەكانی زەكات دان[٣٥]**

خوای كاربەجێ زەكاتی لەهەر جۆرە ماڵێك دا پێویست نەكردوە، بەڵكو زەكاتی لەماڵو سامانێك دا فەرز كردوە كەچەند مەرجێكی تایبەتی تێدا هاتبنەدی، ئەو مەرجانەش بەكورتیو پوختی ئەمانەن،

---

[٣٤] بروانە: (فقه الزكاة) ج١ص١٢٥،١٢٦.

[٣٥] بۆ نووسینی ئەم باسە سوودێكی باشم لە (فقه الزكاة) ج١ص١٣١تا١٦٦، وەرگرتوە هەرچەندە سەرجەم كتێبە شەرعی‌یەكان ئەو مەرجانەیان باس كردوون، بروانە (الفقه الأسلامي...) ج٣ص١٧٩٧ هەتا ١٨١، ط٤.

### ١- خاوەنێتی تەواو (الملك التام):

واتە: ماڵ و سامانێك زەكاتی تێدا پێویست دەبێ كەخاوەنەكەی بەبێ هیچ پەرچ و بەند (مانع وقید)ێك خستبییە ژێر ڕكێفی خۆیەوەو هەق و مـاف و دەستەڵاتی هیچ كەسی دیكەی بەسەرەوە نەبێ و بەتەواوی بتوانێ لەقازانج و كەڵكەكانی بەهرەمەند بێت، بەڵگەی ئەم مەرجەش ئەوەیە كە خوای كاربەجێ و پێغەمبەری پێشەوا ماڵ و سامانەكانیان پاڵداوەتە لای خاوەنەكانیان: (خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِمْ بِهَا وَصَلِّ عَلَيْهِمْ إِنَّ صَلَاتَكَ سَكَنٌ لَهُمْ وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ) التوبة:١٠٣، وە: (إن الله فرض عليهم في أموالِهِمْ..) متفق عليه، كەواتە ئەو ماڵ و سامانەی كە زەكاتی لێدەدرێ دەبێ بەتەواوی لەژێر ڕكێف و (تصرف)ی خاوەنەكەی دا بێت.

دیارە بەم مەرجی یەكەمەش چەند جۆرە ماڵ و سامانێك لەزەكات لێدران هەڵداوێررێن بۆ وێنە:

ا- ماڵێك كە خاوەنێكی تایبەتی و دیاریكراوی نەبێ، وەك ماڵ و سامانی میری و دەزگا خێرخوازییەكان.

ب- ماڵ و سامانی وەقف كراو بەشێوەیەكی گشتی، بەڵام وەقفی تایبەت حوكمەكەی جیایە.

ج- ماڵ و سامانی حەرام بەهەموو جۆرەكانییەوە، چونكە لەڕووی شەرعییەوە حەرام بەموڵك دانانرێ.

د- ماڵێكی قەرز كە ئومێدی وەرگێڕانەوەی لێ نەكرێ (دَيْنٌ غير مَرْجوّ).

### ٢- گەشەكردن (النَّماء):

مەبەست لەم مەرجەش ئەوەیە كە ئەو ماڵ و سامانەی زەكاتی لێدەدرێ، دەبێ وابێ كە بگونجێ بۆ زیادكردن و بەرهەمداری و گەشەكردن، بەڵگەی ئەم مەرجەش ئەوەیە كە پێغەمبەری خوا ﷺ و جێنیشینە سەر ڕاستەكانیی خوا لێیان ڕازی بێ زەكاتیان لەو جۆرە ماڵ و كەلوپەلانە وەرنەگرتوە كەشتی تایبەتی و شەخسی بوو ون، وەك لەم فەرموودەیەش دا هاتوە: (لَيْسَ على المُسْلِم في فَرَسِه ولا عَبْدِه صَدَقَةٌ) متفق عليه، كە (نووی) لەشەرح و ڕاڤەی ئەم فەرموودەیەدا گوتوویەتی:[٣٦] (هذا الحديث أصلٌ في أن أموال القُنْيَة لازكاة فيها) واتە: ئەم فەرموودەیە بنچینەیە لەوبارەوە كە ماڵ و كەلوپەلی تایبەتی زەكاتی تێدا نیە.

---

[٣٦] بڕوانە: (شرح صحيح مسلم) ج٤ص٢٧٠٨.

هەڵبەتە هەرکام لەبەروبوومی کشتوکاڵی و میوەجاتو ئاژەڵو پارەی نەغدینەو ماڵی بازرگانیو کانزاو خەزنەش ماڵو سامانێکن کەیان بەکردەوە لەگەشەو زیادی دان، یان لەبارانیان دا هەیە کە گەشە بکەن، دیارە جۆرە ماڵو سامانی دیکەش هەن کە ئەم مەرجەیان تێدایەو لەبەندی دووەم دا بەدرێژی باسیان دەکەین.

*٣-گەیشتنە ئەندازەی زەکات لێکەوتن (النِّصاب)*[٣٧]:

مەرجێکی دیکەی زەکات دان ئەوەیە کە ئەو ماڵەی زەکاتی لێ دەدرێ گەیشتبێتە ئەندازەیەکی تایبەت کە خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ دیارییان کردوە، بۆ وێنە: حوشتر هەتا ژمارەیان نەگاتە پێنجو مەرو بزن هەتا نەگەنە چل سەرو دانەوێڵە هەتا نەگاتە پێنج وەسق... زەکاتیان لێ نادرێ، کە دواتر بەدرێژی باسیان دەکەین.

گەیشتنە رادده (نــصاب) یش بۆ زەکات لێدرانی هەموو جۆرەکانی ماڵو سامان بێجگە لە بەروبومی کشتوکاڵو میوەجاتو کانزاو خەزنە زانایان لەسەری یەکدەنگن، بەلام هەندێك لەزانایان – بۆ وێنە (ابوحنیفة) رایان وایە کەبەروبوومی کشتوکاڵو میوەجاتو کانزاو خەزنە ئەم مەرجەیان تێدا بەمەرج نەگیراوەو لەکەمو زۆریان زەکات دەدرێ، بەلام رای زۆربەو جەماوەری زانایان بەهێزترە وەك دوایی روونی دەکەینەوە.

*٤-زیادبوون لەپێداویستی‌یە بنەرەتی‌یەکان (الزيادة عن الحاجات الأصلية):*

مەبەست لەم مەرجەش ئەوەیە کە بابای زەکات دەر ئەگەر بێتو ئەو ماڵو سامانەی کە زەکاتی لێ‌دەدات بۆ ژیانو گوزەرانی خۆیو ئەوانەی مەسرەف کێشانیان لەسەرێ پێویستە، پێی ئاتاج بوون واتە ماڵو سامانەکەی هەر بەشی ئەوەی دەکرد کە پێداویستی‌یە بنچینەیی‌یەکانی ژیانو گوزەرانی خۆیو خێزانیو ئەوانەی شەرع مەسرەف کێشانیانی خستۆتە سەرشانی، پێ‌دابین بکات، ئەوە ئەو ماڵو سامانەی زەکاتی تێدا فەرز نابێ‌دیارە ئەمەش رای بەشێکە لەزانایان کە حەنەفی‌یەکانیان لە نێودان، وە زانایانی دیکە کە زۆربەن ئەم مەرجەیان بەپێویست نەزانیوەو گوتوویانە: مەرجی دووەم (گەشەکردن – النماء –) جێگای ئەم مەرجەش دەگرێتەوە، چونکە هەموو ئەو شتانەی کە ئینسان پێویستی پێیانەو پێداویستی بنەرەتی ژیانو گوزەراننی، حاڵەتی وەستان (جمود)یان هەیەو ناگونجێ گەشەبکەنو زیادبکەن، بۆ وێنە:

---

[٣٧] وشەی (النصاب) لە ئەسڵی زمان دا یانی (الأصل والمرجع) شەرعزانانیش وەك زاراوەیەك بۆ ئەندازەی زەکات لێکەوتنی هەرجۆرە ماڵێك کردوویانە بەناوو بەکاریان هێناوە، بڕوانە (المعجم الوسيط) ص٩٢٥.

خانوو و بەرەی تێدا نیشتەجێبوون، وڵاخ یان وەسیلەی سواربوون، بەرگو پۆشاك، چەكو چۆڵی بەكارهێنان، كتێبو سەرچاوەكانی زانست، ئامرازو ئامێرەكانی پیشەوكار.. هتد.

وە گوتوویانە ئەو پێویست بوونو پەك لەسەركەوتنە شتێكی نادیارو پەنهانەو ناگونجێ بكرێتە مەرج، بۆیە ئەوەی كە نیشانەو بەڵگەی پێویست نەبوونو سەرتێنەوەستانە كە دانانی ماڵو سامانە بۆ گەشەكردن، كراوە بەپاساو (مُبَرِّر)ی زەكات لێدران، وە هەر شتێك ئەو بەڵگەو نیشانەیەی تێدا نەبێ پاساوی زەكات لێدرانی تێدا نیە.

بەڵام لەڕاستیدا ئەم مەرجە پێویستە هەبێ چونكە، هەموو لایەك لەسەر ئەوە یەكدەنگن كە ماڵی نەغدینە ئەگەر خاوەنەكەشی بەكردەوە مامەڵەو بازرگانی پێنەكات لەسۆنگەی ئەوەوە كە هەر بەسروشت گەشەكردنو بەرهەم هێنانی لەباران دا هەیە زەكاتی لێدەدرێ، جا ئەگەر ئەم مەرجە نەبێ، دەبێ هەركەسێك بەڕادەی (نصاب) ماڵی نەغدینە (زێڕ، زیو، دراو، چەك)ی هەبێ هەرچەندە بۆ پێداویستییە بنەڕەتییەكانی خۆیو خێزانیو ئەوانەی بەئەستۆیەوەن – وەك خواردنو خواردنەوەو بەرگو پۆشاكو دەرمانو چارەسەرو نیشتەجێكردنو پێخوێندنو... هتد – پەكیشی لەسەریكەوتبێ، پێویست بێ زەكاتی لێدەربكات!! بەڵام وەك لەدەقەكانی قورئان و سوننەت دا دەبینرێ زەكات لەبابای دەوڵەمەند وەردەگیرێو بەسەر هەژارو نەدارو... هتد دا دابەش دەكرێ، ئاشكراشە كەسێك هەر هێندەی هەبێ كە خۆیو ئەوانەی بەئەستۆیەوەن پێی بەڕێوەبچن بەدەوڵەمەند دانانرێ!

وە زانایانێك كە ڕایان وایە مەرجی ناوبراو بەمەرج بگیرێ پێناسەیەكی وردو جوانیان بۆ پێداویستییە بنەڕەتییەكان (الحاجات الأصلية) كردوەو گوتوویانە:[38]

(هي مـايَدْفَعُ الهلاك عن الأنسان تحقيقاً: كالنفقة ودور السُكنى وآلات الحرب والثياب المحتاج إليها لدفع الحر والبرد، او تقديراً: كالدَينِ فأن المَدِيْنَ يحتاج الى قضاءه بما في يده من النصابِ ليدفع عن نفسه الحَبْسَ الذي هو كالهَلاك، وكآلات الحرفة وأثاث المَنزِلِ ودواب الركوب وكتب العلم لأهلها، فأن الجهل عندهم كالهلاك، فأذا كان له دراهم مُسْتَحَقَةٌ ان يَصْرِفَها الى تلك الحوائج صارت كالمعدومة، كما ان الماء المستحق بِصَرْفِه الى العطش كان كالمعدوم وجاز عنده التَّيمُمُ.)

---

[38] بڕوانە: (فقه الزكاة) ج١ص١٥٢، ١٥٣ كە لە (حاشية بن عابدين) ج٢ص٦ و (الحجر الرائق) ج٢ص٢٢٢ وەریگرتووە.

واتە:- پێداویستییە بنەڕەتییەکان - بریتین لەو شتانەی کە بەمسۆگەری فەوتانو لەبەین چوون لەئینسان دوور دەخەنەوە، وەك: مەسرەف کێشانو خانوو بەرەی تێدا دانیشتنو ئامرازەکانی جەنگو بەرگو پۆشاکێك کەپێویستە بۆ خۆپاراستن لەگەرماو سەرما، یان بەوادانان (تقدیر) وەك: قەرز چونکە بێگومان بابای قەرزدار پێداویستی بەو ئەندازە ماڵە بە (نصاب) گەیشتووە هەیە کەبەدەستیەوەیە بۆئەوەی حەپسێك لەخۆی دووربخاتەوە کە وەك فەوتان و مەرگ وایە، وە وەك ئامێرو کەلوپەلی پیشەو کارو شمەکی نێو ماڵو ولاخی سواریو کتێبەکانی زانیاری بۆ خەڵکی خۆی، چونکە نەزانییان پێ وەك لەنێوچوون وایە[39]، جا ئەگەر چەند درەمێکی هەبێ کە پەکی لەسەریان کەوتبێ بۆ ئەو جۆرە پێداویستییانە، ئەوە دەکەونە حوکمی نەبوونەوە، هەروەك چۆن کەسێك ئەندازەیەك ئاوی پێبێ کە لەبەر تینوێتی پیویستی پێی بێ ئەوە حوکمی کەسێکی هەیە کە ئاوی پێنیەو بۆی دروستە کە تەیەمموم بکات.

بەڵگەی ئەم مەرجەش وێڕای حوکمی عەقڵ ئەم دەقانەی خوارەوەن:-

١- (يَسْأَلُونَكَ عَنْ الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ قُلْ فِيهِمَا إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَإِثْمُهُمَا أَكْبَرُ مِنْ نَفْعِهِمَا وَيَسْأَلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ قُلْ الْعَفْوَ كَذَلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمْ الآيَاتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ) البقرة:٢١٩، واتە: وە لێت دەپرسن چی ببەخشن؟ بڵێ - ئەوەی کە لێتان - زیادە..

چونکە وشە (عَفْو) وێڕای فەرهەنگەکانی[40] زمان توێژەرەوانی[41] قورئانیش هەر بە: (مازاد على النفقة) و (مايَفْضُلُ عنْ أهلك) مانایان کردوە، دیارە حیکمەتی خوای پەروەردگاریش هەر ئەوەی لێ چاوەڕوان دەکرێ کەبەخشینی ماڵو سامانێك لەسەر ئینسان فەرز نەکات کە بۆ خۆی پێی ئاتاجەو پەکی لەسەری کەوتوە.

٢-(عن ابي هريرة رضي الله عنه أن النبيَّ ﷺ قال: **إنّما الصَّدقةُ عن ظَهْرِ غِنىً**) لەریوایەتێکی دیکەش دا: **(لا صَدَقَة الا عن ظَهْرِ غِنيً)** رواه احمد و صححه احمد شاكر.

واتە/ زەکات دان - یان ماڵ بەخشین - تەنیا لەحاڵەتی دەوڵەمەندیدایە.

---

[39] مەبەست لێرەدا لەڕاناوی سەر (نەزانییان) زاناو شەرعزانانی ئیسلامە هەزار ئافەرینیان لێبێ.

[40] بڕوانە: (المعجم الوسيط) ص٦١٢.

[41] بڕوانە: (تفسير القرآن العظيم) ابن كثير، ج١ص٢٥٦، کە تەفسیری ناوبراوی بۆ وشەی (عفو) لەهەرکام لە (ابن عباس وابن عمرو مجاهد عكرمة وسعيد بن جبيرو حسن وقتادة...)وە گێڕاوەتەوە.

٣-(عن جابرٌ رضي الله عنه أن رسول الله ﷺ قال لِرَجُلٍ إبدأ بنفسك فتَصَـدّقْ عليها فـان فضَـلَ شيئٌ فلأهلِكَ، فان فضَلَ شيئ عن أهلك فلذوِيْ قرابَتكَ، فانْ فضَلَ عن ذوي قرابتـكَ شـيئٌ فـهكذا وهكذا) رواه مسلم.

واته: لەخۆتەوە دەست پێبکەو پـێی ببەخشە، جا ئەگەر شتێك زیادبوو، ئەوە با بۆ خاوو خێزانت بێ وە ئەگەر شتێك لەخاوو خێزانیشت زیادبوو با بۆ خزمەكانت بێ، وە ئەگەر لەخزمەكانیشت شتێك مایەوە ئەوە بەملاولادا بیبەخشە.

جا هەرچەندە ئەو فەرمودانە ڕەنگە زیـاتر مـاڵ بەخشـینی سـوننەت بگرنـەوە، بـەڵام هەرچۆن بێ بەگشتی چۆنیەتی ماڵ بەخشینی – چ فەرز بێ چ سوننەت – مان فێر دەكەن.

*٥-قەرزدار نەبوون:*

پێنجەمین مـەرجی گشتی بۆ پێویست بوونـی زەكات ئەوەیە كە بابای خـاوەن مـاڵ و سامان هێندەی قەرز لەسەر نەبێ كە ماڵو سامانەكەی لەڕاددەی (نصاب) كـەم بكاتـەوە، جـا هەرچـەندە زانایـان لەسـەر ئـەوە كـە ئایـا قـەرزدار بـوون كاریگـەری لەسـەر هـەموو جۆرەكانی مـاڵو سـامان هەیە بەئاشكراو پەنهانەوە، یان كاریگـەری تەنها لەسـەر مـاڵی ئاشكرا هەیە یان لەسەر هیچ جۆرێكی نیە، ڕایان جیا جیایە، بەڵام زۆربەو جەماوەریان ڕایان وایە كە بابای قەرزدار زەكاتی لەسەر نیە، بەڵام بەو مەرجەی قەرزەكە هێندە ببێ كە ماڵەكەی لە ئەندازەی (نصاب) بهێنێتە خوارێو جۆرە ماڵو سامانی دیكەشـی نـەبێ كە قەرزەكـەی لـێبداتەوە، لەبـەندی دووەمیـش دا لـە (برگـە)یـەكی سـەربەخۆدا باسـی ئـەم مەسەلەیە دەكەین بۆیە لێرەدا بەم ئەندازەیە لێی دەگەڕێین.

ئاشكراشە كە مەرجی چوارەم ئەم مەرجی پێنجەمەش دەگرێتە نێو خۆی، بەڵام بۆ زێدە داكۆكیو بەرچاو ڕوونی، بەتایبەتیش خستمانەڕوو.

*٦-ساڵ بەسەردا وەرسووڕان:*

مەرجی شەشەمو كۆتایی زەكات دران لەماڵو سامان بریتیە لە وەرسووڕانەوەی سـاڵ (حَوَلانُ الحول) واتە: دەبێ ئەو ماڵەی كە زەكاتی لـێدەردەكرێ دوازدە مانگی عـارەبی بەسەردا تێپەڕ بووبن، ئەوجار لەكۆتایی ئەو دوازدە مانگەدا زەكاتی تێدا فەرز دەبێ، جا دیارە ئەم مەرجەش بۆ ئاژەڵو پارەی نەغدینەو ماڵی بازرگانی، سەرجەم زانایانی پێشینو پاشین (السلف والخلف) لەسەری یەكدەنگنو هەموویان لەسەر ئەوە كۆكن كە لەساڵێك دا تـەنیا جارێك زەكاتیان لـێدەدرێ، (إبـن أبـي شـيبة) لـەوبارەوە ئـەم دەقـەی لـە (زهـري)

گێڕاوەتەوە:[42] (لَمْ يَبْلُغْنا عن احد من ولاة هذه الأمة الذين كانوا بالمدينة – ابوبكر وعمر وعثمان – انهم كانوا يُثْنُون الصدقة لكن يَبْعثون عليها كلّ عام في الخصب والجدب لأن اخذها سنة من رسول الله ﷺ) واتە: لەهیچ کام لەمشوورگێڕانی ئەم ئوممەتە کە لە مەدینە بوون – ئەبوبەکر وعومەرو عوسمان – پێمان نەگەیشتوە کە – هیچ ساڵێك – زەکاتیان دووبارە کردبێتەوە، بەڵکو هەموو ساڵێك هات بوو بێ یان نەهات جارێك ناردوویانەو کۆیان کردۆتەوە، چونکە وەرگرتنەکەی – بەوشێوەیە – ڕێسایەکە لەپێغەمبەری خواوە ﷺ هاتوە.

هەروەها تێکڕای زانایان لەسەر ئەوەش یەکدەنگن کە بەروبومی کشتوکاڵ و میوەجاتو کانزاو خەزنەو هەنگوینو بەرهەمی دەریا، ساڵ بەسەردا وەرسووڕانەوەیان تێدا بەمەرج نەگیراوەو لەکاتی حاسەڵات هەڵگیران دا زەکاتیان لێدەردەکرێ.

بەڵام ئەوەی کێشەو مشتومڕی لەسەرە بریتیە لەماڵو سامانی وەدەست هێنراو (المال المُسْتفاد) کە بریتیە لەوجۆرە ماڵو سامانەی کە لەمیانەی ساڵ (خلال السنة) دا دێتە دەست ئینسان، وەك: موچەو یارمەتیو کرێو خەڵاتو دیاریو دەست کەوتو ... هتد، کە ئەمیش هەرچەندە زانایان تێیدا جیاوازن، بەڵام ڕای بەهێزتر ئەوەیە کە مادام مەرجەکانی زەکات دان هاتبنەدی پێویستە زەکاتی لێبدرێ، جا لەبەرئەوەی لە دوو برگەی سەربەخۆی بەندی دووەم دا ئەم مەسەلەیەمان توێژیوەتەوە لێرە قسەی لێناکەینو خوێنەری بەڕێز حەواڵەی ئەوێ دەکەین.

جا خوێنەری سەنگین! ئێستا کە زانیمان ماڵو سامان لەڕوانگەی شەرعەوە چییەو مەرجە گشتییەکانی زەکات دانیش چین! کاتی ئەوە هاتوە کەبچینە نێو توێژینەوەی باسی: (زەکات لە چیو چی دەدرێو چەندە وەردەگیرێ؟!)، پێویستە ئەوەش بگوترێ کە ئەوپەڕی حیکمەت لەو مەرجە گشتییانەدا دەبینرێ کە بەرنامەی خوا بۆ پێویست بوونی زەکات بەمەرجی گرتوونو دادگەریو واقیع بینی شەریعەتی خوا لەو یاسایەش دا وەك سەرجەم ڕێساو یاسایەکانی دیکەی وەك ڕۆژی ڕوون دیارە، هیواداریشم چاك چاك لێیان وردبیەوەو جوان جوان لێیان حاڵی بی، چونکە پەیوەندی بە هەموو برگەکانی ئەم برگەی چوارەمەوە هەیە کە وەك پێشتریش گوتمان بەکاکڵو جەوهەری باسی زەکات دادەنرێ – کە لەم بەندی یەکەمەدا دەیخەینەڕوو.

---

[42] بروانە: (فقه الزكاة) ج١ص١٦٤، کە لە (كَنزُ العُمال) ج٦ص٢٩٤ وەری گرتوە.

## ١-ماڵی نەغدینە (الأموال النقدية)

ئاشكرایە كە لە ڕۆژگاری پێغەمبەری خوادا ﷺ ماڵی نەغدینە تەنیا زێڕو زیو (الذهب والفضة) بووە، هەر بۆیەش لەزۆر لە دەقەكانی قوڕئانو سوننەت دا باسی ئەو دووانە كراوە، چونكە دیناری زێڕو درهەمی زیو یەكەمیان دراو (عُمْلَة)ی وڵاتی ڕۆمو دووەمیان دراوی وڵاتی فارس بووە[٤٣]، بەڵام لەم یەك دوو سەدەی دواییدا لەسەرتاوە دراوی كانزایی (العملة المعدنية) و پاشان دراوی قاقەز (النقود الورقية) شوێنی زێڕو زیویان گرتەوە، چونكە بێگومان هەڵسوكەوتو مامەڵەو بازرگانی بە دراوی قاقەزی زۆر سێناترو بارسووكی ترە لەمامەڵەو بازرگانی بەدراوی كانزایی.

جا هەرچەندە ئێستا زێڕو زیو وەك پارەو دراو بەكارناهێنرێن بەڵام لەبەرئەوەی پێوەرو تەرازووی ماڵی نەغدینەن پێویستە لەبەر تیشكی دەقەكانی قوڕئانو سوننەتو قسەو بیروڕای شەرعزانان دا تیشكیان بخەینەسەر، پاشان بەكورتی باسی پارەو دراوی قاقەزیش دەكەین.

### ا-بەڵگەی فەرزبوونی زەكات لەزێڕو زیودا:

خوای پەروەردگار فەرموویەتی: (يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّ كَثِيرًا مِنَ الْأَحْبَارِ وَالرُّهْبَانِ لَيَأْكُلُونَ أَمْوَالَ النَّاسِ بِالْبَاطِلِ وَيَصُدُّونَ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ وَلَا يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَبَشِّرْهُمْ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ) التوبة: -٣٤-.

پێغەمبەری پێشەواشمان فەرموویەتی: (ما من صاحبِ ذَهَبٍ ولا فضةٍ لايؤدي حقَّها إلاّ إذا كان يوم القيامة صُفِحَتْ لَهُ صَفائح من نار جَهَنَّم...) متفق عليه.

هەروەها زانایانیش تێكڕا لەهەموو چاخو سەردەمەكان دا لەسەر ئەوە كۆكو یەكڕابوون كە دەبێ زێڕو زیو زەكاتیان لێبدرێ هەركاتێك مەرجەكانی زەكات دانیان تێدا هاتنەدی، كە دواتر باسیان دەكەین.

### ب-ئەندازەی زەكات تێدا فەرزكران (نصاب)ی زێڕو زیو:

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لَيْسَ فيما دون خَمْسِ أواقٍ صَدَقَةٌ) متفق عليه، واتە: لەپێنج ئوقیە كەمتر زەكاتی تێدا نیە، ئنجا ئوقیەش بەپێی تەرازووی خەڵكی مەككە چل (٤٠) درهەمە، پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: (المیزانُ میزان أهل مكة والمكيالُ مِكيالُ أهلِ المدينة) رواه أبوداود والنسائي عن ابن عمر وصححه ابن حبان والدارقطني والنووي والقشيري وزاد الألباني: ابن دقيق العيد والعلائي[٤٤].

---

[٤٣] بڕوانە: (فقه الزكاة) ج١ص٢٤٠.

[٤٤] بڕوانە: (سلسلة الأحاديث الصحيحة) ج١ص٣١٥، ٣١٦، رقم الحديث:١٦٥.

کەواتــە: (نصــاب)ی درهەم (زیــو) دوو ســەد (٢٠٠) درهەمــە، چونکــە (٥×٤٠=٢٠٠) ئەبووبەکریش خـوا لێـی ڕازی بـێ لـەو نامەیــەیدا کــە دەربـارەی زەکـات ناردوویــەتی نووسیویەتی: (وفي الرِّقَّةِ رُبُعُ العُشْرِ، فان لَمْ تكُنْ إلا تسعين ومائة فَلَيْسَ فيها شيئٌ) رواه البخاري، واتە: وە چوار یەکی دەیيەك (١/٤٠) زەکات لەزیودا هەیە، جا ئەگەر تەنیا سەدونەوەد (١٩٠) – درهەم – بوو ئەوە هیچی تێدا نیە.

دەربارەی زێڕیش چەند فەرموودەیەك هاتوون بەڵام (نـووي) و فـەرموودە ناسـانی دیکەش گوتوویانە هیچیان ڕاست (صحیح) نین و هەموویان بێهێز (ضعیـف) ن، بەڵام تێکڕا یان بەلای کەمەوە زۆربەی هەرە زۆری زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە (نصاب)ی زێڕ بیست مسقاڵەو لەو ئەندازەیە کەمتر زەکاتی لێنادرێ[45].

## ج–ئەندازەی زەکاتی زێڕو زیو:

هەروەك چۆن زانایان لەسەر زەکات دان لەماڵی نەغدینەدا یەکدەنگ بوو ون، لەوەش دا یەکدەنگن کە ئەندازەی زەکاتی ماڵی نەغدینە بریتیە لە چل یەك (١/٤٠)، خاوەنی کتێبی: (المغني) لەوبارەوە گوتوویەتی: (لانَعْلَمُ خِلافاً بَيْنَ اهل العلم ان زكاةَ الذَّهَبِ والفضة رُبْع عُشْرِهما)[46]

## د–ئەندازەی دیناری زێڕو درهەمی زیو:

دەربـارەی ئـەندازەی دینـارو درهەم کــە وەك پێشــتر گوتمــان تاقــە دراوی ڕۆژگــاری پێغەمبەری خوا ﷺ بوو ون، زانایانی کۆن و هاوچەرخ قسەو مشتومڕی زۆریان لەنێوان دا بووە، بەڵام لەسەر چەند شتێك یەکدەنگ بوو ون کە (ابن خلدون) مێژوونووسی زەبر دەست بەچەند دێڕێك پوختی کردۆتەوەو گوتوویەتی[47]: ﴿ بزانە کەهەر لەسەرەتای هاتنی ئیسلامەوەو لەڕۆژگاری هاوەڵان و شوێن کەوتووانیانەوە ئیجماع لەسەر ئەوە دامەزراوە کەدرهەمی شەرعی ئەوەیە کە دە (١٠) دانەیان کێشی حەوت (٧) مسقاڵ زێڕیان هەیە – واتە درهەمێك کێشەکەی ٧/١٠ی مسقاڵێك زێڕە –، وە (أوقیە)یەك لەزیو چل (٤٠) درهەمە، کە ئەویش لە دە بەشی دینارێك حەوت بەشیەتی، وە کێشی مسقاڵێك زێڕیش حەفتاو دوو (٧٢) دەنکە جۆیە، کەواتە کێشی درهەمێکیش کە (١٠/٧)ی مسقاڵێکە پەنجاو پێنج (٥٥) دەنکە، وە ئەم ئەندازانە سەرجەمیان بەیەکدەنگی زانایان چەسپاون، چونکە درهەمی نەفامی (الدرهم الجاهلي) لەنێو عارەبەکان دا چەند جۆرێك بوو، باشترینیان

[45] بڕوانە: (المجموع) ج٦ص٤.
[46] بڕوانە: (المغني) ج٢ص٦٠٠.
[47] بڕوانە (مقدمة ابن خلدون) ص٢٠٧،٢٠٨، کە لەژێر سەرباسی (السکة) دا هێناویەتی.

که درهمی (طبري) بووه هەشت (دانـق) بـووه، وه (بغلـي) چـوار دانـق بـووه، جـا مسـوڵمانان درهمـی شەرعی‌یان لەنێوه ڕاستیان دەرهێناوه کەشەش (دانق)ە.....﴾

کەواتە: ئەوه کە درهەمێکی زیو کێشەکەی (۱۰/۷)ی دیناریکی زێڕ بووه، وه دینارێکی زێڕیش مسقاڵێك بووەو مسقاڵێکیش حەفتاو دوو (۷۲) دەنکە جۆی نێوەنجی کێشاوه، شتێکە زانایان لەسەری کۆك‌و تەبابوو ون، وه زانایانی شوێنەوارناس (علماء الآثار) لەئەنجامی تێوەرامان‌و هەڵسەنگاندنی دراوەکانی دەوڵەتی ئیسلامی‌دا لەچاخە جیاجیاکانی‌دا کە لەمۆزەخانەکان (متاحف)ی شارەکانی لەندەن‌و پاریس‌و مەدرید $\frac{25}{100}$ وبەرلین دا پارێزراون بۆیان دەرکەوتوه کە دیناری ڕۆژگاری (عبدالملك بن مروان) ی ئەمەوی کێشەکەی چوار گرام‌و چارەکێك (٤) بووه[48]، هەروەها (دائرة المعارف الأسلامية)ش کێشی دیناری ڕۆمی بیزەنطی بەهەمان ئەندازە داناوه[49]، کەواتە کێشی درهەم بەگرام ئاوایە:

$$\frac{٧ \times ٤،٢٥}{١٠} = ٢،٩٧٥$$ کەواتە: درهەمێکی زیو کێشەکەی دوو گرام‌و ۱۰۰۰/۹۷۵ی گرامێکە.

جا بەوپێیە (نصاب)ی زێڕ بەکێش‌و بەگرام بریتیە لە (٤,٢٥×٢٠=٨٥ گرام)، وه (نصاب)ی زیویش بریتیە لە: (٢،٩٧٥× ٢٠٠=٥٩٥) گرام.

ه‍-پارەو دراوی قاقەز (النقود الورقية):

کە بریتیە لەپارچە قاقەزێکی تایبەت‌و بەچەند نەخش‌و نیگارێکی تایبەت دەرازێنرێتەوەو چەند ژمارەیەکی لەسەر نووسراون‌و لەلایەن میری‌یەوه یان لایەنێك کە میری دەستەڵات‌و مافی دەداتێ دەردەکرێ، تاکو خەڵکی وەك دراوێك لەنێو خۆیان دا بەکاری‌بێنن، وه لەوڵاتێکەوه بۆ وڵاتێکی دیکە جیاوازە، هەم لەشێوەو نرخ‌و هەم لە ناویشدا بۆ وێنە: دیناری ئێراقی، تومەنی ئێرانی، ڕیاڵی سعودی، دۆلاری ئەمریکی، مارکی ئەڵمانی، لیرەی لوبنانی ... هتد.

جا لەبەرئەوەی ئەوجۆره ماڵە نەغدینەیە کاتی خۆی نەبووه زاناو شەرعزانانی پێشوو هیچیان لەبارەوه نەگوتوەو، پاش پەیدا بوون‌و بڵاوبوونەوەشی لەوڵاتانی دنیاو جیهانی ئیسلامیش دا زاناو شارەزایان لەبارەیەوه - وەك هەر شتێکی تازه پەیدابوو - کەوتنە

---

[48] بڕوانە: (فقه الزكاة) ج١ص٢٥٩، کە لە (الخراج في الدولة الأسلامية) ص٣٣٧، وەری‌گرتوه.

[49] بڕوانە: (فقه الزكاة) ج١ص٢٥٩، کە لە (دائرة المعارف الأسلامية) ج٩، وەری‌گرتوه.

کێشەو مشتومڕەوە: هەتا سەرەنجام سەرجەمیان بێجگە لە(حەنبەلی‌یەکان) لەسەر ئەوە یەکدەنگ بوون کە ئەوجۆرە دراوەش حوکمی زێڕو زیوو جۆرە ماڵو سامانەکانی دیکەی هەیە لەمامەڵەو بازرگانی پێکردنو زەکات لێدانو.. هتددا، بەڵام حەنبەلیەکان ڕایان وایە کە هەتا بەکانزای نرخدار (المعدن النفيس) کە مەبەستیان زێڕو زیوە، نەگۆڕێتەوە زەکاتی لێ‌نادرێ[50]!

بەڵام لەڕاستی‌دا ڕای حەنبەلییەکان سەیرو بێ‌هێزیشە چونکە وەك زانایانی ئابووری ناس گوتوویانە[51]: (النُّقودُ هي كل مايُسْتَعْمَلُ مِقْياساً للقيم، و واسطة للتبادل، وأداة للادّخار، فاي شيئ يؤدي الیٰ هذه الوظيفة يعتبر نُقوداً بصرف النظر عن المادة المصنوع منها، وبصرف النظر عن الكيفية التي أصبح بها وسيلة التعامل في مبدأ الأمر، فما دامت هناك مادة يَقْبَلُها كلُّ المُنْتِجين في مجتمعٍ ما للمبادلةِ نَظيْرَ مايَبيعونَ، فهذهِ المادةُ نُقودٌ)

واتە: دراو بریتیە لەهەر شتێك كە وەك پێوەری نرخەكان بەكاردێت، وە هۆكاری بەیەكتر گۆڕینەوەو ئامرازی پاشەكەوت كردنە، جا هەر شتێك ئەو ئەركە بەجێ بێنێ بەبێ لەبەرچاوگرتنی ئەو كەرەسەیەی لێ‌ی‌دروست كراوەو ئەو چۆنیەتی‌یەی كە لەسەرەتاوە پێ‌ی بۆتە ئامرازی مامەڵە بەپارەو دراو دادەنرێ، مادام شتێك هەبێ هەموو بەرهەم هێنەرەكانی كۆمەڵگایەك لەبەرانبەر ئەو شتانەدا كە دەیانفرۆشن پێ‌ی ڕازی‌بن‌و بیانەوێ، ئەوە ئەو شتە پارەیە.

و- مەرجەكانی زەكات لێدانی پارەی نەغدینە:

بۆ زەكات لێدرانی پارەی نەغدینە هەركام لە:

١-گەیشتنە ئەندازەی (نصاب).

٢-ساڵ بەسەردا وەرسووڕانەوە.

٣-قەرزدار نەبوون.

٤-زێدەبوون لەدابین كردنی پێداویستی‌یە بنەڕەتی‌یەكان، بەمەرج گیراون، جا دیارە مەرجەكانی یەكەمو دووەمو سێیەم زانایان لەسەریان یەكدەنگن‌و لەسەر چوارەمیش جیاوازن بەڵام وەك پێشتر گوتمان بەمەرج گیرانی پەسەندترو بەهێزتریشە.



---

[50] بڕوانە: (الفقه الأسلامي...) ج٣ص١٨٣٣، ١٨٣٤، ط٤، وە (فقه الزكاة) ج١ص٢٧٢.

[51] بڕوانە: (فقه الزكاة) ج١ص٢٧٦، كە لە (النظم النقدية والمصرفية) ص٢٩، وەری‌گرتووە.

## ز-تەرازوو و پێوەری دیاریکردنی (نصاب)ی پارەی قاقەز چیە؟!

شتێکی ئاسایی و چاوەڕوان کراوە کە زاناو شارەزایانی پێشین باسی ئەم مەسەلەیان نەکردبێ چونکە لەڕۆژگاری ئەوان دا پارەو دراو تەنیا زێڕو زیو بووە، جا زانایانی هاوچەرخمان کە ئەو مەسەلەیان توێژیوەتەوە، بوونەتە دووڕا؛ ڕایەکیان زیو (فضة)ی پێ پەسندە کە بکرێتە تەرازوو و پێوەری ماڵی نەغدینەی ئەم ڕۆژگارە، واتە هەرکەسێك بارتەقا (مقابل)ی (نصاب)ی زیو - کە پێنج سەدو نەوەدو پێنج (٥٩٥) گرامە پارەی هەبوو پێویستە زەکاتی لێبدات، لایەنگرانی ئەم ڕایەش دوو بەڵگەیان بەدەستەوەن بۆ سەلماندنی پەسەندی ڕایەکەیان:

١-دەڵێن (نصاب)ی زیو زانایان لەسەری یەکدەنگن و فەرموودەی ڕاست (صحیح)و ڕەوانی لەسەر هەیە، وەك پێشتر ڕوونمان کردەوە.

٢-بۆ خەڵکی هەژارو نەدار چاکترو بەسوودترە، چونکە بەو پێیە زەکات لەسەر ژمارەیەکی زیاتری مسوڵمانان پێویست دەبێ.

ڕایەکەی دیکەش دەڵێ پێویستە ئەندازەی زەکات لێکەوتنی پارەی قاقەز بە هەموو جۆرو شێوەکانی یەوە، بە (نصاب)ی زێڕ دیاری بکرێ و زێڕ بکرێتە تەرازوو و پێوەری، واتە هەرکەسێك بارتەقای هەشتاو پێنج (٨٥) گرام زێڕ پارەی هەبوو ئەوجار زەکاتی دەکەوێتە سەر، ئەگەرنا لەو ئەندازەیە کەمتر زەکاتی تێدا فەرز نابێ.

جا لەڕاستیدا هەرکەسێك وردبینانەو واقیع بینانە ڕابمێنێ و سەرنج بدات دڵنیا دەبێ کەڕای دووەم ڕاست ترە، بگرە بۆ ئەم ڕۆژگارە هەر ئەو ڕاستو بەجێیە، چونکە:

١-زێڕ تا ڕاددەیەکی زۆر نرخەکەی چەسپاوو نەگۆڕە بەپێچەوانەی زیوەوە کە وەك باقی شتەکانی دیکە نرخەکەی لەگۆڕان دایە، بۆ وێنە مێژوو نووسان دەڵێن دینارێکی زێڕ لەڕۆژگاری پێغەمبەردا ﷺ دە (١٠) درەمی زیوی کردوە، پاشان لەنیوەی دووەمی چاخی ئەمەوی یەکان دا دوازدە (١٢) درەمو لەچاخی عەبباسی یەکان دا گەیشتۆتە پازدە (١٥) درەمو زیاتریش، وە (مقریزي) باسی کردوە کە لەڕۆژگاری فاطمی یەکانداو لەسەردەمی دەستەڵاتی (الحاکم)دا، نرخی دینارێکی زێڕ سی وچوار (٣٤) درەمی زیو بوو![52]

٢-ئنجا ئەگەر تەماشای ئەندازەی زەکات لێکەوتن (نصاب)ی ئاژەڵ و بەروبوومی کشتوکاڵیش بکەین دەبینین کە (نصاب)ی زێڕ بەدرێژایی مێژوو و ئێستاش لێیانەوە

---

[52] بڕوانە: (فقه الزکاة) ج١ص٢٦٤.

نزیکە جا چ تۆزێك کەمتر بێ چ زیاتر، بەڵام زیو وانیەو چەند قات کەمترە، بەڵێ نرخی کڕینو فرۆشتنی پێنج حوشتر یان[53] چل سەر مەڕو بزن یان پێنج وەسق دانەوێڵە کە دەکاتە دەوری (٦٥٣) کیلۆگرام لەبیست (٢٠) مسقاڵ زێڕەوە تاڕادەیەك نیزیکە، بەڵام لە (٥٩٥) گرام زیوەوە زۆر دوورە، کە وەك پێشتر ڕوونمان کردەوە (نصاب)ی زیو پێنج (اوقیة)یەو هەر (اوقیة) یەکیش چل (٤٠) درەمە، کە سەرجەم دەکاتە دوو سەد (٢٠٠) درەمو ئەمیش بەکێشانو بەگرام دەکاتە پێنج سەدو نەوەدو پێنج (٥٩٥)گرام.

٣-وەك لەباسەکانی ڕابردوودا خستمانەڕوو، زەکات لەسەر دەوڵەمەندان پێویست کراوە، جا ئەگەر کاتی خۆی لەڕۆژگاری پێغەمبەری خواو ﷺ خەلیفە سەر ڕاستەکانیدا و دوای ئەوانیش تاڕادەیەك، پێنج ئۆقیە زیو بەشی ئەوەی کردبێ کە خێزانێك بۆ ماوەی ساڵێك پێی بژینو بەڕێوەبچن، وەك (ولي الله الدهلوي) گوتوویەتی[54]، ئەوە بێگومان ئەو دووسەد درەمە - کە ڕەنگە بەس یەك سەر مەڕی پێبکڕێ - نەك بایی مەسرەفی ساڵێکی خێزانێك ناکات، بگرە بۆ هەندێك لەو شوێنانەی کە خەڵکەکەی ئاستی ژینو گوزەرانیان بەرزە بەشی ڕۆژێکیشیان ناکات!!

٤-وێڕای ئەوەی کەپاش دابەزینی نرخی زیو کە وەك گوتمان ڕەنگە لەم ڕۆژگارەدا (نصاب)ی زیو بەس یەك سەر مەڕ یان بزنی پێبکڕێت! وە لەسۆنگەی ئەوەشەوە کە زەکات لەسەر دەوڵەمەندان فەرزکراوە (تؤخذُ من أغنيائهم) رواه البخاري، وە بێگومان کەسێك تەنیا هێندەی پارە لەخۆی زیاد بێت کە مەڕێکی پێبێت بەدەوڵەمەند دانانرێ، بەڵێ وێڕای ئەمە ئەگەر دانرانی (نصاب)ی زیو بەپارەی قاقەزی ئەم ڕۆژگارە بۆ هەژارو نەداران باشو بەکەڵك بێ - کە بێگومان سوودو کەڵێکی ئەوتۆشی نیە، چونکە ماڵو سامانی کەم زەکاتی کەمیشی لێدەدرێو باری لارو کەوتووی هەژارو نەدارانیش بەو پرووچکە پرووچکە ڕاست نابێتەوەو کەلێنێکی وایان بۆ ناگرێ - ئەوە بە مسۆگەری بۆ ئەو خاوەن ماڵو سامانە کەمانەی کە بەتەرازووی (نصاب)ی زیو زەکاتیان لێوەردەگیرێ ستەمو زیان لێدانەو ڕەنگە زۆر لەو کەسانە کە بەو پێیە زەکاتیان لێوەردەگیرێ، دوایی خۆشیان پەکیان بکەوێو زەکاتیان پێبشێ! زاناو شەرعزانانیش لەسەر ئەوە یەکدەنگن

---

[53] بۆیە باسی (مانگا)م نەکردوە چونکە لەبارەی (نصاب)ە کەیەوە ڕا جیایی (اختلاف) لەنێو زانایان ـدا هەیە وەك دواتر باسی دەکەین.

[54] بڕوانە: (حُجةُ الله البالغة)ج٢ص٥٠٦.

کە: دوورخستنەوەی زەرەرو زیان لەپێش وەدەست هێنانی سودو کەڵکەوەیە: (دَفْعُ المضار مُقَدَّمٌ على جَلْبِ المَنافِعِ).

لەکۆتایی ئەم باسەش دا بەپێویستی دەزانم مەسەلەیەکی دیکەی گرنگ کەزۆر پێیەوە پەیوەستە، لەدوو تـوێی ئاراستەکردنی پرسیارێك‌و وەڵامدانەوەی‌دا، ڕوون بکەمەوە، ئەویش ئەوەیە کە ئەگەر یەکێك بپرسێ:

باشە ئەوە بەو بەڵگانەی هێنرانەوە ئیسپات بوو کە تەنیا زێڕ بەکەڵکی ئەوەدێ کە بکرێتە تەرازووی زەکات لێکەوتن‌و لێنەکەوتنی پارەی قاقەز، بەڵام ئایا ئەگەر زێڕیش نرخەکەی وەك زیو گۆڕاو دابەزی تەگبیر چی‌یە؟! لەوەڵام دا دەڵێین:

هەرچەندە دوور دێتە بەرچاو کە زێڕیش بەمەرەدی زیو بچێ‌و بەهای شت پێ‌کرین (القیمة الشرائیة)ی هێندە دابەزێ، بە بەڵگەی ئەوە کە لەڕۆژگاری پێغەمبەرەوە ﷺ و بگرە زووتریش‌و هەتا ئێستاش زێڕ تاڕادەیەکی هەروەك خۆی ماوەتەوە، بەڵام ئەگەر شتێکی واش ڕووی‌دا پەکمان ناکەوێ‌و چارەسەر و تەگبیری هەیە، ئەویش ئەوەیە کە یەکێك لە (نصاب)ی بەروبوومی کشت‌وکاڵ، یان ئاژەڵ بکەینە تەرازوو و پێوەر، بەڵام لەسۆنگەی ئەوەوە کەنرخی (نصاب)ی بەرووبومی کشت‌وکاڵ زۆر لەنرخی (نصاب)ی ماڵات کەمترە°°، (نصاب)ی بەروبوومی کشت‌وکاڵ کەڵکی ئەوە ناگرێ بکرێتە تەرازوو و پێوەری زەکات لێدران‌و لێنەدرانی پارەی قاقەز، کەواتە دەبێ هەر (نصاب)ی ئاژەڵ ئەو دەورە ببینێ‌و ئەو گیروگرفتە چارەسەر بکات، ئنجا ئاژەڵیش سێ جۆری سەرەکی‌یە: حوشتر، ڕەشەوڵاخ، مەڕو بزن، جا وەك پێشتر ئاماژەمان پێ‌کردو دواییش بەڕوونی باسی دەکەین ئەوەی (نصاب)ەکەی ڕوون‌و بێ‌چەندو چوونە هەر حوشترو مەڕو بزنن، چونکە ڕەشەوڵاخ شەرعزانان لەبارەی (نصاب)ەکەیەوە ڕا جیایی (إختلاف)یان هەیەو لەپێنج سەرەوە هەتا پەنجا سەر ڕۆیشتوون!

(نصاب) ی وشتریش پێنج سەرەو هی مەڕو بزنیش چل (٤٠) سەرە، کەواتە لەهەر ڕۆژگارو سەردەمێك دا نرخی زێڕیش گۆڕاو ئەو تەرازوو و پێوەرەی کە ئێستا بەدەستمانەوەیە بۆ دیاری‌کردنی (نصاب)ی پارە لاتەڵ‌و لاسەنگ بوو، ئەوە سەرنج دەدەین داخوا نرخی کڕین‌و فرۆشتنی پێنج حوشتر یان چل سەر مەڕو بزن چەندە، ئەو ئەندازەیە دەکەینە (نصاب)ی (پارە) بۆ زەکات لێدان.

---

°° ئەویش لەبەر چەند حیکمەتێك: یەکەم: کە ڕەنج‌و ماندووبوونی ئینسان لەبەرهەم هێنانی بەروبوومی کشت‌وکاڵ دا کەمترە، دووەم: هەمیشە ئینسان ئاتاجی بەروبوومی کشت‌وکاڵە، بەڵام گۆشت وانیە، سێ‌یەم: زەکاتی کشت‌وکاڵ‌و میوە لەبەرهەم‌و قازانجی زەوی‌و زارە، بەڵام زەکاتی ئاژەڵ لەسەرووبەرییەتی، بڕوانە: (فقه الزکاة) ج١ص٢٦٦،٢٦٧.

جا خوێنەری بەرێز! ئەوەی تا ئێرە نووسیومە لەبارەی ئەو مەسەلەیەوە کە خەریکی توێژینەوەو ڕوونکردنەوەینی ڕاوبۆچوونی (د.یوسف القرضاوي)یە کە لەکتێبی (فقه الزکاة)دا هێناویەتی[٥٦]، بەڵام من وای بۆ دەچم کە ڕاست ترو چاکتر ئەوەیە (نصاب)ی پارە - کەجێی زێڕو زیوی گرتۆتەوە -، نیوەی (نصاب)ی ئاژەڵ بێت، چونکە لەو فەرموودەیەوە کە (بخاري) لە(انس بن مالك)ی گێڕاوەتەوە دەردەکەوێ کە لە ڕۆژگاری پێغەمبەردا ﷺ مەڕێك یان بزنێك نرخی دە (١٠) درەم بووە، وەك فەرموویەتی: (...ويُعْطيه المُصَدِّقُ عِشرين دِرْهَماً او شاتَيْنِ) چونکە ئەگەر (٢٠) درەمو دوو مەڕ یان بزن بەرانبەر بن، کەواتە: (٤٠ ×١٠=٤٠٠)درەم، کە دوو هێندەی (نصاب)ی زیوە، پێم وا نیە نرخی پێنج وشتریش لەو ئەندازەیە کەمتر بووبێ، ئەگەر زیاتریش نەبووبێ، هەر بۆیەش زەکاتی پێنج وشتر مەڕێکە[٥٧].

## ٢-ئاژەڵ، ماڵات (الأنعام):

هەرچەندە جیهانی گیانداران (عالم الحيوانات) جیهانێکی زۆر پانو پۆڕو جۆراوجۆرە، بەڵام ئەوەی کە هەر لەدێرزەمانەوە ئینسان لێی بەهرەمەند بووەو توانیویەتی سوودو کەڵکی لێ‌وەربگرێ ئەو جۆرەیانە کە بەئاژەڵ، ماڵات (انعام) ناوبراون کەبریتین لە: حووشتر، مانگاو گامێش، مەڕو بزن، وە خوای بەخشەرو پەروەردگار لەچەندان ئایەت دا سەرنجی ئینسانی ڕاکێشاوە بۆ گرنگیو بایەخو سوودو کەڵکەکانی ئاژەڵ، بۆ وێنە فەرموویەتی: (وَالْأَنْعَامَ خَلَقَهَا لَكُمْ فِيهَا دِفْءٌ وَمَنَافِعُ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ،وَلَكُمْ فِيهَا جَمَالٌ حِينَ تُرِيحُونَ وَحِينَ تَسْرَحُونَ ،وَتَحْمِلُ أَثْقَالَكُمْ إِلَى بَلَدٍ لَمْ تَكُونُوا بَالِغِيهِ إِلَّا بِشِقِّ الْأَنفُسِ إِنَّ رَبَّكُمْ لَرَءُوفٌ رَحِيمٌ) النحل:٥-٧، واتە: وە - خوا - ئاژەڵەکانی بۆتان خوڵقاندوە کە -هۆکاری - خۆپێ‌گەرم کردنەوەتانو بەرژەوەندی زۆریان تێدایە، وە لێشیان دەخۆن. هەروەها دیمەنێکی جوانیان بۆتان هەیە لەدەمی لەوەڕگا هێنانەوەی ئێوارانو بەرە ولەوەڕگاچونی بەیانیان دا. وە کەل‌وپەلە گرانەکانتان بەرەو شوێنێك بۆ هەڵدەگرن کە - ئەگەر لەسەر پشتی ئەوان نەبووایە - مەگەر بەکولەمەرگی بۆی چووبانایە! بێگومان پەروەردگارتان بەپەرۆشو بە بەزەیی‌یە.

جا ئەوە بەکورتی یەك بەیەك باسی چۆنیەتی زەکات لێ‌دەرکردنی ئەو جۆرە گیاندارانە دەکەین کە بەئاژەڵ یان ماڵات ناوبراون:



[٥٦] بڕوانە: ج١ص٢٦٦تا٢٦٨.

[٥٧] وەك لە (صحيح البخاري)دا هاتووە دوایی باسی دەکەین.

### ١- حوشتر (الأبل):

له سۆنگەی ئەوەوە کە ئەو دەقانەی لەپێغەمبەری خوا ﷺ و هاوەڵانی بەڕێزیەوە خوا لێیان ڕازیبێ هاتوون لەسەر ئەو خشتە (جدول)یەی خوارێ ڕێك كەوتوون دەربارەی (نصاب)و ئەندازەی زەکاتی حوشتر، تێکڕای مسوڵمانانیش لەسەری پێکهاتوون، خشتەکەش بەم شێوەیەیە:

| ئەندازەی زەکات لێکەوتن (نصاب) | | | ئەو ئەندازەیەی کەپێویستە وەك زەکات بدرێ (القدر الواجب) |
|---|---|---|---|
| له: | | هەتا: | |
| ٥ | تا | ٩ | ١مەڕ } دروست نیە بزن بدرێ لەجیاتی مەڕ |
| ١٠ | تا | ١٤ | ٢مەڕ } دروست نیە بزن بدرێ لەجیاتی مەڕ |
| ١٥ | تا | ١٩ | ٣مەڕ } دروست نیە بزن بدرێ لەجیاتی مەڕ |
| ٢٠ | تا | ٢٤ | ٤مەڕ } دروست نیە بزن بدرێ لەجیاتی مەڕ |
| ٢٥ | تا | ٣٥ | ١ بنت مخاض، کە بەچکە حوشترێکی مێچکەیە پێی لەدوو ساڵ ناوە. |
| ٣٦ | تا | ٤٥ | ١بنت لبون، کە حوشترە مێچکەیە کەپێی خستۆتە ساڵی سێیەمەوە. |
| ٤٦ | تا | ٦٠ | ١حِقَّة، کە حوشترە مێچکەیەکە سێ ساڵی تەواو کردوونو پێی ناوەتە ساڵی چوارەمی تەمەنیەوە. |
| ٦١ | تا | ٧٥ | ١جَذَعة، کە حوشترە مێچکەیەکە چوار ساڵی تەواو کردوونو پێی ناوەتە ساڵی پێنجەمەوە. |
| ٧٦ | تا | ٩٠ | ٢بنت لبون. |
| ٩١ | تا | ١٢٠ | ٢حقة. |

وە ئەگەر لە(١٢٠) زیاتربوون ئەوە بەڕای زۆربەی هەرەزۆری زانایان لەهەر چل (٤٠) سەرێك (ابنة لبون)ێكو لەهەر پەنجا (٥٠) سەرێك (حقة)یەك، ئەوەی کە دەربارەی (نصاب)و ئەندازەی زەکاتی حوشتران گوترا لەو دەقەدا هەیە کە (بخاري) لە (انس بن مالك) ەوە خوا لێی ڕازیبێ گێڕاویەتەوە کە کاتێك (ابوبکر الصدیق) خوا لێی ڕازیبێ ڕەوانەی بەحرەینی کرد نامە (کتاب)یەکی بۆ نووسی کە چۆنیەتی زەکاتی حوشتری تێدا ڕوون کردبۆوە[٥٨].

وەك تێبینی دەکرێ حوشتر هەتا ژمارەیان نەگاتە پێنج سەر زەکاتیان لێنادرێ، وە ئەو ژمارەیەش کە دەکەوێتە نێوان دوو ئەندازەی (نصاب) ەوە کە (وَقْص)ی پێ دەگوترێ دیسان زەکاتی لێنادرێو ئەمەش تایبەت نیە بەحوشترەوە بەڵکو هەموو جۆرەکانی ئاژەڵ دەگرێتەوەو لەبەندی دووەمیش دا لەبڕگەیەکی سەربەخۆدا باسی دەکەین.

---

[٥٨] بڕوانە: (الأدلة الرضية) ص١١٦.

## ب-مانگاو گامێش (البقر والجاموس):

دیاره (گا)ش لەگەڵ مانگا حیساب دەکریو (گامێش)یش کە بەیەکدەنگی[٥٩] زانایان ڕەگەڵ مانگا دەخرێ، (کەڵ)یش دەگرێتەوە.

بەڵام ئەندازەی (نصاب) ی ئەم جۆرە ئاژەڵەو ئەندازەی زەکاتەکەی هەرچەندە زۆربەی زانایان کەهەر چوار مەزەبەکانیشیان لەنێودان لەسەر خشتە (جدول) یەك پێکهاتوون کە دوایی دەینووسین، بەڵام وەك هی حوشتر لەسەری یەکدەنگ نەبوو ون، هۆیەکەشی ئەوەیە ئەو دەقو فەرموودانەی کە لەبارەی زەکاتی مانگاوە هاتوون وەك ئەوانەی حوشتر ڕاستو ڕاشکاو (صحیح و صریح)نین، ڕەنگە حیکمەتەکەشی ئەوەبێ کە مانگاو گامێش جۆرو شێوەیان زۆرن‌و بۆئەوەی مسوڵمانان بەچەند دەقێکەوە نەبەسترێنەوەو مەودای بیروڕاو ئیجتیهادی جۆراوجۆریان هەبێ بەپێی هەلومەرجو بارودۆخە جیاجیاکان، زەکاتی مانگاو گامێش بەوشێوەیە هەڵخرابێت، ڕای زۆربەو جەماوەری زانایانیش لەبارەی زەکاتی مانگاوە بەم شێوەی خوارێیە:

| ئەندازەی زەکات لێکەوتنی مانگا (نصاب البقر) | | | ئەو ئەندازەیەی کەپێویستە وەك زەکات بدرێ. |
|---|---|---|---|
| لە: | | تا | |
| ٣٠ | تا | ٣٩ | گۆلکە (گوێرەکە) نێر یان مێیەك کە یەك ساڵی تەواو کردبێ. |
| ٤٠ | تا | ٥٩ | نێنگوونێك، کە بریتییە لەمێچکەیەکی دوو ساڵ بەڕێکردووی پێ‌لەسێ ساڵ ناو. |
| ٦٠ | تا | ٦٩ | دوو گۆلکە نێر. |
| ٧٠ | تا | ٧٩ | نێنگونێك‌و گۆلکە نێرێك. |
| ٨٠ | تا | ٨٩ | دوو نێنگوون. |
| ٩٠ | تا | ٩٩ | سێ گۆلکە نێر. |
| ١٠٠ | تا | ١٠٩ | نێنگوونێك‌و دوو گۆلکەنێر. |
| ١١٠ | تا | ١١٩ | دوو نێنگوون‌و گۆلکە نێرێك. |
| ١٢٠ | تا | ١٢٩ | سێ نێنگوون یان چوار گۆلکە نێر. |

بەڵگەی ئەو خشتەیەش ئەم فەرموودەیەیە:

(عن معاذٍ رضي الله عنه قال: بعثني رسول الله ﷺ الى اليَمَن، فأمرني أن آخُذَ مِنْ كلِّ ثلاثين بقرةً، تَبِيْعاً أو تبِيْعةً، ومن كل أرْبعين، مُسِنَّةً،...) رواه اصحاب السنن واحمد وحسنه الترمذي،

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ ناردمی بۆ یەمەن وەفەرمانی پێ‌کردم کە لەهەرسی (٣٠) سەر مانگا، گۆلکێکی نێر یان مێ - بەزەکات - وەربگرم، وە لەهەر چل (٤٠) سەرێك نێنگوونێك.

---

[٥٩] بڕوانە: (المحلى) ج١ص١٩١، وە (المغني..) ج٢ص٤٧٠.

ئەو ڕایانەی دیکەش کە بەڕای جەماوەری زانایان ڕازی نەبوو ون، بەم جۆرەن:

یەکەم: کە (طبري) هەڵی بژاردووەو (ابن حزم) یش پشتگیری کردوە[60]، ئەوەیە کە لەهەر پەنجا (٥٠) سەر سەرێکەو هەتا ژمارەیان نەگاتە پەنجا سەر زەکاتیان لێناکەوێ، بەڵام دوایی (ابن حزم) هەر گەڕاوەتەوە سەر ڕای زۆربەو جەماوەر[61].

دووەم: کە (ابن ابي شيبة) لە (شهر بن حوشب) ی گێڕاوەتەوە، ئەوەیە کە هەتا نەگەنە دە (١٠) سەر زەکاتیان لێنادرێ و کەبوونە دە سەریش مەڕێکیان لەزەکات دەدرێ.

سێیەم: کە ڕای (سعيد بن المسيب) و (زهري) و (ابو قلابة)یە، ئەوەیە کە زەکاتی ڕەشەوڵاخیش هەروەك هی حوشتر وایە، ئەوەندە هەیە ئەو تەمەنانەی کە بۆ زەکاتی حوشتر بەمەرج گیراون بۆ ڕەشەوڵاخ بەمەرج نەگیراون.

ئنجا وەك پێشتریش ئاماژەمان پێکرد وابێدەچێ حیکمەتی ئەو ڕاجیایی (اختلاف)یە ئەوەبێ کە ڕەشەوڵاخ وەك حوشتر نیەو جۆراوجۆرەو بەرزیو نزمی زۆریان لەنێوان دا هەیە، جا دەگونجێ کە بۆ ئەو جۆرە مانگاو گامێشانەی کەجۆرێکی ئاساییو ئاست نزمن ڕای جەماوەر کاری پێبکرێ و، بۆ ئەو جۆرانەش کە زۆر چاكو نایابنو ڕەنگە جاری وا هەبێ، یان لەهەندێك شوێنو هەلومەرجان دا وەك حوشترو بگرە باشتریش بن، ئەو ڕایانەی دیکە بەتایبەت دووەمو سێیەم کاریان پێبکرێ.

بەڵام ڕای یەکەم زۆر لاواز دێتە بەرچاو چونکە ئاشکرایە مانگا هەرچۆن بێ زۆر لەمەڕو بزن چاکترەو ماقووڵ نیە، مەڕو بزن لەچل سەر سەرێکیان زەکات بێ، بەڵام مانگاو گامێش هەتا نەگەنە پەنجا سەر زەکاتیان لێنەکەوێ[62].

## ج-مەڕو بزن (الغنم):

دەربارەی مەڕو بزنیش کە زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە زەکاتیان لێدەدرێ و وشەی (غنم)یش هەرکام لە (ضأن) مەڕو (معز) بزن دەگرێتەوە، ڕای تێکڕای زانایان یان بەلای کەمەوە زۆربەی هەرە زۆریان کەلەبەر تیشکی ئەو فەرموودەیەدا پێیگەیشتوون کە (بخاري) لە (انس بن مالك) خوا لێیڕازیبێ گێڕاویەتەوە[63]، لەبارەی چۆنیەتیو ئەندازەی

---

[60] بڕوانە: (فقه الزكاة) ج١ص١٩٦، وە بڕوانە: (المحلى) ج٥ص٢٠١.

[61] بڕوانە: (المحلى) ج٥ص٢٠١، دیارە ئەو جۆرە هەڵوێستانەی (ابن حزم) جێی ڕێزو سوپاسنو بەڵگەی زۆر بەدوای هەق و ڕاستیدا گەڕانیو لەبەرانبەر هەق دا تەسلیم بوونیو ڕەوشت بەرزینی!

[62] بڕوانە: (فقه الزكاة) ج١ص١٩٤تا٢٠٣.

[63] بڕوانە: (الأدلة الرضية) ص١١٨.

زەكات لێكەوتن و زەكات لێدانی یەوە بەوجۆرەیە كە لەو خشتە (جدول)یەی خوارێدا دەبینرێ:

| ئەندازەی زەكات لێكەوتن (نصاب) | | ئەو ئەندازەیەی كە پێویستە بەزەكات بدرێ |
|---|---|---|
| لە | تا | |
| ١ | ٣٩ | هیچی تێدا نیە |
| ٤٠ | ١٢٠ | یەك سەر |
| ١٢١ | ٢٠٠ | دوو سەر |
| ٢٠١ | ٣٩٩ | سێ سەر |
| ٤٠٠ | ٤٩٩ | چوار سەر |
| ٥٠٠ | ٥٩٩ | پێنج سەر |
| پاشان لەهەر سەد (١٠٠)سەرێك | | یەك سەر |

جا هەرچەندە مەسەلەی زەكاتی مەڕو بزن - هەروەها حوشترو ڕەشەوڵاخیش - پێویستی بەتوێژینەوەی زیاتر دەكات، بەڵام لەسۆنگەی ئەوەوە كە لەچەند بڕگەیەكی بەندی دووەم دا دووبارە دەگەڕێینەوە سەری، لێرە بەم ئەندازەیە لێی دەگەڕێین و هەر مەسەلەیەك لێرە هەقی تەواوی نەدرابێتێ، خوا یاربێ لەوێ بۆی قەرەبوو دەكەینەوە.

لەكۆتایی باس و توێژینەوەی زەكاتیماڵات (انعام)یش بەپێویستی دەزانم ئاماژەیەكی كورت بەمەرجەكانی بكەین:

١-گەیشتنە ئەندازەی (نصاب)، كە زانایان لەسەری یەكدەنگن.

٢-ساڵ بەسەردا وەسووڕانەوە، ئەمیش زانایان لەسەری كۆك و ڕێكن.

٣-دەبێ بەزاری خۆی لەوەڕابێ، واتە لەزۆربەی ساڵێدا ئەو ماڵاتە (وشتر و ڕەشەوڵاخ و مەڕو بزن) بۆ خۆی لە لەوەڕگاو مەزرادا لەوەڕابێ و پێویستی بەئاڵف نەبووبێ، كەئەمیان ڕای زۆربەی زانایانەو بەڵگەشیان ئەو فەرموودانەن كە سیفەتی لەوەڕاو (سائمة) یان تێداكراوە بەئاوەڵناوی ئەو ئاژەڵانە كە زەكاتیان لێدەدرێ، وەك:

(عن بَهْز بن حكيم عن أبيه عن جَدّه قال: سَمعت رسولَ الله ﷺ يقول: في كُلّ إبـلٍ سائمةٍ في كلّ أربعين إبنة لَبُونٍ..) رواه احمد والنسائي وابوداود، وە: (وفي صَدَقَة الغَنَـمِ في سائمتها إذا كـانت أربعينَ منها شاةٌ) رواه البخاري عن انس بن مالك.

بەڵام (مالك وربيعة و ليث) ئەو مەرجەیان بەپێویست نەزانیوە[٦٤].

---

[٦٤] بڕوانە: (فقه الزكاة) ج١ص١٧١، كە لە (الروض النفير) ج٢ص٣٩٩ وەریگرتوە.

٤-کە تایبەتە بە وشترو ڕەشەوڵاخەوە[٦٥] - نابێ ئیشکەربێ و خاوەنەکەی بۆ زەوی کێڵان و ئاو هەڵهێنجان و بارلێنان بەکاری بێنێ، دیارە ئەمەش ڕای زۆربەو جەماوەری زانایانە، بەڵام (مالك) ڕای وایە کە ئیشکەر (عاملة)و ئیش نەکەر یەکسانن و زەکات لەهەموویان دا دەبێ بدرێ، ئاشکراشە کەڕای جەماوەر بەهێزترەو چەند دەقێکیشیان لەوبارەوە بەدەستەوە هەن وێڕای بەڵگەی عەقڵی، بۆ وێنە[٦٦]:

أ-(ابوعبید) لە (علي) خوا لێی ڕازیبێ گێڕاویەتەوە کە گوتوویەتی: (لَيسَ في البقر العواملِ صَدَقةٌ).

ب-هەروەها لە (جابر بن عبدالله) خوا لێی ڕازی بێ گێڕاوەتەوە کە گوتوویەتی: (ولَيسَ على الحراثةِ صَدَقةٌ).

ج-دیسان (ابوداود) لە (علي) خوا لێی ڕازیبێ، وە (زهیر) گوتوویەتی، پێم وایە کە لەپێغەمبەرەوە ﷺ هێناویەتی، گێڕاویەتەوە کە گوتوویەتی: (ولَيسَ في العواملِ شئٌ).

ئنجا پێشتریش گوتمان کە گەشەکردن (نماء) یەکێکە لەمەرجە بنەڕەتییەکانی زەکات، وە خستمانەڕوو کەهەر ماڵ و سامانێك لەپیشەوکاردا بەکاربێت و لەپێداویستییە بنەڕەتییەکانی ژیان و گوزەران بێ زەکاتی لێناکەوێ.

٥-زێدەبوون لەدابین کردنی پێداویستییە بنەڕەتییەکان، مەگەر ماڵ و سامانی دیکەی هەبێ.

## ٣-بەروبوومی کشتوکاڵ و میوەجات:

زانایان دوای ئەوەی لەسەر ئەوە کە بەروبوومی کشتوکاڵ و میوەجات زەکاتیان لێدەدرێ، یەکدەنگ بوون، چونکە چەندان دەقی قورئان و سوننەت لەوبارەوە هەن، لەسەر وردە بابەتەکانی زەکاتی کشتوکاڵ و میوە ڕایان جیاوازە، جا ئەوە بۆ وەسێنایی خستنی خستنەڕووی باسەکە لەچەند وردەخاڵێك دا دەینووسین:

أ- بەڵگەی زەکات لێدرانی بەروبوومی کشتوکاڵ و میوەجات:

١-خوای دادگەر فەرموویەتی: (يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَنفِقُوا مِنْ طَيِّبَاتِ مَا كَسَبْتُمْ وَمِمَّا أَخْرَجْنَا لَكُمْ مِنَ الأَرْضِ) البقرة:٢٦٧، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! لەو ڕۆزییە پاك و چاكەی

---

[٦٥] چونکە مەڕو بزن ئەوجۆرە کارانەیان پێناکرێن و لەتوانایان دا نیە.

[٦٦] بڕوانە: (فقه الزكاة) ج١ص١٧٢.

كە وەدەست تان هێناوەو لەوەی کە لەزەوی‌دا بۆمان دەرهێناون - و ڕواندوومانە - ببەخشن....

(جصاص) گوتوویەتی:[67] (وَلَمْ يَخْتَلِفِ السَّلَفُ والخَلَفُ فِي أَنَّ المُراد بهِ الصَّدَقَةُ) واتە: وە زانایانی پێشین‌و پاشین لەوەدا کەمەبەست لێرەدا زەکاتە جیاوازی‌یان نیە.

٢-پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: (فيما سَقَتِ السَّماءُ والعُيونُ أو كان عَثَرِياً، العُشْرُ وفيما سُقِيَ بالنَّضْحِ نِصْفُ العُشرِ) رواه البخاري، واتە: ئەوەی بەئاوی باران‌و کانی‌و سەرچاوان ئاودرابێ، یان بەهۆی گۆماوەوە - یان زەوی‌یەکەی تەڕو شێداربێ - ئەوە دەییەك (١٠/١)ی زەکات تێدایە، بەڵام ئەوەی بەهۆی هەڵهێنجرانی ئاوەوە ئاودێر کرابێ بیست یەك (٢٠/١)ی زەکاتە.

٣-پێشتریش گوتمان کە زانایانی ئیسلام لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە بەروبوومی کشت‌وکاڵ‌و میوەجات زەکاتی لێ‌دەدرێ.

**ب-ئەو بەروبوومانەی کەزەکاتیان لێ‌دەدرێ:**

زانایان بەگشتی چوار ڕایان هەن لەوبارەوە کە ئایا چی‌و چی لەبەرهەم‌و بەروبوومی کشت‌وکاڵ‌و میوە زەکاتیان لی‌دەدرێ؟!

ڕای یەکەم: کە هی (ابن عمر) و کۆمەڵێك لەزانایانی پێشینە[68]، دەڵێن: تەنیا گەنم‌و جۆو خورماو مێوژ (الحنطة والشعير والتمر والزبيب) زەکاتیان لێ‌دەدرێ، وە (ابن حزم) تەنانەت (مێوژ)یشی حیساب نەکردوەو بەس: گەنم‌و جۆو خورمای بەوە داناوە کە زەکاتیان لێ‌بدرێ[69].

ڕای دووەم: کە هی (مالك و شافعي)یە، دەڵێن: هەر شتێك بژێو (قوت)بێ‌و پاشەکەوت بکرێ‌و وشك بکرێتەوە لەدانەوێڵەو میوەجات زەکاتیان لێ‌دەدرێ، جا دیارە ئەمانیش لەسەر چەند شتێك کۆکن‌و لەسەر زۆر شتیش ڕایان جیاوازە[70].

ڕای سێیەم: کە باوترین ڕای (أحمد) ە، ئەوەیە کە هەر شتێك سێ سیفەتی تێدا هەبن زەکاتی لێ‌دەدرێ، کە بریتین لە: وشك کرانەوە، مانەوە، پێوران، کەواتە ئەم ڕایە بژێو بوونی بەمەرج نەگرتوەو هەر بەروبوومێك کە بگونجێ وشك بکرێتەوەو پاشەکەوت بکرێ،

---

[67] بڕوانە: (احكام القرآن) للجصاص، ج١ص٥٤٣.

[68] بڕوانە: (فقه الزكاة) ج١ص٣٤٩، ٣٥٠.

[69] بڕوانە: (المحلى) ج٥ص١٤٤، مسألة: (٦٤٠). وە: (فقه السنة) ج١ص٤٨٣.

[70] بڕوانە: (الفقه الأسلامي) ج٣ص١٨٨٥، ١٨٨٦، ط٤، وە: (المجموع) ج٥ص٤١٦.

وە بمێنێتەوەو نەڕزێ و لەبەین نەچێ، وە بپێورێ، ئەوە پێویستە مادام مەرجەکانی دیکەی زەکاتی تێدا هاتبنەدی زەکاتی لێبدرێ[71].

رای چوارەم: کە رای (ابو حنیفة)یە رەحمەتی خوا لەسەرجەم زاناو پێشەوایانمان بێ، دەڵێ: هەر شتێك کە لەزەویدا دەڕوێنرێ و دەچێنرێ و بەمەبەستی سوودو بەرهەم وەدەست هێنان دەکرێ زەکاتی لێدەدرێ، تەنیا لە داری سووتەمەنی و پووش و گیاو قامیشی بێ شەکر، زەکات نادرێ، بەلام ئەمانیش ئەگەر بابای خاوەن زەوی زەویوزارەکەی خۆی بۆیان تەرخان کرد دیسان زەکاتیان لێدەدرێ[72].

جالەبەرئەوەی ئەم رایەی کۆتاییو چوارەم کە هی (ابو حنیفة)یە پێم لە هەموو رایەکانی دیکە پەسەندترو بەهێزترە، بەچاکی دەزانم بەهێنانەوەی چەند بەلگەیەك روونی بکەمەوە بۆچی رای ناوبراوم پێ‌سەندترو بەهێزترە:

یەکەم: خوای پەروەردگار لەئایەتی ژمارە (٢٦٧)ی (البقرة)دا بەگشتیو بەبێ هەلاواردن فەرموویەتی: (يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَنفِقُوا مِنْ طَيِّبَاتِ مَا كَسَبْتُمْ وَمِمَّا أَخْرَجْنَا لَكُمْ مِنَ الْأَرْضِ وَلَا تَيَمَّمُوا الْخَبِيثَ مِنْهُ تُنفِقُونَ وَلَسْتُمْ بِآخِذِيهِ إِلَّا أَنْ تُغْمِضُوا فِيهِ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ حَمِيدٌ) کە بێگومان هەرچی لەزەویدا بڕوێ دەیگرێتەوە، هەروەها لەئایەتی ژمارە (١٤١)ی (الأنعام) پاش ئەوەی بەگشتی باسی کشتوکاڵو میوەجاتی کردوە فەرموویەتی: (وآتوا حَقَّهُ يَوْمَ حَصَادِهِ) واتە: وە لەڕۆژی درووینو چنینو هەلگرتنەوەی بەروبوومەکەیدا هەقەکەی لێبدەن – بەخەلکی دیاریکراوی خۆی –، ئایەتەکەش بەتەواوی ئەمەیە: (وَهُوَ الَّذِي أَنشَأَ جَنَّاتٍ مَعْرُوشَاتٍ وَغَيْرَ مَعْرُوشَاتٍ وَالنَّخْلَ وَالزَّرْعَ مُخْتَلِفًا أُكُلُهُ وَالزَّيْتُونَ وَالرُّمَّانَ مُتَشَابِهًا وَغَيْرَ مُتَشَابِهٍ كُلُوا مِنْ ثَمَرِهِ إِذَا أَثْمَرَ وَآتُوا حَقَّهُ يَوْمَ حَصَادِهِ وَلَا تُسْرِفُوا إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الْمُسْرِفِينَ)

واتە: وە –خوا – ئەو زاتەیە کە باغاتی کەپر دارو بێ کەپری خەملاندوە، هەروەها خورماو کشتوکاڵی وا کە میوەکانیان جیاجیان، وە زەیتوونو هەناری پێکچوو و وێك نەچوو، جا هەرکاتێك میوەیدا لەبەرەکەی بخۆنو لەڕۆژی رەنێو هێنانیشیدا هەقەکەی لێدەربکەن، وە زیادەڕۆیی مەکەن بێگومان خوا زیادەڕۆیی کەرانی خۆش ناوێن.

دووەم: پێغەمبەر ﷺ بەگشتی فەرموویەتی: (وفيما سقت السماء العشر..) رواه البخاري، جا دیارە بەبێ‌بەلگەش دروست نیە هیچ شتێك لەوانەی کە بەئاوی بارانو کانیاوو.. هتد ئاو دەدرێن لەو حوکمە هەلباوێررێنو جیابکرێنەوە.

---

[71] بروانە: (المغني) ج٢ص٥٤٩، وە: (الشرح الكبير) ج٢ص٥٤٩، ٥٥٠.

[72] بروانە: (الفقه الأسلامي..) ج٣ص١٨٨٤، وە بروانە: (المجموع) ج٥ص٤١٦.

سێیەم: لەپێناسەی ماڵو سامان دا باسمان کرد کە هەر شتێك بخرێتە ژێر ڕکێفو دەستەڵاتەوەو کەڵكو سوودی هەبێ بەماڵو سامان دادەنرێو ئاشکراشە کە خوای کاربەجێ بەگشتی فەرموویەتی: (خُذْ مِن أموالِهِمْ صَدَقَةً..) التوبة: ١٠٣، واتە: لەماڵو سامانەکانیان زەکات وەربگرەو هیچ جۆرە ماڵو سامانێکی لەزەکات لێدران هەڵنەواردوە.

یەکێك لەو زانایانەش کەڕای (ابو حنیفة) ی هەڵبژاردوە (ابن العربي)یە کە هەرچەندە بۆ خۆی (مالكي)یە گوتوویەتی[73]: (واقوى المذاهب في المسألة مذهب ابي حنيفة دليلاً وأحوطها للمساكين، واولاهما بشكر النعمة، وعليه يَدُلُّ عمومُ الآية والحديث) واتە: وە بەهێزترین ڕا لەڕووی بەڵگەوەو دووربینانەترینی بۆ نەداران و نیزیکترینی بۆ سوپاسگوزاری چاکەی خوا، ڕای (ابوحنیفة)یە، کە گشتییەتی ئایەتو فەرموودەش دەلالەتی لەسەر دەکەن.

ج-ئەو ئەندازەیەی کە زەکاتی لێ دەکەوێ (النصاب):

زۆربەی هەرە زۆری زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە بەروبوومو بەرهەمی کشتوکاڵو میوە مادام نەگەیشتبێتە پێنج وەسق زەکاتی لێناکەوێ، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (لَيْسَ فيما دُونَ خَمْسَةِ أوسق صَدَقَةٌ) متفق عليه عن ابي سعيد الخدري.

واتە: لەپێنج وەسق کەمتر زەکاتی تێدا نیە.

بەڵام ژمارەیەك لەزانایان کە یەکێکیان (ابو حنیفە)یەو هەرکام لە (ابراهيم النخعي و عطاء ابي رجاء العطاردي و (ابن حزم)یش گوتوویەتی: مجاهدو حماد بن أبي سليمان و عمر بن عبدالعزیز)یشیان لەنێودان[74]، ڕایان وایە کە لەکەمو زۆری زەکات دەدرێو (نصاب) مەرج نیە.

بەڵام مادام پێغەمبەری خوا ﷺ مەسەلەکەی هەڵبڕیبێ بێگومان هەر قسەو بۆچوونێکی دیکە لەوبارەوە زیادەیە، هی هەرکەسێك بێ.

پێنج وەسق (خمسة اوسق)یش لەبەرئەوەی هەر وەسقێك شەست (صاع)ە بەیەکدەنگی زانایان[75] دەکاتە (٥×٦٠=٣٠٠) صاع، ئنجا هەر (صاع)ێکیش کێشەکەی (٢,١٧٦) گرامە، بەڕای زۆربەی[76] زانایان، کەواتە:

---

[73] بڕوانە: (شرح الترمذي) ج٣ص١٣٥.

[74] بڕوانە: (فقه الزكاة) ج١ص٣٦١، ٣٦٢، وە بڕوانە: (المحلى) ج٥ص١٤٧.

[75] بڕوانە: (المغني) ج٢ص٥٦٠، کە گوتوویەتی: (قال ابن المنذر: هو قول كل من يحفظ عنه من اهل العلم).

(٣٠٠×٢,١٧٦=٦٥٢,٨ كيلۆگرام‌و بۆ ئاسانكاری ده‌ڵێین (٦٥٣) كیلۆگرام (نصـاب)ی دانه‌وێڵه‌و میوه‌یه[٧٧].

ئه‌وه بۆ ئه‌و جۆره به‌روبوومه‌ی كه ده‌گونجێ راسته‌وخۆ بپێورێ‌و بكێشرێ، بۆ جۆره‌كانی دیكه‌ش راسترین و په‌سه‌ندترین را ئه‌وه‌یه، كه نرخی (نصاب)ی دانه‌وێڵه‌و میوه‌جاتێكی میانه (متوسط) بكرێته ته‌رازووی، بۆ وێنه:

ئه‌گه‌ر نرخی (٦٥٣) كیلۆگرام گه‌نم ئه‌ندازه‌یه‌ك پاره‌ی قاقه‌ز بێت كه به‌رانبه‌ری (١٠) مسقاڵ زێڕ بێت، هه‌ركاتێك جوتیارێك بایی ئه‌و ئه‌ندازه پاره‌یه جۆرێك له‌و به‌روبوومانه‌ی هه‌بوو - بۆ نموونه شه‌كر یان لۆكه -، ئه‌وه پێویسته زه‌كاتی لێ بدات ئه‌گه‌رنا لێی نادرێ[٧٨].

د- ئه‌ندازه‌ی زه‌كاتی به‌روبوومی كشت‌وكاڵ‌و میوه‌جات:

له‌سۆنگه‌ی ئه‌وه‌وه كه چه‌ند فه‌رمووده‌یه‌كی راست‌و راشكاو له‌وباره‌وه هه‌ن، تێكرای زانایان له‌سه‌ر ئه‌وه یه‌كده‌نگن بوو ون، كه ئه‌ندازه‌ی زه‌كاتی كشت‌وكاڵ دووجۆره: ئه‌گه‌ر به‌ئاوی باران یان رووبارو كانیاو ئاودرابێ، یان زه‌وی‌یه‌كه‌ی وابووبێ هه‌ر پێویستی به‌ئاودران نه‌كردبێ له‌به‌ر شێداری، ئه‌وه زه‌كاتی به‌روبوومی ئه‌و كشت‌وكاڵه ده‌بیه‌ك (١/١٠)ه، به‌ڵام ئه‌گه‌ر ئاوی بۆ هه‌ڵهێنجرابێ یان به‌زه‌حمه‌ت‌و مه‌سره‌فی زۆر بۆی راكێشرابێ‌و بۆی هێنرابێ، ئه‌وه زه‌كاته‌كه‌ی بیست یه‌ك (١/٢٠)ه، بۆ وێنه له‌وباره‌وه ئه‌م ده‌قه دێنینه‌وه كه‌پێشتریش هێناومانه:

(عن ابن عمر رضي الله عنهما عن النبي ﷺ قال: فيما سَقَتِ السَّماءُ والعُيونُ أو كان عَثرياً العُشْرُ، وفيما سُقي بالنضح نصف العُشرِ) رواه البخاري.

---

[٧٦] زاناو شه‌رعزانانی هاوچه‌رخ ده‌رباره‌ی ئه‌ندازه‌ی (صاع) به‌گرام، رایان جیاوازه، وه‌ك چۆن زانایانی پێشین رایان جیاواز بووه، به‌ڵام زۆربه‌یان كه (شافعي و يوسف و محمد بن الحسن و فقهاء الحجان) یان له‌نێودان به (٢,١٧٦) گرامیان داناوه، بڕوانه: (فقه الزكاة) ج١ص٣٧٥، وه: (الفقه الأسلامي) ج١ص١٤٢، ١٤٣، وه: (الأدلة الرضية) ص١٢٣، به لیتریش (٢,٧٥) واته (٣) لیتر شتێك كه‌مه، به (مست: مد)یش چوار مسته، بڕوانه (الفقه الأسلامي) ج١ص١٤٢، یان پێنج مست بۆ ئیحتیاط، بڕوانه (جواهر الفتاوى) ج١ص٢٢٢، ملا عبدالكريم المدرس، به‌ڵام له‌لای (ابو حنيفه) و هه‌ندێك له‌زانایانی دیكه (٣٨٠٠) گرام یان (٢٧٥١) گرامه، بڕوانه: (الفقه الأسلامي) ج١ص١٤٣.

[٧٧] بڕوانه: (الفقه الأسلامي) ج١ص١٤٢، وه بڕوانه: (الفقه الزكاة) ج١ص٣٧٥.

[٧٨] بڕوانه: (فقه الزكاة) ج١ص٣٧٥، كه له: (المغني) ج٢ص٥٥٧، وه‌ریگرتووه‌و ئه‌م رایه‌ش نی ژماره‌یه‌ك له‌زانایانه كه یه‌كێكیان (ابو يوسف)ه‌و رایه‌كی زۆر ماقووڵه‌و پێم وایه بۆ زه‌كات لێدانی ئه‌وجۆره به‌رهه‌مانه چاره‌یه‌كی دیكه‌مان نیه.

بەڵام ئەگەر نیوەی بەئاوی بارانو نیوەشی بەئاوی هەڵهێنجراوو بەڕەنجو مەسرەف هێنراو ئاودێرکرابێ، ئەوە دەبێ سێ لەسەر چوار (٣/٤)ی دەییەکی زەکات لێبدرێو، (ابن قدامة) لەوبارەوە گوتوویەتی[٧٩]: (ولا نَعْلَمُ فيه مَخالِفاً) نەمانزانیوە هیچ کەس ڕای لەمە جیاوازبێ.

**هـ- مەرجەکانی زەکات لێدانی بەروبوومی کشتوکاڵ:**

١-گەیشتنە ئەندازەی (نصاب)، کەڕای زۆربەی هەرەزۆری زانایانە.

٢-زێدەبون لەدابین کردنی پێداویستییە بنچینەیییەکان، بەڵام ئەگەر جۆرە ماڵو سامانی دیکەی هەبوو کەبەشی دابین کردنی پێداویستییەکانی بکات، لێرەدا ئەو مەرجە پێویست و بگرە دروستیش نابێ.

٣-درانەوەی ئەو قەرزو قۆڵانەی کەبابای جوتیار بۆ ڕەنێو هێنانی بەروبوومەکەی، یان ژیانو گوزەرانی خۆیو ئەوانەی بەئەستۆیەوەن کەوتۆتە بن باریان، ئنجا زەکاتەکە جیا بکرێتەوە، ئەم مەرجەش هەرچەندە زانایان تێیدا جیاوازن بەڵام وادیارە هی ئەوانەی کە بەمەرج گیرانی ڕاست ترو بەجێتر بێت[٨٠].

## ٤-ماڵی بازرگانی (مال التجارة):

زۆربەی هەرە زۆری زانایان ڕایان وایە کە کەلوپەلی بازرگانی (عروض التجارة) زەکاتی لێدەدرێ، هەندێکیشیان ڕایان وایە کەزەکاتی تێدا نیە، جا ئەوە ئێمە لەچەند وردەخاڵێك دا ئەو باسە دەخەینەڕوو.

**ا-مەبەست لەکەلوپەلی بازرگانی چیو چییە؟!**

کەلوپەلو شمەکی بازرگانی سەرجەم ئەو شتانەن کەبازرگانیو مامەڵەیان پێدەکرێ، جا چ گوازراوە بن چ نەگوازراوە (المنقولة وغير المنقولة) وەك کەلوپەلی نێوماڵو قوماشو ئاژەڵو سەییارەو چەكو زەویو زارو خانوو و بەرەو... هتد.

**ب-بەڵگەی فەرزبوونی زەکات لەماڵی بازرگانیدا:**

زۆربەو جەماوەری زانایان کەزەکات لەکەلوپەلی بازرگانیدا بەپێویست دەزانن، سێ جۆرە بەڵگەیان بەدەستەوەن:

---

[٧٩] بڕوانە: (المغني) ج٢ص٥٦٢.

[٨٠] بڕوانە: (المغني) ج٢ص٥٥٩، ٥٦٠، وە بڕوانە: (الفقه الأسلامي) ج٣ص١٨٩٣، ١٨٩٤، ط٤ وە (فقه الزكاة) ج١ص٣٩١تا ٣٩٧.

یەکەم: چەند دەقێک:

خوای پەروەردگار فەرمووبەتی: (يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَنفِقُوا مِنْ طَيِّبَاتِ مَا كَسَبْتُمْ وَمِمَّا أَخْرَجْنَا لَكُمْ مِنَ الأَرْضِ وَلا تَيَمَّمُوا الْخَبِيثَ مِنْهُ تُنفِقُونَ وَلَسْتُمْ بِآخِذِيهِ إِلا أَنْ تُغْمِضُوا فِيهِ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ حَمِيدٌ) البقرة:٢٦٧، کە توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: مەبەست لە (ماكَسَبْتُم)، ئەوەی وەدەست هێناوە، ماڵێکە کەلەڕێی مامەڵەو بازرگانی‌یەوە وەدەست هێنرابێ[٨١].

پێغەمبەری خواش ﷺ فەرموویەتی: (في الأبلِ صَدَقَتُها، وفي الغَنَمِ صَدَقَتُها، وفي البقر صَدَقَتُها، وفي البَزِّ صدقَتُهُ) رواه الدارقطني والبيهقي، واتە: حوشتر زەکاتی خۆی هەیەو، مەڕو بزن زەکاتی خۆی هەیەو، مانگا زەکاتی خۆی هەیە، کەلوپەلیش زەکاتی خۆی هەیە. وە (سمرة بن جندب) خوا لێی ڕازی بێ گوتوویەتی: (أما بَعْدُ: فَانَّ النبي ﷺ كان يامُرُنا أَنْ نُخرِجَ الصَّدقة من الذي نَعُدُّهُ للبَيْعِ) رواه ابوداود والبيهقي؟

واتە: پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێدەکردین کە زەکات لەو ماڵە دەربکەین کە بۆ فرۆشتنمان دادەنا. هەروەها (ابو عمرو بن حماس) لەبابی‌یەوە دەگێڕێتەوە، کە گوتوویەتی: (كُنتُ أَبيعُ الأُدُمَ والجِعاف فَمَرَّبي عمر بن الخطاب رضي الله عنه، فقال: أدِّ صَدَقَةَ مالك! فقلتُ: يا أمير المؤمنين إنما هو الأُدُمُ! قال: قَوِّمْهُ ثُمَّ أَخْرِجْ صَدَقَته) رواه الشافعي واحمد وابوعبيد والدارقطني والبيهقي.

واتە: من پێستەو مەنجەڵم دەفرۆشتن، عومەری کوڕی خەتتاب خوا لێی ڕازی بێ بەلامدا تێپەڕی، وتی: زەکاتی ماڵەکەت بدە! منیش گوتم: ئەی فەرماندەی بڕواداران کەلوپەلەکە تەنیا پێستەیە! گوتی: بیقەبڵێنەو پاشان زەکاتەکەی بدە.

دووەم: قیاس:

کە زانایان ئاوا پێناسەیان کردوە[٨٢]: (قیاس بریتیە لەیەکسان کردنی شتێك کە دەقی لەسەر نەهاتوە لەگەڵ شتێك کە دەقی لەسەرە، لەحوکم دا، لەبەر بەشداری‌یان لەهۆ (علة)ی حوکمەکەدا).

جا زانایان ئاوا قیاس دەکەنە بەڵگەی ئەوە کە کەلوپەلو ماڵی بازرگانی زەکاتی تێدا فەرزە، دەڵێن: کەلوپەلی بازرگانی ماڵێکە کە دەویسترێ گەشەو زیاد بکات، کەواتە ڕاست وەك ئاژەڵو پارەی نەغدینەو بەروبوومی کشتوکاڵ وایەو لەو ڕووەوە هیچ جیاوازی‌یان نیەو ئەوانیش لەبەر هەمان هۆ (علة) زەکاتیان تێدا فەرز کراوە.

---

[٨١] بڕوانە: (جامع البيان) للطبری ج٣ص١١، وە: (الجامع لاحكام القرآن) ج٢ص٢٤٣، قرطبي.
[٨٢] بڕوانە: (الاحكام في اصول الأحكام) للآمدي ج١ص٢٠٩، وە: (الوجيز في اصول الفقه)ص١٩٤.

## سێیەم: یەکدەنگی زانایان ( إجماع العلماء ):

کە زانایان بەم جۆرە پێناسەیان کردووە:[83] (ئیجماع بریتیە لە یەکدەنگ بوونی تێکڕای زانایانی ئیسلام پاش کۆچی دوایی پێغەمبەر ﷺ لەچاخ و سەردەمێك دا لەسەر حوکمێکی شەرعی).

(ابن المنذر) لەبارەی یەکدەنگ بوونی زانایان لەسەر فەرز بوونی زەکات لەماڵی بازرگانیدا گوتوویەتی: (الأجماع قائمٌ على وجوبِ الزكاة في مالِ التّجارةِ... لكن لايُكفّر جاحِدُها للأختلافِ فيها)[84].

واتە: یەکدەنگی زانایان لەسەر فەرزبونی زەکات لەماڵی بازرگانیدا هەیە... بەڵام کەسێك بڕوای پێی نەبێ بەکافر دانانرێ چونکە ڕا جیایی تێدایە[85].

ئنجا وێڕای ئەم سێ بەڵگەیەش کە لەبارەی یەکەمیانەوە لەسەر فەرمودەکانی لەنێو فەرمودەناسان (محدثین)دا مشتومڕ هەیە[86]، دەشتوانین بڵێین: هیچ کەس ناتوانێ نکوڵی لەوەدا بکات کە کەل وپەلی بازرگانی ماڵ و سامانەو ماڵ و سامانیش بەگشتی و بەبێ لێهەڵاواردن بوون (إستثناء) زەکاتی تێدا فەرزکراوە: (خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِمْ بِهَا وَصَلِّ عَلَيْهِمْ إِنَّ صَلَاتَكَ سَكَنٌ لَهُمْ وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ) التوبة: ١٠٣.

کەواتە: ماڵی بازرگانیش زەکاتی تێدا فەرزکراوە.

ئنجا وەك پێشتریش گوتمان فەرزبوونی زەکات لەکەل وپەلی مامەڵەو بازرگانیدا ڕای زۆربەی هەرەزۆری نیزیك بەئیجماعی زانایانە لەپێشین و پاشین و[87]، ئەوانەی پێیان وایە ماڵی بازرگانی زەکاتی لێنادرێ ژمارەیەکی کەمن و بەڵگەیەکی واشیان بەدەستەوە نیە شایانی باس بێت و لەبەرانبەر بەڵگەکانی جەماوەری زانایان دا خۆی بگرێ[88].

---

[83] بڕوانە: (الأحكام..) ج١ص٢٥٤، وە: (الوجيز...) ص١٧٩، للدكتور عبدالكريم زيدان.

[84] بڕوانە: (مجموعة الفتاوى) لأبن تيمية، ج٢٥ص١٣، وە بڕوانە: (سبل السلام) ج٢ص٨٢٥.

[85] بەڵام (قنوجي) نکوڵی کردوە لەدامەزرانی ئیجماع لەوبارەوە، بڕوانە: (الروضة الندية) ج١ص٢٨٨. منیش ڕایەکەی بەڕاست دەزانم چونکە مادام ڕا جیایی تێدا هەبێ دیارە ئیجماعی لەسەر نەبووە!

[86] بڕوانە: (الروضة الندية شرح الدرر البهية) ج١ص٢٨٦تا٢٨٨.

[87] (نووي) گوتوویەتی: ئەمە ڕای: (نخعي و مالك وثوري و اوزاعي و شافعي وابوحنيفة واصحابه واحمد واسحاق وابوثور و ابوعبيد)ە،، بڕوانە: (المجموع) ج٦ص٤١، وە: (سبل السلام) ج٢ص٨٢٥.

[88] ئەمە ڕای: (داود الظاهري)یە بڕوانە: (المجموع) ج٦ص٤١، وە ڕای (شوكاني) یشە، بڕوانە: (الأدلة الرضية) ص١٢١، وە: (الروضة الندية) ج١ص٣٨١.

ج–چۆنیەتی زەکات دران لەماڵی بازرگانی:[89]

ماڵی بازرگانی سێ حاڵەتی هەن:

یەکەم: یان کەل وپەلەو کڕاوەو جارێ بابای بازرگان نەیفرۆشتوە.

دووەم: یان پارەیەکی لەبەر دەستە جا چ لەشێوەی دراودابێ چ لەشێوەی چەکەو لەبانق دابێ، یان لەشێوەی پشك (سهم) و لەشەریکەیەکی هاوبەش دا.

سێیەم: یان لەشێوەی قەرزو قۆڵ دایە کەلەلای خەڵکی یە، جا چ وەرگرتنەوەی ئاسان بێت و ئومێدی پێ ی هەبێ، چ لێ ی بێ هیوا بووبێ، کە بێگومان حوکمەکەیان جیاوازە، وەك لەبەندی دووەم دا لەبڕگەیەکی تایبەت دا باسمان کردوە.

هەروەها مەگەر چۆن دەنا بابای بازرگان وەك چۆن قەرزی لەلای خەڵك دەبێ، قەرزی خەڵکیشی بەلاوە دەبێ!

جا ئایا بابای بازرگان چۆن چۆنی زەکاتی ماڵ و سامانەکەی دەدات، کە هەموو ئەو جۆرە حاڵەتانەی هەن؟!

بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە سێ قسەی پڕ مانا لەسێ لەپێشەوایانی شوێن کەوتووان (ائمة التابعین) دەخوازینەوە کە لەوبارەوە گوتوویانن و (ابوعبید) گێڕاونیەوە[90]:

١–(میمون بن مهران) گوتوویەتی: (إذا حَلَّتْ علیك الزَّكاةُ فانْظُرْ ماكان عندكَ من نَقْدٍ اوْ عَرَضٍ فَقَوِّمْهُ قیمة النَّقْدِ، وماكانَ من دَیْنٍ في مَلَأةٍ فَاْحْسَبْهُ ثم اْطْرَحْ منه ماكان علیك مِنَ الدَّیْنِ، ثم زَكِّ مابَقِيَ).

واتە: هەرکاتێك وەختی زەکات دانت هات، سەرنج بدە داخوا ماڵی نەغدینەو کەل وپەلت چ لەلا هەیە! ئەوە بەپێ ی پارەی نەغدینە بینرخێنە، هەروەها ئەو قەرزانەشت کەمیوات پێیان هەیە حیسابیان بکە، وە ئەو قەرزانەی کە لەسەرتن لەو ماڵەی کەدەتەوێ زەکاتی لێ بدەی دەریان بکە، پاشان ئەوەی دەمێنێتەوە زەکاتی لێ بدە.

٢–(الحسن البصري)یش هەر لەوبارەوە گوتوویەتی: (اذا حضر الشهر الذي وقَتَ الرَّجُلُ انْ یُؤَدِّيَ فیه زكاته، أدَّىٰ عن كلِّ مالٍ لَهُ وكل ما اْبتاع من التجارةِ، وكل دَیْنٍ، إلا ماكان منه ضِماراً لایَرْجُوه). واتە: هەرکات ئەو مانگەی کە کابرا زەکات دانی خۆی تێدا دیاری کردوە، هات با –بابای زەکات دەر–، لەهەموو پارەی نەغدینەی و، ئەو کەل وپەلەی بۆ بازرگانی کڕیویەتی و، هەر قەرزێك کەلای خەڵکی هەیەتی، زەکات دەربکات، مەگەر قەرزێکی نادیار کە ئومێدی پێ نەماوە.

[89] بۆ نووسینی ئەم باسە سوودم لە (فقه الزكاة) ج١ص٣٣٢تا٣٣٩.

[90] بڕوانە: (الأحوال) لأبي عبید، ص٤٢٦، کە (فقه الزكاة)یش هێناونی، ج١ص٣٣٢، ٣٣٣.

٣-(ابراهيم النخعي)یش هەر لەو بارەوە گوتوویەتی: (يُقَوِّمُ الرَّجُلُ مَتاعَهُ إذا كان للتجارة اذا حَلَّتْ عليه الزكاة فَيُزَكِّيهِ مَعَ مالِهِ) واتە: هەرکاتێك کابرا کاتی زەکات دانی هات ئەو کەلوپەلەی کە بۆ بازرگانی دایناوە لەگەڵ پارەی نەغدینە کەھەیەتی زەکاتی لێدەدات.

جا خوێنەری بەڕێز! ئێستا لەم سێ دەقەوە کە لەو سێ پێشەوا بەڕێزە خوا لێیان خۆش بێ هێنامانەوە زۆر چاك روون بۆوە کە ماڵی بازرگانی چۆن چۆنی زەکاتی لێدەردەکرێ!

بابای بازرگانی مسوڵمان لەوکاتەدا کە ساڵانە دیاری کردووە بۆ زەکات دان دێنێ هەرچی کەلوپەل و شمەکی بازرگانی هەیەتی، لەگەڵ ئەو قەرزانە کەئومێدی وەرگرتنەوەیانی هەیە. هەموویان پێکەوە خڕ دەکاتەوەو کۆدەکاتەوەو زەکاتیان لێدەردەکات بەڕێژەی زەکاتی پارەی نەغدینە کە چل یەك (١/٤٠) یان (٢,٥٪)ە، بەمەرجێك گەیشتبێتە ئەندازەی (نصاب) بە پێوەری زێڕ، وەك پێشتر روونمان کردەوە.

بەڵام ئەو قەرزانەی کەهیوای پێیان نەماوە، هەرکاتێك وەریگرتنەوە ئەوە زانایان لەبارەیان رایان جیاوازەو وەك پێشتریش ئاماژەمان پێکرد لەبڕگەیەکی تایبەتی بەندی دووەم[1] روونمان کردۆتەوە.

بەر لەوەی ئەم باسەش (چۆنیەتی زەکات دران لەماڵی بازرگانی) بەجێ بهێڵین بەپێویستی دەزانم سەرو تیشك بخەینە سەر چوار مەسەلەی پەیوەست بەم باسەوە:

یەکەم: ئەوەی لەبارەی چۆنیەتی زەکات دەرکردن لەماڵی بازرگانی گوتمان رای زۆربەی هەرەزۆری زاناو شەرعزانان بوو کە (ابوحنيفة و شافعي و أحمد و ثوري اوزاعي) یان لەنێودان، بەڵام (مالك) رای وایە کە بازرگانەکان دوو جۆرن، جۆرێکیان بازرگانییەکەیان زیاتر شێوەیەکی سەرپێیی هەیەو ناتوانێ کاتێك دیاری بکات بۆ کڕین و فرۆشتنی کەلوپەلەکانی، جا ئەم جۆرەیان - مالك - رای وەك جەماوەری زانایانە کە دەبێ ساڵانە زەکاتی کەلوپەلەکانی بدات.

بەڵام جۆرەکەی دیکەیان کە کەلوپەلێك دەکرێ و پاشان چاوەڕێ دەکات نرخی ئەو شمەکە بەرز بێتەوە ئەوجار بیفرۆشێ - کە (مالك) ئەم جۆرەی ناوناوە بازرگانی هێڵەرەوەی کەلوپەل (التاجر المُحْتَكِرْ)، وە ئەوەی پێشووش بە بازرگانی سەرپێیی یان هەڵسووڕێنەر (التاجر المدير) ناوبردوە - ئەمە ساڵانە زەکاتی لەسەر فەرز نیە، بەڵکو هەرکاتێك فرۆشتنی زەکاتی ساڵێکی لێدەردەکات! بەڵام بێگومان رای زۆربەو جەماوەری

زانایان بەهێزترو بەڵگەدارترە، ئەوەندە هەیە ئەو ڕایەی (مالك)یش دەگونجێ بۆ هەندێك حاڵەتی دەگمەن (نادر)و تایبەت کە هەندێك جۆرە شمەكو کەلوپەل بێ ڕەواج دەبنو خاوەنەکەیان لێیان دەچێتە زەرەرێ، وەربگیرێو کاری پێ بکرێ.

**دووەم:** ئەوەی کە لەماڵی بازرگانی زەکاتی لێدەدرێ ئەوەیە کە بابای بازرگان دەیگێڕێو کڕینو فرۆشتنی پێدەکات، بەڵام ئەو شتانەی کە بە ژێرخانی پرۆسەی بازرگانی کردن (أساسيات عملية التجارة) دادەنرێنو بابای بازرگان دەستیان لێنادات و نایەوێ مامەڵەو سەودایان پێ بکات، وەك: ئەو صندووقو قەفەزو عەمبارانەی کە کەلوپەلی بازرگانییان تێدا دەپارێزێ، وە ئەو ئامێرو ئامرازانەی کە بۆ بازرگانی پێکردنەکەی پێویستنی.. هتد ئەوە ئەوجۆرە شتانە هیچیان زەکاتیان لێنادرێ چونکە حوکمی کەلوپەلی شەخسیو شتی هەڵگیراو (عروض القُنية)یان هەیەو، بێگومان ئەوجۆرە شتانەش زەکاتیان لێنادرێ.

**سێیەم:** کەلوپەلی بازرگانی لەکاتی زەکات لێدانیدا بەچ نرخێك دەنرخێنرێت؟!

لەو بارەوە زانایان سێ ڕایان هەن:

ڕای یەکەمیان کەڕای زۆربەو جەماوەری زانایانە، ئەوەیە کە بەو نرخەی کە لەکاتی زەکات لێدران دا لەبازاڕ هەیەتی دەقەبلێنرێ، واتە بەنرخی ڕۆژ، کە لەوبارەشەوە ئەم دەقە لە (ابن جابر بن زيد) ەوە هاتوە کە یەکێکە لەزانایانی چینی شوێن کەوتووان (جيل التابعين): (قَوِّمْهُ بِنَحْوِ من ثَمَنِهِ يوم حَلَّتْ فيه الزكاة، ثم أَخْرِجْ زكاتَهُ)[91].

واتە: بەنرخی ئەو ڕۆژە کە زەکاتی تێدا فەرزبووە بینرخێنەو پاشان زەکاتی لێدەربکە.

ڕای دووەمیان کە لە (ابن عباس)یش گێڕراوەتەوە[92]، ئەوەیە چاوەڕێ بکرێ تا دەفرۆشرێو ئەوکاتە بەگوێرەی نرخی پێفرۆشرانی زەکاتی لێدەدرێ، بەڵام هەر لەکاتی زەکات تێدا فەرزبوونییەوە زەکاتەکەی لەسەر پێویستەو حساب دەکرێ.

ڕای سێیەمیش ئەوەیە کە زەکاتەکە بەپێی نرخی پێکڕانی دەدرێ، نەك بەهای پێفرۆشرانی[93]، بەڵام بێگومان ڕای زۆربەو جەماوەر لەهەموویان ڕاست ترو بەهێزترە.

**چوارەم:** ئایا زەکات لەخودی کەلوپەلەکە دەدرێ یان لەنرخەکەی؟! پاش نرخاندنی کەلوپەلی بازرگانیو دیاریکردنی ئەندازەی زەکاتەکەی، ئایا پێویستە ئەو زەکاتە هەر لەخودی کەلوپەلەکە بدرێ یان بەئەندازەی نرخەکەی پارەی نەغدینە دەدرێ؟ زانایان چەند ڕایەکیان هەیە:

---

[91] بڕوانە: (فقه الزكاة) ج١ص٣٣٦، کە لە (الاحوال)ی ابوعبيد، ص٤٢٦ وەریگرتوە.

[92] هەمان سەرچاوەی پێشوو ج١ص٣٣٧.

[93] بڕوانە: (بداية المجتهد) ج١ص٢٧٨.

هەرچی (ابو حنیفة) و (شافعي)یە لەیەكێك لەقسەكانیاندا، رایان وایە كە بابای زەكاتدەر سەرپشك (مختار)ە لەنێوان نرخ و خودی كەلوپەلەكەدا[٩٤].

بەڵام (احمد) و(شافعي) لەقسەیەكی دیكەیاندا دەڵێن: پێویستە لەنرخەكەی بێت نەك لەكەلوپەلەكە چونكە (نصاب)ی ماڵی بازرگانی بەتەرازوو و پێوەری نرخ (قیمة) دیاری دەكرێ و زەكاتێكیش كە لەنرخەكەی دەدرێ وەك لەخودی كەلوپەلەكە درابێ وایە، (ابن قدامة) لەوبارەوە گوتوویەتی: (وَ لا نُسَلِّمُ أنَّ الزَّكاةَ وَجَبَتْ في المالِ، وإنَّما وَجَبَتْ في قيمته)[٩٥].

بەڵام (مزني) و (شافعي) لە قسەیەكی دیكەدا، دەڵێن دەبێ لەخودی كەلوپەلەكە زەكات بدرێ و لەنرخەكەی دروست نیە[٩٦].

واش پێدەچێ راست و چاكترین را لەوبارەوە ئەوەبێ كە مادام بەرژەوەندی بابای زەكات وەرگر لەوەدابێ كەنرخ و دراو وەربگرێ، بۆ وێنە ئەگەر كەلوپەلەكەی پێویست نەبوو، وە پارە دراوەكەی بۆ شتێكی پێویست تر دەویست، یان ئەگەر زەكات دان لەكەلوپەلەكە بۆ بابای زەكات دەر سەغڵەت كردن و زەحمەتی تێدا بوو، ئەوە پێویست یان پەسەند یان بەلای كەمەوە دروست (جائز) بێ كەزەكات لەنرخەكەی بدرێ، وەك (ابن تیمیة)ش بەگشتی لەوبارەوە گوتوویەتی[٩٧].

وە ئێمە لەبڕگەیەكی سەربەخۆی بەندی دووەم دا ئەم مەسەلەیەمان توێژیوەتەوە، نەك هەر دەربارەی ماڵی بازرگانی بەڵكو بەگشتی دەربارەی هەموو جۆرە ماڵ و سامانەكانی زەكات لێدەركراوەوەو ئەو رایەشمان پەسەند كردوە كە دروستە نرخ (قیمة) لەجیاتی خود (عین)ی شتەكان بەزەكات بدرێ.

**د-مەرجەكانی زەكات لێدرانی ماڵی بازرگانی:**

ماڵی بازرگانیش وەك هەموو جۆرە ماڵ و سامانەكانی دیكە ئەگەر چەند مەرجێكی تێدا نەیەنەدی زەكاتی لێناكەوێ، مەرجەكانیش ئەمانەن:

١-كە ئەو ماڵە بەكردەوە لەبەر دەستی و لەژێر ركێفی دابێت و بووبێتە خاوەنی.

٢-كە نیازو مەبەستی بازرگانی و مامەڵە پێكردنی لەدڵ دا بووبێ واتە نیەتی بازرگانی پێوەكردنی لەو ماڵ و كەلوپەلە هێنا بێ.

---

[٩٤] بڕوانە: (المغني) ج٢ص٦٢٥.

[٩٥] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[٩٦] بڕوانە: (بداية المجتهد) ج١ص٢٧٨، وە: (فقه الزكاة) ج١ص٣٢٨.

[٩٧] بڕوانە: (مجموعة الفتاوى) ج٢٥ص٣٠،٣١.

٣-كە ساڵی بەسەردا سووڕابێتەوە.

٤-کە گەیشتبێتە ڕادەی (نصاب)، جا زانایان لەوبارەوە سێ ڕایان هەن: (مالك و شافعي)[٩٨] دەڵێن: تەنیا لەکۆتایی ساڵ دا گەیشتنە (نصاب)ی تێدا بەمەرج گیراوە. بەڵام (ابوثور واحمد وإسحاق و ثوري وابوعبيد وابو المنذر)[٩٩] دەڵێن: گەیشتنە (نصاب)ی لەسەرجەمی ساڵدا تێدا بەمەرج گیراوە، (ابوحنيفة) و هاوەڵەکانیشی دەڵێن: پێویستە لەسەرەتاو کۆتایی ساڵ دا لەڕادەی (نصاب) دا بێت، بەڵام ئەگەر لەغەیری ئەو دوو کاتانەدا نەشگەیشتبێتە ڕادەی (نصاب) زیانی نیە[١٠٠]، واش دێتە بەرچاو کە ڕای یەکەم کەمی (مالك و شافعي)یە لە هەموو ڕایەکانی دیکە بەهێزتر بێ، چونکە هیچ دەقێکی ڕاست (صحيح) لەپێغەمبەرەوە ﷺ لەو بارەوە نەهاتوە، وە لە ڕۆژگاری پێغەمبەری خواو ﷺ خەلیفە سەر ڕاستەکان (الخلفاء الراشدون)یدا کاربەدەستان ڕەوانە دەکران بۆ کۆکردنەوەی زەکات و نەشزانراوە لەهیچ کەسیان پرسیبێ کە ئایا لەکەنگێوە ئەم سامانە گەیشتۆتە (نصاب) و ئایا چەند مانگی پێچووە؟! بەڵکو لەو کاتەدا کە لەساڵێدا دیاریکرابوو زەکاتەکەیان وەردەگرت لەو ماڵ و سامانانەی کە گەیشتبوونە (نصاب) و ساڵێکی مانگیی (سنة قمرية)یان بەسەردا تێپەڕیوو بوو.

٥-کە ئەو ماڵی بازرگانییە هەر ئەوەندە نەبێ کە بابای بازرگان بۆ دابین کردنی پێداویستییە بنەڕەتییەکانی خۆی و ئەوانەی بە ئەستۆیەوەن پێویستی پێی هەبێ.

٦-پێشتریش باسمان کرد کە دەبێ بەر لە جیاکردنەوەی زەکات ئەو قەرزانەی لە سەرنی بیان داتەوە، یان حیسابیان بکات ئەوجار زەکاتەکەی بدات.

شایانی باسیشە کە زانایان لەسەر چوار مەرجەکانی پێشەوە کۆک و یەکدەنگن بەڵام لەسەر مەرجی پێنجەم و شەشەم ڕایان جیاوازە، هەرچەندە ڕای ڕاست تر بەمەرج گیرانی ئەوانیشە وەك مەرجەکانی پێشوویان.



---

[٩٨] بڕوانە: (المجموع شرح المهذب) ج٦ص٤٩ ە وە: (فقه الزكاة) ج١ص٣٢٩.

[٩٩] بڕوانە: (المغني) ج٢ص٦٣٣.

[١٠٠] بڕوانە: (الفقه الأسلامي...) ج٢ص١٨٦٧، ط٤.

## ٥) خەزنەو کانزایەکان (الرِّكاز والمَعادِنْ)

خوێنەری بەڕێز! خوا پشتیوان بێ پاش پێناسەکردن و ڕوونکردنەوەی چەمك و واتای هەرکام لەوشەکانی (المَعْدِن) و(الكَنْز) و(الرِّكاز)، بەجیا جیاو لەچەند وردە خاڵێك بەکورتی باسی هەرکام لەخەزنەو کانزایەکان دەکەین.

پێناسە: زاناو شارەزایانی زمانی عارەبی لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە وشەی (معدن) کە کۆیەکەی (معادن) ە و لەئەسڵ دا لەڕیشەی (عدن)ەوە هاتوە کە بەمانای (أقامَ) دێ، دەگوترێ: (اقام بالمكان) واتە: لەشوێنەکەدا مایەوە، بەو ماددە کانزاییيانە دەگوترێ کە خوای بەخشندە هەر لەڕۆژی بەرێوە خستوونیە نێو زەوی، کەواتە ڕیشە زمانییەکەی بەمانای مانەوەیە، بەڵام پاشان کراوە بەناو بۆ خودی ئەو ماددە کانزاییيانەی کە لەزەویدا ڕۆنراون و چەسپێنراون و نیشتەجێ کراون.

وە هەمووشیان لەسەر ئەوە ڕێك کەوتوون کە وشەی (کنز) کە کۆیەکەی (کنوز)ە بەو خەزنەو ماڵ و سامانانە دەگوترێ کە پێش ئیسلام خەڵکی لە ژێر گڵ و بن بەردو کەڵەك و ئەشکەوت دا شاردوویاننەوەو پەنهانیان کردوون[101]. بەڵام دەربارەی وشەی (رکاز) ڕایان جیاوازە، هەرچی (أبوحنیفة)یە ڕای وایە کە وشەی (رکاز) لەئەسڵدا بەمانای کانزا (معدن) دێ، بەڵام بەشێوەی مەجاز بەمانای خەزنە (کنز)یش دێ، بەڵام (مالك وشافعي) و سەرجەم شەرعزانان (فقهاء)ی حیجاز ڕایان وایە کە (رکاز) بەس بەخەزنە (کنز) دەگوترێ و کانزا ناگرێتەوە، ئنجا بەسەرنج دانی فەرهەنگەکانی زمانیش دەردەکەوێ کەڕای (أبوحنیفه) و هاوەڵەکانی ڕاست ترە، (ابن الأثير) لەوبارەوە گوتوویەتی:[102] (الرِّكازُ عند أهلِ الحِجازِ كُنوزُ الجاهلية المَدْفونة في الأرض وعند أهل العراق: المعادن، والقولان تَحْمِلُهُما اللغة، لأن كُلا منهما مركوزٌ في الأرض أي ثابتٌ) واتە: وشەی (رکاز) لەلای خەڵکی حیجاز بەخەزنەکانی سەردەمی نەفامێتی دەگوترێ کە لەزەویدا شێرراونەوە، وە لەلای خەڵکی عێراق – دیارە مەبەست لەخەڵکی حیجازو عێراق زاناو شارەزایانی ئەو دوو وڵاتەن – : کانزایەکانن، وە زمانیش هەردووك قسەکان هەڵدەگرێ، چونکە هەردووکیان – واتە خەزنەو کانزا – لەزەویدا پەنهان کراون، واتە چەسپێنراون.

---

[101] بۆ پێناسەی هەرکام لە (معدن) و (کنز) سەرنجی ئەم سەرچاوانە بدە: (النهاية في غريب الحديث والأثر) ج٣ص٨٢، یە: (المعجم الوسيط) ص٥٨٨، وە ص (٨٠٠)، وە بڕوانە: (المنجد) وشەی (عدن، وە (رکن)

[102] بڕوانە: (النهاية في غريب الحديث والأثر) ج٢ص١٠٧.

هەروەها هەرکام لەخاوەنی (القاموس المحيط)[103] و (المعجم الوسيط)[104] هەمان قسەو بيزورا بەتەعبيرێکی ديکە دووبارە دەکەنەوە.

کەواتە: کورتەی قسان ئەوەيە کە وشەی (كَنز) تايبەتە بەخەزنەو ماڵو سامانی لەزەویدا شارراوەی پێش ئيسلامو، وشەی (معدن) يش تايبەتە بە کانزايەکانەوە، بەڵام وشەی (رکاز) هەردووك لايان دەگرێتەوە.

خەزنە (الكنز)[105]:

## ١-بەڵگەی هەق تێدا پێويست بوونیو ئەندازەکەيشی:

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموويەتی: (... **وفي الرِّكازِ الخُمُسُ**) متفق عليه عن ابي هريرة.

واتە: وە ئەوەی لەژێر گڵ دا شارراوەتەوە پێنج يەکی لێدەدرێ.

هەروەها لەوەڵامی کەسێك دا کە دەربارەی ماڵی دۆزراوە (اللقطة) پرسياری لێکردوە فەرموويەتی: (**ما كان في طريقٍ مَأْتيٍ أو في قَرْيَةٍ عامِرَةٍ، فَعَرِّفْها سَنَةً، فإن جاءَ صاحِبُها وإلاّ فَلَكَ، ومالم يكن في طريقٍ مَأتيٍّ ولا في قريةٍ عامِرةٍ، فَفيهِ وفي الركازِ الخُمُسُ**) رواه النسائي عن عمر بن شعيب عن ابيه عن جده.

واتە: ئەوەی کە لەرێگايەکی وادا کە خەڵکی پێدا بڕوات يان دێيەکی ئاوەدان دۆزيتەوە، ساڵێك بانگ بکەو بەخەڵکی بناسێنە، جا ئەگەر خاوەنەکەی هات باشە، ئەگەرنا ئەوە هی تۆ دەبێ، بەڵام ئەگەر لەرێيەکی گوزەر پێداکراوو دێيەکی ئاوەدان دا نەبوو، ئەوە لەو -شتە دۆزراو -هداو لەماڵی شێرراوە (خەزنە)دا پێنج يەك (١/٥) هەيە.

## ٢-ئايا زەکات دان لەخەزنە هيچ مەرجی هەن؟!

زۆربەی هەرە زۆری زانايان کە (مالك و ابوحنيفة واحمد و اسحاق وشافعي لەرای کۆنیدا) يان لەنێودان دەڵێن گەيشتنە (نصاب) مەرج نيە بۆ زەکات لێدەرکرانی خەزنە، بەڵام (شافعي) لەرای نوێیدا پێی وايە کە گەيشتنە (نصاب) مەرجە بۆ زەکات لێدرانی[106].

هەروەها تێکرای زانايان لەوەشدا يەکران کە ساڵ بەسەردا وەسووڕانەوەی مەرج نيەو پێويستە پاش دەستگيربوونی پێنج يەکەکەی لێدەربکات[107].

---

[103] بڕوانە: ج١ وشەی (رکز)

[104] بڕوانە: (ص٣٦٩).

[105] لەزمانی کوردیدا وشەی (خەزنە)يان (غەزنە) بەمانای (كنز)ی عارەبی بەکاردێنن، بەتايبەت لەچيرۆکو بەسەرهاتە فۆلکلۆريەکان دا زۆر باوەو بەکارهێنراوە.

[106] بڕوانە: (المغني) ج٢ص٦١٥، بەڵام (نووي) ڕای جەماوەری پەسەند کردووە، بڕوانە: (المجموع) ج٦ص٨٣.

[107] بڕوانە: (نيل الأوطار) ج٤ص٢١١، وە بڕوانە: (المجموع) ج٦ص٨٣.

سەبارەت بەمەرجەکانی دیکەش، وەك: قەرزدار نەبوون و یەك لەسەر نەکەوتن بۆ دابین کردنی پێداویستییە بنەڕەتییەکان، لەو سەرچاوانەدا کە تەماشام کردوون نەمدیتوە باسیان کرابێ بەبوون و نەبوون، بەڵام بەقیاس لەسەر زەکاتی شتەکانی دیکە دەبێ ئەوانیش بەمەرج بگیرێن، هەرچەندە پێم وایە ئیحتیاط وایە بەمەرج نەگیرێن و هەرچۆن بووە پێنج یەکەکەی لێ دەربکرێ.

## ٣-خەزنە بەچی وچی دەگوترێ؟!

زۆربەی زانایان ڕایان وایە کە هەرجۆرە ماڵ و سامانێك لەژێر زەویدا شێررابێتەوە بەخەزنە دادەنرێ، بەڵام (شافیعییەکان) بەس زێڕ وزیو بەخەزنە دادەنێن، ئاشکراشە کە ڕای جەماوەر ڕاست ترو بەجێترە، چونکە مادام لەدەقەکانی سوننەت دا خەزنە تەنیا بەزێڕو زیو دانەنراوەو بەگشتی باسی کراوە پێویستە هەروا بهێڵرێتەوە[108].

ئنجا لێرەدا مەسەلەیەکی گرنگ هەیە کە دیسان لەکتێب و سەرچاوەکانی بن دەستم دا - بە (فقه الزكاة)ی د. قرضاوي یشەوە کە زۆربەی مەسەلەو بابەتە تازە پەیدابووەکانی لەمەڕ زەکاتی باس کردوون - باسی نەکراوە، ئەویش ئەوەیە کە ئایا ئەو شتانەی کە لە شوێنەوارە مێژوویییەکانی پێش ئیسلام دا دەدرۆزرێنەوە لەشوێنەوارەکان (آثار)ی گەلان و دەوڵەتانی پێشین کە لەم ڕۆژگارەمان نرخ و بەهایەکی زۆریان هەیە، حوکمی خەزنەیان هەیە یان نا؟! جا من لێرەدا بە بۆچوون و ئیجتیهادی خۆم دەڵێم: هەرچەندە ئەگەر مسوڵمانان کیان و قەوارەیەکی شەرعی خۆیانیان هەبێ پێویستە ئەوجۆرە شتانە بەئەمانەتەوە بەدام ودەزگا پسپۆڕەکان بسپێررێن بۆئەوەی بۆ لێکۆڵینەوەی مێژوویی سوودیان لێ وەربگرن، بەڵام ئەگەر ئەوە نەکراو نەگونجا ئەوە پێویستە ئەوجۆرە شتانەش - کە زۆرجار گەلێك گەلێك لە زێڕو زیویش بەنرخترن - هەروەك زێڕو زیو ڕەفتاریان لەگەڵ بکرێ، چونکە بەپێی پێناسەی (مال) بەماڵ و سامان دادەنرێن و دەبێ هەمان حوکمیشیان هەبێ.

## ٤-ئەو پێنج یەك (١/٥)ەکەی کە لە خەزنە وەردەگیرێ لەچیدا سەرف دەکرێ؟!

لەسۆنگەی ئەوەوە کە فەرموودەکەی پێغەمبەر ﷺ دیاری نەکردوە ئەو زەکاتەی لەخەزنە وەردەگیرێ چۆن صەرف بکرێ، زانایان ڕایان جیاوازە لەو بارەوە، زۆربەیان کە (أبوحنيفة و أحمد و مالك) لەڕایەکیدا یان لەنێودان دەڵێن: حوکمی دەست کەوتی بێ جەنگ و کوشتار[109] (فيء)ی هەیە، واتە دەبێ بخرێتە خەزێنەی دەوڵەتەوە، بەڵام (شافعي و أحمد) لەڕیوایەتێك دا ڕایان وایە کە وەك زەکات دابەش دەکرێ و حوکمی ئەوی هەیە[110].

---

[108] بڕوانە: (نيل الاوطار) ج٤ص٢١٠، ٢١١، (مالك)یش لەپێناسەی خەزنەدا گوتوویەتی: (ان الركاز انما هو دفن يوجد من دفن الجاهلية مالم يطلب بمال ولم يتكلف فيه نفقة...) الموطأ ص-٢١٠-

[109] (فيء) ئەو دەست کەوت (غنيمة)یە کە بەبێ جەنگ دەستگیردەبێ، بڕوانە (المعجم الوسيط) ص٧٠٧.

[110] بڕوانە: (نيل الاوطار) ج٤ص٢١١.

## کانزایەکان (المعادن):

### ١-ئەو کانزایانە چی‌و چین کە زەکاتیان تێدا فەرزە؟!

زاناو شەرعزانان لەوبارەوە ڕایان جیاجیایە، شافیعی تەنیا زێڕو زیو بەو کانزایانە دادەنێ کە زەکاتیان لێدەدرێ بەڵام (ابو حنیفة) و هاوەڵەکانی هەموو ئەو کانزایانەی کە لەزەوی‌دان و نرخ‌و بەهایان هەیە زەکاتیان تێدا بەفەرز دەزانێ بەمەرجێك بەهۆی ئاگرو گەرم کردنەوە کاریان تێبکرێ‌و شتیان لێدروست بکرێ[111].

حەنبەلی‌یەکانیش[112] هەروەها زەیدی‌یەکان‌و سەرجەم شەرعزانانی شیعە[113]، ڕایان وایە کە هەموو ئەو کانزایانەی کەلەزەوی دەردەهێنرێن چ ڕەق (جامد)بن وەك: ئاسن‌و پۆڵاو مس، وە چ شل (سائل)بن وەك: نەوت‌و گازو کبریت، بەمەرجێك نرخ‌و بەهایان هەبێ زەکاتیان لێدەدرێ.

ئاشکراشە کە ڕاوبۆچوونی حەنبەلی‌یەکان‌و شیعەکان ڕاست ترە، چونکە کانزا (معدن) هەر کانزایە چ توندوڕەق بێ چ نەرم‌و شل، وە مادام دەقەکانی قورئان‌و سوننەت بەگشتی باسیان کردبن، دروست نیە لەخۆمانەوە چەند جۆرێکیان لێ‌هەڵاوێرین مەگەر هیچ نرخیان نەبێ‌و بێکەڵك بن.

دیارە زانایانی پێشووش سوودو کەڵکی هەندێك لەوجۆرە کانزایانەیان بۆ دەرنەکەوتبوو ئەگەرنا بێگومان ڕاو هەڵوێستێکی دیکەیان لەبارەیانەوە دەبوو، ئەوەتا لەم ڕۆژگارەدا نەوت (پەترۆڵ) بەزێڕی ڕەش (الذهب الأسود) ناودەبەن[114]!!

### ٢-بەڵگەی زەکات لێدرانی کانزایەکان‌و ئەندازەکەیشی:

زانایان تێکڕا لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە کانزایەکان پێویستە زەکاتیان لێبدرێ‌و چەند بەڵگەیەکیش دێننەوە کە بەهێزترینیان ئەم دووانەن:

یەکەم: (يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَنفِقُوا مِنْ طَيِّبَاتِ مَا كَسَبْتُمْ وَمِمَّا أَخْرَجْنَا لَكُمْ مِنَ الأَرْضِ وَلا تَيَمَّمُوا الْخَبِيثَ مِنْهُ تُنفِقُونَ وَلَسْتُمْ بِآخِذِيهِ إِلا أَنْ تُغْمِضُوا فِيهِ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ حَمِيدٌ) البقرة: ٢٦٧، چونکە (وَ ممّا اخرجنا لَكُم منَ الأرضِ) وە لەوەی کە لەزەوی بۆتانمان دەرهێناوە) هەموو شتێك کە لەزەوی پەیدا دەبێ، دەگرێتەوەو تەنیا لەسەر ڕووەك کورت هەڵنەهاتوە.

---

[111] بڕوانە: (المجموع) ج٦ص٨٤.

[112] بڕوانە: (المغني) ج٢ص٦١٧.

[113] بڕوانە: (الفقه على المذاهب الخمسة) محمد جواد مغنية، ص١٨٦، وە بڕوانە: (فقه الزكاة) ج١ص٤٢٨.

[114] بڕوانە: (فقه الزكاة) ج١ص٤٣٩.

دووەم: (... وفي الركازِ الخُمُسُ) متفق عليه، کە پێشتر ڕوونمان کردەوە، وشەی: (ركاز) هەرکام لەخەزنەو کانزا دەگرێتەوە.

دەربارەی ئەندازەی ئەو زەکاتەش زانایان چەند ڕایەکیان هەن:

زۆربەیان کە (مالك و شافعي و احمد)و لەپێش ئەوانیشەوە (عمر بن عبدالعزيز) یان لەنێودان دەڵێن: ئەندازەی زەکاتی کانزایەکان بریتیە لەچل یەك (١/٤٠)[115].

بەڵام (ابو حنيفة و زهري) دەڵێن: زەکاتەکەیان پێنج یەکە (١/٥)[116]ە.

وە لەمەزەبی (مالك)دا ڕایەکی دیکەی بەناوبانگ هەیە، کە دەڵێ: هەموو ئەو کانزایانەی کە لە نێو زەوی دەردەهێنرێن هەر جۆرێکی بن، دەبێ بکرێنە موڵکی گشتی بۆ مسوڵمانان، بە بەڵگەی ئەوە کە ئەو جۆرە شتانە بەرژەوەندی لەوەدایە کە موڵکی هەموو مسوڵمانان بن نەك هی چەند کەسێکیان، کە یان دەکەونە دەست خەڵکێکی ناشایستەو سوودو کەڵکی پێویستیان لێ نابینرێ، یان دەبنە مایەی سەرهەڵدانی هەراو کێشەو ئاژاوەو کوشتار لەنێو خەڵکیدا[117].

پێشم وایە ئەم ڕایەی کۆتایی کە بێجگە لە بەڵگەی عەقڵ‌و واقیعی بینراو ئەو بەسەرهاتەی خوارێ کە (أبو عبيد) لەکتێبی: (الأحوال)[118] دا هێناویەتی، پشتگیری دەکات، ڕاست ترین‌و چاکترین ڕایە لەو بارەوەو، گومانیشم نیە کە ئەگەر زاناو پێشەوایانمان لەم واقیع‌و ڕۆژگارەی ئێستامان دا ژیابان بێ سێ‌و دوو ڕای ناوبراویان هەڵدەبژاردو پەسەند دەکرد[119]، بەسەرهاتەکەش ئاوایە:

(عن أبيض بن حَمّالٍ المازني رضي الله عنه أنَّـه اسْتَقْطَعَ رسـول الله ﷺ المِلْحَ الـذي بمـأربَ فَقَطَعَهُ لَهُ، قال: فلما وَلَّى، قيل: يا رسول الله أتَدْري ما قَطَعْتَ لَهُ؟ إنّمـا أقْطَعْتَـهُ المـاءَ العِدَّ ! قـال: فَرَجَّعَهُ مِنْهُ) رواه الترمذي[120] وابن ماجة.

واتە: (أبيض بن حمال المازني) دەگێڕێتەوە کە داوای لەپێغەمبەری خوا ﷺ کردوە کە ئەو خوێیەی لە مەئرەبە بۆی دابڕێ (دیارە مەبەست خوێڵێن‌و کانگای خوێیە) ئەویش

---

[115] بڕوانە: (نيل الاوطار) ج٤ص٢١١، وە بڕوانە: )(المغني) ج٢ص٦١٨.

[116] هەمان سەرچاوەی پێشوو

[117] بڕوانە: (فقه الزكاة) ج١ص٤٤٠، وە بڕوانە (الفقه الأسلامي وادلته) ج٣ص١٨٥٧، ١٨٥٨ط٤.

[118] بڕوانە: (ص٢٧٥، ٢٧٦)، وە بڕوانە: (فقه الزكاة) ج١ص٤٤١.

[119] چونکە بۆ خۆیان بنچینە (قاعدة)ی (تختلف الفَتْوىٰ زماناً ومكاناً وشخصاً)یان داناوە.

[120] بڕوانە: (الأحكام السلطانية) لأبي الحسن الماوردي ص٣٠٥ طبعة بغداد ١٩٨٩.

بۆی دابڕی، بەڵام کاتێك ڕۆیشت، گوترا: ئەی پێغەمبەری خوا! ئایا دەزانی چ شتێکت بۆ دابڕیوە؟ کانگایەکت[121] بۆ دابڕیوە کە وەك سەرچاوەی ئاوی بەردەوامو نەبڕاوەیە! دەڵێ: ئەوجار – پێغەمبەر ﷺ لێی وەرگرتەوە.

جا (ابوعبید) لەبارەی ئەم ڕووداوەوە گوتوویەتی[122]:

(بۆیە پێغەمبەر ﷺ یەکەمجار دابوویە چونکە وای زانیوە کە زەوییەکی بەیار (أرض مـــوات)ەو (أبیض) بۆ خۆی دەیژیەنێتەوەو ئاوەدانی دەکاتەوە، بەڵام کە بۆی دەرکەتوە کانگایەکە وەك کانیو سەرچاوەی بەردەوام لێی وەرگرتۆتـــەوە، چونکـە ڕێبـازی پێغەمبـەر ﷺ لـە لـەوەڕگاو ئـاگر و ئـاو (الکلأ والنار والماء)دا ئەوەیە کە خەڵکی تێکڕا تێیان دا بەشدارن، بۆیە حەزی نەکردوە کەبەتەنیا بیداتە پیاوێكو جیا لەخەڵکی بۆ خۆی پارانی بکات).

جا خوێنەری بەڕێز! لەمەوە کە رابرد وەردەگیرێ کە هەموو ئەوجۆرە کانزایانەی کە خەڵکی بەگشتی ئاتاجیانن‌و پێویستی‌یان پێ‌یـان دەبـێ، دروسـت نیـە بکرێنـە موڵکـی شەخسی‌و تایبەتی‌و پێویستە هەر لەژێر ڕکێفی دەوڵەتی ئیسلامی‌و خاوەنێتی گشتی مسوڵمانان دا بمێننەوە، بۆ وێنە: نەوت، ئاسن، گاز، خوێ... هتد.

ئاشکراشە کە ئەم ڕاوبۆچوونە لەسەدا سەد لەگەڵ ڕێڕەو (إتجاه) ی گشتی ئیسلام دا دەگونجێ کە وێڕای دان هێنانی بەخاوەنایەتی تاکی (الملكية الفردية)دا لەبەر ئەوەی داخوازی‌یەکی سروشتی‌یە لەفیطرەتی ئینسان دا، هەمیشە هەوڵ دەدات کە چینایەتی‌و قڕی‌و پڕی دروست نەبێت، هەر بۆیەش نەك هەر کانزایەکان بەڵکو سەرجەم سەرچاوە سروشتی‌یەکانیشی کردوون بەموڵکی گشتی خەڵکی، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

(ثلاثٌ الناس فيهم شُركاءُ: الماءُ والكلأُ والنارُ) رواه ابوداود وفي رواية: (والملح). واتە: سێ شت خەڵکی تێیان دا هاوبەشن: ئاوو لەوەڕگاو ئاگر، لە ڕیوایەتێکیشدا (خوێ) ش.

ئنجا ئاشکرایە کە لەڕۆژگارو سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ، زیاتر ئەو جۆرە شتانە خەڵکی بەگشتی سوودیان لێ‌وەرگرتوون بۆیە تەنیا ئەوانەی باس کردوە، ئەگەرنا هەر شتێکی دیکەش خەڵکی وەك ئەو چوار شتانە (ئاوو ئاگرو لەوەڕگاو خوێ) پەکیان لەسەریان بکەوێ هەمان حوکمیان دەبێ.

---

[121] وشەی (العِدّ)م بۆیە بەکانگا لێکدایەوە چونکە لەفەرموودەکەدا مەبەستیان پێ‌ی خوێڵێن‌و کانگای خوێ‌یە، هەرچەندە وشەکە لەئەسڵی زمان دا ئاوە بۆ کانی‌و سەرچاوە، بڕوانە: (المعجم الوسيط) ص٥٨٧، وە بڕوانە: (الأم)ی (شافعي) ج٢ص١٢١، کە گوتوویەتی: (...فقيل له: انه كالماء العد..)، کەواتە مەبەست پێ‌چواندن (تشبيه) بووە.

[122] بڕوانە: (الأموال) ص٢٨١، وە (فقه الزكاة) ج١ص٤٤١.

وە ئـەو رایـەی مالیکی‌یـەکان دەربـارەی کانزایـەکان - کـەدەبێ بـەموڵکی گشـتی بهێڵرێنەوە تەنیا ڕای ئەوان نیە، بەڵکو لەئەنجامی لێتوێژینەوەی ئەو مەسەلەیەو گەڕان و پشکنینم دا بۆم دەرکەوت کە ئەو ڕایە زۆربەی زانایان پەسەندیان کردوە! بۆ وێنە:

(شافعي) لـەکتێبی (الأم)دا نووسیویەتی[122]: (واصل المعـادن صنفـان: ماكـان ظـاهراً كالملحُ في الجبالِ تَنْتابُهُ الناسِ فهذا لايصلُحُ لأحَدٍ أن يُقْطَعُهُ بحال والناسُ فيـه شُـرَّعٌ، وهكذا النهر والماء الظاهر والنباتُ فيما لا يُملك لأحَدٍ، وقد سأل الأبيض بن حَمال النبي ﷺ ان يُقْطعَهُ مِلْحَ مارب فأقْطَعَهُ إياهُ او أرادَهُ، فقيل له، إنه كالماء العِدّ! فقال: فلا إذَنْ، قال: ومثل هذا كل عين ظاهرةٍ كنَفْطٍ او قيرٍ او كبريتٍ او مُمْيا او حجارةٍ ظاهرةٍ... فهو كالماء والكلأ الناس فيه سواءٌ).

واتە: وە کانزایەکان لە ڕیشەدا دوو جۆرن - جۆرێکیان - : ئەوەیە کە ئاشکرایە وەك خوێی چیایەکان کە خەڵکی خوێی لێ‌دێنن، ئەمەیان ناگونجێ هیچ کەس بە تەنیا بۆی دابڕێ و خەڵکی بەگشتی لێی دەبەنەوە بۆ خۆیان، هەروەها ڕووبارو ئاوی ئاشکراو ڕوەکێك کە ناکرێتە موڵکی هیچ کەس، وە (ابیض بن حمال) داوای لەپێغەمبەر ﷺ کردوە کە خوێی مەئرەبی بداتێ و ئەویش بۆی دابڕیوە، یان ویستوویەتی - بۆی دا بڕێ - بەڵام کەپێی گوتراوە: ئەو خوێیە وەك ئاوی کانی و سەرچاوە وایە، فەرموویەتی: کەواتە نابێ، گوتوویەتی - واتە: شافیعی - هەروەها هەر سەرچاوەیەکی دیکەی ئاشکرا وەك: نەوت یان قیر یان گۆگرد (کبریت) یان مۆمیا[124] یان بەردێکی ئاشکرا.. هەمان حوکمیان هەیەو، وەك ئەو ئاوو لەوەڕگایە وان کە خەڵکی تێیان دا یەکسانن.

هەروەها خاوەنی کتێبی (نهایة المحتاج الى شرح المنهاج) کە شافیعی مەزەبە لەوبارەوە نووسیویەتی:[125] (إنّ المعدن الظاهر وهو ما يخرجُ بلا عِلاجٍ كنِفْطٍ وكبريتٍ، لايُمْلكُ ولا يَثْبُتُ فيه إخْتِصاصٌ بِتَحْجيرٍ ولا إقطاعٍ..) واتە: کانزای دیارو بەرچاو کە بریتیە لەوەی بەبێ ڕەنج و زەحمەت دەردەهێنرێ، وەك: نەوت و گۆگرد، ناکرێتە موڵکی تایبەت و دروست نیە بەهۆی شورا بۆ کردن و دابڕینەوە پاوان بکرێ...

---

[122] بڕوانە: (الأم) ج٢ص١٣١.

[124] مۆمیا ماددەیەك بووە لەجەستەی مردووان دراوە تاکو لە ڕزین و گۆڕان پارێزراوبن، بڕوانە (المعجم الوسیط) و(المنجد) وشەی (موم).

[125] بڕوانە: (نهایة المحتاج) ج٥ص٣٤٦.

هەروەها مەزهەبی حەنبەلی هەمان ڕای هەیە، وەك خاوەنی (المغني) نووسیویەتی[١٢٦]:
(مَسْئَلةٌ: (ولايجوز بيع كل ماءٍ عدٍ كمياه العيون ونَقْعِ البِئرْ ولا ما في المعادن الجارية من القار والملحِ والنّفْطِ، و لا مايَنْبِتُ في أرْضِهِ من الكلأ والشوك وَمَنْ أخَذَ منه شيئاً مَلَكَهُ).
واتە: وە فرۆشتنی هەر ئاوێکی بەردەوام دروست نیە، وەك ئاوی كانیو سەرچاوانو ئاوی ڕاوەستاوی بیرو گۆماو، هەروەها كانزایە بەردەوامەكانی وەك قیر[١٢٧] (زەفت) و خوێو نەوت، دیسان ئەو لەوەڕو دڕكەی كە لەزەوی‌یەكەی‌دا دەڕوێ -دوروست نیە بیفرۆشێ- وە هەر كەسێك شتێكی لێ دەستگیركرد هی خۆیەتی.
(ابو الحسن الماوردي)یش لەوبارەوە گوتوویەتی[١٢٨]: ( وأما إقْطاعُ المعادنِ وهي البقاع التي أوْدعَها الله تعالى جَواهِرَ الأرض، فهي ضربان: ظاهرةٌ و باطنةٌ، فأما الظاهرة فهي ماكان جوهرها المستودع فيها بارزاً كمعادن الكحَلَ والملحِ والقارَ والنّفط، وهو كالماء الذي لايجوزُ إقْطاعُهُ والناس فيه سواءُ.. وأما المعادن الباطنة فهي ماكان جَوْهَرها مُسْتَكِناً فيها لايُوصَلُ اليه إلا بالعَمَلِ كمعادنِ الذهب والفضة والصُّفْر والحديد... وفي جواز إقطاعها قَوْلانِ: احدهما: لايجوزَ كالمعادنِ الظاهرة وكُلّ الناس فيها شَرَّعٌ، والقول الثاني يجوزُ..)
واتە: بەڵام بۆ دابڕینو بەخشینی كانزایەكان كە بریتین لەو جێیانەی كەخوای بەرز ئەو كانزایانەی تێدا داناون، ئەوە دوو جۆرن: دیارو پەنهان، دیارەكان ئەوانەن كە ئاشكراو بەرچاو بن، وەك كانزایەكانی كلو خوێو زەفتو نەوت، ئەوە حوكمیان وەك ئەو ئاوە وایە كە دروست نیە بۆ هیچ كەسێك دابڕێنو[١٢٩] خەڵكی تێیان دا یەكسانن... بەڵام كانزا پەنهانەكان كەبریتین لەوانەی لەنێو زەوی شارراونەوەو بەئیشو ڕەنج نەبێ دەستگیرناكرێن، وەك كانزایەكانی زێڕو زیوو مسی[١٣٠] زەردو ئاسنەوە دەربارەی دروست بوونی دابڕینی دوو قسە هەن: یەكیان ئەوەیە كە دروست نیەو وەك كانزا دیارەكان وانو سەرجەم خەڵكی بۆیان هەیە لێیان ببەن، قسەی دووەمیش ئەوەیە كە دروستە..

---

[١٢٦] بڕوانە: (المغني) ج٤ص٢١.
[١٢٧] وشەی (قار، قیر، زفت) ناون بۆ یەك شت كە ئاوا پێناسەیان كردوە: (مادة سوداء صلبة تسيلها السخونة..) بڕوانە: (المعجم الوسيط) ص٣٩٥.
[١٢٨] بڕوانە: (الأحكام السلطانية والولايات الدينية) ص٣٠٥، ٣٠٦.
[١٢٩] وشەی (أقْطَعَهُ إقْطاعاً) واتە: پارچەیەك زەوی بۆ دابڕیو پێ‌ی بەخشی، پێویستە بزانرێ كە ئەم وشەیە لەفیقهی ئیسلامی‌دا هیچ پەیوەندی بەڕژێمی دەرەبەگایەتی (اقطاعي)یەوە نیە كە لەوڵاتانی ئەوروپاو لەسەدەكانی نێو ڕاست باوبووە.
[١٣٠] بڕوانە: (المعجم الوسيط) ص٥١٦، كە گوتوویەتی: (الصفر: النحاس الأصفر).

هەروەها ئەم رایە ڕای سەرجەم شەرعزانانی شیعەشە وەك خاوەنی کتێبی (إقتصادنا) لەژمارەیەك لەزاناو شەرعزانانیانەوە هێناویەتی[١٣١].

بۆیەش بە پێویستم زانی کە ئەم مەسەلەیە باش ڕوون بکەمەوە، چونکە بێگومان کانزایەکان بەئاشکراو پەنهانیانەوە لە ڕۆژگاری ئێمەدا ڕۆڵێکی یەکجار کاریگەر لەژیانو گوزەرانی خەڵکیدا دەگێڕن بەتایبەت: نەوتو گازو خەڵووزی بەرد، جا گوتم با بزانرێ کە زاناو پێشەوایانمان هەرچەندە لە ڕۆژگاری خۆیان دا گرنگیو بایەخی ئەو کانزایانەیان وەك ئێمە بۆ دەرنەکەوتوە، بەڵام لەسۆنگەی چاك تێگەیشتنیان لەقورئانو سوننەت و ڕێساو یاساکان (الدساتير والأحكام)ی شەرع، چەندان سەدە پێش شارەزایانو ئابووری ناسانی دوای خۆیان کەوتوونەتەوەو بیرۆکە (فکرة)ی خۆماڵیکردنو گشتیکردن (تأميم)ی سەرچاوە سروشتی‌یەکان (المنابع الطبيعية)یان نەك هەر خستۆتەڕوو بەڵکو وەك بڕیارێکی شەرعی ڕاگەیاندوە.

### ٣- مەرجەکانی زەکات لێدەرکرانی کانزایەکان:

هەرچەندە وەك لەلاپەڕەکانی پێشوودا خستمانە ڕوو ڕای زۆربەی زاناو شەرعزانان ئەوەیە کە کانزایەکان هەر موڵکی گشتی خەڵکی بنو نەکرێنە موڵکی تایبەتی و شەخسی، بەڵام بەهەر حاڵ ئەگەر لەبەر هەر هۆیەك بوو کرانە موڵکی تایبەت، ئەوە مەرجەکانی زەکات لێدانیان ئەمانەن:

بێجگە لە (ابوحنيفة)و هاوەڵەکانی زۆربەی هەرە زۆری زانایان کە (مالك و شافعي و احمدو اسحاق) یان لەنێودان ڕایان وایە کە گەیشتنە (نصاب) مەرجە[١٣٢]، بەڵام ساڵ بەسەردا سووڕانەوە ئەوە بێجگە لە (أسحاق و ابن المنذر) هیچ کام لە زانایان بەمەرجیان نەگرتوەو دەڵێن: پێویستە ڕاستەوخۆ پاش دەستگیرکرانی کانزایەکان زەکاتیان لێبدرێ[١٣٣].

دیارە مەرجەکانی دیکەش وەك قەرزدار نەبوونو، ئاتاج نەبوون بۆ دابین کردنی پێداویستی‌یە بنەڕەتی‌یەکان، ئەوە هەر پێویستن، وەك باقی جۆرە زەکات دانەکانی دیکە.

---

[١٣١] بڕوانە: (إقتصادنا) ص٤٤٥تا ٤٥٢ کە لە هەرکام لە (العلامة الحلي) و(السيد العاملي) و خاوەنی کتێبی: (مفتاح الكرامة) وە ئەو مەسەلەیەی هێناوە، نووسەری (إقتصادنا)ش (محمد باقر الصدر)ە.

[١٣٢] بڕوانە: (المغني) ج٢ص٦١٨، ٦١٩، وە (نيل الأوطار) ج٤ص٢١١.

[١٣٣] بڕوانە: (المغني) ج٢ص٦١٩.

## ٤-زەکاتی وەرگیراو لەکانزایەکان لەکوێدا صەرف دەکرێ:؟!

لەم مەسەلەیەش زانایان جیاوازن، هەرچی (مالك و احمد وشافعي) ین:- بەڵام شافیعی قسەی دیکەشی هەیە - دەڵێن: وەك زەکات بەسەر ئەو هەشت جۆرە کەسانەدا دابەش دەکرێ کە خوای پەروەردگار دیاری کردوون. بەڵام (ابوحنیفة) ڕای وایە کە وەك (فیئ) هەڵس وکەوتی لەگەڵ دەکرێ و دەخرێتە خەزێنەی دەوڵەتەوە[١٣٤]. وە شافیعییەکان ڕایەکی دیکەیان هەیە کە دەڵێن: ئەگەر پێنج یەك (٥/١) مان وەرگرت ئەوە وەك (فیئ) حیسابی بۆ دەکەین، بەڵام ئەگەر چل یەك (٤٠/١) بوو، ئەوە وەك زەکات دابەش دەکرێ[١٣٥].

## ٥-ئایا دۆزەرەوەی خەزنەو دەرهێنەری کانزا مسوڵمان بن یان کافر هەریەك حوکمیان هەیە؟!

بێجگە لە (شافعي) سەرجەم زانایان ڕایان وایە کە کافرو مسوڵمان لە مەسەلەی زەکات لێدانی خەزنەو کانزاکان دا یەکسانن[١٣٦]، بەڵام (شافعي) دەڵێت: بابای (ذمي) هیچی لێ وەرناگیرێ[١٣٧]، ڕای جەماوەریش بەهێزترە چونکە دەقی (وفي الركاز الخمس) حوکمێکی گشتییەو بەبێ بەڵگە نابێ هیچی هەڵاوێرین و بەڵگەیەکی ئەوتۆش نیە[١٣٨].

تێبینی: بە بەڵگەی ئەو فەرمودەیەی کە (نسائی) لە (عمرو بن شعیب عن ابیه عن جده)یەوە گێڕاویەتەوەو پێشتر هێنامان، خەزنە بە پێچەوانەی کانزاوە ئەگەر لەزەوی کەسێکدا -مسوڵمان بێ یان نا - دۆزرایەوە دەبێتە موڵکی خاوەن زەوییەکەو دۆزەرەوەکەی نابێتە خاوەنی.

جا خوێنەری بەڕێز! وەك پێشتریش ئاماژەمان پێکردوە، خوا پشتیوان بێ لەبەندی دووەم دا کە بەناوونیشانی: (چەند تێبینییەکی گرنگ دەربارەی زەکات دان)ە لەدوو توێی چوار باس و چل ونۆ وردە خاڵ و تێبینی گرنگ دا هەموو ئەو مەسەلانەی کە پێویستە بخرێنەڕوو کە بەزۆری پەیوەستن بەم بڕگەی چوارەمەوە، دەیانخەینەڕوو، بەهیوا ئەوە کە لەئاکام دا بتوانین وەك شایستەی دووەمین درووشمی خواپەرستی و سێیەمین پایەی ئیسلامە لە زەکات حاڵی بین و پێی شارەزابین.



[١٣٤] بڕوانە: (نیل الاوطار) ج٤ص٢١١.
[١٣٥] بڕوانە: (المجموع) ج٦ص٨٣.
[١٣٦] بڕوانە: (المغني) ج٢ص٦١٦.
[١٣٧] بڕوانە: (المجموع) ج٦ص٨٣، (ذمي)یش کافرێکە لەژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامیدا دەژیەت.
[١٣٨] بڕوانە: (المغني) ج٢ص٦١٦، ٦١٧، وە بڕوانە: (نیل الاوطار) ج٤ص٢١١.

## پێنج: زەكات دەدرێ بەكێ و كێ؟!

خوێنەری مسوڵمانی بەڕێز! كۆكردنەوەی زەكات چەندە گرنگ و بایەخ دار بێ، بەبێ دابەش كردنی بەشێوەیەكی دادگەرانەو گەیاندنی بەدەست خاوەنە شایستەو پێشیاوەكانی خۆی هەر دەبێتەوە بەهیچ! بۆیە ئیسلام زۆر گرنگی و ئەمیەتی بەچۆنیەتی دابەش كردنی زەكات داوەو خوای دادگەرو كاربەجێ ئەوكارە گرنگەی تەنانەت بۆ پێغەمبەری خۆشی ﷺ بەجێنەهێشتووەو بۆ خۆی بەتایبەت ئەوجۆرە كەسانەی دیاریكردون كە پێویستە پێیان بدرێ و بەدەستێكی ئەمین و پاك تەسلیمیان بكرێ.

جا ئەو جۆرە كەسانەش بەدەقی ئایەتی قورئان هەشت (٨)ن، بەڵام بەگشتی دوو جۆرن:

أ-ئەوانە كە پێویستیان بەهاوكاریكران و یارمەتی دران هەیە كە: هەژارو نەدارو قەرزدارو كۆیلەو ڕێبوارن.

ب-ئەوانەی كە مسوڵمانان پێویستیان بەرەنج و كۆشش و هاوكارییان هەیە، كە: دڵڕاگیراوان (المؤلفة قلوبهم) و كاربەدەستانی كۆكردنەوەی زەكات (العاملين عليها) و جەنگاوەران و تێكۆشەران و خزمەتگوزارانی ڕێبازی خوا (في سبيل الله)ن.

كەواتە: وەك زانایان[١٣٩] گوتوویانە: زەكات بەدوو جۆرە كەسان دەدرێ:

یەكەم: كەسێك كەپێویستی بەهاوكاری مسوڵمانان هەیە.

دووەم: كەسێك كە مسوڵمانان پێویستییان بەهاوكاری ئەو هەیە؛ ئاشكراشە كە: هەژارو نەدارو قەرزدارو كۆیلەو ڕێبوار، لەجۆری یەكەم و دڵ ڕاگیراوان و كاربەدەستانی كۆكردنەوەو دابەش كردنی زەكات و جەنگاوەران و خزمەتگوزارانی ڕێی خواش لەجۆری دووەمن، هەرچەندە (في سبيل الله) وەك دوایی لەكورتە باسێكی سەربەخۆدا روونی دەكەینەوە چەمك و واتایەكەی فراوانەو سەرجەم ئەو بەرژەوەندییە گشتییانە دەگرێتەوە كە كۆمەڵگا پێیان ئاتاجە.

وەجێی سەرنجە كە خوای كاربەجێ زەكات پێشیاوانی (كەهەشت جۆرن) بەدوو جۆرە تەعبیر باس كردوون:

أ- چواریان كە: (للفقراء والمساكين والعاملين عليها والمؤلفة قلوبهم)ن پیتی لام (ل)ی خستۆتەپێشیان، كەواتە زەكاتەكە بەشێوەیەك دەیاندرێتێ كەببێتە موڵكی خۆیان چونكە لام بۆ بەخاوەن كردن (تمليك)ە.

---

[١٣٩] ئەوە قسەی (ابن قيم الجوزية)یە، بڕوانە: (زاد المعاد في هدي خير العباد) ج٢ص٩.

ب-چوارەکەی دیکەشیان کە (في الرقاب والغارمين وفي سبيل وابن السبيل)ن، پیتی (لە) (في)یان خراوەتە پێش کە مانای (ظرفية) دەگەیەنێ، کەواتە: بۆ ئەمان ئەوەندە بەسە کە زەکاتەکە لەبەرژەوەندییان دا بەکاربهێنرێ هەرچەندە تەسلیمیشیان نەکرێ.

بەڵێ ئەوانەی زەکاتیان پێدەشێ و ڕەوایە بیاندرێتێ ئەو هەشت جۆرە کەسانەن کە خوای دادگەرو کاربەجێ دیاریکردوون:

*(إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ لِلْفُقَرَاءِ وَالْمَسَاكِينِ وَالْعَامِلِينَ عَلَيْهَا وَالْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَفِي الرِّقَابِ وَالْغَارِمِينَ وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ وَابْنِ السَّبِيلِ فَرِيضَةً مِنَ اللَّهِ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ) التوبة: ٦٠.

واتە: بێگومان زەکاتەکان تەنیا بۆ هەژاران و نەداران و ئەوانەی کۆی دەکەنەوەو دڵ ڕاگیراون و ئەو کۆیلانەی دەیانەوێ خۆیان ئازاد بکەن و قەرزداران و لەڕێی خوادا جەنگاوان و ڕێبوار -ەکان - ە، لەلایەن خواوە پێویست کراوە، وە خوا زاناو کاربەجێیە.

*(زياد بن الحارث الصّدائي)یش خوا لێی ڕازیبێ دەڵێ: چوومە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و پەیمانم لەگەڵ بەست (مەبەستی مسوڵمان بوونە)، جا پیاوێك هات پێی گوت: لە زەکاتێ بەشم بدە! ئەویش فەرمووی: (إن الله لم يرض بحكم نبي ولاغيره في الصدقات، حتى حكم فيها هو فجزّءها ثمانية أجزاء فانْ كُنتَ مِنْ تلك الأجْزاء أعطيْتُكَ) رواه ابوداود، واتە: بێگومان خوا بە حوکمی پێغەمبەرو غەیری ویش لە بواری (دابەش کردنی) زەکاتەکان دا ڕازی نەبووە، هەتا خۆی حوکمی تێدا کردوەو بۆ هەشت بەشان (کە دەدرێن بەهەشت جۆرە کەسان) دابەشی کردوە، جا ئەگەر تۆش لە یەکێك لەو هەشت بەشانە بی ئەوە دەتدەمێ. (ئەگەرنا هەقت نیەو گلەیی مەکە).

ئێستاش با پێناسەیەکی کورتی هەرکام لەو هەشت جۆرە کەسانە بکەین کە بەدەقی فەرموودەی خوای زاناو دادگەر بێجگە لەوان زەکات بەکەسی دیکە ناشێ:

### او٢: الفقراء والمساكين (هەژاران و نەداران):

کە یەکەمیان کۆی (فقير)ەو دووەمیان کۆی (مسكين)ەو ماناشیان زۆر لەیەکەوە نزیکە تەنانەت هەندێك لەزانایان دەڵێن هاو واتا (مترادف)ن، بەڵام ئەو ڕایە بێ هێزەو وا پێدەچێ ئەو لێکدانەوەیە ڕاست و تەواو بێ کە دەڵێ (فقير) و(مسكين) هەردووکیان دەستیان کورتەو نەدارن بەڵام (فقير) هەر هیچی نیە پێی بژیەت و (مسكين)یش شتێکی هەیە بەڵام بەشی ناکات، هەر بۆیەش من (فقير)م بەهەژارو (مسكين)م بەنەدار لێکدانەوەو کردوومنە کوردی، چونکە پێم وایە لەبەکارهێنانی کوردانیش دا هەژار شپرزە حاڵترە لەنەدار، دەشگونجێ وێڕای بە (فقراء) دەست پێکردنی خوای کاربەجێ، ڕستەی:

(أَمَّا السَّفِينَةُ فَكَانَتْ لِمَسَاكِينَ يَعْمَلُونَ فِي الْبَحْرِ) الكهف:٧٩، بكرێته بەڵگەی تەواوی قسەکەمان، چونکە ئەو کۆمەڵە لەگەڵ هەبوونی (کەشتی)یش دا ناویان بە (مساکین) هاتوە، کەواتە (مسکین)یش موحتاج و دەستکورتە بەڵام شتێکی کەمی هەیە، کیفایەتی ناکات، بەپێچەوانەی (فقیر)ەوە کە هەژاری کاری کردۆتە سەر بڕبڕەی پشتی و یەکجاری پەکی کەوتوە[١٤٠].

## ٣-العاملین علیها (کاربەدەستان و کۆکەرەوانی):

کە ئەو کرێکار و کاربەدەستانەن کە لەلایەن دەوڵەتەوە تەرخان دەکرێن بۆ کۆکردنەوەی زەکات و مشوور لێخواردنی و تەسلیم بەخەزێنەی دەوڵەت کردنی و دابەش کردنی و..هتد.

دیارە ئەمانە ئەگەر دەوڵەمەندیش بن هەر دەگونجێ و مووچەیەکی دیاریکراویشیان بۆ دەبڕدرێتەوە لەبەرانبەر کارەکەیان دا، پێغەمبەری خوا ﷺ لەوبارەوە فەرموویەتی:

*(عن أبي سعيد رضي الله عنه أن النبي ﷺ قال: لاتَحِلُّ الصَّدَقَةُ لِغَنِيٍّ إلاّ لِخَمْسةٍ: لِعامِلٍ عليها، أو رَجُلٍ اشْتراها بمالِهِ، أو غارِمٍ، أو غازٍ في سبيل الله، أو مسكين تُصُدِّقَ عليه مِنْها فأهدىٰ منها لِغَنيٍ) رواه أحمد وأبوداود وابن ماجة والحاكم وقال: صحيح على شرط الشيخين.

واتە: زەکات بۆ هیچ دەوڵەمەندێك حەڵاڵ نیە مەگەر بۆ پێنج کەسان: کاربەدەستێك کە کاری تێدا دەکات، یان پیاوێك کە بەماڵی خۆی کڕیبێتەوە، یان قەرزدارێك، یان جەنگاوەرێك لەڕێی خوادا، یان نەدارێك کە لە زەکات پێی دراوە و ئەویش بۆ دەوڵەمەندێك لێی دەکاتە دیاری.



## ٤-المؤلفة قلوبهم (دڵڕاگیراوان):

ئەمانیش شەرعزانان کردوویانن بەدوو بەشەوە:

ا- مسوڵمانانێك کە دەویسترێ دڵیان ڕابگیرێ و هان بدرێن و بەهێزبکرێن، ئەمانیش چەند جۆرێکن[١٤١].

ب- کافرو بێ بڕوایانێك کە یان بۆ سەرنج ڕاکێشانیان، یان بۆ دوورخستنەوەی خراپەو زیانیان زاریان شیرین دەکرێ جا هەرچەندە لەوبارەوە کە ئایا ئێستاش دروستە لەماڵی زەکات بەمەبەستی سەرنج ڕاکێشان و دڵڕاگرتن بدرێ بەکافران لەنێو زانایان دا

---

[١٤٠] بڕوانە: (معجم مفردات الفاظ القرآن) ص٦٤٢، وشەی (فَقَرَ).

[١٤١] بڕوانە: (فقه السنة) ج١ص٥٢٦.

مشت‌ومڕو ڕاجیایی (اختلاف) هه‌یه‌، به‌ڵام وه‌ك لێكۆڵه‌ره‌وه‌ ڕۆچووه‌كان گوتوویانه‌ ئێستاش ئه‌و ده‌رگایه‌ بۆ فه‌رمانڕه‌وایانی مسوڵمان هه‌ر ئاوه‌ڵایه‌و هه‌ركاتێك دووچاری ئه‌و هه‌ل‌ومه‌رجه‌ بوون كه‌پێغه‌مبه‌ری خوا ﷺ ئه‌و هه‌ڵوێسته‌ی تێدا نواندوه‌ ئه‌وانیش بۆیان هه‌یه‌، مادام دابین كردنی به‌رژه‌وه‌ندی‌یه‌كی گشتی یان لابردنی زیانێكی سه‌ره‌كی بۆ ئیسلام‌و مسوڵمانان تێدا بێ[142]، به‌ڵام بێگومان ده‌بێ ئه‌م ڕه‌فتاره‌ وه‌ك هه‌ر هه‌ڵوێست‌و ڕه‌فتارێكی دیكه‌ی گه‌وره‌و گرنگ له‌سه‌ر بنچینه‌ی ڕاوێژی مشوور خۆران‌و دوای هه‌ڵسه‌نگاندن‌و نه‌خشه‌و پلان دانان بێت، نه‌ك به‌پێی میزاج‌و بۆچوونێكی شه‌خسی‌و تاكڕه‌وانه‌.

## ٥-وفي الرقاب (كۆیله‌ ژێر ده‌سته‌كان):

ئه‌مانیش كه‌سانێكن كه‌ له‌هه‌ل‌ومه‌رجێكی نائاسایی وه‌ك جه‌نگ دا نیری كۆیلایه‌تی‌یان ده‌چێته‌ سه‌ر شان، جا له‌سۆنگه‌ی ئه‌وه‌وه‌ كه‌ خوای په‌روه‌ردگار حه‌ز ناكات به‌نده‌كانی بێجگه‌ له‌خۆی به‌نده‌و ژێر ده‌ستی هیچ كه‌س بن كه‌ بێگومان به‌ندایه‌تی‌و مل كه‌چی‌یان بۆ خواش ئه‌وپه‌ڕی عیززه‌ت‌و سه‌ربه‌رزی‌و ئازادی تێدایه‌،له‌ زۆر ڕێگاوه‌ نه‌خشه‌ی ڕزگاركردنی كۆیله‌كانی كێشاوه‌و به‌رنامه‌ی بۆ داناوه‌ كه‌ گرنگترین ئه‌و ڕێیانه‌ش ته‌رخان كردنی هه‌شتیه‌كی زه‌كاتی هه‌موو مسوڵمانانه‌ بۆ كڕینه‌وه‌و ئازادكردنیان، ئنجا وه‌ك زانایان ڕوونیان كردۆته‌وه‌، وشه‌ی (وفي الرقاب) هه‌م ئه‌و كۆیلانه‌ ده‌گرێته‌وه‌ كه‌ ڕاسته‌وخۆ به‌پاره‌ی زه‌كات ده‌كڕدرێن‌و ئازاد ده‌كرێن، وه‌ هه‌م ئه‌وانه‌ش كه‌ پێیان ده‌گوترێ (مُكاتِبٌ) و له‌سه‌ر ئه‌ندازه‌یه‌ك ماڵ له‌گه‌ڵ خاوه‌نه‌كانیان ڕێك كه‌وتوون كه‌ په‌یدای بكه‌ن‌و ڕزگاریان ببێ، كه‌ئه‌مانیش له‌پاره‌و ماڵی زه‌كات هاوكاری‌یان ده‌كرێ[143].

## ٦- الغارمون (قه‌رزداران):

ئه‌مانیش كه‌سانێكن كه‌ كه‌وتوونه‌ بن باری قه‌رزو قۆڵه‌وه‌و تواناشیان نیه‌ قه‌رزه‌كانیان بده‌نه‌وه‌، جا هه‌یانه‌ به‌هۆی به‌ڵاو گرفتاری‌یه‌كه‌وه‌ ئیفلاسی كردوه‌، هه‌شیانه‌ له‌سۆنگه‌ی صوڵح كردن‌و ڕێكخستنه‌وه‌ی دوو كه‌س یان دوو كۆمه‌ڵی ناكۆكه‌وه‌ دووچاری قه‌رزداری بووه‌، وه‌ هه‌شیانه‌ كه‌ به‌هۆی نه‌فامی‌یه‌وه‌و له‌ڕێی گوناحباری‌دا مایه‌پووچ بووه‌ به‌ڵام پاشان ته‌وبه‌ی كردوه‌و گه‌ڕاوه‌ته‌وه‌ سه‌ر جاده‌ی شه‌رع، هه‌موو ئه‌مانه‌ بۆیان ڕه‌وایه‌ زه‌كاتیان بدرێتێ هێنده‌ی ئه‌وه‌ كه‌ قه‌رزو قۆڵیان له‌كۆڵ بێته‌وه‌.

---

[142] بڕوانه‌: (فقه السنة) ج١ص٥٢٩، كه‌ له‌ (رشيد رضا) وه‌ نه‌قڵی كردوه‌، وه‌ بڕوانه‌: (نيل الأوطار) ج٤ص٢٣٤.

[143] (مالك و احمد بن حنبل و ابوثور وأبوعبيد وابن المنذر و بخاري) ڕای یه‌كه‌م‌و (ليث و ثوري)و حه‌نه‌فی‌یه‌كان‌و شافیعی‌یه‌كانیش ڕای دووه‌میان ده‌رباره‌ی مانای (في الرقاب) هه‌ڵبژاردوه‌، بڕوانه‌: (نيل الأوطار) ج٤ص٢٣٤، ٢٣٥.

**٧- في سبيل الله (لەرێی خوادا):**

زانایان لەوبارەوە کە ئایا مەبەست لە (في سبيل الله) چی‌یەو پێویستە ئەو بەشەی زەکات بدرێ بەکێ؟ رایان جیاوازەو زانایان بەگشتی لەوبارەوە پێنج رایان هەن:

یەك: کە رای زۆربەی هەرە زۆری زانایانە، دەڵێن مەبەست لە (في سبيل الله)بەس جەنگو جیهادەو پێویستە ئەو هەشتیەکەی زەکات تەنیا بدرێ بە جەنگاوەرانی ئیسلام، ئەوە رای (ابو حنيفة وابو يوسف شافيعي و مالك و ثوري و أبوثور و وابن المنذر) و قسەیەکی هەرکام لە (احمد) و(اباضية) کانو (إمامية) کانەو (ابن حزم)یش پەسەندی کردوە[١٤٣].

دیارە بەمەرجێك لە (بيت المال) مووچەی تایبەتی‌یان بۆ نەبڕابێتەوە، ئەگەرنا مادام مووچەیان بۆ تەرخان کرابێ نایاندرێتێ.

ئنجا زۆربەی زانایان رایان وایە کە جەنگاوەران (مجاهدين) ئەگەر دەوڵەمەندیش بن هەردەبێ ئەو بەشەی زەکاتیان بدرێتێ[١٤٤]، بەلام (أبوحنيفه) رای وایە کە ئەگەر بابای جەنگاوەر (غازي) نەدار نەبوو نایدرێتێ[١٤٥]، بەلام بێگومان رای زۆربە بەهێزترە، چونکە بابای موجاهید ئەگەر نەچێتە جەنگو جیهادیش مادام هەژارو نەدارو قەرزدارو... هتد بێ زەکاتی هەر دەکەوێ، ئنجا وەك پێشتریش باسمان کرد پێغەمبەری خوا ﷺ چەند کەسێکی جیاکردۆتەوە لەوەی کە لەبەر دەوڵەمەندی زەکاتیان پێ‌نەشێت کە یەکێکیان بابای موجاهیدە!

دوو: کە رایەکی (احمد) و(زيدية) کان و (إمامية) کانیشە، دەڵێن مەبەست لە (في سبيل الله) جیهادو حەجو عومرە کردنە[١٤٦].

سێ: کە رای (محمد بن حسن الشيباني) یە دەڵێ: مەبەست لە (في سبيل الله) بەس ئەوانەن کە دەیانەوێ حەج بکەن[١٤٧].

چوار: ئەمیش کەرای هەندێك لەشەرعزانان (فقهاء) ە[١٤٨]، دەڵێن: مەبەست لە (في سبيل الله) قوتابی‌یانی زانیاری‌یە شەرعی‌یەکانە.

---

[١٤٣] بروانە: (إنفاق الزكاة في المصالح العامة) ص٥٢، ٥٣، د. محمد عبدالقادر أبوفارس.

[١٤٤] بروانە: (فتح الباري) ج٤ص٩٣.

[١٤٥] هەمان سەرچاوەی پێشوو

[١٤٦] بروانە: (إنفاق الزكاة في المصالح العامة) ص٧٤، ٧٥.

[١٤٧] سەرچاوەی پێشوو، ص٨٠، وە: (الفقه الأسلامي) ج٢ص٨٧٤، ط٣

پێنــج: کــه ڕای ژمارەیــەك لــەزانایانی پێشــینو شــەعزانانەو ژمارەیــەك لــەزانایانی هاوچەرخیش پەسەندیان کردوە - کە دوایی ئاماژەیان پێدەکەین - دەڵێن: مەبەست لە (سبيل الله) بەرژەوەندیيە گشتیيەکان (المصالح العامة)ە، واتــە: هــەموو ئــەو کــارو چالاکیو خزمەتگوزارییانەی کە خەڵك و کۆمەڵگا بەگشتی بۆیان ئاتاجنو پێویستیيان پێیان هەیە، وەك دروستکردنی مزگەوتو خەستەخانەو چاککردنی ڕێو بانو پردو جیهادو بەرەنگاریو پاراستنی وڵاتو .. هتد.

جا لە بەرئەوەی منیش ئەم ڕایەم بەلاوە پەسەندترو ڕاست ترە، بەپێویستی دەزانم سەرەتا ئەو زانایانەی کە لایەنگری ئەم ڕایەن ئاماژەیان پێبکەم، پاشان بەڵگەکانی ئەم ڕایە بخەمەڕوو، وە لەکۆتاییدا وەڵامێکی کورتی بەڵگەی ڕایەکانی دیکەش بدەمەوە:

أ-ئەو زانایانەی کە پێیان وایە ( في سبيل الله ) بریتیە لە بەرژەوەندیيە گشتیيەکان:

یەکەم: (فخرالدين الرازي) خاوەنی (التفسير الكبير) کە ئەویش لە (القفال) ەوە نەقڵی کــردوە کــە لەژمارەیــەك لەشــەرعزانانەوە هێناویــەتی کــە ڕێیــان داوە زەکــات لەهــەموو کاروبارێکی خێردا خەرج بکرێ وەك: کفن کردنی مردووانو دروست کردنی قەلاو بورجو ئــاوەدان کردنــەوەی مزگــەوتان... چونکــە فــەرموودەی خــوا: (وفي ســبيل الله) هــەموويان دەگرێتەوە[149].

دووەم: (ابو عبيد) لە (أنس بن مالك ، الحسن البصري)یەوە هێناویەتی کە گوتوویانە: (ما أُعْطيتْ في الجسور والطرق فهي صدقة ماضية، قال اسماعيل: يعني أنها تجزئُ من الزكــاةِ[150]) واتــە: ئــەوەی کــە دەدرێ بەپردەکــانو ڕێوبانــەکان خــێرێکی بەردەوامــە، ئیسماعیل گوتوویەتی، ئەوە وەبری زەکات دەکەوێ.

سێیەم: (الكاساني الحنفي)یش هەمان ڕای هەیە کە گوتوویەتی: (وأما قوله تعالىٰ (وفي سبيل الله) عبارة عن جميع القرب فيدخل فيه كل مَنْ سعىٰ في طاعة الله وسبيل الخيرات إذا كان مُحتاجاً)[151].

---

[148] بڕوانە: (الروضة الندية) ج١ص٢٠٧، وە: (فقه السنة) ج١ص٥٣٢، وە: (انفاق الزكاة في المصالح العامة) ص٨٢، ٨٣.

[149] بڕوانە: (التفسير الكبير) ج١٦ص١١٣.

[150] بڕوانە: (الأحوال) لأبي عبيد، ص٧٥٨.

[151] بڕوانە: (بدائع الصنائع) ج٢ص٩٠٧.

چوارەم: (زيدية)[152] كانو (إمامية)[153] كانيش هەمان رايان هەيە.

پێنجەم: لەزانايانى هاوچەرخيش هەركام لە: (المراغي)[154] و (محمد رشيد رضا)[155] و (محمود شلتوت)[156] و(محمد عبده)[157] و (سيد قطب)[158] و (محمود أبو السعود)[159] و (أبوبكر الجزائري)[160] هەمان رايان هەيەو راى (د.يوسف القرضاوي)[161]يش لە (فقه الزكاة) ەكەىدا لێيەوە نزيكە.

ب- بەڵگەكانى ئەم رايە:

يەكەم: هيچ دەقێك لەقورئان و سوننەت دا نيە كە بەشى (في سبيل الله) ى تايبەت كردبێ بە كەسێك يان كۆمەڵێك يان شتێكى ديارىكراوەوە، هەر بۆيەش بە درێژايى مێژوو زاناو شەرعزانان لەوبارەوە كێشەو مشتومريان هەبووەو ئەگەر دەقێك لەوبارەوە هەبووايە مشتومرو راجيايى دروست نەدەبوو.

كەواتە لەهەموو رايەكان ر... ترو چاكتر ئەوەيە كە وەك چۆن خواى كاربەجێ ئەو دەقەى بەگشتىو بەموتڵەقى فەرمووە، ئێمەش هەروا بيهێڵينەوەو هيچ مەرج و بەندێكى نەخەينەسەر، بەڵێ دەتوانين بڵێين: لەكاتێك دا مسوڵمانان پەكيان لەسەر جەنگو جيهاد كەوتبێ جەنگاوەرانو پێداويستىيەكانى جيهاد لەهەموو شتێكو هەر بەرژەوەندىيەكى ديكەى گشتى لەپێشترن، هەروەها، هەر بۆيەش (مالك) گوتوويەتى: (سبيل الله كثيرة، ولكني لا أعلمُ خلافاً ان المراد بسبيل الله هُهُنا الغزو من جملة في سبيل الله)[162].

---

[151] بروانە: (البحر الزخار) ج٣ص١٨١.

[152] بروانە: (فقه الأمام جعفر الصادق) ج٢ص٩٢. هەروەها بۆ (٢و٣و٤و٥) بروانە: (إنفاق الزكاة في المصالح العامة) ص٨٤تا٨٦.

[154] بروانە: (التفسير المراغي) ج١٠ص١٤٥.

[155] بروانە: (تفسير المنار) ج١٠ص٤٣٦، ٤٣٧.

[156] بروانە: (الأسلام عقيدة وشريعة) ص١٢٤.

[157] بروانە: (الفتاوى) للشيخ محمد رشيد رضا، ج٣ص١٠٤٩.

[158] بروانە: (العدالة الأجتماعية) ص١٣٥، وە: (في ظلال القرآن) ج٣ص١٦٧٠.

[159] بروانە: (خطوط رئيسية في الأقتصاد الأسلامي) ص١٧.

[160] بروانە: (منهاج المسلم) ص٢٧٢.

[161] بروانە: (فقه الزكاة) ج٢ص٦٥٥تا ٦٦٩.

[161] بروانە: (احكام القرآن) لأبن العربي ج٢ص٩٥٧.

دووەم: (بخاري ومسلم و نسائي و أبوداود وابن ماجه) لە (بشير بن يسار)ەوە خـوا لێی ڕازی بێ گێڕاویانەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ لەحوشتری زەکات خوێنی پیاوێکی ئەنصاری داوە کە لەخەیبەر کوژراوە، جا دیارە صوڵح و ئاشتی نێوان مسوڵمانان بەرژەوەندی یەکی گشتی هەموویانەو (في سبيل الله) نەبێ هیچ کـام لـە حـەوت بەشـەکانی دیکـەی زەکـات نایگرنەوە.

سێیەم: وەك زانایـان گوتوویانـە: ئەگـەر سـەرنجی ئەوانـە بدەیـن کـە زەکاتیـان بـۆ دیاریکراوە لەدوو حاڵەت بەدەرنین:

ا- پێویستی یان بەهاوکاری مسوڵمانانە،

ب- مسـوڵمانان پێویسـتی یان پێ یانـە، کەواتـە هـەر ئیش وکـارو بەرژەوەندی یـەکی دیکەش کە مسوڵمانان بۆی ئاتاج بن هەمان حوکمی هەیە، هەر بۆیەشە کە زۆربەی زانایان بـە دروسـت (جـائز)یـان دانـاوە کـە مـاڵی زەکـات بدرێتـە زانایـان و دادوەران (قضـاة) و قوتابی یـانی زانسـتە شـەرعی یەکان هەرچـەندە توانـای کاسـبی و بژێـو پەیداکردنیشـیان هەبێ.

چوارەم: وەك پێشتریش ئاماژەمان پێکرد: خوای پەروەردگار زەکات پێشیاوانی کە هەشت جۆرن کردوونە دوو بەشەوە:

یەکەم- چواریان: (لِلفُقراء والمساكين والعاملين عليها والمؤلَّفة قلوبهم) پیتی (ل) لامیان چۆتە سەرێ کە مانای خاوەندارێتی دەگەیەنێ و، لـەواقیعیش دا ئـەم چـوارە زەکاتەکـە تەسلیمی خۆیان دەکرێ.

دووەم- وە چوارەکەی دیکەیان: (وفي الرقاب والغارمين وفي سبيل الله وابن السبيل) پیتی (في) (لـە) یـان چۆتـە سـەرێ کە مانـای شـوێن بـوون (ظرفيـة) دەگەیـەنێ و ئەمـەش ئـەوەی لێ دەفامرێتەوە کە ئەم چوار جۆرەیان مەرج نیە زەکاتەکە تەسلیمی خودی خۆیان بکرێ و ئەوەندە بەسە کە بەرژەوەندی یەکانیانی پێ دابین بکرێن، واتە: ئەگەر کۆیلەیە ئازاد بکرێ و ئەگەر قەرزدارە قەرزەکەی بۆ بدرێتەوەو ئەگەر ڕێبوارە بگەیەندرێتـەوە شـوێنی خـۆی، جا مادام وابێ (في سبيل الله) ش هەموو ئەو بەرژەوەندی یە گشتی یانەن کە بەجێ بەجێ کردن و دابـین کردنیـان مسـوڵمانان بەگشـتی بەهرەمـەند دەبـن و کـەڵك و سـوود وەردەگـرن، دەگرێتەوە.

ج-کورتە وەڵامێکی بەڵگەکانی ڕایەکانی دیکە:

یەکەم: جارێ ئەوانە کە دەڵێن وشەی (في سبيل الله) تەنیا جەنگاوەرانی ڕێی خواو پێداویستییەکانی جەنگو جیهاد دەگرێتەوە، لەبەرئەوەی لە بەکارهێنانی عورفو شەرع دا وشەی ناوبراو هەرئەوە دەگەیەنێ! لەوەڵامیان دا دەڵێین: جارێ بەکارهێنانی عورفو عادەت پێوەگرتن هیچ لەحەقیقەتی وشەو زاراوە شەرعییەکان ناگۆڕێو هیچ ئیعتباری پێناکرێ، پاشان ڕاست نیە کە وشەی (في سبيل الله) لە بەکارهێنانی شەرع دا بەس جیهادو جەنگ بگرێتەوە، بەڵکو بەسەرنج دانی قورئانو سوننەت بۆمان دەردەکەوێ کە وەك پەسەندمان کرد وشەی ناوبراو هەرچی کاری خێرو چاکەو بەرژەوەندی گشتی مسوڵمانانە دەیگرێتەوە بەبێ جیاوازی با بزانین چۆن؟!

*خوای بەخشەر دەربارەی ماڵ بەخشین لەپێناوی خوادا فەرموویەتی: (الَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَالَهُمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ثُمَّ لا يُتْبِعُونَ مَا أَنفَقُوا مَنًّا وَلا أَذًى لَهُمْ أَجْرُهُمْ عِنْدَ رَبِّهِمْ وَلا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلا هُمْ يَحْزَنُونَ) البقرة:٢٦٢.

* وە دەربارەی ڕێبازو بەرنامەی خۆی کە بە (سبيل الله) ناوی هێناوە فەرموویەتی: (قُلْ يَاأَهْلَ الْكِتَابِ لِمَ تَصُدُّونَ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ) آل عمران:٩٩،

هەروەها فەرموویەتی: (وَإِنْ تُطِعْ أَكْثَرَ مَنْ فِي الْأَرْضِ يُضِلُّوكَ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ) الانعام:١١٦،

* وە دەربارەی کۆچکردن لەڕێی خوادا فەرمووویەتی: (وَمَنْ يُهَاجِرْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ يَجِدْ فِي الْأَرْضِ مُرَاغَمًا كَثِيرًا وَسَعَةً...) النساء: ١٠٠.

* هەروەها (سبيل الله) بەمانای خێرو چاکە هاتوە، وەك خوای کاربەجێ فەرموویەتی: (وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ وَلَا يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ) التوبة: ٣٤،

جا ئاشکرایە کەبەپێی ئەم ئایەتە ئەگەر کەسێك هەموو سامانی خۆی بکاتە خێرو چاکەو بیبەشێتەوە بێئەوەی بۆ جیهاد صەرفی بکات، ناگونجێ بڵێین، ماڵەکەی لەپێناوی خوادا (في سبيل الله) نەبەخشیوە!!

*هەروەها (في سبيل الله) بەمانای خوا پێ مەبەست بوون (الأخلاص)یش هاتوە، وەك لەم فەرموودەیەدا دەبینرێ: (عن أبي موسى الأشعري ﵁ قال، سئل رسول الله ﷺ عن الرجل يُقاتل شجاعةً، ويُقاتلُ حَميةً، ويُقاتلُ رياءً؟ فأي ذلك في سبيل الله؟! فقال: مَنْ قاتل لتكون كلمة الله هي العُليا فهو في سبيل الله) رواه البخاري ومسلم واصحاب السنن.

کەواتە: ڕاست نیە کە وشەی (في سبيل الله) تایبەت بێ بەجیهادەوە، بەڵکو زۆر مەبەست دەگرێتەوەو بەگشتی واتاو چەمکەکەی بریتیە لەکردنی هەر چالاکیو جموجۆڵو کارێکی خێر لەبەر خواو لەپێناوی ویدا، جا چ جیهاد بێت چ ماڵو سامان بەخشین بێت.. هتد.

*دووەم:* ئەوانەش کە گوتوویانە مەبەست لە (في سبيل الله) حەجو عومرەو جیهادەو یان بەس حەجو عومرە، یان خزمەت کردنی ئەهلی زانستە. هیچ بەڵگەیەکیان بەدەستەوە نیەو ئەو دەقانەش کە پشتیان پێیان بەستوە، یان بێهێزنو قسەیان لەسەرە یان هەر هێندە دەگەیەنن کە وشەی ناوبراو ئەوجۆرە خواپەرستیو کارە خێرانە دەگرێتەوە بەڵام کە لەسەر ئەوان کورت هەڵبێو لەوان دا (حصر) بێت ئەو دەقانە نایگەیەنن، ئەوەی پێشووش کە وشەی ناوبراو ئەو جۆرە کارانە دەگرێتەوە لەگەڵ ئەو ڕایەدا کە پەسەندمان کردوەو، بەرگری لێدەکەین تێك ناگیرێن.

*سێیەم:* وە ئەوەش کە هەندێکیان گوتوویانە: ئەگەر مەبەست لە (في سبيل الله) بەرژەوەندییە گشتییەکان (المصالح العامة) بێت دووبارەبوونەوە (تكرار) لەوانەدا ڕوودەدات کە زەکاتیان پێدەشێ!! دەڵێین: وا نیە، چونکە وەك ڕوونمان کردەوە حەوتەکانی دیکە دیاریکراو (محدَّد) نو لەپێناوی خوادا (في سبيل الله)ش بەرژەوەندییە گشتییەکان دەگرێتەوە، واتە حەوتەکانی دیکە بۆ تاکەکان (أفراد) نو ئەم هەشتەمەش بۆ هەر قازانجو خێرو بەرژەوەندییەکی کۆمەڵو کۆمەڵگایە[١٦٢].

*چوارەم:* وە لەکۆتاییدا پێویستە لەدوو ڕاستی بێئاگا نەبین:

١-ئەم بەشەی (في سبيل الله)یە نابێ بە بیانووی بەرژەوەندی گشتی لەئەندازەی خۆی کە هەشتیەك (٨/١)ە زیاتری بۆ تەرخان بکرێو زیان بەبەشی حەوت جۆرەکانی دیکە بگەیەنرێ.

٢-بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵگا لەچاخو سەردەمێکەوە بۆ چاخو سەردەمێكو لەکۆمەڵگایەکەوە بۆ یەکێکی دیکە دەگۆڕێنو جیاوازنو هەرجارە جۆرێکیان لەپێشتر

---

[١٦٢] بۆ نووسینی سەرجەم ئەم باسەی (في سبيل الله -لەرێی خوادا-) سوودێکی چاکم لەنامیلکەی: (إنفاق الزكاة في المصالح العامة) ی د.محمد عبدالقادر (ابو فارس، وەرگرتوە، خوا پاداشتی بداتەوە.

دەبێ و، دەبێ زیاتر بایەخی پێبدرێ، ڕۆژێك جەنگ و جیهادو کاتێکی دیکە چارەسەری کێشە کۆمەڵایەتی یەکان و ڕۆژێکی دیکە بەرەو پێش بردنی زانست و، ڕۆژێکیش پزیشکی گەری و چارەسەری نەخۆشی و... هتد.

وە ئەوە کە وشەی (في سبيل الله) لەعورف و باوی زانایان و شەرعزانان دا زیاتر جەنگ و جیهادی گەیاندوە، هۆیەکەی ئەوەیە کە زانایـانی ئیسلام بـەدرێژایی مێـژوو هەسـتیان کـردوە کـە جیـهادو بـەرەنگاری و پارێزگـاریکردن لەئیسـلام و مسـوڵمانان گـەورترین و گرنگترین بەرژەوەندی گشتی یان بووە.

## ٨-ابن السبيل (ڕێبوار):

ئـەمیش کەسـێکە کـە ڕێبـوار و ئاوارەیـەو پـارەو مـاڵی پێنـەماوەو پـەکی کـەوتوەو، هێندەی زەکات دەدرێتێ کـەپێی بگاتـەوە مـاڵ و وڵاتـی خـۆی و لـەو حاڵەتـە نەداری یـە کاتی یە قوتاری ببێ.

## تێبینی:

زانایان دوای ئەوەی لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە بێجگە لەو هەشت جۆرە کەسانە کە خوای دادگەر دیاری کردوون زەکات بەکەسی دیکە ناشێ، زۆربەی هەرە زۆریشیان لەسەر چەند مەرجێکی دیکەش پێکهاتوون بۆ زەکات دان:

١-دەبێ بابای زەکات پێدراو مسوڵمان بێت، بێجگە لەدڵڕاگیراوان (المؤلفة قلوبهم) چونکە پێغەمبەر ﷺ بە (معاذ)ی فەرمووە وەك پێشتر فەرموودەکەمان هێناوە:

(تؤخذُ من أغنياءهم فتُرَدّ في فقراءهم) رواه البخاري ومسلم.

٢-نابێ ئەو کەسە لەوەچەی هاشیم و موطەلیب بێ، چونکە ئەوانە خزم و بنەماڵەی پێغەمبەرن ﷺ و ئەوانیش زەکاتیان نادرێتێ بە بەڵگەی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ:

(إن هذه الصَّدقاتِ إنما هي أوْساخُ الناس، وانها لاتَحِلُّ لِمُحَمَّدٍ ولا لآلِ محمدٍ) رواه مسلم، ورواه أحمد وأصحاب السنن عن ابي رافع بلفظ: (إنَّ الصدقة لاتَحِلُّ لَنا).

واتە: ئەم زەکاتانە چڵك و چەپەری خەڵکین، وە بێگومـان بـۆ موحەممـەدو خزمـانی موحەممەد ڕەوانین.

وەچەی (هاشم)یش کە زەکاتیان نادرێتێ بەڕای حەنەفییەکانو شافیعییەکانو حەنبەلییەکان بریتین لە: وەچەی: (عباس و علي و جعفر و عقیل) و (حارث بن عبدالمطلب)، بەلام مالیکییەکان دەڵێن: وەچەی (مطلب) لەڕیزی ئەوان نین[163]، بەلام بێگومان ڕای جەماوەر ڕاست ترە چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إن بني هاشم وبني المطلب شيءٌ واحدٌ وشبّك بين أصابعه) رواه البخاري عن جبير بن مطعم.

بەلام ئەگەر هاتوو هەقی خۆیانیان لێزەوت کرا کە پێنج یەکی پێنج یەك (خُمسُ الخُمس)ە لە (الغنیمة والفيئ)، یان هەر خەزێنەی ماڵ (بیت المال) لێیان خاڵی بوو، ئەوە بەپێی ڕای زۆر لەزانایان ئەوکاتە زەکاتیان پێدەشێ، دیارە بەپێی ڕای زۆربەی زانایانیش هەموو کاتێك خێراتی غەیری زەکاتیان هەر پێدەشێ[164].

٣-نابێ ئەو کەسەی زەکاتی دەداتێ لەوانەبێ کە مەسرەف کێشان (نفقة)یان لەسەری فەرزە[165]، وەك: بابو دایكو باپیرو نەنكو بەرەو سەر، وە کوڕ، کچو نەوە بەرەو خوار، وە هاوسەر (ژن)، بەلام بەو سیفەتە کە قەرزدار یان موجاهید بێ دروستە[166].

وە بەڕای زۆربەی زانایان[167] زەکاتی ژن بەمێردی دەشێ، چونکە پێغەمبەر ﷺ بە (زینب)ی ژنی (ابن مسعود) ی خوا لێیان ڕازیبێ فەرمووە: (زَوجُكِ وَ وَلَدُكِ أحقُ مَنْ تصدَّقْتِ عليهم به) متفق علیه، واتە: مێردەکەتو منداڵەکەت شیاوترین کەسن کەپێیان بدەی.



[163] بڕوانە: (المجموع) ج٦ص٢١٨، وە بڕوانە: (الفقه الأسلامي وادلته) ج٢ص٨٨٤.

[164] بڕوانە: (المجموع) ج٦ص٢١٨، وە بڕوانە: (الفقه الأسلامي..) ج٢ ٨٨٤، هەندێك لەزانایانیش دەڵێن: بەهیچ ڕەنگێك هەر پێیان ناشێ، بڕوانە (سبل السلام) ج٢ص٨٥٤.

[165] بڕوانە: (المجموع) ج٦ص٢١٩، وە بڕوانە: (الفقه الأسلامي) ج٢ص٨٨٥.

[166] سەرچاوەی پێشوو ج٢ص٨٨٥.

[167] بەلام (ابوحنیفة) و (احمد) لە ڕیوایەتێکیدا دەڵێن دروست نیە، بڕوانە: (المغني).

## شەش: گواستنەوەی زەکات (نَقْلُ الزکاة):

وەك لەو فەرموودانەدا دەبینرێ کە باسی کۆکردنەوەو دابەش کردنی زەکاتێ دەکەن، بنچینەی گشتی ئەوەیە کە زەکات لە دەوڵەمەندانی چ شوێن و وڵاتێك وەردەگیرێ، هەر بەسەر هەژارو نەدارو باقی زەکات پێڕەوابووەکانی ئەو شوێن و وڵاتەش دا دابەش بکرێ، بەڵام زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە ئەگەر هات و لەوشوێنەدا کە زەکاتەکەی لێکۆکراوەتەوە خەڵکی زەکات پێڕەوابینراوی لێنەبوو ئەوە دروستە[١٦٨] بۆ شوێن و وڵاتێکی دیکە بگوازرێتەوە کە خەڵکی زەکات پێ شیاوی لێبێ[١٦٩]، بەڵام ئایا ئەگەر هات و خەڵکی ئەو شوێنە کە زەکاتەکانی لێکۆکراونەوەو وەرگیراون خۆیان پێویستیان بوو، وە خەڵکی وایان هەبوو زەکاتیان پێ ڕەوابێ حوکمەکەی چۆنە؟

زانایان لێرەدا ڕایان جیا جیایە:

حەنەفییەکان بەناپەسەند (مکروه)ی دەزانن زەکاتەکە بگوازرێتەوە، مەگەر لەحاڵێك دا کە خەڵکی شوێنە زەکات بۆ گوزراوەکە خزمی بابای زەکات دەربن، یان پێویستیان زیاترو وەزعیان شڕتر بێت، یان بۆ بەرژەوەندی مسوڵمانان چاکتربێ، یان بۆ بابایەکی قوتابی زانستی شەرعی بێت، ئەوە لەم حاڵانەدا ناپەسەند نابێ[١٧٠].

شافیعییەکانیش دەڵێن مەگەر هیچ کەسی زەکات پێشیاو لەشوێنی یەکەم نەبێ ئەگەرنا دروست نیە[١٧١].

(مالك)یش هەر ڕای وایە کە دروست نیە مەگەر خەڵکی ئەو شوێنە دووچاری هەل‌ومەرجێکی ناهەموار بووبن و پێشەواو مشوورخۆری مسوڵمانان بەئیجتیهادی خۆی ئەو بڕیارە بدات[١٧٢].

حەنبەلیەکانیش دەڵێن دروست نیە لەماوە (مسافة)یەك زیاتر بیگوازێتەوە کە نوێژی تێدا کورت بکرێتەوە، بەڵام ئەگەر کەمتربێ دروستە[١٧٣].

(ابن قدامة)ش گوتوویەتی: (فأن خالَفَ ونَقلَها أَجْزَاَتْهُ في قَوْلِ اکثرِ اهل العلم)[١٧٤]، واتە: بەڵام ئەگەر بابای زەکات دەر بەپێچەوانەوە ڕەفتاری کردو زەکاتەکەی گواستەوە ئەوە بەڕای زۆربەی زانایان بۆی وەبەر دەکەوێ.

واش پێدەچێ ڕای ئەوانە بەهێزتربێ کە دەڵێن بەبێ هۆ دروست نیە بگوازرێتەوە.

---

[١٦٨] بەڵکو دەبێ فەرزیش بێ نەك هەر دروست، چونکە بەپێچەوانەوە دروست نیە ماڵی زەکات لەشوێنێك خەرج بکرێ کە کەسی لێنەبێ پێویستی پێی هەبێ، لەحاڵێك دا کە لەشوێنیتر مسوڵمانان بۆی ناچارو ئاتاج بن.

[١٦٩] بڕوانە: (فقه السنة) ج١ص٥٤٦.

[١٧٠] بڕوانە: (الفقه الأسلامي) ج٢ص٨٩٢، وە: (الفقه السنة) ج١ص٥٤٧.

[١٧١] بڕوانە: (المجموع) ج٦ص٢١١.

[١٧٢] بڕوانە: (نيل الأوطار) ج٤ص٢١٥، وە: (المغني والشرح الكبير) ج٢ص٥٣١، وە بڕوانە: (الفقه السنة) ج١ص٥٤٨.

[١٧٣] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[١٧٤] بڕوانە: (المغني والشرح الكبير) ج٢ص٥٣١.

## حەوت: زەكات بەكێ بدرێ خێر ترو چاكترە؟!

ئاشكرایە كە ئەگەر زەكات لەژێر سایەی قەوارەو دەستەلاتێكی شەرعیدا كۆبكرێتەوە، هەم وەرگرتنو كۆكردنەوەیو هەم دابەش كردنیشی بەشێوەیەكی مەركەزی دەبێو دەستەلاتی شەرعی ولات جێبەجێی دەكات، بەلام ئەگەر هەركەسە ئازادبوو لەچۆنیەتی دابەش كردنی زەكاتی مالو سامانی خۆیدا وەك حالو واقیعی ئێستای مسولمانان لەزۆربەی ولاتان دا ئەوە زۆربەی هەرە زۆری زانایان رایان وایە پەسەندو چاكتر ئەوەیە كە زەكاتەكەی بدات بەخزمو نزیكە زەكات پێشیاوەكانی خۆی بەمەرجێك لەوجۆرانە نەبن كە مەسرەفیان لەسەری پێویست بێ وەك پێشتر باسمان كرد، چونكە (ابن المنذر) گوتوویەتی: (زانایان یەكدەنگن لەسەر ئەوە كە زەكاتی ئینسان بەباب و دایكی و سەرووترو كورو كچی و خوارووتر ناشێ)[١٧٥]. هەروەها خێزانیشی واتە ژنەكەی.

ئەمە چەند دەقێك لەوبارەوە كە زەكاتی ئینسان بەخزمانی خێرترو چاكترە:

*پێغەمبەری خوا ﷺ لەوەلامی پرسیاری (زینب) هاوسەری (ابن مسعود) و ئافرەتێكی دیكەدا كەئایا ئەگەر زەكاتەكەیان بدەن بەمێردەكانیانو بەچەند هەتیوێك كە بەخێویان دەكەن بۆیان وەبەردەكەوێ؟! فەرموویەتی : (**لهما أجرانِ أجْرُ القرابةِ وأجْرُ الصَّدَقَةِ**) متفق علیه، واتە: دوو پاداشتیان هەن: پاداشتی خزمایەتیو پاداشتی زەكاتیش.

*هەروەها فەرموویەتی: (**الصَّدَقَةُ على المسكين صَدَقَةٌ وهي على ذي الرحم ثِنْتانِ: صَدَقَةٌ وصِلَةٌ**) رواه احمد والترمذي وابن ماجة، واتە: زەكات دان و خێر كردن بە نەدار هەر بەزەكاتو خێركردن دادەنرێ، بەلام زەكات دان و خێركردن بە كەسێك خاوەنی خزمایەتی بێت دووانە: زەكات دان و خێركردن و خزمایەتی كردنیشە.

* هەروەها فەرموویەتی: (**ان أفْضَلَ الصَّدقَةِ الصَّدَقَةُ على ذي الرَّحِمِ الكاشِح** ) رواه احمد عن ابي ايوب، واتە: بەڕاستی چاكترین مال بەخشین چ فەرز چ سوننەت مال بەخشینە بەخاوەن خزمایەتییەكی ناحەزو بوغزێنەر. (واتە لەبەر خزمایەتییەكەی نابێ گوێ بە ناحەزایەتیو بوغزو غەرەزەكەی بدرێ، دیارە بەمەرجێك مسولمان بێو بۆ ئیسلام بێزیان بێ).

---

[١٧٥] بڕوانە: (نيل الأوطار) ج٤ص٢٤٨، بەلام (شوكاني)، ئەو قسەیەی (ابن المنذر) بەڕاست نازانێو دەلێ هیچ بەلگەیەك لەسەر ئەوە نیە كە دروست نەبێ زەكات بدرێ بەو خزمە نزیكانەی كە مەسرەفیان لەسەر ئینسانە لەكاتی هەژاریو نەدارییان دا، دیارە ئەو رایەی (شوكاني) رای (ابو حنيفة) و هاوەلەكانیو هەندێك لەزانایانی دیكەشەو چەند فەرموودەیەكیش بە بەلگە دێننەوە یەكێكیان ئەوەیە كە (مَعْن بن يزيد) دەیگێڕێتەوە كە بابی ئەندازەیەك پارە لەلای پیاوێك لەمزگەوتێ دادەنێ كە بۆ یبەخشێ و (مَعْن)یش پارەكە دەباتو پاش دەمە قالێیان لەوبارەوە كە دەچنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ ، دەفەرموێ (لك ما نَوَيْتَ يا يَزِيدُ ولك ما أخَذْتَ يا مَعْنُ) رواه البخاري.

# ٤- زەکاتی سەرفترە (زكاة الفطر)

خوا پشتیوان بێ لەحەوت (٧) برگان دا بەکورتی باسی زەکاتی (فطر) دەکەین:

## یەك: پێناسەو کاتی فەرزکرانی:

زەکاتی (فطر) کە بەکوردی (سەرفترە) ی پێ دەڵێن ئەو زەکاتەیە کە لەئەنجامی تەواوکردنی گرتنی ڕۆژووی ڕەمەزان دا فەرز دەبێ[١٧٦]، وە لە مانگی شەعبانی ساڵی دووەمی کۆچیدا فەرزکراوە، واتە هەر لەو ساڵەدا کە گرتنی ڕۆژووی مانگی ڕەمەزانی تێدا فەرزکرا[١٧٧]، دەقی سوننەتیش لەسەر فەرزبوونی زەکاتی (فطر) زۆرن بۆ وێنە:

**(عن ابن عمر** رضي الله عنهما **قال: فَرَضَ رسول الله ﷺ زكاة الفطر من رمضان على الناس: صاعاً مِنْ تَمْرٍ، أوْ صاعاً من شَعِيْرٍ على كل حُرٍ أو عَبْدٍ، ذكرٍ أو أنثى من المسلمين)** رواه الجماعة الا ابن ماجة.

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ زەکاتی تەواوکردنی ڕۆژووی ڕەمەزانی لەسەر خەڵکی پێویست کرد: صاعێك لەخورما، یان صاعێك لەجۆ، لەسەر هەموو ئازادو کۆیلەیەك، چ نێر بێ چ مێ لەسەرجەم مسوڵمانان.

## دوو: حوکمو حیکمەتی:

حوکمی سەرفترە بریتیە لەفەرزبوون (الوجوب) بە یەك دەنگی[١٧٨] هەموو زانایانو بەڵگەشیان ئەو فەرموودانەن کە لەو بارەوە هاتوون، حیکمەتەکەشی وەك لەم دەقەی دەردەکەوێ دوو شتە:

أ-پڕکردنەوەی کەلێنو ناتەواوییەکانی ڕۆژوو و پاککردنەوەی بابای ڕۆژووگر لەو هەڵەو پەڵانەی کە تووشیان بووەو بوونەتە هۆی کەمکردنەوەی خێرو پاداشتی ڕۆژووەکانی.

ب-هاوکاریکردنو دەستبار بۆ گرتنێکی خێراو دەستوبردی هەژارو نەداران لەو ڕۆژە تایبەتییەدا کە جەژنی مسوڵمانانە:

*(**عن ابن عباس رضي الله عنهما قال: فرض رسول الله ﷺ زكاة الفِطْرِ طُهْرَةً للصائِمِ من اللَّغْوِ والرَّفَثِ، وطُعْمَةً للمساكين..**) رواه أبوداود وابن ماجة والدارقطني.

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ زەکاتی کۆتایی ڕەمەزانی بۆ: پاککردنەوەی ڕۆژووگر لە ڕەفتاری پووچو قسەی ناشیرین، وە خواردن دان بە نەداران، پێویست کردوە..

---

[١٧٦] بڕوانە: (الفقه الأسلامي..) ج٣ص٢٠٣٥، ط٤ وە: (فقه السنة) ج١ص٥٥١.

[١٧٧] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[١٧٨] بڕوانە: (المجموع) ج٦ص٨٦، وە: (الروضة الندية) ج١ص٣٢٠، ٣٢١.

## سێ: ئەندازەکەی چەندەو لەسەر کێ فەرزە؟!

سەرجەم زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە ئەندازەی ئەو زەکاتە بریتیە لە (صاع)ێك، لەبژێوی زۆربەی خەڵکی وڵات، بەگرام بەرای زۆربەی[179] زانایان (٢,١٧٦)ە، واتە: دوو کیلۆو چارەکێك شتێك کەمترە، بەمست (مد)یش چوار مست یان بۆ ئیحتیاط کردن پێنج مستە.

ئەوە لەبارەی ئەندازەکەیەوە، لەبارەی ئەو کەسانەشەوە کە لەسەریان فەرزە، زۆربەی هەرە زۆری زانایان دەڵێن: ئەو زەکاتە لەسەر هەموو موسوڵمانێکی ئازاد (حر) فەرزە، چ گەورە بێ چ گچکە، چ نێر بێ چ مێ، چ عاقڵ چ شێت، بەمەرجێك بژێوی شەوو ڕۆژی جەژنی خۆیو ئەوانەی نانو نەفەقەیان لەسەری پێویستە هەبێ[180]، بەڵام حەنەفییەکان دەڵێن: ئەگەر ئەو زەکاتە لەپێداویستییە بنەڕەتییەکان (الحاجات الأصلية)ی زێدەنەبێ، لەسەری فەرز نابێ[181]، مەبەستیشیان لەو پێداویستییانە: خانوو و بەرگو پۆشاكو کەلوپەلی نێومالو کەلوپەلی مالو خێزانیو چەكو هەموو ئەو شتانەیە کە ژیانو گوزەرانی پەکی لەسەریان کەوتوە، هەروەها قەرزداریش نەبێ.

بەڵام بێگومان ڕای جەماوەری زانایان بەهێزترو چاکترە.

ئنجا هەرکەسێك ئەو زەکاتەی لەسەر پێویست بوو دەبێ هەم ئەوەی خۆیو هەم ئەوەی لەسەر ئەو کەسانەش پێویست بووە کە مەسرەفیان لەسەری پێویستە، بدات، وەك: ژنو منداڵە نەباڵغەکانیو[182]، دایكو بابی ئەگەر هەژاربوونو[183]..هتد.

**تێبینی:**

هەرچەندە زۆربەی زانایان بەمەرجیان گرتوە کەدەبێ ئەو زەکاتە لەخودی بژێوەکە بێت بەڵام وایێدەچێ ئەو ڕایە پەسەندتربێ کە دەڵێ نرخ (قیمة)ەکەشی هەر دروستە، مادام بۆ بابای زەکات پێدراو باشتر بێ، ئەو ڕایەش هی: (أبو حنيفة و ثوري)یەو لەپێش ئەوانیش ڕای (حسن البصري و عمر بن العزيز)ە، ئنجا هەرکام لە (إسحاق و أبوثور) یش گوتوویانە: ئەگەر ناچاری بوو دروستە[184]. بەتایبەتی لەم ڕۆژگارەدا کەژیانو گوزەرانی خەڵکی زۆر گۆڕاوەو پارەکە هەر کەلێنێکیان بوێ بۆیان دەگرێ بەڵام بژێو (قوت)ەکە وا نیە.

---

[179] ئەندازەی (صاع)مان بەگرامو لیترو مست، لەبڕگەی چوارەم دا لەزەکات لەچی وەردەگیرێو چەنێ دەدرێ؟!)، لەباسی (نصاب)ی زەکاتی کشتوکالو میوەدا ڕوون کراوەتەوە، بۆیە لێرەدا پێویست بەدووبارەکردنەوە ناکات.

[180] بڕوانە: (المجموع) ج٦ص٨٦، ٨٩، وە: (االفقه الأسلامي) ج٣ص٢٠٣٧، ٢٠٣٨.

[181] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[182] بڕوانە: (المجموع) ج٦ص٩٥، ١٢١، وە بڕوانە: (الفقه الأسلامي) ج٣ص٢٠٣٨، بەڵام (مالیکییەکان دەڵێن: هی کچەکانی هەر لەسەرە هەتا دەچنە لای مێردیان، بڕوانە: (الفقه الأسلامي) ج٣ص٢٠٣٩، ط٤.

[183] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[184] بڕوانە: (المجموع) ج٦ص١٢٣، ١٢٤.

## چوار: چیو چی به بژێو (قوت) دادەنرێ؟!

دەربارەی جۆرەکانی بژێو که بۆ زەکاتی ڕەمەزان دەشێت زانایان بیروڕایان جیاوازە:

هەرچی حەنەفییەکانن دەڵێن پێویسته یەکێك لەم چوار شتانه بێ:

گەنم (الحنطة)، جۆ (الشعیر)، خورما (التمر)، مێوژ (الزّبیب)، وه دەڵێن ئەگەر گەنم بوو نیو صاع پێویسته بەڵام ئەوانی دیکه صاعێك، صاعیش لەلای حەنەفییەکان نزیکەی (٣٨٠٠) یان (٢٧٥١) گرامه[١٨٥].

حەنبەلییەکانیش دەڵێن وێڕای ئەو چواره کەشك (أَقِط )یش هەر دەبێ، وه دەڵێن ئەگەر ئەو پێنجانه چنگ نەکەوتن هەر بژێوێکی دیکەش دەگونجێ[١٨٦]. مالیکییەکانیش[١٨٧] دەڵێن: دەبێ ئەو زەکاته لەبژێوی زۆربەی خەڵکی وڵات بێ، بەڵام لەم نۆ شتانه دەرنەچێ: گەنم، جۆ، خورما، مێوژ، کەشك، جۆ ڕەشکه (سُلْت)، گەنمەشامی (ذرة)، زوڕات (دخن)، برنج (رُز)[١٨٨].

شافیعییەکانیش دەڵێن: پێویسته لەو بژێوه بێ کەزۆربەی خەڵکی ئەو شوێنو وڵاته پێی دەژین، جا هەرچی هەیه با ببێ[١٨٩]!

واش دێته بەرچاو که ڕای شافیعییەکان لەهەموو ڕایەکانی دیکه پەسەندتر بێت، چونکه لەڕاستیدا بژێو (قوت)ی خەڵکی لەشوێنێکەوه بۆ شوێنێكو لەڕۆژگارێکەوه بۆ ڕۆژگارێکی دیکه جیاوازەو گۆڕانی بەسەردا دێ، وه که له دەقەکانی سوننەت تەنیا باسی چوار پێنجێکیان کراوه هۆیەکەی ئەوەیه که لەو ڕۆژگارو ژینگه (بیئة) یەدا هەر ئەو جۆرانه هەبوونو باو بوو ون، ئاشکراشه که له بواری هەڵسوکەوتەکان (المعاملات)دا پێویسته سەرنجی ئامانجو مەبەستەکانی شەریعەت (مقاصد الشریعة) بدرێو، چاو لەسەر ڕواڵەتو دەقاودەقێتی دەقەکان (نصوص) چڕ دانەگیرێ، ئەگەرنا دووچاری هەڵەی سەیر و سەمەره دەبینو بەرنامەی خواش وشكو تەسك دەکەینەوه.

لەبڕگەی سێیەمیش لەژێر سەرباسی تێبینییەك دا خستمانەڕوو که ئەو ڕایەی دەڵێ: نرخ (قیمة) دەخرێته بری بژێو (قوت) ەکە، هیچ گومانیش لەوەدا نیه که لەم ڕۆژگارەدا زۆر پێویستمان بەوجۆره ڕاو بۆچوونانه هەیه بۆ چاکتر هێنانەدی ئامانجو مەبەستەکانی شەریعەتی فراوانو زیندووی خوای پەروەردگار.

---

[١٨٥] بڕ،انه: (الفقه الأسلامي) ج٣ص٢٠٤٤، ط٤، وه: ج١ص١٤٣، ط٤.

[١٨٦] بڕوانه: (المغني و الشرح الکبیر) ج٢ص٦٦٣، ٦١٤، وه : (الفقه الأسلامي) ج٣ص٢٠٤٥.

[١٨٧] بڕوانه: (الفقه الأسلامي) ج٣ص٢٠٤٥، ط٤

[١٨٨] سەرچاوەکه که (الفقه الأسلامي)یه تەنیا (٨)ی هێناون بەڵام من (برنج)یشم لێزیاد کردن بۆئەوەی ببنه نۆ (٩)و پێشم ماقووڵ نەبوو (برنج) یان لەگەڵ نەبێ که ئێستا بژێوی زۆربەی هەره زۆری خەڵکییه.

[١٨٩] بڕوانه: (المجموع) ج٦ص١٢٤.

## پێنج: ئەو جۆرە زەكاتە كەی فەرز دەبێ؟!

سەرجەم زانایان لەسەر ئەوە ڕێك كەوتوون كە لە كۆتایی ڕەمەزان دا فەرز دەبێ[190]، بەڵام لە دیاریكردنی (تحدید)ی كاتەكەدا جیاوازن:

(ثوري و احمدو إسحاق و شافعي) لەقسەی دووەمو تازەیداو (مالك) لەیەكێك لەدوو قسەكانیدا دەڵێن: كاتی فەرزبوونی بریتیە لە ئاوابوونی ڕۆژی شەوی جەژن، چونكە كاتی كۆتایی هێنان بەڕەمەزان (الفِطْر مِنْ رَمَضان) ئەو كاتەیە[191].

(ابوحنيفة و ليث و شافعي) لەڕای كۆنیداو (مالك) لەقسەی دووەمیدا دەڵێن كاتی فەرز بوونی ئەو زەكاتە لە بەرەبەیانی ڕۆژی جەژنەوەیە (طلُوع فَجْرِ يَوْمِ العِيْد)[192].

## شەش: ئایا دروستە پێش بخرێ و زووتر بدرێ؟!

زانایان دوای ئەوەی لەسەر ئەوە یەكدەنگ بوون كە پەسەندو باشتر وایە زەكاتی (فطر) ڕۆژی جەژن پێش نوێژ واتە نوێژی جەژن بدرێ[193]، لەوبارەوە كە ئایا دروستە پەلەی لێبكرێ و پێش بخرێ؟ چەند ڕایەكیان هەن:

(ابو حنيفة) ڕای وایە كە بەساڵیش پێش بخرێ، نەك هەر بەمانگو ڕۆژ![194] دروستە.

(مالك و احمد) و (كرخي)یش لەحەنەفییەكان دەڵێن: دروستە ڕۆژێك و دووان پێش بخرێ[195].

(شافعي)یش گوتوویەتی: لەسەرەتای مانگی ڕەمەزانەوە دروستە بدرێ، بەڵام نابێ پێش مانگی ڕەمەزان بخرێ[196].

(داود)یش ڕای وایە كە نابێ پێش بەرەبەیانی ڕۆژی جەژن بخرێ و، نابێ بخرێتە دوای نوێژی جەژنیشەوە[197].

---

[190] بڕوانە: (فقه السنة) ج١ص٥٥٣، وە بڕوانە: (الفقه الأسلامي) ج٣ص٢٠٤١، ٢٠٤٢، ط٤.

[191] بڕوانە: (المجموع) ج٦ص١٢١.

[192] بڕوانە: (فقه السنة) ج١ص٥٥٣، وە : (المجموع) ج٦ص١٢١.

[193] بڕوانە: (المجموع) ج٦ص١٢١.

[194] سەرچاوەی پێشوو هەمان بەرگو لاپەڕە.

[195] سەرچاوەی پێشوو هەمان بەرگو لاپەڕە.

[196] هەمان سەرچاوەو بەرگو لاپەڕە، وە بڕوانە: (نيل الأوطار) ج٤ص٢٥٢.

[197] بڕوانە: (المجموع) ج٦ص١٢١.

بەڵام بۆ دواخستنی لەنوێژی جەژن ئەوە زۆربەی هەرەزۆریان کە (ابوحنیفة و مالك و شافیعي و لیث و احمد) یان لەنێودان ڕایان وایە مادام هەر لەڕۆژی جەژن دا بێ دروستەو گوناحبار نابێ، بەڵام ئەگەر دواتر کەوت هەم گوناحبارەو هەم دەبێ دواییش هەر بیداتو بۆیشی بەگێڕانەوە (قضاء) لەقەڵەم دەدرێ[198]، ئەمەش تێکڕای زانایان لەسەری ڕێك کەوتوون[199].

## حەوت ئەو زەکاتە دەدرێ بەکێ؟!

ئەو کەسانەی ئەم جۆرە زەکاتەیان دەدرێتێ هەر ئەوانەن کە خوای پەروەردگار لەئایەتی: (إنّما الصَّدقات للفقراء والمساكين...)دا باسیکردوون، لەوبارەشەوە ئەم فەرموودەیە هاتوە:

* (**عن ابن عمر رض الله عنهما قال: فَرَضَ رسولُ الله ﷺ زكاة الفِطْرِ وقال: أغْنوهُمْ عن طَـوافِ هـذا اليَـوْم**) رواه البيهقي، واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ زەکاتی تەواوکردنی ڕۆژووی مانگی ڕەمەزانی پێویست کرد وە فەرمووی: لەگەڕانو سووڕانی ئەمڕۆ – بۆ سواڵو دواکردن – بێنیازیان بکەن.

## دوو تێبینی:

یەکەم: (ابوحنیفة و زهري و محمد بن الحسن وابن شبرمة) ڕایان وایە کە دروستە زەکاتی سەرفترە بدرێ بەئەهلی کیتاب[200].

دووەم: شافیعی‌یەکان ڕایان وایە کە پێویستە زەکاتی گشتیو ئەم زەکاتە تایبەتی‌یەش هەموو ئەو هەشت جۆرە کەسانەی کە لەوڵات دا چنگ دەکەون پێی بگیرێنەوەو بدرێ بەهەموویان کە بێگومان ئەمە زۆر سەختە بۆیە هەندێك لەزانایانی شافیعی مەزهەب، وەك ڕای جەماوەری زانایان فتوایان داوە کە دروستە بدرێ بەیەك کەسیش، وە گوتوویانە: ئەگەر شافیعی زیندوو بووایە ئەویش وای فتوا دەدا[201].

---

[198] هەمان سەرچاوەو بەرگ ص١٢٢، وە بڕوانە: (نيل الأوطار) ج٤ص٢٥٦.

[199] بڕوانە: (فقه السنة) ج١ص٥٥٤.

[200] هەمان سەرچاوەو بەرگو لاپەڕە.

[201] بڕوانە: (الفقه الأسلامي وادلته) ج٣ص٢٠٤٩، ط٤، وە بڕوانە: (جواهر الفتاوى) ج١ص٢٢٢، ٢٢٣.

## ٥- ماڵ بەخشینی سوننەت ( خێرکردن التَصَدُّق )

خوێنەری بەڕێزو خۆشەویست! ماڵو سامان لەرێی خوادا بەخشین وەك چۆن جۆری فەرزی هەیە کە لەخاڵەکانی پێشوودا باسمان کرد جۆری سوننەتیشی هەیە، کە لەزمانی کوردیدا، (خێرکردن) یان (صەدەقە کردن)ی پێ دەڵێن. جا ئێمە خوای بەخشەر پشتیوان بێ هەوڵ دەدەین لەیازدە (١١) برگەی کورت دا باسی خێرکردن یان ماڵ بەخشینی سوننەت بکەین.

**یەك: خێرکردن لەئیسلام دا لەماڵ بەخشینیدا کورت هەڵنەهاتوە:**

بەڵێ لەڕوانگەی ئیسلامەوە تەنها ماڵو سامان بەخشین خێرو چاکەو صەدەقە نیە، بەڵکو چەمك (مفهوم) ی خێرکردن یەکجار فراوانە هەموو جۆرە کارو چالاکییەکی شەرعیو پەسەندو سوودبەخش دەگرێتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لەوبارەوە فەرموویەتی:

*(**علی کل مُسْلِمٍ صَدَقَةٌ، فَقالوا: یانبي الله فَمَنْ لَمْ یَجِدْ؟! قال یعمل بیده فَیَنْفَعُ نَفْسَهُ ویتصدّق، قالوا: فانْ لَمْ یَجِدْ؟ قال: یُعینُ ذا الحاجة الملهُوفِ، قالوا: فأن لَمْ یَجِدْ؟ قال: فَلْیَعملَ بالمعروفِ ولْیُمَسِكْ عن الشرَ، فانها لَهُ صَدَقَةٌ**) رواه البخاري وغیره.

واتە: هەموو مسوڵمانێك لەسەری پێویستە خێر بکات، گوتیان: جا ئەی پێغەمبەری خوا کەسێك نەیبوو چی بکات؟! فەرمووی: با بەدەستی خۆی کار بکات هەم خۆی کەڵکی لێ وەربگرێو هەم خێریشی پێبکات، گوتیان: ئەدی ئەگەر بۆی نەکرا؟ فەرمووی: با هاوکاری لێقەوماوێکی کۆست کەوتوو بکات، گوتیان: ئەگەر، ئەوەشی بۆ نەکرا؟! فەرمووی: با ڕەفتاری چاك بێتو دەست لەخراپە بگرێتەوە بێگومان ئەوەش بۆی بەخێر دەنووسرێ.

*هەروەها فەرموویەتی: (**کل مَعْروفٍ صَدَقَةٌ، وَمِنَ المَعْروفِ أنْ تَلْقَی أخاك بِوَجْهٍ طَلْقٍ، وأنْ تُفْرِغ مِنْ دَلْوِك في إنائِه**) رواه احمد والترمذي وصححه.

واتە: گشت چاکەیەك خێرکردنە، وە لە ریزی چاکەکردن دا ئەوەیە کە بە ڕووی گەش لەگەڵ برایەکەت دا ڕووبەڕوو بیەوە، وەکە لە دۆڵچەکەت ئاوی بۆ لەقاپەکەی بکەی.

* هەروەها فەرموویەتی: (**کلُّ سُلامیُ مِنْ الناسِ علیه صدقةٌ کل یوم تطلَعُ فیه الشَمْسُ: تَعْدِلُ بَیْنَ إثنین صَدَقَةٌ، وتُعینُ الرجل في دابته تحملُهُ علیها وتَرْفَعُ لَهُ عَلَیها مَتاعَهُ صَدَقَةٌ، والکلمة الطیبةُ صَدَقَةٌ، وبکلَ خطوةِ تمشیها الی الصلاة صدقةٌ، وتمیط الأذی عن الطریق صدقة**) رواه البخاري ومسلم عن أبي هریرة.

واتە: هەر ڕۆژێك كەخۆری تێدا هەڵدێ لەسەر هەر جومگەیەكی خەڵكی خێركردنێك فەڕزە؛ جا بە دادگەرانە دوو كەسان ئاشت بكەیەوە خێرە، وە یارمەتی كابرا بدەی لەبارلێنانی وڵاخەكەیداو بارەكەی بۆ بخەیە سەر پشتێ خێرە، وەقسەیەكی خۆش و پەسەند خێرە، وە هەر شەقاوێك كە بەرەو نوێژ دەینێی خێرە، وە ئازارێك لەسەر ڕێگا لابەری خێرە.

## دوو: پێناسەو حوكم و گرنگی ماڵ بەخشینی سوننەت:

مەبەست لەماڵ بەخشینی سوننەت ئەوەیە كە بابای مسوڵمان بێئەوەی شەرع لەسەری پێویست كردبێ و بەویستی ئازاد و خێر خوازیانەی خۆی لەو ماڵ و سامانەی كە خوا پێی بەخشیوە لەپێناوی ڕازیكردنی خواو پاداشتی دواڕۆژدا، ببەخشێ.

ئاشكراشە كە حوكمی ئەوجۆرە ماڵ بەخشینە كە ئێمە بەپێی زاراوی[٢٠٢] شەرعزانان (فقهاء) وەسفی سوننەتمان بۆ بەكارهێناوە ئەوەیە كە ئینسان لەسەركردنی پاداشتی هەیەو لەسەر نەكردنیشی گوناحبار نابێ.

پلەو پایەو گرنگی ئەوجۆرە ماڵ بەخشینەش لە دەقەكانی قورئان و سوننەتدا وەك ڕۆژی ڕوون دەدرەوشێتەوە، بۆ وێنە:

* (مَثَلُ الَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَالَهُمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنْبَتَتْ سَبْعَ سَنَابِلَ فِي كُلِّ سُنْبُلَةٍ مِائَةُ حَبَّةٍ وَاللَّهُ يُضَاعِفُ لِمَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ) البقرة: ٢٦١،

واتە: وێنەی ئەوانە كە ماڵ و سامانەكانیان لە ڕێی خوادا خەرج دەكەن وەك دەنكە تۆوێك وایە كە حەوت گوڵان سەوز دەكات لەهەر گوڵێك دا سەد (١٠٠) دەنك هەیە، وە خوا بۆ هەر كەسێكیش حەز بكات چەند قات دەكاتەوە، وە – خوا دەستەڵات و بەخشش – فراوان و زانایە.

كەواتە: چاكەو خێرو ماڵ بەخشین كە بێگومان لەم ئایەتەدا تایبەت نەكراوە بەماڵ بەخشینی فەڕز یان سوننەتەوە لە تەرازووی كەرەم و بەخششی بێوێنەو بێسنووری خوای بە بەزەیی و بەخشەردا پاداشتەكەی هەتا یەك بەحەوت سەدو پتریش دەڕوات.

*(مَنْ ذَا الَّذِي يُقْرِضُ اللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا فَيُضَاعِفَهُ لَهُ أَضْعَافًا كَثِيرَةً وَاللَّهُ يَقْبِضُ وَيَبْسُطُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ) البقرة: ٢٤٥

واتە: ئەو كەسە كێیە كە قەرزێكی باش لەگەڵ خوادا بكات، تاكو ئەویش بەچەند قاتی زۆر پاداشتی بۆ چەند قات بكاتەوە!

---

[٢٠٢] وشەی (سنة) لەزاراوی فەرموودە ناسان (مُحَدِّثین)دا هەموو دەقەكانی سوننەت و ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ دەگرێتەوە بەفەڕزو سوننەت و هەموو جۆرەكانی یەوە.

وەك دەبینین خوای كاربەجێ و بە بەزەیی خێرو چاكەكردن لەگەڵ خەڵكی‌دا لەبەر خوا بەقەرز بەخوا دان ناو دەبات!! لەحاڵێك دا كە بابای خێركەر خۆی‌و ماڵەكەشی هەر هی خوان‌و بۆلای ویش دەگەڕێنەوە!

*بە هێنانەوەی دەقێكیش لەسوننەتی پێغەمبەر ﷺ كۆتایی بەم برگەیە دێنین، بەڵام بە مەبەستی كورت كردنەوە دەقە عارەبی‌یەكەی نانووسین‌و یەكسەر وەری‌دەگێڕینە سەر زمانی كوردی، دیارە فەرموودەكەش لەوجۆرەیە كەپێی دەگوترێ (قدسی) چونكە پێغەمبەری بەڕێز لەخوای بێوێنە و تاكەوە دەیگێڕێتەوە:

*(فەرموویەتی: خوای زاڵ‌و پایەبەرز ڕۆژی قیامەتێ دەفەرمووێ: ئەی ئادەمیزاد! نەخۆش كەوتم‌و سەرت لێ‌نەدام! دەڵێ: ئەی پەروەردگارم جا چۆن سەرت لێ‌بدەم كە تۆ پەروەردگاری جیهانەكانی؟ دەفەرمووێ: ئەدی نەتزانی كە فلانە بەندەیەم نەخۆش كەوت‌و سەرت لێ‌ی نەدا؟ ئاگاداربە ئەگەر سەردانت كردبایە منت لەلای وی دەبینی!، ئەی ئادەمیزاد! داوای خواردنم لێ‌كردی‌و دەرخواردت نەدام! دەڵێ: ئەی پەروەردگارم جا چۆن دەرخواردت بدەم كە تۆ پەروەردگاری جیهانەكانی؟! دەفەرمووێ: ئەدی نازانی كە فلانە بەندەیەم داوای خۆراكی لێ‌كردی‌و دەرخواردت نەدا؟ ئەدی نازانی ئەگەر دەرخواردت دا بایە پاداشتی ئەوەت لەلای من چنگ دەكەوتەوە؟ ئەی ئادەمیزاد! داوای ئاوم لێ‌كردی‌و ئاوت نەدامێ! دەڵێ: ئەی پەروەردگارم جا چۆن ئاوت بدەمێ كە تۆ پەروەردگاری جیهانەكانی؟ دەفەرمووێ: فلانە بەندەیەم داوای ئاوی لێ‌كردی‌و ئاوت نەدایە، دەجا دڵنیابە ئەگەر ئاوت دابایە ئەوەت لەلای من دەبینی‌یەوە.) رواه مسلم.

## سێ: كێ لەپێشترە بۆ خێر پێ‌كردن؟!

لەبەر تیشكی چەند فەرموودەیەك دا وەڵامی ئەو پرسیارەی سەرێ ڕوون دەبێتەوە:

*(**عن جابر رضي الله عنه أن رسول الله ﷺ قال: إذا كان أَحَدُكُمْ فَقيراً فَلْيَبْدأْ بِنَفْسِهِ، وان كان فَضْلٌ فعليٰ عِيالِه، وان كان فَضْلٌ فعليٰ ذَوي قرابته، أو قال: ذَوي رَحِمِه، وان كان فَضْلٌ فَهٰهُنا وهاهُنا**) رواه احمد و مسلم.

وەك دەبینن پێغەمبەری لێزان ﷺ بەم شێوەیە ڕیز (ترتیب)ی داناوە بۆ خێرو چاكە:

ا- خۆ ج-خزمان

ب- خێزان د-خەڵكی

ئاشكرایە كاتێك ئینسان بۆ خۆی ئاتاجی شتێك بێ‌و بیداتە خێزانی چاوی لەدوایەوە دەبێ، وە ئەگەر خێزانی پێویستی بێ‌و بیداتە خزمانی خێزانی هەقی گلەیی دەبێ‌و، شتێكیش خزمان پێ‌ی ئاتاج بێ‌و بدرێتە خەڵكی پێ‌ی قەڵس‌و پەست دەبن.

* هەروەها لەو فەرموودەیەش دا کە (ابوداود ونسائي و حاکم) بۆمان دەگێڕنەوە کە دوای ئەوەی پێغەمبەر ﷺ بەمسوڵمانانی فەرموو: خێر بکەن (تصدقوا) پیاوێك گوتوویەتی: دینارێکم لەلایە ئەویش فەرموویەتی بۆ خۆتی خەرج بکە! ئەوجار گوتوویەتی: دینارێکی دیکەشم هەیە، ئەویش فەرموویەتی: بیدە بەژنەکەت، ئەوجار گوتوویەتی: دینارێکی دیکەشم هەیە، ئەویش فەرموویەتی: بیبەخشە بەمنداڵەکەت، دیسان گوتوویەتی: دینارێکی دیکەشم لەلایە، ئەویش فەرموویەتی: بیکە خێر بۆ خزمەتکارەکەت، وە لەکۆتاییدا گوتوویەتی: دینارێکی دیکەشم هەیە! ئەویش فەرموویەتی: بۆ خۆت چاکتر دەزانی چی لێ بکەی باشە. بەڵێ لەمیش دا هەمان مەبەستی فەرموودەی پێشوو دووبارە بۆتەوە.

ئاشکراشە کە دوای ڕەچاوکردنی ئەو ڕیز (ترتیب) ە کە باس کرا، ڕیزی دیکەش هەن کە لەخێرکردنو ماڵ بەخشین دا ڕەچاوکردنیان پێویستە، بۆ وێنە:

أ-پێش خستنی ئینسانی چاكو پارێزگار، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

*(لاتَصْحَبْ إلا مُؤْمِناً ولا يأكُلْ طعامك الا تقيٌّ) رواه ابوداود والترمذي عن ابي سعيد الخدري.

واتە: هاوەڵایەتی بڕوادار نەبێ مەکەو با بابای پارێزکاریش نەبێ خواردنت نەخوات.

ب-پێش خستنی بابای ناچارترو کەنەفت تر وەك: کۆیلەو دیلو هەتیوو هەژاری بارکەوتوو، خوای دادگەر و بەبەزەیی لەوبارەوە فەرموویەتی: *(فَلَا اقْتَحَمَ الْعَقَبَةَ، وَمَا أَدْرَاكَ مَا الْعَقَبَةُ، فَكُّ رَقَبَةٍ، أَوْ إِطْعَامٌ فِي يَوْمٍ ذِي مَسْغَبَةٍ، يَتِيمًا ذَا مَقْرَبَةٍ، أَوْ مِسْكِينًا ذَا مَتْرَبَةٍ). البلد: ١١-١٦،

واتە: نەخێر ئەو کەسە کەلافی سەخاوەتو ماڵ بەخشین لێدەدات دەرووی سەختی نەبڕیوە. وە تۆ چووزانی دەرووی سەخت چییە؟ ئازادکردنی گەردنێکە لە نیری کۆیلایەتیو دیلی یاخود خواردن بەخشینە لە ڕۆژێکی برسیەتیدا، بەهەتیوێکی خزم. یان نەدارێکی پەککەوتوو.

## چوار: خێرکردن بۆ کەسێك باشە کە لەپێویستی خۆیو ئەوانەی بەئەستۆیەوەن زیادەی هەبێ:

بەڵێ ئیسلام کە بەرنامەی خوای کاربەجێو پەنهان بینە هەموو یاساو ئاڕاستەکانی بەوردو درشتەوە ئەوپەڕی حیکمەتو لێزانییان تێدا ڕەچاوکراوەو هیچ بڕیارێکی بەگۆترە نەداوە، ئەوەتا لەبارەی خێرکردنو ماڵ بەخشینی سوننەتەوە پێغەمبەری پێشەوامان ﷺ فەرموویەتی: (خَيْرُ الصَّدَقَةِ ما كان عن ظَهْرِ غِنىً، و أبدأ بمن تَعُول) متفق عليه،

واتە: باشترین جۆرە خێرکردن ئەوەیە کە لەبێنیازییەوە بێت، وە لەو کەسانەوە دەست پێبکە کە مەسرەفیان دەکێشی.

ئەگەرنا خێرکردنی بابایەك کە ئەوانەی بەڕێوەبردنو بژێو بۆ پەیداکردنیان ئەرکی شەرعییەتی ئاتاج بنو خێریان پێنەبڕێ نەك هەر پاداشتی نیە، بگرە زۆر نزیکە دووچاری

سزاو جەزرەبەش ببێ، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (كَفَىٰ بـالمَرْءِ إثماً أنْ يُضَيِّعَ مَـنْ يَقُـوتُ) رواه ابوداود والنسائي عن ابي هريرة، واتـە: ئینسان ئـەوەندە گوناحـەی بەسـە كـە ئـەو كەسانە پشت گوێ بخات كە بژێو پەیدا كردنیان بەئەستۆوەیە.

ئنجا بەسەرهاتی ئەو پیاوەش كە بەئەندازەی هێلكەیەك زێڕی هێناو بەپێغەمبەری ﷺ گوت: بیگرەو هەر ئەمەشم هەبوو هیچی دیكەم نیە، پێغەمبەریش ﷺ بەتووڕەییەوە – پاش سێجار قسەو تـەكلیفی ئـەو پیـاوە– لێیوەرگـرت و ڕێی گورزانـدو ئەگـەر پـێی كەوتبایە ئازاری دەدا، وەپاشان فەرمووی: (يأتي أحدُكُمْ بمالهِ كُله يتصَدّقُ بهِ ثُـم يجلسُ بعـد ذلك يَتَكَفف الناسَ! إنَّما الصَّدقَةُ عـن ظَـهْرِ غِـنىً) رواه ابوداود والحاكم وقال: صحيح على شرط مسلم، واتـە: یـەكێكتان هـەموو سامانەكەی دێنـێ و دەیكاتـە خـێر، پاشـان دادەنیشـێ و دەسـت لەخەڵكی پان دەكاتەوە! خێركردن بەس دەبێ لەحاڵەتی هەبوون دابێ.

بـەڵێ لـەو بەسـەرهاتەدا پـەندێكی گـەورەو پـڕ مانـا هەیـە بـۆ ئـەو كەسـانەی كەلەبـەر زاڵبوونی سۆزو عاتیفە گوێ نادەنە تەرازوو و ئاڕاستەكانی شەرع.

هەڵبەتە زانایان لەبەر ڕۆشنایی ئەو دەقەدا كە (ابوداود و ترمذي وصَحّحَهُ) لە (عمر بن الخطاب) خوا لێیڕازی بێ، گێڕاویانەتـەوە دەڵێن بەچەند مـەرجێك دروستە ئینسان لـە هەندێك حاڵەتی تایبەتیدا هەموو ماڵەكەی لەڕێی خوادا ببەخشێ، جا ئێمە لەپێشـەوە دەقەكە دەخەینەڕوو پاشان مەرجەكان:

(عومەر خوا لێی ڕازی بێ گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا فـەرمانی پـێكردین كـە خێربكـەین و لەوكاتـەشدا هـەندێك سامانم هـەبوو، جا گـوتم واتـە لـەدڵی خۆیدا ئەگـەر چ ڕۆژان پێـش ئەبوبـەكر خـوا لێیڕازیبـێ كەوتبمـەوە مەگـەر ئـەمڕۆبێ! هـاتم نیـوەی ماڵەكـەمم هێنـا، پێغەمبـەر ﷺ فـەرمووی: چیت بۆ ماڵو خێزانت هێشـتۆتەوە؟ گـوتم: هێنـدەی ئەمـە كـە هێناومە. ئەبوبەكریش خوالێیڕازیبێ هـەرچی هـەیبوو هێنابووی! جا پێغەمبـەری خـوا ﷺ فـەرمووی: چیـت بـۆ مـاڵو خـێزانت هێشـتۆتەوە؟ گوتـی: خـواو پێغەمبەرەكـەیم بـۆ بەجێهێشتوون، واتە بەتەمای ئەوان لێیان گەڕاوم ، منیش گوتم: هەرگیز لەهیچ شتێك دا پێشبڕكەت لەگەڵ ناكەمەوە).

ئەو مەرجانـەش كـە زانایـان بەمـەرجیان گرتـوون بـۆ دورسـت بوونـی ئـەوجۆرە مـاڵ بەخشین و كەسك لەماڵەوەدانە، ئەمانەن:

ا– كە بابای بەخشەر حاڵەتی پشت بەخوابەستن (تَوَكُّل)ی زۆر بەهێزبێ و خۆڕاگربێ.

ب–كە وزەو تواناو سەلیقەی كارو كەسابەتی هەبێ.

ج–كە قەرزدار نەبێ، چونكە قەرزدانەوە فەرزەو خێركردن سوننەتەو نابێ پێش بخرێ.

د–نابێ ئەوانـەی نانو نەفەقەیان لەسـەری پێویستە ئاتاج بن، یان هـەر هیچ كەسـی بەئەستۆوە نەبێ كە دابین كردنی گوزەرانیانی بەئەستۆوەبێ.

## پێنج: نەسڵەمینەوە لەخێرکردنی گچکەو بەخشینی شتی کەمیش:

چونکە خوای وردبین فەرموویەتی: (فَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَه) الزلزلة:٧، واتە: هەرکەس بەقورسایی گەردێك چاکە بکات دەیبینێتەوە.

پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: (إتَّقوا النَّارَ ولَوْ بِشَقِّ تَمْرَةٍ) متفق عليه.

واتە: ئەگەر بە لەتکە دەنکە خورمایەکیش بێ کەبیبەخشن خۆتان لەئاگری دۆزەخ بپارێزن.

هەروەها فەرموویەتی: (يا نساءَ المسلمات لاتحقرنّ جارةٌ أنْ تَهْديَ لِجارتِها ولَوْ فِرْسَنَ شاةٍ) متفق عليه عن ابي هريرة، واتە: ئەی ئافرەتانی مسوڵمان با دراوسێیەکتان دیاری ناردن بۆ دراوسێیەکەی بە کەم نەگرێ ئەگەر پێچکە مەڕێکیش بێ.

بەڵێ لەکەمی کەمو لەزۆریش زۆر، جاری واش هەیە خێرێکی گچکەو کەم لەلای خوای دادگەر پێش خێرکردنو ماڵ بەخشینێکی یەکجار زۆر دەکەوێتەوە، وەك لەو فەرموودەیەدا دەردەکەوێ کە (نسائي و ابن خزيمة و ابن حبان) لە (أبو هريرة) ی دەگێڕنەوە کەپێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ فەرموویەتی:

(درەمێك پێش سەد هەزار درەم کەوتەوە! پیاوێك گوتی: جا ئەوە چۆن بووە ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی: پیاوێك سامانێکی زۆری هەبوو لەلایەکیەوە سەد هەزار درەمی بردو کردیە خێر، پیاوێکیش بەس دوو درەمی هەبوون، یەکێکیانی بردو کردیە خێر)

## شەش: خێرکردنی بەردەوام (الصدقة الجارية):

ئەو خێرو چاکانەی کەئینسان پێیان هەڵدەستێ لەڕووی بەردەوام بوونو نەبوونیانەوە دوو جۆرن:

ا- جۆرێکیان یەك جار دەکرێو لەکاتو شوێنێکی دیاریکراوداو دەبڕێتەوە، وەك: بەخشینی ئەندازەیەك خواردنو خواردنەوە، یان بەرگو پۆشاکێك بە بابایەکی ئاتاج.

ب-جۆرەکەی دیکەشیان کەمو زۆر دەوامی دەبێت، تەنانەت بۆ دوای مەرگیشی، وەك: چاککردنی ڕێو بانێك، دروست کردنی مزگەوتو قوتابخانەو خەستەخانەو.. هتد بڵاوکردنەوەی زانستێکی سوودبەخش، بنیاتنانی باغێك .. هتد.

پێغەمبەری خوا ﷺ لەوبارەوە فەرموویەتی: (إذا ماتَ الأنسانُ إنْقَطَعَ عَمَلُهُ الاّ مِنْ ثلاثة: صَدَقَةٍ جارِيَةٍ، أو عِلْمٍ يُنْتفَعُ به، أوْ وَلَدٍ صالحٍ يَدْعو لَهُ) رواه احمد ومسلم.

واتە: ئینسان کە مرد کردەوەی چاکی دەبڕێ مەگەر لە سێ ڕێیانەوە: خێرێکی بەردەوام، یان زانیارییەك کە سوودی لێببینرێ، یان منداڵێکی صالح کە بۆی بپاڕێتەوە.

ئاشکراشە کە کارو کردەوەی خێرو چاکە هەر جۆرێکی بێ هەرباشە، بەڵام بێگومان هەتا لە ڕووی ڕووبەر (مساحة)ی سوودگەیاندنی فراوانترو لە ڕووی خایاندن (استمرارية) ەوە زیاتربێ چاکترەو پاداشتی پترە.

## حەوت: خێرکردنی ئافرەت لەماڵی مێردیدا:

بێگومان ژن لەماڵو مێردیدا خاوەن هەقو مافە بۆی هەیە کە لەماڵو سامانی مێردەکەیدا لە سنوورێکی گونجاوو ماقووڵ دا مادام بزانێ مێردەکەی پێی ناخۆش نیە خێرو چاکە بکاتو هەم خۆیشیو هەم مێردەکەیشی پاداشتیان بۆ دەنووسرێ، ئەمەش چەند دەقێکی سوننەت کە ئەو مەسەلەیە جوان ڕوون دەکەنەوە:

*(عن عائشة رضي الله عنها قالت: قال النبيُ ﷺ: إذا أنفَقَتِ المرأةُ مِنْ طعام بَيْتِها غير مُفْسدَةٍ كان لَها أجْرُها بما أنفقَتْ، ولِزَوْجِها أجْرُهُ بما كَسَبَ، وللخازنِ مثل ذلك، لاينقصُ بَعْضُهُمْ أجرَ بَعْضٍ شيئاً) رواه البخاري.

واتە: هەرکات ئافرەت لەخواردەمەنی ماڵەکەی بەخشی بەبێ زیان گەیاندن ئەوە هەم بۆ خۆی پاداشتی هەیە بەهۆی بەخشینەکەیەوەو هەم مێرەدەکەشی پاداشتی هەیە بەهۆی پەیداکردنییەوەو، هەم عەمباردارەکەشی پاداشتی هەیە، هەندێکیان یەك تۆز لەپاداشتی هەندێکیان کەم ناکەنەوە یەعنی هیچیان لەپاداشتی ئەویتر کەم ناکەنەوە.

*(عن أبي أمامة قال سَمْعْتُ رسُولَ الله ﷺ يَقُولُ في خُطْبَةِ عام حَجَّة الوداع: لاتُنفِقُ المرأة شيئاً مِنْ بَيْتِ زَوْجِها إلاّ باذنِ زوجها، قيل: يا رسول الله ولا الطّعامَ؟ قال: ذلك أفْضَلُ أمْوالِنا) رواه الترمذي وحَسَّنَهُ.

واتە: گوێم لەپێغەمبەری خوا ﷺ بوو کە لەوتاری حەجی ماڵئاواییدا دەیفەرموو: نابێ ژن هیچ شتێك لە ماڵی مێردی ببەخشێ بەبێ مۆڵەتی وی، گوترا: ئەی پێغەمبەری خوا تەنانەت خواردنیش؟ فەرمووی: ئەوە – خواردن – چاکترین جۆری سامانمانە.

*بەڵام دیارە مەبەستی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە نیە کە ژن بۆی نەبێ هەر هیچ ببەخشێ! چونکە ئەوەتا (أسماء بنت أبي بكر) خوا لێیان ڕازیبێ پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺ کردوە گوتوویەتی: زوبەیر خوا لێیڕازی بێ پیاوێکی توندە مەبەستی نەبەخشینە وە جاری وایە نەدارێك دێتە لامو لەماڵی وی خێری پێدەکەم بەبێ مۆڵەتی وی! پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (إرْضَخي ولاتُوعي فَيُوعيَ الله عَلَيك) رواه احمد والبخاري ومسلم.

واتە: کەمێك ببەخشەو سامانەکەتان مەخەنە کیسەوە واتە دەست مەنووقێنن ئەگەرنا خواش ڕۆزیتان لێدەگرێتەوە.

## هەشت: بەخشین و خێرکردن بەئینسانی گوناحبارو تەنانەت کافریش دروستە:

خوای پەروەردگار لەوبارەوە فەرموویەتی:

*(لا يَنْهَاكُمْ اللَّهُ عَنْ الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُمْ مِنْ دِيَارِكُمْ أَنْ تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوا إِلَيْهِمْ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ) الممتحنة: ٨، واتە: خوا رێتان لێناگرێ کەچاکە بکەنو دادگەری بکەن لەگەڵ ئەوانەدا کە لەبەر ئایین لەگەڵتان نەجەنگاون، وە لەماڵو حاڵتان وەدەریان نەناون، بێگومان خوا دادگەرانی خۆش دەوێن.

هەروەها فەرموویەتی:

* (وَيطعِمونَ الطعامَ على حبّهِ مِسكيناً وَيَتيماً وَأسيراً) الدهر:٨، واتە: وە خواردنێك کە لەلایان خۆشەویستە دەیدەن بەنەدارو هەتیوو دیل. (ئاشکراشە کە (دیل)ی لای مسوڵمانان کافرو دوژمنێکە کە لەجەنگ دا گیراوە).

*(اسماء بنت ابي بكر)[٢٠٣]یش خوا لەخۆی و بابی ڕازیبێ دەڵێ: دایکم لەکاتێك دا جارێ هەر هاوبەش بۆ خوا پەیداکەر (مشركة) بوو هاتە لام، منیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا دایکم هاتۆتە لامو مەیلیشی هەیە واتە بەلای ئیسلام دا جا ئایا هاوکاری بکەمو چاکەی لەگەڵ بکەم؟! فەرمووی: (نَعَمْ صِلِي أُمَّكِ) بەڵێ چاکە لەگەڵ دایکت دا بکەو هاوکاری بکە. (بخاري و مسلم) گێڕاویانەتەوە.

## نۆ: خێرو چاکەکردن لەگەڵ مردوودا:

مسوڵمانان چ لەحاڵەتی ژیانو چ لەحاڵەتی مردنو دوای ژیانیش دا بەرانبەر بەیەکتر بەرپرسیارن، جا بەشێك لەو بەرپرسیارێتی‌یە کە مسوڵمانان بەرانبەر بەمردووەکانیان ئەرکی سەرشانیانە بریتیە لەخێرو چاکە لەگەڵ کردنیان و پێبەخشینیان، جا ئەو خێرو چاکەو بەخشینەش چەند جۆرێکی هەیە کە هەندێکیان سەرجەم زانایانو هەندێکیشیان زۆربەو جەماوەریان لەسەریان ڕێك کەوتوون، کە ئەمانەن:

١-پاڕانەوە ( الدعاء ):

خوای میهرەبان لەوبارەوە فەرموویەتی: (وَالَّذِينَ جَاءُوا مِنْ بَعْدِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا وَلِإِخْوَانِنَا الَّذِينَ سَبَقُونَا بِالْإِيمَانِ وَلَا تَجْعَلْ فِي قُلُوبِنَا غِلًّا لِلَّذِينَ آمَنُوا رَبَّنَا إِنَّكَ رَءُوفٌ رَحِيمٌ) الحشر:١٠، واتە: وە ئەوانەی لەدوایانەوە دێن دەڵێن: پەروەردگارمان لەئێمەو لەو برایانەمان ببوورە

---

[٢٠٣] بڕوانە: (رياض الصالحين) للنووي، ص١٣٣.

کە بەئیمانەوە لەپێشمان دا ڕابردوون، وە بەرانبەر بەوانەی ئیمانیان هێناوە کینەمان مەخە نێو دڵان، پەروەردگارمان بەڕاستی تۆ میهرەبان و بە بەزەیی.

هەروەها پێشتریش باسمان کرد کە یەکێك لەپایەکانی نوێژی مردوو بۆ پاڕانەوەیەتی، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (إذا صَلَّيْتُمْ على المَيِّتِ فَأَخلِصُوا لَهُ الدُّعَـاءَ) روا ه ابوداود والبيهقي وابن حبان وصَحَّحَهُ.

## ٢-ماڵ بەخشین ( الصَّدقة ):

ئەمیش (نووي)[٢٠٤] گوتوویەتی زانایان لەسەر گەیشتنی بەمردوو لەهەر کەسێکەوە بێ، یەکدەنگن، ئەم دەقەش یەکێکە لە بەڵگەکانی گەیشتنی خێرو صەدەقە بەمردوو:

*(عن أبي هريرة رضي الله عنه أن رَجُلاً قال للنبيَ ﷺ: إنَّ أبي ماتَ وترك مالاً ولَمْ يُوصِ، فَهَلْ يُكَفِّرُ عَنهُ أنْ أتَصَدَّقَ عَنْهُ؟ قالَ: نَعَمْ) رواه احمد ومسلم.

واتە: پیاوێك بەپێغەمبەری ﷺ گوت: بابم مردووەو سامانێکی بەجێهێشتوەو وەصیەتیشی نەکردوە، جا ئایا ئەگەر خێری بۆ بکەم گوناحی لێدەسڕێتەوە؟! فەرمووی: بەڵێ.

## ٣-ڕۆژووگرتن:

بەڵگەی ئەمیش چەند فەرموودەیەکە یەکێکیان ئەوەیە کە (بخاري ومسلم) لە (ابن عباس) ەوە خوا لێیان ڕازیبێ گێڕاویانەتەوە کە پیاوێك هاتۆتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و گوتوویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا دایکم مردووەو ڕۆژووی مانگێك قەرزدارە، جا ئایا بۆی بگێڕمەوە؟! فەرمووی: (لَوْ كانَ على أُمِّكَ دَيْنٌ أكُنْتَ قاضِيَهُ عَنْها؟! قال: نَعَمْ، قال: فَدَيْنُ الله أحَقُّ أنْ يُقضى)، واتە، ئایا ئەگەر دایکت قەرزێکی لەسەر بووایە بۆت دەدایەوە؟! گوتی: بەڵێ، فەرمووی: دەجا قەرزی خوا شایستەترە بەدرانەوە[٢٠٥].

## ٤-حەج کردن:

بەڵگەی ئەمیش ئەم فەرموودەیەیە:

* (عن ابن عباس رضي الله عنهما أنَّ امرأةً مِنْ جُهَيْنَةَ جاءَتْ الى النَبيِّ ﷺ، فَقالَتْ: انَّ أُمـي نَذَرَتْ أنْ تَحُجَّ فَلَمْ تَحُجَّ حتىَّ ماتَتْ، أفَأَحُجُّ عَنْها؟! قالَ: حَجِّي عَنها، أرَأيْتِ لَوْ كانَ على أمِكِ دَيْنٌ، أكُنْتِ قاضِيَتَهُ؟! أقْضوا فَاللهُ أحَقُّ بالقَضاءِ) رواه البخاري.

---

[٢٠٤] بڕوانە: (المجموع) ج٥ص٢٨٦.

[٢٠٥] (نووي) ڕەحمەتی خوای لێبێ دوای ئەوەی ڕایەکی (شافعي) دێنێ کە مردوو ڕۆژووی بۆ ناگێڕێتەوە، گوتوویەتی: (الصواب الجزم بجواز صوم الولي عن الميت سواءٌ رمضان والنذر وغيره من الصوم الواجب للأحاديث الصّحيحة السابقة ولا معارض لها ويتعين أن يكون هذا مذهب الشافعي، لأنه قال: اذا صَحَّ الحديثُ فهو مَذْهبي واتركوا قَوْلي المخالِفَ لَهُ..) بڕوانە: (المجموع) ج٦ص٣٩٣.

واتە: ئافرەتێکی جوهەینیی‌یە هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ ، گوتی: دایکم حەجی لەخۆی گرتبوو، بەڵام حەجەکەی نەکرد هەتا مرد، جا ئایا حەجی لەباتی بکەم؟ فەرمووی: حەجی لەجیاتی بکە، ئایا نابینی ئەگەر دایکت قەرزێکی لەسەر بووایە، ئایا بۆت نەدەدایەوە؟ دەجا ئەوجۆرە قەرزانەی خوا بگێڕنەوە چونکە خوا لەپێشترە کە قەرزی بدرێتەوە.

حەج کردنیش لەجیاتی مردوو ئەگەر وەصیەتی کردبێ وەك (نـووي) گوتوویـەتی: ڕای هەرکام لـە (أبـو حنیفـة و مالك و شافعي و احمـد) ئەوەیـە کـە دروسـتە[٢٠٦]، بـەڵام ئـەگـەر وەصیەتی نەکردبێ ئەوە دیسان زۆربەی[٢٠٧] زانایان کە بێجگە لە (أبو هريرة و ابن عباس) خوا لێیان ڕازی بێ هەرکام لە (عطاء و ابن سيرين) وە (أبوحنيفة و أبوثور و شافعي و ابن المنـذر)یشـیان لـەنێودان دەڵێـن دروسـتە. بـەڵام (مـالك) گوتوویـەتی: ئەگـەر وەصیـەتی نەکردبێ حەجی بۆ ناگات بەڵام خێرو چاکەی دیکەی بۆ دەکاتو بۆی دەکاتە دیاری[٢٠٨].

### ٥-نوێژکردنو قورئان خوێندن:

ژمارەیەکی زۆر لەزانایان[٢٠٩] ڕایان وایە کە نوێژو قورئان خوێندنیش وەك دووعاو ماڵ بەخشینو ڕۆژووگرتنو حەج بەمردوو دەگات، هەندێکیشیان ڕایان وایە کە ئەم دووانە بەمردوو ناگـەن، بەڵگـەی ئەوانـە کـە دەڵێـن پـێ‌ی دەگـەن چـەند شـتێکە یـەکێکیان ئـەم فەرموودەیەیە کە (دار قطني) گێڕاویەتەوە کە پیاوێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من بابو دایکێکم هـەبوون کەهـەتا لـەژیان دا بـوون چاکـەم لەگـەڵ دەکـردن، جـا ئایـا پـاش مردنیان چۆن چاکەیان لەگەڵ بکەم؟ ئەویش ﷺ فەرمووی: (**إنَّ مِنَ البِرِّ بعد الموت أنْ تُصَلِّيَ لَهُما مع صلاتِكَ وأن تَصُومَ لَهُما مع صِيامِكَ**) واتە: لەچاکەکردن لەگەڵیان پاش مردن ئەوەیە کە لەگەڵ نوێژەکەت دا نوێژیان بۆ بکەی‌و لەگەڵ ڕۆژووگرتنت دا ڕۆژوویان بۆ بگری.

بەڵام هەندێکیان[٢١٠] کە (شافعي) یەکێکیانە ڕایان وایە کە نوێژو قورئان خوێندن ناگەن! بەسەرنج دانـی دەقـەکانی قورئـانو سـوننەتیش دەردەکـەوێ کـەڕای زۆربـەو جـەماوەری



[٢٠٦] بڕوانە: (المجموع) ج٧ص٨١.

[٢٠٧] بڕوانە: هەمان سەرچاوەو بەرگ ص٨٣.

[٢٠٨] هەمان سەرچاوەو بەرگ ص٨٣.

[٢٠٩] بڕوانە: (المغني والشرح الكبير) ج٢ص٤٢٤-٤٣٠، وە بڕوانە: (نيل الأوطار) ج٤ص١٤٢-١٤٤، وە بڕوانە: (مجموعة الفتاوى) لأبن تيمية ج٢٤ص١٧٨، ١٧٩ وە ج٢١ص١٧٩، وە بڕوانە: (فقه السنة) ج١ص٤٤٣، ٤٤٤، وە بڕوانە: (الفقه الأسلامي) ج٣ص٢٠٥٧)، ط٤.

[٢١٠] بڕوانە: (فقه السنة) ج١ص٤٤٣، وە: (الفقه الأسلامي..) ج٣ص٢٠٥٧، ط٤.

زانایان بەهێزترە کە دەڵێن هەموو کردەوەیەکی خێرو چاکە مادام بکرێتە دیاری (هدیة) بەمردوو دەگات، ئەوەندە هەیە هەندێکیان بەشێك لەو کارە خێرانە تایبەت دەکەن بەخزمی[٢١١] نزیکی مردووەوە وەك ڕۆڵە بۆ باب و دایك و ژن و مێرد بۆ یەکتر، بەتایبەت نوێژو ڕۆژوو.

وە سەرجەم زانایانیش لەسەرئەوە یەکدەنگن کەنابێ قورئان خوێندنەکە بەکرێ (أُجرة) بێت و لەبەرانبەر شتێك دا بێ[٢١٢]، هەروەها زۆربەشیان دەڵێن نابێ لەسەر گۆڕەکەی بخوێندرێ، بەڵام (أحمد) بەدروست و بگرە بەپەسەندیشی زانیوە[٢١٣]، بەڵام بێگومان ڕای زۆربەی زانایان بەهێزترو بەڵگەدارترەو زانایانی لێکۆڵەرەوە گوتوویانە لەوبارەوە هیچ فەرموودەیەکی ڕاست (صحیح) و بگرە چاك (حسن) یش نیەو سەرجەمیان بێ‌هێز (ضعیف)ن[٢١٤].

## دە: خێرکردن و چاکەکردن لەگەڵ گیانداران دا:

بەخشین و چاکەکردن نەك هەر لەگەڵ ئینسانەکان بەڵکو لەگەڵ گیاندارانیش دا پاداشتی هەیە، پێغەمبەری بەبەزەیی ﷺ لەوبارەوە ئەم فەرمایشتەی فەرمووە:

*(بَيْنَما رَجُلٌ يَمْشي بِطَرِيقٍ اْشتَدَّ عليه العَطَشُ، فَوَجَدَ بئراً فَنَزَلَ فيها فَشَرِبَ ثُمَّ خَرَجَ فـإذا كَلْبٌ يَلْهَثُ الثرى من العَطَشِ، فَقَالَ الرَّجُلُ: لَقَدْ بَلَغَ هذا الكلبُ من العَطَشِ مثل الذي كان قَدْ بَلَغَ مني، فَنَزَلَ البِئْرَ، فَمَلأَ خُفَّهُ ماءً، ثُمَّ أَمْسَكَهُ بِفَمِهِ حَتىَّ رَقِيَ فَسَقى الكلْبَ، فَشكر اللهُ لَهُ فغفر لَهُ، قـالوا يـا رسول الله: إنَّ لَنا في البهائِمِ أجْراً! فقالَ: في كُلِّ كَبِدٍ رَطبَةٍ أجْرٌ) متفق عليه.

واتە: لەکاتێك دا پیاوێك بەڕێیەك دا دەڕۆیی تینوێتی سەغڵەتی کردبوو، بیرێکی بینی جا پێیدا چووە خوارێ و ئاوی خواردەوەو دوایی هاتەوە دەرێ و سەگێکی بینی لەتینوان زمانی ڕەعەرزێ دەخشاند، کابرا لەدڵی خۆی‌دا گوتی: دیارە من چەندەم تنیوو بوو بوو ئەم سەگەش هێندەی تینوو بووە، ئەوجار دابەزیەیە بیرەکەو گۆرەویەیە چەرمەکەی پڕکرد لەئاوو پاشان بەزاری گرتی هەتا سەر کەوتەوەو سەگەکەی ئاودا، خواش سوپاسی کردو لێی‌خۆش بوو، گوتیان ئەی پێغەمبەری خوا ئایا لەگیاندارانیش دا پاداشتمان هەیە؟! فەرمووی: هەموو گیاندارێکی هەناوتەڕ پاداشتی لەسەر هەیە ئەگەر چاکەی لەگەڵ بکرێ و سوودی پێ‌بگەیەنرێ.



[٢١١] بڕوانە: (نيل الأوطار) ج٤ص١٤٢، ١٤٣.

[٢١٢] بڕوانە: (مجموعة الفتاوى) ج٢٤ص١٦٧و ١٧٦.

[٢١٣] بڕوانە: (المغني والشرح الكبير) ج٢ص٤٢٤، ٤٢٥.

[٢١٤] بڕوانە پەراوێزی (المغني والشرح الكبير) ج٢ص٤٢٥، ٤٢٦.

## یازده: خێرکردن بەماڵی حەرام:

زانایان هەموویان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە خێرو چاکەکردن بەماڵو سامانی حەرام وەرناگیرێ، لەوبارەشەوە ئەم دوو دەقە دێنینەوە:

*پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (أيها النّاسُ إنَّ الله طَيِّبٌ لايَقْبَلُ الا طَيّباً وإنَّ الله أمَـر المؤمنـين بما أمَرَ به المُرسَلين، فقال الله عزَّ وجل: ﴿يَاأَيُّهَا الرُّسُلُ كُلُوا مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَاعْمَلُوا صَالِحًا إِنِّي بِمَـا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ﴾ (المؤمنون:٥١)، وقال: ﴿يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُلُوا مِنْ طَيِّبَاتِ مَـا رَزَقْنَـاكُمْ وَاشْـكُرُوا لِلَّـهِ إِنْ كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ﴾ (البقرة: ١٧٢)، ثم ذكر الرَّجُلَ يُطيلُ السَّفَرَ، أشْعَثَ أغْبَرَ يَمُدُّ يَدَيْه الى السماء: ياربِّ ياربِّ! ومطْعَمُهُ حَرامٌ، ومَشْرَبُهُ حَرامٌ، ومَلْبَسُهُ حَرامٌ، وغُذِيَ بالحرام فَأَنَّى يُستجابُ لَهُ!) رواه مسلم.

واتە: ئەی خەڵکینە خوا پاکو چاکەو خێرو چاکەی پاکو[215] چاکیش نەبێ وەرناگرێ، وە خوا بەوە کە فەرمانی پێ بەپێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام کردوە، فەرمانیشی پێ بە بڕواداران کردوە، خوای زاڵو پایەبەرز فەرموویەتی: (ئەی پێغەمبەرینە! لەڕۆزیی پاك و چاکەکان بخۆنو کردەوەی باش بکەن بێگومان من بەوەی دەیکەن زانام)، وە فەرموویەتی: (ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە لەو ڕۆزیيە پاكو چاکانە بخۆن کەپێمان بەخشیون)، پاشان پێغەمبەر ﷺ باسی کابرایەکی کرد کە سەفەرێ درێژ دەکاتەوە، سەرو ڕیش ئاڵۆزو تەپوتۆزاوی، هەردووك دەستی بەرەو ئاسمانێ بەرز دەکاتەوەو دەڵێ: ئەی پەروەردگارم ئەی پەروەردگارم! بەڵام خواردنەکەی حەرامەو، خواردنەوەکەی حەرامەو، پۆشاکەکەی حەرامە، وە هەر بەحەرامیش بەخێوکراوە، ئاخر چۆن پاڕانەوەی بابای وا وەڵامی بدرێتەوە!

*هەروەها فەرمویەتی: (مَنْ تَصَدَّقَ بَعدْلِ تمرةٍ مَنْ كسْبٍ طَيِّب - ولايقبل الله الا الطيب فأن الله تعالى يَتَقَبَّلُها بيَمينِه ثُمَّ يُرَبِّيها لَصاحِبِها كما يُرَبِّي أحَدُكُمْ فَلُوَّهُ حَتىَّ تكونَ مِثْلَ الجَبَل) رواه البخاري.

واتە: هەرکەسێك هێندەی دەنکە خورمایەك لەماڵێکی[216] حەڵاڵ بکاتە خێر وە خواش خێری ماڵی حەڵاڵ نەبێ وەرناگیرێ ئەوە بێگومان خوای بەرز بەدەستی ڕاستی وەریدەگرێ، پاشان بۆ خاوەنەکەی گەشەی پێدەکات، وەك چۆن یەکێکتان جوانووەکەی بەخێودەکات، هەتا پاداشتی ئەو خێرە هێندەی چیایەکی لێدێ.

بەم بڕگەیەش کۆتایی بەباسی ماڵ بەخشینی سوننەتو خێرو چاکەکردن دێنینو دەچینە سەر خاڵی شەشەم (چۆنیەتی ماڵ بەخشین).

---

[215] بۆیە جارێك وشەی (طيب) مان بە (پاكو چاك) ماناکردوەو جارێکیش بە (حەڵاڵ)، چونکە (طيب) لەئەسڵی زمان دا بەمانای پاکیو چاکی دێ، دیارە هەرشتێکیش پاكوچاك نەبێ خوای کاربەجێ حەڵاڵی نەکردوە، وەك چۆن هەرچی پیسو زیانبەخش نەبێ حەرامی نەکردوە.

[216] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

# ٦-چۆنیەتی ماڵ بەخشین
## ( چەند ئەدەب و ڕەوشتێکی بەرزو جوان )

خوێنەری بەڕێز و سەنگین! خودی ماڵ و سامان بەخشین چ فەرز بێ چ سوننەت هەروەك چۆن لەقورئان و سوننەت دا زۆر جەختی لەسەر کراوەو فەرمانی پێکراوە، لەزۆر دەقانیش دا کۆمەڵێك ئەدەب و ڕەوشت بۆ چۆنیەتی و شێوازی دیاری کراون کە ئەبێ ڕەچاوکردن و پەیڕەوی لێکردنیان ماڵ و سامان بەخشینی نەك هەر ئامانجە بەرزەکانی خۆی ناپێکێ و مەبەستە شەرعیەکانی ناهێنێتە دی بگرە دەبێتە مایەی قەرزدار بوونەوەی بابای بەخشەرو زەرەرو زیانی بابای پێبەخشراویش، جا خوا یار بێ ئێمە لە (چوارده) برگەدا بەکورتی و گوشراوی چۆنیەتی و شێوازی ماڵ و سامان بەخشینی شەرعیانە ڕوون دەکەینەوە:

**یەك: هەموو چاکەو نیعمەتەکان لەخوای بەخشەر بزانێ:-**

یەکەمین و گەورەترین ئەدەب و ڕەوشتی هەرە بەرزی ماڵ و سامان بەخشین ئەوەیە کە بابای بەخشەر تەنیا خوای پەروەردگارو خاوەن لوتف و کەرەم بەسەرچاوەی سەرجەم چاکەو خێرو نیعمەتەکان بزانێ، وەك خوای بەخشندە فەرموویەتی: (وَمَا بِكُم مِّن نِّعْمَةٍ فَمِنَ اللَّهِ ثُمَّ إِذَا مَسَّكُمُ الضُّرُّ فَإِلَيْهِ تَجْأَرُونَ) النحل: ٥٣، واتە: هەرچی نیعمەتێك کە هەتانە هەمووی لەخواوەیە، ئنجا هەر گرفتاریەکیشتان تووش بێ بەس پەنا بۆ وی دەبەن.

بەڵێ هەرکاتێك ئەو ڕاستیە مەزنە لەعەقڵ و دڵی ئینسان دا جێگیربوو بۆی دەبێتە کانگاو سەرچاوەی تێکڕای ئەو ڕەوشت و ئەدەبە بەرزو جوانانەی کەپێویستە لەکاتی خێرکردن و ماڵ بەخشین دا ڕەچاو بکرێن.

**دوو: ماڵ بەخشین جێبەجێکردنی ئەرکی سەرشان و بەجێی خۆ گەیاندنی ئەمانەتێکی گرانە:**

بەڵێ خوای کاربەجێ بەمەبەستی تاقیکردنەوە (إمتحان) ئینسانی کردوە بەجێنشینی خۆی و ئاوەدان کردنەوەی سەر زەوی پێسپاردوەو هەرچی نازو نیعمەتە وەك ئەمانەتێك خستوویەتە بەر دەستی، وەك فەرموویەتی: (آمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَأَنفِقُوا مِمَّا جَعَلَكُم مُّسْتَخْلَفِينَ فِيهِ فَالَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَأَنفَقُوا لَهُمْ أَجْرٌ كَبِيرٌ) الحديد: ٧، واتە: بڕوا بەخواو پێغەمبەرەکەی بهێنن

وە لەو ماڵو سامانەدا کە ئێوەی تێدا کردۆتە جێنشین ببەخشن، چونکە ئەوانەتان کە بڕوایان هێناوەو ماڵیً خۆیان بەخشیوە پاداشتێکی گەورەیان هەیە.

پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ فەرموویەتی: (**إنَّ الدُّنيا حُلْوَةٌ خَضِرَةٌ وإنَّ الله تعالىٰ مُسْتَخْلِفُكُمْ فيها، فَيَنْظُرُ كيف تعلمون...**) رواه مسلم عن ابي سعيد الخدري.

واتە: بێگومان ژیانی دنیا شیرینو سەوزە، وە خوای بەرزیش ئێوەی تێدا کردۆتە جێنشین، جا تەماشا دەکات داخوا چۆن ڕەفتار دەکەن.

## سێ: دەبێ بەخشین بەدڵخۆشیو ڕووگەشی‌یەوە بێت:

بەڵێ مادام بابای بەخشەر ماڵو سامان بەخشینەکەی بە خواپەرستییو دینداری بزانێ پێویستە لە زاتی خۆیدا پێ دڵخۆش بێ، کە خوای بە بەزەیی هیدایەتی داوە ئەوجۆرە خواپەرستی‌یە ئەنجام بدات، وە لەگەڵ بابای وەرگریش دا ڕووگەش بێت کە خوا کردوویەتی بە هۆکاری ئەنجام دانی ئەو خواپەرستیو تاعەتە بەرزەی، خوای پەروەردگار فەرموویەتی: (قُلْ بِفَضْلِ اللَّهِ وَبِرَحْمَتِهِ فَبِذَٰلِكَ فَلْيَفْرَحُوا هُوَ خَيْرٌ مِمَّا يَجْمَعُونَ) يونس:٥٨.

واتە: بڵێ با تەنها بە بەخششی خواو بە بەزەیی وی دڵخۆش بن، ئەوە چاکترە لەوەی کەخڕی دەکەنەوە.

ئاشکراشە کە بەخششی خواو ڕەحمەتەکەی تەنیا بەهۆی فەرمانبەری بۆ کردنی‌یەوە دەستگیر دەبن، کەواتە جێی خۆیەتی بابای بەخشەر لەکاتی بەخشینو خێرکردن دا لەوپەڕی دڵخۆشیو شادی‌دا بێت کەبەکارێك هەڵساوە مایەی بەخششو بەزەیی خوای پەروەردگارە، پێشینانیشمان گوتوویانە: (نانت جۆین بێ خوڵقت گەنمین بێ).

## چوار: بەخشین لەماڵی هەڵبژاردەو خۆشەویست:

خوای کاربەجێ فەرموویەتی: (لَنْ تَنَالُوا الْبِرَّ حَتَّىٰ تُنْفِقُوا مِمَّا تُحِبُّونَ وَمَا تُنْفِقُوا مِنْ شَيْءٍ فَإِنَّ اللَّهَ بِهِ عَلِيمٌ) آل عمران: ٩٢، واتە: ناگەنە پلەو پایەی چاکەکاری هەتا لەوە نەبەخشن کە خۆشتان دەوێ وەهەر شتێك ببەخشن خوا پێی زانایە.

هەروەها فەرموویەتی: (يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَنْفِقُوا مِنْ طَيِّبَاتِ مَا كَسَبْتُمْ وَمِمَّا أَخْرَجْنَا لَكُمْ مِنَ الْأَرْضِ وَلَا تَيَمَّمُوا الْخَبِيثَ مِنْهُ تُنْفِقُونَ وَلَسْتُمْ بِآخِذِيهِ إِلَّا أَنْ تُغْمِضُوا فِيهِ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ حَمِيدٌ) البقرة: ٢٦٧، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە لەو ڕۆزی‌یە حەڵاڵەی کە وەدەست تان هێناوەو لەوەی کە لەزەوی‌دا بۆمان دەرهێناون ببەخشن، بەڵام لەجۆرە خراپەکەی مەخەفتێن، لێی دەبەخشن، بەڵام ئامادەنین وەریبگرن مەگەر بەناچاریو چاولێنووقاندنەوە بێ..

جا دیاره هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەر ﷺ ئەم ئاڕاستە (توجیە)یەی قورئانیان وەك هەموو ئاڕاستەکانی دیکە بەچاکترین شێوە جێبەجێ کردوە، ئەوەتا (بخاري و مسلم) دەگێڕنەوە کە عومەر خوا لێیڕازیبێ گوتوویەتی:

(یا رسول الله! لَمْ أُصِبْ مالاً قَطُّ هو أنْفَسُ عندي من سَهْمي الّذي هو بَخَيْبَر، فما تامرني به. قالَ: حَبِّسِ الأَصْلَ وَسَبِّلِ الثَّمَرَةَ) واتە: ئەی پێغەمبەری خوا هەرگیز سامانێکم دەست نەکەوتوە کە لەلام چاکتربووبێ لەو بەشەم کە لەخەیبەرە جا بەچی فەرمانم پێدەکەی؟ فەرمووی: ئەسڵەکەی بهێڵەوەو میوەو بەرەکەشی بکە بەخێرو لەڕێی خوادا بیبەخشە[٢١٧].

هەروەها (بخاري ومسلم) دەربارەی جێبەجێکردن (تطبیق)ی ئایەتی: (لَـنْ تـنـالوا الـبِرَّ حتى تُنْفِقوا مِمـا تُحِبُـون) بەسەرهاتێکی دیکەی لەوجۆرە لە (أبو طلحة) خوا لێیڕازی بێ دەگێڕنـەوە کـە بـاخێکی هـەبووە بـەناوی (بـەیرەحاء) و لـەهەموو مـاڵو سـامانی خـۆی خۆشتری ویستوەو دوای ڕاوێژکردن بەپێغەمبەری خوا ﷺ لەڕێی خوادا بەخشیویەتیو بەسەر خزمە نەدارەکانی خۆیدا دابەشی کردوە[٢١٨].

دیسـان (ابوبکـر الـبزّار) لـە (عبـدالله بـن عمـر) خـوا لێیـان ڕازیبـێ دەگێڕنـەوە کـە گوتوویەتی: کاتێك ئەم ئایەتەم بیست: (لَنْ تنالوا البِرَّ حتـى تُنْفِقـوا مِمـا تُحِبُـون) وە بیرم لەو شتانە کـردەوە کـە خـوا پـێی بەخشـیوم، هیـچ شـتێکم لـەلا خۆشەویسـتتر نـەبوو لـە کەنیزەکێکی ڕۆمی، بۆیە گوتم: ئەوە لەبەر خوا ئازادم کرد..[٢١٩]

## پێنج: نابێ بابای بەخشەر منەتو فیزو کەشخەی لێهەست پێبکرێ:

خوای پەنهان بین فەرموویەتی: (يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُبْطِلُوا صَدَقَاتِكُمْ بِالْمَنِّ وَالْأَذَى) البقرة: ٢٦٤، واتـە: ئـەی ئەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە خێرەکانتـان بەمنـەت لەسـەرکردنو ئازاردانی دڵی بابای پێبەخشراو هەڵمەوەشێننەوە..

کەواتە: بەدەقی فەرمایشتی خوا (جل جلاله) منەت لەسەرکردنو دڵ ئازاردانی بابای خێر پێکراو دەبێتە مایەی هەڵوەشاندنەوەو شۆردنەوەی خێرو چاکەکەی.

لەخاڵی حەوتەم (سەرەنجامی ماڵ بەخشینی ڕیاکارانە) دا چاکتر ئەم مەسەلەیە ڕوون دەکەینەوە.



[٢١٧] بڕوانە: (تفسير القاسمي: المسمّى (محاسن التأويل)) ج٢ص١٤٥، ١٤٦.
[٢١٨] هەمان سەرچاوەی پێشوو.
[٢١٩] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

## شـەش: قسـەی خـۆش‌و ڕەوشـتی جـوان‌و ڕووی گـەش لـەخێرکردنی ئازاردەرانە زۆر باشترە:

**خوای بەخشندە فەرموویەتی:** (قَوْلٌ مَعْرُوفٌ وَمَغْفِرَةٌ خَيْرٌ مِنْ صَدَقَـةٍ يَتْبَعُـهَا أَذًى وَاللَّـهُ غَنِـيٌّ حَلِيمٌ) البقرة: ٢٦٣، واتە: قسەیەکی باش‌و خۆش‌و لێبوردنێك لەقسەو ڕەفتارێکی بێ‌جێی بابای داواکەر چاکترە لەخێرپێکردنێك کـەئازاردانی بـەدوادا بێـت، وە خـواش بێ‌نیـازو هێدی‌و مەندە.

بەڵێ ئینسان تەنها جەستە نیە تاکو بەس پێویستی بە ماددەو نان بێ، بەڵکو بەرلـەوە ڕووح‌و عەقڵ‌و هەست‌و نەستەو پێویستی بە ڕێزو حورمەت‌و کەسایەتی و نەڕووشاندنی هەستی هەیە، بێگومان ئەو کەسەش کە ڕێزو حورمەتی کەسایەتی خۆی لە بەرانبەر نان‌و ئـاوێك دا دادەنـێ زیـانێکی زۆری کـردوە، بۆیـە خـوای کاربـەجێ‌و وردبـین‌و دووربـین پارێزگاری‌کردن لە ڕێزو حورمـەتی نەداران بە لەپێشتر دادەنێ لە تێرکردنی گـەدەیان‌و داپۆشینی جەستەیان‌و بە دەوڵەمەندەکان دەفەرموێ: ئەگەر بەخشینەکەتان دەبێتە مایەی ئازاردان‌و هەست ڕووشاندنی نەداران هەر لێیـان بگـەڕێن‌و مـەیان دەنـێ‌و بەقسـەی بـاش‌و ڕووی گەش ڕێزو حورمەتیان بگرن‌و هەست‌و نەستیان بپارێزن بۆ ئێوەش‌و بۆ ئـەوانیش چاکترە، چونکە بەپێچەوانەوە هەردووکتان لەسەری قەرزدار دەبنەوە.

## حـەوت: بـاس کردنـی پـاش ملـەش هەرجۆرێکـە لـەئازاردان‌و منـەت لەسەرکردن‌و بەچاودا دانەوە:

هەندێك کەس هەیە کە بەرواڵەت خێرو چاکەیەك دەکات، بەڵام دوایی ئەوەندە لەملاولا بەڕاشکاوی (صراحة)، یان بەکینایەیەکی چاکتر لەڕاشکاوی باسی دەکات کە بۆ بابای خـێر پـێ‌کراو چـەند قـات خراپتربـێ لـەوەی هـەر بـەرەو ڕوو شـکاندبایەوەو بـەچاوی دادابایەوە! جا پێویستە بزانرێ کەچەمك‌و واتـای (يَتْبَعُهَا أَذًى) وە (لاتبطلوا صدقاتكم بالمن والأذى) زۆر فراوانـەو هـەموو جۆرەکانی ئازاردان‌و بـەچاو دادانـەوەو منـەت کـردن دەگرنەوە چ بەرەو ڕووبن چ پاش ملە، خوای تۆڵەستێنیش فەرموویەتی:

(وَيْـلٌ لِكُـلِّ هُمَـزَةٍ لُمَـزَةٍ) الهمزة: ١، واتـە: سـزای سـەخت بـۆ هـەر پـاش ملـە بەخراپـە باسکەرێکی بەرەوڕوو تانەدەر.

## هەشت: ئاشكراكردنو پەنهانكردنی ماڵ بەخشین بەپێی هەلومەرج حوكمەكەیان دەگۆڕێ:

خوای كاربەجێ فەرموویەتی: (إِنْ تُبْدُوا الصَّدَقَاتِ فَنِعِمَّا هِيَ وَإِنْ تُخْفُوهَا وَتُؤْتُوهَا الْفُقَرَاءَ فَهُوَ خَيْرٌ لَكُمْ وَيُكَفِّرُ عَنْكُمْ مِنْ سَيِّئَاتِكُمْ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ) البقرة: ٢٧١، واتە: ئەگەر خێركردنەكانتان ئاشكرا بكەن ئەوە شتێكی زۆرباشە، وە ئەگەر پەنهانی بكەنو بیدەن بەهەژاران ئەوە بەوجۆرە بۆتان باشترە، وە لەخراپەكانیشتان لێتان دەسڕێتەوە وە خوا بەوەی دەیكەن شارەزایە.

جا دیارە پێشتریش لەباسی زەكات دا باسمان كرد كە مەسەلەی ئاشكراكردنو پەنهان كردنی ماڵ بەخشینو هەڵبژاردنی لایەكیان شتێكی موتڵەق نیە، بەڵكو هەرجارە لایەكیان چاكترەو دەبێ هەڵببژێررێن وە هەركام لە ماڵ بەخشینی فەرزو سوننەتیش لەم مەسەلەیەدا یەك حوكمیان هەیەو، بابای بەخشەر دەبێ سەرنج بدات چۆن چۆنی بەرژەوەندی بابای وەرگر دابین دەبێو لەزیانو ئازار بەدوور دەبێ، دەبێ وا بكات، هەڵبەتە هاوكات لەگەڵ ئەوەش پێویستە وریای خۆیشی بێت كە لەڕوو پاماییو هەر خەسڵەتێكی دیكەی پیسو بەد پارێزراوو سەلامەت بێ.

## نۆ: حیكمەتو سەلیقەو لێزانی لەبەخشین دا زۆر پێویستە:

ئاشكرایە كە هەر كارێك لەسەر بناغەی حیكمەتو لێزانی ئەنجام نەدرێ بێ سەروبەر دەردەچێو هیچی باشی لێ سەوز نابێ، هەر بۆیەش خوای كاربەجێ لە ریزی ئەو ئایەتانەدا كەباسی ماڵو سامان بەخشین دەكەن باسی حیكمەتی كردووەو فەرموویەتی: (يُؤْتِي الْحِكْمَةَ مَنْ يَشَاءُ وَمَنْ يُؤْتَ الْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِيَ خَيْرًا كَثِيرًا وَمَا يَذَّكَّرُ إِلا أُولُوا الأَلْبَابِ) البقرة: ٢٦٩، واتە: خوا بەهەر كەسێك كە حەز بكات لێزانی پێ دەبەخشێ، وە بێگومان هەر كەسێك حیكمەتی پێدرابێ ئەوە چاكەیەكی زۆری پێدراوە، وەخاوەن عەقڵانیش نەبێ پەند وەرناگرن.

جا دیارە حیكمەتو سەلیقە لە بەخشین دا زۆر شت دەگرێتەوە، بەڵام دەرفەتی زۆر درێژەپێدانمان نیەو تەنیا وێنەیەك دێنینەوە:

هیچ گومانێك لەوەدا نیە كە دروست كردنی ماڵی خوا (مزگەوت) كارێكی یەكجار خێرەو چاكەیەكی بەرزو مەزنە، بەڵام ئایا دروست كردنی چەندان مزگەوتی وا كە ڕەنگە مسوڵمانان یەكیان لەسەریان نەكەوتبێ لەوڵاتێك دا كە حوكمی ئیسلامی تێدا قاچاخ

کراوەو لەنێو گەلێك دا کە ڕەنگە دەیانو سەدان فەڕزی کیفایەیان فەوتاندبێ لەبەر بێ ئیمکانیەتیو دەست نەڕۆیشتوویی لەهەموو ڕووەکانی فیکریو پەروەردەییو سیاسیو ئابووریو کۆمەڵایەتیو جەنگیو تەکنۆلۆجیو.. هتدەوە! ئایا مەرجە چاکترین جۆریماڵو سامان بەخشین بێ وەك زۆربەی هەرەزۆری ئەگەر نەڵێم هەموو ئەوانەی مزگەوتان دروست دەکەن گومان دەبەن؟!

ئایا لە کاتێك دا مسوڵمانانی وڵاتێك لە ئەنجامی گەڕانەوەیان دا بۆ ئیسلام لەهەموو بوارەکانی ژیان دا کیانو قەوارەیەکی شەرعی پێك دێنن، مزگەوت دروست کردنو گەلێك کارو چالاکی دیکەی لەو بابەتە نابێتە کارێکی زۆر ئاسانو یەکێك لەئەرکەکانی سەرشانی ئەو قەوارە شەرعیە؟!

وە لەلایەکی دیکەشەوە ئایا لەحاڵێك دا مسوڵمان خاوەنی بوونو قەوارەی شەرعی خۆیان نەبن ئەو تاغووتانەی کە خۆیان بەکوێخاو هەمەکارەی خەڵكو میللەت دەزانن ڕێگا بەمزگەوتو ئەهلی مزگەوت دەدەن کە ڕۆڵی شەرعیانەو ڕەوای خۆیان بگێڕن؟!

بەکورتی: پێویستە مسوڵمانان لێزانو وەستابن لەخەرج کردنو بەخشینی ماڵو سامانەکانیان داو لەهەر قۆناغو هەلومەرجێك دا چاك سەرنج بدەنو ڕامێنن داخوا چ شتێك لەپێشترەو ئەمیەتو بایەخو کاریگەری زیاتری هەیە بۆ بەرەوپێش بردنی کاری ئیسلامیو چاك کردنی حاڵو باڵیان، لەوەدا ماڵو سامانەکانیان بەخت بکەن، نەك بەپاڵنەری چاولێکەری بکەونە پێش بڕکەی مزگەوت دروست کردن.

## دە: چاو وردکردنەوە بۆ دۆزینەوەی شەخسی ئاتاج ترو شایستەتر:

پێغەمبەری کارزان ﷺ لەوبارەوە فەرموویەتی: (لَيْسَ المسكينُ الَّذي يَطُوفُ على الناس تَرُدُّهُ اللقمَةَ واللّقمتان والتَّمْرَةُ والتَّمْرَتانِ، ولكن المسكين الذي لايَجِدُ غِنيً يُغْنِيه، ولايُفْطَنُ لَهُ فَيُتَصَدَّقُ عَلَيهِ، ولايَقومُ فَيَسألُ الناسُ) متفق عليه عن أبي هريرة رضي الله عنه.

واتە: نەدار ئەو کەسە نیە کە بۆ سواڵ بەسەر خەڵکەوە دەگەڕێو بەپاروویەكو دوو پاروو، وە بەخورمایەكو دوو خورما قەناعەت دەکات، بەڵکو نەداری شایستەی خێرپێکران ئەو کەسەیە کە خۆی هێندەی نیە مەداری ساز بکات، وە لەسۆنگەی عیززەتو ئەدەبیشەوە هەستی پێناکرێ تاکو خێری پێبکرێ، خۆیشی هەڵناستێ داوا لەخەڵکی بکات.

بەڵێ ڕووحم فیدای پێغەمبەری خواو فەرمایشتە بەرزو پیرۆزەکانی بێت هەر ئەو بەڕێزە ڕەندو ئاکار پەسەندو کارزانو لێزانە دەزانێ کە ماڵو سامان چۆن چۆنیو لەکوێو بەکێ ببەخشرێ چاکتر جێگا دەگرێو خوای لێبوردەش وەری دەگرێت!

## یازده: جێ پێ گرتن (کەلێن پێ پڕکردنەوە نەك خەڵك زۆر پێ گرتنەوە):

یەکێ دیکە لەو ئەدەبو ڕەوشتە بەرزو گرنگانەی کە پێویستە لەشێوازو چۆنیەتی ماڵو سامان بەخشین دا ڕەچاوبکرێ ئەوەیە کە هەرچی زیاتر و چاکتر هەوڵ بدرێ ئەو خێرو ماڵ بەخشینە جێگای شایستەی خۆی بگرێو بۆ بابای وەرگر کەلێن بگرێ، بۆ ڕوونکردنەوەی مەبەست دەڵێم:

هەندێك کەس چ لە ڕووی خراپ لەشەرع حاڵیبوون یان لە ڕووی ڕیاییکردنو خۆ دەرخستنەوە، دێنێ ئەو ئەندازە پارەو ماڵەی دەیەوێ بیبەخشێ بەسەر چەندان کەسو شوێن دا پرژو بڵاوی دەکاتەوەو، بەپڕووچکە پڕووچکە دەیدات بەم و بەو، هەتا سەرەنجام هیچ کام لەو خێر پێ کراوو پارەو ماڵ وەرگرانە سوودێکی وای لێ وەرناگرنو هەر بایی ئیشتیاکردنەوەو ئاو لەدەم هێنانیان دەکات!!

دیارە دواتر لەباسی چۆنیەتی زەکات دان باسی دەکەین کە پێویستە چەندە بدرێ بەو کەسانە کە شایستەی وەرگرتنی زەکاتنو لێرەدا دووبارەی ناکەینەوە.

## دوازدە: چاوەڕوانی نەکردنی هیچ کرێو پاداشتێك:

خوای پەروەردگار لەمەدحی کەسانێك دا کە لەپێناوی ڕەزامەندی خوادا ماڵو سامانیان دەبەخشن فەرموویەتی: (ويطعمـون الطعـام علـى حبّـه مسكيناً ويتيماً وأسيراً، انما نُطعمكُـم لِوَجـهِ الله لانريـدُ منكـم جـزاءً ولا شـكوراً) الدهر: ٨-٩، واتە: وە ئەو خواردنەی کە خۆشیان دەوێ دەیدەن بەنەدارو هەتیوو دیل. دەڵێن بەس لەبەر ڕەزامەندی خوا دەرخواردتان دەدەینو هیچ پاداشتو سوپاسێکمان لێتان ناوێ؟

بەڵێ نابێ بابای بەخشەر هیچ جۆرە چاوەڕوانییەکی لە بەرانبەر ماڵ بەخشینەکەیدا هەبێ چونکە ماڵ بەخشین وەك لە ڕابردوودا گوتمان خواپەرستیو طاعەتەو ئەمیش دروست نیە بێجگە لە پاداشتو ڕەزامەندی خوا هیچ شتێکی دیکەی تێدا ڕەچاو بکرێ.

هەربۆیەش زانایانمان گوتوویانە: وا باشە ئەگەر بابای پێ بەخشراو دووعای خێری بۆ کرد بەخشەریش دووعای خێری وەك خۆی بۆ بکاتەوە، بۆئەوەی هیچ لە پاداشتی خێرەکەی کەم نەبێتەوە[٢٢٠].

---

[٢٢٠] بڕوانە: (مغني المحتاج شرح المنهاج) ج٣ص١٢٣، وە بڕوانە: (الفقه الأسلامي وادلته) د. وهبة الزحيلي، ج٣ص٢٠٦٠.

## سـێزده: بـۆ وەرگریـش وا چاکـە مەگـەر زۆر ناچاربـێ ئەگـەرنا داوا نەکاتو خۆی بەڕووت و ڕەجاڵ پیشان نەدات:

چونکە خوای زاناو توانا مەدحی ئەو جۆرە کەسانەی کردوە کە وێڕای ئاتاجیو نەداریشیان عیززەتیان ڕێی نەداون خۆیان بێماڵو شپرزە حاڵ پیشان بدەن، بەڵکو مەگەر کەسێك لە نزیکەوە پێیان ئاشنابێ ئەگەرنا بەپێچەوانەوە لێیان حاڵی دەبێ، وەك فەرموویەتی: (لِلفُقَرَاءِ الَّذِينَ أحْصِرُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ لَا يَسْتَطِيعُونَ ضَرْبًا فِي الْأَرْضِ يَحْسَبُهُمُ الْجَاهِلُ أغْنِيَاءَ مِنَ التَّعَفُّفِ تَعْرِفُهُمْ بِسِيمَاهُمْ لَا يَسْأَلُونَ النَّاسَ إلْحَافًا وَمَا تُنفِقُوا مِنْ خَيْرٍ فَإِنَّ اللَّهَ بِهِ عَلِيمٌ) البقرە: ٢٧٣.

واتە: ماڵو سامانەکانتان با بۆ ئەو هەژارانە بێ کە لەسۆنگەی جەنگو جیهادکردنەوە لەڕێی خوادا ڕێی دەرچوونیان نیەو بۆیان نالوێ بە زەوی‌دا بگەڕێن بۆ پەیداکردنی ڕۆزی، بابای نەشارەزا بە دەوڵەمەندیان تێدەگات بەهۆی نەفس بەرزی‌یانەوە، بەلاّم تۆ بەسەرو سیمایان دەیانناسی، عادەتیان وایە بەمکووڕی داوا لەخەڵکی ناکەن، وە بێگومان هەرشتێك ببەخشن خوا پێی زانایە.

هەڵبەتە بێ تەماعیو نەفس بەرزی (عفة)یش بۆ بابای هەژارو نەدار هێندەی خاکی بوونو خۆ بەکەمگرتن (تواضع) بۆ بابای دەوڵەمەندو هەبوو جوانو شیرینەو، هەموو خێرو بێرو نازو نیعمەتێك لەخوا زانینیش لەدڵو دەروونی هەرکام لەنەدارو هەبوودا ئەوجۆرە هەڵوێستو ڕەفتارە شەرعیو پەسەندانە پەیدا دەکات، وەك پێشتریش گوتمان.

## چواردە: پێویستە بابای وەرگر پێزانو بەئەمەگ بێت:

بێگومان هەموو سوپاسو ستایشێك هەر شایستەی خوای پەروەردگارەو پێویستە ئینسان هەموو چاکەو نیعمەتێكو خێرو بێرو خۆشی‌یەك بەس لە خوا بزانێو دڵنیابێ کە بەبێ ویستو دەستەلاّتی خوا هیچ خێرو شەڕێك ڕوو لە ئینسان ناکات، جا هەرچی شەڕو زیانو خراپەیە هۆکارەکەی خودی ئینسانە، بەلاّم خێرو چاکەو بەرژەوەندی بەس لەخواوەیە، وەك فەرموویەتی: (مَا أَصَابَكَ مِنْ حَسَنَةٍ فَمِنَ اللَّهِ وَمَا أصَابَكَ مِنْ سَيِّئَةٍ فَمِنْ نَفْسِكَ وَأرْسَلْنَاكَ لِلنَّاسِ رَسُولًا وَكَفَى بِاللَّهِ شَهِيدًا) النساء: ٧٩،

بەلاّم وێڕای ئەوەش ئەمەگو وەفاو پێزانینی ئینسانەکان بەرانبەر بە یەکتر ڕەوشتو ئەدەبێکی بەرزو پەسندە بەتایبەت بۆ بابای چاکە لەگەڵ کراو لە بەرانبەر چاکە کاردا، پێغەمبەریش ﷺ لەوبارەوە فەرموویەتی: (لایَشْكُرُ اللهَ مَنْ لایشكُرُ الناسَ) رواه احمد عن الاشعث بن قیس بسند رواته ثقات.

واتە: هەر کەسێك سوپاسی خەڵکی نەکات سوپاسی خواش ناکات.

## ٧- سەرەنجامی ماڵ بەخشینی ڕیاکارانە

خوێنەری مسوڵمانی خۆشەویست ! وەك پێشتریش باسمان كرد ماڵو سامان لە ڕێی خوادا خەرج كردنو بەخشین جۆرێكە لە جۆرەكانی خواپەرستی (عبادة) و، مەرجی سەرەكیو بنەڕەتی هەرجۆرە خواپەرستی‌یەكیش بۆ ئەوەی لەلای خوا جێی ئیعتیبار بێو وەربگیرێ، دووانن:

ا- بەپێی شەرعی خوابوون (الأُتباع).

ب-تەنیا خوا پێ مەبەست بوون (الأخلاص).

جا لەسۆنگەی ئەوەوە كە سروشتی ماڵو سامان بەخشین وایە كە ئەگەر خاوەنەكەی مسوڵمانی تێرو تەواو و ئیمان دامەزراوو هۆشیارو بێدار نەبێ، زۆر نزیكە تێیدا تووشی ڕووپامایی كردنو خۆپێ دەرخستنی ببێ، بەپێویستم زانی لەم خاڵی حەوتەمەدا سێ ئایەت لەسوورەتی (البقرة) بەكورتی بتوێژمەوە كە خوای زاناو وردبینو پەنهان بین بە هێنانەوەی چەند وێنەیەكی یەكجار سەرنج ڕاكێشو ڕاچڵەكێنەر سەرەنجامو ئاكامی هەركام لە ڕیاكاریو ئیخلاص لەبواری ماڵو سامان بەخشین دا ڕوون دەكاتەوە:

(يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُبْطِلُوا صَدَقَاتِكُمْ بِالْمَنِّ وَالْأَذَى كَالَّذِي يُنفِقُ مَالَهُ رِئَاءَ النَّاسِ وَلَا يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَمَثَلُهُ كَمَثَلِ صَفْوَانٍ عَلَيْهِ تُرَابٌ فَأَصَابَهُ وَابِلٌ فَتَرَكَهُ صَلْدًا لَا يَقْدِرُونَ عَلَى شَيْءٍ مِمَّا كَسَبُوا وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْكَافِرِينَ، وَمَثَلُ الَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَالَهُمُ ابْتِغَاءَ مَرْضَاةِ اللَّهِ وَتَثْبِيتًا مِنْ أَنفُسِهِمْ كَمَثَلِ جَنَّةٍ بِرَبْوَةٍ أَصَابَهَا وَابِلٌ فَآتَتْ أُكُلَهَا ضِعْفَيْنِ فَإِنْ لَمْ يُصِبْهَا وَابِلٌ فَطَلٌّ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ، أَيَوَدُّ أَحَدُكُمْ أَنْ تَكُونَ لَهُ جَنَّةٌ مِنْ نَخِيلٍ وَأَعْنَابٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ لَهُ فِيهَا مِنْ كُلِّ الثَّمَرَاتِ وَأَصَابَهُ الْكِبَرُ وَلَهُ ذُرِّيَّةٌ ضُعَفَاءُ فَأَصَابَهَا إِعْصَارٌ فِيهِ نَارٌ فَاحْتَرَقَتْ كَذَلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمُ الْآيَاتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ) البقرة: ٢٦٤- ٢٦٦،

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! ماڵ بەخشینەكانتان بەهۆی منەت كردنو ئازاردانی دڵی خێر پێكراوەوە هەڵمەوەشێننەوە، وەك كەسێك كە ماڵی خۆی بۆ ڕووپامایی خەڵكی خەرج دەكاتو بڕوای بەخواو ڕۆژی دوایی نیە، چونكە وێنەی ئەو كەسە وەك تاشەبەردێكی لووس وایە كە تەنكە گڵێكی بەسەرەوەیەو تۆوێكی تێدا چێنراوە جا بارانێكی دڵۆپە زلی بەخورزەم لێی بداتو بەڕەقو سافی بمێنێتەوە، وە ئەوانەی تۆویان لەسەری چاندوە ناتوانن هیچ بەرهەمێكی لێوەدەست بێنن، وە خواش ڕێنوێنی كۆمەڵی كافران ناكات.

وه وێنەی ئەوانەش کە ماڵو سامانەکانیان بۆ وەدەست هێنانی ڕەزامەندی خواو بەهۆی دڵدامەزراوی یانەوە دەبەخشن، وەك ئەوە وایە کەباغێك لەسەر بەرزاییەك بێ و بارانێکی درشتو بەخوڕزەمی لێ ببارێ، جا بەرو میوەکەی دوو چەندان بێتەوە، وە ئەگەر بارانی بەخوڕزەمیش نەیگرێتەوە، هەر ڕشێنەیەکی بەس بێ وە خوا بەوەی کە دەیکەن بینایە.

ئایا یەکێکتان حەز دەکات کە باغێکی لە خورماو ترێی هەبێ، کە جۆگەلە ئاوەکانی بەژێردا برۆن، وە لە هەموو جۆرە میوەیەکی تێیدا هەبێ، وە لەحاڵێك دا کە تووشی پیری بووەو وەچەیەکی ساواو لاوازی هەیە، گێژەڵووکەیەك کە ئاگری تێدایە لێی بداتو بسووتێ؟! ئاوا خوا ئایەتەکانیتان بۆ ڕوون دەکاتەوە بەڵکو بیربکەنەوە.

جا ئێستا با سەرنجی هەرکام لەم سێ وێنەیە بدەین کە خوای پەروەردگار بەمەبەستی حاڵی کردنمان لەسەرەنجامو ئاکامی ماڵو سامان بەخشینی ڕیاکارانەو ساختەچی یانەو شەرعی یانەو دڵسۆزانە بۆی هێناوینەوە:

## وێنەی یەکەم:

تاتە بەردێکی لووسو ساف کە توێژاڵە گڵێکی بەسەرەوە هەیە تۆوێکی تێدا چێنراوەو خاوەنی چاوەڕێیە بڕوێو بۆی بێتەبەرو بەرهەمی لێ هەڵبگرێ، بەڵام هەر هێندەی خۆشە هەتا بارانێکی درشتی بە خوڕزەو لێزمەی لێدەبارێو هێندەی دەڵێی یەك و دوو، دەبینی تاشە بەردی گۆڕین داشۆراوەو جگە لەبەردێکی ڕەقو تەقو لووس نەك تۆو دانەوێڵە بگرە تۆزە خۆڵێکیشی بەسەرەوە نەماوە!!

دەجا ئەو کەسەش کە بەپاڵنەری ڕیابازیو سەرنج ڕاکێشانی خەڵکی یەوە ماڵی خۆی خەرج دەکاتو بڕوای بەخواو بەرۆژی قیامەت نیە، وە سەربارەش منەتو فیزو کەشخە بەسەر بابای خێرپێکراودا دەکاتو بەقسەو ڕەفتاری ناشایستەو دڵی ئازار دەدات، ئەو بێئیمانیو ڕیابازی یەی و ئەو منەتو ئازاردانەی هەموو خێرو چاکەکانی دادەشۆرنو ئەو دەمامکە ساختەچی یانەی سەر ڕووی لادەچێو ماهیەتی ڕاستەقینەی دەردەکەوێو دیکۆرو ڕواڵەتە تەنكو کاتی یەکەی نامێنێو دەمێنێتەوە دڵو دەروونە بێئیمانو ویژدانو ڕەقو تەقە بێ خێرەکەیو ئاوێ بێنەو دەستان بشۆ!

## وێنەی دووەم:

باغێکی گەشوجوانو بەخوڕڕەم کە لەشوێنێکی بڵندو گەشو هەوایەکی سازگارو خۆش دا هەڵخراوە چ بارانی درشتو بەخوڕزەمی لێ ببارێ، چ هەر ڕشێنەو تەنانەت ئەگەر شەونمیش بیگرێتەوە بەشی دەکاتو دوو چەندانەی ئەوەی لێ چاوەڕوان دەکرێ بەرو میوەی باش دەگرێو مایەی خۆشحاڵیو چاو پێ ڕوون بوونەوەی خاوەنەکەیەتی.

دەجا کەسێکیش کە بە پاڵنەری خوا لەخۆڕازیکردنو لەڕووی ئیمانو عەقیدەی پتەوو لەدڵ دا دامەزراوەوە لەماڵو سامانی خۆی دەبەخشێو هەموو سنوورەکانی شەرعو ئەدەبو ڕەوشتە بەرزو جوانەکانیشی تێدا ڕەچاو دەکات، هەم لە دنیاو هەم لە دواڕۆژیش دا بەو بەخشینو خێرو چاکەیەی خۆی وەك بابای خاوەن باغ دڵخۆش دەبێو لەبەری ڕەنجی خۆی بەهرەمەندو پێی بەختەوەر دەبێ.

## وێنەی سێیەم:

کابرایەك کە گەیشتۆتە قۆناغی پیریو تەمەنی هەڵکشیوەو چۆتە ساڵەوە پێستی تەنكو ئێسکی باریكو جەستەی بێهێزبووەو دەستی لەخۆی شۆردوەو لەوە بێهیوا بووە کەتینو تاقەتو هێزو وزەی جارانی بۆ بگەڕێتەوە، دەزانێ هێدی هێدی بەرەو چاڵی مەرگ هەنگاو دەنێ، وە کۆشێك ماڵو خێزانی وردو ساواو پێڕۆچکەو سەلکەو پێچکەی هەیە کە پاش ئومێدی بەڕەحمەتی خوا، بۆ دابین کردنی ژیانو گوزەرانیان هیوای بەو باغەیەتی کە ساڵەهای ساڵە ڕەنجی تێدا کێشاوەو تەمەنی لاوێتیو تینو تاوی گەنجێتی خۆی تێدا بەکارهێناوەو سەرف کردوە، بەڵام بابای پیری کەنەفتو خاوەن کۆشێك ماڵو منداڵی وردو بێ پەڕو باڵ، هەر هێندە دەزانێ کە گەردەلوولێکی ئاگراوی لەباغەکەی دەداتو هیچی بەسەر هیچەوە ناهێڵێو دەیکاتە قەرە برووت!!

دەجا کەسێکیش کە ماڵو سامانی خۆی بەڕواڵەت بۆ خواو لەپێناوی وەدەست هێنانی بەهەشتی نەبڕاوەو پاداشتو ڕەزامەندی خوادا بەخشیوە، بەڵام لەڕاستیدا وانەبووە مەبەستی ڕووپامایی‌کردنو خۆپیاو باش کردنو خەڵك هەڵخەڵەتاندن بووە، هەر بۆیەش نەیتوانیوە ئەدەبو ڕەوشتە بەرزو جوانە شەرعی‌یەکان لەماڵو سامان خەرج کردنەکەیدا پەیڕەو بکات، بەڵکو گیرۆدەی چەندان خەسڵەتی بەدو پیسو ڕەفتاری نالەبار بووەو خۆی لەسەر ماڵ بەخشینەکەی قەرزداریش کردۆتەوە، بەڵێ ئەو کەسەش لەقیامەت دا وەك بابای تەما بەژیان نەماوی باغو باغات سووتاوی ماڵو خێزان بەجێماو، دەستی لەهەموو پچکان دەبڕێو دەروونی لەپەشێمانی‌یان دەگرێو فرمێسکی گریانو حەپەسانو دەستەوەستان دەسڕێ.

هەڵبەتە هەرکام لەو سێ وێنەیە زۆر زیاتر لەوەی کەنووسیمان توێژینەوەو بەرلەوەش ڕامانو وردبوونەوەو بیرکردنەوە هەڵدەگرن، بەتایبەتیش کە خوای پەروەردگار لە کۆتایی

هەرسێك وێنەكان دا فەرموویەتی: (كذلك يبين الله لكم الآيات لعلكم تتفكـرون) وە لەشوێنی دیكەش دا فەرموویەتی كە هەموو كەس توانای تێگەیشتن و پەند وەرگرتنی لەو وێنە هێنانەوانەی خوای زانا نیەو، تەنیا زاناو دانایانن كەشایستەیی ئەوەیان هەبێ، (وَتِلْكَ الْأَمْثَالُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ وَمَا يَعْقِلُهَا إِلَّا الْعَالِمُونَ) العنكبوت: ٤٣، بەلاَم لێرەدا هەر ئەوەندەمان دەرفەت هەیە.

لەكۆتایی ئەم باسەش دا دەڵێم:

بێگومان پاش بەپێی شەرع بوون، هەوێن و هەناوی هەر خواپەرستی یەك و كاكڵ و جەوهەری هەر كردەوەیەكی باش چ ماڵ بەخشین بێ چ هەر كارو چالاكی یەكی دیكەی شەرعی بریتیە لەخوا پێمەبەست بوون (الأخلاص لله)!

بەڵێ خوێنەری خۆشەویست!

ماڵ و سامان بەخشین بەبێ نیازو مەبەست ساغ و یەكلابوونەوەی خاوەنەكەی بۆ خوای پەروەردگارو بژاركردن و پاككردنەوەی دڵ و دەروونی لەهەر جۆرە نیازو مەبەست و هاندەرو پاڵنەرێكی دیكە، وەك شیری بێ هەوێن و جەستەی بێ هەناوو دەنك و تۆوی بێ كاكڵ و نێوەڕۆكە! شاعیرێكی فارسی زمانیش لەوبارەوە جوانی گوتوە:

عبادتْ به إخلاصِ نيتّ نيكوستْ    و گرنه چ آيدْ زبي مغز پوست؟
اگر جُزْ بهٔ حَقّ ميرود جاده ات    درآتش مشانَنْد سجاده ات!

واتە: خواپەرستی بەنیازو مەبەستی ساغەوە زۆرباشە، ئەگەرنا توێكڵی بێ كاكڵ چی لێ پەیدا دەبێ؟

ئەگەر ڕێگات بەرەو لای غەیری خوا بچێ، ئەوە بەرماڵەكەت لێ فڕێ دەدەنە ئاگری بەتینی دۆزەخەوە!

سا خوایە بەلوتف و كەرەمی خۆت دەرو دەروونمان پاك و ساغ بكەیەوە، دەر (ظاهر) مان لەناشەرعی و سەرپێچی و دەروون (باطن) یشمان لەنەخۆشی و ڕیابازی.

# بەندی دووەم

## چەند تێبینی‌یەکی گرنگ دەربارەی زەکات دان

١-زەکات دان و وەرگرتنی و دابەش کردنی.

٢-زەکات و کۆسپ و گیروگرفتەکانی

٣-زەکاتی ئاژەڵ و بەروبوومی کشتوکاڵ و میوەجات.

٤-چەند جۆرە زەکاتێك.

خوێنەری بەڕێزو خۆشەویست!

بابەت (موضـوع) ی زەكـات بابـەتێكی یـەكجار بـەرفراوان و بـەلق و پۆپـەو لەكتێبـە فیقهی‌یـەكان دا وردەكـاری زۆری دەربـارە كـراوەو بێگومـان وا بەئاسـانی هـەقی خـۆی پێنادرێ و هەموو شتێكی لەبارەوە باس ناكرێ، بەڵام بەپێویستم زانی كە لەم بەندەش دا چەند تێبینی‌یەكی گرنگ بۆ زیاتر تیشك خستنەسەر ئەو بابەتە گرنگ و ئەو سێ‌یەمین پایـەی ئیسـلامەتی‌یە، بخەمـەڕوو چونكـە: (ئـەوەی فریـای هەموویشـی نەكـەوی نابـێ هەندێكیشـی فـەرامۆش بكـەی) دیـارە بـەهۆی ئامـاژەكردنیشـەوە بـۆ سـەرچاوەكان لەپـەراوێزەكان دا ڕێی گەڕانـەوە بـۆ ئـەو سـەرچاوانەو چاكـتر تێگەیشـتن و بـەرچاوڕوون بوونەوەش سێناتر دەبێ؛ وەك پێشتریش گوتمان.

وەسەرجەم ئەو تێبینی‌یانەش لەژێر چوار سەرباس دا دەنووسین:

# یەكەم: زەكات دان و وەرگرتنی و دابەش كردنی

## ١-زەكـات دان وەك هـەر خواپەرسـتی‌یەكی دیكـە نیـاز (نیـة) ی تێدا بەمەرج گیراوە:

خوای پەروەردگار لەوبارەوە فەرموویەتی: (وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ حُنَفَاءَ وَيُقِيمُوا الصَّلَاةَ وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ وَذَٰلِكَ دِينُ الْقَيِّمَةِ) البينة،٥، واتـە: وە تـەنیا بـەوە فـەرمانیان پێكرابوو كە خوابپەرستن و گەردن كەچی خۆیانی بۆ ساغ بكەنەوەو واز لەهەموو شتێكی دیكە بهێنن، وە نوێژێ بەرپابكەن و زەكاتێ بدەن و هەر ئەوەشە دینداری ڕاستەقینە.

پێغەمبەری خواش ﷺ فەرموویەتی: (انما الأعمال بالنيات وانما لكلّ أمري ما نوى) متفق عليه

جا هەرچی (مالك وشافعي)ین دەڵێن دەبێ لەكاتی زەكات دانەكەدا ئەو نیازەی ئامادە بێت، بەڵام (ابوحنيفة) دەڵـێ ئەگەر لـەكاتی جیاكردنەوەشـیدابێ هـەر دەبێ، (احمد)یـش دەڵێ ئەگەر ماوەیەكی كەم بەر لەدانی بێت دروستە، بەڵام نابێ ماوەیەكی زۆربێ[٢٢١].

---

[٢٢١] بڕوانە: (فقه السنة) ج١ص٤٧٠.

## ٢- دەرختسنو دەرنەخستنی زەکات لەکاتی بەخشینیدا:

بابای زەکات دەر بۆی هەیە بە ئاشکرا یان بە پەنهانی زەکاتەکەی بدات، جا جاری وا هەیە ئاشکراکردنی باشترە ئەگەر ببێتە مایەی ڕەواندنەوەی تەمی گومانو تۆمەت، یان ببێتە مایەی چاولێکرانو کرانە سەرمەشق (اسوة) بۆ خەڵکی دیکە[222]، جاری واش هەیە لەبەر دڵڕاگرتنی بابای زەکاتدەر، یان لەبەر تووش بوونی ڕووپامایی‌کردن، پەنهان کردنی چاکترە، وەك خوای کاربەجێ فەرموویەتی: ﴿إِنْ تُبْدُوا الصَّدَقَاتِ فَنِعِمَّا هِيَ وَإِنْ تُخْفُوهَا وَتُؤْتُوهَا الْفُقَرَاءَ فَهُوَ خَيْرٌ لَكُمْ وَيُكَفِّرُ عَنْكُمْ مِنْ سَيِّئَاتِكُمْ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ﴾ البقرة: ٢٧١، واتە: ئەگەر زەکاتەکان - یان خێرکردنەکان - تان ئاشکرا بکەن ئەوە شتێکی زۆر باشە، بەڵام ئەگەر پەنهانیان بکەنو بیاندەن بەهەژاران ئەوە بۆتان چاکترە.

ئنجا شایانی باسیشە کە بابای زەکات دەر - چ خاوەن ماڵ بێ چ میری - لەسەری بەمەرج دانەنراوە کە لەکاتی زەکاتدان دا بە بابای زەکات وەرگر بڵێ: ئەمە زەکاتە![223] مەگەر هەلومەرجەکە وا داخواز بکات بۆ وێنە: بابای زەکات وەرگر ئەگەر نەزانێ زەکاتە هەست بەمنەتباری بکاتو پێی وابێ خێرو پیاوەتی لەگەڵ کراوە.

## ٣-زەکات دان کەی فەرز دەبێ؟!

زۆربەی هەرە زۆری[224] زانایان ڕایان وایە کە هەر لەوکاتەدا کە زەکات لەماڵ دا پێویست دەبێ فەرزە دەستبەجێ بدرێ، مەگەر پەرچێکی لەبەردەم دابێو عوزرێکی شەرعی هەبێ، لەوبارەشەوە چەند دەقێکی سوننەت هەن بۆ وێنە:

( عن عائشة رضي الله عنها أن النبي ﷺ قال: ما خَالَطَتِ الصَّدقَةُ مالاً قطُّ إلاّ أهْلَكَتْهُ) رواه البخاري في التاريخ، ورواه الشافعي، واتە: ماڵی زەکات هەرکاتێك تێکەڵاوی ماڵێك بووبێ حەتمەن لەنێوی بردوە.



[222] بڕوانە: (المجموع) ج٦ص٢٢٤.
[223] بڕوانە: (المجموع) ج٦ص٢٢٣، وە بڕوانە: (الفقه الأسلامي..) ج٢ص٨٨٢.
[224] بڕوانە: (المجموع) ج٦ص٢٢٢، وە بڕوانە: (فقه السنة) ج١ص٤٧٠.

## ٤-ئایا دروستە زەکات دان پێش کاتی فەرزبوونی بخرێ؟!

زۆربەی زانایان ڕایان وایە کە بابای زەکات دەر ئەگەر ماڵەکەی - هەر جۆرێك بێ لەو شتانەی کەساڵ بەسەردا وەرسووڕانیان تێدا بەمەرج گیراوە - گەیشتە ئەندازەی (نصاب) ئەوە دروستە بەر لەوەرسووڕانی ساڵ زەکاتەکەی بدات، هەندێکیشیان دەڵێن: دروست نیەو دەبێ ساڵێك تەواوبێ ئەوجار زەکاتەکەی بدات[٢٢٥]، دیارە ڕای جەماوەری زانایانیش بەهێزترە چونکە (احمد وأبوداود وابن ماجة و الترمذي بأسناد حسن) لە (علي ابن ابي طالب) خوا لێیڕازیبێ گێڕاویانەتەوە کە (عباس) خوا لێیڕازیبێ داوای لەپێغەمبەر ﷺ کردوە کەڕێی بدات بەرلەهاتنی کاتی زەکات دان زەکاتەکەی بدات ئەویش مۆڵەتی داوە.[٢٢٦]

## ٥-ئایا مەرجە زەکات هەر هەشت جۆرەکان بگرێتەوە؟!

زۆربەی زانایان بەمەرجیان نەزانیوە، بەڵام شافیعییەکان بەمەرجیان گرتوە، بەسەرنج دانی دەقەکانی سوننەتیش دەردەکەوێ کەڕای جەماوەری زانایان بەهێزترە، چونکە خوای کاربەجێ بەس فەرموویەتی دەبێ زەکات بدرێتە ئەو هەشت جۆرە کەسانە، ئیدی نەیفەرمووە کە حەتمەن دەبێ بە یەکسانی بیاندرێتێو لەیەك کات دا بدرێ بەهەموویان، وە لەڕاستیدا هیچ دەقێك لەوبارەوە نیە کە بۆ بەڵگە پێهێنانەوە بشێ[٢٢٧]، وە چاکتر وایە سەرنج بدرێو کێپێویست تر بێو چۆن بۆ بەرژەوەندی ئیسلام و مسوڵمانان باشتر بێ بەوپێیە هەڵسوکەوتی لەگەڵ بکرێ.[٢٢٨]

## ٦- ئەو ئەندازەیەی کە دەدرێتە بابای زەکات پێدراو دەبێ چەندبێ؟!

ئاشکرایە ئەگەر بابای زەکات پێدراو قەرزدار بێ بەئەندازەی درانەوەی قەرزەکەیو، ئەگەر ڕێبواربێ بایی ئەوە کەپێی بگاتەوە شوێنی خۆیو، ئەگەر کاربەدەستی کۆکردنەوەی زەکات بێ بەئەندازەی کارو ڕەنجەکەی، زەکاتیان پێدەدرێ، بەڵام ئەگەر لەپێنج جۆرەکانی دیکە بێ ئەوە زۆربەی زانایان دەڵێن پێویستە یان بەلای کەمەوە دروستە، هێندەی بدرێتێ کەمەداری پێی سازبێتو لەکۆڵ ئاتاجی ببێتەوە، بۆ وێنە

---

[٢٢٥] بڕوانە: (الفقه الأسلامي...) ج٢٧٥٥، ٧٥٦، بەڵام (ظاهرییەکانو مالیکییەکان) دەڵێن دروست نیە.

[٢٢٦] بڕوانە: (المجموع) ج٦ص١٢٦، وە : (الفقه الأسلامي...) ج٢ص٧٦٥.

[٢٢٧] بڕوانە: (فقه السنة).

[٢٢٨] بڕوانە (الروضة الندية) ج١ص٣٠٨، ٣٠٩.

ئەگەر بازرگان بوو هێندەی بدرێتێ کە مامەڵەو بازرگانی پێ بکات، وە ئەگەر پیشە (حرفة)یەکی دەزانی هێندەی بدرێتێ کە پێداویستی‌یەکانی ئەو ئیش‌و پیشەیەی پێ‌دابین بکات،[٢٢٩] چونکە حیکمەت لە فەرزبوونی زەکات لە ماڵ‌و سامانی دەوڵەمەندان دا ئەوەیە کە چین‌و توێژە نەدارە موحتاجەکانی کۆمەڵگا لە بن باری نەداری‌و ناگوزوزوری بێنە دەرێ‌و قوتاریان ببێ، بەڵگەی رای زۆربەی زانایانیش زۆرن بۆ وێنە:

ئەو فەرموودەیەی کە (قبیصە بن مخارق الهلالي) گێڕاویەتەوەو پێغەمبەر ﷺ تێیدا فەرموویەتی: (..فحلّت لَهُ المسألةُ حتى يُصيبَ قِواماً من عَيْشٍ..) رواه احمد ومسلم وابوداود والنسائي، واتە: جا – لەو سێ حاڵەتانەدا کە لە فەرموودەکەدا باس کراون – داواکردنی ماڵ‌و سامان – زەکات بێ یان غەیری زەکات – ی بۆ ڕەوا دەبێ هەتا ژیان‌و گوزەرانی هەڵدەستێتەوەو پێویستی نامێنێ[٢٣٠].

هەندێکیش لە زانایان ڕایان وایە کە بە ئەندازەی (نصاب)[٢٣١]، یان بایی مەسرەفی ساڵێکی زیاتری نادرێتێ[٢٣٢]، بەڵام وەك گوتمان ڕای زۆربەی زانایان کە (شافعي‌یەکان و حەنبەلی‌یەکان) یان لەنێودان چاکترو بەڵگەدارترە.

هەر بۆیەش زانایانی ڕۆچوو و لێکۆڵەرەوە ڕایان وایە کە زەکات بەبابایەکیش دەشێ کە ماڵ‌و سامانی هێندە هەیە کە زەکاتی لێ‌بکەوێ، بەڵام مەسرەفی زۆرەو بەشی ناکات![٢٣٣] واتە لەلایەکەوە کە بایی زەکات لێ‌کەوتن ماڵ‌و سامانی هەیە بە دەوڵەمەند دادەنرێ‌و، لەو رووەشەوە کە کیفایەتی ژیان‌و گوزەرانی ناکات بەنەدارو شایستەی زەکات وەرگرتن حسێب دەکرێ![٢٣٤]



[٢٢٩] بڕوانە: (المجموع) ج٦ص١٨١.

[٢٣٠] بگرە هەندێك لە زانایان دەڵێن دروستە هێندەی زەکات بدرێتێ کە بەشی کیفایەتی هەموو تەمەنی بکات! بڕوانە: (المجموع) ج٦ص١٨١.

[٢٣١] ئەمە ڕای (ابو حنیفة) یە، بڕوانە: (الفقه الأسلامي..) ج٢ص٨٧٦. (فیعطي من الزکاة تمام کفایته ولایکلف بیعه..) بڕوانە: (المجموع) ج٦ص١٧٩.

[٢٣٢] ئەمەش ڕای (مالیکی‌یەکان)ە، بڕوانە: (الفقه السلامي..) ج٢ص٨٧٦.

[٢٣٣] بڕوانە: (المجموع) ج٦ص١٨٤، وە (فقه السنة) ج١ص٥٢٣.

[٢٣٤] (نووي) لەوبارەوە گوتوویەتی: (إذا كان لَهُ عقارٌ يَنْقُصُ دَخْلُه عن كفايَتِهِ فهو فَقيرٌ او مِسْكينٌ)

## ٧- كەسێك داوای زەكات بكاتو پێی نەشێ حوكمی چی‌یە؟!

جارێ زانایان لەسەر ئەوە یەكدەنگن كە هەر كەسێك لەو هەشت جۆرە كەسانە نەبوو كە خوای پەروەردگار دیاریكردوون دروست نیە زەكاتی بدرێتێ، بەڵام ئەگەر بابای زەكات دەر وای زانی پێی دەشێو دوایی بۆی دەركەوت كە شایستە نیە ئەوە لێرەدا رایان جیاوازە٬زۆربەیان كە (مالك و شافعي وأبويوسف و ثوري و ابن المنذر) یان لەنێودان دەڵێن: زەكاتەكەی بۆ وەبەرناكەوێو پێویستە دووبارەی بكاتەوە، هەندێكیشیان دەڵێن: بۆی بەردەكەوێو داوای دووبارە زەكات دانەوەی لێ ناكرێ، جا هەرچی زۆربەن بەڵگە بەرواڵەتی ئایەتی زەكات دێننەوە كە خوای كاربەجێ زەكاتی تایبەت كردوە بەو هەشت جۆرە كەسانەوەو دیارە ئەگەر بدرێ بەغەیری ئەوان مانای وایە ئەو هەقەی كە خوا لەسەری پێویست كردوە بەجێی خۆی نەگەیاندوە، بۆیە لەسەری لانەچووە، ئەوانی دیكەش بەڵگەیان چەند دەقێكی سوننەتە كە یەكێكیان ئەو فەرموودەیەیە كە پێغەمبەر ﷺ لەكۆتایی‌یەكەی‌دا فەرمووی: (**لك مانويت يا يزيدُ، ولك ما أخذت يامَعْنُ**) رواه البخاري، كەپێشتر هێنامانەوە، هەروەها چەند دەقێكی دیكەی لەو بابەتە كە جەماوەری زانایان لە بارەیانەوە دەڵێن: ئەم فەرموودانە دەربارەی خێركردنو ماڵ بەخشینی سوننەتن نەك زەكات![235]

منیش وای بۆ دەچم كە ئەگەر بابای زەكات دەر كەمتەرخەمی نەكردبێ لە ناسینی ئەو كەسانەدا كە زەكاتەكەیان دەداتێ، ئەوە پێویست بە دووبارەكردنەوە ناكات، ئەگەرنا پێویست دەكات، چونكە هەركەسێك كەمتەرخەمی كرد دەبی تۆڵەو سزایەكەی ببینێ.

## ٨-ئایا كەسێك هێزو وزەی كاسپی هەبێ زەكاتی دەدرێتێ؟!

لەوبارەشەوە زانایان دوو رایان هەن بەشێكیان[236] كە (شافعي و احمد واسحاق وأبو عبيده) یان لەنێودان دەڵێن: پێی ناشێو پێویستە كاسبی بكاتو بژێوی خۆیو ئەوانەی بەئەستۆیەوەن پەیدا بكات، ئەم فەرموودەیەش بە بەڵگە دێننەوە: (**لاتحلُّ الصَّدَقَـةُ لغَـنيٍّ ولا لِـذي مِـرَّةٍ سَـوِيٍّ**) رواه ابوداود والترمذي وصححه، واتـە: زەكـات بـۆ ئینسـانی دەوڵەمـەندو بـۆ كەسێكی خاوەن هێزو لەش ساغ رەوا نیە.

---

[235] بڕوانە: (فقه السنة) ج١ص٥٤٩، ٥٥٠، هەروەها بڕوانە: (فقه الأسلامي..) ج٢

[236] بڕوانە: (فقه السنة) ج١ص٥٢٢، ٥٢٣.

بەشێکیشیان[٢٣٧] کە حەنەفی‌یەکانیان لەنێودان دەڵێن: مادام بە ئەندازەی (نصاب)ی زەکاتی نەبێ دروستە زەکاتی بدرێتێ، ئەم فەرموودەیەش بە بەڵگە دێننەوە: (عن عُبيد الله بن عَدي الخيار قال أَخْبرني رَجُلان أنهما أَتَيَا النبيَّ ﷺ في حجة الوداع وهو يُقَسِّمُ الصَّدقة فسألاه منها، فَرفَعَ فينا البَصَرَ وخَفَّضَهُ فَرآنا جَلْدَينِ، فقالَ: (إن شِئْتما أعطَيتكما، ولاحَظَّ فيها لغنيٍّ ولا لِقويٍّ مُكْتَسِبٍ) رواه ابوداود والنسائي.

واتە: ئەگەر حەز دەکەن دەتاندەمێ، بەلام بەشی دەوڵەمەندو بابایەکی بەهێزی کاسبی پێکەری تێدا نیە.

بەلام وای تێدەگەم کە ئەم فەرموودەیەش وەك ئەوەی پێشوو هەر بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە بابای بەهێزو تواناو ساغ‌و سەلیم زەکاتی پێناشێ، چونکە پێغەمبەر ﷺ بەراشکاوی فەرموویەتی: (لاحظَّ فيها..) کەواتە: ئەگەر بابای دەوڵەمەند یان هێزدارو لەش ساغ وەری‌بگرن ئەوە هەقی غەیری خۆیانیان وەرگرتوەو پێیان ناڕەوایە.

ئەوەندە هەیە هەندێك لەزانایان رایان وایە کە ئەگەر بابایەك سەر بە بنەماڵەو خێزانێك بێت کە پێشتر هەبوو بووبن‌و فێرە کاسبی نەبێ وەك حاڵەتێکی هەڵاوێرراو (حالة استثنائية) دروستە وەك هەژارو نەدار دابنرێ‌و زەکاتی بدرێتێ[٢٣٨].

## ٩-زەکات چۆن وەردەگیرێ‌و چۆن دابەش دەکرێ؟!

کاتی خۆی لەرۆژگاری پێغەمبەری خوادا ﷺ بۆ خۆی نوێنەرەکانی خۆی دەنارد بۆ کۆکردنەوەی زەکات پاشان بەسەر ئەو کەسانەدا دابەشی دەکرد کە خوای کاربەجێ دیاری‌کردوون هەروەها (أبوبکر و عمر)یش خوالێیان رازی‌بێ هەروایان دەکرد بێ‌ئەوەی ماڵی پەنهان‌و ئاشکرا[٢٣٩] لەیەك جیابکەنەوە.

کاتێك (عثمان) خوا لێی‌رازی‌بێ هات ئەویش ماوەیەك هەر ئاوا رەفتاری کرد، بەلام دوایی تەماشای کرد ماڵ‌و سامانی پەنهان زۆر زۆر بووەو پشکنین‌و سۆراغ کردن بۆ کۆکردنەوەی دەبێتە مایەی سەغڵەت کردنی خەڵکی، بۆیە کۆکردنەوەو دابەش کردنی حەواڵەی خاوەنەکانی کرد[٢٤٠].

---

[٢٣٧] بڕوانە: (فقه السنة) ج١ص٥٢٢، ٥٢٣.

[٢٣٨] (نووي) گوتوویەتی: (سُئِلَ الغزالي عن القوي مِنْ أَهْلِ البُيُوتاتِ الذين لَمْ تَجْرِ عادَتُهم بالتَكسُّبِ بالبَدنِ، هل لَهُ اخذ الزكاة من سهم الفقراء والمساكين؟ قال: نَعَمْ). بڕوانە: (المجموع) ج٦ص١٨٠.

[٢٣٩] مەبەست لەماڵی پەنهان (باطِن) پارەی نەغدینەو هەندێك جۆری ماڵی بازرگانی‌یە، ماڵی ئاشکرا (ظاهر) یش ئاژەڵ‌و کشتوکاڵ‌و زۆربەی ماڵی بازرگانی‌یە.

[٢٤٠] بڕوانە: (الفقه الأسلامي..) ج٢ص٨٨٨.

پاشان زانایان لەسەر ئەوە ڕێك كەوتوون كەزەكاتی  ماڵی پەنهان دروستە هەر خاوەنی خۆی دابەشی بكات[241]، بەڵكو (شافعي‌یەكان‌و حەنبەلی‌یەكان) ڕایان  وایە ماڵی ئاشكراش هەمان حوكمی ماڵی پەنهانی هەیەو خاوەنی  بۆی هەیە ئەویش سەروبەر بكات[242]، بەڵام (مالك و حەنەفی‌یەكان) دەڵێن: ئەگەر ماڵی ئاشكرا بوو دەبێ میری (دیارە مەبەست حكوومەتی شەرعی‌یە) سەرپەرشتی بكات[243]، وە ئەمە ڕای زۆربەی زانایانە[244].

بەڵام هەموویشیان لەسەر ئەوە یەكدەنگن كە ئەگەر پێشەوای دادگەر (أمام عادل) هەبوو بەلای كەمەوە چاكتر وایە تەسلیمی كاربەدەستانی میری بكرێ، تەنیا (حەنبەلی‌یەكان) دەڵێن: چاكتر وایە خۆی جێبەجێی بكات، بەڵام ئەگەر تەسلیمی میریشی بكات هەر دروستە[245].

بەڵام لەڕاستی‌دا بەسەرنج دانی دەقەكانی قورئان‌و سوننەت و سیرەو ژیانی پێغەمبەر ﷺ و خەلیفە سەر ڕاستەكانی بۆمان دەردەكەوێ كە ئەو ڕایە ڕاست تر و بەهێزترە كە هەموو جۆرەكانی زەكات چ لە ڕووی كۆكردنەوەو چ لە ڕووی دابەش كردنەوە بەئەرك‌و مافی دەستەڵاتی شەرعی وڵات دەزانێ، چونكە بێگومان بەوجۆرە باشتر كۆدەكرێتەوەو دادگەرانەتر دابەش دەكرێ‌و كەلێنی چاكتریشی پێدەگیرێن، مەگەر دەستەڵاتی ناشەرعی حوكمڕان بێ كە بێگومان ئەوكاتە دروست نیە زەكاتی تەسلیم بكرێ، یان نادادگەرو ستەمكاربێ كە ئەو كاتەش مەگەر ناچاری بێ – وەك دوایی باسی دەكەین – ئەگەرنا بەلای كەمەوە ناپەسەندە.

ئەمەش چەند دەقێك بۆ ئیسپاتی ئەو ڕایە كە دەبێ زەكات لەكۆمەڵگای ئیسلامی‌دا بەشێوەیەكی مەركەزی وەربیگرێ‌و دابەش بكرێ:

*(خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِمْ بِهَا...) التوبة: ١٠٤، كە ئاشكرایە ڕووی دواندن (خطاب) لەگەڵ پێغەمبەری خوایە ﷺ

*(إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ لِلْفُقَرَاءِ وَالْمَسَاكِينِ وَالْعَامِلِينَ عَلَيْهَا وَالْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ وَفِي الرِّقَابِ وَالْغَارِمِينَ وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ وَابْنِ السَّبِيلِ فَرِيضَةً مِنَ اللَّهِ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ) التوبة:٦٠. جا مادام بەشێكی  زەكات بۆ ئەو كاربەدەستانە بێ كە كۆی دەكەنەوە دیارە دەبێ لەهەل‌ومەرجی ئاسایی‌دا لەلایەن میری‌یەوە كۆبكرێتەوە.



[241] سەرچاوەی پێشوو هەمان بەرگ‌و لاپەڕە.
[242] بڕوانە: (فقه السنة) ج١ص٥٤١.
[243] هەمان سەرچاوەو بەرگ‌و لاپەڕە.
[244] بڕوانە: (الفقه الأسلامي وادلته) د.وهبة الزحيلي ج٢ص٨٨٩.
[245] بڕوانە: (فقه السنة) ج١ص٥٤١.

*(والله لو مَنَعوني عِقالاً كانوا يؤدُّونَهُ الى رسول الله ﷺ لَحارَبْتُهُمْ عَلَيـهِ) رواه الجماعة الا ابن حاجة عن ابي هريـرة، كـه ئەمـەش قسـەو هەڵوێسـتی خەلیفـەی یەکەمـە خـوا لێیڕازیبێ و ئـەوە دەگەیـەنێ کـە کۆکردنـەوەو دابـەش کردنـی زەکـات ئـەرکی سەرشـانی فـەرمانڕەوای مسوڵمانانە.

بەڵام ئەوانەش کە دەڵێن دروستە بابای خاوەن زەکات زەکاتەکەی ببەخشێ – بەتایبەت هی ماڵی پەنهان – بەڵگەیان بەدەستەوە هەیە بۆ وێنە:

*(وَالَّذِينَ فِي أَمْوَالِهِمْ حَقٌّ مَعْلُومٌ، لِلسَّائِلِ وَالْمَحْرُومِ) المعارج: ٢٤-٢٥، واتە: وە ئەوانەی کە لەسامانیان دا مافێکی دیاریکراو هەیە، بۆ سواڵکەرو بێبەش – نەدار –.

دیـارە ئـەوەی کـە دەشـدرێتە سـواڵکەرو نـەداری بـەردەرگا دەبـێ ڕاسـتەوخۆو دەستبەجێ بێت.

*(عن السائب ابن يزيد سمعتُ عثمان بن عفان يَخْطُبُ على منبر رسول الله ﷺ يقولُ: هذا شهر زكاتِكُم، فَمَنْ كان عليه دَيْنٌ فليقضِ دَيْنَهُ حتى تَخْلُصَ أموالكـم فتـؤدوا منـها الزكـاة) رواه البيهقي باسناد صحيح، واتـە: ئەمە مانگی زەکاتتانە، جا هەرکەسێك قەرزی لەسەرە با قەرزەکەی بداتەوە بۆئەوەی ماڵ و سامانەکەتانتان بۆ ساغ بێتەوەو زەکاتەکەی لێبدەن.

هەڵبەتـە بنچینـەی گشـتی لـەزەکات دان دا ئەوەیـە کـە لەپێشـەوە گوتمـان کـە دەبـێ مەرکەزی بێ بـەڵام بۆ مـاڵی پەنـهان یـان هـەندێك حاڵـەتی نائاسـایی بەشـێوەی تـاکی و سەربەخۆش بدرێ هەر دروستە.

## ١٠- ئایا دروستە زەکات بدرێ بەحوکمڕانێکی ئیسلامی ستەمکار؟!

بێگومـان پەسـەندو چاکتر ئەوەیـە کـە بابـای زەکـات دەر لـەحاڵێکی وا دا بـۆ خـۆی زەکاتەکەی بگەیەنێتە دەستی ئەوجۆرە کەسانەی کە شەرع دیاریکردوون، بەڵام ئەگەر ناچارکرا ئەوە زۆربەی زانایان دەڵێن دروستەو بۆی وەبەر دەکەوێ، هەندێکیشیان دەڵێ: دروسـت نیـەو بـۆی وەبـەر ناکـەوێ، دیـارە ڕای زۆربـەش ڕاسـت و تـەواوەو چـەندان دەق (نص)ی ڕاست پشتگیرییان دەکات[٢٤٦]، بۆ وێنە: *(عن أنـس رضـي الله عنـه أن رجلاً قـال لرسول الله ﷺ : أذا أديت الزكاة الى رسولك فقد بَرِئْتُ منها الى الله ورسوله؟! قال: نعم، اذا أديتها الىٰ رسولي فقد بَرِئْتَ منها الى الله رسوله فَلَكَ أَجْرُهَا وإثْمُها علىٰ مَنْ بَدَّلَها) رواه احمد.

واتە: پیاوێك بەپێغەمبەری خوای ﷺ گوت: ئایا ئەگەر زەکاتم تەسلیمی نێرراوی تۆکرد گـەردنم لەهـەقی خـواو پێغەمبەرکـەی ئـازادبووە؟! فـەرمووی: بـەڵێ، ئەگـەر تەسـلیمی نێرراوەکەمت کرد ئەوە بێگومان لەڕاست خـواو پێغەمبەرکەیـەوە ئۆبـاڵی ئـەو زەکاتـەت

---

[٢٤٦] بر وانة: (نيل الأوطار) ج٤ص٢١٩، ٢٢٠، ٢٢١، وه بروانه: (المغني والشرح الكبير) ج٢ص٦٧٦.

لەسەر نەماوە، وە تۆ پاداشتەکەیت هەیەو گوناحیشی لەسەر ئەو کەسەیە کە دەیگۆڕێو نایگەیەنێتە شوێنی خۆی.

*وە کاتێك پرسیار لەپێغەمبەر ﷺ کرا دەربارەی چۆنیەتی هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ حوکمڕانانی ستەمکارو نا لەباردا فەرمووی: (**تؤدُّون الحق الذي عليكم وتَسألون الله الذي لكم**) متفق عليه، واتە: ئەو هەقەی لەسەرتانە جێبەجێی بکەنو ئەوەی لەسەر ئەوانیش هەتانە لەخوای داوا بکەن.

ئەمە لەحاڵێك دا کە حوکمەکە ئیسلامی بێت بەڵام نارێکیو ستەمو هەڵەو پەڵەی تێدابێ، بەڵام ئەگەر حوکمەکە ناشەرعی بوو، واتە هەر لەڕیشەوە بەپێی شەریعەتی خوا بنیات نەنرابوو، وەك حوکمی زۆربەی هەرەزۆری ئەو دەوڵەتۆکەو ڕژێمە نەفامیيانەی کەئەمڕۆ بەسەر مسوڵمانان دا سەپێنراونو بەناوی ڕێچکەو بیردۆزە مرۆڤکردەکانی وەك: دیمۆکراسیو لیبراڵیزمو سۆسیالیزمو ناسۆنالیزمو سیکۆلاریزمو ... هتد حوکمڕانی دەکەن، ئەوە بێگومان بەهیچ جۆرێك [247] دروست نیە زەکاتیان بدرێتیو هەر کەسێکیش بیانداتێ سەرەڕای بۆ وەبەرنەکەوتنی زۆریش گوناحبارو تاوانبار دەبێ، چونکە لەلایەکەوە هەقی هەژارو نەدارانی داوە بەو کافرو ملهوڕانەو، لەلایەکی دیکەشەوە دەستباری بۆ گرتوونو لەسەر گوناحو دەستدرێژی هاوکاری کردوون، خوای تۆڵەستێنیش فەرموویەتی: (وَتَعَاوَنُوا عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَى وَلَا تَعَاوَنُوا عَلَى الْإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ) المائدة: ٢

## ١١- ئایا بابای زەکات دەر دروستە وەکیل بگرێ؟!

سەرجەم زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە دروستە بابای خاوەن زەکات (مُزَكِّي) یەکێك بکاتە وەکیلی خۆی بۆ زەکات دان، بەڵام پێویستە لە کاتی جیاکردنەوەی زەکاتەکە یان تەسلیم کردنی بەوەکیلەکەی یان درانی بەبابای زەکات وەرگردا، نیاز (نية) ی لەدڵ دا هەبێ، وە بابای وەکیل مەگەر خاوەن زەکاتەکە پێی گوتبێ: هەرکەسێکت حەزکرد بیدەیە، یان چۆنت پێباشە وای لێبکە، ئەگەرنا بۆی نیە بۆ خۆی هەڵیگرێ یان لێی هەڵگرێ [248].

## ١٢-وا باشە زەکات بدرێ بەخەڵکی پارێزکارو چاکەکار:

دیارە زەکات بەهەر مسوڵمانێك دەشێ کە لەوجۆرە کەسانەبێ کە خوای دادگەر باسیکردوون چاکەکاربێ یان خراپەکار، بەڵام چاکتر وایە بابای زەکات دەر زەکاتیماڵەکەی بگەیەنێتە دەستی خەڵکی صاڵحو پارێزکار، بگرە ئەگەر بێتو بزانرێ کە بابای

---

[247] بروانە: (فقه السنة) ج١ص٥٤٢، ٥٤٣، کە ئەمیش لە (رشید رضا) وە نەقڵی کردوە.

[248] بروانە: (الفقه الأسلامي وادلته) ج٢ص٨٩٠، ٨٩١، ط٢.

خراپەکار ئەو زەکاتە بۆ تاوان و خراپە بەکاردێنێ وەك دووربینی و ڕێگرتن لەخراپە (سد الذريعة) دروست نیە بیداتێ، مەگەر لەحاڵێك دا کە بزانرێ بەهۆی ئەو ماڵەوە بەرەو خێر دەگەڕێتەوەو دەبێتە مایەی چاکبوونی،[249] پێغەمبەری خواش ﷺ فەرموویەتی: (..فَأَطْعِمُوا طَعَامكُمْ الأتقياءَ وأَوْلُوا مَعْروفَكُمْ المؤنين) رواه احمد بسند جيد.

واتە:.. جا خواردنی خۆتان دەرخواردی پارێزکاران بدەن و چاکەی خۆتان تەرخان بکەن بۆ بڕواداران.

## ١٣-زەکات بەقوتابی زانیاریی شەرعی کە توانای کاسبی هەبێ دەشێ، بەڵام بەبابای سەرگەرمی خواپەرستی مادام توانای کاسبی هەبێ ناشێ:

(نووي) خوا لێی خۆش بێ لەوبارەوە گوتوویەتی: (قالوا: والمُعتَبَرُ كَسْبُ يَليقُ بحاله ومروّته وأما مالا يليق به فهو كالمعدوم قالوا: ولو قَدرَ على كسب يليق بحاله إلا أنه مُشتَغِلُ بِتَحْصيلِ بَعض العلوم الشرعية، بَحيثُ لَوْ أقْبَلَ على الكسْبَ لانْقَطَعَ عن التَحْصيلِ حَلّتْ لَهُ الزكاةُ، لأن تحصيل العلم فرضِ كفاية... وأما مَنْ أقْبلَ على نوافلِ العبادات والكَسْبُ يَمْنَعُهُ منها أو من إستغراقِ الوقتِ بها فَلا تَحلِ لَهُ الزكاةُ بالأتفاقِ لأن مَصْلَحَةَ عبادته قاصرةُ عَلَيه بخلاف المشتغَلِ بالعِلم، قال أصْحابُنا: واذا لم يجِد الكَسوبُ مَنْ يَسْتَعمَلُهُ حَلّتْ لَهُ الزكاة لأنه عاجِزٌ)[250].

واتە: زانایان گوتویانە: ئەو کاسبیکردنەی کە لەڕووی شەرعەوە بەکاسبی دادەنرێ ئەوەیە کە لەگەڵ پلەو پایەو کەسایەتی‌دا گونجاوبێ، ئەگەرنا ئەوجۆرەی کە لەکەسایەتی وی ناوەشێتەوە وەك نەبوو دادەنرێ، ئنجا گوتوویانە: ئەگەر دەستی گەیشتە کەسابەتێکی شایستەی خۆی بەڵام لەسۆنگەی سەرقاڵ بوونی بەفێربوونی هەندێك لەزانیاری‌یە شەرعی‌یەکان نەیدەپەرژایە سەری بەجۆرێك کە ئەگەر سەرگەرمی کاسبی‌یەکەی ببوایە لەخوێندنەکەی دادەبڕا، ئەوە -بابای وا - زەکاتی پێڕەوایە، چونکە فێربوونی زانیاری فەرزی کیفایەیە،... بەڵام ئەو کەسەی کە خەریکی سوننەتەکانی خواپەرستی دەبێ (و توانای کارو کاسبیشی هەیە) وە ئەگەر کاسبی بکات نایپەرژێتە سەر ئەوجۆرە خواپەرستی‌یە یان نایپەرژێتە سەر هەمووی، ئەوە زەکاتی پێڕەوا نیە بەیەکدەنگی سەرجەم زانایان، لەسۆنگەی ئەوەوە کە قازانجی خواپەرستی‌یەکەی لەخۆی‌دا کورت هەڵتوە بەپێچەوانەی بابای سەرگەرم بەزانیاری‌یەوە، هاوەڵانمان (مەبەستی زانایانی شافیعی مەزهەبە) گوتوویانە: وە ئەگەر بابای کاسبی‌کەر کەسی چنگ نەکەوت کەئیش‌وکارێکی پێبکات (واتە: کارو کاسبی‌یەکی دەست نەکەوت) ئەوە لەبەرئەوەی بێچارەیە زەکاتی پێدەشێ.

---

[249] بڕوانە: (المجموع) ج٦ص٢٣٣، وە: (فقه السنة) ج١ص٥٤٣.

[250] بڕوانە: (المجموع) ج٦ص١٧٧، ١٧٨.

وەك دەبینین لەم دەقەوە كە لە (نووي) یەوە نەقلمان كرد چەند ڕاستی‌یەكی گرنگ هەن:

١-هەر كەسێك لەبەر داواكردن‌و پەیداكردنی زانیاری شەرعی نەیپەرژێتە سەر كارو كاسبی ئەوە بەنەدار دادەنرێ‌و هەرچەندە توانای كارو كاسبی هەیە بەلاّم زەكاتی پێ‌دەشێ، چونكە خەریكی شتێكە كە لەسەر مسوڵمانان فەرزی كیفایەیەو ئەگەر هەندێكیان پێی هەڵنەستن تێكڕایان گوناحبارن! بەلاّم ئەوەی بەندە تێ‌بینی لەسەر هەیە ئەوەیە كە (نووي) زانیاری (علم)ی تایبەت كردوە بەزانیاری‌یە شەرعی‌یەكان (العلوم الشرعیة) ەوە! كە لەڕاستی‌دا ئەو بەند (قید)ە زیادەیەو هەرجۆرە زانیاری‌یەك كە ژیانی مسوڵمانان پەكی لەسەر بكەوێ وەدەست هێنانی بەفەرزی كیفایە دادەنرێ.

ئنجا ئاشكرایە كە ئەگەر زەكات بەقوتابی (طالب العلم) بشێ، چاكتر بە زانا (عالم) دەشێ، هەر بۆیەش زانایان گوتوویانە: (لو كان لَهُ كتبُ علمٍ وهو عالمٌ جازَ دَفْعُ سَهْمِ الفقراءِ الیه.. ولاتُباعُ كُتُبهُ في الدیَن)[٢٥١] ئەگەر بابایەكی زانا كتێبی زانستی هەبوون (دیارە مەبەست ئەندازەیەكی زۆرە كە زەكاتیان لێ‌بكەوێ)، دروستە لەبەشی هەژاران زەكاتی بدرێتێ.. وە كتێبە شەرعی‌یەكانی نابێ بفرۆشرێن.

٢-بەلاّم ئەگەر لەبەر سەرگەرمی‌بوونی بەزیادە خواپەرستی‌یەوە نەیپەرژایە سەر كەسابەت ئەوە زەكاتی پێ‌ڕەوا نیە، چونكە خەریكی شتێكە كە بەس خۆی لێی بەهرەمەندەو مادام وابێ دروست نیە ماڵی مسوڵمانان بەبێ بەرانبەر (مقابل) بدرێ بەكەسێك كە بۆ خۆی خۆی نەدار كردوەو، دەتوانێ وانەبێ‌و كارو كاسبی‌یەك بكات!

بەڵێ ئیسلام دەستی ئەهلی زانست دەگرێ‌و دەستباریان بۆ دەگرێ، بەلاّم بە پێچەوانەوە ڕێزی ئەو كەسانە ناگرێ كە بەهەر بیانوویەكەوە بێ تەنانەت زێدە خوا پەرستنیش! تەنبەڵی‌ی‌و بێ‌كاری‌ی هەڵدەبژێرن‌و چاو لەدەستی خەڵكی دەكەن!

٣-ئێمە پێشتر لەخاڵی (٨) دا ڕوونمان كردەوە كە كەسێك هێزو وزەی كاسبی هەبێ، زەكاتی پێ‌ڕەوا نیە، بەلاّم دیارە ئەم مەسەلەیە دوو شتی تێدا بەمەرج گیراون:

یەكەم: كارو كاسبی دەست بكەوێ، ئەگەرنا توانای كاسبی‌كردن بەبێ كارو ئیش وەگیركەوتن بەكەڵك نایەت‌و وەك مەلەوانی زانینی بێ‌ئاو وایە!

دووەم: دەبێ كارو كاسبیەكە شایستەی ئەو كەسە بێت‌و لەگەڵ كەسایەتی‌ی‌و پلەو پایەی نێو كۆمەڵگای‌دا بگونجێ، چونكە هەموو جۆرە كاسبی‌یەك لەهەموو كەس ناوەشێتەوە؛ جا دیارە لەمەش دا حیكمەت‌و وردبینی‌و واقیع بینی بەرنامەی خوا زیاترو چاكتر ڕوون دەبێتەوە، كە دەبینین لەدانانی یاساكانی‌دا تێكڕای لایەنەكان‌و سەرجەم هەل‌ومەرجەكان ڕەچاو دەكات.

---

[٢٥١] بڕوانە: (المجموع) ج٦ص١٨٠.

## ١٤-ئایا دەگونجێ ماڵی زەکات بۆ بەرژەوەندییە گشتییەکان بەکاربهێنرێ؟!

هەرچەندە زۆربەی[252] هەرەزۆری زانایان وشەی: (في سبيل الله) لەئایەتی زەکات دا لەسەر جیهادو جەنگ کورت هەڵدەهێن، بەڵام وەك کاتی خۆی ڕوونمان کردەوە کورت هەڵێنان (حصر) ی وشەی: (في سبيل الله) لەسەر جیهادو جەنگو جەنگاوەران هیچ بەڵگەیەکی وای لەسەر نیە شایستەی پشت پێ بەستران بێت، بۆیە وەك پێشتریش گوتوومانە ڕاست ئەوەیە کە وشەی: (لەڕێی خوادا) وەك چۆن خوای کاربەجێ بەموتڵەقی فەرموویەتی هەروا بهێڵرێتەوەو بەهیچ شتێکەوە تایبەت نەکرێ، هەرچەندە بێگومان جەنگو جیهادو خزمەتی موجاهیدانو جەنگاوەرانی ڕێی خوا لەپێشەوەی (في سبيل الله) و ڕیزی یەکەمی بەرژەوەندییە گشتییەکاندایە، بەڵام بەبێ بەڵگەیەکی ڕوونو بێچەندو چوون بۆمان نیە حوکمێکی ڕەهاو موتڵەقی قورئان سنووردارو مەرجدار بکەین.

بۆیە بەڕاشکاوی دەڵێین:

بەڵێ بەبێ‌هیچ دوو دڵییەك دروستەو دەگونجێ کە ماڵی کۆکراوەی زەکات لەپێناوی سەرجەم بەرژەوەندییە گشتییەکانی کۆمەڵگای موسوڵمانو دەوڵەتی ئیسلامیدا بەکاربهێنرێ، وەك:

لایەنی جیهادیو سەربازی بەهەموو بەشەکانییەوە، لایەنی زانستیی، لایەنی تەندروستیی، خزمەتگوزارییە کۆمەڵایەتییەکانی وەك چاککردنی ڕێبانو دروست کردنی پردو صوڵحو ئاشتی بەرپاکردن لەنێوان موسوڵمانان دا...هتد.

ئاشکراشە کە بە گوێرەی بەرژەوەندی ئیسلامو موسوڵمانان ڕیز (ترتيب) بۆ ئەو مەسەلانە دادەنرێو کامیان گرنگیو ئەمیەتو (اولوية)ی هەبێ پێش دەخرێ، بەڵام نابێ لەبیرمان بچێ کە ئەوجۆرە خزمەتانە پێویستە لەجوغزی ئەو هەشتیەك (١/٨)ە دابن کە بۆ ڕێی خوا (في سبيل الله) دانراوەو نابێ لەسەر حیسابی کەسوشوێنەکانی دیکە بێت.



[252] بڕوانە: (الفقه السنة) ج١ص٥٤٠، وە: (الفقه الأسلامي) ج٣ص١٩٥٨، ط٤.

## دووەم: زەکات و کۆسپ و گیروگرفتەکانی

### ١-ئایا بەمردنی زەکات لادەچێ؟!

زۆربەی زانایان کە (مالیکی‌یەکان و شافیعی‌یەکان و حەنبەلی‌یەکان) یان لەنێودان دەڵێن: کەسێك زەکاتی لەسەر پێویست بووبێ و توانیبێتی بیدات، بەڵام کەمتەرخەمی تێدا کردبێ و نەیدابێ و مردبێ گوناحبارەو پێویستە - هەرچەندە وەصیەتیشی نەکردبێ - لەمیراتەکەی بدرێ، بەڵام (ابوحنیفة) دەڵێ مادام وەصیەتی نەکردبێ بەمردنی لەسەری لادەچێ،[٢٥٣] بەڵام بێگومان رای زۆربە بەهێزترە، (نووي) لەوبارەوە قسەیەکی جوانی کردوە کە بەرپەرچی رای (ابوحنیفة)ی پێدەداتەوە: (فَمَنْ وَجَبَتْ عليه زكاة وتمكَّنَ من أدائها فمات قبل ادائها عَصىٰ ووَجَبَ إخْراجُها من تَرِكَتِه عِنْدَنا بلا خِلافٍ، و به قال جمهور العلماء، وقال ابوحنيفة: تَسْقُطُ عنه الزكاة بالموت، وهو مذهبُ عجيبٌ! فأنهم يقولون: الزكاةُ تجِبُ على التراخي وتَسقُطُ بالموت، وهذا طريق الى سُقوطِها..).[٢٥٤] واتە: جا هەرکەسێك زەکاتی لەسەر پێویست بووبێ و توانیبیەتی بیدات و بەرلەوەی جێبەجێی بکات مردبێ ئەوە گوناحبارەو پێویستە لەمیراتەکەی بدرێ، ئەوە لای ئێمە کێشەی تێدا نیە، وە زۆربەی زانایانیش رایان وایە، بەڵام (ابوحنیفة) گوتوویەتی: بەمردنی زەکاتی لەسەر لادەچێ، وە ئەمە رایەکی سەیرە! چونکە ئەوان (واتە حەنەفی‌یەکان) دەڵێن: زەکات دان دەستبەجێ فەرز نیەو بەمردنیش لادەچێ ئەمەش رێیەکە بۆ لەبەین چوونی زەکات...

ئەم دوو دەقەی خوارەوەش بەڵگەی رای جەماوەری زانایانن:

*خوای پەروەردگار لەئایەتی ژمارە (١٢)ی سوورەتی (النساء)دا پاش ئەوەی باسی چەند ئەندازە میراتێکی کردوە فەرموویەتی: (.... مِنْ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصَى بِهَا أَوْ دَيْنٍ..) واتە: پاش جێبەجێکردنی وەصیەتێك کە کراوە یان - دانەوەی - قەرزێك..

ئنجا ئاشکراشە کە زەکاتیش قەرزەو قەرزی خواو خەڵکیشە، وە قەرزی خواش - وەك لەدەقی دووەم باسی‌دەکەین - لەپێشترە بۆ درانەوە لەقەرزی بەندەکان.

*(عن ابن عباسٍ رضي الله عنهما ان رجلاً جاء الىٰ رسول الله ﷺ فقال: إنَّ أُمـي ماتَتْ وعَليها صَوْمُ شهرٍ، أفأقضيه عنها؟! فقال: لو كان علىٰ أُمك دَيْنٌ أكُنْتَ قاضيَه عَنْها؟! قال: نعم، قال: فدَيْنُ الله أحقُّ أنْ يُقضىٰ) متفق عليه.

---

[٢٥٣] بروانە: (الفقه الأسلامي) ج٣ص١٩٨٠، ١٩٨١، ط٤، وە بروانە: (فقه السنة) ج١ص٤٦٩، ٤٧٠.

[٢٥٤] بروانە: (المجموع شرح المهذب) ج٦ص٢٢٣.

واته: پیاوێك هاته خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و گوتی: دایكم مردوەو ڕۆژووی مانگێك قەرزداره. ئایا بۆی بگێڕمەوه؟! فەرمووی: ئەگەر دایكت قەرزێكی لەسەر ببوایە بۆیت نەدەدایەوە؟ گوتی: بەڵێ، فەرمووی: دەجا قەرزی خوا لەپێشترە بۆ درانەوە.

## ٢- دواخستنی زەكات نابێتە هۆی لاچوونی:

هەركەسێك چەندانساڵی بەسەردا تێپەڕبووبێ‌و زەكاتی نەدابێ بانەشی زانیبێ كە لەسەری فەرزە، پێویستە زەكاتی ئەو چەند ساڵە بدات، یان لێی بستێنرێ، چونكە قەرز كۆن دەبێ بەڵام نافەوتێ.

وە (ابن المنذر) گوتوویەتی: ئەگەر كۆمەڵێكی یاخیبوو یان دەرچوو لە فەرمانبەری پێشەوای مسوڵمانان لە شوێنێك دا حوكمڕانی‌یان كردو خەڵكەكەش بۆ ماوەی چەند ساڵێك زەكاتیان نەدا، پاشان پێشەوای مسوڵمانان ئەو شوێنەی خستەوە ژێر ڕكێفی خۆی، ئەوە بەپێی قسەی (مالك و شافعي وأبوثور) دەبێ زەكاتی ئەو چەند ساڵەیان لێ بستێنێ[255].

## ٣-ڕاكردن لەزەكات دان و فێڵ و تەڵەكە تێداكردنی قەدەغەیە:

كەسێك بەئەندازەی (نصاب) جۆره ماڵێكی هەبێ كە زەكاتی لێ‌دەدرێ، بەڵام بەر لە ساڵ سووڕانەوه فێڵ‌و پیلانێكی تێدا بكات كە بە خەیاڵی خۆی ببێتە هۆی زەكات لێ‌نەدرانی، وەك ئەوەی كە بیفرۆشێ، یان بیبەخشێ، یان هەندێكی لێ بفەوتێنێ كە ئەوەی دەمێنێ لەئەندازەی (نصاب) كەمتربێ، یان ئەوەی بڵاوە[256] كۆبكرێتەوە تاكو زەكاتی كەمتری لێ‌دەربكرێ، یان بەپێچەوانەوە، هی كۆبووەوە[257] پرژو بڵاو بكرێ بۆ هەمان مەبەست ئەوە لەهەموو ئەو حاڵەتانەو هاووێنەكانیان دا بەڕای زۆربەی[258] زانایان كە (مالك و اوزاعي وأحمد و اسحاق و ابوعبيد) یان لەنێودان، زەكاتی تەواوی لێ‌وەردەگیرێ، بەمەرجێك ئەو فێڵ‌و تەگبیرانە لەنزیك كۆتایی ساڵ‌و زەكات وەرگیران دا كرابن، چونكە ئەگەر لەسەرەتای ساڵەوە ئەوجۆره ڕەفتارانە بكرێن مەزەنەی فێڵ‌و

---

[255] بڕوانە: (فقه السنة) ج١ص٥١٨.

[256] وەك ئەوە كەسێ‌كەس یەكی چل (٤٠) سەر مەڕو بزنیان هەبێ بێن كۆیان بكەنەوە بۆئەوەی بەهەموویان یەك سەر بدەن، نەك هەر كامیان سەرێك!

[257] وەك ئەوەی دوو كەسی هاوبەش (شريك) دوو سەدو یەك سەر مەڕو بزنیان هەبێ‌و بێنن بەشەكانیان لەیەك جیابكەنەوە تاكو یەكی یەك سەر بدەن نەك بەهەردووكیان سێ‌سەر

[258] بڕوانە: (فقه السنة) ج١ص٥١٩، وە بڕوانە: (الفقه الأسلامي وادلته) ج٣ص١٩٧٨، ١٩٧٩، ط٤.

فەرەجی لێناکرێ، بەڵام بەشێك لەزانایان کە (ابو حنیفة و شافعي) یان لەنێودان دەڵێن: زەکاتەکەی لەسەر لادەچێ بەڵام گوناحبار دەبێ[٢٥٩].

جا دیارە بەندە ڕای جەماوەری پێبەهێزو چاکترە[٢٦٠] کە ئەم چەند بەڵگەیەیان بەدەستەوەن:

أ-بەسەرهاتی خاوەنانی باغەکە (أَصحاب الجنة) کە بڕیاریان دا بوو بەر لەوەی هەژارو نەدارەکان لەکاتی دیاریکراودا بچنە لایان و داوایان لێبکەن ئەوان بەروبوومەکەیان هەڵبگرن و تاکو نەدارە خاوەن هەقەکان بەسەر پەرێزی خاڵیدا بچن! خوای تۆڵەستێن و دادگەریش لەتۆڵەی ئەوەدا سزای دان و باغەکەی لێکردنە زەوییەکی پاککراوەی بێ بەرهەم، وەك فەرموویەتی: (إِنَّا بَلَوْنَاهُمْ كَمَا بَلَوْنَا أَصْحَابَ الْجَنَّةِ إِذْ أَقْسَمُوا لَيَصْرِمُنَّهَا مُصْبِحِينَ وَلَا يَسْتَثْنُونَ، فَطَافَ عَلَيْهَا طَائِفٌ مِنْ رَبِّكَ وَهُمْ نَائِمُونَ، فَأَصْبَحَتْ كَالصَّرِيمِ) القلم:١٨-٢١.

ب- هەرکەسێك بیەوێ بەشی خاوەن بەشێك بفەوتێنێ کە مافی ڕەوای خۆی بێ، ڕێی نادرێ وەك ئەو کەسەی کە لە[illegible] خۆشی مەرگ دا ژنەکەی تەڵاق دەدات بۆئەوەی لەمیراتی بێبەش بکات، ژنەکەی تەڵاقی ناکەوێ.

ج-هەرکەسێك مەبەستێکی خراپ و ناشەرعی هەبێ، شەرع بەپێچەوانەی مەبەستەکەیەوە سزای دەدات، وەك ئەو کەسەی کە میرات لێگیراو (مُوَرِّث) ەکەی خۆی دەکوژێ تاکو زوو میراتەکەی پێببڕێ، لەمیراتەکەی بێبەش دەکرێ وێڕای سزاو تۆڵەی شەرعی خۆی[٢٦١].

## ٤-لەنێوچوونی زەکات دوای جیاکردنەوەی:

زانایان لەوبارەوە ڕایان جیاجیایە زۆربەیان دەڵێن: هەرکەسێك زەکاتی ماڵی خۆی جیاکردەوە بەڵام بەرلەوەی بیگەیەنێتە دەستی خاوەنانی شەرعی خۆی فەوتا، ئەوە لەسەری فەرزە دووبارە زەکات جیابکاتەوەو بیگەیەنێتە شوێنی خۆی[٢٦٢]، بەڵام (ابوحنیفة) ڕای وایە کە فەرزەکەی لەسەر شان لاچووە، مەگەر خۆی فەوتاندبی ئەگەرنا لەسەری پێویست نیە دووبارەی بکاتەوە.

واش پێدەچێ ڕای ئەوانە بەهێزتربێ کە دەڵێن لەسەری فەرزە دووبارە بیداتەوە، وە ئەوە پەسەندکراوی (ابن حزم) ی ئەندەلووسیشە[٢٦٣].

---

[٢٥٩] هەردووك سەرچاوەی پێشوو هەمان بەرگ و لاپەرە.

[٢٦٠] وەك تێبینی دەکرێ مەگەر چۆن دەنا هەمیشە ڕای جەماوەرو زۆربەی زانایان بەهێزترو پەسەندترە، بەڵام ڕێش دەکەوێ یەکێك یان هەندێك لەزانایان لەجەماوەرو زۆربە باشتریان پێکابێ.

[٢٦١] بڕوانە: (فقه السنة) ج١ص٥١٩، ٥٢٠.

[٢٦٢] بڕوانە: (المحلى شرح المجلى) ج٥ص١٨١، ١٨٢.

[٢٦٣] ئەوەش مەسەلەیەکە دوایی باسی دەکەین، بڕوانە: (المحلى) ج٥ص١٨١.

## ٥-لەنێوچوونی ماڵی زەكات لێكەوتوو پێش زەكات لێدرانی:

لەمیش دا زانایان رایان جیاوازە هەندێكیان كە (أحمد و ابن حزم)* یان لەنێودا هەن، دەڵێن مادام زەكاتی لێكەوتبێ هەرچۆنێكی فەوتابێ، كەمتەرخەمی تێدا كردبێ یان نا، ئەوە زەكات دانەكەی هەر لەسەر فەرزەو دەبێ بیدات، چونكە - بەڕای ئەوان - زەكات لەئەستۆو ئۆباڵی خاوەن ماڵ دایە نەك خودی ماڵ و سامانەكە، بەڵام (ابوحنیفة) ڕای وایە كە مادام خەتای نەبووبێ زەكاتەكەی لاچووەو لەسەری پێویست نیە بیدات.

زۆربەشیان كە (شافعي و حسن بن صالح واسحاق وأبوثور وابن المنذر) یان لەنێودان، دەڵێن، ئەگەر، ماڵەكە بەر لەوە فەوتابێ كە بتوانێ زەكاتی لێدەربكات، زەكاتەكەی لاچووە، ئەگەرنا لانەچووەو دەبێ بیدات، (إبن قدامة)ش هەر ئەم ڕایەی پەسندكردوە[٢٦٤].

## ٦-ئایا دەگونجێ قەرز بخرێتە بری زەكات؟!

واتە: كەسێك ماڵێكی هەبێ كە هەلومەرجی زەكات لێدرانی ڕەخسابێ، بەڵام لەجیاتی زەكات لێدانی قەرزێك كە لەسەر بابای زەكات وەرگر هەیەتی بەئەندازەی زەكاتەكەی لەسەری لابەرێ و بیخاتە بری!

زانایان لەوبارەوە دووڕایان هەن زۆربەو جەماوەریان دەڵێن: نەخێر دروست نیەو بەوە زەكاتی لەسەر لاناچێ، چونكە مەرجی سەرەكی زەكات دان وەك پێشتر ڕوونمان كردەوە، تەسلیم كردنیەتی بەو كەسانەی كەپێیان ڕەوایە، بەڵام ئاشكرایە كەماڵی قەرز شتێكی نادیارەو مسۆگەر نیە، دیسان وەك پێشتر باسمان كرد نیەت هێنان لەكاتی زەكات دان دا مەرجێكی بنەڕەتی یەو لەقەرز خستنەبری زەكات دا ئەویش هەر نایەتەدی، شایانی باسیشە كە ئەم ڕای یەكەمە بێجگە لەهەر چوار پێشەوا سەربەرزەكان ڕای هەركام لە (سفیان الثوري) و (ابوعبید) و (زیدیة) و (إباضیة) شە[٢٦٥].

هەندێكیشیان كە ( ظاهریة) و (الشیعة الجعفریة) و هەندێك لە (تابعین) وەك (حسن البصري وعطاء)[٢٦٦] دەڵێن: قەرز دەخرێتە بری زەكات و بابای زەكات دەر بەوە كە بەئەندازەی زەكاتەكەی قەرز لەسەر قەرزدارێكی زەكات پێشیاو لادەبات، ئەو ئەندازە زەكاتەكەی لەسەر لادەچێ.

---

[٢٦٤] بڕوانە: (فقه السنة) ج١ص٥١٧.

* بەڵام (ابن حزم) دەڵێ بەمەرجێك دوای ئەوەبێ كە بۆی گونجا بێ زەكاتەكەی بدات، بڕوانە: (المحلّى) ج٥ص١٨١.

[٢٦٥] بڕوانە: (الفقه الأسلامي..) ج٣ص١٩٨٣، ط٤.

[٢٦٦] سەرچاوەی پێشوو ج٣ص١٩٨٢.

بەڵام بێگومان ڕای زۆربەو جەماوەر بەهێزترەو بەرژەوەندی هەژارو نەدارانیشی زیاتر تێدایە، چونکە وێڕای ئەوە کە وەك باسمان کرد و مەرجی سەرەکی زەکات دان ئەوەیە کە تەسلیمی خاوەنی شەرعی خۆی بکرێ،[٢٦٧] ئەگەر ئەوجۆرە زەکات دانەش ڕەوابێ سەردەکێشێ بۆ نەدرانی زەکاتی گەلێك کەس، کە زەکاتی ماڵەکانیان دەخەنە جێگای ئەو قەرزو قۆڵانەی کە لەدرانەوەو وەرگرتنەوەیان بێ هیوا بوو ون!

ئنجا نەك هەر ئەوە بەڵکو زانایان لەسەر ئەوەش ڕێك کەوتوون[٢٦٨] کە دروست نیە بابایەکی دەوڵەمەندی خاوەن قەرز بەقەرزدارە زەکات وەرگرەکەی خۆی بڵێ: ئەوە زەکاتەکەم پێدای بەمەرجێك دوایی لەجیاتی ئەو قەرزەی لەسەرتە بمدەیەوە وە لەحاڵێکی وادا زەکاتەکەی لەسەر لاناچێ، بەڵام ئەگەر هەردووکیان - زەکات دەرو زەکات وەرگر - نیازیان وابێ بەڵام نەیکەنە مەرج و باسی نەکەن، دروستە، چونکە لەحاڵەتی یەکەم دا بابای زەکات وەرگر نابێتە خاوەن (ماڵِكْ)و پرۆسەی کردنە خاوەن (تَمْلیك) نایەتەدی، بەڵام لەحاڵەتی دووەم دا دێتە دی.

## ٧-ئایا ئەو باج (ضریبة) ەی کە میری وەریدەگرێ وەبری زەکات دەکەوێ؟!

لەسۆنگەی ئەوەوە کە ڕۆژگاری زوو لەکۆمەڵگای ئیسلامی‌دا (باج) وەرگرتن نەبووە زاناو شەرعزانانی ڕابردوو قسەیان لێ‌نەکردوە، بەڵام زانایانی هاوچەرخ دەڵێن: بەهیچ جۆرێك دروست نیە باج (ضریبة) ێك کە دەوڵەت بەزۆر لەهاووڵاتیانی دەستێنێ لەجیاتی زەکات حیساب بکرێ، چونکە:

زەکات جۆرە خواپەرستی‌یەکەو نیازو مەبەستی لەگەڵدایەو هەم ئەندازەکەی و هەم ئەوانەی کە دەیاندرێتێ و هەم ئەو شتانەی کە لێیان دەدرێ لەلایەن شەرعەوە دیاریکراون، بەڵام (باج) هیچ کام لەو سیفەتانەی تێدا نین[٢٦٩].

---

[٢٦٧] بۆیە زانایان دەڵێن: ئەگەر زەکات دەرێك قەرزی مردوویەك لەجیاتی زەکات دان بداتەوە دروست نیە، بەڵام دروستە قەرزی زیندوویەك بەنیزنی خۆی بداتەوە چونکە لەحاڵەتی یەکەم دا (تملیك) نیەو لەهی دووەم دا هەیە! بڕوانە: (الفقه الأسلامي..) ج٣ص١٩٨٦، ط٤.

[٢٦٨] بڕوانە: (المجموع) ج٦ص١٩٩، وە بڕوانە: (المغني...) ج٢ص٥١٦، وە بڕوانە: (فقه السنة) ج١ص٥٤٦.

[٢٦٩] بڕوانە: (فقه الزكاة)، د.یوسف القرضاوي ص٩٩٧تا١٠٠٣، وە بڕوانە: (الفقه الأسلامي..) ج٣ص١٩٧٩.

## ٨-ئایــا دروســـته زەكـــات دەر زەكاتەكـــەی لـــەبابای زەكـــات وەرگر بكڕێتەوە؟!

زۆربـەی[٢٧٠] هـەرە زۆری زانایـان بـە ناپەســەند (مكـروه) یـان زانیـوە كـە زەكـات دەر زەكاتەكەی لەبابای زەكات پێدراو بكڕێتەوە، هەندێكیشیان بەدروست (جائز) ی دەزانن، كە ئەمە ڕای (حسن وعكرمة وربيعة واوزاعي) يەو (ابن حزم)يش هەڵی بژاردوە[٢٧١]، بەڵام بێگومان ڕای جەماوەر بەهێزترو پەسەندترە چونكە ئەم دەقەيان بەدەستەوەيە:

*(عن عبدالله بن عمر رضي الله عنهما أن عمر رضـي الله عنـه حَمَلَ علـى فَـرَسٍ في سـبيل الله، فَوَجَدَهُ يُباعُ فأراد أن يَبْتاعَهُ، فسأل رسولَ الله ﷺ عن ذلك؛ فقال: لاتَبْتَعْهُ، ولا تَعُدْ في صَدَقَتِك) رواه الشيخان وابوداود والنسائي.

واتـە:عومـەر خـوا لێـی ڕازی بـێ ئەسـپێكی بـۆ جیـهاد دا بەكەسـێك، پاشـان دیتـی دەفرۆشرێ ئەویش ویستی بیكڕێتەوە، جا لەوبارەوە پرسیاری لەپێغەمبـەری خـوا ﷺ كرد؟ ئەویش فەرمووی: مەیكڕە، وە زەكاتی خۆت مەگێڕەوە لای خۆت.

بـەڵام بێگومـان ئەگـەر قـازانج و بـەرژەوەندی زەكـات وەرگـر لـەوەدا بـوو ئـەوە بـەڕای هـەموویان دروستە، چونكە بەناپەسەند دانرانەكە هـەر لەبەر بەرژەوەندی زەكات وەرگـر بوو، جا ئەگەر هات و قازانجی لەوەدا بوو حوكمەكەی دەگۆڕێ[٢٧٢].



[٢٧٠] بڕوانە: (فقه السنة) ج١ص٥٤٤.

[٢٧١] بڕوانە: (المحلى) ج٦ص٦٨، وە (فقه السنة) ج١ص٥٤٤.

[٢٧٢] بڕوانە: (المغني والشرح الكبير) ج٢ص٥١٦.

# سێیەم: زەکاتی ئاژەڵ و بەرهەمی کشتوکاڵ و میوەجات

## ١-جۆرەکانی زەکات مادام یەك ڕەگەز (جنس) بن دەخرێنەوە سەریەك:

سەرجەم زانایان[٢٧٣] لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە جۆرەکان (أنواع)ی شتێك هەرچەندە لەچاکی و خراپی و ڕەنگ و .. هتد دا جیاواز بن لەکاتی زەکات لێدەرکردن دا پێکەوە کۆدەکرێنەوە، ئەم بنچینەیەش هەم بەرووبوومی کشتوکاڵ و میوەجات و هەم ئاژەڵ و هەم ماڵی بازرگانیش، دەگرێتەوە، بەڵام بەمەرجێك کە ئەو جۆرە شتانە بکەونەوە جوغزی یەك ڕەگەز (جنس) ەوە، بۆ وێنە:

جۆرەکانی گەنم[٢٧٤] دەخرێنەوە سەر یەك، بەڵام گەنم و جۆ، یان جۆ و گەنمەشامی. چونکە لەڕەگەزدا لە یەك جیان ناخرێنەوە سەر یەك، بەڵکو هەر کامێکیان بە جیاو سەربەخۆ زەکاتی لێدەدرێ و دەبێ لە هەر کامێکیان دا مەرجەکانی زەکات هاتبنەدی ئەوجار لێی دەردەکرێ.

هەروەها جۆرەکانی حوشتر، وە جۆرەکانی مانگاو گامێش، وە جۆرەکانی مەڕو بزن، دەخرێنەوە پاڵ یەك بەڵام هیچ کامیان ناخرێتەگەڵ ئەوی دیکەیان چونکە ڕەگەزیان جیا جیایە، ئەمەش وەك (ابن المنذر) گوتوویەتی: زانایان لەسەری یەکدەنگن[٢٧٥].

دیسان کەل وپەل و شمەکی بازرگانی لەگەڵ ئەو نرخ و پارەیەی کە لێیانەوە پەیدا بووە دەخرێنەوە سەریەك ئەوجار زەکاتیان لێدەردەکرێ، بەڵام (شافعي)[٢٧٦] دەڵێ:

دەبێ شمەك و کەل وپەلەکە بەچ پارەیەك کڕابێ بخرێتەوە پاڵ وی نەك پارەیەکی دیکە، کە دیارە مەبەستی زێڕو زیوی ئەو ڕۆژگارەیە کە دراوی ئەوکاتە بوو ون.

---

[٢٧٣] بڕوانە: (المغني) ج٢ص٥٥٩.

[٢٧٤] لە دانەوێڵەکان (حبوب) دا زانایان یەکدەنگ نین، بەڵکو ئەوەی سەرەوە ڕای زۆربەیانەو هەندێکیشیان دەڵێن ڕەگەزە لەیەك جیاجیاکانیش دەخرێنەوە سەریەك، بڕوانە: (المغني) ج٢ص٥٦٠.

[٢٧٥] بڕوانە: (المغني) ج٢ص٥٥٩.

[٢٧٦] هەمان سەرچاوەو بەرگ و لاپەڕە.

**٢-بەچکەی ئاژەڵ کە بەر لەوەرسووڕانەوەی ساڵ پەیدا دەبێ بۆ زەکات لێ دران، ڕەگەڵ دایکی دەخرێ، بەمەرجێك ئەو ئاژەڵانە بێجگە لەبەچکەکان گەیشتبنە (نصاب):** زۆربەی هەرە زۆری زانایان ڕایان وایە کە هەر جۆرە ئاژەڵێك (حوشتر، مانگاو[277] گامێش، مەڕو[278] بزن) ژمارەی گەیشتبێتە ڕاددەی زەکات لێدەرکران، ئەگەر لەمیانەی ساڵ دا -واتە بەر لەتەواوبوونی ساڵ - بەچکەیان لێ پەیدا بوو لەکاتی زەکات لێدەرکران دا ئەو بەچکانەشیان لەگەڵ حیساب دەکرێن، بەڵام بەچکەکان بەزەکات وەرناگیرێن، ئەمە ڕای هەر چوار مەزهەبەکان و زۆر لەزانایانی دیکەشە،[279] بەڵگەشیان ئەم دەقەیە:

*(عن سفيان بن عبدالله الثقفي أن عمر بن الخطاب قال: تَعُدُّ عليهم السَّخْلَةَ يَحْمِلُها الرّاعي ولا تَأْخُذْها ..) رواه مالك والشافعي.

واتە: (ئەو کاریلەیەی کە شوان هەڵی دەگرێ لەسەریان حیساب بکە - بۆ وەرگرتنی زەکات - بەڵام ئەویان لێوەرمەگرە). هەروەها خاوەنی (المغني) دەڵێ ئەم مەسەلەیە ئیجماعیشی لەسەرە[280].

**٣-وڵاخە بەرزەو ئێسترو کەر زەکاتیان لێنادرێ:**

زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە وڵاخە بەرزە (ئەسپ و ماین) و ئێسترو کەر ئەگەر کران بە ماڵی بازرگانی زەکاتیان لێدەدرێ، وە جگە لە (ابوحنيفة) ش هەموویان یەکدەنگن کە مادام بازرگانی یان پێنەکرێ زەکاتیان لێنادرێ، بەڵام (ابو حنيفة) ڕای وایە کە وڵاخە بەرزە ئەگەر ئەسپ و ماین بن یان هەر ماین بن زەکاتیان لێدەدرێ، جا خاوەنەکەیان دەتوانێ لەجیاتی هەر سەرێك دینارێك (مسقاڵێك زێڕ) بدات، یاخود بیان قەبڵێنێ و لەباتی هەر دوو سەد درەم پێنج درەم بدات وەك کەلوپەلی بازرگانی[281].

بەڵام بێگومان ڕای زۆربەی نزیك بە ئیجماعی زانایان بەهێزترەو چەند دەقێکیش بە بەڵگە دێننەوە کە ئەمە یەکێکیانەو ڕاست ترینیشیانە:

* (عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: قال رسول الله ﷺ: لَيْسَ علىٰ المُسْلِمِ صدقةٌ في عَبْدِهِ ولا فَرَسِهِ) رواه الجماعة. واتە: مسوڵمان لەکۆیلەکەی و ئەسپەکەی دا زەکاتی لەسەر نیە.

---

[277] بڕوانە: (المحلى) ج٥ص١٨٣، ١٩١

[278] هەمان سەرچاوەی پێشوو

[279] بڕوانە: (الفقه الأسلامي وأدلته) ج٣ص١٩٤٠.

[280] بڕوانە: (المغني) ج٢ص٥٥٩.

[281] بڕوانە: (فقه السنة) ج١ ٥٠٣، وە بڕوانە: (الفقه الأسلامي وأدلته) ج٣ص١٩٢٨، ١٩٢٩، ط٤.

## ٤-ئایا زەكات لەئۆباڵی بابای زەكات دەر دایە یان لەخودی ئەو شتە دایە كە زەكاتی لێ دەدرێ؟!

زانایان لەوبارەوە ڕایان جیاوازە حەنەفی‌یەكان‌و مالیكی‌یەكان وە شافیعی‌و ئەحمەدیش لەیەكێك لەدوو قسەكانیان دا ڕایان وایە كە زەكات لەخودی ئەو شتەدایە كە زەكاتەكەی لێ دەردەكرێ (الزكاةُ في العَيْن)، بەڵام شافیعی‌و ئەحمەد لەقسەی دووەمیان دا دەڵێن زەكات لەئۆباڵ‌و گەردنی زەكات دەر[282] دایە، (الزكاة في الذِّمَّةِ)، (ابن حزم)یش[283] زۆر جەختی لەسەر ئەم ڕای دووەمە كردوە، جیاوازی ئەو دوو ڕایەش بەوێنە هێنانەوەیەك ڕوون دەكەینەوە:

ئەگەر كەسێك بیست مسقاڵ زێڕی هەبێ و دوو ساڵی بەسەردا تێپەڕبووبێ‌و زەكاتی لێنەدابێ بەگوێرەی ڕای یەكەم تەنیا مسقاڵێكی زەكات دەكەوێتە سەر چونكە ماڵەكەی پاش ئەوەی مسقاڵێكی لێ بەزەكات دەدرێ نۆزدە (١٩) مسقاڵی دەمێنێتەوە، كە لە (نصاب) كەمتر دەبێتەوەو چی دیكەی لێنادرێ، بەڵام بەگوێرەی ڕای دووەم دوو مسقاڵەكەی لەجیاتی هەردووك ساڵەكە لێدەدرێ، چونكە زەكاتەكە لەئەستۆی زەكات دەر دایە وەك قەرزێك‌و دەبێ هەر بیدات.

واش پێدەچێ ڕای یەكەم بەهێزتربێ‌و ئەوەش كە ڕای دووەم بە بەڵگەی دێننەوە - بەتایبەت (ابن حَزْم) كە چاك شی‌كردۆتەوە - كە ئەگەر زەكات لەخودی شتەكە دا بووایە نەدەبوو دروست بێ لەغەیری ئەو پارە نەغدینەیە یان ئاژەڵە یان دانەوێڵەیە زەكات بدرێ، وەڵامەكەی ئەوەیە كە لەبەر ئاسانكاری مۆڵەت دراوە وەك گەلێك مۆڵەت (رخصة)ی دیكەی شەریعەت[284].

## ٥-ئایا دروستە لەجیاتی خودی زەكاتەكە نرخ (قیمة)ەكەی بدرێ؟!

لەم مەسەلەیەش دا زانایان ڕایان جیاجیایە، هەرچی زۆربەو[285] جەماوەریانن كە (مالك‌و شافعي واحمد) یان لەنێودان‌و (ابن حزم)[286]یش زۆر سەخت گیرانە پشتگیری كردوە

---

[282] بڕوانە: (المغني والشرح الكبير) ج٢ص٤٩١، ٤٩٢.

[283] بڕوانە: (المحلى) ج٥ص١٨١، وە (المغني..) ج٢ص٥٣٧.

[284] بڕوانە: (الفقه الأسلامي..) ج٣ص١٩٣٦، ١٩٣٧، ط٤.

[285] بڕوانە: (الفقه الأسلامي..) ج٣ص١٩٣٨، ١٩٣٩، ط٤.

[286] بڕوانە: (المحلى شرح المجلى) ج٦ص٥تا٢٣، (مسألة: ٦٧٤).

دەڵێن: دروست نیەو هەر شتێك دەبێ لەخودی خۆی زەكاتی لێبدرێ، بەڵام (ابو حنیفة) رای وایە كە بەبێ بەندو مەرج (بدون قید وشرط) دروستە[287]، بەڵام وا پێدەچی ڕاست ترین‌و دادگەرانەترین ڕا ئەوەبێ كە ئەسڵ ئەوەیە هەر شتە لەخودی خۆی زەكاتی لێبدرێ، چونكە دەقەكانی قورئان‌و سوننەت كەباسی زەكات دان لەو شتانە دەكەن كە زەكاتیان لێ دەدرێ وا دەگەیەنن، بۆ وێنە: پێغەمبەر ﷺ كە (معاذ)ی ڕەوانەی یەمەن كرد پێی فەرموو: (خُذِ الحَبَّ من الحَبِّ، والشاةَ من الغَنَمِ، والبَعِيْرَ مِنَ الأبِلِ، والبقَـرةَ مِـنَ البَقَـرِ) رواه ابوداود وابن ماجة. بەڵام لەكاتی پێویستی و ناچاری‌دا وەك ئەو كەسەی كە لەزەكات دانی حوشتران دا مەڕی دەكەوێتە سەرو مەڕیشی نین! یان لەكاتێك دا كە بەرژەوەندی بابای زەكات وەرگر لەوەرگرتنی پارەو نرخ دابێ نەك خودی شتەكە، ئەوە لەو حاڵەتانەدا دروستە نرخ‌و بەها لەجیاتی زەكات بدرێ، ئەم ڕایەش جگە لە (أحمد)[288] لەقسەیەكی داو (شافعي)[289] لەچەند حاڵەتێكی تایبەت دا، هەركام لە (ابن تیمیة)[290] و (شوكاني)[291]یش هەڵیان بژاردوە، (ابن تیمیة) لەوبارەوە گوتوویەتی: (و معلومٌ أن مصلحة وجوب العَيْنِ قدْ يُعارِضُها أَحْياناً فِي القِيمَةِ من المَصْلَحَةِ الراجِحَة وفي العينِ من المَشَقَّةِ المَنْفِيَّة شَـرْعاً)، واتە: وە ئاشكرایە كە جاری وا هەیە پێویست بوونی زەكات لەخودی شت دا لەگەڵ بەرژەوەندی چاكتر بەهۆی دانی نرخ (قیمة) وە، وە زەحمەت‌و گرفتاری ناپەسەند لەڕووی شەرعەوە، لەسۆنگەی زەكات دەركردن لەخودی شتەكەدا دژ دەوەستن‌و تێك دەگیرێن.

(مەبەست ئەوەیە كە مادام جاری وا هەیە دانی نرخ لەبری خودی شتەكە بەرژەوەندی چاكترو گەورەتری تێدایە، وە دانی خودی شتەكە دەبێتە مایەی زەحمەت‌و نارەحەتی، كەواتە لەو حاڵەتانەدا درانی نرخ لەجیاتی خود (دَفْعُ القِيمَةِ بَدَلَ العَيْنِ) دروستە)[292].



[287] بڕوانە: (الفقه السنة) ج1ص518.

[288] بڕوانە: (مجموعة الفتاوی) ج25ص30.

[289] بڕوانە: (المجموع) ج5ص386، 387، وە بڕوانە: (الفقه الاسلامي..) ج3ص1938، كەلەسەر زمانی شافیعی‌یەكان ئەو حاڵەتانە لەپێنجان دا كورت هەڵدێنێ.

[290] بڕوانە: (مجموعة الفتاوی) ج25ص31.

[291] بڕوانە: (نیل الاوطار) ج4ص216، 217.

[292] بۆ ماڵی بازرگانی زۆربەی زانایان بەپێویست یان بەدروستی دەزانن كە لەنرخ زەكات بدرێ، بڕوانە: (المغني) ج2ص625.

٦-لەزەکاتی ئاژەڵ دا ئەو ئەندازەیەی کە دەکەوێتە نێوان دوو ئەندازەوە کە زەکاتیان تێدا دیاریکراوە، زەکاتی لێنادرێ کەپێی دەگوترێ (وَقَصْ): سەرجەم[293] زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە هەروەك چۆن هیچ کام لە جۆرەکانی ئاژەڵ هەتا ژمارەیان نەگاتە ئەندازەی (نصاب) زەکاتیان ناکەوێتە سەر بەهەمان شێوەیش ئەو ژمارەیەی کە لە (نصاب) زیاد دەبێ هەتا نەگاتە ئەو ئەندازەیەی کە شەرع دیاری کردوە بۆ زەکات لێدران زەکاتی لێناکەوێ.

بۆ ڕون کردنەوەی مەبەست دەڵێین:

ا-بێگومان حووشتر زەکاتیان لێناکەوێ هەتا ژمارەیان نەگاتە پێنج[294] (٥) حوشتری کامڵ، جا ئەوکاتە یەك سەر مەڕ لەزەکاتیان دەدرێ، پاشان کە گەیشتنە دە (١٠) مەڕێکی دیکەیان زەکات لێدەدرێ، بەڵام ئەگەر هەر نۆ (٩) سەربن بەس یەك سەر مەڕەکەیە، ئەو چوار سەرەش پێیان دەگوترێ (اوقاص) کە کۆی (وَقَصْ)[295] و زانایان تێکڕا دەڵێن (عَفْو)یەو زەکاتیان لێنادرێ.

ئنجا زەکاتی حوشتران هەر لەپێنج سەران مەڕێك بەردەوام دەبێ هەتا دەبنە بیستو پێنج (٢٥) سەر کە ئەوکاتە هەتا دەگەنە سیوشەش (٣٦) سەر بەچکە حوشترێکی مێیەیەك ساڵ تەواو کردووی پێ لەدوو ساڵ ناو (بِنْتُ مَخَاضْ) یان لێدەدرێ[296]، کەواتە لەحوشتری بیستو شەشەم (٢٦) ەوە هەتا سیوپێنجەم (٣٥) دیسان زەکاتیان لێنادرێ چونکە کەوتوونە نێوان دوو ئەندازەی فەرزەکە کە (٢٥) و (٣٦)ن.

ب- بۆ زەکاتی ڕەشەوڵاخ (مانگاو گاو گامێشو کەڵ)یش دیارە هەتا نەگەنە سی (٣٠) سەر زەکاتیان لێناکەوێو کە بوونە سی (٣٠) سەر گۆلکێکی نێر یان مێ یەکساڵ (تَبِيْع أو تَبِيْعَة) یان لێدەدرێو کەبوونە چل (٤٠) سەر نێنگوونێك[297] (مُسِنَّة) یکیان لێدەدرێ، کەواتە لەسیویەکەم (٣١) ەوە تا سیو نۆیەم (٣٩) (اوقاص)نو زەکاتیان لێ ناکەوێ.

---

[293] بڕوانە: (الفقه الأسلامي وادلته) ج٣ص١٩٤٢، ١٩٤٣، ط٤، وە: (فقه السنة) ج١ص٥٠١، ٥٠٢.

[294] وەك لەو فەرموودەیەدا هاتوە کە (بخاري) لە (انس) ەوە هێناویەتی، بڕوانە: (الأدلة الرضية) ص١١٦.

[295] وشەی (وَقَصْ) لەئەسڵی زمان دا بەمانای ناتەواوی (نَقْص) و پەراگەندەیی (تَفَرَّق) هاتوە، بڕوانە: (المعجم الوسيط) ص١٠٤٩.

[296] وەك (بخاري) لە (انس)ی گێڕاوەتەوە، بڕوانە: (الأدلة الرضية) ص١١٦.

[297] وەك (أصحاب السنن) لە (معاذ) یان گێڕاوەتەوە، بڕوانە: (نيل الأوطار) ج٤ص١٩١.

ج- بۆ زەكاتی مەڕو بزنیش هەتا نەبنە چل (٤٠) سەر هیچیان لیٚناكەویٚو كەبوونە چل سەر سەریٚكیان لیٚ دەدریٚ، پاشان هەتا نەبنە سەدوبیستو یەك (١٢١) سەر هیچی دیكەیان لیٚناكەویٚ، بەڵام كە بوونە (١٢١) دوو سەریان لیٚدەدریٚن، پاشان كە بوونە دوو سەدو یەك (٢٠١) سیٚ سەرو، كە بوونە سیٚسەدویەك (٣٠١) یش چوار سەرو ئنجا لەهەر سەد (١٠٠) سەر سەریٚك[٢٩٨]، كەوابیٚ: لەچلو یەكەمەوە هەتا سەدوبیست كە هەشتا (٨٠) سەرە بە (اوقاص) دادەنریٚنو زەكاتیان لیٚنادریٚ، هەروەها لە (١٢٢)ەوە تا (٢٠٠) و، لە (٢٠٢)ەوە تا (٣٠٠)و، لە (٣٠٢)ەوە هەتا (٣٩٩) بەهەمان شیٚوە هەموویان بە (اوقاص) دادەنریٚن و زەكاتیان تیٚدا نیە.

## ٧- دیاریكردنو ئەندازەگیری (نصاب)ی خورماو تریٚ بەگۆترەو مەزەننە دەبیٚ نەك بەپیٚوان:

زۆربەو[٢٩٩] جەماوەری زانایان ڕایان وایە كە دیاریكردنی (نصاب)ی ئەندازەی زەكات وەرگیران لەخورماو تریٚدا باشتر وایە - هەندیٚكیشیان[٣٠٠] دەڵیٚن پیٚویستە - كە بەگۆترەو مەزەننە بیٚت لەكاتی پیٚگەیشتنیان دا، بەڵام لەلایەن بابایەكی پسپۆڕو شارەزای ئەمیندارو[٣٠١] دادگەرەوە، بەڵام حەنەفییەكان[٣٠٢] ئەو قەبلاندن (خَرْص)ە بەدروستو ڕەوا نازانن، ئەوەندە هەیە دەڵیٚن ئەگەر بۆ ترساندنو ئاگاداركردنەوەی خاوەنیان بیٚ باشە!

بەڵام بیٚگومان ڕای جەماوەری زانایان بەهیٚزترە چونكە چەندان دەقیان بەدەستەوە هەن، حیكمەتی ئەو كارەش ئەوەیە كە خورماو تریٚ پاش پیٚگەیشتنیان خەڵك دەست دەكات بەلیٚخواردنیان، جا بۆئەوەی زیان بەمافی زەكات وەرگران نەگات وا باشە هەر لەسەرەتاوە هەقو مافی ئەوان لەو باخو ڕەزانەدا[٣٠٣] دیاری بكریٚ.

---

[٢٩٨] وەك (بخاري) لە (انس) و ئەویش لە (ابوبكر الصديق) ەوە خوا لیٚیان ڕازیبیٚ گیٚڕاویانەتەوە، بڕوانە: (الأدلة الرضية) ص١١٨.

[٢٩٩] بڕوانە: (الفقه الأسلامي) ج٣ص١٩١٠تا١٩١٣، ط٤، وە (فقه السنة) ج١ص٤٩٣، ٤٩٤.

[٣٠٠] سەرچاوەی پیٚشوو و هەمان بەرگو لاپەڕە، كە ئەمە ڕای (مالك) ەو (شافعي و احمد) بەسوننەتی دەزانن.

[٣٠١] بڕوانە: (الفقه الأسلامي..) ج٣ص١٩١١، ط٤.

[٣٠٢] بڕوانە: (نيل الأوطار) ج٤ص٢٠٦، ٢٠٧.

[٣٠٣] بەڵام دانەوێڵەو میوەجاتی دیكە دروست نیە بقەبڵیٚنریٚ چونكە وەك تریٚو خورما بەرچاو نیەو دیار نیە، بڕوانە: (المغني..) ج٢ص٥٧٢.

بەلام پێویستە بابای قەبڵێنەر (خارِص) ئەندازەی سێیەك یان چواریەكی ئەو میوەو بەربوومە حیساب نەكات چونكە خاوەن باخ و ڕەز بۆ خۆی و خێزانی و میوانەكانی و ڕێبوارو گیاندارانیش لێی دەخۆن و ئەگەر لەكاتی قەبلاندن دا هەمووی بقەبڵێنرێ بابای خاوەن دووچاری زیان و تەنگ پێهەڵچنران دەبێ.

ئەمەش چەند دەقێك لەوبارەوە:

* (عن عتاب بن أسيد أن النبي ﷺ يَبْعَثُ علىٰ الناسِ مَنْ يَخْرُصُ عليهم كُرومَهُمْ وثِمارَهُمْ) رواه الترمذي وان ماجة.

* (عن سَهْلِ بن أبي حَثْمةَ قال: قال رسول الله ﷺ: إذا خَرَصْتُمْ فَخُذوا ودَعُوا الثُلُثَ فإنْ لَمْ تَدَعُوا الثُلُثَ فَدَعُوا الرُّبُعَ) رواه الخمسة الا ابن ماجة.

*(عن عائشة قالت: كان رسول الله ﷺ يَبْعَثُ عبدالله ابن رواحة فَيَخْرُصُ النَّخْلَ حين يُطيبُ قَبلَ أن يُؤْكَلَ منه، ثم يُخَيِّرُ يهودَ يأخذونَهُ بذلك الخَرْصِ أو يَدْفَعونَهُ اليهم بذلك الخَرْصِ لكي يُحصيَ الزكاةَ قَبْلَ أنَ تؤكَلَ الثمارُ وتفرَّقَ) رواه احمد وابوداود.

وەك لەم سێ دەقەدا دەبینین پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانیكردوە بەمەزەنندەكردن و قەبلاندنی بەروبوومی خورماو ترێ بەرلەوەی لێی بخورێ و پرژوبلاو بێتەوە بەملاولادا بەلام لەهەمان كاتیش دا فەرمانی كردوە كە ئەندازەی سێیەك یان بەلای كەمەوە چوار یەك لەو خەملاندنە ببوێرن و نەیهێننە نێو حیسابەوە.

## ٨-حوكمی خواردنی خاوەن كشتوكاڵ و میوە لەبەروبوومەكەی پێش زەكات لێدانی:

زانایان لەوبارەشەوە ڕایان جیاوازە، بەشێكیان كە (شافعي و احمد و ليث)[٢٠٤] یان لەنێودان و (ابن حزم)[٢٠٥] یش بەعەزمێكی جەزمەوە لەگەڵیانە، دەڵێن: دروستە لێی بخوات و دواییش لەسەری حیساب ناكرێ، بەلام (مالك و ابوحنيفة) دەڵێن: بۆی نیەو ئەگەر لێشی خوارد لەكاتی زەكات دان دا لەسەری حیساب دەكرێ![٢٠٦]

پێشم وایە كەڕای یەكەم وێچووترو كردەییترو لەگەڵ ڕووحی گشتی شەرع دا گونجاوترە.



[٢٠٤] بڕوانە: (المغني والشرح الكبير) ج٢ص٥٧١، ٥٧٢.

[٢٠٥] بڕوانە: (المحلى شرح المجلى) ج٥ص١٧٨، مسألة: ٦٥٨.

[٢٠٦] بڕوانە: (الفقه السنة) ج١ص٤٩٥.

### ٩-چ کاتێ زەکات دان لەبەروبوومی کشتوکاڵ دا پێویست دەبێ؟!

بەڕای زۆربەو جەماوەری زانایان زەکات لەوکاتەوە لەدانەوێڵەدا فەرز دەبێ کەپێگەیشتو لەمیوەجاتیش دا لەوکاتەوە کە دەگاتو بەکەڵکی خواردن دێت[٢٠٧].

بەڵام دانەوێڵە هەتا پاك نەکرێو میوەش هەتا ئیشك نەبێ زەکاتیان لێ دەرناکرێ[٢٠٨].

هەرکاتێکیش خاوەنی دانەوێڵە پاش پێگەیشتنو خاوەنی میوەجات دوای گەیشتنی دانەوێڵەو میوەکانی خۆیانیان فرۆشت ئەوە زەکاتەکانیان لەئەستۆی خۆیان دایە نەك لەئەستۆی کڕیاردا[٢٠٩].

شایانی باسیشە کە مەسرەفو کرێی ڕەنێو هێنانو پاك کردنو هەڵگرتنی دانەوێڵەو میوەش هەر لەسەر خاوەنەکانیانەو نابێ لە (نصاب) کەم بکرێتەوە، چونکە بەروبوومی کشتوکاڵو میوەجاتیش وەك ئاژەڵ وایەو هەروەك چۆن کرێی لەوەڕاندنو پارێزگاری لێکردنو سەرپەرشتیکردنی ئاژەڵ لەسەر خاوەنیەتی، دانەوێڵەو میوەش بەهەمان شێوە[٢١٠].

### ١٠-لەوەرگرتنی زەکات دا پێویستە دادگەری بکرێو بەرژەوەندیو مافی هەرکام لەزەکات وەرگرو زەکات دەر ڕەچاو بکرێن:

بەڵێ ئیسلام بەرنامەی خوای دادگەرو کاربەجێیەو لە تێکڕای دەستوورو یاسایەکانیدا دادگەری موتڵەق هەیەو بەرژەوەندی هەموو لایەك ڕەچاو دەکات، لە مەسەلەی زەکات وەرگرتنیش دا بەهەمان شێوە نە لەسەر بابای زەکات دەر پێویست دەکاتو نە لە کاربەدەست (عامِلْ) ی زەکات وەرگریش قبووڵ دەکات کە چاکترین جۆریماڵیان بەزەکات دابنرێ، وە لەلایەکی دیکەشەوە دیسان لێشیان ڕازی نابێو قبووڵ ناکات کە کامەی خراپو لاتە بەزەکات دابنرێ، بەڵکو دەڵێ دەبێ میانەڕەوی (إعتدال) ڕەچاوبکرێو[٢١١] کارێك بکرێ نەشیش بسووتێ نە کەباب.

دیارە لەوبارەشەوە دەقی قورئانو سوننەت زۆرن بۆ وێنە:

*(يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَنفِقُوا مِنْ طَيِّبَاتِ مَا كَسَبْتُمْ وَمِمَّا أَخْرَجْنَا لَكُمْ مِنَ الْأَرْضِ وَلَا تَيَمَّمُوا الْخَبِيثَ مِنْهُ تُنفِقُونَ وَلَسْتُمْ بِآخِذِيهِ إِلَّا أَنْ تُغْمِضُوا فِيهِ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ حَمِيدٌ) البقرة: ٢٦٧.

---

[٢٠٧] بڕوانە: (الفقه الأسلامي..) ج٣ص١٨٩٤، ١٨٩٥، ط٤.

[٢٠٨] هەمان سەرچاوەو بەرگ ص١٩٠٩، وە: (المغني) ج٢ص٥٧٢.

[٢٠٩] بڕوانە: (المغني) ج٢ص٥٧٢، وە: (الفقه الأسلامي..) ج٣ص١٩٠٩، ط٤.

[٢١٠] بڕوانە: (فقه السنة) ج١ص٤٩٦، ٥٠٢.

[٢١١] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە لەو سامانە پاکو چاکەی کەوەدەست تان هێناوەو لەوەی کە لەزەوی بۆمان وەدەرناون ببەخشن، وە لەوەی کە بەدوخراپە تێیدا، مەخەفتێن لەوە دەبەخشن بەڵام مەگەر بەناچاری چاوی لێ‌بنووقێنن ئەگەرنا ئامادەنین وەری‌بگرن وەبشزانن کە خوا دەوڵەمەندو ستایش کراوە.

*(عن سهل بن حنيف عن أبيه قال: نهى رسول الله ﷺ عن لَوْنَيْنِ من التَّمْرِ: الجعرور ولَونُ الحُبَيْق) رواه ابوداود والنسائي وغيرهما.

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ دووجۆرە خورمای قەدەغە کردن کە بۆ زەکات وەربگیرێن کە (جوعرور)[312] و (لەونولحوبەیق)[313]ن.

*(عن عبدالله بن معاوية الغاضري أن النبي ﷺ قال: ثلاثٌ من فَعَلَهُنَّ فَقَدْ طعِمَ طَعْمَ الأيمانِ: مَن عَبَدالله وحده، وأن لا اله الا هو، وله أعطى زكاة ماله طَيِّبةً بها نَفْسُهُ رافِدةً عليه كُلَّ عامٍ، ولايُعطي الهَرِمةَ، ولا الدَّرِنَةَ، ولا المَرِيْضَةَ، ولا الشَّرَطَ ولا اللَّئِيمَةَ، ولكِنْ منْ وَسَطِ أَموالِكُمْ، فان الله لم يَسْألكم خَيْرَهُ ولَمْ يَأْمُرْكُمْ بِشَرِّهِ) رواه ابوداود والطبيراني بإسناد جيد.

واتە: سێ شت هەن هەرکەسێك جێبەجێیان بکات ئەوە تامی ئیمانی چێژتوە: کەسێك تەنیا خوا بپەرستێ، وە – بڕوای وابێ – کە بێجگە لەوی هیچ پەرستراونێن، وە بەدڵێکی خۆشەوە هەموو ساڵێك زەکاتی ماڵەکەی بەخوا دەبەخشێو دڵ و دەروونی دەبێتە هاندەری بۆ خێرو چاکە، ئەئاژەڵی پیرو نەهی گەرو نەهی گچکەو خراپو نەهی کەم شیر ئاکاتە زەکات، بەڵکو –دەبێ زەکات – لەنێوەندی ماڵەکانتان بدەن، چونکە بێگومان خوا نەئەوەی هەڵبژاردەیەتی لێی داواکردوونو نەبەخراپترینیشی فەرمانی پێکردوون.

*(.... فان هم أطاعوك لذلك فَأَعْلِمْهُمْ أن الله أفْتَرَضَ عليهم صَدَقَةً تُؤْخَذُ مِنْ أغنياءِهِمْ فَتُرَدُّ علىٰ فُقَرائِهِمْ فانْ أطاعوك لذٰلِكَ فأيّاك وكَرائِمَ أمْوالِهِمْ واتَّقِ دَعْوَةَ المَظْلُومَ فانه ليس بَيْنَها وَبَيْنَ الله حِجابٌ) رواه الجماعة عن ابن عباس.

ئەم فەرموودەیەمان پێشتر هێناوەو ئەوەی جێی مەبەستمانە لێرەدا رستەی: (فَأياك وكَرائِمَ أمْوالِهِمْ) ە، واتە: توخنی ماڵە هەڵبژاردەو هەرە چاکەکەیان نەکەوی – کە بەزەکات لێیان وەربگری!



[312] (جعرور): جۆرە خورمایەکی رەقو وردە، بڕوانە: (المعجم الوسيط) و (المنجد) وشەی (جَعَرَ).

[313] (لون الحُبَيْق) یش بەهەمان شێوە، کە بەکوردی (قەسپەرەقە)یان پێ‌دەڵێنو زیاتر دەکرێنە ئالیکی حوشتر، بڕوانە: (نيل الأوطار) ج٤ص٢٠٧.

(شوكاني) لەوبارەوە گوتوویەتی: (لەم فەرموودەیەدا بەڵگەی ئەوە هەیە کە دروست نیە کار بەدەست (عامل)ی زەکات وەرگر کامەی هەڵبژاردەو چاکە وەریبگرێ، چونکە حیکمەتی زەکات دەستبار بۆ گرتنی هەژارانە بۆیە ئەو ڕەفتارە کارێکی گونجاو نیە، وە گوتەی: (اتقوا دعوة المظلوم) لە پاڕانەوەی ستەم لێکراو خۆت بپارێزە، ئاگادار کردنەوەیە بۆ دەستگرتنەوە لەهەر جۆرە ستەمێك، نهێنی ئەوەش کە لەدوای ئەوەوە باسی کردوە کە ماڵی هەڵبژاردە وەرنەگرێ، ئاماژەیە بۆ ئەوە کە وەرگرتنی ئەوجۆرە ماڵە بەزەکات، ستەمە..)[٣١٤].

پێویستە ئەوەش بگوترێ کە زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە ئەگەر ماڵەکە – جا هەر جۆرێك بێ – هەمووی باش بوو دەبێ زەکاتەکەشی هەروابێ، وە ئەگەر هەمووشی خراپ بوو زەکاتەکەشی وەك خۆی بێ، وە ئەگەر باش و خراپ تێکەڵ بوو دیسان زەکاتەکەشی هەروا، مەگەر بابای زەکات دەر بەخۆشی خۆیو ئیرادەی ئازادی خۆی زەکاتی ماڵەکەی لەجۆری چاك هەڵبژێرێ، ئەگەرنا ماڵەکەی چۆن بێ زەکاتەکەشی بەپێی خۆی لێدەردەکرێ[٣١٥].



[٣١٤] بڕوانە: (نیل الأوطار) ج٤ص١٧١.

[٣١٥] بڕوانە: (المحلی) ج٥ص١٨٤تا ١٨٧، مسألة: ٦٧١، وە بڕوانە: (المغني) ج٢ص٥٧٣، ٥٧٤.

# چوارەم: چەند جۆرە زەکاتێك

## ١-ئایا زەکات لەماڵی قەرز دەدرێ؟!

**ماڵی قەرز دوو حاڵەتی هەن:**

**یەکەم:** قەرزەکە لەلای کەسێکە کە ئامادەییو توانای دانەوەی هەیە جا چ لەکاتی دیاریکراوی خۆیدا، وە چ هەرکاتێك خاوەنەکەی داوای بکاتەوە، ئەم جۆرەیان زۆربەی زانایان[٣١٦] دەڵێن: پێویستە زەکاتی لێبدرێ جا هەرچی (شافعي)یە دەڵێ: پێویستە لەگەڵ تەواوبوونو وەرسووڕانەوەی ساڵ دا زەکاتەکەی بدات[٣١٧]، بەڵام ئەوانی دیکە دەڵێن: پاش وەرگرتنەوەی ماڵەکەی زەکاتی لێدەردەکات، بەڵام دەربارەی ئەندازەی ماڵە وەرگیراوەکەو ئەندازەی زەکات لێدانەکە چەند وردە جیاوازییەکیان هەن[٣١٨].

**دووەم:** قەرزەکە لەلای کەسێکە کە یان هەردانی پێداناهێنێ، یان دانیپێدا دێنێ، بەڵام مکووڕە لەسەرنەدانەوەی، یان هەر تەنگدەستەو بۆی نادرێتەوە، ئەمیشیان زۆر لە زانایان دەڵێن: زەکاتی لەسەر نیە،[٣١٩] بەڵام هەندێکیان[٣٢٠] دەڵێن: زەکاتی هەر لەسەرە ئەوەندە هەیە هەتا نەیەتەوە دەستیو وەرینەگرێتەوە لەسەری پێویست نابێ زەکاتی لێبدات[٣٢١].

(ابن حزم)یش ڕای وایە کە قەرزەکە هەرجۆرێك بێ هەتا وەرینەگرێتەوە زەکاتی لەسەر نیە، ئنجا کەوەریگرتەوە پاش ساڵ بەسەردا سووڕانەوە زەکاتی ساڵێکی لێدەردەکات، هەرچەندە چەندەها ساڵیش لەلای بابای قەرزدار مابێتەوە[٣٢٢].

---

[٣١٦] بڕوانە: (الفقه الأسلامي..) ج٣ص١٨٣٠تا١٨٣٣، ط٤، وە بڕوانە: (المغني) ج٢ص٦٣٨.

[٣١٧] بڕوانە: (المحلى) ج٦ص٦٧، وە بڕوانە: (الفقه السنة) ج١ص٤٧٤.

[٣١٨] بڕوانە: (المحلى) ج٦ص٦٦، ٦٧، وە بڕوانە: (الفقه الأسلامي..) ج٣ص١٨٣٠تا ١٨٣٣، ط٤.

[٣١٩] بڕوانە: (الفقه الأسلامي) ج٣ص١٨٣٣، وە (فقه السنة) ج١ص٤٧٤.

[٣٢٠] دوای وەرگرتنەوەش (احمد) دەڵێ: زەکاتی هەموو ساڵەکانی لەسەرە، بڕوانە: (الفقه الأسلامي..) ج٣ص١٨٣٢، ١٨٣٣. بەڵام (مالك و اوزاعي و ليث) دەڵێن: زەکاتی ساڵێکی لێدەدات، بڕوانە (فقه السنة) ج١ص٤٧٥.

[٣٢١] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[٣٢٢] بڕوانە: (المحلى) ج٦ص٦٦، ٦٧، مسالة: ٦٩٦.

## ٢-ئایا بابای قەرزدار زەكات دانی لەسەرە؟!

زۆربەی[٣٢٣] هەرە زۆری زانایان ڕایان وایە كە بابای قەرزدار زەكاتی لەسەر نیە، بەڵام بەمەرجێك قەرزەكە هێندە ببێ كە بەئەندازەی ئەو ماڵە بێ كە زەكاتی لێدەدات، یان هێندە ببێ كە لە (نصاب)ی زەكات لێكەوتن دایشكێنێ و بیهێنێتە خوارو جگە لەوەش كە زەكاتەكەی لێدەدرێ - ئەگەر قەرزداریی ڕێگر نەبووایە - ماڵێكی دیكەی نەبێ كەبایی قەرز لێدانەوە یان ڕاست كردنەوەو قەرەبووكردنەوەی (نصاب) ە كە بكات[٣٢٤].

جا حەنبەلییەكان[٣٢٥] دەڵێن: قەرزدار نەبوون بەو شێوەیەی كە ڕوون كرایەوە مەرجی زەكات لێدرانی هەموو جۆرەكانی ماڵ و سامانە بەئاشكراو پەنهانەوە، بەڵام حەنەفییەكان[٣٢٦] دەڵێن: مەرجی زەكات لێكەوتنی هەموو جۆرەكانە بێجگە لەبەروبوومی كشتوكاڵ و میوە، وە مالیكییەكانیش[٣٢٧] دەڵێن: تەنیا مەرجی زەكات لێدرانی ماڵی نەغدینەیە.

هەندێكیش لەزانایان كە شافیعییەكان[٣٢٨] و (ابن حزم)[٣٢٩]یان لەنێودان، دەڵێن بەهیچ ڕەنگێك قەرزداری پەرچ نیە لەڕێی زەكات لێكەوتن داو ئەگەر ئەو قەرزەی كە لەسەریەتی لەسەرجەم ئەو ماڵ و سامانەش زیاتر بێت كە زەكاتی لێكەوتوە، دەبێ زەكاتەكەی هەر بدات!! پێم وایە بەئاشكراش دیارە كەڕای جەماوەر بەهێزو پێزترو ماقووڵترە! ئاخر زەكات لەسەر بابای دەوڵەمەند فەرزە: (تُؤْخَذُ مِنْ أَغْنِيَاءِهِمْ) و قەرزداریش مادام زەكاتی پێڕەوابێ: (.. والغارِمِيْنَ) دیارە دەوڵەمەند نیە!

---

[٣٢٣] بڕوانە: (المغني) ج٢ص٦٣٥، كە گوتوویەتی: ئەمە ڕای: (لیث و مالك و ثوري و اوزاعي واسحاق وابوثور و اصحاب الراي -كە مەبەستی ابوحنیفة و هاوەڵانیەتیی - وأحمد) ە، وە بڕوانە: (ص:٦٣٦)ی هەمان بەرگ.

[٣٢٤] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[٣٢٥] بڕوانە: (الفقه الأسلامي وادلته) ج٣ص١٨٠٦، ١٨٠٧.

[٣٢٦] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[٣٢٧] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[٣٢٨] بڕوانە: (المجموع) ج٥ص٣٠٩.

[٣٢٩] بڕوانە: (المحلی) ج٦ص٦٥، ٦٦، مسالة: ٦٩٥.

## ٣-زەکاتی مارەیی (زكاة الصَّداق):

زانایان دەربارەی زەکات دان لەمارەیی (مَهْر، صِداقْ) ئافرەت، رایان جیاوازە، هەرچی (ابوحنیفة)یە رای وایە کە مارەیی ئافرەت مەگەر وەریگرتبێ ئەگەرنا زەکاتی تێدا نیە،[٣٣٠] بەڵام حەنبەلیەکان رایان وایە کە مارەیی حوکمی قەرزی هەیە کە لەخاڵی یەکەم دا باسمان کرد[٣٣١]، شافیعی و شافیعیەکانیش رایان وایە کە مارەیی ئافرەت هەرچۆن بێ زەکاتی هەر لەسەرە ئافرەتەکە گوازرابێتەوە یا نا، وەمارەییەکە وەرگیرابێ یان هەر قەرزبێ و لەئەستۆی مێردەکەی دابێ،[٣٣٢] ئاشکراشە کە مەرجی زەکات لێکەوتنی مارەیی (مَهْر)یش وەك باقی ماڵی نەغدینە ئەگەر نەغدینە بێ، یان هەرجۆرێکی دیکە بێ و چ شتێکیان تێدا بەمەرج گیرابێ بۆ زەکات لێدران ئەویش هەمان مەرجی تێدایە، کە وەك پێشتر باسمان کرد بۆ بەروبوومی کشتوکاڵ و میوەجات گەیشتنە ئەندازەی (نصاب) ەو بۆ جۆرەکانی دیکەش وێڕای (نصاب) ساڵ بەسەردا سوڕانەوەشە، بێجگە لەخەزنەو کانزایەکان وەك پێشتر باسمان کرد، کە زۆربەی زانایان ساڵ بەسەردا وەرسووڕانەوەیان بۆ بەمەرج نەگرتوون.

## ٤-زەکاتی کرێی خانوو و بەرەی بەکرێدراو (زكاة الدور المؤجرة):

زاناو شەرعزانانمان خوا لێیان خۆش بێ دوای ئەوەی لەسەر ئەوە یەکدەنگ بوو ون کە بابای بەکرێدەر (مُؤَجِّرْ) زەکاتی ئەو کرێیەی لەسەر فەرزە کە لەبەکرێدانی خانوو و بەرەو هەر شتێکی دیکەدا وەریدەگرێ بەمەرجی گەیشتنە ئەندازەی (نصاب)، دەربارەی کات و چۆنیەتی زەکات دانەکە رایان جیاوازە:

( ابوحنیفة و مالك)[٣٣٣] رایان وایە لەسۆنگەی ئەوەوە کە بابای بەکرێدەر هەتا ماوەی بەکرێدان (إجارة)ەکە تەواونەبێ کرێیەکەی ناکەوێ، زەکاتی ئەو کرێیەشی لەسەر فەرز نابێ هەتا وەرینەگرێ و ساڵی بەسەردا نەسووڕێتەوە.

بەڵام حەنبەلیەکان[٣٣٤] رایان وایە کە بابای بەکرێدەر هەر لەودەمەوە کە بەڵێن نامە (عَقْد)ەکە ئیمزا دەکەن، دەبێتە خاوەنی کرێیەکە، جا ئەگەر زوو وەریگرت ئەوە زەکاتەکەی لێ دەردەکات، ئەگەرنا حوکمی قەرزی دەبێ و هەرکاتێك وەریگرت لە دەمی ئیمزاکردنی بەڵێن نامە (عقد) ەکەوە حیسابی دەکات بۆ زەکات لێدان.

---

[٣٣٠] بڕوانە: (فقه السنة) ج١ص٤٧٦.

[٣٣١] بڕوانە: (المغني والشرح الكبير) ج٢ص٦٤٢، ٦٤٣.

[٣٣٢] بڕوانە: (المجموع) ج٥ص٢٠،٢١، وە بڕوانە: (فقه السنة) ج١ص٤٧٧.

[٣٣٣] بڕوانە: (فقه السنة) ج١ص٤٧٧.

[٣٣٤] بڕوانە: (فقه السنة) ج١ص٤٧٧.

شافیعی‌یەکانیش[٣٣٥] چەند بیروڕایەکیان لەوبارەوە هەن کە لە ڕای حەنبەلی‌یەکانەوە نیزیکن. ئنجا پێویستە ئەوەش بگوترێ کە وەك شەرعزانانی هاوچەرخمان خوا پاداشتیان بداتەوە دەڵێن لەم ڕۆژگارەدا سەرمایەکان ڕوویان پێکراوەتە چەندان جۆرە بوار کە لە کاتی خۆی نەبوو ون، بۆ وێنە:[٣٣٦]

ا- دروست کردنی بینایەی گەورە گەورە (العِمارات والشُّقَقْ) بۆ بەکرێ‌دان و تێدا حاوانەوەی چەندان خێزان و ماڵ.

ب-هۆتێلەکان (الفَنادِقْ)، کە ڕێبوارەکان بۆ چەند شەوێك یان چەند هەفتەیەك تێیان دا دەمێننەوەو ئیسراحەت دەکەن.

ج-کارگەو فابریقەی جۆراوجۆر بۆ بەرهەم هێنان، کە بەکرێ دەدرێن.

د-هۆیەکانی گواستنەوەو هاتوچۆ، وەك: فڕۆکەو کەشتی و سەییارەو .. هتد.

ه-کێڵگەو مەزرای تێدا بەخێوکردنی مەڕو مانگاو پەروەدەکردنی پەڕەور.

جا بێگومان خودی ئەو شتانە مادام بازرگانی‌یان پێنەکرێ زەکاتیان لێ نادرێ، بەلام بەتەئکید دەبێ لەداهات و بەرهەمەکانیان بدرێ، هەرچەندە کاتی خۆی ئەوجۆرە شتانە نەبوو ون و شەرعزانانی پێشوو لە بارەیانەوە نەدواون، وە ئەوەی باسیشیان کردوە لە بارەی ئەو شێوەو چۆنیەتی‌یە سادەیانەوە بووە کە ئەوکاتە بوویانە، بۆ وێنە کە گوتوویانە:

(لازكاة في دُورِ السُّكنىْ، وأثـاثِ المَنْزِل، وأدوات الحِرْفَـةِ، ودَوابُّ الرُّكـوبِ..)[٣٣٧]، واتە: زەکات لەخانووبەرەی تێدا نیشتەجێ‌بوون و، کەل‌وپەلی نێوماڵ و، ئامرازەکانی پیشەو کارو، ولاخەکانی سواری، نادرێن مەبەستیان ڕۆژگاری خۆیان بووە، کە هەرکام لەو شتانە لەو کاتی‌دا شێوەیەکی سادەو ساکاریان هەبووەو لەگەڵ هی ئێستا ناچنە تەرازووەوەو زۆر جیاوازن.

دیارە هەر بۆیەش هەرکام لە: کۆنگرەی دووەمی زانایانی مسوڵمان (مؤتمر علماء المسلمين الثاني) و کۆنگرەی دووەمی توێژینەوە ئیسلامی‌یەکان (مؤتمر البحوث الأسلامي الثاني) کە لەساڵی (١٣٨٥-١٩٦٥ز) دا بەستران، تێیاندا بڕیاردرا کە:



[٣٣٥] بڕوانە: (المجموع) ج٦ص٢٠، ٢١.

[٣٣٦] بڕوانە: (الفقه الأسلامي وادلته) ج٣ص١٩٤٧، ط٤.

[٣٣٧] بڕوانە: (الفقه الأسلامي وادلته) د.وهبه الزحيلي، ج٣ص١٩٤٧، الطبعة الرابعة.

﴿ هەموو ئەو ماڵو داراییە گەشەکردووانە (الأموال النامية)ی کە هیچ دەقێکیان لەسەر نیەو هیچ ڕایەکی فیقهیی یان لەسەر نەگوتراوە - کە زەکاتیان لێبدرێ - حوکمەکەیان ئاوایە: (زەکات لەخودی بینایە بەرهەمدارەکانو کارخانەکانو کەشتیو فڕۆکەکانو هاو وێنەکانیان دا نیە، بەڵام لەبەرهەمە ساغ کراوەکانیان دا هەیە، دوای ئەوەی مەرجی (نصاب) و ساڵ بەسەردا سووڕانەوەیان تێدا دێتەدی، دیارە ئەندازەی زەکاتەکەشیان بریتیە لەچل یەك (٤٠/١) پاش تەواوبوونی ساڵ، واتە: (٢,٥٪) لەسەدا دوو و نیوی بەرهەمی ساغ کراوەیان.. وەك زەکاتی بازرگانی وماڵی نەغدینە، وە لەو شتانەدا کەچەند هاوبەش (شريك)ێك تێیان دا بەشدارن، نابێ تەماشای کۆی هەموو قازانجەکانی ئەو پڕۆژانە بکرێ، بەڵکو تەماشای بەشی هەر بەشدارێك بەجیادەکرێ. (واتە: ئەگەر بەشی هەر کامێکیان نەگەیشتبێتە ئەندازەی (نصاب) زەکاتی لێنادرێ) ﴾[٣٣٨]

## ٥-زەکاتی زەوییەکی بەکرێگیراو (زكاة الارض المُستأجَرَة):

زانایان لەوبارەوە کە ئایا ئەگەر کەسێك زەوییەکی بەکرێگرت یان بەهەر شێوەیەکی دیکە وەریگرتو کشتوکاڵی تێدا کرد، زەکاتەکەی لەسەر خاوەنی زەوییە یان لەسەر بابای جوتیار (زارِعْ)؟! ڕایان جیاجیایە، هەرچی (ابوحنيفة)[٣٣٩]یە ڕای وایە کەلەسەر خاوەن زەوی (مالك الارض)یە، بەڵام زۆربەی هەرەزۆری زانایان کە دوو هاوەڵەکەی (ابوحنيفة) - واتە: محمد بن الحسن و ابو يوسف -یشیان لەنێودان، دەڵێن: زەکاتەکەی لەسەر بابای بەکرێگر (مُستأجِرْ)ە[٣٤٠]، بەڵگەشیان ئەوەیە کە خوای دادگەر فەرموویەتی: (وآتُوا حَقَّهُ يَوْمَ حَصَادِهِ) کە بێگومان ڕاناو (ضمير)ی سەر هەردووك وشەی: (حَقّ) و (حَصاد) بۆ کشتوکاڵەکە دەگەڕێنەوە، ئنجا بێگومان ئەگەر زەوییەکە دانەچێنرابایەو کشتوکاڵی لێنەکرابا هیچی لەسەر پێویست نەدەبوو، کەواتە زەکاتەکە پەیوەندی بە بەروبوومەکەوە هەیە نەك زەوییەکەو دەبێ خاوەنی بەروبوومیش بیدات نەك خاوەن زەوی.



[٣٣٨] هەمان سەرچاوەو بەرگ ص١٩٤٧، ١٩٤٨.

[٣٣٩] بڕوانە: (فقه السنة)ج١ص٤٩٢، وە : (الفقه الأسلامي) ج٣ص١٩٠١.

[٣٤٠] بڕوانە: (الفقه الأسلامي وادلته) ج٣ص١٩٠١/ط٤، وە بڕوانە: (المغني) ج٢ص٥٧٤.

## ٦-زەكاتى زەوى خەراجى (زكاة الأَرْض الخَرَاجِيَّة):

ئەو زەوىو زارەى كە دەكريٚتە كشتوكاڵو باغو باغات لەڕوانگەى شەرعەوە دوو بەشە:

ا- زەوى دەيیەكى (الأرض العُشْريَّة) : كە سێ جۆرە: يان خاوەنەكەى بەخۆشى خۆى مسوڵمان بووە، يان بەهۆى جەنگەوە ئازادكراوەو بەسەر موجاهيدان دا دابەش كراوە، يان مسوڵمانان بۆ خۆيان ژياندووويانەتەوەو وەبەرهەميان هێناوە.

ب-زەوى خەراجى: كە ئەميش ديسان سێ جۆرە: يان لەئەنجامى جەنگ داگيركراوەو بەسەر جەنگاوەران دا دابەش نەكراوە، بەڵكو بەدەست خەڵكەكەيەوە هێڵراوەتەوەو خەراجيان لەسەر دانراوە، يان لەگەڵ خەڵكەكەىدا وا صوڵح كراوە كە ئەو زەوىيە موڵكى مسوڵمانانە بەلاّم بەدەست خەڵكەكەوە دەبێ وەك ئەمانەتى دەوڵەتى ئيسلامىو خەراج دەدەن، يان خەڵكەكەى لەترسان بەجێيان هێشتوە.[٣٤١]

جا دەربارەى زەكاتى زەوى خەراجى هەركاتێك بوو بەموڵكى بابايەكى مسوڵمان، زانايان رايان جياوازە:

زۆربەى هەرە زۆريان كە (مالك و أوزاعي و شافعي و ليث و ابن المبارك و احمد و اسحاق و داود)يان لەنێودان دەڵێن: زەوى خەراجى وێڕاى دەيیەك (عُشْر) دەبێ خەراجيشى لێبدرێو هەردووكيان پێكەوە كۆدەبنەوە، (أبوحنيفة) و حەنەفىيەكانيش دەڵێن زەوى خەراجى دەيیەكى لەسەر نيەو تەنيا ئەو خەراجەى بۆى ديارىكراوە لێى دەدرێ[٣٤٢].

بەلاّم بێگومان راى جەماوەر بەهێزترەو ئەم بەڵگانەيان بەدەستەوە هەن كەوەك (ابن حزم) گوتوويەتى: قسە بۆ هيچ كەس ناهێڵنەوە:

ا-ئايەتى: (يَاأَيُّها الَّذِينَ آمَنُوا أَنفِقُوا مِنْ طَيِّبَاتِ مَا كَسَبْتُمْ وَمِمَّا أَخْرَجْنَا لَكُمْ مِنَ الْأَرْضِ) البقرة: ٢٦٧، كە بەگشتى زەوى باس كردوەو جياوازى نەخستۆتە نێوان خەراجىو دەيیەكىيەوە.

ب-فەرموودەى: (فيما سَقَتِ السَمَاءُ العُشْرُ) رواه البخاري، كە ئەميش وەك ئايەتەكە حوكمێكى گشتىيەو هيچ جۆرە كشتوكاڵێكى لێهەڵنەوێرراوە.

---

[٣٤١] بۆ پێناسەى زەوى خەراجىو عوشرى سەرنجى: (فقه السنة) ج١ص٤٨٩، وە (الفقه الأسلامي) ج٣ص١٩٠٣، بدە.

[٣٤٢] بروانە: (المغني والشرح الكبير) ج٢ص٥٧٥، وە: (المحلى) ج٥ص١٧٠، وە: (فقه السنة) ج١ص٤٩٠.

ج-هەرکام لە دەییەك (عُشر[٣٤٣])و (خەڕاج)[٣٤٤] لەڕووی ماهیەتو شوێنی پەیوەندی پێوەبەستن (محل التعليق) و هۆی فەڕزبوونو بەڵگەی فەڕزبوونو جێگای تێدا خەرج کرانیان لەیەکتر جیان؛ ماهیەتی دەییەك زیاتر خواپەرستی دەگەیەنێ، بەڵام خەڕاج زیاتر سزا (عقوبة) ی تێدا دەخوێندرێتەوە، شوێنی پەیوەندی پێوەبەستنی دەییەکیش بەروبوومو بەرهەمە، بەڵام هی خەڕاج خودی خاوەن زەوییەو لەگەردنی وی دایە، هۆی فەڕزبوونی دەییەکیش بەرهەمی زەوییەکەیەو بەبێ ئەوە فەرز نابێ، بەڵام هۆی پێویست بوونی خەڕاج ئەو زەوییەیە کە بەکەڵکی کشتوکاڵ دێ (الأرض الصالحة للزراعة) ئیدی ئەگەر نەشکرێتە کشتوکاڵ هەردەبێ خەڕاجی لێبدرێ، بەڵگەی فەڕزبوونی دەییەکیش دەقی فەرموودەیە بەڵام هی خەڕاج ئیجماعو ئیجتیهادە، شوێنی تێدا خەرج کرانی دەییەکیش ئەو کەسانەن کە زەکاتیان پێدەشێ بەڵام هی خەڕاج جەنگاوەرانو بەرژەوەندییە گشتییەکانن.

## ٧-زەکاتی ماڵی هاوبەش (زَكاةُ المالِ المُشْتَرَكْ):

ماڵی هاوبەش لەنێوان دوو بەشدار (شريك) یان زیاتردا ئەگەر غەیری ئاژەڵ بوو بەڕای زۆربەی زانایان زەکات لەهیچ یەکێکیان ناکەوێ هەتا هەرکامێکیان بە ئەندازەی (نصاب) ماڵی نەبێ.

بەڵام ئەگەر ئاژەڵ بوو ئەوە حەنەفییەکان دیسان رایان وایە کەتێکەڵ کردنیان بەهەرجۆرێك بێ هیچ کارناکاتە سەر مەسەلەی زەکات دان، چونکە دەڵێن هەتا هەرکامیان بەئەندازەی (نصاب) ی نەبێ زەکاتی لەسەر پێویست نابێ، بەڵام شافیعییەکانو حەنبەلییەکان رایان وایە کەتێکەڵ کردنی ئاژەڵی چەند هاوبەشێك چ بەشێوەی ئاوێتەیی (شُيُوعْ) بێ چ بەشێوەی دراوسێیەتی (جِوارْ) کاردەکاتە سەر چۆنیەتی زەکات لێدانیان چونکە ئەو ماڵانە وەك هی یەك کەسی لێدێو بەوجۆرە هەم لە فەڕزبوونی زەکات دا و هەم لە کەم کردنەوەو زیادکردنی رێژەکەیدا کاریگەری دەبێ ئنجا مالیکییەکانیش هەمان رایان هەیە بەڵام دەڵێن مەرجە کە هەرکام لەو بەشدارانە بەئەندازەی (نصاب)

---

[٣٤٣] (عشر) کە دەییەکە ناوە بۆ زەکاتی کشتوکاڵێك کە بەئاوی باران یان رووبار ئاو دەدرێ.

[٣٤٤] (خەڕاج) ئەو باج (ضريبة)یە کە دەخرێتە سەر زەوی خەڕاجیو دوو جۆرە: أ- خەڕاجی دیاریکراو (خراج الوظيفة) کە بریتیە لەدانرانی ئەندازەیەك ماڵ لەسەر ئەندازەیەك زەوی، جا ئەو زەوییە دابچێنرێ یان نـ. ب- خەڕاجی بەشکردن (خراج المُقاسَمَة) کە دانرانی بەشێکی وەك نیوە، سێیەك، چواریەکە لەپارچە زەوییەك دا کە دەکرێتە کشتوکاڵو بەرهەمی دەبێ، بڕوانە: (الفقه الأسلامي..) ا.ج٣ص١٩٠٤.

ئاژەڵیان هەبێ ئنجا هەرکام لە مالیکی‌یەکان و شافیعی‌یەکان و حەنبەلی‌یەکانیش دەڵێن: مەرجە کە (شوان و نێری و بەران (فَحْل) و لەوەڕگاو ئاغەڵ)ی ئاژەڵەکانیش یەك بن، هەروەها شافیعی‌یەکان و حەنبەلی‌یەکان دەڵێن: دەبێ شوێنی ئاودران و دۆشران (المَشْرَب والمَحْلَب) یشیان یەك بێ، وە مالیکی‌یەکان دەڵێن: دەبێ خاوەنەکانیان نیازو مەبەستی تێکەڵی و هاوبەشایەتی‌یان پێکەوە هەبێ[٣٤٥].

## ٨-زەکاتی ماڵی وەدەست هێنراو (زَكاةُ المالِ المُسْتَفادْ):

مەبەست لەماڵی وەدەست هێنراو ئەو ماڵ و سامانەیە کە خاوەنەکەی لەمیانە (خلال)ی ساڵێدا پێش سووڕانەوەی ساڵ بەهەر شێوەیەکی شەرعی دێتە دەستی.

ئنجا ئەو ماڵە کە دێتە دەستی ئەگەر لەو جۆرە بوو کە ساڵ بەسەردا وەرسووڕانەوەی تێدا بەمەرج گیرابوو بۆ زەکات لێدران وەهیچ ماڵی دیکەشی نەبوو، وەگەیشتبووە (نصاب)، یان هەر لەڕەگەز (جنس)ی ئەو ماڵە ماڵی دیکەی هەبوو کە لەئەندازەی (نصاب) کەمتربوو وە بەهۆی ئەو ماڵە وەدەست هێنراوەوە دەگەیشتە (نصاب)، ئەوە هەرکات ساڵی بەسەردا سووڕایەوە زەکاتی لێدەردەکرێ[٣٤٦].

بەڵام ئەگەر هات و ماڵی دیکەی بەئەندازەی زەکات لێکەوتن (نصاب) هەبوو، ئەوە لەسێ حاڵان بەدەر نیە:

أ-کە ماڵە وەدەست هێنراوەکە لەئەنجامی گەشەکردنی ئەو ماڵە ئەسڵی‌یە پەیدابووبێ وەك قازانجی بازرگانی و بەچکەی ئاژەڵ، ئەوە هەرکات ماڵە ئەسڵی‌یەکە ساڵی بەسەردا سووڕایەوەو زەکاتی لێدرا ئەمیش لێی دەدرێ، ئەمەش تێکڕای زانایان لەسەری ڕێك کەوتوون.[٣٤٧]

ب- کە ماڵە وەدەست هێنراوەکە هەر لەڕەگەزی ماڵە ئەسڵی‌یە بە (نصاب) گەیشتووە کە بێ بەڵام لەوەوە پەیدا نەبووبێ، بەڵکو لەڕێ‌یەکی دیکەی وەك: کڕین، میرات، بەخشران.. هتدەوە هاتبێتە دەستی، ئەمەیان زانایان تێیدا جیاوازن: (أبوحنيفة) ڕای وایە کە وەك ماڵی بازرگانی و بەچکەو بەرهەمی ئاژەڵ مامەڵەی لەگەڵ دەکرێ واتە: دەخرێتە پاڵ ماڵە ئەسڵی‌یەکەو پاش ساڵ وەرسووڕان لەگەڵ وی زەکاتی لێدەدرێ، (شافعي و احمد)یش ڕایان وایە کە لە (نصاب) دا شوێن ماڵە ئەسڵی‌یەکە دەکەوێ، بەڵام هەتا ساڵی بەسەردا

---

[٣٤٥] بڕوانە: (الفقه الأسلامي وادلته) ج٣ص١٩٠١تا١٩٠٦، وە: (فقه السنة) ج١ص٤٨٩تا٤٩٢.

[٣٤٦] بڕوانە: (فقه السنة) ج١ص٥١٤.

[٣٤٧] بڕوانە: (فقه السنة) ج١ص٥١٤.

تێنەپەڕێ زەکاتەکەی لێنادرێ، بۆ وێنە: ئەگەر یەکێك سی (٣٠) مسقاڵ زێڕی هەبوو – یان بارتەقای ئەوە پارەی قاقەزی بانکی – پاشان لەمیانەی ساڵ دا دە (١٠) مسقاڵی دیکەی هاتە دەست، ئەوە لەکۆتایی ساڵدا هی سی (٣٠) مسقاڵەکەو پاشان کە دە (١٠) یەکەی دیکەش ساڵی بەسەردا تێپەڕی هی ئەویش دەردەکات، (مالك)یش لەئاژەڵ دا ڕای وەك ڕای (ابوحنیفە) وایە، بەڵام لەماڵی نەغدینەدا ڕای وەك ڕای (شافعی و احمد) وایە، واتە: دەڵێ: دەبێ ئەگەر ماڵە وەدەست هاتوە کە ئاژەڵ بوو بخرێتە پاڵ ئاژەڵە زەکات لێکەوتووەکانی دیکە بۆ زەکات لێدران لەکۆتایی ساڵ دا، بەڵام ئەگەر ماڵی نەغدینە بوو، دەبێ ساڵی بەسەردا بسووڕێتەوە ئەوجار زەکاتەکەی لێدەربکات.

ج–کە ماڵە وەدەست هاتووەکە لەگەڵ ماڵە زەکات لێکەوتووەکە یەك ڕەگەز نەبن، ئەوە بەپێی ڕای زۆربەو جەماوەری زانایان نە لە (نصاب) و نە لەساڵ بەسەردا سووڕانەوەش دا ناخرێتە پاڵی، بەڵکو ئەگەر خۆی گەیشتبووە ڕاددەی زەکات لێکەوتن (نصاب) ئەوە چاوەڕێ دەکات هەتا ساڵی بەسەردا دەسووڕێتەوە ئەوجار زەکاتی لێدەردەکات، ئەگەرنا هیچی ناکەوێتە سەر[٣٤٨].

## ٩–زەکاتی پشکەکانو چەکەکان (زَكاةُ الأسْهُم والسَّنَدات)

لەئەنجامی بەرەو پێش چوونو گەشەکردنی پیشەسازیو بازرگانی لەدنیادا، جۆرە دەستمایەو سەرمایەیەکی نوێ هاتۆتەکایەوە بەناوی پشك (السهم) و چەکە (السند) ، کە برتیین لەدوو جۆرە قاقەز کە نرخی دارایییان هەیەو لەبازاڕێکی تایبەتدا کەپێی دەگوترێ: بازاڕی قاقەزە داراییەکان (بورصات الأوراق المالية) مامەڵەو بازرگانییان پێدەکرێ، جا بەپەسەندی دەزانم بەرلەوەی چۆنیەتی زەکات لێدانیان بخەینەڕوو، پێناسەیەکی کورتیان بکەین:

أ–بەشەکان (الأسْهُم) بریتین لەچەند مافێکی وەك یەکی بەشداربووان لەشەریکەیەك دا کە تێیدا بەشدارنو بەهەموویان سەرمایەکەی پێك دێنن، جا هەرکام لەو بەش (سهم)انە نرخیان یەکسانەو لەبازاڕدا وەك هەر پارەو دراوێك مامەڵەو بازرگانییان پێ دەکرێ، جا ئەو بەش (سهم)انە سێ جۆرە نرخ (قيمة)یان هەیە:

---

[٣٤٨] بڕوانە: (فقه السنة) ج١ص٥١٥.

یەکەم- نرخێك کە لەسەر ئەو چەکەیە دەنووسرێ کە بەناوی شەریکەکەوە دەردەچێ و بەهەموویان سەرمایەی شەریکەکە پێك دێنن، ئەمەیان نرخی ناوی (القیمة الأسمیة)ی پێ دەگوترێ.

دووەم-نرخی بازرگانی (القیمة التجاریة)، کە ئەمیش نرخی بەشەکانە لەبۆرصەو بازاڕداو بەپێی حاڵ و باڵی بازاڕو ناوبانگی شەریکەکە دەگۆڕێ و بەرزی و نزمی بەسەردا دێ.

سێیەم-نرخی ڕاستەقینە (القیمة الحقیقیة)، کە بریتیە لەو نرخە دارایی‌یەی هەر بەشێك هەیەتی لەکاتی تەصفیەی حیسابی شەریکەکەو دابەش کردنی دەستمایەو دەست کەوتی بەسەر ژمارەی بەشەکان دا.

ب-بەڵام چەکەکان (سندات، صکوك) کە کۆی چەك (سَنَدْ، صَكّ)ە، بریتیە لەپارچە قاقەزێکی ڕەسمی خاوەن نرخ کە لەلایەن بانق یان شەریکە یان دەوڵەتەوە لەبەرانبەر ئەندازەیەك پارەی قەرزدا دەدرێ بەهەڵگرەکەی لەکاتێکی دیاریکراوداو لەئاقار سوود (ربح)ێکی دیاری کراودا.

جیاوازی بنەڕەتی نێوان پشك و چەك (سهم و سند) یش ئەوەیە کە پشك تەعبیر لە بەشێك دەکات لە شەریکەیەك دا، واتە خاوەنەکەی بەشدارو خاوەن بەشە، بەڵام چەك تەعبیر لە قەرزێك دەکات کە خاوەنەکەی لەسەر شەریکەیەك یان بانقێك یان دەوڵەت هەیەتی، واتە خاوەنەکەی قەرزدەرو خاوەن قەرزە، جا بەوپێ‌یە خاوەن پشك تەنیا کاتێك دەست کەوتی دەبێ و قازانج دەکات کە شەریکەکە قازانج بکات، بەڵام لەزیانیشیدا بەشدارە، کەچی بابای خاوەن چەك لەهەموو حاڵێ دا قازانج و دەستکەوتێکی نەگۆڕ (ثابت) ی هەیە، ئەو لایەنەی قەرزەکەی لەلایە قازانج بکات یان زیان.

جا ئاشکرایە کە زانایان و شەرعزانانی ڕابردوومان دەربارەی ئەم جۆرە شتانە هیچیان نەگوتوە، چونکە لەڕۆژگاری ئەوان دا نەبوو ون، بۆیە دەبێ لەوبارەوە لەکتێب و سەرچاوە فیقهی‌یەکانی ڕابردوومان دا نەگەڕێین و گوێ بۆ زاناو شارەزایانی هاوچەرخمان بگرین.

زاناو شەرعزانانی هاوچەرخ دوای ئەوەی کە لەسەر ئەوە یەکدەنگ بوو ون کە هەرکام لەپشکەکان و چەکەکان - هەرچەندە مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو بانقانەدا کەسوود دەدەن بە خاوەن پارە حەرامەو ئەو قازانج و سوودەش کەوەری‌دەگرن حەرامە، بەڵام - زەکات لێ‌دەرکردنیان فەرزە، مادام گەیشتبنە ئەندازەی زەکات لێ‌کەوتن، لەسەر چۆنیەتی و ئەندازەی زەکاتەکە ڕایان جیایە.

دەربـارەی چەکـەکان[٣٤٩] جیـاوازی شـارەزایانی هاوچـەرخ هـەر لـەو ڕووەوەیـە کـە جیاوازی‌یان هەبوو دەربارەی زەکات لێدانی ماڵی قەرز، کەپێشتر باسمان کردو ڕوونمان کردەوە کە زۆربەی هەرەزۆری زانایـان ڕایـان وایـە کەقـەرزێك ئومێدی وەرگیرانـەوەی - بەئاسانی - لـێ‌بکرێ، دەبێ زەکاتی لـێ‌بدرێ.

بـەڵام جیاوازی‌یـان لـەبارەی پشـکەکان (اسـهم)ەوە، زیـاتر لـەو ڕووەوەیـە کـە ئـەو شەریکانەی پشکەکانیان تێدان، یان پیشەسازی (صناعي)ین، یان بازرگانی (تجاري)ین، یـان لەهـەردووکیان تێکـەڵن، جـا بەشـێکیان جیـاوازی دەخەنـە نێـوان شـەریکە پیشەسـازی‌یەکان‌و بازرگانی‌یەکانـەوەو دەڵێـن دوای هـەڵاواردنی نرخـی کەل‌وپـەل‌و ژێرخانی کارگەو شەریکە پیشەسازی‌یەکە چل یـەك (١/٤٠)ی زەکـات لـێ‌دەدرێ، بـەڵام کارگەو شەریکە بازرگانی‌یەکان وەك ماڵی بازرگانی دەقەبلێنرێن‌و زەکاتیان لـێ‌دەردەکرێ، هەندێکیش لەزانایان دەڵێن: جیاوازی ناخرێتە نێوان ئەو دووجۆرە کارگەو شەریکانەوەو هەرکەسە بەئەندازەی بەشەکان (اسهم)ی خۆی زەکات دەدات، هەندێکیشیان ڕایان وایە کە هەموو جۆرە کارگەو کارخانـەکان بـەڕێژەی دەیـەك (١/١٠)ە وەك کشـت‌وکاڵ زەکاتیـان لـێ‌دەردەکرێ، بەڵام ئەم ڕایەی دوایـی بێ‌هێزە، چونکە ئەو کارگەو کارخانەو شەریکانە زیاتر وەك ماڵی بازرگـانی دەچـن‌و، لـە زەوی‌زاری کشـت‌وکاڵەوە دوورتـرن، دیـارە ئێمـە لێرەدا لەم ئەندازەیە زیاتر دەرفەتی وەدواکەوتنی ئەم بابەتەمان نیە، ئەگەرنا لق‌وپۆپ‌و لایـەنی زۆری هـەن کـە پێویسـتی‌یان بەتوێژرانـەوەو شـیکرانەوە هەیـە، بۆیـە سـەرنجی خوێنەرانی بەرێز بۆ ئەوە ڕادەکێشم کە بە بەرچاوڕوونی چاکترو زیاتر دەربارەی چۆنیەتی زەکات لێدانی پشکەکان‌و چەکەکان، تەماشای ئەو کتێب‌و سەرچاوانە بکەن کـە زانـاو شەرعزانانی هاوچەرخمان - خوا پاداشتیان بداتەوە - لەو ڕووەوە نووسیویانن[٣٥٠].



[٣٤٩] ئاشکرایە کە زەکاتەکە لەئەسڵی سەرمایەو حەڵاڵ‌و بەچەکە کراوەکە دەدرێ، نەك لەسوودە حەرامەکە، چونکە ماڵی حەرام زەکاتی لـێ‌دەرناکرێ وەك دواتر باسی دەکەین‌و ڕوونی دەکەینەوە.

[٣٥٠] بڕوانە: (فقه الزكاة) د.یوسف القرضاوي، ج١ص٥٢١تـا٥٣٣، وە بڕوانـە: (الفقه الأسلامي وادلتـه) د.وهبـة الزحيلـي، ج٣ص١٨٣٥تـا١٨٥٤، وە بـۆ پێناسـەی (الأسـهم والسـندات) بەتایبـەت، بڕوانـە: (المعاملات الحديثة واحكامها) عبدالرحمن عيسىٰ.

## ١٠-زەکاتی پارەی پێدراو بۆ مامەڵە پێکردن (المُضارَبَةُ أو القِراضْ):

(مضاربة) یان (قراض) ئەوجۆرە مامەڵەیە کە بابایەکی خاوەن ماڵ و سامان ئەندازەیەك ماڵ دەدات بەکەسێك تاکو مامەڵەو بازرگانی پێبکاتو، قازانجیش لە نێو خۆیان دا بەش دەکەن بەوجۆرەی کە لەسەری پێك دێن، وەك نیوە بەنیوە، یان سێ‌یەك بۆ مامەڵەپێکەرو دووسێ‌یەك بۆ خاوەن ماڵ یان بەهەر شێوەیەکی دیکە کەرێك دەکەون، دیارە زیان (خسارة) یش تەنیا دەکەوێتە ئەستۆی خاوەن ماڵو، بابای مامەڵەپێکەریش ڕەنج و ماندووبوونەکەی لەکیس دەچێ[٣٥١].

شایانی باسە ئەم جۆرە مامەڵەیە سەرجەم زاناو پێشەوایان لەسەر ڕەوابوونی یەکدەنگنو، لەسەر ئەوەش کە زەکات لەسەر هەردووك لا - خاوەن سامانو مامەڵەپێکەر مادام مەرجەکانی زەکات لێکەوتنیان تێدا هاتبنەدی -، فەرزە دیسان یەکدەنگن، بەڵام دەربارەی چۆنیەتی زەکات دانەکە ڕایان جیاوازە.

حەنەفی‌یەکان ڕایان وایە کە هەرکام لەخاوەن ماڵو مامەڵەپێکەر (مُعامِلْ) پێویستە هەموو ساڵێ زەکاتی خۆیان بدەنو چاوەڕێنەکەن تا کاتی کۆتایی هاتنی مامەڵەکەیانو ساغ کردنەوە (تصفیة)، بەڵام حەنبەلی‌یەکان دەڵێن: خاوەن پێویستە هەموو ساڵێ زەکات بدات، بەڵام مامەڵەپێکەر هەتا بەشی خۆی وەرنەگرێو ساڵێشی بەسەردا وەرنەسووڕێ زەکات نادات، چونکە خاوەنێتی‌یەکەی خاوەنێتی‌یەکی تەواو نیە.

شافیعی‌یەکانیش ڕایان وایە کە هەردووکیان زەکات دەدەن بەڵام بۆ مامەڵەپێکەر:

یەکەم: ساڵی بەشەکەی لەوکاتەوە دەست پێدەکات کەقازانج دەردەکەوێ، دووەم: هەتا کاتی حیساب ساغ کردنەوە لەسەری پێویست نابێ زەکاتەکەی دەربکات.

مالیکی‌یەکانیش دەربارەی خاوەن ماڵ دوو ڕایان هەن، بەهێزتریان ئەوەیە کە تا ساغ کردنەوەی حیساب زەکات دەرناکات، بەڵام ئەوکاتە هی هەموو ساڵەکان دەردەکات، مامەڵەپێکەریش پاش ساغ کردنەوەو جیابوونەوە زەکاتی ساڵێك دەردەکات، چونکە تا ئەوکاتە نابێتە خاوەن (مالك)ی ڕاستەقینەی ماڵەکەی[٣٥٢].

---

[٣٥١] بڕوانە: (الفقه السلامي..) ج٥ص٣٩٢٤.

[٣٥٢] بڕوانە: (الفقه الأسلامي) ج٣ص١٨٧٨، ١٨٧٩، وە بڕوانە: (کیف تؤدي زکاة أموالِكَ؟) د.علي محي‌الدين قرداغي ص٤٨.

## ١١-زەکاتی ماڵی وەقف کراوو دەوڵەتو دامودەزگا خێرخوازی‌یەکان:[253]

تێکڕای زانایان ڕایان وایە کە ئەو شتانەی ماڵی گشتی مسوڵمانانن و لەژێر چاودێری دەوڵەت دان زەکاتیان لێ نادرێ، چونکە خاوەنێکی دیاریکراویان نیەو هەموو مسوڵمانان تێیان دا بەشدارنو یەکێك لەمەرجەکانی زەکات لێکەوتنی هەر ماڵو سامانێکیش ئەوەیە کە خاوەنێکی دیاریکراوی هەبێو خاوەنێتی تەواوی بەسەریدا هەبێ.

جا دیارە ماڵی وەقف کراویش هەردەچێتە ئەو خانەیەوەو زەکاتی لێ نادرێ، بەلام بەمەرجێك بەگشتی لەسەر جۆرێك لەمسوڵمانان یان چەند جۆرێکیان وەقف کرابێ، وەك هەژاران، جەنگاوەران (مجاهدين)، هەتیوان، مزگەوت، قوتابخانە... هتد، ئەگەرنا ئەگەر لەسەر کەسێکی تایبەت یان خێزانێك یان کۆمەڵێکی دیاریکراوو ژمێرراو وەقف کرابێ ئەوە ڕای زۆربە وایە کەفەرزە زەکاتی لێبدرێ، تەنانەت هەندێك لە زانایان ڕایان وایە کە ماڵی وەقف کراو گشتی بێ یان تایبەت، زەکاتی هەر لێ‌دەدرێ، بەلام بێگومان وەك (ابن رشد) گوتوویەتی[254]: هیچ مانای نیە لەسەر ئەو نەدارانە فەرز بکرێ کەزەوی‌و ئەوجۆرە شتانەیان لەسەر وەقف کراون، چونکە هەم خاوەنێتی‌یەکەی ناتەواوە هەم ئەو ماڵە لەسەر کۆمەڵێکی دیاریکراو وەقف کراوە کە زەکاتیان پێ‌دەشێ نەك لێ‌وەربگیرێ.

## ١٢- زەکاتی مووچەو کرێ مانگانەی کارمەندان (رواتب واجور المُوَظَّفين) و دەستکەوتی خاوەن پیشە ئازادەکان:

زاناو شەرعزانانی[255] هاوچەرخ لەبارەی زەکات لێدانو لێنەدانی مووچە و مەعاشی مانگانەی کارمەندانو دەستکەوتی خاوەن پیشە ئازادەکان (أَصْحابُ المِهَنِ الحُرَّة)، کە هەتا کۆتایی ساڵ نامێنێ‌و هێندە خڕ نابێتەوە کە بگاتە ڕاددەی زەکات لێکەوتن (نصاب)، دوو ڕایان هەن، هەندێکیان دەڵێن: زەکاتی لێ‌ناکەوێ، بەلام زۆربەیان دەڵێن زەکاتی لێ‌دەکەوێ، بەلام بەمەرجێك ئەو ماڵە ئەگەر هەمووی لەکۆتایی ساڵ دا خڕبێتەوە سەریەك بێجگە لەدابین کردنی پێداویستی‌یە سەرەکی‌یەکان (الحاجات الأصلية) ی ژیانو گوزەرانی خۆی‌و ئەوانەی مەسرەفیان لەسەری پێویستە، بگاتە ئەندازەی زەکات لێکەوتن

---

[253] بڕوانە: (فقه الزكاة) ج١ص١٣١، ١٣٢، وەبڕوانە: (كيف تؤدي زكاة اموالك؟) ص٧٤.

[254] بڕوانە: (بداية المجتهد ونهاية المقتصد) ج١ص٢٥٤.

[255] هەرچەندە زانایانی پێشووش وەك دوایی ئاماژەی پێ‌دەکەین کەم و زۆر قسەیان لەوبارەوە کردوە، بەلام پێشتر ژیانو گوزەرانو حاڵەتی ئەوجۆرە کەسانە وەك ئێستا نەبووە، بۆیە وەك پێویست مەسەلەکە نەتوێژراوەتەوە.

(نصاب)، بەڵگەشیان ئەوەیە کە ئەوجۆرە کەسانە چ کارمەند (موظف)بن چ خاوەنی پیشەیەکی ئازاد بن وەك ئەندازیارو پزیشكو بەرگدروو. هتد دوو جۆرن، جۆرێکیان دەست بڵاو نیەو بەس بەئەندازەی پێویست خەرج دەکاتو سەرەنجام بۆ کۆتایی ساڵ هێندەی بۆ دەمێنێتەوە کە زەکاتی لێبکەوێ، جۆرێکیشیان مانگانەیان نێوە نێوە لەمیانەی ساڵ دا پارەی باشی دێتە دەست بەڵام دەست بڵاوانە بەڕاست و چەپ دا خەرج دەکاتو هیچی لێ ناهێڵێتەوە بۆ کۆتایی ساڵ، ئنجا لە ڕاستیدا ئەوجۆرە ماڵو سامانە ئەگەر کتومتیش وەك ماڵی وەدەست هێنراو (المال المستفاد) نەبێ زۆری لێدەچێ، کە لە برگەی هەشتەم دا باسمان کرد، پێم وایە وەك (د.یوسف القرضاوي)یش گوتوویەتی: (شێخ محمد الغزالي) خوا لێی خۆش بێ یەکەمین کەس بووە لەزانایانی هاوچەرخ کەباسی ئەو مەسەلەیەی کردوەو پێشنیاری کردوە کە زەکات لەوجۆرە کەسانە وەربگیرێ، گوتوویەتی: پێویستە هەرکەسێك هێندەی دەستکەوت هەبێ کە – بێجگە لەدابین کرنی ژیانو گوزەران – بگاتە ئەو ئەندازەیەی کە بارتەقای بەرهەمو دەستکەوتی بابای جوتیار (فلاح) ی زەکات دەر بێ، زەکات بدات[٢٥٦]. هەڵبەتە ڕایەکەشی زۆر ڕەوایە چونکە ماقووڵ نیە بابایەکی جوتیار کەپێنج وەسق[٢٥٧] دانەوێڵەی هەیە، یان خاوەن حوشتر کەپێنج حوشتری هەن، یان مەڕدارو ماخۆبزنێك کە (٤٠) سەر مەڕ یان بزنیان هەیە، یان چێڵدارێك کە (٣٠) سەر مانگای هەیە، زەکات بدەن، بەڵام مووچەخۆرێك یان خاوەن پیشەیەکی ئازاد کەچەند قاتی ئەوانی دێتە دەستو زۆر لەوانیش خۆشگوزەرانانەتر دەژیەت هەر لەبەرئەوەی پارەکەی پرژوبڵاو کردوەو نەیهێشتوە بگاتە کۆتایی ساڵ زەکات نەدات!!

ئنجا وەك پێشتر گوتمان ئەوجۆرە ماڵە – مووچەو دەستکەوتی پیشەی ئازاد – زۆر وەك ئەوجۆرە ماڵە دەچێ ئەگەر کتومتیش وەك وی نەبێ، کە شەرعزانانی پێشوومان بەماڵی وەدەست هێنراو (المال المستفاد) ناویان بردوە، ئەویش هەرچەندە هاوەڵانو شوێن کەوتووان (الأصحاب والتابعون) لەبارەی زەکات لێدانو لێنەدانی پێش ساڵ بەسەردا سوورانەوەی ڕایان جیاوازە، بەڵام ڕای ئەوانە بەهێزترو دووربینانەترە کە دەڵێن دەبێ زەکاتی لێبدرێو، ئەوانەی ڕای ناوبراویشیان هەڵبژاردوە: لەهاوەڵان خوالێیان ڕازیبێ هەرکام لە (ابن عباس) و (ابن مسعود) و (معاوية بن أبي سفيان) و، لەشوێن کەوتووان خوا لێیان خۆش بێ هەرکام لە (عمر بن عبدالعزيز و حسن البصري وزهري) و لەزانایانی

---

[٢٥٦] بڕوانە: (الأسلام واوضاعُنا الأقتصادية) ص١٦٦تا١٦٨، ط٥، وە: (فقه الزكاة) ج١ص٥١٠تا٥١٢.

[٢٥٧] پێنج وەسق بەپێی ڕای (د.وهبة الزحيلي) دەکاتە (٦٥٣) کیلۆگرامو، بەپێی ڕای (د.يوسف القرضاوي)یش بەهەمان شێوەو، (د.علي قرداغي)یش (٦٤٧) کیلۆگرامی داناوە، بڕوانە: (الفقه الأسلامي..) ج١ص١٤٤، وە -(فقه الزكاة) ج١ص٣٧٣، وە : (كيف تؤدي زكاة اموالك؟) ص٤١.

دیکەش وەك (محمد الباقر) و (جعفر الصادق) و (الناصر) وە (داود الظاهري)و (ابـن حـزم الأندلسي)یش لەزانایانی (ظاهري) مەزەب[٣٥٨].

ئەمەش چەند دەقێك کە لە (ابن عباس و ابن مسعودو معاویە وعمر بن عبدالعزیز)ەوە هاتوون:

١-هەرکام لە (ابوعبید) و (ابن أبي شیبة) لـە (ابـن عبـاس) یـان گێڕاوەتـەوە کـە لـەبارەی کەسێکەوە پرسـیاری لـێکراوە کـە مـاڵێکی دەسـت دەکـەوێ گوتوویـەتی: (یُزَکِّیـهِ یـوم یَسْتَفیدُهُ)[٣٥٩].

٢-هەروەها (ابوعبید) لە (هبیرة بن یریم) ەوە هێناویـەتی: (کـان عبـدالله بـن مسـعود یُعْطینا العَطاءَ في زُبُلٍ[٣٦٠] صغار ثم یأخذ منه الزکاة)[٣٦١].

٣- وە (مالك)[٣٦٢] لە (ابن شهاب)ی گێڕاوەتەوە کە گوتوویەتی: (أوَّلُ مَنْ أخذ من الأُعْطیة الزکاة مُعاویة بن أبي سُفیان).

٤-وە (ابوعبید)[٣٦٣] دەربارەی (عمـر بن عبدالعزیـز) گوتوویـەتی: (کان إذا أعطـی الرَّجُلَ عُمالَتَهُ أخَذَ منها الزکاة، وإذا رَدَّ المظالِمَ اخَذَ منها الزَّکاة، وکان یـأخُذُ الزکاة مـن الأُعْطیَـة إذا خَرَجَتْ لأصحابها)[٣٦٤]، مەبەستیش لە (عُمالَة) ئەو کرێیەیە کە کابرا لەبەرانبەر کارێك دا کە ئەنجامی داوە وەری‌دەگرێ، وەك مووچەی کارمـەندو کرێکارەکـانی ئـەم ڕۆژگـارە، (مظـالم)یـش بـەو مـاڵ‌و سـامانانەیان گوتـوە کـە دەسـتەڵاتدارە سـتەمکارەکان بەناهـەق دەسـتیان بەسـەردا گرتـوون‌و زەوتیـان کـردوون‌و خاوەنـەکانیان لێیـان بـێهیوا بـوو ون‌و بەماڵی فەوتاوو لەدەست چوو (المال الضائِع والضِّمار[٣٦٥]) یان حیساب کردوون‌و، دیـارە هـەرکاتێك خەلیفەو فەرمانڕەوایەکی پارێزکـارو دادگـەری وەك (عمـر بـن عبدالعزیـز) بـۆی گێڕابنەوە بەدەستکەوتێکی تازەیان دانـاوە، (اعطیـات)یـش بـەو پاداشـت‌و کرێ‌و مووچـە بەردەوامەیان گوتـوە کـە لـە (بیـت المـال) ی مسـوڵمانان دراوە بـە سـەربازو جـەنگاوەرانی سوپای ئیسلام‌و هەرکەسێك وەك وان بووبێ[٣٦٦].

---

[٣٥٨] بڕوانە: (المحلی) ج٦ص٥٢، مسألة (٦٨٥) وە (فقه الزکاة) ج١ص٤٩٩.

[٣٥٩] بڕوانە: (المحلی) ج٦ص٥٢.

[٣٦٠] (زُبُل) کۆی (زَبِیل) ە کە بەکوردی (زەنبیل)ی پێ‌دەڵێن.

[٣٦١] بڕوانە: (فقه الزکاة) ج١ص٥٠٠.

[٣٦٢] بڕوانە: (الموطأ) ص٢٠٧.

[٣٦٣] بڕوانە: (الأحوال) ص٤٣٢، وە: (فقه الزکاة) ج١ص٥٠٢.

[٣٦٤] بێگومان ئەو ڕەفتارەی (عمر بن عبدالعزیز) ڕەحمەتی خوای لێبێ کەلەلای زۆر لەزانایان بەپێنجەمین خەلیفەی ڕاشید ناسراوە قورسایی‌و ئیعتیبارێکی زۆری هەیەو هیچ کەسیش ناتوانێ گومانی خراپی پێبەرێ.

[٣٦٥] (ضِمار) بەماڵی بزربوو و نادیارو دەس لێ‌شۆراو دەگوترێ، بڕوانە: (المعجم الوسیط) ص٥٤٣.

[٣٦٦] ئەو پێناسانەم لە (فقه الزکاة) ج١ص٥٠٢، ٥٠٣ وەرگرتوون.

## ١٣-زەكاتی كارگەو كارخانەو پرۆژە هاوبەشەكان (الشركات)[٣٦٧]:

كارگەو كارخانەو پرۆژە هاوبەشەكان دوو جۆرن:

جۆری یەكەم كە چەند كەسێكی دیاریكراو تێیدا بەشدارن‌و بۆ خۆیان هەڵی دەسووڕێنن، ئەوە چۆنیەتی زەكات لێدانی بەوشێوەیە دەبێ كە هەركام لەو بەشدارانە زەكاتی بەشی خۆی دەردەكات، دوای ئەوەی كە لەكۆتایی ساڵ دا كارخانەكە دەنرخێنن‌و، ئەو شتانە كە ژێرخان‌و كەل‌وپەلە بنەڕەتی‌یەكانی پێك دێنن لەحیساب جیایان دەكەنەوە، هەروەها ئەو قەرزو قۆڵانەی كە كارخانەكە پێیان قەرزدارە، دیارە ئەندازەی زەكاتەكەش وەك ئی زەكاتی بازرگانی‌یە كە چل یەكە (٤٠/١) واتە (٢,٥٪)، یان (١٠٠٠/٢٥).

جۆری دووەم: كە كارخانەكە بەپێی سیستەمی پشكان (أسهم) بنیات نرابێ‌و بەڕێوەببرێ، ئەمیش دوو حاڵەتی هەن:

أ- كە كارخانەكە خۆی زەكات بدات لەجیاتی هەموو خاوەن پشك (سهم)ەكان، دیارە ئەمیش لەكاتێك دا دەبێ كە هەموو خاوەن پشكەكان لەسەر ئەوە ڕێك كەوتبن‌و ئیدارەی كارخانەكەیان كردبێتە وەكیل.

ب-بەڵام ئەگەر وانەبوو، ئەوە هەر خاوەن پشكە زەكاتی بەشی خۆی دەردەكات بەوشێوەیەی كەپێشتر لەبڕگەی نۆیەم (٩)دا باسمان كرد.

## ١٤-زەكاتی خشڵ (زكاة الحُلَيّ):

زانایان لەسەر ئەوە یەكدەنگن كە ئەگەر (خشڵ) لەئەندازەی زەكات لێكەوتن (نصاب) كەمتربێ، ئەوە زەكاتی لێنادرێ، بەڵام ئەگەر زیاتربێ، ئەوە زانایان ڕایان جیاوازەو بەمەبەستی سێنایی‌كردنی خستنەڕووی باسی خشڵ لەچەند خاڵێك دا دەینووسین:

١-خشڵی غەیری زێڕو زیو بەڕای زۆربەی هەرە زۆری زانایان زەكاتی لێنادرێ، مەگەر بابای دەوڵەمەند بۆ خۆ دزینەوە لەزەكات، ئەوجۆرە خشڵەی كڕیبێ، بێگومان ئەوكاتە وەك ماڵی بازرگانی دادەنرێ‌و زەكاتی لێ‌دەكەوێ، بۆ وێنە: (گەوهەر) و (مراوری)و (ئەڵماس) و (پلاتین)..[٣٦٨]

---

[٣٦٧] بڕوانە: (الفقه الأسلامي.) ج٥ص٣٨٧٥تا ٣٩٢٢، وە بڕوانە: (كيف تؤدي زكاة أموالك؟) ص٥٢، ٥٣.

[٣٦٨] بڕوانە: (فقه الزكاة) ج١ص٣١٠.

٢-خشڵی زێڕو زیوی ئافرەتانیش ئەگەر بۆ پەزمەندەکردنو هەڵگرتن بێ نەك بۆ خۆپێ ڕازاندنەوەو بەکارهێنان، ئەوە دیسان زەکاتی لێدەکەوێ، چونکە ئەوکاتە حوکمی پارەی نەغدینەی دەبێ[٣٦٩].

٣-هەروەها خشڵی ئافرەتان ئەگەر بەکاریشی بهێنن، بەڵام زیادەڕۆیی زۆری تێداکرابێ و زۆر لەسنووری عورف و عادەتی ئەو خەڵك و کات و شوێنە دەرچووبێ دیسان ڕای بەهێزتر ئەوەیە کە زەکاتی لێدەدرێ[٣٧٠].

٤-بەڵام ئەگەر خشڵەکە هی ئافرەتان بێ و، بۆ بەکارهێنان بێ و لەسنووری عورف و باوی خەڵکی دەرنەچووبێ، یان خشڵەکە هی پیاوان بێ لەوجۆرانەی کە بۆیان ڕەوا (مباح)ن، وەك ئاڵقەو ئەنگوستیلەی زیوو زێڕ کفتو زیو کفت کردنی چەكو.. هتد، ئەوە زەکاتی لێنادرێ،[٣٧١] بەڵام ئەگەر لەوجۆرانەبێ کە بەکارهێنانی ڕەوا نەبێ وەك قاپو قاچاغو کەلوپەلی زێڕو زیو، ئەوە وێڕای گوناحبار بوونیشیان زەکاتیشیان دەکەوێتەسەر.[٣٧٢]

٥-هەندێك لەزانایانیش دەڵێن: (خشڵ) یش وەك پارەی نەغدینە وایە بەموتڵەقی زەکاتی لێدەکەوێ و دەبێ هەموو ساڵێك زەکاتی لێبدرێ[٣٧٣].

٦-هەندێکیشیان دەڵێن: بەموتڵەقی (خشڵ) زەکاتی لێناکەوێ[٣٧٤].

٧-هەندێکیشیان دەڵێن: خاوەن خشڵ لەتەمەنیدا یەکجار لەسەری فەرزە زەکاتی لێ دەربکات[٣٧٥].

٨-دیارە زەکاتی (خشڵ) یش وەك پارەی نەغدینە بریتیە لە (٤٠/١) یان (٢,٥٪).

ئنجا هەرچەندە هەم ئەوانە کە دەڵێن (خشڵ) زەکاتی لێنادرێ کە زۆربەی زانایانن و[٣٧٦]، هەم ئەوانەش کە ڕایان وایە زەکاتی لێدەدرێ، چەند دەقێکی سوننەت بە بەڵگە دێننەوە؛

---

[٣٦٩] (نووي) لەوبارەوە گوتوویەتی: (ولو اتَّخذ حُلِيّاً ولَمْ يَقْصُدْ بهِ استعمالاً. بَلْ قصدَ كَنْزَهُ واقتناءه فالمذهب الصحيح المشهور الذي قَطَعَ به المصنفُ والجمهورُ وجوبُ الزكاة فيه) بڕوانە: (المجموع) ج٦ص٣١.

[٣٧٠] بڕوانە: (المجموع) ج٦ص٢٤، کە گوتوویەتی: (كلُّ حُليٍّ أبيحَ للنساءِ فانما يُباحُ اذا لم يكن فيه سَرَفٌ ظاهِرٌ).

[٣٧١] بڕوانە: (مجموعة الفتاوى) ج٢٥ص١٤.

[٣٧٢] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[٣٧٣] بڕوانە: (فقه الزكاة) ج١ص٢٨٦.

[٣٧٤] هەمان سەرچاوەی پێشوو

[٣٧٥] هەمان سەرچاوەی پێشوو

[٣٧٦] (ابن تيمية) گوتوویەتی: (مالك و ليث و شافعي واحمد وابوعبيد) دەڵێن لێی نادرێ و (ابوحنيفة و ثوري اوزاعي)یش دەڵێن لێی دەدرێ، بڕوانە: (مجموعة الفتاوى) ج٢٥ص١٤، وە بڕوانە: (المجموع) ج٦ص٣٨، ٣٩.

بەلام بەچاك سەرنج دان و لێ وردبونەوەی سەرجەم دەقەكان، دەردەكەوێ كە رای زۆربەو جەماوەری زانایان بەهێزترە، بەلام بەو بەند (قید) انەوە كەخستمانەڕوو. جا ئەوە بۆ دڵنیایی زیاتریش ئاماژەیەك بەو دەقانە دەكەین و هاوكاتیش بەڵگەی هەردووك لایان دەخەینەڕوو:

أ-بەڵگەو دەقەكانی ئەوانە كە دەڵێن: خشڵ زەكاتی لێ دەدرێ:

١-(وَالَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ وَالْفِضَّةَ وَلَا يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَبَشِّرْهُمْ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ)[٣٧٧] التوبة: ٣٤،

٢- (في الرِّقَةِ رُبْعُ العُشْرِ)، (وليس فيما دون خمس أُواقٍ صَدَقَةٌ)[٣٧٨] رواه البخاري.

٣-(مامن صاحبِ ذهب ولافضةٍ لايؤدي منها حقَّها إلا إذا كان يوم القيامة صُفِّحَتْ لـه صفائحَ مـن نار، فأُحميَ عليها في نار جهنَّم..)[٣٧٩] رواه البخاري ومسلم عن ابي هريرة.

٤-( عن عمرو بن شُعَيبْ عن أبيه عن جدّه أن أمرأةً أتَتْ رسولَ الله ﷺ ومعها إبْنَةٌ لَها وفي يَـدِ إبنتها مُسْكَتانِ غَليْظَتَان مِنْ ذَهَب؛ فقال لَها: أَتُعْطِينَ زكاةَ هذا؟ قالتْ: لا، قال: أَيَسُرُّكِ أنْ يُسَـوِّرَكِ الله بِهما يوم القيامةِ سِواريْنِ مِنْ نـارٍ؟ قـال: فَخَلَعَتْـهُما فَأَلْقَتْـهما الىْ النـبيَّ ﷺ، وقـالت: هُمـا لله ورسولِه)[٣٨٠] رواه ابوداود، والترمذي بنحوه وقال: لم يصح في هذا الباب عن النبي ﷺ شيٌ.

٥-(عن عائشة رضي الله عنها قالت: دَخَلَ علي رسول الله ﷺ فرأىْ في يديَّ فَتَخـاتٍ مـن وَرِقٍ، فقال: ما هذا يا عائشة؟! فقالت: صَنَعْتُهُنَّ أَتَزَيَّنُ لَكَ يارسول الله، قال: أتؤدِّيْنَ زكاتَهُنَّ؟ قالَتْ: لا، أو ماشاءالله، قال: هو حَسْبُكِ من النار)[٣٨١] رواه ابوداود والدارقطني والحاكم والبيهقي.

٦-( عن أُمّ سلمة قالت: كنتُ أَلْبَسُ أوْضاحاً من ذَهَبٍ، فقلت: يـا رسـول الله، أكـنزٌ هُـوَ؟! قـال: مابَلَغَ أن تُؤدي زكاتَهُ فزُكّي، فَلَيْسَ بِكَنْزٍ)[٣٨٢] رواه ابوداود وغيره.

---

[٣٧٧] پێشتر مانامان كردوون.

[٣٧٨] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[٣٧٩] واتە: هیچ خاوەن زێڕو زیوێك نیە كە هەقیان لێ‌دەرناكات مەگەر ڕۆژی قیامەت لەوحی ئاگرینی بۆ دروست دەكرێن و لەئاگری دۆزەخ دا پێیان داغ دەكرێت..

[٣٨٠] واتە: ئافرەتێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ كچێكی خۆی لەگەڵ بوو كە دووبازنی زلو ئەستووری زێڕی لەدەست دابوو، پێی فەرموو: زەكاتی ئەمە دەدەی؟ گوتی: نەء، فەرمووی: حەز دەكەی خوا لەڕۆژی قیامەت دا دوو بازنی زێڕت لەدەست بكات؟ دەڵێ: یەكسەر لەدەستی داینین و بۆ پێغەمبەری ﷺ هەڵدان و گوتی: با بۆ خواو پێغەمبەرەكەی بن.

[٣٨١] واتە: پێغەمبەر ﷺ چەند ئەنگوستیلەیەكی گەورەی زیوی لەپەنجەكانی دەستی عائیشەدا بینیەوەو ئنجا كەلێی پرسیەوە ئەویش گوتوویەتی بۆ تۆ خۆمیان پێ دەرازێنمەوە، فەرموویەتی: زەكاتیان لێ دەردەكەی؟ گوتوویەتی:نەء، یان مەگەر خوا بیەوێ، ئەویش فەرموویەتی: ئەوەندەت بۆ ئاگری دۆزەخ بەسە.

ب-بەڵگەو دەقەکانی ئەوانە کە دەڵێن: خشڵ زەکاتی لێنادرێ:

١-ئەسڵ ئۆباڵی خاڵی بوونە لەئەرکی شەرعی (الأصل براءة الذمة من التكليف الشرعي) هەتا بەڵگەیەکی شەرعی ڕاستو ڕەوان دەبێ.

٢-زەکات لەماڵو سامانێك دا فەرز دەبێ کە لە گەشەکردن (نمو)دا بێ یان دانرابێ بۆ گەشەکردن، دەجا بێگومان خشڵ کە بەکاردەهێنرێو بەخۆوە دەخرێ لەوە چۆتە دەرێ کە مامەڵەو بازرگانی پێبکرێو گەشە بکاتو زیاد بکات، وەك چۆن ئاژەڵیش - بۆ وێنە: حوشترو کەڵو گامێش و گاو مانگا - ئەگەر کاری پێکرا، وەك بارلێنانو ئاوپێهەڵهێنجانو زەوی پێکێڵان، زەکاتی لێنادرێ، وەك پێشتر باسمان کردوە.

٣-هەربۆیەش لە ژمارەیەك لە هاوەڵانەوە خوالێیان ڕازیبێ گێڕراوەتەوە کە گوتوویانە: خشڵ زەکاتی لێ دەرناکرێ، هەروەك چەند دەقێك لەپێغەمبەری خوا ﷺ گێڕراونەوە لەو بارەوە، بۆ وێنە:

*پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (يا مَعْشَرَ النساءِ تَصَدَّقْنَ ولَوْ من حُلِيِّكُنَّ) رواه البخاري.

(ابن العربي) گوتوویەتی: (ڕواڵەتی ئەم فەرموودەیە ئەوە دەگەیەنێ کە زەکات لەخشڵدا نیە، چونکە بەئافرەتانی فەرمووە: (ئەگەر لەخشڵەکانیشتان بووە خێر بکەن) جا بێگومان ئەگەر زەکاتی تێدا فەرزبووایە وێنەی پێ نەدەهێنایەوە بۆ ماڵ بەخشینی سوننەت)[٢٨٣]

* هەروەها فەرموویەتی: (لَيْسَ في الحُلِيِّ زَكاةٌ) رواه البيهقي، واتە: لەخشل دا زەکات نیە.

*وە (مالك) لە (قاسم بن محمد بن أبي بكر الصديق) گێڕاویەتەوە کە گوتوویەتی: عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر ﷺ سەرپەرشتی کچەکانی برایەکەی دەکرد کەهەتیو بوونو لەباوەشیدا بوون، خشڵی لەبەردەکردنو زەکاتی لەخشڵەکەیان نەدەدا[٢٨٤].

* دیسان (مالك) لە (نافع) ی گێڕاوەتەوە کە (عبدالله ابن عمر) خوالێیان ڕازیبێ خشڵی زێڕی وە کچەکانیو کەنیزەکانی دەخستو پاشان زەکاتی لەخشڵەکەیان نەدەدا[٢٨٥].

* هەروەها (ابن ابي شيبة) و (أبوعبيد) هەمان مەسەلەیان لە (جابر بن عبدالله) و (اسماء بنت ابي بكر) خوا لێیان ڕازیبێ گێڕاوەتەوە[٢٨٦].

---

←[٢٨٢] واتە: خرخاڵ - یان جۆرە خشڵێك - ی زێڕم دەبەر دەکرد، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەوە بەپەزمەندە (خزن) کردن دادەنرێ؟ فەرمووی: هەر ماڵێك بگاتە ڕاددەی زەکات لێدرانو زەکاتی لێدرا، بەپەزمەندەکردن دانانرێ.

[٢٨٣] بڕوانە: (شرح الترمذي) ج٣ص١٣٠، ١٣١، وە بڕوانە: (فقه الزكاة) ج١ص٢٩٢.

[٢٨٤] بڕوانە : (الموطأ) ص٢١٠.

[٢٨٥] بڕوانە: (الموطأ) ص٢١٠.

(ابو الوليد الباجي) لـه (شـرح الموطـأ) دا گوتوویـەتی:[287] (ئەمـە – زەكـات لەخشـڵ دەرنەكردن – ڕایەكی ئاشكرای نێو هاوەڵان بووەو، زاناترین كەسیش لەوبارەوە عائیشەیە خوا لێی ڕازیبێ، چونكە هاوسەری پێغەمبەر ﷺ بوەو كاروباری پێغەمبەری لێ پەنهان نەبووە، هەروەها (عبدالله بن عمر) كە (حفصة)ی خوشكی هاوسەری پێغەمبەر ﷺ بووەو خشڵەكەی لەپێغەمبەر ﷺ پەنهان نەبووەو، ئەویش حوكمەكەی لێشێرراوە نەبووە).

* وە لە (حسن البصري) یەوە هاتوە كە گوتوویەتی: (نەمانزانیوە هیچ كام لەخەلیفەكان گوتبیان خشڵ زەكاتی لێدەدرێ)[288].

ئەو دەقانەش كە ئەوانە بە بەڵگەیان هێناونەوە كە زەكات لەخشڵ دەدرێ، بـە بەڵگـە ناشێن، چونكە:

١-جارێ بۆ ئایەتی (والذين يكنزون الذهب والفضـة..) وە ئەوە كە پێیان وابووە (خشڵ) دەچێتە خانەی (كَنْز)ەوە، هەڵەیە، چونكـە ئایەتەكـە مەبەسـتی پـێ پـارەو دراوێكـە كـە بگونجێ سەرف بكرێو مامەڵەی پێبكرێ، بەبەڵگەی ئەوە كە فەرموویـەتی: (ولاينفقونـها في سـبيل الله) جا دیارە ئەو سیفەتەش بۆ پارە دەشێ نەك بۆ خشڵێك كە بۆ خۆپێ ڕازاندنەوە بەكاردێ.

٢-هەركام لەفەرموودەی: (**في الرقةِ رُبعُ العُشْرِ**) و (**مـامن صـاحب ذهـبٍ ولافضـة...**)یش كە هەردوكیان ڕاست (صحیح)ن، بە ئاشكرا تێیان دا دەبینرێ كەمەبەست پێیـان دینـارو درەمو (ماڵی نەغدینە)یەو هیچ پەیوەندییان بە (خشڵ) ەوە نیە.

٣-سـێ دەقەكـەی دیكـەش زانایـان مشـتومڕی زۆریـان لـەبارەی زنجیرەی گـێڕەرەوە (سلسلة الـرواة) كانیـان كـردوەو، هەیانـە وەك (ترمـذي) ڕەدی كردوونـەوەو لـەوبارەوە گوتوویەتی: (لايَصِحُّ في هذا الباب شيئٌ)[289]، وە (ابن حزم) كە ڕاشی وایە (خشڵ) زەكـاتی لـێدەدرێ، لەبارەی ئەو دەقانەوە گوتوویەتی: (واْحْتجَّ مَنْ رأئ إيجابَ الزكـاة في الحُلـيِّ بآثـار وا هيـة لاوَجْـهَ للاْشْـتِغالِ بِـها)[290] واتـە: وە ئەوانـەی كـە پێیـان وایـە زەكـات دان لە(خشڵ)دا فەرزە، چـەند دەقێكـی بێهێزیـان بـە بەڵگـە هێناونـەوە كەشـایانی خۆپێـوە خەریك كردن نین.[291]

---

[286] بڕوانە: (فقه الزكاة) ج١ص٢٩٠، كە لە (المُصَنَّف) لابن ابي شيبة ج٤ص٢٨، وە (الأموال) لأبي عبيد ص٤٤٣، وەریگرتوون.

[287] بڕوانە: (المنتقى شرح الموطأ) ج٢ص١٠٧.

[288] بڕوانە: (فقه الزكاة) ج١ص٢٩١، كە لە: (المصنف) ج٤ص٢٨، وەریگرتوە.

[289] بڕوانە: (صحيح الترمذي بشرح ابن العربي) ج٣ص١٣١.

[290] بڕوانە: (المحلى) ج٦ص٤٨، مسألە (٦٨٤) لە ص٤٥تا٥٢.

[291] بۆ هەڵسەنگاندنی ئەو دەقانە بڕوانە: (فقه الزكاة) ج١ص٢٩٩تا٣٠٣

ئنجا زانایان – ئەگەر گریمان ئەو دەقانە ڕاست (صحیح)یش بن – بەچەند شێوەیەك تەئویلیان كردوون:

یەك: هەندێكیان گوتوویانە: كاتێك زەكات لەخشڵ دا هەبووە كە بەكارهێنانی خشڵ حەرام بووە، بەڵام كە حەڵاڵ كراوە زەكاتی تێدا نەماوە، (بَیْهَقِي) گوتوویەتی: زۆر لەهاوەڵانمان ڕایان وابووە، پاشان چەند دەقێكی هێناوە كە حەرامیی خشڵ دەگەیەنن، پاشان چەند دەقێكی دیكەی هێناوە كە موباح بوونی دەگەیەنن بۆ ئافرەتان، وگوتوویەتی: ئەو یەكدەنگی (إجماع)یەی كە لەسەر موباح بوونی خشڵ پەیدا بووە بەڵگەیە لەسەر نەسخ كرانەوەی حەرامێتی‌یەكەی بۆ ئافرەتان بەتایبەت.[392]

دوو: هەندێكیشیان گوتوویانە: پێغەمبەر ﷺ بۆ خێزانو بنەماڵەی خۆی زیاتر سەخت گیری كردوەو هەوڵی داوە زیاتر بەلای ژیانی سادەو زبردا پەلكێشیان بكاتو، ئەو حوكمە – كە بەكارهێنانی خشڵ حەرامە مەگەر زەكاتی لێ‌بدرێ – تایبەت بووە بەوانەوە، هەربۆیەش ئەوان بۆ خەڵكی بەگشتی فەتوایان بەوە نەداوە.

سێ: هەندێك لە زانایانیش گوتوویانە: پێغەمبەر ﷺ بۆیە زەكاتی لەوجۆرە خشڵانەدا فەرز كردوە، چونكە بینیویەتی ئیسرافو زیادەڕۆیی‌یان تێدا كراوە، دیارە هەركام لە وشەی: (مُسْكَتان غَلِیْظَتان) و (فَتَخاتٌ) یش پشتگیری ئەو تەئویلە دەكەن.

چوار: هەندێكیشیان (زەكاتی خشڵ) یان وا لێكداوەتەوە كە بریتیە لە بە ئەمانەت وەخەڵكی دانی بۆ كاتی زەماوەندو بۆنەكان (مُناسَباتْ) ، (بیهقي) ئەوجۆرە مانا لێدانەوەی بۆ زەكاتی خشڵ لە (ابن عمر وابن المسیب) گێڕاوەتەوە، وە (ابن أبي شیبة و أبوعبید)یش لە (سعید بن المسیِّب و الحسن البصری قتادة و شعبي) گێڕاویانەتەوە كە گوتوویانە: (زكاة الحلْيِّ إعارتُهُ)، واتە: زەكاتی خشڵ ئەوەیە كە بەئەمانەت وەخەڵكی بدات[393].

---

[392] بڕوانە: (فقه الزكاة) ج١ص٣٠٣، ٣٠٤، شایانی باسە ئەو یەكدەنگی‌یەی زانایان لەسەر موباحێتی خشل بۆ ئافرەتان، جگە لە (بیهقي) كە لە (سنن) ج٤ص١٤٢دا هێناویەتی، (ابن حجر)یش لە (فتح الباري) ج١١ص٥٠٢ هێناویەتی، كەواتە ئەوەی كە زانای فەرموودەناس (ناصرالدین الألباني) لەكتێبی (آداب الزفاف) ص٢٢٢ ط٢، دا گوتوویەتی كە بەكارهێنانی زێڕ بۆ ئافرەتانیش وەك پیاوان حەرامە، مەگەر ئەوەی وردو پارچە پارچەكراو (الذهبُ المُقَطَّعٌ) بێ! ڕایەكی بێ‌هێزو ڕیزپەڕیشە، چونكە زانایانی ئیسلام بەدرێژایی مێژوولەسەر زەكات لێدرانو لێنەدرانی خشڵی ئافرەتان مشتومڕیان بووە، وە لەهەموو وڵاتانو گۆشەو كەناری جیهانی ئیسلامیش ئافرەتانی مسوڵمان خشڵی زێڕیان هەر بەكارهێناوەو زاناو شەرعزانان هیچیان نەگوتوە، بڕوانە: (فقه الزكاة) ج١ص٣٠٤.

[393] بۆ نووسینی باسی: (زەكاتی خشڵ) سوودێكی زۆرم لە (فقه الزكاة) ج١ص٢٨٢تا ٣١١، وەرگرتوە.

## ١٥- بەروبوومی دەریا:

بەروبووم و بەرهەمێك كە لە دەریا دەردەهێنرێ چ گیانداربێ وەك ماسی و هەرجۆرە گیاندارێكی دیكە كە گۆشتی بخورێ، وەچ بێ گیان بێ وەك گەوهەرو مرواری (اللؤلؤ والمرجان) و عەنبەر - كەجۆرە بۆنێكی زۆر خۆشە -، دوای ئەوەی زانایان لەسەر ئەوە یەكدەنگ بوو ون كە ئەگەر كران بەكەل وپەل و شمەكی بازرگانی زەكاتیان تێدا فەرز دەبێ وەك هەر ماڵێكی دیكەی بازرگانی، لەوەدا كە ئەگەر بابای دەرهێنەرو وەدەست هێنەر نەیكردنە ماڵی بازرگانی رایان جیاوازە؛ زۆربەیان كە (أبوحنیفة و مالك و شافعي واحمد) یشیان لەنێودا هەن دەڵێن: زەكاتیان لێناكەوێ[٣٩٤]، (ابن حزم) لەوبارەوە گوتوویەتی:[٣٩٥] (مسألە: (٧٠٣) ولَيسَ في شيءٍ مما أُصيبَ من العَنْبَرِ والجواهر والياقوتِ والزمُرُّد بَحْرِيَّةٍ وبَرِّيةٍ، شيئ أصلاً، وهو كلهُ لمن وَجَدَهُ) واتە: وە لەهیچ كام لەعەنبەر[٣٩٦] و گەوهەرو یاقووت و[٣٩٧] زومورڕود[٣٩٨] كە وەدەست دەهێنرێن چ دەریایی بن چ هی ئیشكانی هیچ هەقێكیان تێدا نیەو، هەمووی بۆ ئەو كەسەیە كەپەیدای دەكات.

بەڵام پێم وایە ئەگەر زانایانی پێشینمان ئەو هەموو بەرهەم و بەروبوومەیان بینیبایە كە لەم رۆژگارەدا لەدەریاكان دەردەهێنرێ، بەخوراوو نەخوراوەوە بەتەنكید راو بۆچوونێكی دیكەیان لەوبارەوە دەبوو، هەڵبەتە لەهەركام لە (عمر بن الخطاب) و (ابن عباس)یشەوە خوالێیان رازیبێ گێراوەتەوە، كە گوتوویانە: بەروبوومی نەخوراوی دەریا، وەك خشڵ و عەنبەر پێنج یەك (١/٥)ی زەكات تێدایە[٣٩٩].

وە هەمان راو بۆچوون (أبوعبيد) لە (الحسن البصري و ابن الشهاب الزهري) و (عبدالرزاق و ابن أبي شيبة)ش لە (عمر بن عبدالعزيز) یان گێراوەتەوە، وە ئەوە رای (أبو يوسف) ە ریوایەتێكیشە لە (احمد) ەوە، خوا لە هەموویان خۆش بێ،[٤٠٠].

---

[٣٩٤] بروانە: (مجموعة الفتاوى) ج٢٥ص١٥، وە: (الفقه الأسلامي..) ج٢ص٧٧٥تا ٧٨٤، ط٣.

[٣٩٥] بروانە: (المحلى) ج٦ص٧٧.

[٣٩٦] عەنبەر: ماددەیەكی رەقە تام و بۆنی نیە هەتا نەهاڕێ یان نەسووتێنرێ، بروانە: (المعجم الوسيط) ص٦٣٠.

[٣٩٧] یاقووت: بەردێكی بەنرخە لەدوای ئەڵماس پتەوترین كانزایە، بروانە: (المعجم الوسيط) ص١٠٦٥.

[٣٩٨] زومورڕود: بەردێكی بەنرخە رەنگەكەی سەوزەو روونە، بروانە: سەرچاوەی پێشوو، ص٤٠٠.

[٣٩٩] بروانە: (المحلى) ج٦ص٧٧.

[٤٠٠] بروانە: (فقه الزكاة) ج١ص٤٥٤.

هەرچەندە بۆ ڕێژەی زەکاتەکە هەق وایە بەئەندازەی کەمی و زیادی مەسرەف و تێچوون و ڕەنج و ماندووبوون بگۆڕێ، وەك هەرکام لە (مالك و شافعي) ڕایەکی لەوجۆرەیان دەربارەی کانزا (معدن) وە بەگشتی لێوە نەقڵ کراوە.[401]

جا هەرچەندە ئەوەی لە پێشەوە گوترا هەموو بەرهەمو بەروبوومی دەریای گرتەوە – هەرچەندە هەندێکیان بەهەندێك جۆرەوە تایبەتیان کردبوو – بە ماسی و جۆرە گۆشتەکانی دیکەشەوە کە زۆر زۆرن، بەڵام دەربارەی ماسی و گۆشتیش بەتایبەت زانایان هەندێك شتیان گوتوە، بۆ وێنە:

(ابو عُبَيد) لە (يونس بن عُبَيدْ)ی گێڕاوەتەوە کە عومەری کوڕی عەبدولعەزیز بۆ والییەکەی خۆی کە لە (عومان) بووە نووسیویەتی: (أنْ لايَأْخُذَ من السَّمَكِ شَيْئاً حتَّى يَبْلُغَ مائتَيْ درهمٍ، فاذا بَلَغَ مائتَيْ درهم فُخُذْ منه الزكاة)[402]، واتە: کە هیچ زەکات لە ماسی وەرنەگرێ هەتا دەگاتە بایی دووسەد درەمی زیو – کە ڕاددەی زەکات لێکەوتن (نصاب)ی پارەی نەغدینەیە –، جا هەرکات گەیشتە دووسەد درەم زەکاتی لێ وەربگرە.

هەروەها هەمان مەسەلە لە (احمد)یش گێڕراوەتەوە[403].

(شیعەی ئیمامی)یش دەڵێن پێنج یەك (٥/١)ی تێدایە چونکە ئەوان پێیان وایە حوکمی دەستکەوتی جەنگی (غنيمة) ی هەیە[404].

## ١٦–زەکاتی بەروبوومی چەند زیندەوەرو گیاندارێك:

یەك: هەنگ (مێشەنگوین)ە کە بەرهەمەکەی تەنیا هەنگوین (عَسَلْ)ە:

زانایان لەبارەی هەنگوینەوە کە ئایا زەکاتی لێ دەدرێ یان نا ڕایان جیا جیایە، هەرچی (أوزاعي) و حەنەفییەکان و حەنبەلییەکان دەڵێن: زەکاتی لێ دەدرێ، بەڵام (ابوحنيفة) ئەوەی بەمەرج گرتوە کە هەنگە کە لەزەوی خەراجیی دانەبووبێ، وە (ابوحنيفة) ڕای وایە هەنگوینەکە کەم بێ یان زۆر دەبێ زەکاتی هەر لێ بدرێ، بەڵام حەنبەلییەکان دەڵێن دەبێ بگاتە (نصاب) و ئەویش بریتیە لە دە (١٠) فەرق (عشرة أفْراق)[405] کە دەکاتە (١٦٠) (رطل) یان (١٠٠) کیلۆگرام، چونکە هەر (فرق)ێك (١٦) (رطل) یان (١٠) کیلۆیە[406].

---

[401] سەرچاوەی پێشوو، ج١ص٤٥٥.

[402] هەمان سەرچاوەو بەرگ ص٤٥٥، ٤٥٦.

[403] بڕوانە: (المغني والشرح الكبير) ج٢ص٦٢٠.

[404] بڕوانە: (الفقه على المذاهب الخمسة) ص١٨٧.

[405] بڕوانە: (مجموعة الفتاوى) ج٢٥ص١٦، وە: (الفقه الأسلامي..) ج٣ص١٨٨٨، ط٤، بەڵام (ابن تيمية) گوتوویەتی (احمد)یش ڕای لەگەڵ ئەوانەدایە کە زەکاتی لێ نادرێ، بەڵام لە (المغني) ج٢ص٥٧٧تا٥٧٩،

(مالك و شافعي)یش ڕایان وایە کە زەکاتی لێنادرێ، هەروەها (ابن ابي ليلى) و (الحسن بن ابي صالح) و (ابن المنذر) یش هەمان ڕایان هەیە[407].

ا-بەڵگەی ئەوانە کە دەڵێن زەکات لەهەنگوین دەدرێ:

١-( عن عمر بن شعيب عن أبيه عن جده عن النبي ﷺ أنَّه أخَذَ مِنَ العَسَلِ العُشْرَ) رواه ابن ماجة، واتە: پێغەمبەر ﷺ دەیيەكی (زەكات) لەهەنگوین وەرگرتوە.

٢- (عن سليمان بن موسى أن أبا سيارة المتعي قال: قلت يارسول الله إنَّ لي نَحْلاً، قـال: فـأَدِّ العُشُورِ قلت يارسول الله إَحْمِ لي جَبَلَها، قال: فَحَميٰ لي جَبَلَها) رواه احمد وابن ماجة.

واتە: (ابو سيارة) دەڵێ: گوتم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من هەنگم هەن، فەرمووی: دەجا دەیيەكیان لێبدە (واتە زەكات) گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا دەجا چیاو كێوەكانم بۆ پاوان بكە! گوتی: ئەویش ئەو چیاو كێوانە – ی كە هەنگەكەمی لێیە – بۆی پاوان كردم.

٣-(عن سعد بن أبي ذُباب أن النبي ﷺ أستعملهُ علـى قَوْمِـه وأنـه قـال لَهُمْ: أدّوا العُشْـر في العَسَلِ، وأنه أتى به عُمَرَ فَقبِضَهُ فَباعَهُ ثم جَعَلَهُ في صَدَقاتِ المُسْلِمينَ) رواه البيهقي، واتە: (سعد بن ابي ذباب) دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر ﷺ كردوويەتە برا گەورە بەسەر گەلەكەیەوەو پێشی گوتوون: دەیيەكی هەنگوین زەكات بدەن، ئنجا ئـەویش ئـەو دەیيەكـەی هێنـاوە بـۆلای عومـەر – خـوا لێـی ڕازیبـێ – و ئـەویش وەریگرتـوەو فرۆشـتوویەتی پاشـان خستوویەتەگەڵ زەكاتەكانی مسوڵمانان.

٤-(عن أبن عمر رضي الله عنـهما أن رسـول الله عليـه وسـلم قـال: في العَسَلِ في كـلَ عَشْـرَة أزْقاقٍ زِقٌ) رواه الترمذي، واتە: زەكاتی هەنگوین هەر لە دە پێستە (كوندە) پێستەیەكە.

ب-بەڵگەی ئەوانە كە دەڵێن هەنگوین زەكاتی لێ نادرێ:

١-دەڵێن: دەربارەی زەكـاتی هـەنگوین هیچ دەقێكـی ڕاسـت (صـحيح) نیەو زانایـانیش لەسەری یەكدەنگ نین[408].

٢-دەڵێن: شێوەی (شیر) دەكات، شیریش بەیەكدەنگی زانایان زەكاتی لێنادرێ.

---

گوتوویەتی: مەزهـەبی (احمـد) ئەوەیە كـە بـەڕێژەی دەیيـەك (١٠/١) زەكـات لەهـەنگوین دەدرێ مـادام گەییێتە (نصاب) كە دە (فرق)ە.

[406] بڕوانە: (الفقه الاسلامي) ج١ص١٤٣، ط٤.

[407] بڕوانە: (مجموعة الفتاوى) ج٢٥ص١٦.

[408] بڕوانە: (فقه الزكاة) ج١ص٤٢٥، كە ئەوە قسەی (ابن المنذر)ە.

بەڵام وا پێدەچێ ڕای یەکەم بەهێزتربێ چونکە دەقەکان ئەگەر قسەش لەسەر زنجیرەی ڕاوییەکانیان کرابێ، بەڵام بەهەموویان یەکتر بەهێز دەکەن، لەڕووی قیاسیشەوە مادام هەنگوین لە شیلەی گوڵ و کلۆوکی دارو درەخت و ڕووەك دروست دەبێ و، هەڵیش دەگیرێ و پاشەکەوت دەکرێ، جێی خۆیەتی وەك بەروبوومی کشتوکاڵ حیسابی بۆ بکرێ[409]، ئەوەش کە دەگوترێ: ماددەیەکی شلی وەك شیرەو شیریش زەکاتی لێنادرێ، (ابن قدامة) بەوە وەڵامی داوەتەوە: کە شیر زەکات لەئەسڵەکەی کە ئاژەڵە دەدرێ، بەڵام هەنگوین ئەسڵەکەی زەکاتی لێنادرێ[410].

دەربارەی ئەندازەی زەکات لێکەوتن (نصاب)ی هەنگوینیش پێشتر گوتمان کە (احمد) ڕای وایە دە (فَرْق) ە کە دەیکردە (١٠٠) کیلۆگرام، هەندێکی دیکەشیان – وەك ابویوسف و محمد بن الحسن[411] – ڕایان وایە کە (نصاب)ی هەنگوین بریتیە لەپێنج وەسق، کەوەك پێشتر گوتمان دەکاتە (٦٥٣) کیلۆگرام بەڕای جەماوەری زانایان، بەڵگەشیان ئەوەیە کەپێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

(لَيْس فيما دون خَمْسَةِ أَوْسُقٍ صَدَقَةٌ) رواه احمد والبيهقي بسند جيد عن ابي هريرة.

بەڵام بێگومان ئەو پێنج وەسقە بۆ دانەوێڵەیە، جا ئەگەر ئەم ڕایەمان هەڵبژارد بۆ دیاریکردنی (نصاب)ی هەنگوین – کە وەك د.یوسف القرضاوي، گوتوویەتی واش پێدەچێ ئەم ڕایە چاکتربێ[412]– ئەوە دەبێ بڵێین هەرکاتێك کەسێك هێندەی هەنگوین هەبوو کەبایی (٦٥٣) کیلۆگرام لەبژێوی ئەو شوێنە بکات، چ برنج بێ چ گەنم چ مێوژ.. هتد ئەوە زەکاتی لێدەکەوێ.

دوو: بەروبوومی کرمی ئاوریشم و شیری مانگای دابەستراوو مریشك و پەڕەوری بۆ هێلکەو گۆشت بەخێوکراو:

ئاشکرایە کە لەڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی بەڕێزی خوالێیان ڕازیبێ و پێشەواو شەرعزانانی پێشین خوالێیان خۆش بێ مانگاو گامێشی بۆ شیر دابەستراوو کرمی ئاوریشم دروستکەرو کێڵگەی مریشك (دَواجِن) و پەڕەور، نەبوو ون، بۆیە لەوبارەوە هیچیان نەفەرمووەو هیچ حوکمێکیان نەداوە.

[409] سەرچاوەی پێشوو ج١ص٤٢٤.

[410] بڕوانە: (المغني والشرح الكبير) ج٢ص٥٧٧.

[411] بڕوانە: (المغني) ج٢ص٥٧٧، ٥٧٨.

[412] بڕوانە: (فقه الزكاة) ج١ص٤٢٨، ٤٢٩، د. يوسف القرضاوي.

بەڵام کە دەبینن زاناو شەرعزانانی پێشوومان زەکاتیان لەشیری مانگاو مەڕو بزن و حوشتردا دیاری نەکردوە، بەڵام زۆریان لەهەنگوینی هەنگ دا بەپێویستیان زانیوە، هەرچەندە هەردووکیشیان - واتە شیرو هەنگوین - دوو ماددەی شلن کە لەگیانلەبەر پەیدا دەبن، لەمەوە دەگەینە ئەو ئەنجامە کەهەر شتێك زەکات لەئەسڵەکەی بدرێ لەبەرووبوم و بەرهەمەکەی ناکەوێ، دیارە زەوی کشتوکاڵ و خانوو و بەرەی کرێ و هۆیەکانی گواستنەوەو هاتوچۆ وەك سەییارەو کەشتی و شەمەندەفەرو فرۆکەو.. هتدیش - هەروان، بەڵام هەرشتێك زەکات لەئەسڵەکەی نەدرێ لەبەرووبووم و بەرهەمەکەیدا پێویست دەبێ، کەهەرکام لەهەنگ و کرمی ئاوریشم (دودة القز) و ئاژەڵی دابەستراوو مریشك و پەڕەوری بەخێوکراو لەوجۆرەن، چونکە زەکات لەخودی خۆیان دەرناکرێ، بەڵام لە بەرهەمەکانیان دەردەکرێ[٤١٣]، (نصاب)ی زەکات لێکەوتنیشیان ئەگەر وەك (نصاب)ی بەروبوومی کشتوکاڵ بێ ڕەنگە ڕاست تر بێت، واتە هەرکاتێك بەرهەمەکەیان گەیشتە ڕاددەیەك کەبارتەقا (مقابل)ی پێنج وەسق دانەوێڵە بێت زەکاتیان لێ بدرێ بەڕێژەی دەییەك (العشر)، بەڵام پاش لێداشکاندنی ئەو کرێ و مەسرەفەی کە لێیان کراوەو لەو بەرهەم و بەروبوومە چووە، واتە پێویستە پاش داشکاندنی کرێ و مەسرەفەکەیان لە (نصاب) کەمتر نەبن .

ئنجا پێویستە ئەوەش بگوترێ کە هەرکام لەبەروبوومی دەریاو بەرهەمی ئەو زیندەوەرو گیانلەبەرانەی باسمان کردن هەرچۆن بێ لەزەکات هەر قوتار نابن، چونکە جارێ ئەگەر بکرێنە شمەك و کەلوپەلی بازرگانی (عروض التجارة) ئەوە بەیەکدەنگی (إجماع) ی زانایان پێویستە وەك هەر کەلوپەلێکی دیکەی بازرگانی زەکاتیان لێ بدرێ، بەڵام ئەگەر نەکرێنە کەلوپەلی بازرگانی ئەوە لەدوو حاڵ بەولاوە نیە: یان سەرەنجام دەبنە پارەی نەغدینە کە زەکاتی لێ دەدرێ - ئەگەر مەرجەکانی تێدا بێنەدی - یان دەکرێنە کەلوپەلی ماڵ -دیارە ئەم قسەیە بەروبوومی هەنگ و ئاژەڵ و پەڕەوری دابەستراوو بەخێوکراو ناگرێتەوە -، ئنجا ئەگەر کرانە کەلوپەلی نێو ماڵیش بۆ وێنە خشڵ و جلوبەرگ و کەلوپەلەکە بەکارهێنانی حەڵاڵ بێ و لەسنووری عورف و باو دەرنەچووبێ ئەوە هیچ، ئەگەرنا ئەگەر بەکارهێنانی حەرام بوو یان لەسنووری عورف و عادەت بەولاوەبوو، وە بۆ ڕاکردن لەزەکات بوو ئەوە لەهەموو ئەو حاڵانەدا پێویستە زەکاتیان هەر لێ وەربگیرێ.

---

[٤١٣] بڕوانە: (فقه الزكاة) (ج١ص٤٣٠، ٤٣١) ط٣. د. يوسف القرضاوي.

## ١٧- ماڵی حەرام زەکاتی لێنادرێ:

زانایان تێکڕا لەسەر ئەوە ڕێك کەوتوون کە ماڵی حەرام زەکاتی لێناکەوێ، چونکە ئەو کەسەی ماڵو سامانێکی حەرامی دێتە دەست لە ڕووی شەرعی‌یەوە نابێتە خاوەنی و بەهی وی دانانرێ، تاکو بەهۆی ئەو ماڵەوە بەدەوڵەمەند دابنرێو زەکاتی لەسەر پێویست بکرێ، (قرطبي) لەوبارەوە گوتوویەتی: (وإنّما لايقبل الله الصدقة بالحرام لأنّه غير مَمْلوك للمُتَصدِّقِ، وهو ممنوع من التصرُّف فيه والمُتَصدِّق به مُتَصَرِّفٌ فيه، فَلَوْ قُبِلَ منه لَزِمَ أن يكون الشيُ مأموراً مَنهيّاً من وجهٍ واحدٍ وهو محالٌ).[٤١٤]

واتە: لەسۆنگەی ئەوەوە خوا ماڵ بەخشینی حەرام وەرناگرێ چونکە ماڵی حەرام موڵکی بابای بەخشەر نیە، بەڵکو ئەو بۆی نیە دەستکاری بکات، ئاشکراشە کە خێر پێکەرو بەخشەریش دەستکاری کردوە! جا ئەگەر لێی قبووڵ کرابایە مانای وایە یەك شت لە یەك کات داو لە یەك ڕووەوە هەم فەرمان پێکراو دەبوو هەم قەدەغەکراو، بێگومان ئەوەش مەحاڵە.

ئەمەش چەند دەقێکی قورئان و سوننەت لەوبارەوە:

١- خوای دادگەر[٤١٥] فەرموویەتی: (إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ اللَّـهُ مِنَ الْمُتَّقِينَ) المائدة: ٢٧، واتە: بێگومان خوا بەخشین - و هەر کارێکی دیکەی چاك - تەنیا لەپارێزکاران وەردەگرێ، ئنجا ئاشکراشە کە کەسێك ماڵ و سامانی حەرامو پیس پەیدا بکاتو کەڵەکە بکات بەپارێزکار (متقي) دانانرێ خواش لەپارێزکاران نەبێ وەرناگرێ.

٢- پێغەمبەری خواش ﷺ فەرموویەتی:[٤١٦] (مَنْ تَصَدَّقَ بِعَدلِ تَمْرةٍ من كَسْبٍ طَيِّبٍ ولايَصْعَدُ الى الله الا الطَّيِّبُ، فانَّ الله تعالى يَتَقَبَّلُها بِيَمينه، ثم يُرَبّيها لصاحِبِها كما يُرَبّي أحدكُمْ فَلُوَّهُ حَتّى تكونَ مِثْلَ الجَبَلِ) رواه البخاري ومسلم عن أبي هريرة رضي الله عنه.

واتە: هەرکەسێك هێندەی دەنکە خورمایەك لەماڵێکی حەڵاڵ ببەخشێ، وە کاری چاكو پاکیش نەبێ بۆلای خوا بەرز نابێتەوە، ئەوە بێگومان خوای بەرز بەڕاستەی وەری‌دەگرێ، پاشان بۆ خاوەنەکەی هەراشی دەکات، وەك چۆن یەکێکتان جوانووەکەی[٤١٧] بەخێودەکات، هەتا هێندەی چیایەکی لێدێ[٤١٨].

---

[٤١٤] بڕوانە: (فتح الباري) ج٤ص٢٦.

[٤١٥] دیارە ئەو قسەیە ئی کوڕە صاڵحەکەی ئادەمە کە مێژوونووسان دەڵێن ناوی (هابیل) بووە، بەڵام بەو ئیعتیبارە کە خوا فەرموویەتیو پەسندیشی کردوە بەفەرمایشتی وی دادەنرێ.

[٤١٦] بڕوانە: (فتح الباري) ج١٥ص٣٧٥، و (شرح صحيح مسلم) ج٤ص٢٧٩٦.

[٤١٧] (فلو) بەچکەی ئەسپ وماینە، کە بەکوردی (جوانوو) ی پێدەڵێن، وە عارەب (مهر)یشی پێدەڵێن.

[٤١٨] بۆ توێژینەوەو شەرحی ئەو فەرموودەیە بڕوانە: (فتح الباري) ج٤ص٢٦، ٢٧، وە بڕوانە: (شرح صحيح البخاري) ج٤ص٢٧٩٦، ٢٧٩٧.

٣-هەروەها فەرموویەتی: (أيُّها الناسُ! إنّ الله طَيِّبٌ لايَقْبَلُ إلاّ طَيِّباً..) متفق عليه عن ابي هريرة.

واتە:ئەی خەڵکینە! بێگومان خوا پاك و چاكەو - کردەوەی - پاكو چاكیش نەبێ وەرناگرێ..

٤-دیسان فەرموویەتی: (لايَقْبَلُ اللهُ صَدَقَةً مِنْ غُلولٍ ولا صلاةً بِغَيْرِ طُهورٍ) رواه ابوداود وقال الحافظ ابن حجر إسنادُهُ صحيح[419].

واتە: خوا ماڵ بەخشینێك كە لەغەنیمەتی دزراوبێ، وە نوێژێك بەبێ دەستنوێژی كرابێ، وەریان ناگرێ.

خوێنەری بەڕێز!

سەرنج بدە چۆن پێغەمبەری پێشەوامان ﷺ نوێژی بەجەستەی پیسو بێنوێژەوەی لەگەڵ ماڵ بەخشین لە ماڵی دزراو لەدەستكەوتی جەنگ (غنيمة)دای پێكەوە خستوونە تەرازووەوە! كەواتە وەك چۆن نوێژی بێدەست نوێژ وەك دیواری بێناغە هەر لە سەرەتاوە بنیات نانرێو دانامەزرێ، خێرو چاكەو ماڵ بەخشینی ماڵو سامانی حەرامو دزراویش وایەو هەر لە ڕێوەو لە بناغەوە بەكەڵك نایەت، جا چ ماڵ بەخشینی فەرزبێ، كە زەكاتە چ سوننەت بێ[420].

بەم باسەش كۆتایی بە بەندی دووەم دێنینو دەچینە سەر بەندی سێیەم لەباسی ماڵ بەخشین، كە بریتیە لە: (بەراوردێك لەنێوان زەكاتو باج دا).



[419] بڕوانە: (فتح الباري) ج٤ص٢٥.

[420] لەكۆتایی برگەی یازدەیەمی خاڵی پێنجەمی (ماڵ بەخشینی سوننەت) لەبەندی یەكەمیش دا تیشكمان خستۆتە سەر ئەم باسە.

# بەندی سێیەم

# بەراوردێك لەنێوان زەكاتو باج دا

-ماهیەتی زەكاتو باجو خاڵە هاوبەشو جیاوازەكانیان.

٢-بنەمای مەبدەئی ی زەكاتو باج.

٣-زەكاتو باج لەچی دەدرێن؟!

٤-پرانسیپەكانی دادگەریی لەنێوان زەكاتو باج دا.

٥-بۆچی لەزەكات دان دا شێوازی ڕێژەیی هەڵبژێرراوە نەك هەڵكشین؟!

٦-دەستەبەركەرەكانی زەكاتو باج.

٧-ئایا وێڕای زەكات دروستە باجیش دابنرێ؟!

٨-ئایا باجەكان (ضرائب) دەبنە جێدار (بدیل)ی زەكات؟!

## ڕێ خۆشکردن

خوێنەری بەڕێز! خوا پشتیوان بێ لەم بەندەدا هەوڵ دەدەین لەهەشت خاڵدا تیشک بخەینە سەر هەرکام لەزەکات و باج (ضريبة) بەهۆی پێکەوە بەراودکردنیان و ڕوونکردنەوەی خاڵە هاوبەشەکانیان و جیاوازی‌یەکانیان.

ئاشکراشە کەبەهۆی ئەم بەندەوە وێڕای زیاترو چاکتر بەرچاو ڕۆشن بوون لەبارەی زەکاتەوە زانیاری‌یەکی باشیشمان چنگ دەکەوێ دەربارەی باج (ضريبة) کە لەڕۆژگاری ئێستامان دا یەکێکە لەبنەما گەورەو گرنگەکانی سیستەمی ئابووری هەر دەوڵەتێك.

هەروەها تیشکیش دەخەینە سەر مەسەلەی گومرگ[421] (الجمرگ) کە جۆرێکە لەجۆرەکانی باج و ڕوونی دەکەینەوە کە لەچ حاڵەتێك دا ڕەوایەو کەنگێش بەحەرام و پیس دادەنرێ!

شایانی باسیشە کە بۆ نووسینی ئەم باسە کە لەم بەندی سێیەمەدا دەیخەمەڕوو، پشتم بەکتێبی: (فقه الزكاة)[422]ی بەڕێز: دکتۆر (یوسف القرضاوي) بەستوە، کە بەڕاستی کتێبەکەی چاکترین و فراوانترین سەرچاوەی هاوچەرخە بۆ توێژنەوەی زەکات، خوا پاداشتی بداتەوە.

دیارە ئێمە زۆر بەپوختی و گوشراوی و بەئەندازەیەکیش دەستکاری‌یەوە ئەوەی سەرچاوەی ناوبراو لەوبارەوە گوتوویەتی، دەینووسین، بۆئەوەی لەگەڵ سروشت و قەبارەی ئەم کتێبەمان دا بگونجێ.

ئەو هەشت خاڵانەش کە ئێمە زەکات و باجیان تێدا لەگەڵ یەك بەراورد دەکەین ئەمانەن:

١-ماهیەتی زەکات و باج و خاڵە هاوبەش و جیاوازەکانیان.

٢-بنەمای مەبدەئی‌ی زەکات و باج.

٣-زەکات و باج لەچی دەدرێن؟!

٤-پرانسیپەکانی دادگەری‌ی لەنێوان زەکات و باج دا.

٥-بۆچی لەزەکات دان دا شێوازی ڕێژەیی هەڵبژێرراوە نەك هەڵکشین؟!

٦-دەستەبەرکەرەکانی زەکات و باج.

٧-ئایا وێڕای زەکات دروستە باجیش دابنرێ؟!

٨-ئایا باجەکان (ضرائب) دەبنە جێدار (بدیل)ی زەکات؟!

هیوادداریشم ئەم باسەش وێڕای تیشك خستنە سەر باج و باج وەرگرتن گۆشەیەکی دیکەش لەدەریای دەوڵەمەندو پڕ گەوهەری زەکات و ماڵ بەخشینمان پێ‌بناسێنێ و چەپکێکی دیکەشمان لەحیکمەت و نهێنی‌یە گەورەو گرنگەکانی ئەو پایەو درووشمە مەزنەی ئیسلام بخاتە دەست.

---

[421] هەرچەندە هەر لەدوو توێی باج دا باسی گومرگمان کردوەو بەتایبەت باسمان نەکردوە لەبەرئەوەی گومرگ هەر جۆرێکە لەجۆرەکانی باج و ناوێکە لەناوەکانی.

[422] بڕوانە: ج٢ص٩٩٧تا١١١٩.

## ١-ماهیەتی زەکاتو باجو خاڵە هاوبەشو جیاوازەکانیان

خوا پشتیوان بێ لەسێ بڕگان دا چییەت (ماهیة) ی زەکاتو باج ڕوون دەکەینەوە:

**یەکەم: پێناسە:**

زەکات: وەك شەرعزانان پێناسەیان کردوە مافێکی دیاریکراوە کە خوا لەماڵو سامانی مسوڵمانان دا فەرزی کردوە بۆ ئەو کەسانەی کە خوای دادگەر لەئایەتی زەکات دا ناوی بردوون، وەك سوپاسگوزارییەك بۆ چاکەی خواو پەرستنو بەندایەتی بۆ کردنیو پاك کردنەوەی تاكو کۆمەڵو گەشەپێدانیان.

باج (ضریبة):-یش وەك زانایانی دارایی ناس پێناسەیان کردوە ئەرکێکی پێویستی سەرشانی بابای خاوەن ماڵو سامانە کە بیداتە دەوڵەتو ئەویش لەدابین کردنی مووچەو خەرجییە گشتییەکانو هێنانەدی ئامانجە ئابووریو کۆمەڵایەتیو سیاسییە کان دا کە ئەرکی سەرشانی هەر دەوڵەتێ[illegible]ن بەکاری دێنێ.

**دووەم: خاڵە هاوبەشەکانی نێوان زەکاتو باج:**

ا: هەردووکیان پێویستنو بەشێوەیەکی ئیلزامی وەردەگیرێن.

ب: هەردووکیان تەسلیمی لایەنێکی ڕەسمی دەکرێن.

ج: هیچ کامیان بەرانبەر (مقابل)ێکی تایبەتییان نیەو نابێ خاوەنەکەی چاوەڕێی هیچ مافو ئیمتیازێك لەکۆمەڵگاو دەوڵەت بکات.

**سێیەم: خاڵە جیاوازەکانی نێوانیان:**

یەك: لەناو (اسم)دا:

وشەی زەکات وەك کاتی خۆی ڕوونمان کردەوە پاکیو چاکیو نەشونماو گەشەکردن دەگەیەنێ، بەڵام (ضریبة) کە لەکوردیدا بە (باج) تەفسیر کراوە مانای زۆر و سەپاندنو لێستاندن دەگەیەنێ، وەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی: (وَضُرِبَتْ عَلَيْهِمْ الذِّلَّةُ وَالْمَسْكَنَةُ) البقرة: ٦١.

دوو: لەماهیەتو جەوهەردا:

وەك پێشتر گوتمان زەکات خواپەرستییەکە کە خوا لەسەر ئینسانی مسوڵمانی فەرز کردوە وەك سوپاسگوزاری چاکەی خواو پاداشتی بەرزی لە بەرانبەردا هەیە لە دواڕۆژدا بۆیە نیازو مەبەست (نیة) یەکێکە لە مەرجەکانی جێبەجێکرانی، بەڵام باج تەنیا ئەرکێکی مەدەنی ڕووتەو هیچ مانایەکی دینداریو خواپەرستی نەگرتۆتە نێوخۆی.

سێ: لەدیاریکردنی ئەندازەی لێدران و ئەندازەی دران دا:

ئەمیش یەکی دیکەیە لە جیاوازییە گرنگەکانی نێوان زەکات و باج، چونکە زەکات لەلایەن خوای کاربەجێوە دیاریکراوە کە لە هەر جۆرە ماڵێك لەچەند بدرێ و چەندەش بدرێ! بەڵام باج پەیوەستە بەبۆچوون و رای ئەو لایەنە دەستەڵاتدارە کەوەریدەگرێ، بەڵکو هەر ئەسڵی وەرگرتن و وەرنەگرتنەکەشی بەدەست حوکمڕان و کاربەدەستانە.

چوار: لەڕووی بەردەوامی و کاتی بوونەوە:

بێگومان زەکات پێویستییەکی شەرعی چەسپاو نەگۆڕەو هەتا ئیسلام و مسوڵمانان مابن هەر بەردەوامە، بەڵام باج وانیەو وەك پێشتریش گوتمان پەیوەستە بەبیرو‌ڕاو بڕیاری حوکمڕانانەوە.

پێنج: لەڕووی چۆنیەتی خەرج کردنەوە:

لەو ڕووەشەوە زەکات خوای پەروەردگار بۆ خۆی دیاریکردوە کەچی لێبکرێ و بەکێ و کێ بدرێ، بەڵام باج دەوڵەت و کاربەدەستانی بەپێی بۆچوونی خۆیان و لەو بوارانەدا کە بەپێویستی دەزانن بەکاردەهێنرێ.

کەواتە بودجە (میزانیة) ی زەکات دەبێ سەربەخۆ بێت و تێکەڵ بەخەزێنەی دەوڵەت نەکرێ و بەو شوێنانە بگەیەنرێ کەشەرع دیاری کردوون.

شەش: لەبواری پەیوەندیدا بەحوکمڕانەوە:

لەو بارەشەوە دیسان زەکات و باج لەیەك جیان، چونکە باج دان ئەرکێکی دەوڵەتە لەسەر تاك کە دەبێ جێبەجێی بکات، بەڵام زەکات بەرلەوەی مافی کۆمەڵگا بێت ئەرك و فەرزێکی خواییە لەسەرشانی مسوڵمان دەبێ وەك جۆرە خواپەرستییەك ئەنجامی بدات.

حەوت: لەڕووی ئامانجەوە:

ئامانجی زەکات دان چەند شتێکی زۆر بەرزو مەزنن کە ئێمە لەبەندی چوارەم دا بەدرێژی باسیان دەکەین و خوای کاربەجێش لەم ئایەتەدا ئاماژەی بە هەندێکیان کردوە: (خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِمْ بِهَا وَصَلِّ عَلَيْهِمْ إِنَّ صَلَاتَكَ سَكَنٌ لَهُمْ وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ) التوبة:١٠٣.

بەڵام باج ناتوانێ لەئامانجە ماددییەکان بەولاوەتر بچێ و ئەوەی زیاتریش زەق و بەرچاوە هەر کۆکردنەوەی ماڵ و سامانە بۆ دەوڵەت.

هەشت: لەڕووی بنەمای مەبدەئییەوە:

ئەمیش یەکێکی دیکەیە لەجیاوازییە بنەڕەتییەکانی زەکات و باج، بەڵام لەبەر زێدە گرنگی لەخاڵێکی سەربەخۆدا کە خاڵی دووەمە دەیتوێژینەوەو لێرەدا بەس ئەوەندە دەڵێین: کە ئەگەر باج تەنیا ئەرکێکی مەدەنییە، زەکات هەم ئایینی و هەم مەدەنییشە!

## ٢-بنەمای مەبدەئی زەکاتو باج:-

یەکـەم: بـاج:- لێکۆڵـەرەوان دەربـارەی بناغـەی یاسـایی (الأسـاس القـانوني) بـۆ پێویستکردنی باجەکان (ضرائب) لەسەر خەڵکی بەگشتی دوو رایان هەن:

یەك: لەسەر بنچینەی بەڵێنی کۆمەڵایەتی (العَقْد الأجتماعي) کە بیردۆزەی سیاسی (جان جاك رۆسۆ)یـە فەیلەسـووفەکانی سـەدەی هەژدەهـەم رایـان وابـووە کـە بنـەماو بناغـەی مـەبدەئی‌ی دانرانـی باجـەکان ئـەو پەیوەندی‌یـە بەڵێنی‌یەیـە کـە لـە نێـوان دەوڵـەتو هاوولاتی‌یەکانی‌دا هەیەو، گوتوویانە: بۆیە تاك باج دەدات بە دەوڵەت، چونکە لەو داموو دەزگاو خزمەتگوزاری‌یانە بەهرەمەند دەبێ کە دەوڵەت فەراهەمیان دێنێ.

دوو: بەڵام پاش چەند رەخنەگیرانێك لە بیردۆزەی ناوبراو کە بە بیردۆزەی بەڵێندارێتی (النظرية التعاقدية) ناسراوە، بیردۆزەیەکی دیکە سەری هەڵدا کە بریتیە لەبیردۆزەی بالاّ دەستێتی دەوڵەت (نظرية سيادة الدولة) و نێوەرۆکەکەی ئەوەیە کە مادام ئەرکی سەرەکی دەوڵـەت دابین کردنـی بەرژەوەندی‌یە گشتی‌یەکانی کۆمەڵگایـەو ئـەمیش بـەبێ هاوکـاری هـەموو لایـەك مسـۆگەر نابێ بۆیـە پێویسـتە تاکـەکانی کۆمـەڵگا هـەرکامێکیان لەئاسـت خۆیەوەو بەگوێرەی توانای هاوکاری دارایی بکات.

دووەم: زەکات:- بەڵام بۆ زەکات ئەوە بەسەرنج دانـی دەقەکانی قورئانو سوننەت بـەلای کەمەوە دەتوانین ئەم چوار بنەمایە بە بناغەی پێویست بوونی‌ی دابنێین:

یـەك: ئینسان بـەندەی خوایـەو خـوای بەدیهێنـەرو پـەروەردگاریش هـەقی خۆیـەتی هـەر ئەرکێك بخاتە سەرشانی بەندەکانی بۆ تاقی‌کردنەوەیان، چونکە خوا ئینسانی بەهەوەنتەو بێ‌حیکمەت نەخوڵقاندوە، وەك فەرموویەتی: (الَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا) الملك:٢.

جا زەکاتیش یەکێکە لەو ئەرکانەی کە خوای دادگەرو کاربەجێ خستوویەتە سەرشـانی بەندەکانی، کەواتـە بـەر لەهـەر شـتێك زەکـات دان هـەروەها مـاڵ بەخشـین بەشـێوەیەکی گشـتی ئـەرکو فـەرمانێکی خوایی‌یـە لەسەرشـانی ئینسـان، وەك نوێـژو رۆژوو و حـەجو جیهادو باقی ئەرکو پێویستی‌یەکانی دیکەی دینداری‌و مسوڵمانەتی.

دوو: بنەمایـەکی دیکـەی فـەرزبوونی زەکـات لەسـەر ئینسـانی مسـوڵمان ئەوەیـە کـە لەروانگەی ئیسلامەوە ئینسان جێنشینی[٤٢٣] خوای پەروەردگارەو ئەو ماڵو سامانەش کە

---

[٤٢٣] لـەکتێبی (مسـوڵمانی کـامڵ) بەشـی دووەم، بـەرگی یەکـەم (خواپەرسـتیی مسـوڵمان) لاپـەرە (٤٢)دا مەسەلەی خەلیفەی خوا بوونی ئینسانمان جوان توێژیوەتەوە، لەوێ سەرنجی بدە.

لەدەستی‌دایە سپاردە (امانة)یەکی خواییەو پێویستی بەپێی مۆڵەتی بەرنامەی خواو لەسنووری شەرع دا ڕەفتاری لەگەڵ بکات، وەك خوای مەزن فەرموویەتی: (آمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَأَنفِقُوا مِمَّا جَعَلَكُمْ مُسْتَخْلَفِينَ فِيهِ فَالَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَأَنفَقُوا لَهُمْ أَجْرٌ كَبِيرٌ) الحديد:٧، واتە: بڕوا بەخواو پێغەمبەرەکەی بێنن‌و لەو ماڵ‌و سامانە ببەخشن کەئێوەی تێدا گێڕاوە بەجێنشین، چونکە ئەوانەتان کە بڕوایان هێناوەو دەبەخشن پاداشتێکی گەورەیان هەیە.

بەڵێ تەنیا خوای بەخشەر خاوەن (مالك)ی ڕاستەقینەو سەربەخۆی هەموو شتێکەو، هیچ کەسێك بۆی نیە لافی خاوەندارێتی موتڵەق لێبدات بەسەر هیچ شتێك داو، ئەو ئەندازەیەش کە شەرع لەسەر ئینسانی سامانداری فەرزکردوە بیبەخشێ، بە بڕیاری شەرع هی بابای بەخشەر نیە، بەڵکو هەقی ئەوانەیە کەخوا دیاری‌کردوون‌و، بابای بەخشەر تەنیا بەئەمینداریکی ئەو ماڵ‌و سامانە دادەنرێ کە بیگەیەنێتە دەستی خاوەنەکانی خۆی.

سێ: یەکی دیکە لەبنەمایەکانی پێویست بوونی زەکات‌و ماڵ بەخشینی بەگشتی ئەوەیە کە لە ئیسلامدا هەرکام لەتاك‌و کۆمەڵگا بەرانبەر بەیەکتر بەرپرسیارن‌و پێویستە هاوکاری یەکدی بکەن‌و دەستبار بۆ یەکتر بگرن.

هەربۆیەش لەچەندان دەقی قورئانی بەرێزدا ئاماژە بەوە کراوە کە ماڵ‌و سامانێك کە بەدەست دەوڵەمەندەکانەوەیە هی هەموو کۆمەڵگایەو پێویستە هەموویان لەبەرانبەری‌دا هەست بە بەرپرسیاری بکەن‌و پارێزگاری لێبکەن، بۆ وێنە: (وَلَا تُؤْتُوا السُّفَهَاءَ أَمْوَالَكُمُ الَّتِي جَعَلَ اللَّهُ لَكُمْ قِيَامًا) النساء:٥، واتە: وە ئەو ماڵ‌و سامانەتان کە خوا گێڕاویەتی بەمایەی ڕاگرتن ی ژیان‌و گوزەران تان تەسلیمی نەفامەکانتانی مەکەن. هەروەها: (يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَأْكُلُوا أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ ...) النساء:٢٩، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە ماڵ‌و سامانەکانتان بەناهەق لەنێوان خۆتان دا مەخۆن..

بەڵێ ماڵ‌و سامانێك کە لەدەستی سامانداران دایە بەهی هەموو کۆمەڵگا دادەنرێ‌و پێویستە هەق‌و مافی‌و توێژە کەمدەست‌و نەدارەکانی کۆمەڵگای لێدەربکات.

چوار: چوارەمین بنەمای مەبدەئی‌ی زەکات‌و ماڵ بەخشینی فەرزیش لەئیسلام دا ئەوەیە کە سەرجەم ئەندامانی کۆمەڵگای ئیسلامی بە براو خوشکی یەکتر دادەنرێن وەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی: (إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ) الحجرات:١٠،

ئاشکراشە کە برایەتی (أُخُوَّة) لەئیسلام دا کۆمەڵێکی زۆر ئەرك‌و بەرپرسیارێتی جۆراوجۆر دەخاتە سەرشانی مسوڵمانان، کە لەدەقەکانی قورئان‌و سوننەت بەڕوونی باس کراون، بۆ وێنە:

* (المسلم أخو المسلم لايَظْلِمُهُ ولا يُسْلِمُهُ) متفق عليه، واته: مسولْمان براى مسولْمانه نەستەمی لیٚدەکاتو نەپشتی بەردەدات لەکاتی تەنگانەدا .

*(ماآمن بي مَنْ باتَ شَبعانَ وجارُهُ جائِعٌ الى جَنْبِه وهو يَعْلَمُ) رواه الطبراني والبزار عن انس باسناد وحسنٍ ورواه الحاكم عن عائشة.

واتە: ئەو کەسەی بەتێری شەوگار بەسەر دەباتو دراوسیٚیەکەیشی لەتەنیشتی‌یەوە برسی‌یەو پیٚشی دەزانیٚ، بڕوای بەمن نەهیٚناوە.

*(المؤمنُ للمؤمنِ كالبُنْيانِ يَشُدُّ بَعْضُهُ بَعْضاً) رواه البخاري ومسلم عن ابي موسى الأشعري.

واتە: بڕوادار بۆ بڕوادار وەك دیوار وایە هەندیٚکی هەندیٚکی ڕادەگریٚ.

کەواتە: ئەگەر بنەمای مەبدەئی باج تەنیا شتیٚکی سیاسی‌و مەدەنی‌یە هەربۆیەش بەدریٚژایی میٚژوو خەڵکی پەنای بردۆتە بەر دەیان فرتوفیٚڵ بۆ خۆدەربازکردن لیٚی! بنەمای زەکاتو ماڵ بەخشینی فەرز لەئیسلام دا ئەو چوار بنچینە گەورەو گرنگو ڕیشەدارەن کە خستمانەڕوو، هەربۆیەش مسولْمانان لەکاتی زەکات دانو ماڵو سامان بەخشینیان دا، چونکە دەزانن کە یەکیٚك لەئەرکەکانی بەندایەتی بەجیٚدیٚنن کە پایەیەکە لەپیٚنج پایە گەورەکانی ئیسلام، هەست بەئاسوودەیی‌و بەختەوەری زۆریش دەکەنو، نەك هەر فرتو فیٚڵ ناکەن بۆ خۆ بواردن لەزەکات دانو ماڵ بەخشین! بەڵکو زۆریش بەپەرۆشەوە بەدوای ئەو کەسانەدا دەگەڕیٚن کە پیٚویستە ئەو زەکاتو ماڵەیان تەسلیم بکەن، کە خوای دادگەرو بەخشەر لەسەری فەرز کردوون.

## ٣-زەکاتو باج لەچی دەدریٚن؟!

زانایانی داریی‌ناس (علماء المالية) ڕوونیان کردۆتەوە کە باج لەچوار جۆرە ماڵو سامان دەدریٚ:

*أ-سەرمایە (رأس المال):*

*ب- دەستکەوتو بەرهەم (الدخل والأيراد).*

*ج-سەرانە (الضريبة الشخصية).*

*د- باجی کەلوپەلی بەکارهیٚنراو (ضريبة الأستهلاك).*

بەڵام بۆ زەکات وەك پیٚشتر ڕوونمان کردۆتەوە تەنیا لەدووجۆرە ماڵو سامان دەدریٚ کەبریتین لە:

أ- سەرمایە یان دەستمایە.

ب-بەرهەم و دەستکەوتیٚك کە دیٚنە دەست ئینسان.

دیارە دەشتوانین سەرفترە (زكاة الفطر) یش بەو باجە بچوێنینو وەك سەرانەیەك دابنیٚین کە سیستەمی باج (نظام الضريبة) لەسەر تیٚکڕای تاکەکانی کۆمەڵگای پیٚویست دەکات بەگەورەو گچکەو دەوڵەمەندو هەژارەوە.

حیكمەتی پێویست نەكرانی زەكاتیش لەو شتانەدا كەئینسان بۆ خۆی بەكاریان دێنێ و پێیان ئاتاجە، ئەوەیە كە زەكات لەئەسڵ دا لەسەر بابای دەوڵەمەندو ساماندار پێویستە: (تُؤخَذُ من أغنيائهِمْ) دەجا ئاشكراشە دەوڵەمەند كەسێكە كە ماڵ و سامانی لەخۆی و ئەوانەی بەئەستۆیەوەن زیادی هەبێ، هەربۆیەش ئیسلام چەند مەرجێكی داناون بۆ زەكات لێكەوتن، كە یەكێكیان ئەوەیە ئەو ماڵ و سامانەی زەكاتی لێدەدرێ گەیشتبێتە رادەی زەكات لێكەوتن (النصابْ) وەیەكێكی دیكەشیان بەڕای زۆربەی زانایان ئەوەیە كە ئەو ماڵ و سامانە لەمەسرەف و دابین كردنی پێداویستی یە بنەڕەتی یەكانی بابای خاوەن سامان و ئەوانەی مەسرەفیان لەسەری پێویستە زیاد بێت، وەنابێ بابای خاوەن ماڵ بۆ دانەوەی قەرزو قۆڵێك كە لەسەریەتی پێویستی بەو ماڵە بێت كە وەك زەكات دەیدات، ئەگەرنا دیسان بەڕای زۆربەی هەرەزۆری زانایان لەسەری پێویست نابێ، چونكە بابای قەرزدار خۆی زەكاتی پێدەشێ و یەكێكە لەو هەشت جۆرانەی كەپێویستە بەماڵ و سامانی زەكات هاوكارییان بكرێ: (إنَّما الصَّدقاتُ للفقراءِ والمساكين.. والغارمين..)

ئنجا شایانی باسیشە كە ئەو چوار مەرجانەی زانایانی دارایی ناس بۆ باج وەرگرتن بەمەرجیان گرتووون، ئیسلام لەپێویست كردن و وەرگرتنی زەكات دا بەزیادەوەش ڕەچاوی كردوون، كە ئەمانەن:

یەك: نابێ ئەو باجە بەئەندازەیەك بێ كەڕێژەیەكی زۆر لەو ماڵ و سامانە باج لێستێنراوە دابڕێ و پشتی بابای باجدەر قورس بكات، ئاشكراشە كە ڕێژەی چل یەك (٤٠/١) بۆ ماڵی نەغدینەو بازرگانی و ئاژەڵ و، دەییەك (١٠/١)و بیتسیەك (٢٠/١) بۆ بەروبوومی كشت وكاڵ ئەندازەیەكی كەمەو زۆر نییە، كەواتە ئەو مەرجە لەزەكات دا ڕەچاوكراوە.

دوو: نابێ باج (ضريبة)ەكە تەنیا لەشتێك وەربگیرێ، بەڵكو پێویستە چەند جۆرێك بێت و لەسەرجەم جۆرەكانی ماڵ و سامان وەربگیرێ، ئاشكراشە كەزەكاتی ئیسلامی بەو شێوەیەیەو لەسەرجەم جۆرەكانی ماڵ و سامان وەردەگیرێ.

سێ: پێویستە كەسانێك كە لەئەندازەیەكی دیاریكراو كەمتر ماڵ و سامانیان هەیە باجیان لێنەستێنرێ، وەك پێشتریش گوتمان زەكات ئەم مەرجەشی تێدا ڕەچاوكراوە، بەهۆی دیاریكردنی (نصاب)ەوە بۆ هەموو ئەوجۆرە ماڵ و سامانانەی كەزەكات دانیان تێدا فەرز كراوە.

چوار: پێویستە كرێ و مەسرەف و قەرزو قۆڵەیەك كە هاتۆتە سەرماڵ و سامانێك كە باجی لێدەدرێ لەكاتی باج لێدران دا حیساب بكرێن، ڕوونیشە كە زەكات وەك پێشتریش ئاماژەمان پێكرد ئەو شتانەی هەموو تێدا ڕەچاوكراون و، بەر لەزەكات لێدرانی هەرماڵ و سامانێك ئەوجۆرە هەق و حیسابانەی لێجیادەكرێنەوەو لێ ی دەردەكرێن.

## ٤- پرنسیپەکانی دادگەریی لەنێوان زەکات‌و باج دا

لەسۆنگەی ئەوەوە کە باج (ضریبة) بەزۆر وەردەگیرێ‌و لەسەر دڵی بابای باجدەر قورسە گەلێك لەزانایانی ئابووری ناس جەختیان لەسەر ئەوە کردوە کە دەبێ کۆمەڵێك بنچینەو پرنسیپ لەوەرگرتنی باج دا ڕەچاو بکرێن، ناودارترین کەسیش کە لەوبارەوە توێژینەوەو پشکنینی زۆری ئەنجام داوە (ئادەم سمیث) ە کە فەیلەسووفێکی ئابووری‌ناسی ئینگلیزەو لەسەدەی هەژدەیەم دا سەری‌هەڵداوەو کتێبێکی لەبارەی ئابووری (اقتصاد) یەوە هەیە بەناوی: سامانی نەتەوەکان (ثروة الأمم).

جا زانایانی ئابووری‌ناس بەگشتی‌و بەتایبەت ئادەم سمیث بەمەبەستی ڕەچاوکردنی دادگەری (عدالة) لەوەرگرتنی باج دا لەسەر ئەم چوار بنەماو بنچینەیە پێك هاتوون:

یەك: دادگەری، کە بەیەکەمین پرانسیپ (مبدأ) دادەنرێ‌و ئادەم سمیث ئاوا پێناسەی کردوە: (پێویستە سەرجەم هاوولاتیان لەدابین کردنی مەسرەف‌و خەرجی‌یەکانی دەوڵەت دا بەشداربن، بەلام هەرکەسە بەگوێرەی تواناو دەست ڕۆیشتنی‌و بەرێژەی ئەو بەرهەم‌و دەستکەوتەی کە لەسایەی ئەو قەوارەو سیستەمەدا پەیدای دەکات).

دوو: دڵنیایی (الیقین)، کە لێرەدا مەبەستیان پێ‌ی ئەوەیە کە (ئەو باجەی بابای ساماندار دەیدات ڕوون‌و بێ‌چەندو چوون بێ‌و هیچ تەم‌ومژ (غموض)ی بەسەرەوە نەبێ، چ لە ڕووی ئەندازەکەیەوەو چ لەڕووی کات‌و شێوەی درانی‌یەوە، بەشێوەیەك کە بابای باجدەر لەسەرەتاوە دڵنیاو بەرچاو ڕوون بێ).

سێ: سێ‌یەمین مەبدەئی باج دانیش بریتیە لەگونجاندن (الملائمة) کە پوختەی مەبەست بەم بنچینەیەش بریتیە لە: (چاودێری‌کردن‌و ئاگا لێ‌بوون‌و نەرم‌ونیان بوون لەگەڵ باج دەرەکان دا تاکو بتوانن. باجەکانیان بەدڵ ئاسوودەیی‌یەوە بدەن‌و سکالاو بێزاری دەرنەبرن‌و باری شانیان زۆر قورس نەکرێ).

چوار: دەست پێوەگرتن* (إقتصاد)یش چوارەمین پرانسیپی وەرگرتنی باجە، کەمەبەستیان پێ‌ی: (دەست پێوەگرتن‌و زیادەڕۆیی (إسراف) نەکردنی ئەو لایەن‌و دەستەلاتەیە کە باجەکان وەردەگرێ لەخەرج‌و مەسرەف کێشانی وەرگرتن‌و کۆکردنەوەی

---

* هەرچەندە وشەی: (إقتصاد) ئێستا بۆتە زاراوەیەکی تایبەت بۆ هەموو ئەو بابەت‌و مەسەلانەی پەیوەستن بەماڵ‌و سامان‌و دارایی‌یەوە، کە بەکوردی (ئابووری) بۆ دانراوە، بەلام ئەسڵی مانایەکەی لەزمانی عارەبی‌دا میانەڕەوی‌و دەست پێوەگرتنە لەصەرف کردن دا.

باجـەکان دا وەك مووچـەی کارمـەندان و پێداویسـتیی‌یەکانی ئیـدارەو مشـوورگێڕانی ئەوکاروبارە جیا جیایانەی کە پەیوەستن بەباجەوە).

جا ئێستا با سەرنج بدەین داخوا چۆن ئیسلام زۆر بەچاکی و بەزیادەوەش پتر لەهەزار (١٠٠٠) ساڵ بەر لەپەیدابوونی ئادەم سمیث و ئابووری ناسەکانی دیکە هەموو ئەو پرانسیپە گرنگانەی لەمەسەلەی زەکات دا رەچاو کردوە:

**یەکەم**: جارێ بۆ دادگەری کە یەکەمین و گرنگترین مەبدەئی رەفتارو هەڵس وکەوتە لەروانگەی ئیسلامەوە چ لەبواری زەکات و باج و چ هەر بوارێکی دیکەش دا، ئیسلام بەدانانی ئەم یاساو رێڕوونی‌یانەی خوارەوە بەچاکترین شێوە دادگەری لەبواری زەکات وەرگرتن دا دەستە بەرو مسۆگەر کردوە:

ا-یەکسانی لە لەسەر پێویست کرانی زەکات دا، چونکە زەکات لەسەر هەر مسوڵمانێکی دەوڵەمەند فەرز کراوە کە بەئەندازەی زەکات لێکەوتن (نصاب) ماڵ و سامانێکی هەبێ، چ پیاو بێ چ ئافرەت، چ عاقڵ چ شێت، چ باڵغ چ منداڵ، چ دەستەڵاتدار چ بێ‌دەستەڵات ... هتد. چونکە خوا فەرموویەتی: (خُذْ من أموالِهِمْ صدقه تُطَهِّرُهمْ وتزكّيهمْ بِها..)، بەگشتی فەرموویەتی و هەڵاواردن (إستثناء) ی تێدا نیە.

ب- زەکات وەرنەگرتن لەماڵ و سامانێکی کەم، واتە ماڵێك کە نەگەیشتبێتە رادەی زەکات لێدران، چونکە وەك پێشتریش روونمان کردۆتەوە زەکات لەدەوڵەمەندان وەردەگیرێ، خوای کاربەجێش فەرموویەتی: (وَيَسْأَلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ قُلِ الْعَفْوَ.) البقرة:٢١٩، کەوەك لە (ابن عباس) ەوە خوا لێیان رازی بێ هاتوە، لەتەفسیری (العفو) دا گوتوویەتی:[٤٢٤] (الفَضْلُ عن الغنيُ) واتە: لەبەر دەوڵەمەندی لەخاوەنەکەی زیاد بێ.

ج-دووبارەنەکردنەوەی زەکات، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (لاثِـنْيَ في الصَّدَقَةِ) رواه ابوعبيد وابن ابي شيبة، (أبوعبيد) لەمانای (الثني)دا گوتوویەتی:[٤٢٥] ئەوەیە کە لەساڵێ‌دا دووجار زەکات وەرنەگیرێ: (أنْ لاتُؤْخَذَ الصدقة منْ عام مَرَّتين).

د-رێژەی زەکاتەکە بەپێی رێژەی رەنج و ماندووبوون دەگۆڕێ، بۆ وێنە: بەروبوومی کشت وکاڵ ئەگەر بەبێ ئامێر (بدون آلة) ئاودێر بکرێ دەیێك (١/١٠)ی زەکات لێ‌دەکەوێ ئەگەرنا تەنیا بیست یەك (١/٢٠)ی لێ‌دەکەوێ، هەروەها خەزنەی سەردەمی نەفامێتی و کانزایەکان (المعادن) چونکە رەنج و ماندووبوونی کەمتریان دەوێ زەکاتەکەیان پێنج یەك (١/٥)ە!.

---

[٤٢٤] بڕوانە: (فقه الزكاة)، ج٢ص١٠٤٠.

[٤٢٥] بڕوانە: (الأحوال) ص٣٧٥.

هـ-لەبەرچاوگرتنی هەلومەرجی تایبەتی بابای زەکات دەر، وەك: لێدەرکردنی قەرزو قوڵو ئەندازەیەك کەپێداویستییە بنەڕەتییەکانی ژیانو گوزەرانی پێدابین دەکرێو، زەکات نەدان لەو پێداویستیو کەلوپەلانەی کە بۆ کاروباری خۆی پێویستنی، بۆ وێنە: وەسیلەی سواریو هاتووچۆ و خانوو بەرەو جلوبەرگو ئامرازی جەنگو..هتد. وە زەکات دان لەبەرهەمو دەستکەوتو هەلاواردنی ئەسڵی شتە بەرهەم هێنەرەکان، کە لەشوێنی خۆی بەڕوونی باس کراوە.

و-دادگەری لەجێبەجێکردن دا (العدالة في التطبيق)، ئاشکرایە کە هەر مەبدەئێك هەرچەندە یەکجار بەرزو چاك بێ، ئەگەر لەکاتی جێبەجێکران دا خەڵکی شایستەو ئەهلی خۆی جێبەجێی نەکات بەهیچ ناچێ، هەربۆیەش ئیسلام زۆر گرنگیو بایەخی بەو مەسەلەیە داوەو چەندان دەق لەوبارەوە هەن کەڕێنوونیو ئامۆژگاریو ئاڕاستەن بۆ کاربەدەستانی کۆکردنەوەو سەرەو بەرەکردنی زەکات، بۆ وێنە: (**العاملُ على الصَّدَقَةِ بالحق كالغازي في سبيل الله**) رواه احمد واصحاب السنن الا النسائي وحسنه الترمذي وصححه الحاكم ووافقه الذهبي.

واتە: ئەو کاربەدەستە کە بەشێوەیەکی هەقو ڕاست سەرپەرشتی زەکات دەکات، وەك جەنگاوەری ڕێی خوا وایە.

(ابو يوسف)یش لەنامەیەکیدا کە بۆ (هارون الرشيد)ی نووسیوە لەوبارەوەو لەدرێژەی چەند قسەیەکیدا گوتوویەتی: (.. وقَدْ بَلَغَني اَنَّ عُمَّال الخَراج يَبْعَثُون رجالاً مِنْ قِبَلِهِمْ في الصَّدقات فيَظْلِمون ويَعْسِفُون ويأتونَ مالا يحلُ ولايَسَعُ، وانما يَنْبغي اَنْ يُتَّخَذَ للصدقة اهلُ العَفاف والصَّلاح). (بروانە الخراج لأبي يوسف ص ٨٠).

**دووەم**: دەربارەی مەبدەئی دووەمی هێنانەدی دادگەری (عدالة) یش لەبواری زەکاتو باج وەرگرتندا کە بریتیە لەدڵنیایی (يقين) و بەرچاوڕوونی بابای زەکات دەریش ئەوە بەجوانترینو درەوشاوەترین شێوەی لەفەرزی زەکات دا دیارە، کە خوای دادگەر لەقورئانی خۆیدا پێویستی کردوەو دیاریکردوە کە لەکێوەردەگیرێو لەچی وەردەگیرێو بەکێو کێ دەدرێ، وە پێغەمبەری خواش ﷺ ئەندازەکانی زەکات لێکەوتن (مقادير انصبة)ی هەموو ئەو شتانەی زەکاتیان لێ دەدرێو ڕێژە (نِسْبة)ی زەکاتەکانیانی دیاریکردوەو، زاناو پێشەوانیشمان جوان تیشکیان خستۆتە سەر هەموو لایەنەکانیو لەسەر هەموو لایەنو مەسەلە بنەڕەتیو سەرەکییەکانی یەکدەنگ بوونو لەسەر لایەنە جوزئیو وردە بابەتەکانی ڕا جیایی (إختلاف) یان هەیە، کە ئەو ڕاجیاییەش بۆتە مایەی فراوان بوونو بەهێزوپێزبوونی ئەو پایەو کۆڵەکە گەورەو گرنگەی ئیسلامەتی.

**سێیەم**: پرانسیپی سێیەمیش کە (گونجاندن) ە دەتوانین لەچەندان مەسەلەدا بەدی بکەین:

ا-چەند فەرموودەیەکی پێغەمبەر ﷺ لەوبارەوە هەن کە پێویستە بابای زەکات وەرگر (عامل) لەکاتی زەکات وەرگرتن دا ساماندارەکان ناڕەحەت نەکاتو لەسەر جێگاو ڕێگای خۆیان لێیان وەربگرێ، نەك بیانهێنێ بۆ شوێنێکی دیکە، بۆ وێنە: (**تؤخَذُ صَدَقاتُ المسلمين على مياهِهِمْ**) رواه احمد عن عبدالله بن عمر و رضي الله عنهما، هەروەها فەرموویەتی: (**لا جَلَبَ ولاجَنَبَ ولاتؤخَذُ صدقاتُهُم إلا في ديارِهِمْ**) رواه ابوداود واحمد عن عبدالله بن عمر، واتە: نابێ - زەکات دەرەکان - پەلکێش بکرێنو نابێ دووربخرێنەوەو دەبێ تەنیا لەسەر جێگاو ڕێگای خۆیان زەکاتەکانیان لێ‌وەربگیرێن.

ب-نابێ ماڵی هەڵبژاردەو چاکترینیان بەزەکات لێ وەربگیرێ، وەك لەچەندان فەرموودەدا هاتوە، بۆ وێنە لەو فەرموودەیەدا کە پێغەمبەر ﷺ لەکاتی ناردنی (مُعاذ) دا بۆ یەمەن پێی فەرموو: (..**إيّاكَ وكَرائمَ أمْوالِهِمْ**) رواه البخاري.

ج-دەبێ لەکاتی قرساندن (قەبلاندن)ی بەروبوومی میوەجاتو کشت‌وکاڵ دا ڕەچاوی بەرژەوەندی خاوەنی میوەجاتو کشت‌وکاڵ بکرێو لەسەریان سووك بکرێ، لەوبارەشەوە چەندان دەقی سوننەت هەن، بۆ وێنە: (**إذا خرصْتُمْ فَخُذوا ودَعُوا الثُلُث، فإن لَمْ تَدَعوا الثُلُثَ فَدعُوا الرُّبُعَ**) رواه ابوداود والنسائي والترمذي.

د-دروستە کە زەکات دران لەهەندێك حاڵەتی نائاساییداو لەبەر بەرژەوەندی ساماندارەکان، لەکاتی دیاری‌کراوی خۆی دوابخرێ، وەك چۆن (عمر بن الخطاب) خوالێی‌ڕازی‌بێ لەساڵی برسیەتی (عام المجاعة)دا ڕەفتاری کرد.

**چوارەم**: چوارەمین بنەماو مەبدەئیش بۆ هێنانەدی دادگەری کە بریتیە لەدەست پێوەگرتن، ئیسلام نەك هەر بۆ زەکاتو وەرگرتنو دابەش کردنی، بەڵکو هەر بەگشتی زیادەڕۆیی و دەست بلاویی قەدەغە کردوەو، دیارە زەکاتیش کەوەك پێشتر گوتمان بەهەقو مافی شەرعی‌ی ئەوجۆرە کەسانە دادەنرێ کەخوای پەروەردگارو دادگەر دیاری کردوونو لەهەر کەسێکی دیکە حەرامە، بێگومان خۆ لێ‌پاراستنو دەست تێدا پێوەگرتنی پێویست ترو لەپێش تریشە، هەربۆیەش پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر سەخت گیری لەسەر کۆکەرەوانی زەکات (جُباةُ الزّكاة) کردوەو تەنانەت وەرگرتنی دیاری (هدية) یشی لێ‌قەدەغەکردوون، وەك لەو فەرموودە ناودارەدا دەبینرێ کە بەفەرموودەی (ابن اللتَبيّة) ناسراوەو (بخاري ومسلم و أبوداود) لە (ابي حميد الساعدي) گێڕاویانەتەوە[٤٢٦].

---

[٤٢٦] بڕوانە: (فقه الزكاة) ج٢ص٥٩٢.

**٥-بۆچی لەزەکات دان دا شێوازی ڕێژەیی هەڵبژێرراوە نەك هەڵکشین؟!**

ئەم خاڵی پێنجەمە لەدوو برگەدا دەخەینەڕوو:

**یەك: پێناسەی ڕێژەیی و هەڵکشین (النسبیة والتصاعدیة).**

**دوو: حیکمەتی هەڵبژێررانی شێوازی ڕێژەیی بۆ زەکات.**

## یەك: پێناسەی ڕێژەیی‌و هەڵکشین

ئابووری ناسان‌و پسپۆڕانی دارایی باجی ڕێژەیی (الضریبة النسبیة) یان بەوە پێناسە کردوە کە بریتیە لەوەی باجەکەی بەچەسپاوی‌و نەگۆڕی‌ی بمێنێتەوە هەرچەندە ئەو ماڵ‌و سامانەی باجەکەی خراوەتە سەر گۆڕانی بەسەردا بێت‌و زیاد بکات، بۆ وێنە: دەییەك (١/١٠) باج بخرێتە سەر سامانێك کە بریتیە لەئەندازەی سەد هەزار (١٠٠,٠٠٠) دینارو لەهەموو حاڵان دا هەروەك خۆی بمێنێتەوە.

بەڵام باجی هەڵکشین (الضریبة التصاعدیة) بریتیە لەوەی کە بەپێ‌ی زیادبوونی ئەو ماڵ‌و سامانەی کە باجەکەی خراوەتەسەر باجەکەشی زیادبکرێ و هەڵبکشێ، بۆ وێنە:

باجێك بەئەندازەی بیست یەك (١/٢٠) بخرێتە سەر سامانێك کە پەنجا هەزار (٥٠,٠٠٠) دینارەو، کاتێك بوو بە سەد هەزار دینار، پەنجا هەزارەکەی دووەم باجەکەی بکرێتە پازدەیەك (١/١٥)و، هی پەنجا هەزاری سێیەمش بکرێتە دەییەك (١/١٠)و.. هتد.

## دوو: حیکمەتی هەڵبژێررانی شێوازی ڕێژەیی بۆ زەکات!

ئاشکرایە کە ئیسلام شێوازی ڕێژەیی بۆ زەکات دان دیاری کردوە، چونکە کەسێك کە بەئەندازەی زەکات لێکەوتن (نصاب) جۆرێك لەجۆرەکانی سامانی هەبوو، ئەو ڕێژەیەی کە بۆ ئەوجۆرە سامانە دانراوە بۆ وێنە: چل یەك (١/٤٠)یان دەییەك (١/١٠) یان بیست یەك (١/٢٠) یان پێنج یەك (١/٥)، ئەوە ئەو ڕێژەیە بە نەگۆڕی‌و چەسپاوی دەمێنێتەوە با ئەوجۆرە سامانە زۆر زۆریش زیاد بکات.

تەنیا جۆرە سامانێك کە بەڕواڵەت لەو بوارەدا جیاواز دێتە بەرچاو بەڵام بەباری بەراوەژوو و پێچەوانەی هەڵکشین (صُعود) کە داکشین (نزول) ە، مەڕو بزنە کە لەهەر چل (٤٠) سەر سەرێکەو کەبوونە سەدوبیست‌و یەك (١٢١) سەر دوو سەرو، کەبوونە دوو سەدو یەك (٢٠١) سەر سێ‌سەر هەتا دەبنە سێ‌سەد (٣٠٠) و پاشان لەهەر سەد سەر سەرێك!

بەڵام لەڕاستیدا وا نیە چونکە چل سەری یەکەم پێویستە چل سەر مەڕو بزنی تەواو تەمەن بن، بەڵام بۆ ژمارەکانی دوایی کاروبەرخەکانیشیان ئەگەر تازەش لەدایك بووبن دەخرێنەوە سەریان‌و لەگەڵیان حیساب دەکرێن‌و ئاشکراشە کە هەتا ژمارەیان هەڵکشێ رێژەی کارگەل‌و بەرخگەل زیاد دەبێت بۆیە رێژەی زەکاتەکەشیان کەم کراوەتەوەو بەتەئکید دادگەری تەواویش هەر لەوەدایەو بەپێچەوانەوە ئاژەڵدارەکان دووچاری بارگرانی دەبن.

جا ئێستا با سەرنج بدەین داخوا حیکمەت‌و هۆی هەڵبژاردنی شێوازی رێژەیی چیە؟! دەتوانین لەم چەند وردە خاڵەدا وەڵامی ئەم پرسیارە بدەینەوە:

ا- زەکات جۆرە خواپەرستی‌یەك‌و فەرزێکی ئایینی‌یەو خوای کاربەجێ بۆ تاك‌و کۆمەڵی دیاری‌کردوەو هەتا ئینسان ئینسان بێ دەبێ بمێنێ‌و گۆڕانیان بەسەردا نایەت، وەك چۆن نوێژو رۆژوو کە دوو ئەرکی مەعنەوین گۆڕانیان بەسەردا نایەت، زەکاتیش ئەرکێکی ماددی‌یەو بەهەمان شێوەیە.

بەڵام باج وەك پێشتریش باسمان کرد کۆمەڵگاو دەوڵەت بەپێی بۆچوونی خۆی‌و بەشێوەو چۆنیەتی‌یەك کە عەقڵی دەیبڕێ دیاری دەکات‌و کەم و زیادی تێدا دەکات بۆ چارەسەری هەندێك هەل‌ومەرجی تایبەت‌و جاری وا هەیە یەکجارییش لای دەبات. وە وەك دوایی روونی دەکەینەوە ئیسلام پێشگیری دانانی باجەکانیش ناکات لەو هەل‌ومەرج‌و بارودۆخە تایبەتی‌یانەدا کەپاساوی شەرعی‌و ماقووڵی هەبێ.

ب- زەکات بە لەبەرچاوگرتنی ئەو لایەن‌و شوێنانەی کە تێیان دا صەرف دەکرێ‌و پێیان دەدرێ کە یان توێژە نەدارو پەککەوتەکانی کۆمەڵگا یان دابین کردنی بەرژەوەندی‌یە گشتی‌یەکانی، ئەو ئامانجە گرنگانەی کە باجەکان بۆ هێنانەدی‌یان لەسەر خەڵکی پێویست دەکرێن بەچاکترین شێوە دابینیان دەکەن.

کەواتە: زەکات هەرچەندە رێژەیی‌یە بەڵام لەسۆنگەی ئەوەوە کە خوای کاربەجێ چۆنیەتی دابەش کردنی دیاری کردوەو وەك باج نیە کە دەوڵەت‌و دەستەڵاتی سیاسی‌و وڵات بۆی هەبێ دەستکاری (تَدَخُّل) ی تێدا بکات، ئامانجە لەبەرچاوگیراوەکانی باجی هەڵکشیو (الضريبة التصاعدية) دێنێتەدی، کە بریتیە لەکەمکردنەوەی جیاوازی نێوان چین‌و توێژەکانی کۆمەڵگاو هاوسەنگی (توازن) دروست کردن.

ج- هەروەها زۆر لەو ئامانجانەی کە لایەنگرانی باجە هەڵکشیوەکان (الضرائب التصاعدية) هەوڵ و تەقەللایان بۆ دەدەن، ئیسلام لەڕێی چەند یاسایەکی شەرعی‌یەوە زەمینە سازی دابین کردنیانی کردوە، وەك: میرات‌و راسپاردن (وصية)، وە قەدەغەکردنی

سوود (الرِّبا) و فێڵ (الغش) و هێشتنەوەی شت بەمەبەستی گرانبوونی نرخ (الأحتكار)، وە دەست بەسەرداگرتن (مصادرة)ی ماڵو سامانی وەدەست هێنراو لەڕێی ناشەرعیەوەو ..هتد، کە بێگومان ئەم یاسایانە دەبنە هۆی وردو خاش کردنی سەرمایەکان (تَفْتِيتُ الثَّرَوَات) و لەیەك نیزیك خستنەوەی ئاستەکانی ژیان و گوزەرانی خەڵكو بەرپاکردنی دادگەری، چونکە بێگومان پرژو بڵاوبوونەوەی ماڵو سامان بەنێو تاکەکانی کۆمەڵگاداو خڕنەبوونەوەو کەڵەکەنەبوونی لەدەست خەڵکێکی کەم دا کە کاکڵکەی ڕژێمی سەرمایەدارێتی (الراسمالية) یە یەکێکە لەمەبەستە بەرزە شەرعیەکان (المقاصد الشرعية العالية) وەك خوای دادگەرو پەنهان بێن فەرموویەتی: (كَيْ لَا يَكُونَ دُولَةً بَيْنَ الْأَغْنِيَاءِ مِنكُمْ) الحشر:٧،

د- ئەسڵی بیرۆکەی هەڵکشینی باج (تصاعد الضريبة)ش لەلایەن زاناو پسپۆڕانی دارایی و ئابووریناسەوە چەندان ڕەخنەی ئاڕاستەکراون، وەك:

یەکەم: دیاریکردنی ڕێژەو ئەندازەی هەڵکشینەکە هیچ بناغەیەکی زانستیو عەقڵی تەواو و چەسپاوی نیەو بەگوێرەی بۆچوونو سەلیقە دانەرانی دەگۆڕێ! دیارە ئەمەش دەروازەی ستەمو بێدادیو بێویژدانی ئاوەڵادەکاتو هەرکاتێك لەگەڵ دەستەڵاتێکی ستەمکارو تەماعکاردا ڕووبەڕووبوونەوە پشتیان لەژێر باری باج دا دەشکێ.

دووەم: هەڵکشینی بەردەوام (التصاعد المستمر) لەڕووی حیسابیەوە سەری بەئەنجامێکی سەیرو نەگونجاو دەگات! چونکە:

ئەگەر کەسێك هەزار (١٠٠٠) دیناری هەبێ و لەسەدا یەك (١٪)ی باج لەسەر بێت، کە دەکاتە دە (١٠) دینار، بەپێی یاسای هەڵکشینی باج، ئەگەر دوای پەیدابوونی هەر هەزار (١٠٠٠)دیناری دیکە باجەکەی دوو چەندان بێتەوەو وە هەروەها، ئەوە کاتێك هەزارەی ژمارە سەدو یەك (١٠١)ی دێتە دەست واتە سەرمایەکەی دەبێتە (١٠١،٠٠٠) دینار، دەبێ هەزار دیناری ژمارە سەدو یەکەم هەموو بکاتەوە باجی خۆی - واتە باجی ئەو هەزار دینارە - و دە (١٠) دیناریشی بۆ قەرز بکات !!

سێیەم: شێوازی هەڵکشینی باج سەردەکێشێ بۆ تواندنەوەو نەهێشتنی چینە سامانداراکانو تواندنەوەی سەرمایەکانیانو یەکسان کردنی خەڵكو جەماوەر لەهەژاریی و نەداریی‌دا!

چوارەم: هەروەها سەردەکێشێ بۆ ئەوە کە هیچ کەس نەتوانێ ئەندازەیەك پارە پەزمەندەو پاشەکەوت بکاتو بێگومان لەئاکامی ئەوەش دا بەرهەم هێنانو جموجۆڵو چالاکی ئابووری بەرەو ئیفلیجی دەچێتو پەکی دەکەوێت.

## ٦-دەستەبەرکەرەکانی زەکاتو باج (ضمانات الزكاة والضريبة)

بێگومان ماڵ و سامان لەلای ئینسان خۆشەویستەو لە دڵیدا شیرینە، وەك خوای کاربەجێ فەرموویەتی: (زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ الشَّهَوَاتِ مِنَ النِّسَاءِ وَالْبَنِينَ وَالْقَنَاطِيرِ الْمُقَنْطَرَةِ مِنَ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ...) آل عمران:١٤، واتە: خۆشویستنی ئارەزووەکان بۆ خەڵکی ڕازێنراوەتەوە لەئافرەتانو کوڕانو ماڵی پەزمەندە کراو لەزێڕو زیو..

هەربۆیەش لەدێر زەمانەوە خەڵکی هەوڵی خۆدزینەوەیان داوە لەباج دان، بەڵام بێجگە لەخۆشویستنی ماڵو سامان چەند شتێکی دیکەش دەوریان هەیە لەو مەسەلەیەدا، وەك: بڕوانەبوون بەدادگەرانەبوونی باج (ضريبة)ەکە، وە متمانە نەبوون بەوە کە ئەو باجانە لەبەرژەوەندی گشتیدا بەکاردەهێنرێن، وە ئاگاداربوون لەوەی کە کەسانێکی دیکە خۆیان لەباج دان دەدزنەوە..

ئاشکرایە هەتا باجەکە قورستر بێتو قەناعەتی ئەوانەی لەسەریان پێویست کراوە بەدادگەرانە بوونی یان بەچاك صەرف کردنی کەمتر بێت ڕێژەی ئەو ڕاکردنو خۆدزینەوەیە زیاتر دەبێت.

ئنجا ڕاکردنو خۆدزینەوەش لەباج دان زیانی جۆراوجۆری هەن، وەك:

زیان پێگەیاندنی خەزێنەی دەوڵەت، وە زیان گەیاندن بەو کەسانەی کە باج دەدەن چونکە دەوڵەت ناچار دەبێت بۆ پڕکردنەوەی کەلێنی خەزێنەکەی باجەکان قورستر بکات یان باجی دیکە دابنێ، وەزیان گەیاندن بەکۆمەڵگا کە بەهۆی کەلێن تێکەوتنی خەزێنەی دەوڵەتەوە لەگەلێك دامو دەزگاو پرۆژەی خزمەتگوزاری بێبەش دەبن، وە سەرباری ئەو زیانانەش زەرەرو زیانی ئەخلاقیی بەهۆی بڵاوبوونەوەی فێڵو فەرەجو دزیو ناپاکیو باوەڕو متمانە بەیەکتر نەمانی ئەندامانی کۆمەڵگاو...هتد.

جا ئێستا باسەرنج بدەین داخوا ئەو هۆکارانەی دەبنە مایەی دەستەبەرکردنی هەرکام لە باجو زەکات چینو چۆنن؟!

**أ-دەستەبەرکەرەکانی باج:**

<u>یەك:</u> هەق پێدانو ڕێگاپێدانی مشوورگێڕانی کاروباری دارایی کە چاودێری ماڵو سامانی هاوولاتیان بکەن بۆئەوەی نەتوانن فێڵو فەرەج بکەن.

<u>دوو:</u> پابەند (مُلْزَمْ) کردنی بابای خاوەن سامان کە بەڕێكو ڕوونی دان بهێنێ بەئەندازەی ماڵو سامانەکەیدا، وە لەیاسای هەندێك لەدەوڵەتان دا بابای سامانداریش سوێندیش دەدرێ پاشان ئەگەر دەرکەوت سوێندەکەی بەدرۆ خواردوە سزای تایبەت بەسوێندخواردنی درۆی بەسەردا دەسەپێنرێ.

سێ: خەڵاتکردنی ئەو کەسانەی کە بە بەڵگە ئیسپاتی دەکەن کە فلانە سامانداره لەدان پێداهێنان (إقرار)ەکەی‌دا ڕاستی نەکردوەو ماڵو سامانەکەی پەنهان کردوە.

چوار: گێڕانەوە باج لەسەرچاوەی ماڵو سامانەوە، وەك گێڕانەوەی باجێك کە لە کارمەندان (موظفين) دەستێنرێ بەرلەوەی بگاتە دەستیان.

پێنج: سەپاندنی سزا دارایی‌و تاوان (جنائي) ی‌یەکان بەسەر ئەو کەسانەدا کە خۆیان لەباج دان دەدزنەوەو فرت‌و فێڵ دەکەن.

شەش: مافی ئیمتیاز پێدانی خەزێنەی دەوڵەت لەوەگرتنەوەی قەرزی باج، بەسەر باقی خاوەن قەرزەکانی دیکەدا.

ئەمانە سەرجەم ئەو چارەسەرو ڕێیانەن کە پسپۆڕانی دارایی‌و ئیداری هاوچەرخ بۆ ڕێگا لێ‌گرتن‌و چارەکردنی دیاردەی خۆدزینەوە لەباج دان دیاری‌یان کردوون، بەڵام زۆرجاران شارەزایانی بواری ماڵو دارایی دانیان پێداهێناوە کە لەئاقار دیاردەی ناوبراودا دەستەپاچەن! بەتایبەت بۆ چەند جۆرە ماڵو سامانێك کە خاوەنەکانیان دەتوانن هەمووی یان هەندێکی بشارنەوەو نەهێڵن بکەوێتە بەرچاوی ڕواڵەت بینی یاسا (قانون)! ئەمجار با بزانین دەستەبەرکەرەکان (ضمانات)ی زەکاتی ئیسلامی چین‌و چۆنن؟!

### ب-دەستەبەرکەرەکانی زەکات:

ئەو هۆکارانەی کەزەکات دران لەلایەن بابای مسوڵمانی ساماندارەوە دەستەبەر دەکەن بەگشتی دوو جۆرن:

### یەکەم: دەستەبەرکەرە مەعنەوی‌و ڕەوشتی‌یەکان:

یەك: وەك لەباسەکانی ڕابردوودا چەندان جار دووپاتمان کردەوە کە زەکات‌و ماڵو سامان بەخشین لە ڕێی خوادا جۆرێکە لەجۆرەکانی خواپەرستی‌ی، چونکە زەکات یەکێکە لەپێنج پایە گەورەو گرنگەکانی ئیسلامەتی‌و خوای بێ‌وێنەو کاربەجێ کردوویەتی بەهاوشانی نوێژ! (فَإِنْ تَابُوا وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ فَخَلُّوا سَبِيلَهُمْ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ) التوبة:٥، کەواتە بابای زەکات دەرو ماڵو سامان لەڕێی خوادا بەخشەر دەزانێ‌و دڵنیایە کە هەڵس‌وکەوت (تعامل) لەگەڵ خوای پەروەردگارو پەنهان بین دەکات، پێغەمبەر ﷺ لەوبارەوە فەرموویەتی: (ان الرجل لَيَتَصَدَّقُ بالصَّدَقَةِ من الكَسْبِ الطيبِ – ولا يقبل الله إلاّ طيباً – فيَتَلَقَاها الرحمنُ تبارك وتعالىٰ بِيَدِهِ، فَيُرَبِّيها كما يُرَبِّيَّ أحَدُكُمْ فَلُوَّهُ..) رواه البزار عن عائشة رضي الله عنها ورجاله ثقات.

واته: کابرا جاری وایه خێرێك دەکات بەماڵێکی حەڵاڵ – وەخواش تەنیا شتی حەڵاڵ وەردەگرێ – جا خوای بەبەزەیی و بەخشندەی خاوەن پایەو بەرزی بەدەستی خۆی وەری دەگرێ و زیادی دەکات و پەروەردەی دەکات، وەك چۆن یەکێکتان جوانووەکەی بەخێو دەکات..

دوو: هەروەها بابای بەخشەر دەزانێ کە خوای پەروەردگار چاودێر و ئاگادارەو ئاشکراو پەنهان دەبینێ، وەك فەرموویەتی: (يَعْلَمُ خَائِنَةَ الْأَعْيُنِ وَمَا تُخْفِي الصُّدُورُ) غافر:١٩، واتە: خوا – جلّ جلالە – ناپاکی یەك کە بەسیلەی چاوەکرێ و ئەوەی کە سینەکان پەنهانی دەکەن دەیزانێ، جا ئاشکرایە کە بابایەك بڕواو قەناعەتی وا بێت نەك لەبەر خەڵك و لەترسی یاساو سزای دنیا، بەڵکو لەبەرخوا لەترس و بیمی دواڕۆژ نەك بەدەست بگرە بەزمان و بەدڵیش ناتوانێ خیانەت و ناپاکی ی بکات.

سێ: بابای مسوڵمان مەبەست (غاية) ی ژیانی دنیای بەخشش و پاداشت و ڕەزامەندی خوایە لەدوا ڕۆژداو دنیاو ژیانی دنیا تەنیا وەك وەسیلەی وەدەست هێنانی ئەو ئاواتە بەرزو پیرۆزە سەیر دەکات، ئەگەرنا بەشتێکی یەکجار کەم و گچکەو نابووتی دادەنێ، وەك خوای کاربەجێ فەرموویەتی: (قُلْ إِنْ كَانَ آبَاؤُكُمْ وَأَبْنَاؤُكُمْ وَإِخْوَانُكُمْ وَأَزْوَاجُكُمْ وَعَشِيرَتُكُمْ وَأَمْوَالٌ اقْتَرَفْتُمُوهَا وَتِجَارَةٌ تَخْشَوْنَ كَسَادَهَا وَمَسَاكِنُ تَرْضَوْنَهَا أَحَبَّ إِلَيْكُمْ مِنَ اللَّهِ وَرَسُولِهِ وَجِهَادٍ فِي سَبِيلِهِ فَتَرَبَّصُوا حَتَّى يَأْتِيَ اللَّهُ بِأَمْرِهِ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ) التوبة: ٢٤.

چوار: وە بابای مسوڵمان و دیندار دڵنیاو مسۆگەرە کە بەو زەکات دان و ماڵ و سامان بەخشینەی هەم خۆی پاك و چاك (تزكية) دەبێت: (خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِمْ بِهَا...) التوبة:١٠٣، وە هەم ماڵ و سامانەکەیشی پاك دەبێتەوەو گەشەو زیاد دەکات: (وَمَا أَنفَقْتُمْ مِنْ شَيْءٍ فَهُوَ يُخْلِفُهُ وَهُوَ خَيْرُ الرَّازِقِينَ) النساء:٣٩، واتە: وەهەر شتێك ببەخشن خوا کەلێنی پڕدەکاتەوە، وە ئەو چاکترین ڕۆزی دەرە.

پێنج: دیسان بابای مسوڵمان ئەو ئەندازەیەی کە وەك زەکات دەیدات بەمافی ئەوانەی دەزانێ کە خوا دیاری کردوون و لەخۆی بەحەرام دەزانێ، چونکە خوا ئەو ئەندازەیەی بۆ ئەو کەس و شوێنانە دیاری کردوە کە باسی کردوون و، فەرمووشیەتی: ( انّ اللّه يَأْمُرُكُمْ أنْ تُؤَدُّوا الْأَمَانَاتِ إِلَى أَهْلِهَا....) النساء: ٥٨، واتە: خوا فەرمانتان پێ دەکات کەسپاردەکان بگێڕنەوە بۆ خاوەنەکانیان..

وە لەڕاستی دا مسوڵمانان بەگشتی یەکجار هەستیار (حَسّاس) ن کە دینارێکی زەکات ڕەگەڵ ماڵ و سامانەکانیان بکەوێ چونکە دڵنیان کە ئەو دینارە ماڵێکی حەرامە لێیان و دەبێ بەزووترین کات خۆیانی لێ قوتار بکەن و تەسلیمی خاوەنی شەرعی ی خۆی بکەن.

**دووەم: دەستەبەرکەرە ئیداریو یاسایییەکان:**

ئیسلام وەك چۆن لەڕێساو یاساکانیدا تەنیا حیسابی بۆ ڕواڵەتی ئینسان نەکردوەو دیوی پەنهانو دەروونو ویژدانیشی لەبەرچاو گرتوە، بەهەمان شێوەش بەتەمای هاندەرو پاڵنەرە دەروونییەکان وازی لەئینسان نەهێناوەو حیسابی بۆ سزاو پاداشتو لێپرسینەوە دنیاییەکانیش کردوە.

جا دەستەبەرکەرەکانی زەکات دان بەشێوەیەکی شەرعییانەی ڕێكوپێك لەڕووی ئیداریو یاساییەوە لەچەند شتێك دا خۆیان دەنوێنن، کە ئەمانە گرنگترینیانن:

یەك: فەرمان کردن بەهاوکاریکردنی کاربەدەستانی کۆکەرەوەی زەکات:

پێغەمبەری خوا ﷺ لەچەندان فەرمایشتیدا فەرمانی کردوە کە بابای خاوەن سامان هاوکاری کاربەدەستانی زەکات بکاتو هیچ شتێکیان لێنەشارێتەوە، تەنانەت ئەگەر کاربەدەستەکان زیادەڕۆییو ستەمیش بکەن، بۆ وێنە:

*(سيأتيكم رَكْبٌ مُبَغَّضُونَ فاذا أتَوْكُمْ فَرَحِّبوا بِهِمْ، وخَلُّوا بَيْنَهُمْ وبين مايَبْتَغون فَإنْ عَدِلُوا فلأَنْفُسِهِمْ وإنْ ظَلَمُوا فَعَلَيْها، فَإنَّ تَمَامَ زَكاتِكُمْ رِضاهُمْ، وَلْيَدْعُوا لَكُمْ) رواه ابوداود.

واتە: – ئەی سامانداران! – کۆمەڵێك دێنە لاتان ڕەزایان قورسە، جا هەرکاتێك هاتنە لاتان بەخێریان بێنن، وە ئەوەی کە لێتان دەخوازن – لەماڵی زەکات – تەسلیمیان بکەن جا ئەگەر دادگەرییان کرد ئەوە بۆ خۆشیان قازانجە، بەڵام ئەگەر ستەمیان کرد ئەوە بۆ خۆیان خراپە، ڕەزامەندیی ئەوانیش لەوەدایە کە زەکاتەکانتانیان بەتەواویی بدەنێ، ئنجا بائەوانیش دووعای خێرتان بۆ بکەن.

* (عن جرير بن عبدالله رضي الله عنه قال جاء ناسٌ مِنَ الأَعْرابِ الى رسولِ الله ﷺ فقالوا، إنَّ ناساً مِن المُصَدِّقين يأْتُونَنا فيَظْلِمونَنا، فقال ﷺ : أرْضوا مُصَدِّقِيكُمْ قالوا: وإنْ ظَلَمُونا؟! قال: أرْضوا مُصَدِّقِيكُمْ..) رواه ابوداود واللفظ له واخرجه مسلم والنسائي.

واتە: خەڵکێك لەعارەبە خێڵەکییەکان هاتنە لای پێغەمبەری خوا ﷺ و گوتیان: کەسانێك لەزەکات وەرگرەکان دێنە لامانو ستەممان لێدەکەن، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوانەی زەکاتتان لێوەردەگرن ڕازییان بکەن، گوتیان: ئەگەر ستەمیشمان لێبکەن؟ فەرمووی: زەکات لێوەرگرەکانتان ڕازی بکەن.

دوو: قەدەغەکردنی فرتو فێڵ بۆ خۆ دەربازکردن لەزەکات دان:

ئیسلام هەرجۆرە فێڵو تەڵەکەیەکی قەدەغە کردوە کە بەمەبەستی خۆدزینەوە لە زەکات بکرێ، وەك چۆن بەگشتی هەرجۆرە فێڵو پیلانێکی قەدەغەکردوە، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَنْ غَشَّ فَلَيْسَ مِنَّا) رواه البخاري، واتە: هەرکەسێك فێڵ بکات لەئێمە نیە.

وە (بخاري) ئەم فەرموودەیەی کردۆتە بەڵگەی قەدەغەبوونی فێڵو تەڵەکە بۆ زەکات نەدان:

*(لايُفَرَّقُ بين مُجْتَمعٍ ولايُجْمَعُ بين مُتَفَرِّق خَشْيَة الصَّدَقَة) رواه البخاري عن انس رضي الله عنه،

واتە: نابێ ئاژەڵی کۆ بڵاوبکرێن، یان هی بڵاو کۆبکرێنەوە لەترسی زەکات دان.

وە (ابو يوسف) لەکتێبی (الخراج) دا گوتوویەتی:[٤٢٧] (لايَحِلُّ لرَجُلٍ يؤمنُ بالله واليوم الآخر مَنْعُ الصَّدَقة، ولا إخْراجُها مِنْ مُلكِهِ الىٰ ملكِ جَماعةٍ غَيْرِهِ ليُفَرِّقَها بذٰلك فَتَبْطلُ الصَّدَقَةُ عنها، بأنَ يصيرَ لكلِ واحدٍ منهم من الأبلِ والبَقرِ والغَنَم مالاتَجِبُ فيه الصَّدَقَةُ، ولايَحْتالُ في إبْطالِ الصَّدقة بوَجْهٍ ولا سَبَبٍ).

واتە: وە هەر پیاوێك بڕوای بەخواو بەڕۆژی دوایی هەبێ بۆی نیە زەکات نەدات، وە بۆی نیە بەمەبەستی بڵاوکردنەوەو زەکات لێنەکەوتنی لەخاوەنێتی خۆی بیباتەدەرو بەکەسانێکی دیکەی ببەخشێ، بەجۆرێك کەهەر کامێکیان هەر هێندە حوشترو مانگاو مەڕو بزنی هەبن کە زەکاتیان لێ نەکەوێ، وەنابێ بەهیچ ڕەنگێكو و بەهیچ هۆیەك فێڵ بکات بۆ زەکات نەدان.

جا هەرچەندە کەمێك لەزانایان وەك (ابن الجوزي) فێڵ کردنی بەڕواڵەت شەرعی یان بەدروست زانیوە، بۆ وێنە: کابرایەك بەرلەوەی کاتی زەکات دان بێت ماڵو سامانەکەی بەژنەکەی ببەخشێ، پاشان ژنەکەشی پێی ببەخشێتەوە!!

بەڵام زۆربەی هەرە زۆری نیزیك بەیەکدەنگی زانایان ئەوجۆرە فرتو فێڵانەیان بەحەرام داناوەو بڕیاریشیان داوە کە هەر کەسێك وابکات بەو قوڵە فێڵانە زەکاتی لەسەر لاناچێو هەر فەرزە بیدات، (ابن قيم الجوزية)ش لەکتێبی[٤٢٨]: (إغاثَةَ اللّهْفان) و لەکتێبی[٤٢٩]: (إعْلامُ المُوَقِّعين عَنْ رَبِّ العالَمين) دا زۆر چاك بەرپەرچی ئەو جۆرە بۆچوونانەی داوەتەوە.

---

[٤٢٧] بڕوانە: (الخراج) ص٨٠.

[٤٢٨] بڕوانە: ج١ص٣٦٨، ٤٦٩، ط دار الحديثه، تحقيق و تعليق: مجدي فتحي السيد.

[٤٢٩] بڕوانە: ج٣.

پێشم وایە جگە لەو فەرمایشتەی کە (بخاري) لە (انس بن مالك) ەوە هێناویەتی، فەرموودەی: (إنَّما الأعمالُ بالنياتِ وإنَّما لكلِ آمريءٍ مانَوى) متفق عليه، چاکترین بەڵگەی ڕوونو بێچەندو چوونی حەرامیی هەرجۆرە فرتو فێڵێکە.

سێ:- سزاو جەزرەبەدانی بابای زەکات نەدەرو ماڵ لێئەستاندنی:

زانایان پاش یەکدەنگ بوونیان لەسەر ئەوە کە زەکات لێوەرگرتنی سامانداره‌کان فەرزەو لەسەر کۆمەڵگاو دەستەڵاتی شەرعیی مسوڵمانان پێویستە کە بە تۆبزی لێیان بستێنێ هەرکاتێك بەخۆشی نەهاتنە ژێر باری شەرعو ملیان نەدا.

لەوبارەوە کە ئایا پێویستە چۆن چۆنی سزا بدرێنو تەمبێبکرێنو جگە لە زەکاتەکەیان ماڵو سامانی دیکەیان لێبستێنرێ یان نا؟! ڕایان جیاوازە، بەڵام ڕای زۆربەیان کە چەند دەقێکی قورئانو سوننەتیش بە بەڵگە دێننەوە بەهێزترە کە بریتیە لە: «لێئەستاندنی ئەو ئەندازە زەکاتەی کە لەسەریان فەرز بووە، وەسزادانیشیان بە لێزەوت کردنو دەست بەسەرداگرتنی ئەندازەیەك لەماڵو سامانەکانیان، بەپێی بۆچوون (إجتهاد)ی دەستەڵاتی شەرعیو کاربەدەستانی مسوڵمانان».

ئەو دەقانەش کە بە بەڵگەیان دێننەوە لەوبارەوە ئەمانە گرنگترینیانن:

*(فَإِنْ تَابُوا وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ فَخَلُّوا سَبِيلَهُمْ) التوبة:٥،

کەواتە: ئەگەر نوێژیان بەرپانەکردو زەکاتیان نەدا تۆبەکەیان ئیعتباری پێناکرێ و نابێ وازیشیان لێبهێنرێ!.

*(ابوبکر الصدیق)یش خوا لێیڕازی بێ لە کاتی جەنگەکانی هەڵگەڕانەوە (حروب الرِّدَّة) داو لەوەڵامی کەسانێك دا کە ڕەخنەیان هەبوو لەجەنگ کردنی لەگەڵ زەکات نەدەران دا گوتی: (والله لَوْ مَنَعوني عِقالاً كانوا يُودُّونَهُ الى رسول الله ﷺ لَحارَبْتُهُمْ عليه) رواه الجماعة الا ابن ماجة عن ابي هريرة رضي الله عنه.

* هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی زەکات نەدەران فەرموویەتی: (..وَمَنْ مَنَعَها فَإِنَّا آخِذُوها وشَطْرَ إبِلِه عَزْمَةٌ مِنْ عَزَماتِ رَبِّنا تَبارَكَ وتَعالىٰ..) رواه احمد و ابوداود والنسائي.

واتە: .. وە هەر کەسێك نەیدات ئەوە ئێمە لێی دەستێنینو نیوەی حوشترەکانیشی لێزەوت دەکەین، بڕیارێکە لەبڕیارەکانی پەروەردگارمان..

ئنجا وەك زانایانیش گوتوویانە:[٤٣٠] سزای دارایی (العقوبة المالية) بەچەندان بەڵگە سەلمێنراوە کە شتێکی ڕەوایەو، یەکێکە لەو مەسەلانەش کە دەکەوێتە جوغزی سیاسەتی شەرعییەوەو چۆنیەتیو ئەندازەکەی پەیوەستە بە بۆچوونو ئیجتیهادی کاربەدەستانی دەوڵەتەوە، کەواتە ئەوەی کە لەو فەرموودەیەی پێشوودا هاتوە: (فَانَّا آخِذوها وشَطْرَ إبِلِهِ) مەبەست پێی دیاریکردنی ئەندازەی سزای دارایی نیە بۆ بابای زەکات نەدەر، بەڵکو مەبەست پێ ئەسڵی ڕەوابوونو شەرعیی بوونیەتی.

لەئەنجامی ئەم برە توێژینەوەیەش دا بۆمان دەرکەوت کە خوای کاربەجێو پەنهان بین بۆئەوەی مسوڵمانان کەمتەرخەمی لە زەکات دان دا نەکەنو وەك پێویست جێبەجێی بکەن کۆمەڵێك هۆکارو دەستەبەرکەری وای بۆ داناون کە جێبەجێکردنو بەجێی خۆی گەیاندنی زەکات مسۆگەر دەکەن، بەپێچەوانەی باجەوە کە وەك پێشتر باسمان کرد دزیو فزیو پاشقولگرتنو ژێر بەژێری زۆری تێدا دەکرێ، لەگەڵ ئەو هەموو دەستەبەرکەرو هۆکارانەدا کە بۆی دانراون!



---

[٤٣٠] (ابن قيم الجوزية) لەکتێبی: (الطرق الحكمية في السياسة الشرعية) ص٢٤٥تا٢٤٩، چەندان بەڵگەو وێنەی جۆراوجۆری لەژیانی پێغەمبەر ﷺ و چوار جێنشینەکانیدا بۆ ئیسپاتی شەرعی بوونی سزاو تۆڵەی دارایی هێناونەوە، وە گوتوویەتی: (وهذه قضايا صحيحة معروفة وليس يَسهلُ دعوى نسخها، ومَنْ قال: ان العقوبات المالية منسوخة واطلق ذلك فقد غَلَطَ على مذاهب الأئمة نَقْلاً واَسْتدلالاً..).

هەروەها (ابن تيمية) لەچەند شوێنێکی (مجموع الفتاوى) کەیدا ڕوونی کردۆتەوە کە تەمبێکردن (التعزير) بەسزا ماڵییەکان ڕەوایە (والتعزير بالعقوبات المالية مشروع) بڕوانە: ج٢٠ص٢١٠، ٢١١، وە ج٢٨ص٦٤تا٦٧، وە ج٢٩ص١٦٤.

## ٧-ئایا وێڕای زەکات دروستە باجیش دابنرێ؟!

ئایا دەستەڵات و دەوڵەتی ئیسلامی کە کاروباری مسوڵمانان هەڵدەسووڕێنێ وێڕای وەرگرتنی زەکات کە خوای پەروەردگارو پێغەمبەری سەروەری ﷺ رایان گەیاندوە کە لەسەر مسوڵمانانی ساماندار پێویستە بیدەن، بۆی هەیە چەند جۆرە باجێکیش وەربگرێ بۆ دابین کردنی کۆمەڵێك بەرژەوەندی گشتی کۆمەڵگاو ئیدارەو هەڵسووڕاندنی کاروبارەکانی حوکمو وڵات؟!

بۆ وەڵامدانەوەیەکی تێر وتەسەل پرسیاری سەرەوە پێویستە سێ کورتە باس لەسێ برگەی سەربەخۆدا بخەینەڕوو:

**یەك: چەند بەڵگەیەك لەسەر دروست (جائز) بوونی وەرگرتنی باج.**

**دوو: ئەو مەرجانەی کە ڕەچاوکردنیان پێویستە بۆ وەرگرتنی باج.**

**سێ: بەڵگەکانی ئەوانە کەباج بەڕەوا نازانن و بەرپەرچ دانەوەیان.**

### یەك: چەند بەڵگەیەك لەسەر دروست (جائز) بوونی وەرگرتنی باجەکان.

أ-پێویست بوونی هاوکاریو مشوورخۆری کۆمەڵایەتی (التضامن الأجتماعي):

پێشتر -لەخاڵی دووەمی بەندی یەکەم دا لەژێر ناونیشانی (ماڵ بەخشینی فەرز) دا - ڕوونمان کردۆتەوەو بەچەندان بەڵگەش سەلماندوومانە کە جگە لە زەکات، لەچەندان حاڵەت دا لەسەر ئینسانی مسوڵمانو کۆمەڵی مسوڵمان پێویست دەبێ کە لە ماڵو سامانی خۆیان صەرف بکەنو ببەخشن، جا لێرەدا بەپێویستی نازانم ئەوەی لەوێ گوتراوە دووبارەی بکەینەوەو خوێنەری بەڕێز حەواڵەی ئەوێ دەکەمەوە.

ب- ئەو کەسو شوێنانەی زەکاتیان تێدا خەرج دەکرێ کەمنو ئاتاجیو پێداویستییەکانی کۆمەڵگاو دەوڵەت زۆر زۆرن:

وەك پێشتر ڕوون کرایەوە زەکات یەکێکە لەخواپەرستییە مەزنەکانی ئیسلامو چۆنیەتی کۆکردنەوەو دابەش کردنو خەرج کردنیشی لەلایەن شەرعەوە دیاریکراوەو هیچ کەسیش بۆی نیە دەستکاری بکات، بەڵام بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵگاو پێداویستییەکانی زۆرو زەوەندن، ئنجا ئەگەر وشەی: (في سبيل الله) وەك پێشتر ڕوونمان کردەوەو بەڵگەشمان لەسەر هێنانەوە، - وەك زۆربەی زانایان گوتوویانە - بەس جیهادو جەنگو جەنگاوەران نەگرێتەوەو سەرجەم بەرژەوەندییە گشتیو بالأیەکانی کۆمەڵگاش بگرێتەوە، دیسان هەشتیەك (٨/١)ی زەکات زۆر لەوە کەمترە کەبتوانێ هەموو ئەو کارو

بەرژەوەندی‌یانە پێك بێنێ کە گەلێك جاران کۆمەڵگاو دەوڵەت پەکیان لەسەریان دەکەوێ، لەهەموو بوارەکانی جەنگی‌و ئاوەدانی‌و کشت‌وکاڵ‌و پیشەسازی‌و زانستی‌و کۆمەڵایەتی‌دا .

ئنجا ئەگەر یەکێك بپرسێ: کە ئایا کاتی خۆی دەوڵەت‌و کۆمەڵگا پارەو مەسرەفی ئەو جۆرە شتانەی لەچ سەرچاوەو ڕێیەکەوە دابین کردوە؟! لەوەڵام دا دەڵێین: کاتی خۆی ئەو ماڵ‌و سامانە زۆرانەی کە مسوڵمانان چ بەهۆی جەنگەوە – کە غەنیمەت‌و دەستکەوت (الغنیمة)ی پێ‌دەڵێن – و چ بەبێ جەنگ‌و کوشتار – کە ماڵی هاتووەوە (مالُ الفيء) ی پێ‌دەگوترێ – دەستیان دەکەوت ئەو کارانەیان پێ‌ئەنجام دەداو بەرژەوەندی‌یە گەورەو گرنگەکانی کۆمەڵگاو دەوڵەتیان پێ دابین دەکردن.

ئاشکراشە کە یاسای: (مالا يتمُّ الواجِبُ الا بهِ فهوَ واجبٌ) (هەر شتێك فەرزێك پەکی لەسەری بکەوێ ئەویش فەرز دەبێ) دەگونجێ بکرێتە بناغەی باج وەرگرتن بۆ هێنانەدی هەموو ئەو ئامانجە شەرعی‌یانەی کە کۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامی پێیان ئاتاجن.

ج- چەند بنچینەیەکی شەرعی گشتی (قواعد شرعية كلية):

جگە لەبنچینەی شەرعی‌ی ناوبراو: (مالايتم الواجب إلا بهِ فهو واجبٌ) زانایانی شەرعزان لەئەنجامی سەرنج دان و تێوەرامانی دەقەکانی قورئان‌و سوننەت دا چەندان[431] بنچینەی شەرعی‌یان هەڵهێنجاون کە دەبنە مایەی بەرچاوڕوونی مسوڵمانان‌و باشتر بەهرە وەرگرتنیان لەقورئان‌و سوننەت‌و بەهەڵەدانەچوون لە فام کردن‌و وەرگرتنی حوکمە شەرعی‌یەکان دا لێیان، بۆ وێنە هەندێك لەو بنچینانەی کە پەیوەستن بەم بابەتەی ئێمەوە:

* (دَرءُ المَفْسَدة مُقَدَّمٌ على جَلْبُ المَصلَحَةِ) لابردنی زیان پێش وەدەست هێنانی بەرژەوەندی دەخرێ.

* (يُتَحَمَّلُ الضَّرَرُ الخاصُّ لِدَفْعِ ضَرَرٍ عامٍ) چاوپۆشی لەزیانی تایبەت دەکرێ لەپێناوی نەهێشتنی زیانی گشتی‌دا.

*(تفويتُ أدنىٰ المَصلَحتينِ تَحْصيلاً لِأَعْلاهُما) بەرژەوەندی‌ی گچکە بەقوربانی هی گەورە دەکرێ.

جا بێگومان ئەم بنچینانەو هاووێنەکانیان نەك تەنیا بەڵگەی ڕەوا (مباح) بوونی دانانی باجەکانن بۆ دوورخستنەوەی زیان‌و مەترسی‌یەکان‌و هێنانەدی بەرژەوەندی‌یە گەورەو گرنگەکانی ئۆممەت‌و دەوڵەتی ئیسلامی، بگرە بەڵگەی پێویست کردنیشیانن‌و، بەتایبەت لەم ڕۆژگارەدا کیان‌و دەوڵەت بەبێ ئەوە بەڕێوەچوونی زەحمەتە ئەگەر مەحاڵیش نەبێ.

د- جیهادکردن بەماڵ و سامان:

---

[431] بۆ وێنە سەرنجی: (الأشباهُ النظائر) ی (ابن نجيم) و ئەوەی (سيوطي) و (أصول التشريع)ی (خضری بگ)بدە.

خوای پەروەردگار و باڵادەست لەچەندان دەقی قورئانیدا فەرمانی بەمسوڵمانان کردوە کە بەماڵو سامانیان لەرێی خوادا جیهاد بکەن، وێڕای سەرو گیانیان:

* (إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا وَجَاهَدُوا بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ أُوْلَئِكَ هُمْ الصَّادِقُونَ) حجرات:١٥،

*(تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَتُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ بِأَمْوَالِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَكُمْ إِنْ كُنتُمْ تَعْلَمُونَ) الصف:١١،

*(وَأَنفِقُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلَا تُلْقُوا بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ وَأَحْسِنُوا إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ) البقرة:١٩٥،

ئاشکراشە کە جەنگو جیهاد لە بەرانبەر دوژمنانو ناحەزان داو پارێزگاری لێکردنی پیرۆزییەکانی ئیسلامو حورمەتەکانی ئوممەتو سنوورەکانی دەوڵەت وێڕای چەكو جبەخانەو جەنگاوەران پێویستی بەزۆر شتی دیکەش هەیەو، مسوڵمانان کاتێك دەتوانن بەرەنگاری فێڵو پیلان و نەخشەی ئیبلیسانەی کافرو مونافیقانو هێرشو پەلامارەکانیان بکەن، بەچۆکیان دا بێننو بیان گەوزێنن، کە لەهەموو بوارەکانی ئابووریو پیشەسازیو زانستیو... هتد دا بەهێزو پێز بنو، بێگومان ئەمەش بەبێ هاوکاریی جیددی مسوڵمانان بەگشتیو بەتایبەت پارەدارەکانیان ناکرێ.

هەربۆیەش زانایانی[٤٣٢] ئیسلام بەڕەوایان زانیوە کە کاربەدەستو مشووورگێڕانی مسوڵمانان بەزۆر ماڵو دارایی لەمسوڵمانانی هەبوو وەربگرن لەو حاڵەتانەدا.

ه-ڕەنج لەبەرانبەری گەنجو ئێش لەبەرانبەری نۆش دا:

بێگومان ئەو ماڵو دارایییەی کە بەهۆی باجەکان (ضرائب) ەوە کۆدەبێتەوەو دەڕژێتە خەزێنەی دەوڵەتەوە، هەر لەپێناوی بەرژەوەندییە گشتییەکانی کۆمەڵگادا خەرج دەکرێو هەموو لایەك لێی بەهرەمەند دەبن، بۆ وێنە: بەرگریکردن لەوڵاتو، چەسپاندنی هێمنیو ئاساییشو، خێرکردنو پەروەردەکردنو، ئاوەدانیو بەرەو پێش بردنی ژیانو گوزەرانی خەڵكو، تەندروستی گشتیو، ڕێگاو بانو هۆیەکانی هاتوچۆو گواستنەوەو.. هتد، کەواتە هەموو ئەوانەی کە ئەوجۆرە خزمەتگوزارییانەیان پێشکەش دەکرێن، مادام دەوڵەت سەربەخۆو بەبێ هاوکاری ئەوان لەتوانایدا نەبێ پێویستە بەپێی توانایان هاوکاری بکەن، چونکە خوای دادگەر فەرمویەتی:

(وَتَعَاوَنُوا عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَى...) المائدة:٢، وە بەدەردی پێشینان گوتوویانە: (ئەو ڕۆنەی خۆیان هەر لەسەری خۆیان دەدرێتەوە)، عارەبیش گوتوویانە: (الغُنْمُ بالغُرْمِ).

---

[٤٣٢] بڕوانە: (فقه الزكاة) ج٢ص١١٠٢، کە لە (ابن تيمية) و لە (الجويني) خاوەنی کتێبی: (غياث الأمم)ەوە هێناویەتی.

## دووەم: ئەو مەرجانەی کەڕەچاوکردنیان پێویستە بۆ وەرگرتنی باج:-

١- پێویستیو ئاتاجی ڕاستەقینە هەبێو چارەی دیکەش نەبێ:-

دیارە ئەسڵ پاراستنی ماڵو سامانی خەڵكو پارێزگاری لێکردنی خاوەنێتییانو ئەرك نەخستنە سەر شانیانە مەگەر بە بەڵگەیەکی شەرعی ڕوونو بێچەندو چوون، بۆیە یەکەمین مەرجی دروست (جائز) بوونی باج وەرگرتن لەخەڵکی ئەوەیە کە دەوڵەتو کۆمەڵگا ئاتاجیو پێویستی ڕاستەقینەیان هەبێ، وە بێجگە لەباج وەرگرتن هیچ چارەی دیکەشیان لەبەردەم دانەبێ!

شایانی باسیشە کە زاناو پێشەوایانمان زۆر سەخت گیرییان لەم مەرجەدا کردوە، ئەوەك دەستەڵاتدارەکان بۆ زیادەڕۆیی تێرکردنی ئارەزووەکانیان باری شانی خەڵکی بە باجەکان قورس بکەن!

وە لەمێژووی ئیسلامیی‌دا زۆر هەڵوێستی مەردانەو بوێرانەی زانایان لەبەرانبەر حوکمڕانان دا لەوبارەوە بەخەتی پرشنگدار تۆمارکراون، بۆ وێنە:

یەکەم:[٤٣٣] کاتێك سوڵتانی میصر (سیف الدین: قُطُزْ) ویستی لەشکر ئامادە بکات بۆ جەنگی تەتەرەکانو زاناو شەرعزانانو قسە ڕۆیشتووانی وڵاتی بانگ کردنو ڕاوێژی پێکردنو، پێشنیاری کرد کە ماڵو سامان لەخەڵکی وەربگیرێو بۆ پرچەككردنو خۆئامادەکردن بەکاربهێنرێو لەوبارەوە قسەو باس کراو هەموو لایەك چاوەڕێی قسەو بڕیاری: (سُلْطانُ العُلَماء: العِزّ بنُ عَبْدِالسّلام) بوون، (ابن عبدالسلام) یش بە (قُطُزْ) ی گوت: (هەر کاتێك دوژمن بەسەر وڵاتی مسوڵمانانی داداو داگیریکرد، لەسەر تێکڕای خەڵکی فەرزە کە لەگەڵی بجەنگن، ئنجا بەمەرجێك هیچ لەخەزێنە (بیت المال)دا نەمابێو، هەرچی جلوبەرگو کەلوپەلی زێڕ کفت کراوو گرانبەهاتان هەیە فرۆشتبتانو هەرکام لەسەربازەکان تەنیا وڵاخو چەکەکەیان هەبێو، لەگەڵ خەڵکیدا یەکسان بن، ئەوە بۆتان هەیە بەئەندازەی ئەوە کە جیهادەکەتان پێویستیەتی لەمیللەت وەربگرن، بەڵام پارە لەخەڵکی وەرگرتن لەحاڵێك دا کەپارەو سامانو کەلوپەلی گرانبەها لەدەستی جەنگاوەران (واتە دەوڵەتو کاربەدەستانی)دا مابێ، ئەوە نابێو دروست نیە).

---

[٤٣٣] بڕوانە: (فقه الزکاة) ج٢ص١٠٨٠، کە لە: (النجوم الزاهرة) ج٧ص٧٢، ٧٣، وەریگرتوە.

دووەم: هەروەها هەڵوێستێكی كتومت بەوشێوەیەش لەنێوان پێشەوا (نووی)و (الظّاهر بَیْبَرس)ی دەستەڵاتداری شامیش دا دووبارە بۆتەوە، كە سەرەنجام (الظّاهر) ئەو پێشەوا ناودارە پارێزكارو فیداكارە دەردەكات، ئەویش دیمەشق بەجێ‌دەهێڵێ‌و پاشان هەرچەندە لەسەر داواو تكای زانایانی دیكە (الظاهر) پەشێمان دەبێتەوەو داوای لێ‌دەكات كە بگەڕێتەوە، بەڵام (نووی) ڕازی نابێ‌و دەڵێ: هەتا ظاهیر لەوێ‌دابێ ناچمەوە نێوی! وە ظاهیریش پاش مانگێك دەمرێ جا لەنامەیەكی‌دا كە بۆ سوڵتان ظاهیری نووسیوەو ئامۆژگاری كردوە، گوتوویەتی:

(ولایَحِلُ ان یُؤْخَذَ من الرَّعیَّةِ شَيءٌ، مادام في بَیْتِ المالِ شَيءٌ مِنْ نَقْدٍ او مَتاعٍ او أَرْضٍ او ضِیاعٍ تُباعُ اَو غَیْرُ ذٰلِكَ، وهؤلاءِ عُلَماءُ المُسلمین في بِلادِ السُلطانِ - اعزَّ الله اَنْصارَهُ - مُتَّفِقون علیٰ هذا)[٤٢٤]

واتە: وە ڕەوا نیە هیچ شتێك لەماڵ‌و سامانی میللەت وەربگیرێ، هەتا شتێك لەدراو یان كەل‌وپەل یان زەوی و زارێك كە بفرۆشرێ‌و هەر شتێكی دیكەش لەخەزێنەدا مابێ، وە ئەوانەش زانایانی مسوڵمانانن لەوڵاتی سوڵتان دا - خوا پشتیوانەكانی سەربخات - هەموویان لەسەر ئەمە یەكدەنگن.

ب-باجەكان بەشێوەیەكی ڕاست‌و دادگەرانە دابنرێن:

مەرجی دووەمی وەرگرتنی باجەكان (أخذ الضرائب) ئەوەیە كە دەبێ بەشێوەیەكی ڕەواو دادگەرانە دانرابن، ئاشكراشە كە لێرەدا مەبەستمان یەكسانی (المساواة) نیە كە بێگومان یەكسان كردنی داراو نەدارو هەبوو و هەژار ستەمەو دادگەری‌ی نیە! بەڵكو دادگەری‌ی ئەوەیە كە هەر كەسە بەئەندازەی تواناو دەست ڕۆیشتنی خۆی باجی بخرێتە سەر ئەستۆ.

ئنجا مەرجیش نیە كەجیاوازی باجەكان تەنیا لەو ڕووەوە بێ كە باس كرا، بەڵكو جاری وا هەیە لەبەر هێنانەدی بەرژەوەندی‌یەكی ئابووری‌یە، وەك (ابو عبید) لە (ابن عمر) وە خوا لێیان ڕازی بێ گێڕاویەتەوە:[٤٢٥] (كان عمر یأخذ مِن النَّبَط: من الزَّیْتِ والحِنْطَة نِصْفَ العُشْرِ، لِكَيْ یَكْثُرَ الحَمْلُ الیٰ المَدینَة، ویأخُذُ مِنَ القُطْنیَّةِ العُشْرَ)

---

[٤٢٤] بڕوانە: (فقه الزكاة) ج٢ص١٠٨٠، ١٠٨، كە لە: (ترجمة الأمام النووي) الحافظ السخاوي وەریگرتوە.

[٤٢٥] بڕوانە: (الأحوال) لأبي عبید، ص٥٣٣.

واتە: عومەر (خوا لێی ڕازی بێ) لەنەبطی‌یەکان[436] (بازرگانی‌یان دەکرد): لەزەیت‌و گەنم بیست یەك (٢٠/١)ی وەردەگرت (وەك باج) بۆئەوە باری زۆر - ی زەیت‌و گەنم - بۆ شاری مەدینە بێنن، وە دەییەك (١٠/١)ی لە لۆکە فرۆشەکان وەردەگرت.

هەروەها (اَنَس بن مالك) خوالێی ڕازی بێ گێڕاویەتەوە کە عومەر خوالێی ڕازی بێ وەك یاسایەك دایناوبوو کە:

(أَنْ يُؤخَذَ من تِجّار أَهْلِ الحَرْبِ العُشْرُ، ومِنْ تُجّار أَهْلِ الذِّمَّة نِصفُ العُشْرِ، ومن تجار المسلمين رُبْعُ العُشْرِ)[437].

بازرگانەکانی ئەهلی جەنگ دەییەکیان لێ‌وەربگیرێ‌و، بازرگانەکانی هاوپەیمان بیست یەك‌و بازرگانەکانی مسوڵمانانیش چل یەك.

ج- دەبێ باجەکان لەبەرژەوەندی‌یەکانی میللەت دا صەرف بکرێن:

بەڵێ تەنیا ئەوەندە بەس نیە کە باجەکان بەهەق وەربگیرێن‌و بەدادگەریش وەرگیرانەکە جێبەجێ‌بکرێ، بەڵکو پێویستە پاش کۆکرانەوەش بەپێی یاساکانی شەرع‌و لەپێناوی دابین کردنی بەرژەوەندی‌یە گشتی‌یەکانی کۆمەڵگاو دەوڵەت دا بەکاربهێنرێ، نەك لەپێناوی هەواو ئارەزووی حوکمڕان‌و کاربەدەستان دا.

با بۆ چاکتر ڕوون بوونەوەی مەبەست سەرنجی ئەم گفت‌وگۆیەی عومەری کوڕی خەتتاب‌و یەکێك لەمسوڵمانان بدەین:

(عن سفيان بن أبي العوجاء قال: قال عمر بن الخطاب: والله ماأدري أَخَليْفَةٌ أنا أمْ مَلِكٌ؟! فأن كنت مَلكاً فهذا أمْرٌ عَظيمٌ، قال قائلٌ: ياأمير المؤمنين اِنَّ بَيْنَهُما فَرْقاً، قال: ماهو؟ قال: الخليفة لايأخُذُ إلا حَقاً ولايصنعهُ إلا في حَقٍ، فأنت بحَمْدِالله كذلك، والمَلِكُ يَعْسِفُ، فيأخذُ مِنْ هذا ويُعْطي هٰذا، فَسَكَتَ عُمَرُ)[438]

واتە: عومەری کوڕی خەتتاب گوتی: بەخوا نازانم ئایا من خەلیفەم یان پادشام؟ ئەگەر پادشا بم ئەوە شتێکی گەورەیە! قسەکەرێك گوتی: ئەی فەرماندەی بڕواداران جیاوازی‌یەکیان هەیە، گوتی: چی‌یە؟ گوتی: خەلیفە بەهەق نەبێ (سامان) وەرناگرێ‌و لەشوێنی هەقیش دا نەبێ داینانێ، جا ستایش بۆ خوا کە تۆ ئاوای، بەڵام پادشا ستەم دەکات‌و (هەر لەخۆوەو بەبێ هەق) لەم وەردەگرێ‌و بەم دەبەخشێ! جا عومەر (خوا لێی‌ڕازی بێ) بێ‌دەنگ بوو.

---

[436] نەبەطی‌یەکان (نبط، أنباط) گەلێکن، وە بە بازرگانان‌و جوتیارانیش دەگوترێ بڕوانە: (المعجم الوسيط) ص٨٩٨.

[437] هەمان سەرچاوەو لاپەرە.

[438] بڕوانە: (فقه الزكاة) ج٢ص١٠٨٤، کە لە (طبقات ابن سعد) ج٣ص٣٠٦، ٣٠٧ وەرگرتوە.

د- پەسندکردنی مشورخۆران و ئەنجوومەنی ڕاوێژ:

چوارەمین مەرجی ڕەوابوونی باج وەرگرتن لەئیسلام دا ئەوەیە کە خەلیفە یان سەرۆك یان پێشەوای دەوڵەت، چ جای کاربەدەستانی خوار وی وەك سەرپەرشتی ویلایەتەکان، بۆی نیە بەتەنیاو بەبێ ڕاوێژ پێکردن و پاشان پەسەندکردن و ڕا لەسەربوونی مشوور خۆران (أهْلُ الحَلِّ والعَقْد) و ئەنجوومەنی ڕاوێژ، بەتایبەت پسپۆڕانی ئەو بوارە، هەر لەخۆوەو سەربەخۆ باجەکان دابنێ، چونکە وەك پێشتریش گوتمان ماڵ و سامانی ئینسانەکان پێویستە وەك خوێن و کەرامەت و حورمەت و ئابڕوویان پارێزراو بێت و هیچ کەس بۆی نیە بەبێ بەڵگەو پاساوی شەرعی دەستی بۆ درێژ بکات.

ئنجا بەحوکمی ئەوە کە ڕاوێژکردن (الشوریٰ) یەکێکە لەبنەما هەرە گەورەو گرنگەکانی بەڕێوەچوونی کاروباری کۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامی، وەك خوای کاربەجێ فەرموویەتی: (وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ) الشورى:٣٨، وە دانانی باجەکانیش لەسەر هاوڵاتیان بەمسوڵمان و نامسوڵمانەوە کارێکی یەکجار گەورەو گرنگە، ئەوە بێگومان بەبێ ڕا لەسەر بوون و پەسەندکردنی مشوورخۆران دروست نیە دابنرێ، چونکە ئەوکاتە بەدەست تێوەردان (تدخل)ی ماڵ و سامانی خەڵکی دادەنرێ لەلایەن شەخسی حوکمڕانەوەو، ئەوجۆرە ڕەفتارەش هیچ دەقێکی شەرعی پشتگیری ناکات، بەڵام بەپێچەوانەوە چەندان بەڵگەی شەرعی ڕوون و بێ چەندو چوون لەسەر ئەوە هەن کە نابێ بەناهەق ماڵ و سامانی هیچکەس بخورێ و زیانی پێ بگەیندرێ، بۆ وێنە: (يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَأْكُلُوا أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ إِلَّا أَنْ تَكُونَ تِجَارَةً عَنْ تَرَاضٍ مِنْكُمْ وَلَا تَقْتُلُوا أَنفُسَكُمْ إِنَّ اللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا) النساء:٢٩، واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە ماڵ و سامانتان لەنێو خۆتان دا بەناهەق مەخۆن..

بەڵگەی ئەوەش کە ئەگەر بەڕاوێژ و پەسەندکردنی مشوورخۆران و ئەهلی ڕاوێژ بێت دروستە باج وەرگرتن دابنرێ - جگە لەبەڵگەکانی پێشوو - ئەوەیە کە خوای دادگەرو کاربەجێ فەرموویەتی: (وأمرهم شورى بينهم) با کاروباریان بەڕاوێژ بێ، جا بێگومان باج وەرگرتن (اخذ الضريبة)یش یەکێکە لە کاروبارەکانیان، کەواتە مادام بەڕاوێژ پەسەندی بکەن و پێیان چاك بێ دروست و ڕەوایە.

## ڕوونکردنەوەیەك دەربارەی ڕاوێژ (شورى):

زانایان پاش یەکدەنگ بوونیان لەسەر پەسەندیی و چاکیی ڕاوێژ، لەدوو ڕووەوە لەبارەی ڕاوێژەوە کەوتوونەتە ڕاجیایی (إختلاف)یەوە:

**یەکەم**: ئایا ڕاوێژکردنی فەرمانڕەوا (حاکم) بەئەنجوومەنی ڕاوێژ فەرزە یان سوننەتە؟!

**دووەم**: ئایا ڕای زۆربەی ئەنجوومەن و ڕاوێژ پێکراوان بۆ فەرمانڕەوا پابەندکەر (مُلزِم)ە یان بەس ئاگادارکەر ( مُعْلِم)ە ؟!

جا هەرچەندە ئێرە جێی توێژینەوەی باسی ڕاوێژ نیە، بەڵام هەر بەکورتی سەرو تیشك دەخەینە سەر هەركام لەم دوو پرسیارە:

*یەكەم:* جاری بۆ پرسیاری یەكەمیان ئەگەر گونجاوو ڕەوابێ بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری كە ئایا ڕاوێژكردنی لەسەر پێویست بووە، یان تەنیا سوننەت بووە؟! بكرێ، - كە بۆ ئەویش بەڵگەی فەرزبوونی بەهێزترە[٤٣٩] - ئەوە بێگومان دروست نیە بۆ غەیری وی ئەو پرسیارە هەر بكرێ دوای ئەوەی خوای كاربەجێ بەڕاشكاوی فەرموویەتی: دەبێ كاروباری مسوڵمانان بەڕاوێژ بێت، وەدوای ئەوەی كەپێغەمبەری خوا ﷺ هیچ مەسەلەو ڕووداوێكی ڕاوێژ هەڵگری نەهاتۆتە پێش كەڕاوێژی نەكردبێ وەك لە سیرەی ژیانیدا بەڕوون و درەوشاوەیی دیارە.

*دووەم:* بۆ پرسیاری دووەمیشیان دەڵێین:

بێگومان ڕاوێژ پابەندكەر (مُلزِم) ەو تەنیا فێركەر و ئاگاداركەرەوە نیە، چونكە:

١-ئەگەر ئەنجامی ڕاوێژكردن بریتی نەبێ لە پابەندبوونی فەرمانڕەوای ڕاوێژكەر بەڕای زۆربە یان سەرجەم ڕاوێژپێكراوەكانیەوە، ئەو ڕاوێژكردنە جەوهەرو نێوەڕۆكی خۆی لەدەست دەدات و كۆڕی ڕاوێژو ئەنجوومەنی ڕاوێژ پێكراوان بەبەلاش سەری خۆیان دەهێشێنن!!

ئاخر چ مانای هەیە پاش چەند سەعات مشت ومڕو ڕاوێژو هەڵسەنگاندنی كۆڕو ئەنجوومەنی مشوورخۆران و تەگبیركەران بابای فەرمانڕەواو جڵەو بەدەست هەر لەسەر قسەو ڕای خۆی بێت و، بتوانێ هەرچی گوتراوە ئەگەر بە بەڵگەش ئیسپات كرابێ هەمووی بەدیواری دا بدات!!

ئنجا (ابن كثير)[٤٤٠] یش لەتەفسیرەكەی خۆی هێناویەتی كە (ابن مردويه) لە (علي بن ابي طالب)ەوە خوا لێی ڕازی بێ كە گوتوویەتی: (سُئِلَ رسولُ الله ﷺ عن (العَزْم) في الآية الكريمة: (فأذا عَزَمْت فتوكل على الله) فقال: مُشاورةُ أهلِ الرايِ ثُمَّ إتّباعُهُمْ) واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ لەبارەی (العزم) ەوە كە لەئایەتی بەڕێز (فأذا عَزَمْتَ فتوكّلْ على الله) دایە پرسیاری لێكرا فەرمووی: عەزم لێرەدا بریتیە لەڕاوێژكردن بەخاوەن عەقڵان پاشان شوێن كەوتنیان.

٢-پێغەمبەری خوا ﷺ لەهەر كاروبارێكی گرنگ دا كە وەحی و پەیامی خوای بۆ نەهاتبێ پرس و ڕاوێژی بە هاوەڵە بەڕێزەكانی خوا لێیان ڕازیبێ كردوەو پاشان بەپێی

---

[٤٣٩] چونكە خوای زاناو دادگەر فەرمانی پێكردوە كەڕاوێژ بەهاوەڵانی بكات: (.. وشاوِرْهُمْ في الأمْر..) آل عمران:١٥٩، جا بێگومان وەك زانایانی (اصول الفقه) گوتوویانە: فەرمان (أمْر) بۆ پێویست بوون (وجوب)ە مەگەر بەڵگەیەك هەبێ لەسەر مەبەست نەبوونی پێویست بوون.

[٤٤٠] بڕوانە: (تفسير ابن كثير) ج١ص، تفسير آية: ١٥٩ من (آل عمران).

ئەنجامی پرس و ڕاوەرگرتن و ڕاوێژەکەش ڕەفتاری کردوەو گەلێك جار لەبیروڕای شەخسی خۆیشی هاتۆتە خوارو چۆتە سەر ڕای زۆربە، کە دەشڵێم گەلێك جار مەبەستم ئەوە نیە کە جاری واش هەبووبێ گوێی بەڕای زۆربە نەدابێ، بەڵکو تەنانەت یەك جاریش نەبووە کە پابەند نەبووبێ بەڕای زۆربەوە، بەڵام مەبەستمان لەگەلێك جار ئەوەیە کەهەندێك جار ڕاوێژکرنەکە دەربارەی مەسەلەیەك بووە کەپێویستی بەڕاو بۆچوونی خەڵکی پسپۆڕ (اهل الأختصاص) هەبووە، نەك تێکڕای خەڵکەکە تاکو سەرەنجام زۆریی و کەمیی لایەنگرانی ڕایەکان دەوری هەبێ!

ئەو ڕووداوو مەسەلانەش کە پێغەمبەر ﷺ ڕاوێـژی تێـدا کـردوون و پابـەندیش بـووە بەئەنجامی ڕاوێژکردنەکەیەوە زۆر زۆرن، بۆ وێنە:[441]

*ڕاوێژکردنی لەجەنگی بەدردا بۆ ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ سوپای هاوبەش بۆ خوا دانەرانی قورەیش وە بڕیاردانی بەرەنگاربوونەوە پاش ڕا لێبوون و پەسەندکردنی لەلایەن کۆچکەران (مُهاجِرین) و پشتیوانان (أنْصار)ەوە.

*ڕاوێژکردنی بە (الحباب بن المنذر) و جێبەجێکردنی نەخشەو ڕایەکەی وی.

*ڕاوێژکردنـی بـۆ لەشـارچوونەدەر یـان نەچوونـەدەر لەجـەنگی ئوحـود داو پاشـان پابەندبوون بەڕای زۆربەوەو دابەزین لە ڕاو بۆچوونی خۆی.

*ڕاوێژکردنی دەربارەی ڕێك کـەوتن لەسـەر سێیەکی بـەروبومیوەی مەدینـە لەجـەنگی ئەحزاب داو پاشان واز لـێهێنانی ئـەو ڕایـە لەبـەر ڕا لـێنەبوونی: (سـعد بـن عبـادة) و (سعد بن معاذ).

*ڕاوێژکردنی لەسوڵحی حودەیبییەدا کە هەڵکوتێتە سەر ماڵ و خێزانی کافرەکـان و پاشان وازلـێهێنانی ئەو ڕایە لەسەر قسەی (أبوبکر) خوا لێی ڕازی بێ.

## سێ: بەڵگەکانی ئەوانە کە باج وەرگرتن بەڕەوا نازانن و بەرپەرچدانەوەیان

هەرچەندە پاش برگەی یەکەم و دووەم ڕەنگە پێویست نەکات هیچ قسەی دیکە لەسەر باج وەرگرتـن بکـرێ بـۆ ئیسـپاتی ڕەوایـی و دروسـت بوونـی، بـەڵام بـۆ زێـدە دڵنیـایی و بەرچاوڕوونی، ئەوە لـەم برگەی سێیەمەش دا سـەرنجێکی قسەو بیروڕای ئەو کەسانە دەدەین کەپێیان وایە باج وەرگرتـن دروسـت نیـەو بەرپـەرچی ئەو شتانەش دەدەینەوە کە لەوبارەوە بە بەڵگەیان دێننەوە، کە سـەرجەم قسـەو بەڵگەکانیان لـەم سـێیانەدا خۆیـان دەنوێنن:

---

[441] سەرچاوەی پێشوو، ج١ص٤٢٠.

ا- بێجگە لەزەكات هیچ هەقێكی دیكە لەسەر ماڵو سامان نیە (لاحَقَّ في المالِ سِوى الزّكاة): ئەمە قسەو بیروڕایەكی باوی نێو هەندێك لەشەرعزانان (فقهاء) ەو ئەگەر ئەم قسەیەش ئیسپات بێ باج وەرگرتن لەبناغەوە هەڵدەوەشێتەوە.

ب-ڕێزگرتن لەخاوەنداریێتی كەسی (إحترام الملكية الشَّخْصيَّة): شتێكی ئاشكراو ڕوونە كە ئیسلام بەڕاشكاوی دانی بەوەدا هێناوە كە هەموو كەسێك خاوەنی شتی خۆی بێت، وە هەروەك چۆن كوشتنی هەر ئینسانێك و خوێن ڕشتنی قەدەغەیە، ماڵو سامان لێ‌فەوتاندنو لێ‌ئەستاندنیشی بەهەمان شێوە حەرامەو پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو كەسەی بەشەهید داناوە كە لەسەر بەرگری لێ‌كردنی ماڵو سامانی دەكوژرێ: (مَنْ قُتِلَ دون مالِه فَهوَ شَهيدٌ) رواه البخاري ومسلم وأصحاب السنن.

ج- هاتنی چەندان فەرمووده لەبارەی زەم كردنی وەرگرتنی باجو گومرگەوە: كە ئەمانەن:

* (إنَّ صاحِبَ المَكْسِ في النّار) رواه احمد والطبراني عن رويفع بن ثابت رضي الله عنه.

* (لايَدْخُلُ الجنة صاحِبُ مَكْسٍ) رواه ابوداود وابن خزيمة في صحيحه والحاكم وصححه عن عقبة بن عامر رضي الله عنه.

*بەسەرهاتی ئەو ژنەی كە بە (الغامديّة) ناسراوە كە زینای كردوەو پاشان دانی پێداهێناوە دوایی پێغەمبەر ﷺ پاش ئەوەی منداڵەكەی بووەو لەشیری بڕیوەتەوە، فەرمانی كردوە كە بەردباران (رَجْم) بكرێ، ئنجا لەبارەیەوە فەرموویەتی: (لَقَدْ تابَتْ توبةً لَوْ تابَها صاحِبُ مَكْسٍ لَغَفَرَ لَهُ) رواه مسلم، واتە: ئەو ژنە بەجۆرێك گەڕاوەتەوە لای خوا كە ئەگەر خاوەن (مَكس)[442] ێكیش ئاوا گەڕابایەوە لێی‌دەبووردرا.

*( اِنَّ الله يَدْنُو مِنْ خَلْقِهِ فَيَغْفِرُ لِمَنْ يَسْتَغْفِرُ إلاّ لِبَغِيٍّ بِفَرْجِها أو عَشّارٍ) رواه احمد والطبراني في الكبير والأوسط عن عثمان بن أبي العاص رضي الله عنه.

واتە: خوا لەبەندەكانی نیزیك دەبێتەوەو هەر كەسێك داوای لێبوردنی لێ‌بكات لێی دەبوورێ مەگەر ئافرەتێك كە بەداوێنی زینا بكات، یان باجو گومرگ وەرگرێك[443].

* (يا مَعْشَرَ العَرَبِ إحْمَدوا الله الذي رَفَعَ عنكم العُشورْ) رواه احمد وابوعلي والبزار عن سعيد بن زيد رضي الله عنه.

واتە: ئەی گەلی عارەب ستایشی ئەو خوایە بكەن كە دەییەكی لەسەر هەڵگرتن.

* (إنَّما العُشورُ على اليهود والنَّصارى ولَيْسَ على المسلمين عُشورْ) رواه احمد وابوداود، واتە: بێگومان دەییەك لەسەر جوولەكەو نەصرانی‌یەكانەو مسوڵمانان دەییەكیان لەسەر نیە.

[442] دوایی پێناسەی (مَكْس) دەكەین.

[443] دوایی چاكتر مانای (عَشّار) ڕوون دەكەینەوە.

*ئێستاش با دەست بکەین بەهەڵسەنگاندنی هەرکام لەو سێ بەڵگەیەو لەمەحەکیان بدەین داخوا چۆن و چەند دەردەچن!*

أ- جارێ بۆ یەکەمیان مادام لەخاڵی دووەمی (ماڵ بەخشینی فەرز) بەندی یەکەم دا ڕوونمان کردۆتەوەو سەلماندووشمانە کە ماڵ بەخشینی فەرز بەس لەزەکات دا کورت هەڵنەهاتوەو هەقی نێوماڵ و سامان تەنیا زەکات نیە. خوێنەری بەڕێز حەواڵەی ئەوێ دەکەین و لێرەدا دووبارەی ناکەینەوە.

ب- دەربارەی بەڵگەی دووەمیشیان هەر بەکورتی دەڵێین:

بەڵێ بێگومان لەکۆمەڵگای مسوڵمان و لەژێر سایەو سێبەری دەوڵەتی ئیسلامیدا تێکڕای هاوڵاتیان بەمسوڵمان و نامسوڵمانەوە پێویستە ماڵ و سامانیشیان وەک خوێن و ئابروو کەرامەتیان پارێزراو بێت و بەبێ بەڵگەو هەقی شەرعی هیچ کەس دەستیان بۆ نەبات، بەڵام بێگومانیش ڕێز لێ گرتنی موڵک و ماڵی تاکەکانی کۆمەڵگاش لەگەڵ هەبوونی هەق و مافی گشتی کۆمەڵگاو دەوڵەت لەو موڵک و ماڵ و سامانەدا دژ نین و تێک ناگیرێن، چونکە بێگومان هیچ تاک (فَرْد)ێک بەبێ هاوکاری و دەستیار بۆ گرتنی ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆی کۆمەڵگاو دەوڵەت کاروکاسبی بۆ ناکرێ و هیچی بۆ بەهیچ ناکرێ!

بۆیە دادگەری ئەوەیە عەقڵ و فیطرەت داخواز دەکەن - وێڕای بەڵگە شەرعیەکان - کە هەروەک چۆن کۆمەڵگاو دەوڵەت دەست و دەوریان لە پەیداکردنی ئەو ماڵ و سامانەدا هەبووە، پشک و بەشیشیان لەصەرف کردنیدا هەبێ.

کەواتە:

یەکەم: هەرکاتێک لەنێو کۆمەڵگای ئیسلامیدا کەسانێک هەبوون کە بەهۆی زەکاتەوە پێداویستیەکانیان دابین نەدەکران و زەکات بەشی ئەوەی نەدەکرد.

دووەم: وەهەر کاتێک دەوڵەت و قەوارەی ئیسلامی بۆ هێنانەدی بەرژەوەندیەکی ئابووری یان عەسکەری یان زانستی یان کۆمەڵایەتی پەکی لەسەر ماڵ و سامان کەوت.

سێیەم: وەهەرکاتێک ڕاگەیاندن و گەیاندنی پەیام و بەرنامەی خوا بەهەر جێیەک لەگۆشەو کەنارەکانی دنیا، یان لابردن و ڕیشەکێش کردنی هەر خراپەو ناشەرعیەک و چەسپاندنی هەر چاکەو پێویستیەکی شەرعی پەکی لەسەر ماڵ و سامان کەوت، ئەوە لەهەموو ئەم حاڵانەدا مادام خەزێنە (بيت المال) تێیدا نەبوو یان توانای نەبوو، نەک هەر دروستە ماڵ و سامان لەخەڵکی بەگشتی و سامانداران بەتایبەت وەربگیرێ، بگرە فەرزیشە، چونکە هەموو ئەو شتانە جێبەجێکرانیان فەرزەو بێگومان هەرشتێکیش فەرزێک پەکی لەسەری بکەوێ ئەویش فەرزو پێویست دەبێ وەک چەندان جار ڕوونمان کردۆتەوەو باسمان کردوە.

ج- وە دەربارەی سێیەمیشیان دەڵێین:

یەکەم: زۆربەی ئەو دەقانەی کە لەو بارەوە گێڕراونەوەو پاڵدراونە لای پێغەمبەر ﷺ یان ڕاستیی (صحة)یان سەلمێنراو نیە قسە لەسەر (سند)ەکانیان هەیە،[444] یان ئەگەر هەیانبێ ڕاستیش بێت - وەك فەرموودەکەی (مسلم) - ئەوە دەق (نص) نیە لەسەر حەرام بوونی باج و گومرگ، چونکە باسی (مَكْس) و (عُشُور) دەکەن و ئەمانیش، وەك تۆزێکی دیکە دەیخەینەڕوو نە لەڕووی زمانەوانی و نە لەڕوانگەی شەرعەوە چەمك و واتایەکی تایبەت و دیاریکراویان نیەو بۆ چەند ماناو مەبەستێك بەکارهاتوون.

دووەم: وشەی مەکس (المَكْس) کە وەك پسپۆڕانی زمان گوتوویانە[445]: لەئەسڵی زمان دا بەمانای کەم وکوڕی (النَّقْص) و کەم کردنەوەی نرخی شت لەکڕین فرۆشتن دا( إنتِقاصُ الثَّمَن فِي البَياعَة) دێت، لەزاراوو بەکارهێنانی شەرع و شەرعزانانیش (فقهاء)دا دوو چەمك و واتای هەن:[446]

١-ئەو باج و گومرگانەی کە لەسەردەمی هاتن و سەرهەڵدانی ئیسلام دا لەدنیادا باوبوون و پادشاو دەستەڵاتدارە ستەمکارەکان بەناهەق لەخەڵکیان دەستاندن و لەژێر باری گرانی باج و سەرانەو سۆغرەو بێگاردا پشتیان پێدەچەماندن، هیچی لەپێناوی قازانج و خێرو بەرژەوەندی خەڵك و کۆمەڵگادا بەکارنەدەهێنراو، تەنیاو تەنیا لە ڕێی تێرکردنی هەواو ئارەزووەکانی ئەو پادشاو دەستەڵاتدارانەو دەست و پێوەندەکانیاندا خەرج دەکراو لەهەشتی مشتی بەخەڵك و میللەت نەدەگەیشت!!

٢- واتایەکی دیکەی وشەی ناوبراو لەزاراوی شەرع دا: بە ڕەفتاری ئەو کاربەدەست زەکات وەرگرانە دەگوترێ کە لەکاتی وەرگرتنی زەکات دا ستەم لەخاوەن سامانەکان دەکەن و زیاد لەوەی کە لەسەریانە لێیان وەردەگرن، یان لەوەی کە بەناوی زەکات و بۆ هەژاران و نەداران و زەکات پێشیاوانی دیکە کۆی دەکەنەوە دزی و خیانەت دەکەن.

کەواتە: وشەی (مکس) کە کۆیەکەی (مکوس) و ئەوەی کە دەیکات (ماکس) ی پێدەگوترێ و کۆیەکەی (مُكَّاس)ە، لەئەسڵی زمان دا بەمانای کەم وکووڕی و کەم کردن و

---

[444] بۆ چۆنیەتی ئەو ئیشکال و تێبینییانەی کە لەسەر ئەو دەقانە هەن، بڕوانە کتێبی: (فقه الزكاة) ج٢ص١٩٠تا١٠٩٢، کە دەقی فەرموودەکانی لە (متن) دا هێناوەو لەپەراوێزیش دا لەبەر تیشکی سەرچاوەکانی سوننەت و قسەی پسپۆڕان دا هەڵیسەنگاندوون و لەمەحەکی داون و دەریخستوە کە کەم وایە لەڕەخنەو تێبینی سەلامەت دەربچن.

[445] بڕوانە: (لسان العرب) مادة: م ك س، وە بڕوانە: (المعجم الوسيط) ص٨٨١.

[446] بڕوانە: (فقه الزكاة) ج٢ص١٠٩٤، ١٠٩٥.

لێداشکاندن (النَّقْصُ والأنتقاص) دێتو، لەزاراوی شەرعزانانیش دا بریتیە لە لێکەم کردنەوەی ماڵو سامانی خەڵکیو وەرگرتنی ئەندازەیەك لێیان بەناهەقو لە ڕووی ستەمو زۆرەوە جا چ هەر لەئەسڵ دا ناشەرعیو ناڕەوا بێت، وە چ لەئەسڵ دا شەرعیو ڕەوا بێت – وەك زەکات – بەڵام لەئەندازەی شەرعیو هەق زیاتر وەربگیرێ یان دزیو خیانەتی تێدا بکرێ.

*سێیەم:* وشەی (عُشْر) یش کە لەئەسڵی زمان دا بەمانای دەیییەك (۱/۱۰) دێ،[٤٤٧] لەزاراوی شەرعزانان دا بریتیە لەوەرگرتنی دەیییەك لەبازرگانانی ئەهلی کوفر کە لەگەڵ مسوڵمانان دا لەحاڵەتی جەنگ دان، هەروەها ناویشە بۆ ئەو دەیییەکەی کە وەك (خراج)، لەو زەویو زارانە وەردەگیرێ کە سوپای ئیسلام بەزەبری هێزو چەك ئازادی کردوونو هەر بەدەست خەڵكو خاوەنەکانیانەوە هێڵراونەوە[٤٤٨].

دیارە ئەو دەقانەنش کەتێیان دا باسی لابردنی (عشور) کراوە، یان زەمی (عاشِرْ) کە (عُشْر) وەرگرەو کۆیەکەی (عُشّار)ە – کراوە لەگەڵ ئەو چەمك واتایەدا کە گوتمان پڕ بەپێستو گونجاوو تەبان، جا بۆئەوەی لەوبارەوە بەرچاومان ڕوونتر بێت با ئەم چەند قسەیەی زانایەکی ناودارو پسپۆڕی بواری ئابووری لەزانایانی پێشین (سلف) بخوازینەوە، پاش ئەوەی ئەو فەرموودەو دەقانەی هێناومانەوە کە لەبارەی (عشور) ەوە هاتوون گوتوویەتی:[٤٤٩]

(وجوه هذه الأحاديث التي ذَكَرْنا فيها العاشِرَ وكَراهة المَكْسِ والتغليظ فيه: أنه قد كـان لَـهُ أصْـلٌ في الجاهلية. يَفْعَلُهُ ملوك العرب والعَجَم جَميعاً، فكانت سُنَّتُهُمْ أن يأخُذُوا من التُجار عُشْـر أموالِـهِمْ إذا مَرُّوا بها عَلَيْهِمْ.. يُبَيِّنُ ذلك ماذكرناهُ من كُتُب النَبِيِّ ﷺ لمن كَتَـبَ مِـنْ أَهْـلِ الأَمْصـار: (أنَّـهُمْ لايُحْشَرون ولايُعْشَّرون) فَعَلِمنا بهذا: أنه قد كان مِنْ سُنَّةِ الجاهلية، مع أحاديث فيه كثيرة، فـأبطل الله ذلك بِرسولِهِ وبالأسْلام، وجاءَتْ فريضةُ الزكاة بِرُبْعِ العُشْرِ، مِنْ كل مِأتَي درهمٍ خَمْسَـةً، فَمَـنْ أخذهـا منهم على فَرْضِها فَلَيْسَ بعاشِرٍ لأنَّه لَمْ يَأْخذِ العُشْرَ، إنما أخَذَ رُبْعَهُ.. وهو مُفَسَّرٌ في الحديث... (لَيْـسَ على المسلمين عُشورٌ إنما العُشورُ على اليَهودِ والنَّصارىٰ) وكذلك الحديث الـذي ذكرنـاه مَرْفوعـاً، حين ذكر العاشِرَ، فقال: (الذي يأخذ الصدقة بِغَيْرِ حَقِّها) وكذلك وَجْهُ حديث ابـن عمـر، حين سُـئِلَ: (هَـلْ عَلِمْتَ عُمَرُ أخذ العُشرَ من المسلمين؟! قال: لا لَمْ أعْلَمْهُ).. وكذلك حديث زياد بـن حُدَيْر، حين قـال: ((ماكُنا نُعَشِّرُ مُسْلِماً ولامُعاهِداً)) إنما أرادَ: أنا كنا نأخذ من المسلمين رُبْعَ العُشْرِ ومن أهـلِ الذمَّـةِ نِصْفَ العُشْرِ.)

---

[٤٤٧] بڕوانە: (المعجم الوسيط) ص٦٠٢.

[٤٤٨] بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو هەمان لاپەڕە، وە : (فقه الزكاة) ج٢ص١٩٠٧، ١٩٠٨.

[٤٤٩] بڕوانە: (الأَمْوال) لأبي عبيد، ص ٧٠٧، ٧٠٨، وە: (فقه الزكاة) ج٢ص١٩٠٦، ١٩٠٧.

واته: وه ماناو مەبەستی ئەم فەرموودانەی کە تێیان باسی دەییەك وەرگرو ناپەسەندی (مَكْس) و هەڕەشە لێکردنی کراوە: ئەوەیە کە لەسەردەمی نەفامیتیدا ڕیشەیەکی هەبووەو سەرجەم پادشایەکانی عارەبو عەجەم کردوویانەو، ڕەفتاریان وا بووە کە دەییەکیان لەو بازرگانانە وەرگرتوە کە ماڵو سامانەکانیانیان بەلایان دا تێدەپەڕاند.. ئەو نامانەی کە باسمان کردن کە پێغەمبەر ﷺ بۆ خەڵکی شارەکانی نووسیون کەتێیان دا نووسراوە: (نابێ خڕ بکرێنەوەو نابێ دەییەکیان لێ بستێنرێ) ئەوەی گوتمان ڕوون دەکەنەوە.

جا لەمەوە دەزانین کە ئەو دەییەك وەرگرتنە عادەتی سەردەمی نەفامێتی بووە، وە لەو بارەوە فەرموودەی زۆرو زەوەند هەن، جا خوا بەهۆی پێغەمبەرەکەی‌و بەهۆی ئیسلامەوە ئەو نەریتەی هەڵوەشاندۆتەوە، وە فەرزی زەکات چل یەك (٤٠/١)ی ماڵو سامانی دیاری کردوە، لەهەر دووسەد درەم پێنج درەم، جا کەسێك ئەو ئەندازەیەیان بەپێی ئەو فەرزەو بەو ناوەوە لێ‌وەربگرێ ئەوە بە (عاشِرٌ) دانانرێ، چونکە دەییەکی وەرنەگرتوە بەڵکو چواریەکی دەییەکی وەرگرتوە.. ئەویش لەو فەرموودەیەدا ڕوون کراوەتەوە - کە دەفەرموێ:- (دەییەك لەسەر مسوڵمانان نیە بەڵکو لەسەر جوو و دیانەکانە) هەروەها ئەو فەرموودەیەی کە بە بەرزکراوەیی - بۆ لای پێغەمبەر ﷺ هێناومانەوە کە باسی (عاشر) ی کردوەو فەرموویەتی: (ئەو کەسەیە کە بەناهەق زەکات وەردەگرێ)، دیسان واتای قسەکەی (ابن عمر) کە لێی پرسراوە: (ئایا زانیوتە کە عومەر دەییەکی لە مسوڵمانان وەرگرتبێ؟! گوتی: نەء، نەمزانیوە)، هەروەها قسەکەی (زیاد بن حُدَيْر) کە گوتوویەتی: (ئێمە لەهیچ مسوڵمانێك‌و لەهیچ هاوپەیمانێك دەییەکمان نەدەستاند)، ئەوە مەبەستی ئەوە بووە: کە ئێمە چل یەك (٤٠/١) مان لەمسوڵمانان وەردەگرت‌و بیست یەك (٢٠/١) لە (أهل الكتاب) ی هاوپەیمان.

کەواتە: مەبەست لەجوو و دیانەکان (اليهود والنَّصارىٰ) کە لەفەرموودەکەدا هاتوون گشتی، نیە بەڵکو تایبەتی‌ی (خاص)یەو مەبەست پێی ئەوانەیانن کە لەگەڵ ئەهلی ئیسلام دا لەحاڵەتی جەنگ دا بوون‌و (اهل الحرب) بوو ون، وەك ئەم دەقە دەیگەیەنێ کە (ابوعبید) هێناویەتی: *(رویٰ أبو عبدالرحمن من مَعْقِل قال: سألْتُ زياد بن حُدَيْر: مَنْ كُنْتُمْ تُعَشِّرون؟ قال: ماكُنّاَ نُعَشِّرُ مُسْلماً ولامُعاهِداً، قُلْتُ فَمَن كنتُم تُعَشِرون؟ قال: تُجّارَ الحَرْبِ كما كانُوا يُعَشِرونَنا إذا أتَيْناهُمْ.)[٤٥٠]

---

[٤٥٠] بڕوانە: (الأموال) ص٧٠٧، ٧٠٨، وە (فقه الزكاة) ج٢ص١٠٩٧.

شایانی باسیشه كه هەندێكی دیكه لەزانایان ڕایان وایه كه مەبەست لەوشەی (عُشُور) لەو دەقانەی سوننەت دا – كه مشتومڕو ئیشكالی زۆریش لەسەر (سَنَد)ەكانیان هەیه[451] –، سەرانه (جزية) یه، هەربۆیەش له هەندێك لەڕیوایەتەكانیدا لەلای (أبوداود) ئاوا هاتووه: (لَيس على المسلمين خَراجٌ)، چونكه سەرانه (جزية) پێی دەگوترا، (خَراجُ الرؤوس)[452].

ترمذي لەكتێبی (سنن) ی خۆیدا لەوبارەوه گوتوویەتی:[453] (وقَوْلُ النبي ﷺ (ليس علىٰ المسلمين عشورٌ) إنما يَعْنِي به جِزْيةَ الرَّقَبة...) واته: وه فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ (مسوڵمانان (عشور)یان لەسەر نیه) مەبەست پێی سەرانەیه..

*پوختەی قسان:* ئەو دەقانەی كه لەبارەی (مَكْس) و (عُشُور) ەوه هاتوون وێڕای ئەوەی كه بێنەو بەرەی زۆر لەسەر ئەسڵی فەرمووده بوون‌و ڕاست (صحيح) بوونیان هەیه، وەك ڕوونمان كردەوه بەهیچ شێوەیەكیش ناگونجێ بكرێنه بەڵگەی حەڕامێتی باج‌و گومرگ بەموتڵەقی، چونكه هەركام لەو دوو وشەیه بۆ مانایەك زیاتر بەكارهێنراون‌و بەپێی سیاقی فەرموودەكان‌و هەل‌و مەرج‌و بارودۆخی كاتی گوترانیشیان یەكێك لەو چەمك‌و واتایانه زیاتر خۆی فەرز دەكات كه بریتیه له:

یەكەم: بۆ (مُكس) وەرگرتنی ماڵ‌و سامان بەزۆرو ستەم‌و بەناهەق.

دووەم: بۆ ( (عُشور) وەرگرتنی باجی دەیيەك لەڕۆژگاری نەفامێتیدا یان وەرگرتنی دەیيەك یان سەرانه لەجو و دیانەكان.

دەجا بێگومانیش هیچ كام لەزانایان ڕاجیایی (إختلاف)یان نیه لەوەدا كه هیچ كام له (مُكس) و (عشور) بەو چەمك‌و واتایەی گوتمان حەڕام‌و ناڕەوان‌و دروست نیه كه یەكەمیان لەهیچ كەس‌و دووەمیشیان لەمسوڵمانان وەربگیرێن.

بەڵام باج‌و گومرگ‌و (مكس و عشور) زۆر جیاوازان، هەر بۆیەش سەرجەم زانایان‌و شەرعزانان لەسەر حەڕامیی و قەدەغەی (مكوس و عشور) یەكدەنگن، بەڵام بۆ وەرگرتنی باج (ضريبة) كه بێگومان گومرگیش[454] جۆرێكه له جۆرەكانی باج، زۆربەی هەره زۆری زاناو شەرعزانان كه زۆرێك له زانایانی چوار مەزهەبەكانیشیان لەنێودان، بەڕەواو بگره جاری وا هەیه بەفەرزیشی دەزانن، وەك لەبڕگەی چوارەم دا ڕوونی دەكەینەوه.

---

[451] بڕوانه: (فقه الزكاة) ج٢ص١٠٩٢، وه ص١٠٩٦.

[452] هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص١٠٩٨.

[453] بڕوانه: (سنن الترمذي) ج٢ص٣٩٩، كتاب الزكاة، (باب: ما جاء ليس على المسلمين جزية).

[454] بەڵێ وشەی باج (ضريبة) گشتیيه، بەڵام (گومرگ) تایبەته بەباجی ماڵی بازرگانیيەوه بەتایبەت لەكاتی هێنان‌و بردن‌و لەڕێگاو بان دا.

چوارەم: بیروڕای زاناو شەرعزانان لەبارەی ڕەوایی وەرگرتنی باج و گومرگەوە:

هەرچەندە هەر مەسەلەیەك بە بەڵگە شەرعی و عەقڵی یەکان یان بەیەکێکیان ئیسپات بوو، پەکی لەسەر ئەوە نەکەتوە کە زاناو پێشەوایانی پێشوو قسەیان لەبارەوە کردبێ، چونکە بێگومان ئەوان بەگوێرەی پێداویستی یەکانی ڕۆژگاری خۆیان قسەیان کردوەو هەوڵی هەڵهێنجانی حوکم و یاسا شەرعی یەکانیان داوە لەقورئان و سوننەت دا ! پاشان شتێکی ئاشکراشە کەقورئان و سوننەت بۆ تێکڕای مرۆڤایەتی هاتوون بەدرێژایی زەمان و بەپانایی زەمین، وە تێگەیشتنیشیان لەسەر هیچ وەچە (جیل) و توێـژ (شـريحة) یێکی ئۆممەتی ئیسلام تاپۆ نەکراوە.

ئەو قسەیەش کە دەڵێ پێویستە لەبەر ڕۆشنایی تێگەیشتنی پێشینی چاکمان دا لەئیسلام حاڵی بین: (يجب فهمُ الأسلام على ضـوْ منـهم سلفنا الصـالح) ئەگـەر هـەروا بەموتڵەقی بگوترێ، جێگای چەند تێبینی یەکی گەورەیە، چونکە ئەوجۆرە بیرکردنەوەیە دەبێتە مایەی تەسك و گچکە کردنەوەی ئیسلام و سنووردار (محدود) کردنی قورئان و سوننەتی فراوان و موتڵەق و، قاڵب بەستووکردنیان بەقاڵبی بیروهۆش و دیدی کۆمەڵە مسوڵمانێك کە هەرچەندە پێشەوای بەرزو بلیمەت بن، سەرەنجام هەر ئینسانن و ناتوانن هەموو ڕاستی یەکان (حقائق)ی قورئان و سوننەت لەخۆیان دا جێ بکەنەوەو بحەجمێنن!!

ئێستاش دوای خستنەڕووی ئەو ڕاستی یە گەورەو گرنگەی کە هەرچەندە لەهەندێك بیرو هۆشان دا جێی نابێتەوە، بەڵام تەرازووی پارێزران لەگەڵێك بیروبۆچوونی هەڵەو کوشندەیە، باسەرنجێکی قسەو بیروڕای هەندێك لەزانایانی پێشینمان بدەین لەبارەی باج وەرگرتنەوە.[455]

۱-لەفیقهی حەنەفی یەکان دا:

لەکتێبی: (رَدُّ المُحْتار على الدرِّ المُخْتار، شَرْح تَنْوِير الأَبصار)دا هاتوە:[456]

(قوله: (وتَصِحُّ الكَفالَة بِها) أي بالنّائِبَةِ سواء كانت بِحَقٍّ كَكَرْي النَّهر المُشْتَرَكِ للعامَّةِ وأُجْرَةِ الحارِسِ لِلمَحلّةِ المُسَمَّى بِديارِ مِصْرَ الخَفْير وما وُظّف للأمام لِيُجَهِّزَ بهِ الجُيوشَ، وفداءِ الأُسارىٰ بأَنْ احْتاجَ الىٰ ذلك ولم يكُنْ في بيتِ المالِ شَيءٌ.. او كانَتْ بِغَيْرِ حقٍّ كجِباياتِ زَمانِنا فانَّها في المُطالَبةِ كالدُّيونِ بَلْ فَوْقَها..)

[455] بڕوانە: ج٣ص٢٥٣، چاپی (دار احياء التراث العربي)، کە بە (حاشية ابن عابدين) ناسراوە.

[456] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

واته: ئەو قسەیەی کەدەڵێ: (وە دورستە ببێتە کەفیلی) یانی کەفالەتی باج بکات، جا چ بەشێوەیەکی هەق بێت، وەك: لێدانی جۆگەیەکی گشتی هاوبەش، وەکرێی ئیشکچی گەرەك کە لەوڵاتی میصر (خەفەر)ی پێدەڵێن، وە ئەوەی کەبۆ حوکمڕان تەرخان دەکرێ و لەسەر خەڵکی دادەنرێ بۆئەوەی لەشکرو سوپای پێسازو تەییار بکات، وە بۆ کڕینەوەی دیلان، لەکاتێك دا کە ئەنجام دانی ئەم کارانە پێویست بێت و هیچیش لەخەزێنەدا نەبێت، وە چ بەشێوەیەکی ناهەق بێت وەك باج وەرگرتنەکانی ڕۆژگاری ئێمە، ئەوە ئەوجۆرە ماڵ و سامانە لەداواکردن دا وەك قەرزەکان و بگرە لەپێشتریشن.

(وقال ابو جعفر البلخي: مايَضْرِبُهُ السُلْطانُ علي الرعية مصلحةً لهم يَصيرُ دَيْناً واجباً وحقاً مُسْتحقاً كالخَراجِ... حتى أُجْرَةُ الحَرّاسِينَ لِحِفْظِ الطَّرِيْقِ واللُّصوصِ.. وهذا يُعْرَفُ ولايُعْرَفُ خَوْفَ الفِتْنَةِ..)

واتە: (ابو جعفر البلخي)، گوتوویەتی: ئەوەی کە حوکمڕان لەسەر خەڵکی پێویست دەکات و دەیکاتە باج بۆ بەرژەوەندی خۆیان دەبێتە قەرزێکی پێویست و مافێکی ڕەوا وەك خەراج.. تەنانەت کرێی پاسەوانان بۆ پاراستنی ڕێ و بان لەدزان.. بەڵام ئەم حوکمە تەنیا دەبێ بزانرێ و بڵاونەکرێتەوە لەبەر ئەنجامی خراپەو شووم..[٤٥٧]

### ٢- لەفیقهی مالیکی یەکان دا:

(الشيخ المالقي) لەوبارەوە گوتوویەتی:[٤٥٨] (توظيف الخراج على المسلمين من المصالح المُرْسَلَةِ ولاشكَّ عِنْدَنا في جَوازِهِ. وظُهورُ مصلحتهِ في بلاد الأندلسِ في زماننا لِكَثْرةِ الحاجةِ، لما يأخذهُ العَدوُّ من المسلمين سوىٰ مايَحْتاج اليه الناسُ وضَعْفُ بَيْتِ المالِ عنه، فهذا يَقْطَعُ بِجَوازهِ الآن في الأَنْدَلُسِ، وإنَّما النَّظَرُ في المِقْدارِ المُحْتاجِ اَلَيْهِ من ذلك وذلك مَوْكولُ الىٰ الأمام)

واتە: دانانی باج لەسەر مسوڵمانان لەجۆری بەرژەوەندی یە ڕەهایەکان (المصالح المرسلة) ە و لەلای ئێمە گومان لەڕەوابوونی دا نیە، وە بۆیەش لەم ڕۆژگارەمان دا سوودو کەڵکی لەوڵاتی ئەندەلوس (اسپانیا) دا چاکتر دەرکەوتوە چونکە ئاتاجی زۆرە،

---

[٤٥٧] مەبەستی ئەوەیە کە ئەگەر بڵاوبێتەوە کە ئەو باج وەرگرتنە ڕەوایە، ڕەنگە کاربەدەستەکان باری شانی خەڵکی بەجۆرەکانی باجی بەناهەق قورس بکەن، بۆیە پەسەندوایە بەس زانایان بیزانن!!

[٤٥٨] بڕوانە: (فقه الزكاة) ج٢ص١١٠١، ١١٠٢، کە لە (تهذيب الفروق والقواعد السنية) وەری گرتوەو ئەمیش لەسەر پەراوێزی کتێبی: (الفروق)ی قرافي ج١ص١٤١، چاپ کراوە.

لەسۆنگەی ئەوەوە کە دوژمن بەردەوام لەوڵاتی مسوڵمانان زەوت دەکات، وێڕای ئەوەی کە خەڵکی ئاتاجن‌و خەزێنەش توانای نیە، ئەم هۆیانە ڕەوابوونی (باج) لەئێستای ئەندەلووس دا مسۆگەر دەکەن، ئەوەندە هەیە دەبێ سەرنج بدرێتە ئەندازەی پێویست بوو لەوبارەوەو ئەوەش بۆ حوکمڕان دەگەڕێتەوە.[459] هەروەها (الشاطبي) لەوبارەوە گوتوویەتی:[460]

(إنا إذا قدّرنا إماماً مُطاعاً مُفتقراً الى تكثير الجنود لسَدِّ حاجةِ الثُّغور وحمايةِ المُلْكِ المُتّسعِ الأقْطار وخلا بَيْتُ المال وارْتَفعَتْ حاجَةُ الجُنْدِ الى مالٍ يكفيهم، فللإمام إذا كان عَدْلاً أنْ يوظّفَ على الأغنياءِ مايَراهُ كافياً لَهُمْ في الحالِ، الى أنْ يظهر مالٌ في بَيْتِ المالِ، ثم اليه[461] النّظرُ في تَوْظيفِ ذلك على الغَلّاتِ والثّمار وغَيْرِ ذلك... وانما لم يُنْقَلْ مثْلُ هذا عن الأوّلين لاتّساع بَيْتِ المال في زمانِهِمْ بخلاف زَماننا، فانه لَوْ لَمْ يَفْعَلْ الأمام ذلك بَطلَتْ شَوْكَةُ الأمام، وصارتْ دِيارُنا عُرْضةً لاستيلاءِ الكُفّار، وإنّما نِظامُ ذلك كُلّهِ شَوْكَةُ الأمام، فالذين يَفِرّونَ من الدّواهي لو تَنْقَطِعُ عنهم الشّوْكَةُ، لَحِقَهُمْ مِنَ الأضْرارِ مايَسْتَحْقِرونَ بالاضافة إليْها أمْوالَهُم كُلّها فَضْلاً عن اليَسيرِ مِنْها، فاذا عُورِضَ هذا الضّرَرُ العظيمُ بالضّرَرِ اللّاحِق بهمْ بِأخْذِ البَعْضِ مِنْ أمْوالِهِمْ، فلا يُتَمارى في تَرْجيحِ الثّاني على الأوّل).

واتە: ئێمە ئەگەر گریمان پێشەوایەکی قسە ڕۆیشتوومان هەبێ کەپێویستی بە زۆرکردنی سەربازان هەبێ بۆ پارێزگاری لەسنوورەکانی وڵات‌و پاراستنی دەوڵەتی فراوان، وە خەزێنەش هیچی تێدا نەبێ‌و، سەربازەکانیش زۆر پێویستی‌یان بەماڵ‌و سامان هەبێ، ئەوە ئەگەر بێت‌و حوکمڕان دادگەر بێت بۆی هەیە هێندە باج بخاتە سەر سامانداره‌کان کەبەشی ئێستای سەربازەکان بکات، هەتا سامان لەخەزێنەدا پەیدا دەبێت، پاشان بۆ دانانی ئەندازەی باجەکان لەسەر دانەوێڵەو میوەو غەیری ئەوانیش ئیمام خۆی مافی هەیە... ئنجا بۆیەش ئەوە (واتە باج وەرگرتن)، لەپێشووەکانەوە نەقڵ نەکراوە، چونکە خەزێنە لەڕۆژگاری وان دا زۆری تێدا بووەو فراوان بووە بەپێچەوانەی ڕۆژگاری ئێمەوە، چونکە ئەگەر ئێستا حوکمڕان باج وەرنەگرێ سام‌و دەستەڵاتی نامێنێ، وە

---

[459] بەڵکو پێویستە کۆڕی ڕاوێژ بڕیاری لەسەر بدەن وەك باسمان کردوە.

[460] بڕوانە: (الأعتصام) ج٢ص١٠٤، وە: (فقه الزكاة) ج٢ص١٠٧٦، ١٠٧٧.

[461] وەك پێشتر گوتمان ئەوجۆرە بڕیارانە تەنیا لەتوانای کۆڕی ڕاوێژ (مجلس الشورى) دان، بەلام ئەو زانا بەڕێزانەمان زیاتر واقیعی خۆیانیان لەبەرچاو گرتوە.

ولأتمـان دەكەوێتـە ژێــر ڕكێفــی كافرانــەوە، چونكــە دەســتەڵاتو هــێزی حوكمــڕان دەستەبەركەری هەموو ئەو شتانەیە، جا ئەو كەسانەی كە لەچنگ باجەكان ڕادەكەن ئەگەر دەستەڵاتو سێبەری حوكمڕانیان بەسەرەوە نەمێنێ، تووشی زیانو مەترسی ئەوتۆ دەبن كە نەك هەندێك بگرە سەرجەم ماڵو سامانی خۆیشیان لەبەرانبەریدا زۆر بەكەم دەزانن، جا ئەگـەر ئـەم زیانـە مــەزنو بێڕەزایــە بــەراورد بكــرێ بــەو زیانــەی كــە بــەهۆی بــاج لێوەرگیرانیانەوە تووشیان دەبێ، گومان نامێنێ لەهەڵبژاردنی دووەم بەسەر یەكەم دا.

## ٣- لەفیقهی شافیعی‌یەكان دا:

(ابو حامد الغزالي) لەكتێبی (المُسْتَصْفَىٰ) دا لەوبارەوە گوتوویەتی:[٤٦٢]

(واذا خَلَتِ الأيدي من الأموالِ ولم يكن من مالِ المصالحِ مايَفي بِخَراجات العَسْكَر، وخِيْفَ مِنْ ذلك دُخولُ العَدوِّ بلادَ الأسلام، او ثُوَرانَ الفِتْنَة مِنْ قِبَلِ أهْلِ الشَرِّ، جازَ للأمام ان يُوَظِّفُ علىٰ الأَغْنياءِ مِقْدارَ كِفايَةِ الجُنْد، لِأنا نَعْلَمُ انه إذا تَعارَض شَرّانِ او ضَرَرانِ، قَصَدُ الشرعِ دفْع أَشَدِّ الضَررَيْنِ وأعْظَمِ الشَرَّيْنِ، وما يُؤَدِّيْه كلُ واحدٍ منهم قليلُ بالأضافة إلىٰ مايُخاطِرُ بهِ مِن نَفْسِهِ ومالِهِ، لَوْ خَلَتْ خِطَّة الأسْلامِ من ذي شَوكَةٍ يَحفَظُ نِظامَ الأُمورِ وَيقْطَعُ مادَّة الشرور)

واتـە: وە ئەگـەر هــاتو مــاڵو سـامان بەدەسـت (دەوڵـەت)ەوە نــەماو، مــاڵو سـامانی تـەرخان كراو بۆ بەرژەوەندی‌یە گشتی‌یەكانیش هێنـدە نـەبوو كەبەشـی مووچـەی سـوپا بكات، وە بەهۆی ئـەوە بیمو ترسی ئەوە هـەبوو كـە دوژمـن بێتـە خـاكی ئیسلامەوە، یـان ئـاژاوەو هـەرا لەلایـەن خراپەكارانـەوە سـەرهەڵبدات، ئـەوە بـۆ حوكمـڕان هەیـە كـەبایی پێداویستی سەربازەكان لەسەر دەوڵەمەندەكان باج دابنێ، چونكە ئێمە دەزانین كە ئەگـەر دوو خراپـە یـان دوو زیـان دژ وەسـتانو تێـك گـیران، شــەرع دەیــەوێ خراپــترینی دوو زیانەكانو گەورەترینی دوو خراپەكان لاببات!

ئنجا ئەوەش كە هەركامێكیان (لەدەوڵەمەندەكان) دەیدات، لەچاو ئەو زیانو خراپەیەی كە لەسەرو ماڵی گیرۆدەی دەبێت لەحاڵێك دا كە ولأتی ئیسلام حوكمڕانێكی تێدا نەمێنێ كە كاروبارەكان ڕێك بخاتو خراپەو خراپەكاری بنبڕ بكات، شتێكی زۆر كەمە.

---

[٤٦٢] بڕوانە: ج١ص٣٠٣، وە: (فقه الزكاة) ج٢ص١٠٧٦.

٤- لەفیقهی حەنبەلی‌یەکان دا:

(ابن تیمیة)ش لەوبارەوە گوتوویەتی:[٤٦٣]

(..فان هذه الكُلَفَ التي أُخِذَتْ منهم بسَبَبِ نفوسِهِمْ وأموالِهِم هي بِمَنْزِلَةِ غَيرِها بالنسبةِ إلَيْهِمْ، وإنما يختلف حالُها بالنسبةِ الى الآخِذِ، فقد يكون آخِذاً بحقٍ وقد يكونُ آخذاً بباطِلٍ...)

واتە: جا ئەو باجانەی کە بەهۆی خۆیانەوە (وەك سەرانە) یان بەهۆی ماڵو سامانەکانیانەوە لێیان وەردەگیرێن ئەوە بۆئەوان وەك هەقە شەرعی‌یەکانی دیکە وایە، بەڵام بۆ وەرگرەکان حوکمەکەی جیاوازە، دەبینی بەهەق وەری‌دەگرێ‌و جاری واش هەیە بەناهەق وەری‌دەگرێ..

پاشان گوتوویەتی:[٤٦٤] (وَحِيْنَئِذٍ فهؤلاءِ المشتَرِكون لَيْسَ لِبَعْضِهِمْ ان يَفْعَلَ مابهِ ظُلْمُ غَيْرِهِ، بَلْ إما ان يؤدي قِسْطَهُ فيكون عادلاً، وإما أن يؤدي زائداً على قِسْطِهِ فيعين شركاءه فيما اخذ منهم فيكون مُحْسِناً..)

واتە: جا لەوحاڵەدا ئەو هاوبەشانە (لەباج دان دا) هەندێکیان بۆیان نیە شتی وا بکەن کە ببێتە مایەی ستەم بۆ ئەوانی دیکە، بەڵکو یان دەبێ بەشی خۆی بدات کە ببێتە دادگەر، یان زیادەش لەبەشی خۆی بدات‌و هاوکاری هاوبەشەکانی بکات لەوەدا کەلێیان وەرگیراوەو ببێتە چاکەکار.[٤٦٥]

## ڕوونکردنەوەیەکی پێویست:

وشەی باج (ضريبة) کە کۆیەکەی (ضرائب) ە وشەیەکی تازەیەو زاناو پێشەوایانی پێشوومان بەکاریان نەهێناوە، بەڵکو لەجیاتی ئەو وشەی: (نائبة) کە کۆیەکەی (نوائب) ەو لەئەسڵ دا بەمانای بەڵاو کارەساتە، پاشان ماڵو سامانێك کە بۆ چارەسەری ئەو بەڵاو گرفتاری‌یانە دادەنرێ بەو ناوەوە ناونراوە،[٤٦٦] وە وشەی: (وظيفة) کە کۆیەکەی (وظائف) ەو لەئەسڵی زمان دا بەئەرك‌و کار دەگوترێ‌و، پاشان بۆ ئەو باج‌و هاوکاری‌یە

---

[٤٦٣] بڕوانە: (مطالب اولي النهى) ج٣ص٥٦٩، ٥٧٠، وە: (فقه الزكاة) ج٢ص١١٠٤،١١٠٥.

[٤٦٤] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[٤٦٥] هەروەها (ابن تيمية) لەچەند شوێنێکی (مجموع الفتاوى)کەی‌دا ئاماژەی بەو مسەلەیە کردوە بڕوانە: (ج٢٨ص١٥٥و١٥٨).

[٤٦٦] بڕوانە: (المعجم الوسيط) ص٩٦١.

داراییانه کراوەته ناو کە لەلایەن دەوڵەتەوە بۆ ساماندارەکان دانراون[٤٦٧]، وە وشـەی: (كُلْفَة) کە کۆیەکەی (كُلَفْ) ە لە ئەسڵدا بەمانای ڕەنج و زەحمەتەو پاشان کراوەتە ناو بۆ ئەو باج و سامانە وەرگیراوانەی کە دەوڵەت پێویستی کردوون،[٤٦٨] بـەکارهێنراون بـەڵام گرنگ نێوەڕۆك و مەبەستەو هەرکام لەو وشانەش (نوائب، وظائف، كلف، ضرائب) یەك نێوەڕۆك و مەبەستیان هەیە، کە بریتیە لە: (دانرانی ئەندازەیەك ماڵ و سامان و پێویست کردنی لەلایەن دەوڵەت و حوکمڕانەوە لەسەر دەوڵەمەندو ساماندارەکان بەتایبەتی و هاووڵاتیان بەگشتی، بۆ پڕکردنەوەی کەلێن و بۆشایی خەزێنەو جێبەجێکردنی چەند پێداویستی و بەرژەوەندییەکی کۆمەڵگاو دەوڵەت).

*لەکۆتاییدا:* ئێستاش لەکۆتایی ئەم بڕە توێژینەوەیەدا کە دەربارەی باج وەرگرتن کردمان، پێم وایە وەڵامی پرسیاری: (ئایا وێڕای زەکات دروستە باجیش دابنرێ؟! زۆر ڕوون و ئاشکرا بووە کە:

بەڵێ دروست و ڕەوایە بەڵام بەوشێوەیەو بەو مەرجانەی کەزانایان خستوویانەتە ڕوو، کەواتە: هەم ئەوانەی کە بەموتڵەقی باج وەرگرتن بەناڕەوا دەزانن و، هەم ئەوانەش کە بەموتڵەقی بەدروست و ڕەوای دەزانن بەهەڵەداچوون و دووچاری تێپەڕاندن و بەزایەدان (إفراط وتفريط) بوون و هەقی و پێکان (إصابة) لەنێوەندی هەردووك لای سەرکردن و کورت هێنان دایە.

ئنجا وەك پێشتر گوتمان گومرگیش جۆرێکە لەجۆرەکانی باج و هەرچی لەبارەی باج وەرگرتنەوە گوتوومانە بێگومان گومرك کردنیش دەگرێتەوە، کەواتە ئەوانەش کە بەموتڵەقی گومرگ وەرگرتن بەڕەوا یان ناڕەوا دەزانن هەمان حوکمی پێشوویان هەیەو ئەوجۆرە قسەکردن و فەتوادانە موتڵەقانە بەڵگەو نیشانەی سەرکێڵی و حاڵی نەبوون و وردنەبوونەوەن، خوا بەلوتفی خۆی لەوجۆرە نەخۆشییانە بمانپارێزێ.



[٤٦٧] هەمان سەرچاوە، ص١٠٤٢.

[٤٦٨] هەمان سەرچاوە، ص٧٩٥.

## ٨- ئایا باج دان دەبێتە جێدار (بدیل)ی زەکات؟!

زاناو شەرعزانانی کۆن و هاوچەرخ لەوبارەوە کە ئایا باجەکان (ضرائب) وەبری زەکات دەکەون یان نا؟ ڕایان جیاوازەو زۆربەی هەرە زۆری نزیک بەیەکدەنگی ڕایان وایە کەباج دان هەرچەندە زۆر بێت وەبری زەکات ناکەوێت، هەندێکیشیان ڕایان وایە کە دەگونجێ باجەکان لەجیاتی زەکات حیساب بکرێن! هەرکام لە (نووي)[٤٦٩] و (ابن تيمية)[٤٧٠] لەزانایانی پێشین و (الشيخ ابوزهرة)[٤٧١] لەزانایانی هاوچەرخ ڕاوبۆچوونی لەوشێوەیان هەیە، بەڵام بێگومان ڕای زۆربەی زانایان ڕاستەو ناگونجێ باجەکان وەبری زەکات بخرێن، چونکە:

زەکات بەزەکاتی شەرعیی دانانرێ هەتا هەرکام لەم سێ مەرجەی تێدا نەیەنە دی:

یەک: نیازو مەبەستی تایبەتی نێو دڵ کە بەندایەتی بۆ خواکردن و لێنزیک بوونەوەو پەرستنیەتی بەهۆی فەرمانبەری بۆ کردنییەوە.

دوو: دانی ئەو ئەندازە تایبەتی و دیاریکراوەی کە شەرع بۆ هەر کام لەجۆرو ڕەگەزەکانی ماڵ و سامان دیاریکردوە، وەک: دەیەک (عُشْر) و بیست یەک (نصف العُشْر) و چل یەک (رُبع العُشْر).

سێ: سپاردن و تەسلیم کردن و گەیاندنی ئەو ئەندازەیە بەیەکێک لەو هەشت کەس و شوێنانەی کەخوای دادگەر دیاری کردوون.

دەجا شتێکی ڕوون و ئاشکراشە کەهیچ کام لەم سێ مەرجە لەباج دان دا نایەنەدی، جارێ بۆ یەکەمیان کەنیەت هێنانە ئەوە ناگونجێ ئەنجام بدرێ چونکە ئەوەی کە خوا وەک یەکێک لەپێنج پایەو درووشمەکانی ئیسلام فەرزی کردوەو بەیەکێک لەدوو خواپەرستییە مەزنەکانی ئیسلامی داناوەو کردوویەتی بەنیشانەو جیاوازیی نێوان مسوڵمان و نامسوڵمان زەکاتە نەک باج، ئنجا ناشکرێ لەکاتی باج دان دا کەئینسانەکان دیاری دەکەن نیەتی زەکاتێک بهێنرێ کە خوا فەرزی کردوە.

دووەمیشیان دیسان نایەتەدی چونکە ئەندازەو شێوەو چۆنیەتی وەرگرتنی باجەکان وەک پێشتر گوتمان لەهی زەکات جیاوازە.

---

[٤٦٩] بڕوانە: (المجموع) ج٥ص٤٥٢، تحقيق الدكتور: محمود مطرجي.

[٤٧٠] بڕوانە: (الفواكه العديدة في المسائل المفيدة) ج١ص١٥٤، احمد بن محمد المنقور، بەڵام لە: (مجموع الفتاوى) ج٢٥ص٥٥دا ، گوتوویەتی: ( ما ياخذه ولاة الامور بغير اسم الزكاة لايعتدبه من الزكاة).

[٤٧١] بڕوانە: (تنظيم الأسلام للمجتمع) ص١٦٥.

سێیەمیشیان بەهەمان شێوەو، ئەگەر گریمان هەندێك لەباجەكانیش بۆ بەشێك لەهەشت كەس و شوێنەكانی زەكات خەرج بكرێن، وەك هەژارو نەدارو پەككەوتەكان، ئەوە لەلایەكەوە بەوشێوەو چۆنیەتی‌یە نیە كەشەرع دیاری‌كردوەو شەرعزانان ڕوونیان كردۆتەوە، وە لەلایەكی دیكەشەوە باقی كەس و شوێنەكانی دیكەی زەكات پێ‌شیاو هەر دەمێنن!

(إبن حجر الهيثمي) كە یەكێكە لەزانایانی شافیعی مەزەب و خاوەنی كتێبی: (تُحْفة المحتاج)ە لەوبارەوە گوتوویەتی:[٤٧٢] (واعلم ان بعض فَسَقَة التُّجار يظن ان ما يُؤْخَذُ من المَكْسِ يُحْسَبُ عنه اذا نوىٰ به الزَّكاة، وهذا ظَنٌّ باطلٌ لامُستَنَدَ لَهُ في مذهب الشافعي، لأن الأمامَ لم يَنْصبِ المَكّاسِيْنَ لِقَبْضِ الزكاةِ مِمَّن تَجِبُ عليه دونَ غَيْرِهِ، وإنما نَصَبَهُمْ لأخذ عُشورِ اي مالٍ وَجَدُوهُ، قَلَّ اوكَثُرَ وجَبَ فيه الزكاة ام لا، وَزَعْمُ أنه إنما أمَر بأخْذِ ذلك لِيَصْرِفَهُ على الجُنْدِ في مصالح المسلمين، لايُفيدُ فيما نَحْنُ فيه، لأنَّا لَوْ سَلَّمْنا ان ذلك سائغٌ بِشَرْطِهِ - وهو ان لايكون في بيت المال شيئٌ وأضْطُرَّ الأمامَ الىٰ الأَخْذِ مِنْ مالِ الأغنياء - لَكانَ أَخْذُهُ غيرَ مُسْقِطٍ للزكاة ايضاً لانه لَمْ يأخُذْهُ بِاسْمِها...)

واتە: وە بزانە كە هەندێك لەبازرگانە لارێ‌یەكان پێی وایە كە ئەوەی بەناوی باجەوە[٤٧٣] لێی وەردەگیرێ ئەگەر نیەتی زەكاتی لێ‌بهێنێ بۆی بەردەكەوێ! بەلام ئەوە بۆچوونێكی پووچەو لەمەزەبی شافیعی‌دا پالپشتی نیە، چونكە حوكمڕان كە باج وەرگرەكان دیاری دەكات، بۆ وەرگرتنی زەكات داینەناون تاكو ئەوەی زەكاتی لێ‌كەتوە، لێی وەربگرن جیا لەخەلكی دیكە! بەلكو بۆئەوە تەرخانی كردوون كەهەر مال و سامانێك لێیان هەلكەوت باجی[٤٧٤] لێ‌بستێنن، جا زۆر بێت یان كەم، وە زەكاتی لێ‌كەوتبێ یان نا، ئنجا ئەو گومانەش كەدەلێ لەسۆنگەی ئەوەوە حوكمڕان فەرمانی بەوەرگرتنی كردوە كە لەبەر بەرژەوەندی مسولمانان بەسەر سەربازەكانی‌دا ببەشێتەوەو بۆیان خەرج بكات، هیچ لەو مەسەلەیەی ئێمە ناگۆڕێ، چونكە ئەگەر بشسەلمێنین كە ئەو باج وەرگرتنە بەمەرجەكانی‌یەوە ڕەوایە - ئەویش ئەوەیە[٤٧٥] كە خەزێنە هیچی تێدا نەبێ و حوكمڕان ناچار بێت لەسامانی دەولەمەندان وەربگرێ - ئەوە دیسان ئەو باج وەرگرتنە زەكات لانابات و وەبری ناكەوێ، چونكە ئەو باجەی بەناوی زەكاتەوە وەرنەگرتوە.

---

[٤٧٢] بڕوانە: (الزواجر عن اقتراف الكبائر) ج١ص١٤٩.

[٤٧٣] لێرەدا ووشەی (مكس) و (عشور) بەمانای باجی ڕەوا بەكارهاتوون، نەك حەرام و ناڕەوا.

[٤٧٤] هەمان سەرچاوەی پێشوو

[٤٧٥] بەلكو جگە لەم مەرجە ئەوەش بەمەرج گیراوە كە لەسەر بنچینەی ڕاوێژ دانرابێ و ئەندازەیەكی ماقووڵ بێ و بەدادگەرانە وەربگیرێ و بەدادگەرانەو لەپێناو بەرژەوەندی گشتی‌دا بەكاربهێنرێ.

هەروەها (ابن عابدين) یش کە یەکێکە لەزانا زەبر دەستەکانی مەزهەبی حەنەفی و خاوەنی کتێبی: (رَدُّ المُحْتار علی الدُّرِّ المُخْتار) کە بە (حاشية ابن عابدين) ناسراوە، هەمان ڕای هێناوەو پەسەندی کردوەو پاڵی داوەتە لای: (الأمام السَّرَخْسي) کە بە (شَمْسُ الأئمة) ناسراوەو گوتوویەتی:[476]

(... فَعُلِمَ أيضاً أنه لايُحْسَبُ من الزكاة عِنْدنا، لأنه لَيْسَ هو العاشِرُ الذي يَنْصِبُهُ الأمامُ على الطريق ليأخذ الصدقات من المارِّين... ولذا قال في (البَزّازية): (إذا نَوىٰ أنْ يكون المَكْسُ زكاةً فالصَّحيحُ انه لايَقَعُ عن الزكاةِ كذا قال الأمام السَّرَخْسي)).

هەروەها (الشيخ عَليش)[477] کە یەکێکە لەموفتییەکانی مەزهەبی مالیکی، هەمان ڕای هەیەو، هەروەها لە: (السيد رشيد رضا)[478] و (الشيخ شلتوت)[479] و (د.يوسف القرضاوي)[480]یش لەزانایانی هاوچەرخمان هەمان ڕایان هەیە، وە پێشم وایە هەرکەسێك قوڵە شارەزاییەکی دەربارەی قورئانو سوننەتو شەرع هەبێ هەمان ڕای دەبێ...

دەربارەی ڕایەکەی (نووي) یش ڕاستەوخۆ لەبارەی زەکاتەوە نیە، بەڵکو لەبارەی خەراج (خراج) ەوەیە کە ئایا باج لەجیاتی دادەنرێ یان نا؟! (ابن تيمية) ش ڕای دیکەی پێچەوانەی ئەوەی گوتیشمان لێیەوە نەقڵ کراوە[481]، هەرچۆنیش بێ ڕای ڕاستو دروستو بێگرێو گۆڵ هەر ڕای جەماوەرو زۆربەی موتڵەقی زانایانەو، ئەوەش کە هەندێك لەزانایانی هاوچەرخ گوتوویانە: کە ئەوەی لێرەدا زیانبار دەبێ تەنیا مسوڵمانانی دیندارو پابەندن بە شەرعەوە، چونکە خەڵکی دیکە زەکات نادات و تەنیا باجەکان دەدات! بەڵام مسوڵمانانی زەکات دەر هەم باجەکانو هەم زەکاتیش دەدەن، هەرچەندە ڕاستو واقیعییە، بەڵام بێگومان نابێتە پاساوو بیانووی ئەنجام نەدانی یەکێك لەپێنج پایەو کۆڵەکە گەورەو گرنگەکانی ئیسلامەتیو درووشمو نیشانەیەکی بەرزو بەرچاوی دینداریو مسوڵمانەتی ئینسانی مسوڵمان.

ئنجا لەڕاستیدا فەتواو مۆڵەت دان بەخەڵکی مسوڵمان کە باجەکان بخەنە بری زەکات سەردەکێشی بۆ نەهێشتن و لابردنی فەرزی زەکاتو مراندنیو دڵنیاشم کەهیچ کەسێکی بڕوادار ڕێ بەخۆی نادات قسەی وابکاتو بڕیاری وا بدات.

[476] بڕوانە: (ج٣) ص٢٢٤، ٢٢٥.

[477] بڕوانە: (فقه الزكاة) ج٢ص١١١٥تا١١١٩.

[478] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[479] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[480] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[481] بڕوانە: (مجموع الفتاوى) ج٢٥ص٥٥، کە تۆزێك لەمەوبەر دەقەکەیمان هێنا.

هەڵبەتە پێویستیشە بەهەموو لایەك لەبیری ئەوەدا بین کە چۆن چۆنی حوکمو سیستەمی ئیسلامی بگێڕینەوە واقیعی ژیانو گوزەرانی کۆمەڵگاکەمان، بۆئەوەی زەکات دان چی دیکە وەك چاکەو خێرو پیاوەتی‌یەك نەبێ کە هەر کەسێك کەیفی لێ‌بوو بیداتو ئەو کەسەش کە عەقڵی نەیبڕی پشت گوێی بخات!! بەڵام باجەکان کە ڕەنگە گەلێك جار ستەمو بێدادیی لەدانانیان دا هەبێ، هیچ کەس بۆی نەبێ سەرپێچی لەدانیان دا بکات! ئاخر چۆن دەبێ جێبەجێ‌کردنی فەرمانی خوا لەنێو میللەتێکی مسوڵمان دا مسوڵمانانی تێدا سەرپشك بکرێن، بەڵام بەجێ‌هێنانی فەرمانی بەندەکانی خوا مسوڵمانانی پێوە پابەند بکرێن؟!! ئایا ئەم جۆرە بیرکردنەوەو ڕەفتارە بیرکردنەوەو ڕەفتارێکی هاوبەش بۆ خوا دانەرانە نیە؟! کە خوای بەرزو مەزن لەبارەیانەوە فەرموویەتی: (...فَقَالُوا هَذَا لِلَّهِ بِزَعْمِهِمْ وَهَذَا لِشُرَكَائِنَا فَمَا كَانَ لِشُرَكَائِهِمْ فَلَا يَصِلُ إِلَى اللَّهِ وَمَا كَانَ لِلَّهِ فَهُوَ يَصِلُ إِلَى شُرَكَائِهِمْ سَاءَ مَا يَحْكُمُونَ) الأنعام: ١٣٦.

واتە: (...هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان - گوتیان: ئەمە بەشی خوایە بەگومانی خۆیان، وە ئەمە بەشی هاوبەشەکانمانە - لەپەرستراني خوادا -، جا ئەوەی بەشی پەرستراوەکانیانە ناگاتە خوا، بەڵام بەشی خوا بۆ پەرستراوەکانیان دەچێ! چ حوکمو بڕیارێکی خراپ دەدەن ! ).

بەڵێ خوێنەری بەڕێز! بەڕاستی بەڕاستی حوکمو بڕیارێکی بێ‌جێو ناماقوولە کە خوای بەرزو مەزنو بێ‌هاوەڵ بهێنرێتە ڕیزی دروستکراوەکانیشیەوە چ جای نزمتریش بکرێتەوە!! وە بەڕاستی ئەوجۆرە دابەش کردنە دابەش کردنێکی ستەمکارانەو نادادگەرانەیە، وەك خوای بێ‌وێنەو دادگەر دەربارەی ئەو موشریکانەی کەخۆیان بەپەیدابوونی کچان زۆر قەڵس دەبوونو بەکوڕ نەبێ ڕازی نەدەبوون، کەچی دەیانگوت: فریشتەکان کچی خوان! فەرموویەتی: (أَفَرَأَيْتُمُ اللاتَ وَالْعُزَّى، وَمَنَاةَ الثَّالِثَةَ الأُخْرَى، أَلَكُمُ الذَّكَرُ وَلَهُ الأُنْثَى، تِلْكَ إِذًا قِسْمَةٌ ضِيزَى) النجم:١٩-٢٢.

جا خوایە بە کەڕەمی خۆت لەوە بمانپارێزی کە لەهیچ شتێك دا وەك موشریکەکان بچین، چ جاری لەتایبەتمەندی ترین خەسڵەتیان دا، وە هیدایەتمان بدەی کە بەهەموو جۆرو شێوەکانی پەرستن جگە لەتۆ هیچ کەسو هیچ شتێك چاو تروکاندنێکیش نەپەرستین.

لێرەش دا کۆتایی بەم بەندی سێیەمە دێنینو دەچینە سەر بەندی چوارەمو کۆتایی. کە بریتیە لە: (بەرهەمو شوێنەوارەکانی ماڵ بەخشین لەژیانو گوزەرانی تاكو کۆمەڵ دا).

# ڕێخۆشکردن

خوێنەری سەنگین! خوای زاناو کاربەجێ هیچ شتێکی لەسەر بەندەکانی پێویست نەکردوە کە خێرو قازانجی دنیاو دواڕۆژ و تاكو کۆمەڵ و گیانو جەستەیانی تێدا نەبێ، وەك چۆن هەر شتێکی لێ قەدەغە کردبێ لەبەر زەرەرو زیانو شوێنەوارە شوومەکانیەتی لە هەموو بوارەکانی ژیانو گوزەرانی تاکیو کۆمەڵایەتی‌یان دا.

جا بێگومان ماڵو سامان بەخشینیش - بەفەڕزو سوننەتی‌یەوە - کە درووشمو نیشانەیەکی هەرە گەورەو گرنگی خواپەرستیو بەندایەتی کردنە بۆ خوا، پڕ پڕە لەحیکمەتو سوود و بەرژەوەندی هەمەجۆر، بۆ تاكو کۆمەڵی مسوڵمان.

جا پشت بەخوا ئێمە لەم بەندی چوارەمەدا لەدوو خاڵان دا سوودو بەرهەمەکانی ماڵ بەخشین دەخەینەڕوو، لەخاڵی یەکەم دا بەرهەمو شوێنەوارە چاكو پەسەندەکانی ماڵو سامان بەخشین لەژیانی تاك دا دەخەینەڕوو، کە ئەمیش کراوەتە دوو بڕگە، لەبڕگەی یەکەم دا سوودو کەڵکەکانی ماڵ بەخشین بۆ بەخشەر (مُنْفِقْ) خراونەڕوو، وە لەبڕگەی دووەمیش دا خێرو بێرەکانی ماڵ بەخشین بۆ وەرگر (آخِذْ) ڕوون کراونەوە.

خاڵی دووەمیش تەرخان کراوە بۆ توێژینەوەو ڕوونکردنەوەی بەرهەمە چاكو پەسەندو شوێنەوارە بەرزو پیرۆزەکانی ماڵ و سامان بەخشین لەژیانو گوزەرانی کۆمەڵو کۆمەڵگای مسوڵمان دا.

پێویستە ئەوەش بگوترێ کە ئەو بەرهەمو سوودو کەڵکانە هەرچەندە هی ماڵو سامان بەخشینن بەگشتی، بەڵام بەزۆری هی ماڵو سامان بەخشینی فەڕزن کە بێگومان زەکات کاكڵو جەوهەرو بڕبڕەی پشتیەتی هەرچەندە وەك لەبەندی یەکەم دا ڕوونمان کردەوەو سەلماندیشمان، ماڵ بەخشینی فەڕز لەزەکات دان دا کورت نەبۆتەوەو لەو فراوانترە.

جا لەسۆنگەی ئەوەوە کە ئەو سوودو بەرهەمانەی کە لەم بەندەدا دەیانخەینەڕوو بەزۆری پەیوەستن بە زەکاتەوە - کە وەك گوتمان بڕبڕەی پشتی ماڵ بەخشینی فەڕزە - بۆیە بەپەسەندو زانی بە لەخستنەڕووی سەرەدم بەرهەمەکانی ماڵ بەخشین لەچەند خاڵێکی کورتو خێرادا ئیمتیازو تایبەتمەندی‌یەکانی زەکات بخەینەڕوو، چونکە زۆر کەسی لەئیسلام ناحاڵیو بەشەرع دا قووڵ نەبووەوە پێی وایە کە زەکات تەنیا خێرو صەدەقەو چاکەیەکی شەخسی‌یەو پەیوەستە بەدەروونو ویژدانی بابای بەخشەرەوەو هیچی‌تر!

# ئیمتیازو تایبه‌تمه‌ندی‌یه‌کانی زه‌کاتی ئیسلامی[482]

ده‌توانین - له‌به‌ر رۆشنایی ئه‌و باسانه‌دا که له‌باره‌ی زه‌کاته‌وه رابردن - تایبه‌تمه‌ندی‌یه‌کانی زه‌کاتی ئیسلامی له‌م چه‌ند خاڵه‌دا کورت‌و پوخت بکه‌ینه‌وه:

١-زه‌کاتی ئیسلامی ته‌نیا خێرکردن‌و کرده‌وه‌یه‌کی چاك‌و ره‌وشتێکی شه‌خسی په‌سه‌ندو جوان نیه که بابای زه‌کات ده‌ر خۆی پێ‌برازێنێته‌وه، به‌ڵکو وه‌ك پێشتر روون کرایه‌وه یه‌کێکه له پایه گرنگه‌کانی ئیسلام‌و دووه‌مین دروشم‌و نیشانه‌ی خواپه‌رستی‌و دینداری‌و مسوڵمانه‌تی‌یه‌و هه‌رکه‌سێك نکوڵی له فه‌رزبونی بکات حوکمی کوفری به‌سه‌ردا ده‌درێ‌و هه‌ر که‌سێکیش لاملی‌و سه‌رپێچی له دانی بکات مۆری (فسق) و تاوانباری به‌نێو چاوانه‌وه ده‌نرێ‌و وێرای ئه‌وه‌ش باسکی باده‌درێ‌و به‌تۆبزی لێ‌ی ده‌ستێنرێ‌و سزاش ده‌درێ.

٢- زه‌کات له روانگه‌ی ئیسلامه‌وه مافی هه‌ژارو نه‌دارانه له ماڵ‌و سامانی ده‌وڵه‌مه‌ندان دا که خاوه‌نی راسته‌قینه‌ی ماڵ‌و سامان دیاری‌کردوه که خوای په‌روه‌ردگاره، وه بابای خاوه‌ن ماڵ‌و سامان زیاتر به‌پاسه‌وان‌و خه‌زێنه‌دار (امین الصندوق) حیساب کراوه بۆیه هیچ جۆره منه‌ت‌و خێر پێ کردنێك له زه‌کات دان دا نیه، ئایا بابای خه‌زێنه‌ردار (خازن) له کاتێکدا به‌رپرسه‌که‌ی فه‌رمانی پێ‌ده‌کات ئه‌ندازه‌یه‌ك ماڵ بدات به که‌سێك هیچ مانایه‌کی خێرپێ‌کردن‌و چاکه‌و پیاوه‌تی له‌و ره‌فتاره‌ی‌دا هه‌یه‌؟! خوای کاربه‌جێ فه‌رموویه‌تی: (آمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَأَنْفِقُوا مِمَّا جَعَلَكُمْ مُسْتَخْلَفِينَ فِيهِ) الحدید:٧، واته: بروا به‌خواو پێغه‌مبه‌ره‌که‌ی بێنن، وه له‌وه‌دا که ئێوه‌ی تێدا گێڕاوه به‌جێنشین ببه‌خشن..

٣-زه‌کات به‌زاراوی قورئان مافێکی دیاری‌کراوو زانراو (حَقٌّ مَعْلُومٌ) ه و شه‌رع هه‌م سنووری زه‌کات لێکه‌وتن (نِصابٌ)ی ماڵ‌و هه‌م ئه‌ندازه‌ی زه‌کاته‌که‌و هه‌م مه‌رجه‌کانی‌و هه‌م شێوه‌ی درانی‌و دابه‌ش کرانی دیاری‌کردوه، بۆئه‌وه‌ی ئینسانی مسوڵمان به‌رچاوی روون بێ له باره‌یه‌وه‌و دووچاری هه‌ڵه‌و په‌ڵه نه‌بێ، خوای کاربه‌جێ فه‌رمویه‌تی:

(والَّذِينَ فِي أَمْوَالِهِمْ حَقٌّ مَعْلُومٌ لِلسَّائِلِ وَالْمَحْرُومِ) ،

واته: وه ئه‌و که‌سانه‌ی که له‌ماڵ‌و سامانه‌کانیان دا مافێکی زانراو هه‌یه، بۆ سواڵکه‌رو بێ‌به‌ش.

---

[482] بۆ نووسینی ئه‌م باسه به‌تۆزێك ده‌ستکاری‌یه‌وه سوودم له (فقه الزکاة) ج١ص٨٦تا ٨٨، وه‌رگرتوه.

٤-ئەو مافە زانـراوو دیـاریکراوەش حەوالـەی دەروون و ویژدانـی دەولەمـەندەکان نەکراوە کە بەخێرا خۆیان بیدەن یان نەیدەن، بەڵکو مافێکی فەرزکراوو داکۆکی لەسەر کراوەو وەرگرتن و دابەش کردنی ئەرکێکەو بە کۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامی سپێرراوە کە بەهۆی کاربەدەستان (العاملین)ەوە وەردەگیرێ و پاشان بەوپێیەی کە شەرع بڕیاری داوە دابەش دەکرێ، هەر بۆیەش لەقورئان دا تەعبیری: (خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ) و لەسوننەتیش دا: (تؤخَذُ مِن أغنيائِهم ) ی بۆ بەکار هێنراوە!!

پێشتریش ڕوونمان کردەوە کە ڕای بەهێزترو بەڵگەدارتر ئەوەیە کە زەکات بەشێوەی مەرکەزی وەربگیرێ و دابەش بکرێ.

٥-هەر بۆیەش ئەرك و مافی دەوڵەتی ئیسلامی یە کە هەر کەسێك زەکات نەدات بەوشێوەیەی کە بەشیاوو پێویستی دەزانێ تەمبێی بکات و سزای بدا، کەجاری وا هەیە ئەندازەی ئەو تەمبێکردن و سزادانە دەگاتە دەست بەسەردا گرتن (مُصَادَرَة) ی نیوەی ماڵەکەی! وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (فَإنَّا آخِذوهَا وشَطْرَ إبلِهِ) رواه احمد وابوداود والنسائي.

٦-بەڵام ئەگەر زەکات نەدەرەکان کۆمەڵێکی خاوەن هێزو دەستەڵات بوون، ئەوە ئەرکی سەرشانی دەوڵەتی ئیسلامی یە کە جەنگیان لەدژ بەرپا بکات و فشاریان بۆ بێنێ و هەتا ملیان پێکەچ دەکات و دێنەوە ژێر ڕکێفی شەرع و مافی هەژارو نەداران دەدەن، وەك لەفەرموودە ڕاست و ڕاشکاو (صحیح وصریح)ەکانی پێغەمبەری خواد ا ﷺ هاتووەو بەهۆی هەڵوێستی (أبوبکر الصدیق)ەوەش یەکدەنگی هاوەڵان (إجماع الصحابة)ی لەسەر دامەزراوە.

٧- لەهەل ومەرجێك دا کە ئیسلام کیان و دەستەڵاتی نامێنێ کەزەکات لەخەڵکی وەربگرێ لەسەر بابای مسوڵمانی دەوڵەمەند پێویستە کە بۆ خۆی زەکاتی ماڵ و سامانەکەی دەربکات و خۆی ماڵەکەشی خاوێن بکاتەوە لەهەق و مافی زەکات وەرگران، چونکە زەکاتیش وەك نوێژ و باقی ئەرك و پایەکانی ئیسلام هەرچۆن بێ تاکی مسوڵمان هەر لەسەری فەرزە جێبەجێی بکات و ئەگەر خەلیفەو سوڵتانیش لێی داوا نەکات ئیمان و قورئان فەرمانی پێدەکەن و نابێ پەکی بخرێ.

٨- بەرهەمی زەکاتو چۆنیەتی دابەش کردنو بەجێگای شایستەی خۆی گەیاندنی بۆ هەواو ئارەزووی حوکمڕانانی[٤٨٣] دنیاییو پیاوانی[٤٨٤] ئاینی بەجێنەهێڵراوەو وێڵ نەکراوە، کە بەکەیفی خۆیانو بۆ بەرژەوەندی خۆیان بەکاری بێنن، بەڵکو خوای کاربەجێو دادگەر خۆی دیاریکردوە کە بەکێو کێ بدرێ، وەك لەئایەتی: (إِنَّمَا الصَّدَقَاتُ لِلْفُقَرَاءِ وَالْمَسَاكِينِ وَالْعَامِلِينَ عَلَيْهَا...) النساء:٦٠، دا دەردەکەوێ، وە سوننەتی بەپێزی پێغەمبەری بەرێز ﷺ جوان جوان ڕوونی کردۆتەوە، کە پوختەکەی ئەوەیە: زەکاتی هەر شوێنێك لە دەوڵەمەندانی ئەو شوێنە وەردەگیرێو بەسەر نەدارو ئاتاجەکانیدا دابەش دەکرێ، (تُؤْخَذُ مِنْ أَغْنِيائِهِمْ فَتُرَدُّ على فُقَرائِهِمْ).

٩- وە بەپێچەوانەی حاڵیبوونی زۆر کەسەوە، زەکات هاوکارییەکی کاتیو دەستبار بۆ گرتنێکی خێراو کەمو کورت نیە، کە بابای زەکات پێدراو بۆ ماوەیەکی کەم چەند ژەمێکی خواردن بدرێتێو پاشان دووبارە لەگەڵ برسیەتیو نەداریو ئاتاجیدا دەستەو یەخە ببێتەوە! بەڵکو وەك پێشتر باسمان کرد بار ڕاست کردنەوەیەکی تەواوو ڕیشەکێشی کردنێکی یەکجارەکی ئاتاجیو نەدارییە، بەجۆرێك کە بابای زەکات وەرگر هێندەی بدرێتێو بەشێوەیەك هاوکاری بکرێ کە جارێکی دیکە پەکی نەکەوێو دەست پان نەکاتەوە بەڵکو لەسەر پێی خۆی بوەستێو -دوای خوا- پشت بەخۆی ببەستێ، وشەی (قِواماً مِنْ عَيشٍ) یش کە لەفەرموودەی پێغەمبەری خوادا ﷺ هاتوە - وەك پێشتر ڕوونمان کردەوە - هەر ئەوە دەگەیەنێ.

١٠-زەکاتی ئیسلامی - وەك لەم بەندەدا ڕوونی دەکەینەوە - کۆمەڵێك ئامانج و مەبەستی گرنگی تاکیو کۆمەڵایەتی لەهەموو بوارەکانی ڕووحیو ئەخلاقیو فەرهەنگیو کۆمەڵایەتیو ئابووریو جیهادیو سیاسیدا دێنێتەدی، کە لەجوغزی تەسکی شەخسیو ئەخلاقی دەچێتە دەرێو دەچێتە نێو بازنەی فراوانی بەرژەوەندییە مەزنەکانی کۆمەڵگاو ئاستی بەرزی حوکمڕانیو هەڵسوڕاندنی کۆمەڵگاوە.

---

[٤٨٣] ئەم دوو زاراوەیە هی ئایینە شێوێنراوو تێکدراوەکانی جوولەکەو دیانایەتی (اليهودية والنصرانية)ن، چونکە لەئیسلامدا دینو دنیا لەیەك جیاو پێکەوە ناتەبا نینو هەموو پیاوانی مسوڵمانیش پیاوی ئایینەکەیانو زانایانیش ڕابەرو سەرمەشقو حوکمڕانیانن.

[٤٨٤] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

## خاڵی یەكەم:[485]

# بەرهەمو شوێنەوارەكانی ماڵ بەخشین لەژیانی تاك دا

خوێنەری بەڕێز! بێگومان ماڵ بەخشین كۆمەڵێك بەرهەمو سوودو كەڵكی هەن لەژیانی تاك دا چ بەخشەر بێ چ وەرگر، بۆیە بەپەسەندم زانی باسی ئەو بەرهەمو شوێنەوارانە بكەم بۆ هەركام لە بەخشەرو وەرگر لەدوو بڕگەی جیاجیادا:

### بڕگەی یەكەم: بەخشەر (المُنْفِق)

#### ١-پاكبونەوە لەڕژدیو چرووكی:

خوای كاربەجێ بۆئەوەی ئینسان بتوانێ سەر زەوی ئاوەدان بكاتەوەو درێژە بەژیان و گوزەرانی خۆی بدات لەسەر چەند خەسڵەتێكی بنچینەیی وەك: خۆ خۆشویستنو خۆشویستنی شت هەبوون (حُبُّ التَمَلّك) و خۆشویستنی مانەوە (حُبُّ البَقاء) سروشتی ئینسانی ڕێكخستوەو سروشتاندوە، جا ئەو خەسڵەتانە ئەگەر بەهۆی ئیمان بەخواو بەڕۆژی دواییەوە نەبێ دەبنە مایەی پەیدابوونی چەند خەسڵەتێكی دیكەی بەدو خراپ كە یەكێكیان ڕژدی (بُخْل) و چرووكی (شُحّ)، یە، كە خوای پەروەردگار لەبارەیەوە فەرموویەتی: (وَالَّذِينَ تَبَوَّءُوا الدَّارَ وَالْإِيمَانَ مِنْ قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِمَّا أُوتُوا وَيُؤْثِرُونَ عَلَى أَنْفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ وَمَنْ يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ) الحشر:٩.

واتە: (...وەهەر كەسێك لەچەنگ چرووكی دەروونی پارێزرابێ ئا ئەوانەن سەرفرازان).

پێغەمبەریشمان ﷺ فەرموویەتی: (أياكُمْ والشُحَّ، فانما هَلَكَ مَنْ كانَ قَبْلَكُمْ بالشُحّ، أمَرَهُمْ بالبُخْلِ فَبَخِلوا، وأمَرهُمْ بالقَطِيْعَةِ فَقَطَعُوا، وأمَرَهُمْ بالفُجورِ فَفَجَرُوا) رواه أبوداود والنسائي، واتە: خۆتان لەچرووكی بپارێزن چونكە ئەوانەی پێش ئێوە بەچرووكیی فەوتان، وای لێكردن كەڕژدی بكەنو ڕژدییان كرد، وە وای لێكردن كە پەیوەندی خزمایەتی بپچڕێننو پچڕاندیان، وە وای لێكردن كە خراپەكاری بكەنو خراپەكارییان كرد.

جا بێگومان بەهۆی ماڵو سامان بەخشینەوە دڵو دەروونی ئینسانی بەخشەر لەچڵكو چەپەری ڕژدیو چرووكی پاك دەبێتەوەو لەگەرماوی سەخاوەتو كەرەم دا جوان جوان دەشۆرێو خاوێن دەبێتەوە.

---

[485] بۆ نوسینی ئەم خاڵە سوودێكی زۆرم لە (فقه الزكاة) ج٢ص٨٥٧تا٨٧٨، وەرگرتوە.

## ٢-قوتاركردنی ئینسانو ڕزگاركردنی لەكۆیلایەتی بۆ ماڵو سامان پەرستی:

خوا بەیەكگرتن (توحید) بریتیە لەساغو یەكلابوونەوە بۆ خوا لەبەندایەتیو پەرستن دا! بەشێوەیەك كەئینسان بێجگە لەخواو بەخششو پاداشتی خوا دڵ بەهیچ شتێكی دیكە نەبەستێو هیچ شتێك نەتوانێ بیخاتە ژێر ڕكێفی خۆیەوەو دڵو دەروونی داگیرو فیكرو هۆشی یەخسیر بكات! جا یەكێك لەو شتانەی كە بەدرێژایی مێژوو لەلایەن خەڵكێكی سەرلێ‌تێكچوو و ڕێ‌لێ‌بزر بووە وە كراون بەبتو صەنەمو وێڕای خوا یان لەجیاتی خوا پەرستراون ماڵ و سامان بووە، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (تَعِسَ عَبْدُ الدِّينار تَعِسَ عَبْدُ الدِّرْهَمِ تَعِسَ عَبْدُ القَطِيفَةِ تَعِسَ وَانْتَكَسَ وإذا شِيكَ فَلا انْتَقَشَ) رواه البخاري،
واتە: بفەوتێ كۆیلەی زێڕ، بفەوتێ كۆیلەی زیو، بفەوتێ كۆیلەی بەرگو پۆشاك، وەسەرەنگرێ بێ، وە هەركات دڕكێكی تێڕاچوو لێی نەیەتەوە دەرێ.

دیارە دەگونجێ مەبەست لە وشەی (تَعِسَ) لێرەدا دووعا نەبێو هەواڵدان بێ كە ئەوكاتە ماناكەی ئاوای لێدێ: كۆیلەی زێڕو زیوو پۆشاك فەوتاوو سەرەنگرێ‌بووە!

ئنجا ئاشكراشە كە باشترین چارەسەر بۆ دەردی پووڵو پارە پەرستیو دڵ پێ‌نەبەستنیو پشت پێ‌نەبەستنی، برتییە لەبەخشینو خەرج كردنی بەشێكی لەڕێی خواو لەپێناوی وەدەست هێنانی ڕەزامەندیو پاداشتو بەخششیدا.

## ٣-ڕاهێنانو بارهێنانی ئینسان لەسەر بەخشین:

بەخشین (عطاء) و سودو كەڵك بەخەڵك گەیاندن یەكێكە لە خەسڵەتە بنچینەیی‌یەكانی ئینسانی مسوڵمان، وەك خوای زاناو پەنهان بین لە چەندان ئایەتی قورئان دا فەرموویەتی: بۆ وێنە: ﴿وَاللَّيْلِ إذَا يَغْشَى(١)وَالنَّهَارِ إذَا تَجَلَّى(٢)وَمَا خَلَقَ الذَّكَرَ وَالْأُنْثَى(٣)إنَّ سَعْيَكُمْ لَشَتَّى(٤)فَأَمَّا مَنْ أعْطَى وَاتَّقَى(٥)وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَى(٦)فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَى(٧)﴾ الليل.

واتە: سوێند بەشەوگار كە دادەپۆشێ، وەسوێند بەڕۆژگار كەڕوون دەبێتەوە، وە سوێند بەو زاتەی كە نێرو مێی خوڵقاندوون. كۆششو ڕەنجتان جۆراوجۆرە، جا كەسێك ببەخشێ و پارێز بكات. وە بڕوا بەچاكترین وشە كە (لا الە الا اللە)یە بهێنێ. ئەوە بەرەو ڕێی ئاسان -ی شەریعەت - وەری‌دەچەرخێنین.

وەك دەبینن خوای كاربەجێ بەخشین (عطاء)ی كردوە بەیەكەمین خەسڵەتی ئینسانی بڕواداری سەرفراز! وە بەپێچەوانەشەوە ڕژدی و نەبەخشینی بەیەكەمین خەسڵەتی پیسو بەدی تاوانبارانی بەدئەنجام داناوە وەك لەئایەتەكانی دواییدا هاتوە.

وەجۆی سەرنج و رامانە کە بەخشین هەم لەسوورەتە مەککی یەکان و هەم لەسوورەتە مەدینەیی کاندا بەخەسڵەتێکی بنەرەتی و مەزنی ئینسان و کۆمەڵی مسوڵمان و بڕوادار دانراوە، نموونەی سورەتە مەککی یەکان بێجگە لەو ئایەتانەی سوورەتی (الليل):

(فَمَا أُوتِيتُمْ مِنْ شَيْءٍ فَمَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَمَا عِنْدَ اللَّهِ خَيْرٌ وَأَبْقَى لِلَّذِينَ آمَنُوا وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ، وَالَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَائِرَ الْإِثْمِ وَالْفَوَاحِشَ وَإِذَا مَا غَضِبُوا هُمْ يَغْفِرُونَ، وَالَّذِينَ اسْتَجَابُوا لِرَبِّهِمْ وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنْفِقُونَ) الشورى: ٣٦-٣٨،

نمونەی سوورەتە مەدینەیی یەکانیش: (الم، ذَلِكَ الْكِتَابُ لَا رَيْبَ فِيهِ هُدًى لِلْمُتَّقِينَ، الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِالْغَيْبِ وَيُقِيمُونَ الصَّلَاةَ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنْفِقُونَ) البقرة: ١-٣.

جا بێگومان ماڵ و سامان بەخشین بەهەردووک جۆری فەرز و سوننەتی یەوە، باشترین هۆکاری راهێنان و بارهێنانی تاک و کۆمەڵی مسوڵمانە لەسەر خەسڵەتی بەرزی بەخشین و سودو کەڵک بەخەڵک گەیاندن لەهەموو بوار ولایەنەکانی ژیان و گوزەران دا.

## ٤-سوپاسگوزاری چاکەو نیعمەتەکانی خوای بەخشەر:

ئەگەر ستایش و مەدح و ثەنای خوا بەدڵ و زمانە، سوپاسگوزاری بۆ خوا بەدڵ و زمان و ئەندامەکانیشە، وەك زانایان گوتوویانە[٤٨٦]، جا هەروەك چۆن ستایش (حمد) و مەدح و ثەنای خوا لە بەرانبەر ناوە هەرە چاکەکانی و سیفەتە هەرە بەرزو پەسەندەکانی دا پێویستە، سوپاسگوزاری (شکر) یش لەبەرانبەر چاکەو نیعمەتە لەژمارە نەهاتوەکانی دا فەرزە، سوپاسگوزاریش بۆ خوا بەوە دەبێ کە ئینسانی بڕوادار چاکەو نیعمەتەکانی خوای بەخشەر لە رەزامەندی وی دا بەکاربێنێ بۆ وێنە: کەسێك کە خوا لە نیعمەتی عەقڵ بەهرەمەندی کردوە ئەو نیعمەتە بەرزو پەسەندە بەکاربێنێ بۆ ئەنجام دان و نەخشە بۆ کێشانی ئەو کارو چالاکی یانەی کە خوا لێیان رازی یەو پەسەندی کردوون.

جا دیارە ئەمەش کارێکی ئاسان نیەو لە وزەی هەموو کەس دا نیە، بۆیە خوای پەنهان بین فەرموویەتی: (وَقَلِيلٌ مِنْ عِبَادِيَ الشَّكُورُ...) سبأ:١٣، واتە: وە تەنیا کەمێك لەبەندەکانم سوپاسگوزارن، بەڵێ بەراستی کارێکی ئاسان نیە کە ئینسان دەرو دەروونی و دڵ و زمانی و ئەندامەکانی بەرەو رەزامەندی خوا بەکاربێنێ و بەتەواوی خۆی تەسلیمی خوا بکات و خۆی بۆ ساغ و یەکلا بکاتەوەو بەشی هیچ کەس و هیچ شتێك بەخۆیەوە نەهێڵێ.

---

[٤٨٦] بروانە: (معجم مفردات ألفاظ القرآن) راغب الأصفهاني، وشەی (شكر)، کە بەوردی باسی رەگ و ریشەی وشەی (شكر)و ماناو چەمکەکانی کردوە، هەروەها بروانە: (المعجم الوسیط) ص٤٩٠، وشەی (شكر).

جا بێگومان بابای خاوەن ماڵو سامان بەهۆی بەخشینی ماڵو سامانەکەیەوە لەپێناوی خوادا سوپاسگوزاری بۆ خوا ئەنجام دەدات لەسەر نیعمەتی ماڵو سامانو هەتا زیاتر خەسڵەتی سەخاوەتو کەرەم بکاتە پیشە سوپاسگوزاری چاکترو زیاتر بۆ خوا ئەنجام دەداتو هەر چاکەو نیعمەتێکیش سوپاسگوزاری خوای لەسەر بکرێ بەرەکەتو پێزی تێدەزێو زیاد دەکات: (لَئِنْ شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ) ابراهيم:٧، بەڵام بەپێچەوانەوە سپڵەیی و پێنەزانیو بێئەمەکی ماکو میکرۆبی فەوتانو نەمانی چاکەو نیعمەتەکانە: (وَلَئِنْ كَفَرْتُمْ إِنَّ عَذَابِي لَشَدِيدٌ) ابراهيم:٧.

**٥-رزگارکردنی دڵو دەروون لە پەیوەست بوون بەژیانی دنیاوەو ڕووپێکردنە ژیانی دواڕۆژی:**

بێگومان دنیا شوێنی تێدا تاقیکرانەوەیەو نازو نیعمەتەکانی ژیانی دنیاش وەسیلەی بەڕێکردنو گوزەراندنی ئەو ژیانەو گرنگترین ماددەی ئەوتاقیکردنەوەیەشن، کەواتە لەلایەکەوە ئینسانی مسوڵمان هیچ چاری نیە کە بەئەندازەی پێویست لەو نازو نیعمەتانە بەهرەمەندبێ، چونکە بەبێ وان ژیانو گوزەرانی ناکرێو ناسووڕێ، وە لەلایەکی دیکەشەوە دەبێ زۆر ورياو بێداربێ کە زیاد لەئەندازەی پێویست دڵیان پێ نەبەستێو کردو کۆشیان بۆ نەکات، چونکە دڵبەستن بەژیانی دنیاو پێوە سەرگەرم بوونی یەکێکە لەدرووشمو نیشانەکانی ئینسانی بێبڕواو دوور لەخوا، وەك خوای کاربەجێ فەرموویەتی: (..وَوَيْلٌ لِلْكَافِرِينَ مِنْ عَذَابٍ شَدِيدٍ، الَّذِينَ يَسْتَحِبُّونَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا عَلَى الْآخِرَةِ) ابراهيم: ٢-٣، واتە:...وە سزای سەخت بۆ کافران لەئازارێکی توند. ئەوانەی کەژیانی دنیایان لەهی دواڕۆژ خۆشتر دەوێو بەسەریدا هەڵیدەبژێرن...

ئنجا ژیانی دنیا زۆر خۆشویستنو دڵ پێبەستنی جگە لە گوناهباری قیامەت، مایەی بێهێزو پێزی کۆمەڵی مسوڵمانیشە لە بەرانبەر دوژمنو ناحەزانیان دا، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ لەوەڵامی کەسێك دا کە دەربارەی هۆکاری بێهێزی (وَهْن)ی مسوڵمانان لەئاقار دوژمنانیان دا پرسیاری لێکردبوو، فەرمووی: (**حُبُّ الدنيا وكراهية الموت**) رواه احمد وابوداود، واتە: خۆشویستنی دنیاو بوغزاندنی مردن.

دەجا شتێکی ڕوونو بێچەندوچوونیشە کە ماڵو سامان بەخشین بە ئومێدی پاداشتی خواو سەربەرزیو ڕووسووری دواڕۆژ شمشێرێکی تیژو بڕندەیە کەملی خۆشویستنی دنیاو دڵ بەپارەو سامان بەستنەوە دەپەڕێنێو ڕووی ئینسان بەرەو خواو

ژیانی ڕاستەقینەی دواڕۆژ وەردەچەرخێنێ: (وَمَا هَذِهِ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا إِلَّا لَهْوٌ وَلَعِبٌ وَإِنَّ الدَّارَ الْآخِرَةَ لَهِيَ الْحَيَوَانُ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ) العنكبوت:٦٤، واتە: وە -ڕابواردنی - ئەم ژیانی دنیایە بەس کات کووشتنو یارییە، وە -ڕابواردنی - مەنزڵگای دواڕۆژ هەر ئەوە ژیانی ڕاستەقینەیە ئەگە زانیبایان.

## ٦-ماڵو سامان لەڕێی خوادا بەخشین مایەی دڵ چەسپانو دامەزرانی ئیمانە:

بەڵێ هەروەك چۆن بەبێ هەبوونی ئیمان بەخواو پاداشتی دواڕۆژ ئینسان هاندەرو پاڵنەری بەخشینی نابێ، لەئەنجامی ماڵو سامان بەخشینیش دا ئیمان پتەوتر دەبێو زیاتر ڕەگ داکوتاوو دامەزراو دەبێ لەدڵو دەروونی ئینسان دا، چونکە کردەوە چاکەکان - کە ماڵ بەخشین یەکێکە لەهەرە گرنگەکانیان - بۆ درەختی ئیمانو عەقیدە وەك تیشکی خۆرو ئاودانو خزمەتێك وان کە دەبنە مایەی گەشەکردنو پڕبەرتر بوونی، خوای کاربەجێش لەوبارەوە فەرموویەتی: (وَمَثَلُ الَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَالَهُمُ ابْتِغَاءَ مَرْضَاتِ اللَّهِ وَتَثْبِيتًا مِنْ أَنْفُسِهِمْ كَمَثَلِ جَنَّةٍ بِرَبْوَةٍ أَصَابَهَا وَابِلٌ فَآتَتْ أُكُلَهَا ضِعْفَيْنِ فَإِنْ لَمْ يُصِبْهَا وَابِلٌ فَطَلٌّ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ) البقرة:٢٦٥، واتە: وە وێنەی ئەو کەسانە کە ماڵو سامانەکانیان بۆ وەدەست هێنانی ڕەزامەندی خواو باشتر چەسپاندنی دڵو دەروونیان - لەسەر ئیمانو ئیسلام - دەبەخشن، وەك باغێك وایە کە لەسەر بەرزاییەکەو بارانێکی دڵۆپە زلی بەخوڕزەمی لێبباریو دووقات بەرو میوە بدات، وەئەگەر بارانی دڵۆپە زلی بەخوڕزەمیش نەیگرێتەوە بەرشێنەیەك مەداری سازبێت، وە خوا بەوەی کەدەیکەن بینایە.

## ٧-گەشەکردنی کەسایەتی ئینسانو زیاتر پاكو چاك بوونی:

خوای کاربەجێ فەرموویەتی: (خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِمْ بِهَا) التوبة: ١٠٣، واتە: (لەماڵو سامانەکانیان دا زەکاتێك وەربگرە کەبەهۆیەوە پاکیان بکەیەوەو گەشەیان پێبدەی...).

بەڵێ لەڕاستیدا ماڵ بەخشین بەهەموو جۆرو شێوەکانییەوە مایەی پاکبوونەوەی ئینسانە لەخوو و خدە پیسو نزمەکان کە ڕژدیو چرووکی بەرچاوترینیانە، وەك پێشتر باسمان کرد، وە مایەی گەشەکردنو کامڵ بوونی ئینسانو زیاتر گەیشتنو پوختەبوونی کەسایەتییەتی، چونکە زاڵبوونی ئینسان بەسەر خۆویستی (أنانية)ی خۆیدا بەهۆی ماڵو سامان بەخشین لەڕێی خوادا بەڵگەی هەراش بوونی کەسایەتییەتیو بەرزبوونەوەیەتی بەرەو دوندی لەخەم خەڵکیدا بوونو هاوکاری کردنی کۆمەڵگاو دەوروبەر و دەستبار بۆ گرتنو مشور لێخواردنیان.

## ٨-پەیدابوونی ڕێزو خۆشەویستی لەنێوان بەخشەرو کۆمەڵگادا:

پێشینان گوتوویانە: (جُبِلَتْ القلوبَ على حُبِّ مَنْ أحْسَنَ إليها وبُغْضِ مَنْ اساءَ إلَيْها) واتە: دڵەکان لەسەر ئەوە سروشتێنراون کە ئەو کەسەیان خۆش بوێ کە چاکەیان لەگەڵ دەکات و، ئەو کەسەش ببوغزێنن کەخراپەیان لەگەڵ دەکات.

جا بێگومان بابای پارەدارو دەوڵەمەند بە بەخشینی ماڵ و سامانەکەی لەڕێی خوادا لەسەرێکەوە ئیسپاتی ئەوە دەکات کە کۆمەڵ و کۆمەڵگاو دەوروبەرەکەی خۆی خۆش دەوێت و بەتەنگیانەوەیەو ئەمیەت و بایەخیان پێدەدات، وە لەسەرێکی دیکەشەوە بەخشین و چاکەکارییەکەی دەبێتە مایەی خۆشویستران و ڕێزو حورمەت لێگیرانی زیاتری لەلایەن دەوروبەرییەوە، خوای دادگەریش فەرموویەتی: (هَلْ جَزَاءُ الْإِحْسَانِ إِلَّا الْإِحْسَانُ) الرحمن: ٦٠، واتە: ئایا پاداشتی چاکەکاری هەر چاکە لەگەڵ کردنەوە نیە؟!

پێشتریش لەباسی ئەدەب و ڕەوشتەکانی ماڵ و سامان بەخشین دا ڕوونمان کردەوە کە پێویستە بابای وەرگر ڕێزو سوپاس و دووعای خێر پێشکەشی بابای بەخشەر بکات، چونکە بێگومان ئەم ڕەفتارەی بابای وەرگر وێڕای ئەوەی کە لە زاتی خۆیدا ڕەوشتێکی بەرزو جوانە، هاندەرێکیشە بۆ چاکترو زیاتر بەخشینی بابای بەخشەر.

## ٩-پاککردنەوەی ماڵ و سامان و پارێزگاری لێکردنی:

بەخشینی ماڵ و سامان و هەق و مافی خەڵك لێدەرکردنی وەك چۆن مایەی پاکبوونەوەی دڵ و دەروونی ئینسانەو هۆکاری گەشەکردن و کامڵ بوونیەتی، بەهەمان شێوەش مایەی پاککردنەوەی خودی ماڵ و سامانەکەو گەشەپێدان و زیندە بوونیشیەتی، چونکە بێگومان خەڵکی ئاتاج و نەدار چاو دەبڕنە ماڵ و سامانی خوا پێداوان و ئاخی بۆ هەڵدەکشێن، جا ئەگەر بێت و بابای دەوڵەمەند هەق و مافی خەڵکی ئاتاج لەماڵ و سامانەکەی دەرنەکات، ئەوە ئەو خەڵکە هەست بەستەم لێکراوی و هەق لێ زەوتکراوی دەکەن و بەلای کەمەوە بەشێك لەماڵ و سامانی کابرای پیسکەو چرووك بەهەی خۆیان دەزانن و بەهەر شێوەیەك بۆیان بڕەخسێ هەوڵی زەبر لێدان و تۆڵە لێئەستاندنی دەدەن، شۆڕش و ڕاپەڕینە سوورو خوێناوییەکانی هەژارو نەدارانیش لەدژی دەوڵەمەندو سەرمایەدارانی چەنگ قووچاو بەدرێژایی مێژوو چاکترین بەڵگەیە لەو ڕووەوە، ئەمە لەلایەکەوەو لەلایەکی دیکەشەوە سوننەتی خوا وایە کە بەرەکەت و پێز ناخاتە ماڵ و سامانێکەوە کە هەق و مافی خواو خەڵکی لێنادرێ، ئەمەش چەند دەقێك لەوبارەوە:

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إذا أدَّيْتَ زكاةَ مالِكَ فَقَدْ أذهَبْتَ عَنْكَ شَرَّهُ) رواه ابن خزيمة والحاكم عن جابر رضي الله عنه، واتە: هەرکات زەکاتی ماڵ و سامانەکەتت دا ئەوە خراپەو زیانیت تێدا لابردوە.

هەروەها فەرموویەتی: (ما خالطتِ الصدقة – أو قال الزكاة – مالاً إلاّ أهْلكَتْـهُ)[٤٨٧] رواه البزار والبيهقي ورواه الشافعي والبخاري في تاريخه، واتە: صەدەقە – یان گوتی زەکات – تێکەڵی هیچ ماڵێك نەبووە مەگەر فەوتاندوویەتی.

دیسان فەرموویەتی: (.. ولَمْ يَمْنَعوا زكاة أمْوالِهِمْ ألاّ مُنِعوا القَطْرَ من السَّماءِ، ولَولا البَـهائِمُ لَـمْ يُمْطَروا)[٤٨٨] رواه ابن ماجة والبزار والبيهقي واللفظ له عن ابن عمر، ورواه الحاكم وصححه ووافقه الذهبي.

واتە: ... وە هیچ گەلێك نەبووە كە زەكاتی ماڵو سامانەكانیان نەدەن مەگەر بارانیان لەئاسمانەوە لێگیراوەتەوە، وەئەگەر لەبەر ئاژەڵو گیانداران نەبووایە هەر هیچ بارانیان بۆ نەدەباری.

## ١٠-بەخشین بەرەكەتو پێزی ماددی و مەعنەوی دەخاتە ماڵ و سامانەوە:

خوای پەروەردگار و دادگەر لەچەندان دەقی قورئان دا ئەو ڕاستی‌یەی خستۆتەڕوو كە ماڵو سامان بەهۆی زەكات لێدەركران و لێ‌بەخشرانی‌یەوە زیاد دەكاتو هێزو پێزی تێدەكەوێ، بۆ وێنە فەرموویەتی: (وَمَا أَنفَقْتُمْ مِنْ شَيْءٍ فَهُوَ يُخْلِفُهُ وَهُوَ خَيْرُ الرَّازِقِينَ) سبأ:٣٩، واتە (... وەهەر شتێك ببەخشن خوا جێگای پڕ دەكاتەوە وە ئەو چاكترین ڕۆزی دەرە).

هەروەها فەرموویەتی: (وَمَا آتَيْتُمْ مِنْ زَكَاةٍ تُرِيدُونَ وَجْهَ اللَّهِ فَأُوْلَئِكَ هُمْ الْمُضْعِفُونَ) الروم:٣٩، واتە: ...وەهەر زەكاتێك بەمەبەستی ڕوو ورەزامەندی خوا بیدەن، ئەوە ئەوانە – كە ئەو زەكاتە دەدەن – خاوەنی پاداشتی چەند قاتن.

دیسان فەرموویەتی: (يَمْحَقُ اللَّـهُ الرِّبَـا وَيُرْبِي الصَّدَقَـاتِ وَاللَّـهُ لَـا يُحِبُّ كُـلَّ كَفَّـارٍ أَثِيـمٍ) البقرة:٢٧٦، واتە: خوا ماڵێك سود (ربا) ی تێدابێ لەبەینی دەبات، وەخێرو صەدەقەكان گەشەپێدەداتو زیاد دەكات.....).

بەڵێ بەخشینی ماڵو سامان مایەی پیتوپێز تێكەوتنو گەشەكردنو زیادبوونیەتی لەڕووی ماددیو مەعنەوی‌یەوەو لەدنیاو دواڕۆژدا، هەر بۆیەش خوای دادگەرو بەخشەر ماڵی حەرامو پیس بەخێرو صەدەقە وەرناگرێ، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (إنّ الله طَيّبٌ لايَقْبَلُ إلا طيّباً) متفق عليه، چونكە شتێك لەخودی خۆیدا پیس بێت نەقەت پاك دەبێتەوەو نەهیچیشی بۆ خاوێن دەكرێتەوە!

لێرەش دا كۆتایی بە برگەی یەكەمی خاڵی یەكەم دێنینو دەچینە سەر برگەی دووەمی.

---

[٤٨٧] بڕوانە: (نيل الأوطار) ج٤ص٢١١، ٢١٢.

[٤٨٨] بڕوانە: (سلسلة الأحاديث الصحيحة) للألباني ج١ص٢١٩، ٢٢٠، الحديث رقم: ١٠٧.

## برگەی دووەم: وەرگر (الآخذ)

ماڵو سامان بەخشین چ فەرز بێ چ سوننەت تەنیا بۆ بابای بەخشەر بەرهەمو سوودو کەڵکی نیە، بەڵکو وەرگریش بەلای کەمەوە لەدوو لاوە لەوماڵو سامان بەخشینە بەهرەمەند دەبێت: یەکەم: لەڕووی ماددی‌یەوە، دووەم: لەڕووی دەروونی و مەعنەوی‌یەوە، کە لەم چەند دێڕەی خوارێدا تیشکیان دەخەینەسەر:

**١-ڕزگاربوونی بابای پێبەخشراوو هاوکاری‌کراو لەئاتاجی‌و پێویستی:**

بەختەوەرکردنی خەڵکی لەم ژیانە دنیایی‌یەیان دا یەکێکە لە ئامانجە سەرەکی‌یەکانی ئایین‌و بەرنامەی خوای کاربەجێ، ئاشکراشە کە دابین کرانی پێداویستی‌یە ماددی‌یەکان هۆکارێکی گرنگی بەختەوەری‌و خێرو خۆشی‌یە، بۆیەش خوای پەروەردگار نیعمەت‌و چاکەی ڕۆزی‌یە پاك‌و چاکەکانی لە ڕیزی ئەو نیعمەتە گەورەو بەرزانەدا داناوە کە شایستەی سوپاسگوزاری لەسەر کرانن، وەك فەرموویەتی: (وَاذْكُرُوا إِذْ أَنْتُمْ قَلِيلٌ مُسْتَضْعَفُونَ فِي الْأَرْضِ تَخَافُونَ أَنْ يَتَخَطَّفَكُمُ النَّاسُ فَآوَاكُمْ وَأَيَّدَكُمْ بِنَصْرِهِ وَرَزَقَكُمْ مِنَ الطَّيِّبَاتِ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ) الأنفال: ٢٦، واتە: وە - ئەی مسوڵمانینە - یادی ئەوکاتە بکەنەوە کە ئێوە کەم بوون‌و چەوسێنراوەبوون لەزەوی داو دەترسان کە خەڵکی -کافر- بتانفڕێنن، جا خوا ئێوەی حاواندەوەو بەیارمەتی خۆی پشتی گرتن‌و، لەڕۆزی‌یە پاك‌و چاکەکانی پێبەخشین، بۆئەوەی سوپاسگوزاری -خوا- بکەن.

وەپێغەمبەری پێشەواشمان ﷺ نازو نیعمەتە ماددی‌یەکانی بەمایەی بەختەوەری‌و ئاسوودەیی ژیانی دنیا حیساب کردوون، وەك فەرموویەتی: (**أَرْبَعٌ مِن السَّعادة المرأة الصالحة، والمَسكنُ الواسعُ، والجار الصالحُ والمَرْكَبُ الهَنِيءُ**) رواه ابن حبان في صحيحه ورواه احمد والطبراني وصححه الألباني. واتە: چوار شت مایەی بەختەوەرین: ژنی چاك‌و خانووی فراوان‌و دراوسێی باش‌و وەسیلەی سواربوونی ئاسان‌و خۆش.

وە بەپێچەوانەی ئەو شتانەی بەهۆکاری ژینتاڵی‌و شپرزە حاڵی داناوە:

(**وأربَعٌ من الشقاء الجارُ السُوُ والمَرْأةُ السُوُ والمَركَب السُوُ والمَسْكَن الضَيِّقُ**) رواه ابن حبان في صحيحه وصححه الألباني.

بەڵام جیاوازی ئیسلام لەڕێچکەو ئایینە دەستکردەکان لەو بوارەدا ئەوەیە کە ئیسلام پێداویستی‌یەکانی ژیان‌و گوزەرانی ئینسان تەنیا لەتێرکردنی گەدەو گیرفان‌و داوێن دا کورت هەڵناهێنێ، بەڵکو دابین کردنی پێداوستی‌یە ماددی‌یەکان بەوەسیلەو هۆکاری ژیان‌و گوزەرانێکی ئینسانانە دەزانێ‌و، دەیەوێ هەموو ئینسانەکان تێرو پۆشتەو

پەرداخ و خاوەن جێ و ڕێ بن، تاکو دەست کراوەو ئامادە بن بۆ بەندایەتیکردن بۆ خواو، بەدوای نان و ئاودا گەڕان وایان لێنەکات کە نەیان پەرژێتە سەر هیچی دیکە: هەر بۆیەش دەبینین خوای وردبین یەکێك لەو نیعمەتانەی کە دەیکاتە مایەی منەت لەسەر پێغەمبەری خۆی ﷺ بریتییە لە قوتارکردنیی لەنەداری و دەست کورتی، وەك فەرموویەتی: (أَلَمْ يَجِدْكَ يَتِيمًا فَآوَى، وَوَجَدَكَ ضَالاً فَهَدَى، وَوَجَدَكَ عَائِلاً فَأَغْنَى) الضحى:٦-٨، واتە: ئایا خوا تۆی بەهەتیوی نەدی و حاواندییەوە، وە بەسەرگەردانی نەیدی و ڕێی پێشاندای، وە بەدەست کورتی نەیدی و بێنیازی کردی؟!

وە یەکێك لەو دوعایانەی کە پێغەمبەر ﷺ پێیان لە خوا دەپاڕایەوە ئەمە بوو: (اللهم أني أسالك الهُدى والتقى والعفافَ والغِنى) رواه مسلم والترمذي وابن ماجة عن ابن مسعود.

واتە: ئەی خوایە من ڕێنوونی و پارێزکاری و پاکی و بێنیازیت لێداوا دەکەم. جا بێگومان بەهۆی ماڵ و سامان بەخشینەوە بەتایبەت هی فەرز کە زەکات بڕبڕەی پشتیەتی توێژە ئاتاج و نەدارو پەککەوتوو و بێدەرەتانەکانی نێو کۆمەڵگا وەك: هەژار (فقير) و نەدار (مسكين) و ڕێبوار و قەرزدارو کۆیلەو موجاهیدو دڵڕاگیراوان لەبن باری قورسی ژینتاڵی و شپرزە حاڵی دێنەدەرێ و دەروویان لێدەکرێتەوە.

جا لێرەدا بە پەسەندی دەزانم چەند قسەیەکی زۆر بەهاداری زاناو توێژەرەوەی هەڵکەوتووی قورئان و ئیسلام شەهید سەید قوطب لەوبارەوە نەقڵ بکەم کە گوتوویەتی: (ئیسلام حەز ناکات خەڵکی گیرۆدەی هەژاری و ئاتاجی بن، چونکە دەیەوێ بەهۆی بۆ دابین کرانی پێداویستییەکانی ژیان و گوزەران بۆ کارو ئەرکی مەزنتر دەست بەتاڵ بن، کارو ئەرکێك کەشایستەی مرۆڤ و ئەو پایەو پلەیە کە خوا تایبەتی کردوە بە ئادەمیزادەوە وەك فەرمووەتی: (وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ وَحَمَلْنَاهُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَرَزَقْنَاهُمْ مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَى كَثِيرٍ مِمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا) الأسراء: ٧٠، ئنجا لەڕاستیدا ئەو عەقڵ و سۆزو هەست و نەست و ئیشتیاقە رووحییانەی کە شتی بەرزترو سەرووتر لە داخوازییەکانی جەستە داوا دەکەن بوونەتە مایەی ئیمتیازو ڕێزو حورمەتی ئینسان، جا ئەگەر ئینسانەکان هێندەیان لەپێداویستییە ماددییەکانی ژیان و گوزەران بەئاسانی بۆ مەیسەر نەکرێ، دەرفەتی ئەوەیان نامێنێ کە کات و کۆشش تەرخان بکەن بۆ ئەو هەست و نەست و داخوازییە مەعنەوییانەو لە حاڵێکی واش دا ئەو ڕێزو پلەو پایەیان لێ دەستێنرێتەوەو دەگێڕرێنەوە بۆ ڕیزی گیانداران! بەڵکو خراپتریش لەگیانداران چونکە گیانداران خۆراکیان چنگ دەکەوێ و جاری وا هەیە هەندێکیان ڕاکە ڕاك و بازبازێن و کەیفیش دەکەن، وە هەندێك جۆرە پەرەوورو باڵندە پاش تێر خواردن و خواردنەوە دەخوێنن و جریوە جریو دەکەن و خۆشی و شادی بەژیانیان دەردەبڕن.

كەواتە بەڕاستی ئەو کەسە نە ئینسانەو نە بەڕێزیشە لەلای خوا کە لەبەر ناچاری خواردنو خواردنەوە نایپەرژێتە سەر ئەو شتانەی کە ئاژەڵو باڵندەش هەیانە، چ جای ئەو ئەرکانەش کە خوا بۆ مرۆڤێکی ڕێز لێگیراوی دیاریکردوون!

جا ئەگەر بابایەکی وا هەموو هەوڵو تەقەللای خۆی بخاتە کارو ئێستا بەشی ئەوە نەکات کە پێداویستییەکانی دابین بکات، ئەوە ئەوکاتە ئەو بەڵایە یەخەی گرتوە کە بەچەندان پلە دەیخاتە ژێر ئەو ئاستە بەرزەوە کە خوا بۆی دیاری کردوە، وە ئەو کۆمەڵگایەش کە بابایەکی وای تێدا دەژی، مۆری ئەوەی بە نێوچاوانەوە دەنرێ کە کۆمەڵگایەکی پەستو نزمەو شیاوی ڕێز لێگرتنی خوا نیە، چونکە سەرپێچی لە بەرنامەی خوا کردوە.

بێگومان ئینسان جێنشینی[489] خوایە لە زەویدا، بۆیەش لە ویدا کردوویەتە جێگری خۆی تاکو ژیانو گوزەرانی تێدا گەشە پێبداتو بەرەو پێشەوەی بەرێو پاشان ڕازاوەو گەشو جوانی بکات، دواییش تامو چێژ لەجوانیو ڕەونەقی وەربگرێ، وەسەرەنجام سوپاسگوزاری بۆ خوا بکات لەبەرانبەر چاکەو نیعمەتەکانیدا کە پێی داون، وە بێگومان ئینسان هیچ شتێك لەو ئامانجە بەرزانە وەدەست ناهێنێ لەکاتێك دا کە هەموو ژیانو تەمەنی لەپێناو وەدەست هێنانی پارووە نانێك دا بەرێبکات، کە پێی بژیەتو بەشی بکات، چ جای کە هەموو تەمەنەکەشی لەو ڕێیەدا بەرێ بکاتو دەستیشی لەبژێوێکی وا گیر نەبێ کەکیفایەتی بکات!!)[490]

## ٢-پاکبونەوەی دڵو دەروونی وەرگر لەچڵكو ژەنگی حەسەدو بوغزو کینە:

گومانی تێدا نیە کە کەسێك هەژاریو نەداری تەنگی پێهەڵچنیبێو کەڵبەی برسیەتی لە هەناوی گیربووبێو بەئاگری بێجێگاو ڕێگایی و بێ نوێنیو بێبەرگو پۆشاکییەوە چزابێو مارو دووپشکی ڕووتو ڕەجاڵیو بێدەرەتانی پێیەوە دابێ، وە لە دەورووبەری خۆشیدا خەڵکی خۆشگوزەرانو تێرو پڕو پۆشتەو پەرداخ ببینێ، کە هیچ گوێی نادەنێو ئاوڕی لێنادەنەوە، مەگەر چۆن دەنا دڵی پڕدەبێ لە بوغزو کینەو غەرەزو پاشان ئیرەییو حەسەد، بەرانبەر بەو خەڵکە کەمتەرخەمو بێباکە!

---

[489] لەبابەتی یەکەمی (خواپەرستی بەگشتی)دا کە لە بەشی (دووەم) بەرگی یەکەمی (مسوڵمانی کامڵ) دایە لاپەڕە (٤٢) چۆنیەتی و چەمکی خەلیفەی خوابوونی ئینسانمان ڕوون کردۆتەوەو بەرپەرچی ئەوانەشمان داوەتەوە کە لەوبارەوە ڕەخنەیان هەیە لەو کەسانەی کە وشەی (خەلیفەی خوا) بۆ ئینسان بەکاردێننو پێیان وایە هەڵەیە.

[490] بڕوانە: (العدالة الأجتماعية في الأسلام) ص١٣٢، ١٣٣، ط٥.

جا شتێکی ڕوونەکە ماڵ بەخشینی فەرزو سوننەتی دەوڵەمەندەکان بەو توێژە ئاتاجو کەنەفتو شپرزە حاڵانە وێڕای ئەوەی کە درووشمو نیشانەی دینداریو مسوڵمانەتییانو ئەرکو پێویستی سەرشانیانە چاکترین مەڵحەمو هەتوانی برینو زامەکانی دەرو دەروونیشیانەو، باشترین پارێزەرو پاککەرەوەیانە لەژەنگو ژارو چڵکو چەپەڕی ئەو دەردو نەخۆشییە دەروونیو جەستەییە تاکیو کۆمەڵایەتییانەی کە لە بارودۆخی پڕ ستەمو بێویژدانانەی ئابووریو ژیانو گوزەرانی پڕ قڕیو پڕییەوە سەرهەڵدەدەنو تەشەنە دەکەن.

وە لە ڕاستیدا هەر کۆمەڵگایەك گیرۆدەی حەسەدو بوغزو کینە بووبێ بە کۆمەڵگایەکی نەخۆشو دەردەدارو ناتەواو دادەنرێ، چونکە سەرەڕای ئەوە کە حەسەدو بوغزو غەرەز تاکەکان جگە لە نەخۆشییە دەروونییەکان تووشی چەندان نەخۆشی جەستەیی وەك: برینی گەدە (قُرْحَة المَعِدَة) و فشاری خوێن (ضَغْطُ الدَّم) دەکەن، کۆمەڵگاش بەگشتی دووچاری گەندەڵیو پووچەڵیو پەرتەوازەییو شیرازە پچڕان دەکەن، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ ئوممەتەکەی لەو دەردو نەخۆشییە سامناكو بێڕەزایانە ئاگادار کردۆتەوەو فەرموویەتی: (دَبَّ اليكم داءُ الأمم من قبلكم: الحَسَدُ والبَغْضاءُ، والبغضاء هي الحالِقَةُ، أما إني لاأقولُ تَحْلِقُ الشَّعْرَ ولكن تَحْلِقُ الدِّيْنَ) رواه البزاز بأسناد جيد والبيهقي وغيرهما.

واتە: دەردی ئوممەتانی پێشووتان دزەی کردۆتە نێوتان: حەسوودیو بوغزو کینە، وە بوغزوکینە هەڵتاشەرە، ئاگاداربن نالێم موو دەتاشێ، بەڵکو ئایین دەتاشێ، دیارە ئیسلامیش بەئامۆژگاری ڕووت هەوڵی چارەسەری ئەو نەخۆشو دەردانەو ڕێ لێ گرتنیانی نەداوە، بەڵکو وەك عادەتی خۆی وێڕای ئەو شێوازە چارەسەری کردەییشی بۆ داناوە، هەم بۆ پارێز (وقاية) لە سەرهەدانی، چونکە وەك گوتراوە: (درهم وقاية خير من قنطار علاج)، وەهەم بۆ ڕیشەکێش کردنو نەهێشتنی پاش پەیدابوونی.

ئاشکراشە کە بە بێ ئەو بەخشینو بەتەنگ یەکترەوە بوونو بەدەم یەکدییەوە چوونو ئاگا لەیەکتربوونەی کۆمەڵگا، هیچ لەو فەرمانو ئاراستە (توجيه) انەی کە بەمەبەستی تۆکمەو توندو تۆڵ کردنی توێژەکانی کۆمەڵگاو پێکەوە جۆشدانیان هاتوون لەمەیدانی واقیع دا نایەنەدی، بۆ وێنە:

(وَتَعَاوَنُوا عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَى) المائدة: ٢، واتە: وە بۆ چاکەکاریو پارێزکاریو هاوکاری یەکتر بکەن.

(كونوا عبادالله إخواناً) رواه مسلم عن ابي هريرة رضي الله عنه، واته: بەندەکانی خوا ! برا بن.

(المُسْلِمُ أخو المُسْلِم لايَظْلِمهُ ولايُسْلِمُهُ، ومَنْ كان في حاجَةِ أخيه كان الله في حاجَتِه، ومَنْ فَرَّجَ عن مؤمنٍ كُرْبةً فَرَّجَ الله عَنْهُ كُرْبَةً من كُربِ يوم القيامة) متفق عليه.

واتە: مسوڵمان برای مسوڵمانە نە ستەمی لێدەکاتو نە بە دەستەیەوەی دەدات (بێگومان برسیەتی و ڕووتو ڕەجاڵیش وەك دوژمنی بابە کوشتەیە)، وە هەر کەسێك پێویستی برایەکی جێبەجێ بکات، خواش پێویستی وی جێبەجێ دەکات، هەرکەسێکیش گرفتێك لە برواداریێك لابەرێ، خوا گرفتێك لە گرفتەکانی ڕۆژی قیامەتی بۆ لادەبات.

(لايؤمن أحدكم حتى يُحِبَّ لأخيه مايُحِبُّ لِنَفْسِهِ) متفق عليه، واتە: یەکێکتان بڕوا ناهێنێ - بەوجۆرەی کە پێویستە - هەتاچی بۆ خۆی پێخۆشە بۆ برا - و خوشکی - یشی پێی خۆش نەبێ.

لەکۆتاییش دا دەڵێم: ئەگەر لەسیستەمی سەرمایەداریدا کۆمەڵ بەقوربانی تاك دەکرێ، تاك بە کەیفی خۆی هەڵسوکەوت دەکات بۆ دابین کردنی بەرژەوەندییەکانی بێ گوێدانە بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵ، وە ئەگەر لەسیستەمی سۆسیالیزمیدا کۆمەڵ - کە لەچینی پرۆلیتاریادا خۆی دەنوێنێ - تاك دەکرێتە بەلاگێڕیو لەژێر پێی بەرژەوەندییەکانیدا دەپلیشێنرێتەوەو لەسەر بنەمای فەلسەفەی دژایەتیو ناکۆکی چینەکان (صراع الطبقات) چینو توێژەکانی کۆمەڵگا بەردەدرێنە گیانی یەکتر!! لەسیستەمی سیاسیو ئابووریو کۆمەڵایەتی ئیسلام دا تاكو کۆمەڵ لەسەر بناغەی برایەتیو یەکتر خۆشویستنو بەپێی ترازوویەکی دادگەرانە دەستیان پێدەکرێتە ملی یەکترو توێژەکانی کۆمەڵگاش لەجیاتی لە یەکتر بەربدرانو لە یەکتر هارکرانیان بۆ هاوکاریو دەستبار بۆ یەکترگرتن هان دەدرێنو بەشێکی زۆری ئەو هاوکاریو برایەتیو دەستبار بۆ یەکترگرتنەشیان وەك ئەرکێك لەسەر پێویست دەکرێو لەسەر کەمتەرخەمی تێداکردنی دووچاری لێپرسینەوەو سزاو تۆڵەش دەبن.

## خاڵی دووەم:[491]

# بەرهەمو شوێنەوارەکانی ماڵ بەخشین لەژیانی کۆمەڵگادا

خوێنەری بەڕێز! خوا پشتیوان بێ لەم خاڵەدا هەوڵ دەدەین تیشك بخەینە سەر سوودو بەرهەمو پەرێزو شوێنەوارەکانی ماڵ بەخشین - بەتایبەت ماڵ بەخشینی فەرز - لەژیانو گوزەرانی کۆمەڵگادا.

### ١-ماڵ بەخشینی فەرز یەکێکە لە بنەماکانی بەخەم یەکدییەوەبوونی کۆمەڵگا ( الضَّمان الأجتماعي ):

هیچ کاتێك کۆمەڵگا لە کەسانێکی هەژارو نەدارو ئاتاجو پەککەوتە خاڵی نابێو، بۆئەوەش کەباری لارو کەوتووی ئەو جۆرە کەسانە ڕاست بکرێتەوە پێویستە میکانیزم (آلیات)ێکی کردەیی و واقیعی دابنرێ، جا ماڵ بەخشینی فەرز لەئیسلام دا -بەتایبەت زەکات - چاکترینو کردەییترین میکانیزمی تێدایە بۆ ئەو مەبەستە، بەلأم بەمەرجێك وەك شەرع دیاریکردوە ئاوا وەربگیرێو، دابەش بکرێو بە شوێنە شایستەو دیاریکراوەکانی خۆی بگەیەنرێ چونکە وەك لە باسەکانی ڕابردوودا دەرکەوت (زەکات) کە جەوهەرو بەشی هەرە گرنگو بنەڕەتی ماڵ بەخشینی فەرزە ئەندازەیەکی دیاریکراوە لە هەموو جۆرەکانی ماڵو سامان کە دەستەڵاتی شەرعی وڵات وەریدەگرێ بەشێوەیەکی دەوری ساڵانەی ڕێكوپێك (منتظم) بەسەر ئەو کەسو شوێنانەدا دابەشی دەکات کە خوای پەروەردگار دیاری کردوون، نەك وەك خەڵکێکی سادەو سەرکێڵو ناحاڵی گومان دەبەن، خێرو صەدەقەو چاکەیەکی شەخسی بێت بیدات یان نەیدات!!

جا لێرەدا بۆ ڕوونکردنەوەی ڕۆڵی زەکات لە پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییيانەو گرتنی ئەو کەلێنانەی کە بەهەر هۆیەکەوەبێ لە ژیانو گوزەرانی هەندێك لە توێژەکانی کۆمەڵگادا پەیدا دەبن، بەپەسەندی دەزانم دەقی ئەو نامەیەی کە (الزهري) بۆ (عمر بن عبدالعزيز)ی ناردوە دەربارەی ئەو کەسو شوێنانەی بە زەکات باریان ڕاست دەکرێتەوەو بەسەر دەکرێنەوە بەوەرگێڕراوی بنووسم، نووسیویەتی:

---

[491] بۆ نووسینی ئەم خاڵی دووەمەش پشتم بە (فقه الزكاة) ج٢ص٨٨٠تا٩١٢، بەستوە، لەگەڵ چەند وردە دەستکارییەکی خۆمو زیادکردنی چەند شتێك دا.

(بێگومان لە ماڵی کۆکراوەی زەکات دا بەشی: بەساڵداچوو و پەککەوتەکان هەیە، وەبەشی هەر نەدارێك کە لەبەر دەردو نەخۆشی‌یەك توانای کاسبی‌و گەڕان‌و سووڕانی نیە بۆ بژێو پەیداکردن، وەبەشی ئەو نەدارانەی کە سواڵ دەکەن‌و داوای خۆراك لە خەڵکی دەکەن، (بەجۆرێك کە جارێکی دی ئاتاجی ناچاری سواڵکردنیان نەکات)، وە بەشی ئەو کەسانە کە لە ئەهلی ئیسلام لە حەپس خانەکان دان‌و هیچ کەسیان نیە، وەبەشی ئەو نەدارانە کە هاموشۆی مزگەوتان دەکەن‌و هیچ مووچەو بەشێکیان نیە، وەداواش لەخەڵکی ناکەن، وەبەشی کەسێك گیرۆدەی هەژاری بوەو کەوتۆتە بن باری قەرزو قۆڵەوەو بەهۆی گوناح‌و خراپەکاریشەوە نەبوە،لە دینداری یان قەرزداری‌یەکەی‌دا جێگای تۆمەت نیە، وەبەشی هەر ڕێبوارێك کە شوێنی حاوانەوەی نیەو کەسی نیە سەریان پێ‌بێنێ، ئەوە پێویستە خۆراکی پێ‌بدرێ‌و وڵاخەکەی بۆ ئالیك بدرێ‌و هاوکاری بکرێ، هەتا جێگاو ڕێگای دەست دەکەوێ یان ئیش‌وکاری تەواو دەبێ.)[٤٩٢]

ئنجا شایانی باسیشە کە ئەو بەخەمەوە بوون‌و دەستبار بۆ گرتنە تایبەت نەبووە بەمسوڵمانانەوە بەڵکو هەموو هاووڵاتیان‌و دانیشتووانی ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامی گرتۆتەوە، بۆ وێنە: عومەری کوڕی خەتتاب خوا لێی ڕازی بێ کاتێك جوولەکەیەکی هەژاری سواڵکەری بینی دەستی گرت‌و بردیە لای خەزێنەداری (بیت المال) و پێ‌ی گوت: کە ئەمەو هاووێنەکانی ئاونووس بکات‌و لە (بیت المال) مووچەیان بۆ ببڕێتەوەو سەرانە (جزية) شیان لەسەر هەڵگرێ[٤٩٣].

هەروەها کاتێك کە دەچوو بۆ شام لە ڕێگای‌دا کۆمەڵێك نەصرانی گول (گەڕ)ی بینی، ئەویش لە (بیت المال) مووچەی بۆ بڕینەوە[٤٩٤].

پێویستە ئەوەش بگوترێ کە بەخەم یەکدی‌یەوە بوونی کۆمەڵگا[٤٩٥] (الضمان الأجتماعي) لە ئیسلام دا بەس لە بواری ماددی ژیان‌و گوزەرانی کۆمەڵگادا کورت هەڵنەهاتوە بەڵکو هەموو بوارەکانی: مەعنەوی‌و ئەخلاقی‌و فەرهەنگی‌و سیاسی‌و عەسکەری‌و.. هتد دەگرێتەوە، بەڵام لە سیستەمی ڕژێمە ڕۆژئاوایی‌یەکان دا کە لەژێر

---

[٤٩٢] بڕوانە: (الأموال) لأبي عبيد، ص٦٧٨، ٥٨٠، وە (فقه الزكاة) ج٢ص٨٨١، ٨٨٢.

[٤٩٣] بڕوانە: (الأموال) ص٤٦، هەروەها بڕوانە: (الخراج) لأبي يوسف ص١٢٦.

[٤٩٤] بڕوانە: (فتوح البلدان) البلاذري، ص١٧٧، وە بڕوانە: (نظرية الدولة وآدابها في الأسلام) موضوع: (التضامن الأجتماعي مع المحتاج) ص١٤٥تا١٤٩.

[٤٩٥] مانای دەقاودەقی (ئۆباڵداری کۆمەڵایەتی)یە، بەڵام ئەوەی نووسیومە پڕ بەپێست ترە.

فشاری شۆڕش و کودەتا خوێناوی یەکان و شەپۆل و تەوژمە توندو ڕامالەرە شیوعی و چەپی یەکان دا بەناچاری پەنایان بۆ شتێکی وابردو، یەکەمین بەردی بناغەی بەشێوەیەکی ڕەسمی لەسالی (١٩٤١) ی زایینی داو، لەپەیمانی ئەطلە نطی کە لە نێوان ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاو ئینگلتەڕا دا مۆرکرا، دانرا، تەنیا ژیان و گوزەرانی ماددی دەگرێتەوەو بەس لەولایەنەدا کورت هەلاتوە.[٤٩٦]

٢-مالٌ بەخشین بەتایبەت جۆری فەڕزی، دینەمۆی جوولاندن و بەگەڕخستنی مالٌ و سامانە:

ئاشکرایە کە هەر کۆمەلٌگایەك مالٌ و سامانەکان تێیدا دەستاودەست بکەن و لە حالەتی جموجۆلٌ وگەڕان دا بن، ئەوە لە ڕووی ئابووری یەوە بە کۆمەلٌگایەکی چالاك و زیندوو دادەنرێ و بە پێچەوانەوەشەوە بە وەستاوو مردوو.

جا مالٌ بەخشینی فەڕز بە تایبەت زەکات هۆکارێکی یەکجار کاریگەرە بۆ جوولاندن و بە گەڕ خستنی مالٌ و سامان، چونکە بەحوکمی ئەوە کە ئەندازەی (٢,٥٪)ی تێدا پێویست کراوە – دیارە لێرەدا مەبەست مالی ئەغدینەو بازرگانی یە – ئەگەر بێت و خاوەنەکەی نەیخاتە کارەوە وردە وردە زەکات لە بنی دێنێ و سەرەنجام دەستی خاوەنەکەی لە بنی هەمبانەی بەتالەوە دەردێنێ!

هەربۆیەش پێغەمبەری خوا ﷺ لە بارەی مالٌ و سامانی هەتیوانەوە فەرموویەتی: (**أتَّجِروا في أَموالِ اليتامىٰ لاتَأْكُلْها الزَّكاةُ**) رواه الطبراني عن انس بن مالك رضي الله عنه.

واتە: مامەلەو بازرگانی بەمالٌ و سامانی هەتیوان بکەن، با زەکات لەبنی نەهێنێ.

هەروەها ( عمر بن الخطاب) خوا لێی ڕازی بێ لەوبارەوە گوتوویەتی: (**إبْتَغُوا في أموال اليَتامىٰ لاتَأْكُلْها الصَّدَقَةُ**) رواه البيهقي عن سعيد بن المسيب عن عمر، وقال البيهقي اسناده صحيح.

٣-پارێزگاری کردن لەبنەما مەعنەوی یەکان:

هەر گەل و کۆمەلٌگایەك بنەما مەعنەوی یەکانی وەك عەقیدەو ئازادی و کەرامەت و حورمەت و ڕێزی تێدا نەپارێزرێن و بۆ هەموو تاکەکانی دەستەبەر (تضمين) نەکرێن، بە کۆمەلٌگایەکی نەخۆش و لەرزۆك و گەندەلٌ دادەنرێ، جا مالٌ بەخشین بەتایبەت زەکات دەبێتە مایەی پاراستن و دەستەبەرکردنی بنەما مەعنەوی یە بنەڕەتی یەکانی کۆمەلٌگا، چونکە:

---

[٤٩٦] بروانە: (فقه الزكاة) ج٢ص٨٨٢.

کۆمەڵگایەك هەشتیەك (٨/١)ی بودجەی ساڵانەی زەکاتی ماڵو سامانی خۆی بۆ ڕزگارکردنی کۆیلانو ئازادکردنیان لەکۆتو بەندی کۆیلایەتی تەرخان بکات:

(. وفِي الرِّقَاب)!

وە هەشتیەکی بوجدەی زەکات بۆ پارێزگاری لەئیمانو عەقیدە تەرخان بکات:

(وفِي سبيل الله)!

وە هەشتیەکی بودجەی زەکات بۆ ڕزگارکردنی قەرزداران لەبنەباری قەرز تەرخان بکات: (والغارمين)!

وەهەشتیەکی بودجەی زەکات بۆ هاندانو دڵڕاگرتنو سەرنج ڕاکێشانی خەڵکێك بەرەو ئیمان و ئیسلام تەرخان بکات: (والمؤلّفة قلوبهم)!

بەڵێ کۆمەڵگایەکی ئاوا کە تێیدا هێندە بەچاوی بایەخو گرنگی پێدانەوە تەماشای ئەو بنەما ڕووحیو بەها بەرزانە بکرێ بێگومان بەکۆمەڵگایەکی ساغو سەلامەتو تۆکمەو دامەزراو دادەنرێ، چونکە بەڕاستی بنەما مەعنەویو بەها بەرزەکان بناغەو بنچینەی کۆمەڵگان، هەتا ڕۆچووترو مەحکەم تر بن، کۆمەڵگاش دامەزراوترو نەلەخشاوتر دەبێ.

## ٤-لەیەك نیزیك خستنەوەی توێژەکانی کۆمەڵگا:

هەرچەندە ئیسلام دان بەوەدا دێنێ کە لەڕووی ژیانو گوزەرانەوە بەرزیو نزمی (تفاضل) لەنێوان ئینسانەکان دا هەبێ، وەك لەچەند دەقێکی قورئان دا ئاماژەی بۆ کراوە، بۆ وێنە: (وَاللَّهُ فَضَّلَ بَعْضَكُمْ عَلَى بَعْضٍ فِي الرِّزْقِ) النحل:٧١،

واتە: (وە خوا هەندێکتان لەڕۆزیدا بەسەر هەندێکتان دا بەرز کردۆتەوە...) کە دیارە حیکمەتی ئەو بەرزیو نزمی‌یەش دابەش بوونی کارو چالاکی‌یەکانو سووڕانی چەرخو دوولابی ژیانو گوزەرانە، وەك خوای کاربەجێ فەرموویەتی: (..نَحْنُ قَسَمْنَا بَيْنَهُمْ مَعِيشَتَهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَرَفَعْنَا بَعْضَهُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَاتٍ لِيَتَّخِذَ بَعْضُهُمْ بَعْضًا سُخْرِيًّا) الزخرف:٣٢،

واتە: ئێمە لەژیانی دنیادا گوزەرانیانمان لەنێوانیان دا دابەش کردوە، وەهەندێکیانمان بەچەند پلە بەسەر هەندێکیان دا بەرز کردۆتەوە بۆئەوەی هەندێکیان هەندێکیان لەئیش‌وکاردا بەکاربهێنن...

بەڵام لەگەڵ ئەوەش دا ئیسلام ڕێی ئەوەی نەداوە کە کۆمەڵگا چەند چینێکی بەرزو نزمی تێدا پەیدابێ لە شێوەی چەوسێنەرو چەوسێنراوەدا، وەك خوای پەروەردگارو

دادگەر فەرموویەتی: (مَا أَفَاءَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ مِنْ أَهْلِ الْقُرَى فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ كَيْ لَا يَكُونَ دُولَةً بَيْنَ الْأَغْنِيَاءِ مِنْكُمْ) الحشر:٧،

واتە: ئەو – ماڵو سامان –ەی کە خوا لەخەڵکی ئاوەدانییەکانەوە بۆ لای پێغەمبەرەکەی –بەبێ کوشتار – دەیگێڕێتەوە، ئەوە هی خواو هی پێغەمبەرو هی خزمان – ی پێغەمبەر – و هەتیوانو نەدارانو ڕێبوارە، – بۆیەش خوا ئاوا دابەشی کردوە – تاکو ئەو ماڵو سامانە لەدەستی دەوڵەمەندەکانتان دا کورت هەڵنەیەت..

جا بێگومان ماڵ بەخشینی فەرزو سوننەت، بەتایبەت زەکات دەورێکی زۆر کاریگەری هەیە لە بواری پڕکردنەوەی ئەو کەلێنو بۆشاییيە زلانەی نێوان توێژی دەوڵەمەندو توێژە هەژارو نەدارو قەرزدارو پەککەوتەو ئاتاجەکانی کۆمەڵگادا، چونکە وەك پێشتر ڕوونمان کردەوە ڕاست ترینو چاکترین شێوەی دابەش کردنی زەکات ئەوەیە کە هەرکام لەو هەشت جۆرە توێژە زەکات پێشیاوانەی کۆمەڵگا، هێندەیان ماڵو سامان بدرێتێ کە باری کەوتوویان ڕاست بکاتەوەو، بابای زەکات وەرگر خاوەنی هەر پیشەو کارو کاسپییەك بێ، پێداویستییەکانی ئەو کارو پیشەیەی پێدابین بکات، ئەگەرنا بارتەقای مەسرەفی هەموو تەمەنی خۆیو ئەوانەی بەئەستۆیەوەن، یان بەلای کەمەوە بایی مەسرەفی ساڵە وەختێکی بدرێتێ[٤٩٧]، ئنجا ئاشکراشە کە لە حاڵێکی وادا زۆر بەزوویی چینو توێژە هەژارو نەدارو پەککەوتووەکان نامێننو، سەرجەم کۆمەڵگا دەچێتە قۆناغی نائاتاجییەوەو، تاکەکانیشی ئاستی ژیانو گوزەرانیان زۆر لە یەك نیزیك دەکەوێتەوەو حاڵەتی قڕیو پڕیو چینایەتی نامێنێ.

### ٥-چارەسەری دیاردەی سواڵ کردن:

یەکی دیکە لە بەرهەمو شوێنەوارە گرنگەکانی ماڵ بەخشین بریتییە لە نەهێشتنو بنبڕکردنی دیاردەی سواڵ کردنو دەست پان کردنەوە بۆ خەڵکی.

بەڵێ خوێنەری بەڕێز! دیاردەی دزێوی سواڵ کردن (التَّسَوُّل)، ئیسلام پێنج بنەمای گرنگی بۆ چارەسەرو بن بڕکردنی داناوە کە یەکێکیان ماڵ بەخشینی فەرزە بەتایبەت زەکات، جا باسەرنج بدەین داخوا ئیسلام چۆن چارەسەری ئەو دیاردەیە دەکات:

---

[٤٩٧] بڕوانە: (المجموع) ج٦ص١٨٠تا١٨٢.

يەك: ڕاهێنان لەسەر داوانەكردنی هیچ شتێك لەخەڵكی:

بۆ وێنە لەوبارەوە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَنْ يتكفَّلُ لي أنْ لايسألَ النـاس شَيئاً وأتَكَفَّلُ لَهُ بالجنَّة؟ فقال ثوبان: أنا يا رسول الله، فقال: لاتَسْأَلِ الناسَ شَيئاً، فكـان لايَسْأَلُ أحـداً شَيْئاً) رواه ابوداود والبيهقي.

واتە: كێ بەڵێنم پێ دەدا هیچ شتێك لەخەڵكی داوا نەكات منیش بەڵێنی چوونە بەهەشتی پێبدەم؟ (ثوبان) گوتی: من ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: هیچ شتێك لە هیچ كەس داوا مەكە! جا (ثوبان) هیچ شتێكی لەهیچ كەس داوا نەدەكرد.

دوو: كاركردن و ڕەنج دان بناغەی پەیداكردنی بژێوی حەڵاڵە:

پێغەمبەر ﷺ لەوبارەوە فەرموویەتی: (لأنْ يَأخُذ أحدكُمْ حَبْلَهُ على ظَهْرِهِ فيأتي بِحُزْمَةٍ مـن الحَطَبِ فيبيعُها، فيَكُفَّ اللهُ بها وجْهَهُ خيرٌ مِنْ أنْ يسأل الناسَ أعْطَوْهُ أوْ مَنَعوهُ) رواه البخاري عن الزبير رضي الله عنه.

واتە: ئەگەر یەكێكتان گوریسەكەی بخاتە سەرپشتی و كۆڵە دارێك بێنێ و بیفرۆشێ و خوا بەوە ئابڕووی بپارێزێ، چاكترە لەوەی كە داوا لەخەڵكی بكات، نازانێ هیچی دەدەنێ یان نا!

سێ: سواڵ كردن حەرامە مەگەر لەكاتی زۆر تێگیراوی‌دا:

لەوبارەشەوە پێغەمبەر ﷺ چەند شتێكی فەرمووە، بۆ وێنە: (لاتَزالُ المَسْألَةُ بِأحدِكُمْ حتّى يَلْقىٰ الله ولَيْسَ في وَجْهِهِ مُزْعَةُ لَحْمٍ) رواه الشيخان والنسائي عن ابن عمر.

واتە: یەكێكتان هێندە داوا لەخەڵكی دەكات هەتا كاتێك - لەڕۆژی دوایی‌دا - دەگاتە دیداری خوا تۆزە گۆشتێكی بەڕووەوە نەماوە!

وە فەرموویەتی: (مَنْ سَأل وعنده مايُغْنيه فإنَّما يَسْتَكْثِرُ من النارِ - أو مِنْ جَمْرِ جَهَنَّمَ - فقـالوا يا رسول الله ومايُغنيه؟! قال: قَدَرَ مايُغَدِّيه ويُعَشِّيه) رواه ابوداود.

واتە: هەركەسێك سواڵ بكات و هێندەشی هەبێ كەبێ نیازی بكات، ئەوە ئاگر -یان پشكۆی دۆزەخ - بۆ خۆی زۆر دەكات! گوتیان ئەی پێغەمبەری خوا ئەوەی بێ‌نیازی دەكات چەندە؟! فەرمووی: بایی ئەوە خواردنی بەیانی و ئێوارەی دابین بكات.

چوار: ئیش‌وكار دۆزینەوە بۆ بابای تواناداری بێ‌كارو كاسبی:

لەوبارەشەوە (اصحاب السنن) ئەم فەرموودەیە لە (انس بن مالك)ەوە خوا لێی ڕازی بێ دەگێڕنەوە، كە بە مەبەستی كورت كردنەوە یەكسەر تەرجەمە كوردی‌یەكەی دەنووسم:

(پیاوێك لەپشتیوانەكان (الأنصار) هاتە لای پێغەمبەر ﷺ و داوای لێكرد، ئەویش فەرمووی: ئایا هیچ شتێك لەماڵتان دا نیە؟ گوتی: با، بەڕە (حِلْس)یەكمان هەیە كە هەندێكی بەخۆمان دا دەدەین و هەندێكیش ڕادەخەین. وەقاپێك (قَعْب) كە ئاوی تێدا دەخۆینەوە، فەرمووی: هەردووكیانم بۆ بێنە، ئەویش هێنانی، پێغەمبەری خوا ﷺ بەدەستیەوە گرتن و فەرمووی: كێ ئەم دووانە دەكڕێ؟ پیاوێك گوتی: من بەدرەمێك دەمەوێن، فەرمووی: كێ لە درەمێك زیاتر دەدات؟! دووجار یان سێجار، پیاوێك گوتی: من بەدوو درەم دەمەوێن، جا هەردووكیانی پێداو دوو درەمەكەی وەرگرت دانی بەپشتیوانەكەو فەرمووی: بەیەكێكیان خۆراكێك بكڕەو بیبەوە بۆ خێزانت، بەوی دیكەشیان بیور (تەور)ێك بكڕەو بۆم بێنە، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ بەدەستی خۆی كلكی تێبڕی، وەپێی فەرموو: بڕۆ دار بێنەو بیفرۆشەو هەتا پازدە ڕۆژان نەتبینمەوە، جا كابرا ڕۆیشت داری دەكردن و دەیفرۆشت، پاشان هاتەوەو دە درەمی پەیدا كردبوون، بەهەندێكی جل وبەرگ و بەهەندێكیشی خۆراكی كڕیبوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەمە بۆت چاكترە لەوەی كەڕۆژی دوایی بێی و سواڵكردن پەڵەیەك بێ بەڕووتەوە، چونكە سواڵكردن تەنیا بۆ سێ كەسان دەشێ: خاوەن هەژارییەكی بێدەرەتان، یان كەسێك قەرزێكی بێڕەزای لەسەربێ، یان كەسێك خوێنێكی كەنەفت كەری كەوتبێتە سەر)

پێنج: دابین كردنی ژیان و گوزەرانی ئەوانە كە دەستەپاچەن و خۆیانیان پێ ناژیەنرێ:

كەسانێك كەدەستەپاچەن و خۆیانیان پێ بەڕێوەناچێ، جا چ لەبەر نەخۆشی و پەككەوتەیی و بێ توانایی جەستەیی بێ، وە چ لەبەر ئەوەبێ كە دەرگای كەسابەتیان بەڕوودا داخرابێ و كاریان دەستگیر نەبووبێ، ئەوە لەسەر كۆمەڵگاو كیانی ئیسلامی پێویستە ژیان و گوزەرانیان دابین بكات، كە بێگومان زەكات بناغەی ئەو مەسەلەیە، بەڵام وەك پێشتریش ڕوونمان كردۆتەوەو ئیسپاتیشمان كردوە، ئەگەر زەكاتیش بەشی نەكرد، وە (بیت المال)یش یان تێیدا نەبوو یان هەر نەبوو، ئەوە لەسەر دەوڵەمەندەكانی موسوڵمانان فەرزە كە ئەوجۆرە كەسانە بژێنن و گوزەرانیان دابین بكەن. چونكە جگە لە زەكات هەق و مافی دیكەش لەماڵ و سامان دا هەیە.

جا هەرچەندە ئەم خاڵی پێنجەمە بۆ چارەسەری دیاردەی سواڵ كردن لە خاڵەكانی دیكە كاریگەرترەو هەر ئەمیش زیاتر پەیوەستە بەماڵ و سامان بەخشینەوە، بەڵام بێگومان چوار خاڵەكانی دیكەش كاریگەرن و بۆ چارەسەری دیاردەی گۆڕین هەركام لەو پێنج چارەسەری ڕابردن پێویستن.

## ٦-چارەسەرکردنی کێشەو ئاژاوەکان لەکۆمەڵگادا:

بێگومان هیچ کاتێك کۆمەڵگا بێ کێشەو گیروگرفتو ئاژاوە نابێ، هەربۆیەش ئیسلام گرنگیو بایەخێکی یەکجار گەورەی بەصولحو ئاشت کردنەوەی لایەنە ناکۆکەکانو نەهێشتنی ئاژاوەی نێوانیان داوە خوای کاربەجێ لە چەندان دەقی قورئان دا فەرمانی پێکردوەو مسوڵمانانی بۆ هانداوە، بۆ وێنە، فەرموویەتی:

(وَإِنْ طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا ...) الحجرات:٩، واتە: (وە ئەگەر دوو کۆمەڵ لە بڕواداران بەشەڕ هاتن نێوانیان چاك بکەنەوەو ئاشتیان بکەنەوە..).

هەروەها فەرموویەتی: (لاخَيْرَ فِي كَثِيرٍ مِنْ نَجْوَاهُمْ إِلَّا مَنْ أَمَرَ بِصَدَقَةٍ أَوْ مَعْرُوفٍ أَوْ إِصْلَاحٍ بَيْنَ النَّاسِ وَمَنْ يَفْعَلْ ذَلِكَ ابْتِغَاءَ مَرْضَاةِ اللَّهِ فَسَوْفَ نُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا) النساء: ١١٤.

واتە: زۆر لەچپە (سرکە سرك) یان کەڵکی نیە، مەگەر چپەی کەسێك کە فەرمان بەخێرو صەدەقەو چاکەکاریو ئاشتەوایی نێوان خەڵکی بکات، ئەوە بێگومان هەرکەسێك بەمەبەستی ڕەزامەندی خوا ئەوانە بکات لەمەودوا پاداشتێکی گەورەی دەدەینەوە.

پێغەمبەری خۆشەویستیشمان فەرموویەتی: (**ألا أدُلُّكُم على أفْضَلَ مِنْ دَرَجَةِ الصَّلاةِ والصِّيامِ والصَّدَقَةِ؟! إصْلاحُ ذاتِ البَينِ، فإنَّ فسادَ ذاتِ البَيْنِ هيَ الحالِقَةُ**) رواه أبوداود والترمذي وصححه.

واتە: ئایا کردەوەیەکتان پێشان بدەم کە پلەو پایەی لە هی نوێژ و ڕۆژوگرتنو ماڵ بەخشین بەرزتر بێ؟ چاککردنەوەی نێوان خەڵکی، چونکە تێکچوونی نێوان-و خراپ بوونی پەیوەندییەکان - هەڵتاشەرە (واتە هەڵتاشەری دینداری‌یە).

جا بێگومان گەلێك جار ئاشتەواییکردنو چارەسەری کێشەو ئاژاوەکان پەکی لەسەر ماڵو سامان دەکەوێو، لایەنە بەشەڕهاتوو و ناکۆکەکانیش لەسەر ئەوە پێك نایەن! بۆیە کە ئیسلام ئەندازەیەك لە هەشتیەك (٨/١)ی قەرزداران (الغارمین) بۆ ئەو ئامانجە بەرزە تەرخان کردوە، کە چارەسەرێکی کردەیی (علاج عملي) بۆ لابردنی ئەو گرفتو ئاستەنگە لەڕێی صولحو ئاشتەواییدا، داناوە.

بەسەرهاتی (قُبَيْصَة ابن مخارق الهلالي) یش کە صولحێکی کردبوو وە ئەندازەیەکی قەرزی کەوتبوە سەر لەو پێناوەداو پاشان چووە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و داوای هاوکاری لێکرد - چونکە داواکردنیان بۆ ئەوجۆرە مەسەلانە پێ نەنگ نەبوو -، پێغەمبەریش ﷺ پێی فەرموو: (**أقِمْ حَتىّ تأتينا الصَّدقةُ فنَأمُرَ لكَ بِها، ثُم ذكر لَهُ أن أيَّ رَجلٍ تَحمَّلَ حَمالةً فقَدْ حلَّتَ لَهُ المَسألةُ حتى يُصيبَها ثُم يُمسِكُ**) رواه احمد ومسلم. واتە: جارێ هەڵسەو چاوەڕێ بکە هەتا زەکاتمان بۆ دێ، جا ئەو کاتە فەرمان دەکەین کە لەو زەکاتە بتدرێتێ، پاشان - پێغەمبەر ﷺ - بۆی باس کرد کەهەر پیاوێك قەرزێك بگرێتە ئەستۆ ئەوە داواکردنی ماڵو سامانی بۆ حەڵاڵ دەبێ هەتا وەدەستی دێنێ، پاشان وازدێنێ.

شایانی باسیشه كه ئەو كەسانەی بەو كارە جوامێرانەیە هەڵدەستن مەرج نیە كەحەتمەن لەو سۆنگەیەوە كەوتبنە ژێر باری قەرزەوە ئەوجار ئەو مافەیان هەبێ كە لەپشكی قەرزداران (سهم الغارمین) وەربگرن، بەڵكو ئەگەر دەوڵەمەندیش بن‌و لەماڵ‌و سامانی خۆیان ئەو خوێنە یان ئەو پارەیان دابێ‌و ئەو كێشەو ئاژەوەیان پێ‌حەل كردبێ، هەر بۆیان ڕەوایە كە بەئەندازەی ئەو ماڵە كەداویانە وەربگرنەوە.[٤٩٨]

هەروەها شەرعزانانمان گوتوویانە: كە ئەو صوڵح‌و ئاشت كردنەوانە ئەگەر لەنێوان كافرانی هاوپەیمان (أهل الذمة)ی وەك جوو و دیانەكانیش دا بن، هەر دروست‌و ڕەوایە كە لەماڵی زەكات‌و پشكی قەرزداران بۆیان صەرف بكرێتەوە.[٤٩٩]

## ٧-هاوكاری‌كردن‌و دەستبار بۆ گرتنی كەسانی بەلا لێدراوو لێقەوماو:

ئیسلام كە بەرنامەی خوای پەروەردگارو پەنهان بینە واقیع بینانە تەماشای ژیان‌و گوزەرانی كۆمەڵگا دەكات‌و هەموو حاڵەتە جۆراوجۆرو ئاسایی‌و نائاساییەكانی ڕەچاو كردوە، جا لە سۆنگەی ئەوەوە كە هەندێك كەس بەهۆی بەڵاو كارەساتێكی چاوەڕوان نەكراوەوە لێیان دەقەومێ‌و گرفتار دەبن، شەریعەتی حەكیمانەی خوای بەخشندەو كاربەجێ بۆ هەستاندنەوەی ئەوجۆرە كەسە كۆست كەوتووانە چارەسەری داناوەو چەندان دەقی سوننەت لەوبارەوە هەن بۆ وێنە:

١-پیاوێك هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ كە بەڵایەكی بەسەرهاتبوو، هیچی نەمابوو پێغەمبەریش ﷺ بەهاوەڵەكانی خوالێیان ڕازی‌بێ فەرموو (تَصَدَّقُوا عَلَيْهِ) ئنجا خەڵكیش هاوكاری‌یان كردو خێریان پێ‌كرد، وەك (مسلم واصحاب السنن)، گێڕاویانەتەوە.

٢-بەسەرهاتەكەی (قُبَيصة بن فحارق الهلالي)، كە پێشتر باسمان كرد، كە پێغەمبەری خوا ﷺ پاش بەڵێن پێدان‌و بڕیاردانی هاوكاری‌كردنی لە ماڵی زەكات، پێی فەرموو: (لاتحلُّ المَسالَةُ الاّ لأحَدِ ثلاثة: رَجُلٌ تَحمَّلَ حَمالَةً فَحَلَّت لَهُ المسالَةُ حَتّى يُصيْبَها ثُمَّ يُمْسِكُ، ورَجُلٌ أَصابَتْهُ جائحةٌ إجتاحَتْ مالَه، فَحَلّتْ لَهُ المَسْألَةُ حَتّى يُصيبَ قِواماً مِنْ عَيْشٍ - أو قال سِداداً مِن عَيْشٍ - ورَجُلٌ أَصابَتْهُ فاقَةٌ حتى يقوم ثَلاثَةٌ مِنْ ذَوي الحِجا مِنْ قومه: لَقَدْ أصابَتْ فُلاناً فاقَةٌ، فَحلّتْ لَهُ المَسْألةُ حَتّى يُصيْبَ قِواماً من عَيشٍ - أو قال سِداداً مِنْ عَيْشٍ - ، فما سِواهُنَّ مِن المسألة يا قُبَيصَةُ سُحْتٌ يأكُلُها صاحِبُها سُحْتاً) رواه مسلم واحمد[٥٠٠].

---

[٤٩٨] بڕوانە: (فقه الزكاة) ج٢ص٩٠٥، كە لە (مطالب اولي النهي) ج٢ص١٤٣، ١٤٤، وەری‌گرتوە.

[٤٩٩] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[٥٠٠] بڕوانە: (المجموع) ج٦ص١٨٠، ١٨١.

واته: داواکردن تەنیا بۆ سێ جۆرە کەسان حەڵاڵە: پیاوێك- بەهۆی صوڵحێکەوە - ماڵێکی وەئەستۆگرتوە، ئەوە بۆی ڕەوایە داوا بکات تا چنگی دەکەوێ پاشان وازبێنێ، وە پیاوێك بەڵایەکی بەسەر هاتوەو ماڵو سامانەکەی ڕاماڵیوە، ئەمیش داواکردنی بۆ هەیە هەتا هێندەی دەست دەکەوێ کە باری ژیانو گوزەرانی ڕاست دەکاتەوە، وە پیاوێك کە هەژارییەکی کەمەرشکێنی بەمل دا هاتوە بەجۆرێك کە سێ کەسی خاوەن عەقڵو ویژدان لە کۆمەڵەکەی بتوانن بڵێن: بەڕاستی فلانە کەس دووچاری هەژاری بووە، ئەمیش بۆی ڕەوایە داوا - ی هاوکاری - بکات هەتا باری ژیانو گوزەرانی ڕاست دەبێتەوە، بەڵام ئەی (قوبەیصە) جگە لەمانە، هەر داواکردنێکی دیکە حەرامەو خاوەنەکەی حەرام دەخوات.

ئنجا ئایا ئەو ئەندازەیەی کە پێویستە بدرێ بەوجۆرە کەسانە کە بەڵاو گرفتارییەکانی ڕۆژگار یەخەیان پێدەگرێو تەنگیان پێهەڵدەچنێ، چۆنەو چەندە؟! زانایان قسەیان زۆر لەسەر کردەوەو لێیان توێژیوەتەوە، بەڵام ئەوەی کەپێم وایە لەهەموویان ڕاست ترو بەهێزترو لەگەڵ ڕووحی گشتی شەریعەت دا گونجاوترە، ئەو ڕایەیە کە (نووي) لە (المجموع) دا هێناویەتی، کە لەبەر زێدە گرنگیو بایەخ دار بوونی بەپەسەندی دەزانم وەك خۆی - پاش وەرگێڕانی - بینووسم:

لەژێر سەرباسی: (المسألة الثانيـة: في قَدْرِ المَصْـروفِ الیٰ الفقـیر والمسکین) دا نووسیویەتی:

(هاوەڵە عێراقییەکانمانو زۆر لەخۆراسانییەکان گوتوویانە: هێندەیان دەدرێتێ - واتە بەهەژارو نەدار - کە لەحاڵەتی ئاتاجی دەریان بهێنێو بیانخاتە حاڵەتی دەوڵەمەندی، ئەویش بریتیە لەو ئەندازەیە کە بە بەردەوامی تەمەنیان بەشی ژیانو گوزەرانیان بکات، وە ئەوە دەقی قسەی شافیعییە خوا لێی خۆش بێ، وە هاوەڵان - واتە شافیعییەکان - ئەو فەرموودەیەی (قُبَيْصَة بنِ المخارِق)یان بە بەڵگە لەسەر ئەو ڕایەیان هێناوەتەوە،... ، هاوەڵانمان گوتوویانە: پێغەمبەری خوا ﷺ داواکردنی بەڕەوا داناوە هەتا بابای داواکەر هێندەی دێتە دەست کە کەلێنی ژیانی پڕ دەکاتەوە، کەواتە ڕایەکەمان ڕاستە، گوتوویانە، وە بۆیەش سێ کەسی بۆ شایەدی دان باس کردوون، بۆ زێدە دڵنیایی نەك بۆ بەمەرج گرتن، هاوەڵانمان گوتوویانە: جا ئەگەر بابای ئاتاج پیشەیەکی هەبوو ئەوە هێندەی دەدرێتێ کە پیشەکەی یان ئامرازەکانی ئەو پیشەیەی پێبکڕێ جا نرخەکەیان زۆربێ یان کەم، وە دەبێ ئەندازەی ئەو ماڵە کە دەیدرێتێ هێندە ببێ، کە بە قازانجو بەرهەمەکەی بژیەتو بەشی بکات، جا دیارە ئەوەش بەپێی جیاوازی پیشەکانو وڵاتان و ڕۆژگارو کەسەکان دەگۆڕێ، وە هەندێك لەهاوەڵانمان وێنەیان هێناوەتەوەو گوتوویانە: کەسێك پاقلە بفرۆشێ پێنج درهەم دە درهەمی دەدرێتێ، بەڵام کەسێك پیشەکەی گەوهەر

فرۆشی بێ ده هەزار (١٠,٠٠٠) درهەمی دەدرێتێ، مادام بەم ئەندازەیە کەمتر مەداری ساز نەبێ و کارەکەی بۆ نەکرێ، هەروەها کەسێك بازرگان یان نانەوا یان بۆنفرۆش (عَطّار) یان پارە گۆڕەرەوە.(صرّاف) بێ بەگوێرەی پیشەکەی دەیدرێتێ، وە کەسێك بەرگدروو یان دارتاش یان بەرگ سپیکەرەوە (قَصّار) یان قەساب یان غەیری ئەوانە بێ لەخاوەن پیشەکان پێویستە هێندەیان بدرێتێ کە مەداری هاو وێنەکانی ئەوانی سازکردوە، وە ئەگەر -بابای زەکات وەرگر - لەجوتیاران بوو دەبێ هێندەی بدرێتێ کە بایی کڕینی پارچە زەوییەك یان بەشێك لە زەوییەك بکات کە بەرهەمەکەی کیفایەتی ژیان و گوزەرانی بکات بە بەردەوامی، هاوەڵانمان گوتوویانە: بەڵام ئەگەر - زەکات وەرگر - هیچ پیشەیەکی نەدەزانی نە بازرگانی و نەهیچ جۆرە کاسبییەك، ئەوە پێویستە هێندەی بدرێتێ کە بەشی هەموو تەمەنی هاو وێنەکانی وی لەوڵات دا بکات و، تەنیا ئەوەندەی نادرێتێ کە بەشی ساڵێکی بکات... وە ئەوەی کە گوتمان دەبێ هێندەی بدرێتێ کە بەشی هەموو تەمەنی بکات هەرئەوە رای راستە (لەمەزهەبی شافیعیدا) و عێراقییەکان و زۆربەی خۆراسانییەکان پەسەندیان کردوەو دەقی (شافیعی)یشی لەسەرە).[٥٠١]

وە جگە لەشافیعییەکان کۆمەڵێك زانای دیکەش رای ناوبراویان پەسەندکردوە، بۆ وێنە: هەندێك لە حەنبەلییەکان، وە ماوەردی (الماوردي) و (خَطّابي)[٥٠٢]، وە ئەم رایە لەگەڵ سیاسەتی عومەری کوڕی خەتتاب - دووەمین خەلیفەی سەر راستی ئیسلام خوا لێی رازی بێ - یش راست دێتەوە کە گوتوویەتی: (إذا أعْطَيْتُمْ فَأَغْنُوا)[٥٠٣] واتە: هەرکات هاوکاری کەسێکتان کردو ماڵتان پێبەخشی بێنیازی بکەن، ئاشکراشە کە عومەر خوالێیرازی بێ هەر ئامۆژگاریکەری (واعظ)ێکی سەر مینبەر نەبووە قسە بکات و بڕوات، بەڵکو حوکمڕان و خەلیفەی ئیسلام بووەو ئەوەی گوتوویەتی و قەناعەتی پێی بووە کردوویەتە بەندو یاسایەکی سیاسەتی شەرعی خۆی و پیادەی کردوە.

رای دووەمی زانایانیش کە (حەنەفییەکان و مالیکییەکان و زۆربەی حەنبەلییەکان و ژمارەیەك لە شەرعزانانی دیکەشن) پەسەندیان کردوە[٥٠٤]، ئەوەیە کە بابای هەژارو نەدارو ئاتاج و لێقەوماو تەنیا بەشی ژیان و گوزەرانی ساڵێکی دەدرێتێ، بەڵگەشیان ئەوەیە کە مادام ماڵی زەکات هەموو ساڵێ هەیە ئەو ئەندازەیە بەسە!

بەڵام بێگومان رای یەکەم کە فەرموودەکەی (قَبِيصة)ش بەڵگەیەکی بەهێزیەتی چاکترو پەسەندترە، وەك پێشتریش گوتمان.

---

[٥٠١] بڕوانە: (المجموع) ج٦ص١٨٠،١٨١.

[٥٠٢] بڕوانە: (فقه الزكاة) ج١ص٥٦٥، ٥٦٦، ٥٦٧.

[٥٠٣] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[٥٠٤] بڕوانە: (المجموع) ج٦ص١٨٤، وە (فقه الزكاة) ج١ص٥٦٧، ٥٦٨.

## ٨-چارەسەرکردنی گیروگرفتی ژن هێنان و ماڵ پێکەوەنانی گەنجانی بێماڵ و حاڵ:

دروست کردنی ماڵ و خێزان و ژن هێنان یەکێکە لە سوننەتەکانی پێغەمبەری پێشەوامان ﷺ وەك فەرموویەتی: (إنَّما أنا أَعْلَمُكُمْ بالله وأَخْشاكم لَهُ ولكنَّني أقُومُ وأنامُ وأصُومُ وأفْطِرُ، وأتزوَّجُ النِّساءَ، فَمَنْ رَغِبَ عَنْ سُنَّتي فَلَيسَ مِنِّي) رواه البخاري.

واتە: بێگومان من لە هەمووتان بە خوا زاناترم و لە هەمووشتان پتر لێی دەترسێم، بەڵام شەونوێژیش دەکەم و دەشخەوم، وە ڕۆژوو - ی سوننەت -یش دەگرم و جاری واش هەیە ناشگرم، وە ژنانیش دێنم، هەرکەسێکیش لە ڕێبازی من لابدات لە من نیە.

هەروەها فەرموویەتی: (ثَلاثة حَقٌّ علىٰ الله عَوْنُهُمْ: النَاكِحُ الَّذي يُرِيْدُ العَفافَ، والمكاتَبُ الذي يُرِيدُ الأَداءَ، والغازي في سبيلِ الله) رواه احمد واصحاب السنن الا أبي داود.

واتە: سێ جۆرە کەس خوا لەسەرخۆی پێویست کردوە کە هاوکارییان بکات: ژن هێنەرێك کە مەبەستی بە داوێن پاکی مانەوەیە، وە کۆیلەیەك کە دەیەوێ خۆی لەخاوەنەکەی بکڕێتەوەو هەقەکەی بداتێ و ئازاد بێت، وەجەنگاوەرێك کە لە ڕێگا و پێناوی خوادا دەجەنگێ.

جا یەکێك لە بەرهەمەکانی ماڵ بەخشینی فەرز لە ژیان و گوزەرانی کۆمەڵگادا ئەوەیە کە بەڕای زۆرێك لە زانایان ژن هێنان (زواج)یش هەر لە جوغزی کیفایەت و دابین کردنی ئەو پێداویستییە بنەڕەتییانەی ژیان و گوزەرانی زەکات پێشیاوان دایەو پێویستە لەکاتی زەکات پێدرانیان دا وێڕای ڕەچاوکردنی مەسرەفی خواردن و خواردنەوەو بەرگ و پۆشاك و جێگاو ڕێگای تێدا حەوانەوە، مەسرەفی ژن هێنان و ماڵ و حاڵ دروست کردن و خێزان پێکەوەنانیش ڕەچاوبکرێ،[٥٠٥] تەنانەت هەندێك لە زانایان گوتوویانە: کەسێك ژنێك بەشی نەکات پێویستە دوو ژنی بۆ بهێنرێن[٥٠٦].

هەر بۆیەش عمر ی کوڕی عبدالعزیز خوا لێی خۆش بێت - وەك (ابن كَثِيْر) دەگێڕێتەوە: (كان مُنادِيْه في كلِّ يَوْمٍ يُنادي: أينَ الغارِمون؟ أيْنَ الناكِحون؟ اين المَساكين؟ اين اليتامىٰ؟ حَتّى أغْنىٰ كُلاً مِنْ هؤلاء.)[٥٠٧]

---

[٥٠٥] بڕوانە: (المفصل)ج١ص٤٣٠، کە لە (حاشية الدسوقي على الشرح الكبير) ئەم قسەیەی نەقل کردوە: (ان أتسع المال - اي مال الزكاة - زِيْدَ العَبْدُ ومَهْرُ الزَّوجَة) ج١ص٤٩٤. واتە: ئەگەر ماڵی زەکات بەشی کرد دەبێ - بۆ بابای زەکات پێدراو - کۆیلەیەك و مارەیی ژنێکیش زیاد بکرێ، (دیارە کۆیلەکە بۆ خزمەت کردن بووە). هەروەها بڕوانە: (فقه الزكاة) ج١ص٥٦٨، کە لە (حاشية الروض المربع) ج١ص ٤٠٠ و (مطالب أولي النهى) ج٢ص١٤٧، ئەم قسەیەی هێناوە: (إن من تمام الكفاية ما يأخذه الفقير ليتزوج به إذا لم تكن له زوجة واحتاج للنكاح).

[٥٠٦] بڕوانە: (فقه الزكاة) ج١ص٥٦٩، کە لە (النيل وشفاء العليل) ج٢ص١٣٥، وەریگرتوە.

[٥٠٧] بڕوانە: (البداية والنهاية) لأبن كثير ج٩ص٢٠٠.

واتە: عادەتی وابوو هەموو ڕۆژێك جارچی‌یەكەی بانگی دەكرد: كوان قەرزدارەكان؟ ژن هێنەرەكان لەكوێن؟ كوان نەدارەكان؟ هەتیوەكان لەكوێن؟! هەتا هەموو ئەو -جۆرە كەس - انەی بێ‌نیاز كردن.

دیارە ئەسڵی ئەم مەسەلەیەش بێجگە لە ئاراستە گشتی‌یەكانی قورئان‌و سونەت لەم دەقەوە هاتوە: (عن أبي هريرة رضي الله عنه أن النبي ﷺ جاءَهُ رَجُلٌ فقال: إنّي تزوّجتُ أمرأةً من الأنصار... فقالَ: على كَمْ تزوَّجْتَها؟! قال: على أربَعِ أواقٍ، فقال النبي ﷺ على أرْبَعِ أواقٍ! كأنما تَنْحِتون الفِضَّةَ مِنْ عَرْضِ هذا الجَبَلِ! ماعِنْدَنا ما نُعْطيكَ، ولكِنْ عَسى أنْ نَبْعَثَكَ في بَعْثٍ تُصيبُ فيه..) رواه مسلم[508].

واتە: پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و گوتی: ژنێكم لەپشتیوانەكان هێناوە، فەرمووی: لەسەر چەند مارەت كردوە؟ گوتی لەسەر چوار ئووقیە[509]، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لەسەر چوار ئووقیە! هەر دەڵێی زیو لەلاپاڵی ئەم چیایە دادەتاشن!

ئێستا هیچمان لەلا نیە بتدەینێ، بەڵام بەڵكو لەگەڵ كۆمەڵێك دا - بۆ جەنگ - ڕەوانەت بكەین‌و شتێكت دەستگیربێ. (واتە لەدەست كەوت (غنيمة)ی جەنگ شتێكت پێ ببڕێ).

دیارە ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەرئەوەی كە هاوكاری‌كردنی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ئەو كەسانەی كەژنیان هێناوە شتێكی زانراو بووە، بۆیە پیاوەكە داوای لێ‌كردوەو ئەویش ﷺ عوزری بۆ هێناوەتەوە كە ئێستا بەدەستمانەوە نیەو ڕێڕوونیشی كردوە كە لە ڕێ‌یەكی دیكەوە ئەو گرفتەی چارەسەر بكات.

## ٩-چارەسەری گیروگرفتی كەسانی بێ‌جێگاو ڕێگا وەك ڕێبوار و منداڵی دۆزراوە:

بێگومان جێگاو شوێنی تێدا حەوانەوەو نیشتەجێ‌بوون یەكێكە لە پێداویستی‌یە بنەڕەتی‌یەكانی هەر ئینسانێك، كەواتە هەركەسێك بێ‌جێگاو ڕێگابێ ئەوە بەئاتاج (محتاج) دادەنرێ‌و زەكاتی پێ‌دەدرێ بەتایبەت پشكی (ابن السبيل) كە تایبەتە بەوجۆرە كەسانەوە كە بێ‌ماڵ‌و حاڵ‌و بێ‌جێگاو ڕێگان، جا چ ڕێبوار بن چ هەركەسێكی دیكەی وەك ڕێبوار لە بێ جێگاو شوێنی‌دا، بەڵگەی ئەوەش كە گوتمان ئەوەیە كە زاناو پێشەوایانمان جێگاو ڕێگای تێدا نیشتەجێ‌بوون‌و حەوانەوەیان لەڕیزی خواردن‌و خواردنەوەو بەرگ‌و پۆشاك دا حیساب كردوە!

---

[508] بڕوانە: (نيل الأوطار) ج٦ص٣١٢.

[509] (أوقية) یەك (٤٠) درهەمە، كەواتە چوار ئووقیە (٤×٤٠=١٦٠) دەرهەمی زیوە.

ئەوەتا (ابن حزم) دەربارەی ئەو پێداویستی‌یە بنەڕەتی‌یانەی کە هەر کەسێك نەیبێ بەهەژارو نەدارو شایستەی زەکات وەرگرتن دادەنرێ نووسیویەتی:

(وفَرْضٌ على الأغنياءِ من اهل كل بَلَدٍ أن يقوموا بفقراءهم ويَجْبُرهم السُلطان على ذلك، إن لَمْ تَقُم الزكوات بِهم ولا في سائر أموالِ المسلمين بِهِم، فَيُقامُ لهم بما يأكلون من القوتِ الذي لابُدَّ منه، ومن اللباسِ للشتاءِ والصَيفِ بمثلِ ذلك، وبِمَسْكَنٍ يُكِنُّهُمْ من المَطَرِ والصيفِ والشمسِ وعيونِ المارّة..)[510]

واتە: وە لەسەر دەوڵەمەندانی هەر شوێنێك پێویستە کە پێداویستی‌یەکانی هەژارەکانیان دابین بکەن وە حوکمڕان لەسەر ئەوە ناچاریان دەکات، مادام زەکاتەکانی مسوڵمانان‌و ماڵ و سامانەکانی دیکەیان بەشیان نەکات، پێویستە بژێوێك کە بەبێ وی نازێن بۆیان دابین بکرێ، وە لەبەرگ‌و پۆشاکی زستانەو هاوینە بەهەمان شێوە، وەخانوویەك کە لەباران‌و گەرمای هاوین‌و تیشکی خۆرو چاوی ڕێبوار دەیانپارێزێ‌و دەیانشارێتەوە.

(نووي)یش لەوبارەوە نووسیویەتی: (قال أصحابنا: والمُعْتَبَرُ في قولنا: يَقَعَ مَوْقِعاً من كفايتِه: المطعم والملبَسُ والمَسْكَنُ وسائر مالا بُدَّ لَهُ منه على مايليق بحالِهِ بغير إسْرافٍ ولاإقْتارٍ لنَفْسِ الشَّخْصِ ولمن هو في نَفَقَتِهِ)[511]

واتە: هاوەڵانمان گوتوویانە: مەبەست لەو قسەیەمان کە دەڵێ: (دەبێ - ئەو ئەندازەیەی کەدەدرێ بە بابای هەژارو نەدار - هێندە ببێ کەبەشی بکات) دابین کردنی خۆراك‌و پۆشاك‌و خانوو وبەرەیەو هەر شتێکی دیکەیە کەپێویست بێ، بەوپێ‌یەی کەلێی دەوەشێتەوە، بەبێ زیادەڕۆیی‌و چرووکی هەم بۆ خودی خۆی‌و هەم بۆ ئەوانەش کە بەئەستۆیەوەن.

کەواتە: هەموو ئەوانەی کە لەبەر هەر هۆیەك بێ بێ‌جێگاو شوێنن‌و خانوو و جێگایەکیان نیە کە تێیدا بحەوێنەوەو نیشتەجێ بن ئەوە نەك هەر لەپشکی (ابن السبيل) کە بۆ ئەوجۆرە کەسانە تەرخان کراوە، بەڵکو لەپشکی (الفقراء والمساكين)یش دا هەق‌و مافی ئەوەیان هەیە کە خانوو و بەرەیەکی گونجاو و شیاو بۆ حاڵەت‌و پایەی کۆمەڵایەتی‌یان بۆ دابین‌و مسۆگەر بکرێ، بۆئەوەی لەئاوارەیی‌و بێ جێگاو شوێنی ڕزگاریان ببێ‌و لەدەردی کوشندەی ماڵ بەکۆڵەوە بوون‌و بێ‌ئۆقرەیی قوتاریان ببێ.

---

[510] بڕوانە: (المحلى شرح المجلى) ج٦ص١٠٥، ١٠٦، مسالە: ٧٢٥.

[511] بڕوانە: (المجموع) ج٦ص١٧٨.

شایانی باسیشه کەهەندێك لەزاناو شەرعزانانی هاوچەرخ رایان وایە کە منداڵی دۆزراوە (لقیط)یش حوکمی (ابن السبیل)ی هەیەو، پێم وایە بۆچوونەکەشیان دوور نیە، چونکە لەسەر رێگا (سبیل) دۆزراوەتەوەو (رێگا) بۆی بۆتە بابو دایكو خزمو کەس! ئنجا بێگومان منداڵی دۆزراوە ئەگەر نەشکەوێتە نێو جوغزی رێبوارو بێ‌جێگاو شوێنانی دیکەوە بەتەئکید دەکەوێتە خانەی هەژارو نەدارو لێقەوماوانەوەو هەرچۆن بێ هەر خاوەنی هەقو مافە لەزەکاتو لەماڵو سامانی دیکەی مسوڵمانانیش دا، مادام زەکات بەش نەکاتو (بیت المال)یش یان هەرنەبێ یان هێندەی تێدا نەبێ کە کیفایەتی ئەوجۆرە کەسانە بکات.

**١٠-دابین کردنی پێداویستی‌یەکانی قوتابی‌یانو لێکۆڵەرەوانی زانیاری‌یە پێویستەکان:**

یەکی دیکە لە بەرهەمو شوێنەوارە بەرزو بەپێزەکانی ماڵ بەخشین - بەتایبەت ماڵ بەخشینی فەرز - ئەوەیە کە جموجۆڵی زانستی لە کۆمەڵگادا گەشە پێ‌دەداتو بەرەو پێش دەبات، ئەویش بەهۆی ئەوەوە کە ژیانو گوزەرانو پێداویستی‌یە زانستی‌یەکانی قوتابی‌یانو مامۆستاو لێکۆڵەرەوانی زانیاری‌یە پێویستەکان (العلوم الواجبة) دابین دەکات!

واتە هەم ئەو قوتابی‌یانەی کە هەوڵی فێربوونو وەدەست هێنانی ئەوجۆرە زانیاری‌یانە دەدەن کەدینداری‌و دنیاداری‌یان دینو ژینی کۆمەڵگا پێیان ئاتاجە، وە هەم ئەو مامۆستاو زانایانەش کە سەرگەرمی فێرکردنو شارەزا کردن یان زیاتر توێژینەوەو قووڵ بوونەوەو پسپۆڕی (تخصص) پەیداکردنن لەوجۆرە زانیاری‌یە پێویستانەدا، هەرچەندە توانای کارکردنو کاسبی‌یان هەبێ، بەڵام مادام لەبەر زانستو زانیاری دەرفەتی بژێو پەیداکردنیان نەبێ، لەسەر کۆمەڵگا پێویستە کەژیانو گوزەرانو پێویستی‌یەکانی ئەو ئەرکە مەزنەیان بۆ دابینو مسۆگەر بکات وەك کتێبو[٥١٢] سەرچاوەو تاقیگا (مختبر) و نەخشەو هەر ئامێرو ئامرازێکی دیکەی پێویست.

جا بێگومان زەکات لەو بوارەدا رۆڵێکی زۆر گرنگ دەگێڕێ، چونکە زاناو شەرعزانان رایان گەیاندوە، کە ئەهلی زانست پشکیان لەزەکات دا هەیە، مادام لەسۆنگەی

---

[٥١٢] بروانە: (المجموع) ج٦ص١٧٩، ١٨٠، وە بروانە: (الأنصاف) ج٣ص١٦٥، ٢١٨، کە (فقه الزکاة) ج٢ص٥٧٠، لێی نەقل کردوە.

خۆیەکلاکردنەوەیانەوە بۆ وەرگرتنی یان فێرکردنی دەرفەتی کارو کاسبی‌یان نەبێ،[٥١٣] بەپێچەوانەی ئەوانەوە کە بۆ خواپەرستی (عبادة) خۆیان یەکلادەکەنەوەو (تَفَرُّغ)ی بۆدەکەن،[٥١٤] ئەو جیاوازی‌یەش لەنێوان (خۆ یەکلاکەرەوان بۆ زانیاری) و (خۆیەکلاکەرەوان بۆ خواپەرستی)دا[٥١٥] دوو هۆی هەن:

أ-خۆیەکلا کەرەوان بۆ زانیاری پێویست - کە وەك گوتمان هەرجۆرە زانیاری‌یەك دەگرێتەوە کەدین‌و ژینی کۆمەڵگا پێویستی‌یان پێ‌یێ هەبێ - سەرگەرمی جێبەجێ‌کردنی ئەرك‌و کارێکن کە لەسەر کۆمەڵگا پێویستەو فەرزی کیفایەیە، بەڵام خۆیەکلاکەرەوان بۆ خواپەرستی (المتفرغون للعبادة) سەرگەرمی کارێکی شەخسی‌و تایبەتی خۆیانن‌و بەس بۆ خۆیان لێی بەهرەمەند دەبن.

ب-زۆر جاران وەرگرتن‌و فێربوونی زانیاری‌و هەمیشە پێداقووڵ بوونەوەو تێدا پسپۆڕبوونی پەکی لەسەرخۆ بۆ یەکلاکردنەوە کەوتوە، بەڵام خواپەرستی (عبادە) کردن نەك هەر پەکی لەسەر ئەوە نەکەوتوە، بگرە ئەوجۆرە دینداری‌کردنە پێچەوانەی ڕێباز (سنة)ی پێغەمبەریشە ﷺ.

لەکۆتایی‌دا: لەکۆتای ئەم بەندی چوارەمەش دا کە بەتەواوبوونی لەتوێژینەوەی سێ‌یەمین پایەی ئیسلامەتی‌و دووەمین درووشمی خواپەرستی دەبینەوە، پێویستە ئەو ڕاستی‌یە مەزنەمان هەردەم لە بیر بێ کە (ماڵ بەخشین) هەرچەندە پلەو پایەیەکی بەرزو گرنگ‌و کاریگەری‌یەکی گەورەی هەیە لەئیسلامداو، لەژیان‌و گوزەرانی کۆمەڵگای مسوڵمان دا، بەڵام بێگومان هەر بەشێکەو پایەیەکە لە ئیسلام‌و درووشم‌و نیشانەیەکە لە درووشم‌و نیشانەکانی خواپەرستی‌و مسوڵمانەتی‌و بەبێ بەش‌و لایەنەکانی دیکەی ئایین‌و بەرنامەی خوای کار بەجێ کارێکی ئەوتۆی لەدەست نایەت‌و ئەنجام‌و بەرهەمی شایستەو پێویستی بەدوادا نایەت، چونکە، یەکەم: وەك گوتمان ماڵ‌و سامان بەخشین بەزەکاتیشەوە پایەیەکە لەپێنجان‌و درووشمێکە لەچەند درووشمان‌و بوارو لایەنێکە لەچەندان بوارو لایەنی ئیسلامەتی‌و هەر بەئەندازەی خۆی دەور دەبینێ‌و کەلێنی پایەو

---

[٥١٣] بڕوانە: (المجموع) ج٦ص١٧٧، ١٧٨، وە (ابو عبيد) لەکتێبی: (الأموال) دا هێناویەتی کە عومەر خوا لێی‌ڕازی‌بێ پاداشت‌و خەڵاتی پێشکەشی ئەوانە دەکرد کەقورئانی بەرێزیان لەبەر دەکرد، بڕوانە: (الأسلام والمشكلات السياسية المعاصرة) ص٣٢، تاليف الدكتور جمال الدين محمود محمد.

[٥١٤] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[٥١٥] دیارە لێرەدا مەبەست لەخواپەرستی (عبادة) چەمك و واتای تایبەتی‌و تەسکیەتی، کەجێبەجێ‌کردنی درووشمەکانیەتی‌و بەخواپەرستی‌یە ڕووتەکان (العبادات المحضة) ناسراون.

دروشمو لایەنەكانی دیكەی ئیسلام پڕ ناكاتەوە، دووەم: وەك چۆن ئەندامێكی جەستە هەرچەندە زۆر گرنگو كاریگەربێ، بەڵام بەبێ هاوكاریو تەبایی ئەندامەكانی دیكەی جەستە وەك پێویست دەوری خۆی بۆ نابینرێ، ماڵ بەخشینیش بەهەمان شێوە بەبێ پیادەكرانو كارپێكرانی سەرجەم ڕێساو یاساكانی ئیسلامو هاوكاری پێكەوە كردنو دەستبار بۆ یەكترگرتنی تێكڕای لایەنەكانی، هەر خودی خۆیشی وەك شەرع فەرمانی پێكردوەو ڕێو شوێنی بۆ داناوە جێبەجێ ناكرێ، ئایا كۆكردنەوەو دابەش كردنی زەكات كە گەورەترینو گرنگترین جۆرو شێوەی ماڵ بەخشینە بەشێوەیەكی مەركەزی، بەبێ هەبوونی قەوارەیەكی شەرعیو سیاسی بۆ ئیسلام و مسوڵمانان مەیسەر دەبێ؟!

وە ئایا ئەو هەموو بەرهەمو شوێنەوارە گەورەو گرنگانەی ماڵ بەخشین بەتایبەت لە ژیانو گوزەرانی كۆمەڵگادا بەبێ هەبوونی دەسەڵاتێكی شەرعیو چەندان دامو دەزگای پسپۆڕو كارامە لەبوارە جیاجیاكانی ژیانو گوزەران دا، دێنەدی؟!

وە ئایا ئەگەر گریمان بشگونجێ پشكی هەركام لە: هەژاران (الفقراء) و نەداران (والمساكين) و قەرزداران (والغارمين) جێبەجێبكرێ، پشكەكانی دیكەی زەكات، بەتایبەت كاربەدەستانی كۆكردنەوەی (العاملين عليها) و دڵڕاگیراوان (المؤلفة قلوبهم) و ڕێی خوا (في سبيل الله)[516] و ڕێبوار (ابن السبيل) بەبێ هەبوونی سیستەمێكی سیاسی، بەجێی خۆیان دەگەیەنرێن؟!

بێگومان نەخێر، كەوابێ با هەموو لایەكمان دڵنیابین كە ئسلام ئایینو بەرنامەیەكە كە بۆ بەڕێوەبرانو پیادەكرانی پەكی لەسەر پێكهێنانی قەوارەو دەسەڵاتێكی شەرعی كەوتووەو بەبێ حوكمڕانی كردن نەك هەموو ڕێساو یاساكانی بگرە تەنانەت دروشمێكی وەك ماڵ بەخشینو پایەیەكی وەك زەكاتیشی وەك پێویست جێبەجێ ناكرێ!!

لێرەش دا كۆتایی بەتوێژینەوەمان لەبارەی دروشمی دووەمی خواپەرستییەوە دێنینو دەچینە سەر باسو لێكۆڵینەوەی دروشمی سێیەم كە ڕۆژوو گرتنە.

---

[516] وەك پێشتریش لەبەشی یەكەم دا لەبڕگەی (زەكات بەكێ و بەكێ نادرێ؟!)دا باسمان كردوە، وشەی (في سبيل الله) هەرچەندە بەپلەی یەكەم جەنگاوەران (المقاتلين، الغزاة) دەگرێتەوە، بەڵام ڕای ڕاست تر ئەوەیە كە لەسەر ئەوان كورت هەڵنەهاتووەو وێڕای بەرژەوەندییە گشتییەكان، هەموو ئەو كەسانەش دەگرێتەوە كە بەرگری (دفاع) لەئیسلام دەكەن، چ بەدەست چ بەسامان چ بەقەڵەمو زمان چونكە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (جاهدوا المشركين بأموالكم وأنفسكم وألسِنَتِكُمْ) رواه أحمد وأبوداود والنسائي والحاكم وابن حبان، واتە: بەماڵو سامانو بەگیانو بەزمانتان دژی هاوبەش بۆ خوا دانەرەكان بجەنگن، بڕوانە: (المفصل في أحكام المرأة والبيت المسلم في الشريعة الأسلامية) ج١ص٤٣٦تا٤٤٢.

# ڕێ خۆشکردن

خوێنەری بەڕێز:

ڕۆژوو گرتن بەگشتی سێیەمین درووشم و نیشانەی خواپەرستیی ئینسانی مسوڵمان و ڕۆژووی مانگی ڕەمەزانیش چوارەمین پایەو کۆڵەکەی ئیسلامەتی‌یە، وەك چۆن هەرکام لە نوێژکردن و زەکات کە دووپایەو بنەڕەتی هەرەگەورەی ئیسلام و دیارترین و کاریگەرترین درووشمی خواپەرستیی مرۆڤی مسوڵمانن،خاوەنی چەند ئیمتیازو تایبەتمەندی‌یەك بوون کە لە باسەکانی ڕابردوودا ڕوونمان کردنەوە، ڕۆژووگرتنیش چەند تایبەتمەندی‌یەکی خۆی هەیە کە وایان لێ کردووە. بچێتە ڕیزی شایەتمان و نوێژو زەکاتەوەو یەکێك لە پایەو کۆڵەکەو نیشانە سەرەکی‌یەکانی دینداری و مسوڵمانەتی پێك بێنێ.

جا ئێمە خوا پشتیوان بێ ئەو درووشمە گەورەو گرنگەی خواپەرستی لە شەش بەندان دا دە توێژینەوە، بەم شێوەی خوارێ:

<u>بەندی یەکەم:</u> (ڕۆژووگرتن بەگشتی) کە لە حەوت خاڵان پێك دێ و هەرکام لە: پێناسەی ڕۆژووگرتن، پلەو پایەو پاداشتی، پایەو فەرزەکانی، جۆرەکانی ڕۆژووگرتن، ئاداب و ڕەوشتەکانی، موباحەکانی ڕۆژووگرتن، وە هەڵوەشێنەرەوەکان (مبطلات)ی، هەرکام لە خاڵێکی سەربەخۆدا توێژراونەوە.

<u>بەندی دووەم:</u> (ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان) کە ئەمیش لە دە (١٠) خاڵان پێکهاتوە، کە ئەمانەن:

پێناسەی ڕۆژووی ڕەمەزان و کاتی فەرز بوونی، چاکی‌ی و گەورەیی مانگی ڕەمەزان و ڕۆژووگرتن تێیدا، حوکمی گرتنی ڕۆژووی ڕەمەزان، چۆنیەتی ئیسپات کردنی هاتنی ڕەمەزان، خواپەرستی و طاعەتی ڕەمەزان، ئەوانەی مۆڵەتیان هەیە کە لەکاتی خۆیدا ڕۆژووی ڕەمەزان نەگرن، گێڕانەوەی ڕۆژووی ڕەمەزان، کەسێك بمرێ و ڕۆژووی ڕەمەزان قەرزدار بێ، چۆنیەتی ڕۆژووگرتنی ڕەمەزان لەو وڵاتانەدا کە ڕۆژیان تێدا کورت و شەویان درێژە یان بە پێچەوانەوە، شەوی قەدر (ليلة القدر).

بەندی سێیەم: (ڕۆژووە سوننەتەکان) کە هەموو ئەو جۆرە ڕۆژووە سوننەتانەی کە بە دەقێکی ڕاست (صحیح)ی سوننەتی پێغەمبەر ﷺ ئیسپات بوون باس کراون.

بەندی چوارەم: (ئەو ڕۆژانەی کە ڕۆژوو گرتنیان تێدا قەدەغە کراوە)، خراونە ڕوو.

بەندی پێنجەم: (ئیعتکاف) کە لەچەند خاڵێك دا هەم پێناسەی‌و هەم شەرعی بوونی‌و هەم کاتەکەی‌و هەم مەرجەکانی‌و هەم پایەکانی‌و هەم ئەو شتانە کە بۆی ڕەوان‌و، هەم ئەو شتانەی کە (اعتکاف)یان پێ هەڵدەوشێتەوەو، هەم گێڕانەوەی ئیعتکاف‌و، هەم لەخۆگرتن (نذر)ی ئیعتکاف لە مزگەوتێکی دیاری کراوداو هەم بەرهەمی ئیعتکاف توێژراونەوە.

بەندی شەشەم: (بەرهەم‌و سودەکانی ڕۆژووگرتن‌و چوونە ئیعتکافەوە) کە لەچەند خاڵێك دا بەرهەم‌و کەڵکەکانی مەعنەوی‌و ماددی‌و تاکی‌و کۆمەڵایەتی هەرکام لە ڕۆژووگرتن‌و چوونە ئیعتکاف ڕوون کراونەوە.

هیواداریشم کە بتوانین بەسەرجەم ئەو کورتە باسانەی کە لەو شەشە بەندانەدا خراونە ڕوو کە لە دەوری شەست (٦٠) خاڵ دان، ڕووی گەش‌و درەوشاوەی ڕۆژوو و ئیعتکاف وەك حەقیقەتی شەرعی‌یانەی خۆیان پێشان بدەین‌و، بە توێژینەوەی ئەم دروشمە گەورەو گرنگەی خواپەرستی (عبادة)یش زیاترو چاکتر مسوڵمانانی بەڕێزو خۆشەویست بەرەو دینداری‌و مسوڵمانەتی‌و کامڵ بوون هان بدەین.

# بەندی یەکەم: ڕۆژووگرتن بەگشتی

## ١-ڕۆژووگرتن (صیام) یانی چی!؟

ووشەی (صَوْم) لە ئەسڵی زمان دا وەك (راغب الاصفهاني) گوتوویەتی[١]: (الأمساكُ عن الفعل، مَطْعماً كان او كلاماً او مَشْياً) خۆگرتنەوەیە لە کردن، جا خواردن بێ یان قسە کردن بێ یان ڕۆیشتن. بەڵێ (صوم) واتە نەکردن بە موتڵەقی.

بەڵام لە زاراوی شەرع دا ئەوە سەرجەم زانایان ئاوا پێناسەیان کردوە[٢]: (إمْساك المكَلَّفُ بالنِّيَّةِ من الخَيْطِ الأبيض الى الخَيْطِ الأسْوَد عن تَناولِ الأطْيَبَيْنِ والأسْتِمْناء والأسْتِقاء) خۆگرتنەوەی ئینسان بە نیازو مەبەستەوە لە خواردنو خواردنەوەو سەرجێیو ئاوی خۆ هێنانەوەو خۆڕشاندنەوە لە سپێدەی بەرەبەیانەوە هەتا بوولێڵی ئێواریێ.

هەندێکیشیان [٣]بە مەبەستی کورت کردنەوەی پێناسەکە گووتویانە: (الصوم في الشرع: إمساك مخصوص في زمن مخصوصٍ عن شيءٍ مخصوصٍ بشرائط مَخْصوصة) واتە: ڕۆژووگرتن لە شەرع دا: خۆگرتنەوەیەکی تایبەتە لە کاتێکی تایبەت دا لە شتێکی تایبەت. بە چەند مەرجێکی تایبەتەوە.

ئەوەی گوتمان پێناسەی ڕۆژووگرتن بوو لە ئەسڵی زمانی عارەبیو لە ئیسلام دا، بەڵام بەپێی ئایەتی ژمارە (٢٦) سورەتی (مریم) دەردەکەوێ کە لەبەرنامەکانی پێش ئیسلام دا قسەنەکردن (سکوت)یش جۆرێك بووە لە ڕۆژووگرتن یان بەشێکی ڕۆژووگرتن بووە. وەك فەرموویەتی: ( إِنِّي نَذَرْتُ لِلرَّحْمَنِ صَوْماً فَلَنْ أُكَلِّمَ اليومَ إِنْسِيّاً) ، واتە: من ڕۆژووم بۆ خوای بەبەزەیی لە خۆم گرتوەو ئەمڕۆ هیچ کەسێك نادوێنم.

## ٢-پلەو پایەو پاداشتی ڕۆژووگرتن:

خوای پەروەردگار فەرموویەتی: (يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُتِبَ عَلَيْكُمْ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ)البقرە:١٨٣، واتە ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە ڕۆژووگرتنتان لەسەر پێویست کراوە وەك چۆن لەسەر ئەوانەی پێش ئێوە نووسرابوو، بۆ ئەوەی پارێزکاری بکەن. کەواتە: ڕۆژووگرتن یەکێکە لە هۆکارەکانی پەیدابوونو زێدە بوونی پارێزکاری.

---

[١] بڕوانە: (معجم مفردات الفاظ القرآن) من ص٢٩٠، ٢٩١.

[٢] بڕوانە: (معجم مفردات الفاظ القرآن) من ص٢٩٠، ٢٩١.

[٣] بڕوانە: (فتح الباري) ج٤ ص٥٩٢، وە: (شرح صحيح مسلم) ج٥ ص ٢٩٤٢ ط١ سنة ١٩٦٦.

پێغەمبەریش ﷺ لە فەرموودەیەکی قودسی دا فەرموویەتی( قال الله عزّ وجلّ: كلُّ عمَلِ ابْنِ آدم لَهُ الا الصّيامُ فانَّه لي وأنا أجْزي به، والصّيامُ جنَّةٌ فاذا كـان يـومُ صَـوْمِ أحدِكُـمْ فـلا يَرْفُـثْ و لايَصْخَبْ ولا يَجْهَلْ، فانْ شاتَمَهُ أحَدٌ أو قاتَلَهُ فلْيَقُلْ إنّي صائِمٌ مرّتين، والّذي نَفْسُ محمدٍ بِيَدِه لَخُلُوفُ فَمِ الصّائِمِ أَطْيَبُ عِنْدَ اللهِ يومَ القيامَةِ مِنْ رِيْحِ المِسْكِ، وللصّـائِم فَرْحَتـان يَفْرَحُـهما، إذا أفْطَـرَ فَـرِحَ بِفِطْرِه، وإذا لَقِيَ رَبَّه فَرِحَ بِصَوْمِه) متفق عليه عن ابي مريرة ﷺ. واتە: خوای باڵا دەستو خاوەن شکۆ فەرموویەتی: هەموو کردەوەکانی ئادەمیزاد بۆ خۆیەتی بێجگە لە ڕۆژووگرتن، ئەوە تەنیا بۆمنەو خۆشم پاداشتی لەسـەر دەدەمـەوە، وە ڕۆژووگرتـن قـەڵغانو پـارێزەرە لـە گوناهو هەڵە. جا ئەگەر ڕۆژی بەڕۆژوو بوونی یـەکێکتان بـوو با قسـەی ناشـرینو قـڕەو گاڵەو نەفامی نەکات، وە ئەگەر کەسێکیش قسەی پێ گوت یان شەڕی پێ فرۆشت بابڵێ: من بەڕۆژووم با دووکەڕەتان وابڵـێ، سوێند بـەو زاتـەی کە گیـانی موحەممەدی بەدەسـتە بۆنـی گـۆڕاوی زاری ڕۆژووەوان لـەلای خـوا لـە ڕۆژی قیامـەتدا لـەبۆنی میسـك خۆشـترە، ڕۆژوگر دووجار خۆشحاڵ دەبێ کاتێك ڕۆژوی شکاند بە ڕۆژوو شکاندنەکەی خۆشحاڵ دەبێ، وە کاتێکیش بەدیداری پەروەردگاری شاد بوو بەڕۆژووەکەی خۆشحاڵ دەبێ.

شایانی باسیشە کە زانایان دەربارەی ڕستەی: (كُلُّ عَمَلِ ابْنِ آدَمَ لَـهُ إلاّ الصِّيـامَ فانـهُ لي وانا أجْزي بهِ) زۆر شتیان گوتوە، خاوەنی (فتح البـاري)[4] دە ڕای زانایـانی نـەقڵ کـردوون، کە وا پێ دەچێ یەکەمیان کە خۆیشی پەسەندی کردوە، لـە هـەموویان بـەهێزتر بێـت، ئەویش ئەوەیە کە مەبەست لـەوە کـە ڕۆژووگرتـن تایبەتـە بـە خـواوەو هـەر بۆخۆیشـی پاداشتی دەداتەوە، ئەوەیە کە هەموو کردەوە چاکەکانی دیکە دەگونجێ ڕیابازییان تێکەڵ بێ جگە لە ڕۆژوو، چونکە ئەگەر ئینسان بۆ خوای نەبێ دەتوانـێ بەدزی خـەڵك خواردنو خواردنەوە بخواتو واش پێشان بدات کە بەڕۆژوویـە، کە واتـە ڕۆژوو کـە گـیرا هـەر بـۆ خوایەو مەگەر چۆن دەنا کە لێنی ڕیای تێدانیە.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إنَّ في الجَنَّةِ باباً يقالُ لَهُ الرَّيّانُ، يَدْخُلُ مِنْـهُ الصّـائِمون يومَ القيامة لا يَدْخُلُ مِنْهُ أحدٌ غَيْرُهُمْ، يقالُ أيْنَ الصّائِمونَ!؟ فيَقُومونَ لا يَدْخُلُ مِنْهُ أحدٌ غيرُهُمْ، فـاذا دَخَلوا أُغْلِقَ فلَمْ يَدْخُلْ مِنْهُ أحَدٌ) متفق عليه عن سهل بن سعد.

واتـە: بەهەشـت دەرگایـەکی هەیـە پـێی دەگوتـرێ (ڕەییـان) ڕۆژی قیامـەتێ ڕۆژووگـران لێیەوە دەچنە ژوورێو بێجگە لەوان کەسـی دیکە پێیدا ناچێتە ژوورێ، دەگوتـرێ: کوان ڕۆژووگران؟ جا ئەوان هەڵدەستنو جگە لـەوان کەسـی دیکـە لێیـەوە ناچێتـە ژورێ، جـا کاتێك ئەوان چوونە ژوورێ دادەخرێو هیچ کەسی دیکە لێیەوە ناچێتە ژوور.

---

[4] بڕوانە (فتح الباري) ج٤ ص٥٩٨ تا ٦٠٢.

## ٣-پایەوفەرزەکانی ڕۆژوو:

ڕۆژووگرتن دووپایەی هەن کە لێیان پێك دێ:

یەکەم: خۆگرتنەوە لەو شتانەی کە ڕۆژوویان پێ دەشکێ لە دەرکەوتنی سپێدەی بەرەبەیانەوە هەتا ئاوابوونی خۆر، وەك خوای زانا فەرموویەتی: (أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ الصِّيَامِ الرَّفَثُ إِلَى نِسَائِكُمْ هُنَّ لِبَاسٌ لَكُمْ وَأَنْتُمْ لِبَاسٌ لَهُنَّ عَلِمَ اللَّهُ أَنَّكُمْ كُنْتُمْ تَخْتَانُونَ أَنْفُسَكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ وَعَفَا عَنْكُمْ فَالْآنَ بَاشِرُوهُنَّ وَابْتَغُوا مَا كَتَبَ اللَّهُ لَكُمْ وَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الْأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الْأَسْوَدِ مِنَ الْفَجْرِ ثُمَّ أَتِمُّوا الصِّيَامَ إِلَى اللَّيْلِ....﴾ البقرة :١٨٧،

واتە: جا ئێستا بچنە لای ژنەکانتانو مەبەست تان ئەوەبێ کە خوا بۆی نووسیوون- لە منداڵی صاڵحو داوێن پاك ڕاگرتنی خۆتانو هاوسەرانتان- وە بخۆنو بخۆنەوە هەتا دەزووی سپی بەرە بەیانتان لە دەزووی ڕەش بۆ جیا دەبێتە، پاشان هەتا شەوگار دێ ڕۆژووگرتنەکەتان تەواو بکەن.

دیارە مەبەستیش لە دەزووی سپیودەزوی ڕەش سپیەتی ڕۆژگارو ڕەشیەتی شەوگارە، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتێك دا (عَدِي بن حاتم الطائي) لەو مەسەلەیەدا بە هەڵەدا چوو بوو و بۆی ڕاست کردەوەو پێی فەرموو: (إنما ذلك سَوادُ الليْل وبَياضُ النَّهارِ) رواه البخاري ومسلم.

دووەم: نیازو مەبەست (نية) هەبوون، چونکە خوای کاربەجێ فەرموویەتی: (وَمَا أُمِرُوا إِلا لِيَعْبُدُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ حُنَفَاءَ وَيُقِيمُوا الصَّلَاةَ وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ وَذَلِكَ دِينُ الْقَيِّمَةِ) البيّنة: ٥، پێغەمبەری خواش ﷺ فەرموویەتی:(إنَّما الأعْمالُ بالنيات وإنَّما لكل أمرئٍ ما نَوىْ..) متفق عليه.

ئاشکرایە کە نیەتیش بەدڵەو هیچ پەیوەندی بەزمانەوە نیە وەك لە باسی نیەت هێنانی نوێژدا ڕوونمان کردۆتەوە، بەڵام حەتمەن دەبێ ئەو نیازو مەبەست بەدڵ دا هاتنە لە بەشێکی شەوگار دابێ، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَنْ لَمْ يُجْمِعِ الصِّيامَ قَبْلَ الفجر فلا صيامَ لَهُ) رواه احمد و اصحاب السنن و صحّحَهُ ابن خزيمة وابن حبان.

واتە: هەرکەسێك پێش بەرەبەیان دڵی لەسەر ڕۆژووگرتن ساغ نەکردبێتەوە ڕۆژووگرتنەکەی دروست نیە.

جا بۆ ڕۆژووی فەرز - کە ڕەمەزانە - ئەوە زۆربەی هەرە زۆری نزیك بەیەکدەنگی زانایان رایان وایە کە پێویستە نیەتەکەی لەشەودا بێ*. بەڵام بۆ ڕۆژووی سوننەت زۆربەیان رایان وایە کە نیەتەکەی مەرج نیە لەشەودا بێو بەڕۆژیش دروستە ئەوەندە

---

* بڕوانە: (فتح الباري) ج٤ ص ٦٠٤، ٦٤١.

هەیە بەشێکیان کە (أبو حنیفة و شافعي)یان لە نێودان دەڵێن دەبێ پێش نیوەڕۆ بێ، بەڵام هەندێکیان کە (احمد) یەکێکیانە، دەڵێن پێش نیوەڕۆ بێ یان دوای نیوەڕۆ یەکسانەو هەر دروستە، هەندێکیشیان وەك (مالك و لیث و ابن ابي ذئب) دەڵێن: ڕۆژووی سوننەتیش وەك فەرز وایەو دەبێ لەشەوێدا نیازی گرتنی لەدڵ گیرابێ[٦]، بەڵام بێگومان ڕای زۆربەی زانایان ڕاستترەو فەرموودەکەی پێشوش مەبەستی پێ ڕۆژووی ڕەمەزانە، چونکە عائیشە خوای لێ ڕازی بێ ئەم دەقەی لێ گێڕراوەتەوەو گوتوویەتی:

(دَخَلَ عَلَيَّ رسولُ الله ﷺ ذات يوم، فقال: هل عندكم شيءٌ؟ قلنا: لا، قال: فَإِنِّي إذاً صائمٌ)

رواه مسلم واصحاب السنن عن عائشة بن طلحة ﷺ.

واتە: ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ لێم وەژوور کەوت، فەرمووی: ئایا شتێکتان خواردن لەلایە؟ گوتمان نەء، فەرمووی: دە کەواتە بەڕۆژووم.

## ٤-جۆرەکانی ڕۆژووگرتن:

ڕۆژووگرتن بەگشتی دوو جۆرە:

یەکەم: ڕۆژووگرتنی فەرز.

دووەم: ڕۆژووگرتنی سوننەت.

ئینجا ڕۆژووی فەرزیش سێ جۆرە:

أ-ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان. کە لەبەندێکی سەربەخۆدا باس دەکەین.

ب-ڕۆژووی کەفارەت (صوم الكفّارة)، وەك کەفارەتی کوشتنی هەڵە (القتل الخطأ) و سوێند شکاندن (حَنْثُ اليمين)و شکاندنی ڕۆژووی ڕەمەزان بە جیماع (إفطار رمضان بالجماع) و ظیهار کردن لە ژن (الظّهار من الزّوجة)[٧].

ج-ڕۆژوو لەخۆ گرتن (صوم النذر)، ئەویش ئەوەیە کە یەکێك ڕۆژێك یان زیاتر ڕۆژووگرتن لە خۆی بگرێ بۆ خوا، ئەگەر فلانە کارەی سەری گرت یان فلانە بەڵایەی لە کۆڵ بۆوە.

ڕۆژووی سوننەتیش جۆری زۆرن و خوایاربێ ئەمیش لە بەندێکی سەربەخۆدا دەتوێژینەوە.





[٦] سەرچاوەی پێوو هەمان بەرگ و لاپەرە.

[٧] ڕاوییەکە (انس بن مالك)ە خوا لێی ڕازی بێ.

## ٥-ئاداب و ڕەوشتەکانی ڕۆژووگرتن:

بۆ بابای ڕۆژووەوان چەند شتێك سوننەت و پەسەندن و بەئەدەب و ڕەوشتێکی بەرزی ئیسلامی دادەنرێن ڕۆژووەکە چ فەرزبێ چ سوننەت:

یەك: پارشێوکردن (السَّحور) کە ئوممەت لەسەر سوننەت بوونی یەکدەنگە، چونکە چەندان فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ لەوبارەوە هەن، بۆ وێنە:

(تَسَحَّروا فانَّ في السُّحُور بَرَكَةً) رواه البخاري ومسلم عن انس ﷺ.

واتە: پارشێو بکەن چونکە پارشێوکردن پیت و پێزی تێدایە.

دیارە پارشێو کردنیش بە خواردن و خواردنەوەی کەم یان زۆر دێتە دی، ئەگەر قومە ئاوێکیش بێ، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (السحورُ بركةٌ، فلا تَدَعُوهُ ولو أن يَجَرَّعَ أحَدُكمْ جُرْعَةَ ماءٍ..) رواه احمد عن سعيد الخدري ﷺ.

واتە: پارشێو کردن بەرەکەتەو وازی لێ مەهێنن، ئەگەر بەس ئەوەندەش بێ کە یەکێکتان قومە ئاوێك بنۆشێ.

کاتی پارشێوکردنیش لە نیوەشەوەوەیە تاکو بەرەبەیان چونکە: (زید بن ثابت) خوالێی ڕازی بێ گێڕاویەتەوە: (تَسَحَّرْنا مع رسول الله ﷺ ثُم قُمْنا الىٰ الصَّلاة، قُلْتُ: كَمْ كانَ قَدَرُ بَيْنَهما؟! قالَ خَمْسين آية) متفق عليه، واتە: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا پارشێومان کرد پاشان هەستاین بۆ نوێژ، -ڕاوی دەڵێ- گوتم: ئەندازەی نێوانی پارشێو و نوێژەکە چەند بوو؟! گوتی: هێندەی - خوێندنی- پەنجا ئایەت بوو.

واش پەسەندە کە پارشێو کردن دوابخرێ بۆ کۆتایی شەو، چونکە (عمرو بن ميمون) گوتوویەتی: (كان أَصْحابُ محمَّدٍ ﷺ أعْجَلَ الناسِ إفْطاراً وأَبطأَهُمْ سُحوراً) رواه البيهقي بسند صحيح، واتە: هاوەڵاتی موحەمەد ﷺ -خوا لێیان ڕازی بێ- لەهەموو کەس خێراتر ڕۆژوویان دەشکاند و درەنگتر پارشێویان دەکرد.

ئینجا هەرچەندە ئیحتیاط کردن بۆ ئەوە کە پارشێوەکەی نەکەوێتە دوای بەرەبەیان پێویستە بەڵام هەتا لە بەرەبەیانیش دڵنیا دەبێ ڕێی خواردن و خواردنەوەی هەر هەیە[8].

دوو: پەلەکردن لەبەربانگ کردنەوەدا:

پێغەمبەری خوا ﷺ لەوەبارەوە فەرموویەتی: (لايزالُ الناسُ بخَيرٍ ما عجَّلوا الفطْرَ) رواه البخاري ومسلم عن سهل بن سعد ﷺ، واتە: خەڵکی مسوڵمان هەتا بەربانگ بەزوویی بکەنەوە حاڵیان هەر باشە.

---

[8] ئەمە ڕای زۆربەی زانایانە، بڕوانە (فقه السنة) ج١ ص٦٠٠/ وە: (شرح صحيح مسلم)ج٥ ص٢٩٢٧.

(نووي) له ڕاڤەی ئەم فەرموودەیەدا گوتوویەتی[1]: (فيه الحَثُّ على تعجيله بعد تَحُّقق غُروبِ الشَّمس، ومَعْناه: لايزالُ أَمْرُ الأمَّة مُنْتَظِماً وهم بخيرٍ ماداموا مُحافِظِين على هذه السنة، وإذا أخروهُ كان ذلك علامة على فَسادٍ يقعون فيه)

واته: هاندانی تێدایه بۆ زوو بەربانگ کردنەوه پاش دڵنیا بوون له ئاوا بوونی خۆر وه مەبەستی ئەوەیه که کاروباری ئوممەت هەر ڕێكوپێكەو حاڵیان خێرداره هەتا لەسەر ئەو سوننەته دەوام بکەن، جا هەرکات بەربانگیان دواخست ئەوه نیشانەی حاڵەتێکی خراپه که تێی کەوتوون.

واش پەسەنده که ئینسان به چەند دەنکه خورمایەك بەربانگ بکاتەوه، ئەگەر نەبوو بەئاو ڕۆژووەکەی بشکێنێ، (انس) خوالێی ڕازی بێ لەوبارەوه گوتوویەتی: (كان رسول الله ﷺ يُفْطِرُ على رُطَبَاتٍ قبل أن يُصَلِّي، فان لَمْ تكُنَّ فعليُ تَمراتٍ فإن لم تكنْ حَسا حَسَواتٍ من ماءٍ) رواه ابو داود و الحاكم وصَحَّحهُ والترمذي وحَسَّنَهُ. واته: پێغەمبەری خوا ﷺ عادەتی وا بوو بەچەند دەنکه فەریکه خورمایەك بەربانگی دەکردەوه بەرلەوەی نوێژی شێوانی کردبایه، ئەگەرنا بەچەند دەنکه خورمایەك، ئەگەر نەبووایه چەند قومێك ئاوی نۆش دەکرد.

بەڵام ئەگەر خواردنی ئێواره سازکرابوو ئەوه چاکتر وایه خواردنەکەی بخوات ئەوجار نوێژەکەی بکات، چونکه پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (اذا قُدِّمَ العَشاءُ فَأبدوا به قبل صلاة المغرب ولا تَعجَلوا عن عَشاءِكُمْ) رواه الشيخان عن انس. واته: ئەگەر خواردنی ئێواره دانرا بەرلەوەی نوێژی شێوان بکەن بیخۆن، وه پەله مەکەن هەتا نانی ئێوارەتان دەخۆن.

<u>سێ</u>: پاڕانەوەو دووعا کردن لەکاتی بەربانگ کردنەوەدا:

پێغەمبەر ﷺ لەوبارەوه فەرموویەتی: (للصائمِ عِنْدَ فِطْرِهِ دَعْوَةٌ لا تُرَدُّ) رواه ابن ماجة عن عبدالله بن عمرو بن العاص، واته: ڕۆژووەوان لەدەمی بەربانگ دا پاڕانەوەیەکی هەیه ڕەت ناکرێتەوه.

وه (عبدالله بن عمر) خوا لێیان ڕازی بێ گێراویەتەوه که پێغەمبەر ﷺ لە دەمی بەربانگ کردنەوەدا دەیفەرموو: (ذَهَبَ الظَّمأُ وابْتَلَّتْ العُروقُ وثَبَتَ الأَجْرُ إِنْ شاءَ الله) رواه ابو داود وحسَّنه الالباني، واته: تینوێتی نەماو ڕەگو دەمارەکان تەڕ بوونو ئەگەر خواش حەز بکات پاداشتەکەش مسۆگەر بووه؛ وه بەگوێرەی فەرموودەی: (ثلاثة لا تُرَدُّ دَعْوَتُهم، الصَائمُ حتى يُفْطِرَ والأمامُ العادِلُ والمَظْلُومُ) رواه الترمذي بسند حسن، واته: سێ جۆره کەس پاڕانەوەیان گیرایه: ڕۆژووه وان تا بەربانگ دەکاتەوه، وه پێشەوای دادگەر، وه بابای ستەم لێکراو.

بەڵێ بەپێی ئەم فەرموودەیه بابای ڕۆژووگر له میانەی ڕۆژووەکەش دا هەرپاڕانەوەی گیرایه نەك تەنیا لەدەمی بەربانگ دا.

---

[1] بڕوانه: (شرح صحيح مسلم) ج٥ ص٢٩٨٢.

**چوار:** خۆپاراستن لەهەر خولیاو قسەو ڕەفتارێك کەخێری ڕۆژوەکە کەم دەکاتەوە:

پێغەمبەر ﷺ لەوبارەوە فەرموودەی زۆرن بۆ وێنە:

*(عن أبي هريرة ﷺ أن النب ي ﷺ قال: مَنْ لَمْ يَدَعْ قَوْلَ الزُّوْرِ[10] والعَمَلَ بِهِ فَلَيْسَ لِلّهِ حاجَةٌ في أن يَدَعَ طعامَهُ وشرابَهُ) رواه البخاري وأصحاب السنن.

واتە: هەرکەسێك قسەو ڕەفتاری درۆوو هەڵە وێڵ نەکات خوا پێویستی بە نەخواردنو نەخواردنەوەکەی نیە.

*(رُبَّ صائمٍ لَيْسَ لَهُ من صيامِهِ إلاّ الجُوعَ، وربَّ قائمٍ لَيْسَ لَهُ مِنْ قيامِهِ إلاّ السَّهَرُ) رواه النسائي وابن ماجة والحاكم وقال: صحيح على شرط البخاري.

واتە: زۆر ڕۆژووگر لەڕۆژوو گرتنەکەی بەس برسیەتی پێدەبڕێو، زۆر شەونوێژ کەریش لەشەو نوێژکردنەکەی تەنیا شەونخوونی بۆ دەمێنێتەوە.

**پێنج:** سیواك کردن:

سیواك کردن یەکێکە لەسوننەتە داکۆکی لەسەرکراوەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ، لەوبارەوە فەرموویەتی: (لولا أن أشُقَّ علىٰ أمّتي لأَمَرتُهمْ بالسِّواكِ عِنْدَ كُلِّ وُضوءٍ) رواه مالك والشافعي والبيهقي والحاكم، واتە: ئەگەر لەبەرئەوە نەبووایە کەئۆممەتەکەم سەغڵەت بکەم لەدەمی هەموو دەستنوێژگرتنێك فەرمانم پێدەکردن سیواك بکەن.

جا هەرچەندە هەندێك لەزانایان ڕایان وایە کە بۆ بابای ڕۆژووەوان دوای نیوەڕۆیان سیواك کردن نەك سوننەت نیە بەڵکو ناپەسەند (مكروه)یشە! بەڵام ڕای زۆر بە ڕاست ترە کە بەموتڵەقی بەسوننەتی دەزانن و ئەم فەرموودەیەش بە بەڵگە دێننەوە:

*(عن عبدالله بن عامر بن ربيعة عن أبيه قال: رأيتُ رسولَ اللهِ ﷺ مالم أحْصِ يَتَسَوَّكُ وهو صائِمٌ) رواه الترمذي وأحمد وأبوداود. واتە: ئەوەندە جاران کە بۆم ناژمێررێن پێغەمبەری خوام ﷺ بینیوە کە بەڕۆژوو بووەو سیواکی کردوە. ئەمەش ڕای هەرکام لە (ثوري وأوزاعي و أبوحنيفة وشافعي)یە[11].



[10] وشەی (زُور) بەمانای درۆ (كَذِب) و ناهەق (باطل) دێ چ قسە بێ چ کردەوە، بڕوانە (المعجم الوسيط) وشەی (زور).

[11] بڕوانە: (المفصّل) ج٢ص٨٩، ٩٠، وە بڕوانە: (الفقه الأسلامي..) ج٣ص١٦٩١، ط٤.

## ٦-ئەو شتانەی بۆ ڕۆژووەوان موباح و ڕەوان:

یەك: خۆشۆردن بۆ خۆفێنك كردنەوە یان خۆپاككردنەوە، چونكە (عائشة) خوا لێی ڕازیبێ گێڕاویەتەوە: (أنَّ النبيَّ ﷺ كان يُصْبِحُ جُنُباً وهو صائمٌ ثم يَغْتَسِلُ) متفق عليه. واتە: پێغەمبەر ﷺ جاری وا بووە كەڕۆژی لێبۆتەوە بەڕۆژووش بووە لەش پیس بووە پاشان خۆی شۆردوە.

هەروەها (ابوبكر بن عبدالرحمن) لەهەندێك لەهاوەڵانی پێغەمبەری ﷺ بیستوە كە گوتوویەتی: (لقد رأيْتُ رسولَ الله ﷺ يَصُبُّ على رأسِهِ الماءَ وهو صائِمٌ من العَطَشِ أو من الحَرِّ) رواه احمد ومالك وابوداود بأسناد صحيح؛ واتە: پێغەمبەری خوام ﷺ دی كە بەڕۆژوو بوو لەبەر تینوێتی یان گەرما ئاوی بەسەر خۆیدا دەكرد.

دوو: چاو ڕشتن یان دڵۆپە (قطرة) ی دەرمان لەچاوكردن ئەگەر تام و چێژیشی بچێتە زاری‌یەوە چونكە چاو پەیوەندی بەگەدەوە نیە، ئەمەش ڕای شافیعی‌یەكانەو (ابن المنذر) یش لە (عطاء و حسن نخعي و اوزاعي و ابو حنيفة و ابو ثور) گێڕاویەتەوە، وە مەزهەبی (داود الظاهري) یشەو (ترمذي)یش گوتوویەتی:

لەوبارەوە هیچ شتێكی ڕاست (صحيح) لەپێغەمبەرەوە ﷺ نەهاتوە[12].

سێ: ماچ كردنی هاوسەر بەمەرجێك خۆی كۆنتڕۆڵ بكات و لەخۆی دڵنیابێ، ئەگەرنا دروست نیە، بەڵگەی دروست بوونیشی بەمەرجی لەخۆ دڵنیابوون ئەو دەقەیە كە (عائشة) خوا لێی ڕازی بێ هێناویەتی: (كان النبيُّ ﷺ يُقَبِّلُ ويُباشِرُ وهو صائِمٌ وكانَ أمْلَكَكُمْ لِأَرَبِه) متفق عليه، واتە پێغەمبەر ﷺ هاوسەری خۆی ماچ دەكردو دەستی لەدەستی دەداو[13] بەڕۆژووش بوو، وە لەهەمووتان زیاتر ئارەزووی خۆی مەرزەم دەكرد.

چوار: كەڵەشاخ لەخۆگرتن و دەرزی لەخۆدان و خوێن تێكران و خوێن دان، چونكە (بخاري) لە (ابن عباس) ەوە خوا لێیان ڕازی بێ گێڕاویەتەوە كە گوتوویەتی: (إحْتَجَمَ النبيُّ ﷺ وهو صائِمٌ) واتە: پێغەمبەر بەڕۆژوو بوو و كەڵەشاخیشی لەخۆیگرت.

هەروەها (ثابت البناني) لە (انس بن مالك)ی خوا لێی ڕازی بێ پرسیوە: (أكُنتُمْ تكرهون الحجامَةَ للصَّائِمِ؟ قال: لا إلاّ مِنْ أجْلِ الضَّعْفِ) رواه البخاري، واتە: ئایا كەڵەشاختان بۆ ڕۆژووەوان پێ خراپ بوو؟ گوتی: نەء مەگەر لەبەر بێهێزی[14].

---

[12] بڕوانە: (فقه السنة) ج١ص٦٠٤.

[13] (مباشرة) واتە: پێك كەوتنی پێست (بشرة)ی یەكێك بەهی یەكێكی دیكە.

[14] بڕوانە: (فتح الباري) ج٤ص٦٨٢، وە بڕوانە: (المجموع) ج٦ص٣٢٢.

**پێنج:** ئاو لەزارو لووت وەردان (المَضْمَضة والأستِنشاق) ، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (وبالِغْ في الأستِنْشاق الاّ أنْ تكون صائِماً) رواه اصحاب السنن، واتە: وە – لەکاتی دەست نوێژگرتن دا – باش ئاو لەلووت وەربدە مەگەر بەڕۆژووبی.

وە ئەگەر لەکاتی ئاو لەدەمو لووت وەرکردن دا بێئەوەی بیەوێ ئاو لەگەرووی چووە خوارێ ئەوە بەرای (أوزاعيء إسحاق) و (شافعي وأحمد)یش یەکی لەقسەیەکیان دا ڕۆژووەکەی زیانی پێ ناگات، بەلاّم (ابو حنيفة ومالك) رایان وایە کە ڕۆژووەکەی دەشکێ، بەلّگەشیان ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ زیادەڕۆیی (مبالغة) کردنی لەئاو لەلووتو زار وەردان دا قەدەغە کردوە[١٥]، بەلاّم واپێدەچێ رای یەکەم ڕاست تر بێت، چونکە بەدەست خۆی نەبووەو مەرجیش نیە (نهي)ەکەی پێغەمبەر ﷺ بۆ حەرام کردن (تحريم) بێت بەلّکو نیزیکتر ئەوەیە کە بۆ ناپەسەندی (كراهية) بێت.

**شەش:** ڕۆژکردنەوە بەلەش پیسی، وەك پێشتر لە (عائشة) وە هێنامان کەجاری وا بووە پێغەمبەر ﷺ خۆشۆردنی لەش پیسی (غسل الجنابة)ی لەسەر بووەو ڕۆژی لێبۆتەوە ئەوجار خۆی شۆردوە، (بخاري و مسلم) گێراویانەتەوە.

**حەوت:** ئافرەتی زەیسانداروو حەیزدار (النُفَساء والحائض) ئەگەر لەشەوێدا پاکبوونەوە دروستە خۆشۆردنەکەیان دوابخەن تا ڕۆژ دەبێتەوەو بەڕۆژووش بن، پاشان بۆ نوێژ خۆیان بشۆن[١٦].

**هەشت:** هەروەها قووت دانی ئەو شتانەی کە بابای ڕۆژووەوان بۆی نالوێ خۆی لێیان بپارێزێ موباحو ڕەوایە وەك: تۆزو خۆلّی ڕێوبان، تۆزی ئارد، مێشو مێشوولە، تفو بەلّغەمو وێنەی ئەمانە[١٧].

بەلاّم بنێشت (علْك) جوون ئەگەر هیچ تامی نەبێو پارچەی لێجیانەبنەوە ئەوە زۆربەی زانایان کە حەنەفییەکانو شافیعییەکانو حەنبەلییەکانیان لەنێودان، بەناپەسەندی دەزانن‌و، هەشیانە بەموباحی دەزانن[١٨]. بەلاّم هەموویان لەسەر ئەوە ڕێك کەوتوون کە ئەگەر تامو چێژی یان پارچەی لێجیابێتەوەو بچێتە گەدەوە ڕۆژوو بەتاڵ دەکاتەوە[١٩].

---

[١٥] بڕوانە: (المغني والشرح الكبير) ج٣ص٤٤، ٤٥.

[١٦] بڕوانە: (الفقه الأسلامي) ج٣ص١٨٨٦، ١٨٨٧، ط٤.

[١٧] بڕوانە: (المجموع) ج٦ص٣٢٦ تا ٣٢٩، هەروەها بڕوانە: (فتح الباري) ج٤ص٦٥٨.

[١٨] بڕوانە(المجموع) ج٦ص٣٦٩، وە (المغني والشرح الكبير) ج٣ص٤٥، ٤٦، وە: (فقه السنة) ج١ص٦١٠.

[١٩] بڕوانە: (فقه السنة) ج١ص٦٠٦، وە (الفقه الأسلامي) ج٣ص١٧٠٥تا ١٧٣٤، ط٤.

نۆ: تاماندن (تامکردن) لەخواردن بۆ کابان، یان بۆ کڕیاری خواردنێك، زۆربەی زانایان بەدروست (جائز)ی دەزانن[20]، بەڵکو شافیعی‌یەکان بەڕەوای دەزانن کە باب یان دایك خواردن بۆ منداڵەکەیان بجوونو پاشان بیدەنێ، دیارە بەمەرجێك هیچی لەگەروی ئەودیو نەبێت[21].

دە: دەربارەی خۆ بۆنخۆش کردنو بۆنکردنی بۆنی خۆشیش، هەرچەندە زۆر لەشەرعزانان بەناپەسەند (مکروه)ی دەزانن، بەلام ئەوەندەی گەڕامو سەنجم دا هیچ بەڵگەیەکم نەدی کەبایی ئیسپات کردنی ئەو دەعوایە بکات، بۆیە پێم وایە ئەو ڕایە ڕاستو تەواوە کە بۆنکردنیش بەموباح دەزانێ[22]، چونکی حوکمی شەرعی بە بەڵگە نەبێ ناچەسپێ.

## ٧-هەڵوەشێنەرەوەکان (مبطلات) ی ڕۆژوو:

یەكو دوو: خواردنو خواردنەوە بەئانقەست (الأكل والشرب عمداً) بەلام ئەگەر بەهۆی لەبیرچوونەوە (نسیان) یان زۆر لێکران (إکراه) ەوە بوو، ئەوە بۆ لەبیرچوونەوە زانایان یەکدەنگن لەسەر بەتاڵ نەبوونەوەی ڕۆژووەکەیو، بۆ زۆر لێکرانیش ڕایان جیاوازەو زۆربەیان کە (ابو حنیفة ومالك واحمد)یان لەنێودان دەڵێن بەتاڵ دەبێتەوە، بەلام (شافیعی‌یەکان) دەڵێن: مادام تۆبزی[23] لێ‌کرابێ ڕۆژووەکەی بەتاڵ نابێتەوە، ڕایەکی دیکەی سێیەمیش هەیە کە (ابو ثور وابن المنذر) و (ابن عقیل)ی حەنبەلی پەسەندیان کردوە، ئەویش ئەوەیە کەتۆبزی لێ‌کردن (إکراه) دوو جۆرە:

ا- بەهەڕەشەو ترساندن ب-بەکردەوە، وەك ئەوەی بەدەست خواردنو خواردنەوەی بەگەردوودا بکرێ، جا دەڵێن: ئەگەر جۆری یەکەم بێ ئەوە ڕۆژووەکەی بەتاڵ دەبێتەوە چونکە ئەوکاتە بابای ڕۆژووەوان وەك ئەو کەسە دەبێ کەلەبەر عوزرێك وەك نەخۆشی، یان سەفەر ڕۆژووەکەی دەشکێنێ بەلام ئەگەر تۆبزی لێکرانەکە جۆری دووەم بێ ئەوە ڕۆژووەکەی زیانی پێ‌ناگات، چونکە بابای ڕۆژووەوان هیچ ئیرادەو ویستی لەدەست خۆی‌دا نەماوە!

---

[20] بڕوانە: (المجموع)، ج٦ص٣٦٩، وە: (المغني) ج٣ص٤٦، وە بڕوانە: (المفصل) ج٢ص٩١.

[21] بڕوانە: (المجموع) ج٦ص٣٦٩، ٣٧٠.

[22] بڕوانە: (مجموعة الفتاوى) لابن تيمية، ج٢٥ص١٣٠، وە: (الوجيز في فقه السنة والكتاب العزيز) ص١٩٩.

[23] زۆر لەزانایان بڕوایان وایە کە ناو هێنرانەوەو ڕەحەتکرانیش بەتۆبزی هەمان حوکمی خواردنو خواردنەوەی هەیە، بڕوانە. (المجموع) ج٦ص٣٣٤، ٣٣٥.

جا بەندەش ئەم رایەی سێیەمو کۆتایییەم پێ لەڕایەکانی دیکە ڕاست تـرەو دوای ئەمیش ڕای (شـافیعییەکان)[٢٤]م پـێ بەڵگـەدارترە چونکـە بەفـەرموودەی پێغەمبـەر ﷺ پشت ئەستوورە.

ئەو فەرموودانەش کە زانایان بۆ ئیسپاتی ئەوە کـە بابـای لـەبیرچوو (ناسـي)و زۆر لێکراو (مُکْرَهْ) ڕۆژووەکانیان بەتاڵ نابێتەوە، پشتیان پێبەستوون، ئەمانەن:

*(مَنْ أَكَلَ ناسِياً وهُوَ صائِمٌ فَلْيُتِمَّ صَوْمَـهُ فإنَّمـا أطْعَمَـهُ اللهُ وسَـقاهُ) رواه البخاري ومسلم والترمذي وابوداود وأمد وغيرهم عن ابي هريرة رضي الله عنه.

واتـە: هـەر کەسێك بەڕۆژوو بوو و لەبیریچوو شتێکی خـوارد بـا ڕۆژووەکـەی تـەواو بکات، چونکە بێگومان خوا خواردنو خواردنەوەی داوەتێ.

*(مَنْ أفطر في شَهْرِ رمضان ناسياً فلا قضاءَ عَلَيه ولا كَفّارةَ) رواه الدارقطني والبيهقي والحاكم وقال: صحيح على شرط مسلم وقال الحافظ ابن حجر: اسناده صحيح[٢٥].

واتـە: هـەر کەسـێك لـەبیری چـوو و لـەمانگی ڕەمـەزان دا ڕۆژووی شـکاند ئـەوە نەگێڕانەوەی لەسەرە نە کەففارەت.

* (إنَّ اللهَ وَضَعَ عن أُمتي الخَطأَ والنِّسيانَ وما اُسْتُكْرِهوا عليـه) رواه ابن ماجة والطبراني والحاكم.

واتـــە: خـــوا - گونـــاهی - هەڵـــەو لەبیرچوونـــەوەو تۆبـــزی لـــێکرانی لەســـەر ئوممەتەکەم لابردووە.

وەشایانی باسە کە لەگەروو ئەودیوکردنو قووتدانی هەرشتێك بانەشخورێ وەك گڵ، بەرد، خوێ... هتد، لەلای سەرجەم زانایان ڕۆژووی هەر پێ دەشکێ[٢٦].

<u>سـێ</u>: ڕشانـەوەی بەئانقەسـت (القَيْئُ عَمْـداً)، بـەڵام ئەگـەر بەدەسـت خـۆی نـەبوو ڕشـانەوەی هـات، ئـەوە ڕۆژووەکـەی ناشـکێ و گێڕانـەوەو کەفارەتیشـی نـاوێ، چونکـە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَنْ ذَرَعَهُ القيءُ فَلَيْسَ عليه قَضاءٌ، ومَنْ إسْتَقاءَ عَمْـداً فلْيَقْـضِ) رواه احمد والترمذي وأبوداود وابـن ماجة وابـن حبـان والدارقطـني والحـاكم وصححـه. واتـە: هەرکەسـێك - ی ڕۆژووگر - بەدەست خۆی نەبوو ڕشانەوەی هات. ئەوە ڕۆژوو گێڕانەوەی لەسەر نیە، بەڵام کەسێك بەئانقەست ڕشایەوە با بیگێڕێتەوە.

---

[٢٤] هەرچـەندە شـافیعییەکان ڕای دیکەشـیان هەیـە. بـەڵام (نـووي) ئـەم ڕایـەی بەڕاسـت تـر دانـاوە. (المجموع) ج٦ص٣٢٧.

[٢٥] بڕوانە: (فتح الباري) ج٤ص٦٦١.

[٢٦] بڕوانە: (فقه السنة)وە: (المجموع) ج٦ص٣٢٣.

چوار: چوونە لای هاوسەر (جماع) و ئاوی خۆهێنانەوە بەهەر شێوەیەك بێ، تەنانەت ئەگەر بەهۆی ماچ کردن و بەخۆوەگوشینی هاوسەریشی‌یەوە بێت، دەبێتە هۆی بەتاڵ بوونەوەی ڕۆژوو[٢٧]، بەڵام ئەگەر بەهۆی ڕوانین (نظر)ەوە بێ هەرچەندە گوناحبار دەبێ، بەڵام ڕۆژووەکەی بەتاڵ نابێتەوە[٢٨]، بەڕای زۆربەو هەندێکیش ڕایان جیایە[٢٩].

ئەگەر جیماع یان ئاوهێنراوەکەش بەتۆبزی بوو، یان بەهۆی لەبیرچوونەوەوە، ئەوە بۆ تۆبزی لێکران (إکراه) وەك پێشتریش ئاماژەمان پێکرد زۆربەی زانایان ڕایان وایە کەڕۆژووی پێناشکێ بەڵام بەمەرجێك تۆبزی لێکرانێکی جیددی کردەیی بێت. بۆ لەبیرچوونەوەش زۆربەی زانایان کە (اوزاعي و لیث و مالك و احمد)یان لەنێودا هەن و ڕایەکی شافیعی‌یەکانیشە[٣٠] دەڵێن: ڕۆژووی پێ بەتاڵ دەبێتەوە. بەڵام ڕای بەهێزتری شافیعی‌یەکان و ڕاستە مەزەبیان وەك (نووي) گوتوویەتی:[٣١] ئەوەیە کە حوکمی لەبیرچوونی جیماع کردن و ئاوهاتنەوەش هەروەك حوکمی خواردن و خواردنەوە وایەو ڕۆژووی پێناشکێ؛ بەڵگەی ئەوەش کە بەجیماع و ئاوی خۆ هێنانەوە (إسْتِمْناءْ) ڕۆژوو دەشکێ ئەو فەرموودەیەیە کە (بخاري ومسلم واصحاب السنن) لە (ابي هريرة) خوالێی‌ڕازی بێ گێڕاویانەتەوە کە پیاوێك هاتۆتە لای پێغەمبەر ﷺ و پێی گوتوە : ئەی پێغەمبەری خوا فەوتاوم! ئەویش فەرموویەتی: چی فەوتاندوویتی؟! گوتوویەتی: لەڕەمەزانی‌دا چوومەتە لای ژنەکەم... هتد، کە لەبەندی دووەم دا دەیهێنین[٣٢].

---

[٢٧] بڕوانە: (المجموع) ج٦ص٣٧٢، بەڵام (ابن حزم)، ڕ ای وایە بەس بەجیماع بەتاڵ دەبێتەوەو جگە لە جیماع کەدەقی لەسەرە بەهیچ جۆرە ئاوهاتنەوەو ئاوی خۆهێنانەوەیەکی دیکە ڕۆژوو ناشکێ چ هاوسەری ماچ بکات و بەخۆیەوە بگووشێ، چ بەدەست یان بەهەر شێوەیەکی دیکە ڕەحەت بێت و ئاوی بێتەوە!! بڕوانە: (المُحلَّى) ج٦ص١٤١تا١٤٨، المسالة: ٧٥٣. بەڵام لەڕاستی‌دا ڕایەکەی زۆر بێ‌مێزو پێزەو ئەوەی کە ئەو کەڵەزانایەش تووشی ئەوجۆرە بیروبۆچوونە سەیرو ڕیزپەڕ (شاذ) انە دەکات، ئەوەیە کە بڕوای بە (قیاس) نیەو پاشان زۆر زێدەڕۆیی لەپابەندی وشك بەدەقەکانەوە دەکات و چاوپۆشی لەڕووحی شەرع و مەبەستەکان (مقاصد)ی شەریعەت دەکات.

[٢٨] بڕوانە: (المغنی) ج٣ص٤٩، کە گوتوویەتی: (ثوري وابوحنيفة وشافيعی وابن المنذر) دەڵێن: پێی بەتاڵ نابێتەوە، بەڵام (احمد) ڕای وایە بەتاڵی دەکاتەوە. هەرچەندە (ابن قدامة)ش ڕای زۆربەی پەسندکردوە، بە بەڵگەی ئەوە کە نەدەق (نص) لەوبارەوە هەیە نە ئیجماع.

[٢٩] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[٣٠] بڕوانە: (فتح الباري) ج٤ص٦٦٠.

[٣١] بڕوانە: (المجموع) ج٦ص٣٢٤، وە (نووي) گوتوویەتی: ئەم ڕایە ئی (ابو حنيفة و اسحاق و ابوثورو داود وابن المنذر)یشە، کەوابێ ئەمان زۆربەن!

[٣٢] بڕوانە: (فتح الباري) ج٤ص٦٦٨، ٦٦٩.

پێنج و شەش: کەوتنە حەیزو زەیستانی‌یەوە، کە ئەمیش جگە لەچەندان دەقی سوننەت تێکڕای زانایانیش لەسەری یەکدەنگن،[33] هەرچەندە ئەو کەوتنە حەیز (حیض) و زەیستانی (نفاس)یەش لەدوایین دەمی پێش خۆرئاوابوون دا بێ.

حەوت: نیەت هێنانی شکاندنی ڕۆژووەکەی، ئەمیش دەبێتە هۆی بەتاڵ بوونەوەی ڕۆژووەکەی، مەگەر دوایی لەو نیازەی پەشێمان ببێتەوە، چونکە وەك پێشتر باسمان کرد نیازو مەبەست (نیة) یەکێکە لەدوو پایەکانی ڕۆژووگرتن، کەواتە بەنەمانی هەرکام لەو دوو پایە ڕۆژووەکە هەرەس دێنێ، ئەمە ڕای زۆربەی زانایانە[34].

هەشت: خواردن‌و خواردنەوەو جیماع کردن بەگومانی ئەوە کەجارێ هەر شەوەو نەبۆتە ڕۆژ، یان خۆر ئاوابووەو شەو داهاتوە، پاشان دەربکەوێ کە بەپێچەوانەوەیە، ئەمەش بەڕای زۆربەی هەرە زۆری زانایان کە (ابوحنیفة و مالك و شافعي و احمد) یشیان لەنێودا هەن، دەبێتە هۆی هەڵوەشاندنەوەی ڕۆژوو، وە پێویستە دوایی بیگێڕنەوە، هەندێکیشیان وەك (اسحاق و داود و ابن حزم) پێیان وایە ڕۆژووەکەی دروستەو گێڕانەوەی ناوێ، جا هەرچەندە هەردووك لایان چەند فەرموودەو شوێنەوار (اثر)ێك بە بەڵگە دێننەوە، بەلام بەڵگەکانی زۆربەو جەماوەری زانایان بەهێزترن، کە یەکێکیان ئەمەیە:

*( عن علي بن حنظلة عن أبيه وكان أبوه صَديقاً لِعُمَر قال: كنتُ عنـد عُمَـرَ ﷺ في رمضان فأفْطَر وأفْطَر الناسُ، فَصَعِدَ المؤذِّنُ ليؤذِّن فَقَال:أيها الناسُ هذه الشمسُ لَمْ تَغرُبْ ! فقال عمر ﷺ مَنْ كان أفْطَر فَلْيَصُمْ يوماً مكانَهُ، (وفي الرواية الأخرىْ فقال عمـرُ ﷺ لانبـالي وَاللهِ نَقْضـي يَوْماً مكانَهُ) رواه البيهقي[35].

واتە: لە ڕەمەزانێ‌دا لای عومەر بووم خوا لێی‌ڕازی‌بێ ڕۆژووی شکاندو خەڵکیش ڕۆژوویان شکاند. پاشان بانگبێژ سەرکەوت کەبانگ بدات، گوتی: ئەی خەڵکینە! ئەمە خۆرە ئاوانەبووە! عومەریش خوا لێی‌ڕازی بێ گوتی: هەرکەسێك ڕۆژووی

---

[33] بڕوانە: (فقه السنة) ج١ص٦١٠،

[34] بەلام ڕای دیکەش هەیە بڕوانە: (المجموع) ج٦ص٣٠٢.

[35] بڕوانە: (المجموع) ج٦ص٣١٨.

شکاندوه با ڕۆژێکی لەجیاتی بگرێتەوە،(لەڕیوایەتەکەی دیکەدا عومەر گوتی: ﷺ خەممان نیە بەخوا ڕۆژێکی لەجیاتی دەگرینەوە).

جا هەرچەندە هەر لەوبارەوە دەقێکی دیکەی پێچەوانە لەعومەرەوە خوا لێی ڕازی‌بێ گێڕراوەتەوە، کە گوتوویەتی: (والله ما نَقْضِيه وما يُجانِفْنا الإثْـمُ) رواه البيهقي، بەلام زانایان بۆ وێنە (بيهقي) ڕایان وایە ڕیوایەتەکانی پێشوو ڕاست ترن[٣٦].

شایانی باسیشە کە لایەنگرانی ڕای دووەم فەرموودەی: (إنَّ الله تعالىٰ تجاوزلي عنْ أُمَّتي الخَطَأَ والنِّسيانَ وما اسْتُكرِهوا عَلَيْـهِ) رواه ابن حبان على شرط الشيخين وابن ماجة والبيهقي والدارقطني والحاكم على شرط الشيخين ووافقه الذهبي، بە بەڵـگەی ڕایەکەیان دێنەوە، بەلام (نووي) وەلامێکی باشیان دەداتەوە، کە گوتوویەتی:

(انه هُنا محمولٌ علىٰ رَفْعِ الأثم فانّه عامٌ خُصَّ مِنْهُ غَراماتُ المتْلَفات، وانتقاضُ الوضوء بمجرد الحَدَثِ سَهْواً، والصَّلاةُ بالحدث ناسياً وأشْباهُ ذلك، فيُخَصُّ هُنا بما ذكرنا)[٣٧] واتە: ئەم فەرموودەیە لێرەدا مەبەستی لاچوونی گوناحە، جا ئەم فەرموودەیە گشتی‌یەو چەند شتێکی لێ‌هەڵاوێرراوە، وەك: بژاردنی شتی فەوتێنراو - کە بەهەر شێوەیەك فەوتێنراین دەبێ ببژێررێن - وەدەست نوێژشکان بە بالێبوونەوەی هەڵە، وە نوێـژ کـە بەهەڵـە بـەبێ دەستنوێژی کرابێ - دەبێ بکرێتەوەو وێنەی ئەمانە، جا لێرەداش دا ئەوەی باسمان کرد لێی هەڵداوێرریێ و جیادەکرێتەوە، کەواتە نابێتە بەڵگە.



[٣٦] هەمان سەرچاوەی پێشوو

[٣٧] بڕوانە: (المجموع) ج٦ص٣١٨. بۆ بەڵگەو وەلامی ئەهلی ڕای دووەم بڕوانـە: (المحلّـى) ج٦ص١٤١، مسألة، ٧٥٣.

# بەندی دووەم: ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان

## ١-پێناسەی ڕۆژووی ڕەمەزان و كاتی فەرزبوونی:

گرتنی ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان لە مانگی شەعبانی ساڵی دووەمی كۆچیداو ساڵ و نیوێك پاش كۆچكردنی پێغەمبەرو ﷺ هاوەڵانی بەڕێزی خوا لێیان ڕازی بێ بۆ شاری (یثرب) كە دواتر ناوی گۆڕا بە (مدینة)، فەرزكراوە زانایان لەسەر ئەمە یەكدەنگن، وە پێغەمبەر ﷺ نۆ (٩) مانگی ڕەمەزانی گرتوون لەنۆ ساڵان دا[٣٨].

## ٢-چاكیی و گەورەیی مانگی ڕەمەزان و ڕۆژووگرتن تێیدا:

وەك لەدەقەكانی قورئان و سوننەت دا دەردەكەوێ، وەك چۆن ڕۆژی جومعە گەورەو سەرەوەری ڕۆژەكانی هەفتەیە، مانگی ڕەمەزانیش سەروەرو سەرقافڵەی مانگەكانی ساڵە، چونكە:

ا-تێدا بەڕۆژوو بوونی ڕۆژەكانی فەرزەو پێنجەمین پایەی ئیسلامەتییە.

ب-قورئانی بەڕێز لەو مانگەدا هاتۆتە خوارێ.

ج-شەوێك لەو مانگە' هەیە كە بەدەقی قورئان لەهەزار مانگ گەورەترە، كە بریتیە لەشەوی ڕێز، یان ئەندازەگیری (ليلة القَدْر)

د-ئەو مانگە مانگی طاعەت و تەزكیەو بەخشین و دەوركردنەوەی قورئان و... هتد.

ئەمەش چەند دەقێك لەوبارەوە:

* (شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذِي أُنزِلَ فِيهِ الْقُرْآنُ هُدًى لِلنَّاسِ وَبَيِّنَاتٍ مِنَ الْهُدَى وَالْفُرْقَانِ) البقرة:١٨٥،

واتە: ئەو مانگی ڕەمەزانەی كە قورئانی تێدا نێرراوەتە خوارێ، كە ڕێڕوونییە بۆ خەڵكی و بەڵگە گەلە لەڕێپیشاندان و لەیەك جیاكردنەوە - ی هەق و ناهەق -.

*(إذا جاءَ رَمَضانُ فُتِّحَتْ أبوابُ الجنَّةِ، وغُلِّقَت أبوابُ النارِ، وصُفِّدَتْ الشَّياطِينُ) رواه البخاري ومسلم عن ابي هريرة ﷺ.

واتە: هەركات ڕەمەزان هات دەرگاكانی بەهەشت ئاوەڵا دەكرێنەوەو دەروازەكانی ئاگری دۆزەخ گاڵە دەدرێن و شەیتانەكان زنجیر پێچ دەكرێن.

(الصَّلواتُ الخَمْسُ والجمُعَةُ الىٰ الجُمُعَةِ و رمضانُ الىٰ رَمَضانَ مكفِّراتٌ لِما بينهُنَّ إذا اجْتُنِبَتِ الكَبائِرُ) رواه مسلم عن ابي هريرة رضي الله عنه.

---

[٣٨] بڕوانە: (الفقه الأسلامي وادلتُهُ) ج٣ص١٦٢٩، وە: (فقه السنة) ج١ص٥٧٥.

واته: پێنج نوێژه - فەرزە - کانو جومعە بۆ جومعەو ڕەمەزان بۆ ڕەمەزانێکی دیکە سڕەرەوەی ئەو گوناحانەن کە لەنێوانیان دا دەکرێن بەمەرجێك دوورە پەرێزی لەگوناحە زلەکان کرابێ.

* (مَنْ قام رمضان إيماناً واْحتِساباً غُفِرَ لَهُ ما تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِه) رواه البخاري ومسلم عن ابي هريرة رضي الله عنه، واتە: هەرکەسێك شەوانی ڕەمەزان بەئیمانو ئیخلاسەوە شەونوێژ بکات، هەرچی گوناحی ڕابردووی هەیە دەپۆشرێ.

*( مَنْ صامَ رَمضانَ إيماناً واْحتِساباً غَفَرَ اللهُ لَهُ ما تَقَدَّمَ من ذَنْبهِ) رواه احمد واصحاب السنن.

واتە: هەرکەسێك ڕۆژووی ڕەمەزان بەئیمانو خوا پێ مەبەست بوونی ساغەوە بگرێ، خوا لەگوناحی ڕابردووی خۆش دەبێت.

## ٣-حوکمی گرتنی ڕۆژووی ڕەمەزان:

وێڕای بەڵگەی قورئانو سوننەت کە دوایی ئاماژەیان پێدەکەین ئوممەتیش تێکڕا لەسەرئەوە یەکدەنگن کە گرتنی ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان فەرزی تایبەتی (فرض العين)یە لەسەر هەموو مسوڵمانێکی عاقڵو باڵغو ساغو نیشتەجێو بێعوزر.

خوای پەروەردگار فەرموویەتی: (شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذِي أُنزِلَ فِيهِ الْقُرْآنُ هُدًى لِلنَّاسِ وَبَيِّنَاتٍ مِنَ الْهُدَى وَالْفُرْقَانِ فَمَنْ شَهِدَ مِنْكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ وَمَنْ كَانَ مَرِيضًا أَوْ عَلَى سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِنْ أَيَّامٍ أُخَرَ يُرِيدُ اللَّهُ بِكُمُ الْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ وَلِتُكْمِلُوا الْعِدَّةَ وَلِتُكَبِّرُوا اللَّهَ عَلَى مَا هَدَاكُمْ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ) البقرة: ١٨٥، مانای (فَمَنْ شَهِدَ منكم الشهر فَلْيَصُمْهُ)یانی: جا هەرکامێکتان لەو مانگەدا ئامادەبوو - واتە ڕێبوار نەبوو بەڵکو نیشتەجێ بوو - با بیگرێ.

پێغەمبەری خواش ﷺ فەرموویەتی: (بُنِيَ الأسلامُ على خَمْسٍ: شهادةِ أن لا اله الا الله، وأنَّ محمداً رسولُ الله، وإقام الصَّلاة وإيتاءِ الزكاة و صيام رَمَضانَ وحَجِّ البَيْتِ مَنْ اْستطاع اليه سَبيْلاً) رواه البخاري ومسلم عن ابن عمر رضي الله عنهما، واتە: ئیسلام لەسەر پێنج -پایە- ان بنیات نراوە: شایەتیدان بەوە کە جگە لەخوا هیچ پەرستراو نین وە کە موحەممەد ڕەوانەکراوی خوایە، وە بەرپاکردنی نوێژ، وەزەکات دان، وە ڕۆژووگرتنی ڕەمەزان، وەحەجی ماڵی خوا بۆ کەسێك کەبتوانی بیگاتێ.

## ٤-چۆنیەتی ئیسپات کردنی هاتنی مانگی ڕەمەزان:

بەشێوەیەکی گشتی هاتنی مانگی ڕەمەزان بەیەکێك لەم دوو ڕێیە ئیسپات دەبێ:

ا- دیتنی مانگ بەیەك شەوەیی و لەشەودا.

ب-مانگی شەعبان ببێتە سی (٣٠) پڕ.

چونکه پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (صُوموا لرُؤيَتـه وأفطـروا لرُؤيتـه فـانْ غُـمَّ عليكُـمْ فأكملوا عدةَ شَعْبانَ ثَلاثِينَ) رواه البخاري ومسلم عن ابي هريرة رضي الله عنه، واتـه: کـه مانگتـان دی بەڕۆژووبن و - کە لەو سەریشەوە دووبارە - بینیتان کۆتایی بە ڕۆژووگرتن بێنن، وە ئەگەر هات و مانگتان لـێ پەنهان بوو و نەتان دی ئەوە ژمـارەی ڕۆژەکـانی شـەعبان سـی (٣٠) تەواو بکەن - ئەوجار دەست بەگرتنی ڕەمەزان بکەن -.

وە بەڕای بەشێك لە زانایان شایەتی دانی یەك شاهید بەسە بۆ ئیسپاتی دیترانی مانگ، بەڵام بەمەرجێك بابایەکی دادگەرو جێی متمانە بێـت، ئـەم فەرموودەیـەش بـە بەڵگـەی ڕایەکەیان دێننەوە:

*(عن ابن عمر رضي الله عنهما قال: تَراءىٰ الناسُ الهلالَ فأخْبَرْتُ رسـولَ الله ﷺ أنـّي رَأيْتُـهُ، فَصام وأمَرَ الناسَ بصيامِه) رواه أبوداود والحاكم وابن حبان وصححاه.

واتە: خەڵکی لەدیتنی مانگی یەك شەوە دەخەفتان، جا من هـەواڵم دا بە پێغەمبەری خوا ﷺ کە دیتوومە، ئەویش خـۆی دەستی بەڕۆژووگرتن کـرد وە فەرمانیشـی بەخـەڵك کرد کەبیگرن.

هەروەها ئەم فەرموودەیەش بە بەڵگە دێننەوە:

*(عن ابن عباس ﷺ جاءَ أعْرابيٌّ الىٰ النبيِّ ﷺ فقال: إني رأيت الهلالَ يعني رمضان - فقـال: أتَشْهَدُ أن لا اله الا الله؟ قال: نعم، قال: أتشهد أن محمداً رسول الله؟ قال: نعم، قال: يـا بـلالُ أذِّنْ في النـاس فَلْيَصُومُـوا غَـداً) رواه ابوداود والترمذي والنسائي وابن ماجة والحاكم وصححه، کەماناکـەی ڕوون و ئاشکرایە.

بەڵام زۆربەی زانایان ڕایان وایە کە هەتا دوو کەسی دادگەر شایەدی نەدەن ناکرێتە بەڵگە لەسەر دیترانی مانگ و هاتنی ڕەمەزان، کە (عمر بن العزیز و مالك و أوزاعي ليث و اسحاق ماجشون و داود وثوري) یان لەنێودان[39]. بەڵگەشیان ئەم فەرموودەیەیە:

*( عن حسين بن حريث الجدلي قال: خطبنا أميرُ مكةَ الحارثُ بن حاطبٍ فقال: أمرنـا رسـولُ الله ﷺ أنْ نَنْسكَ لرؤيته، فأن لمْ نَرَهُ فَشَهدَ شاهدان عدلان نَسَكْنا بشـادتهما) رواه ابوداود والدارقطني والبيهقي وغيرهم وصححه كل من الدارقطني والبيهقي والنووي[40].

واتە: فەرماندەی مەککە (حارث بـن حاطب) وتـاری بـۆ داین و گوتـی: پێغەمبەری خـوا ﷺ فەرمانی پێکردووین کە ئەگەر مانگمان دی بەڕۆژووبین. وە ئەگەر نەمانبینی بەڵام دوو شایەدی دادگەر شایەدییان دا ئەوە دیسان لەسەر بناغەی شایەدییەکەی ئەوان بەڕۆژوو بین.

---

[39] بڕوانە: (المجموع شرح المهذب) ج٦ص٢٨٤.

[40] هەمان سەرچاوە، ج٦ص٢٧٨.

بەندەش وای بۆ دەچێ، کە هەرکام لەو دوو ڕایانە ڕاستو بەجێن، ئەوەندە هەیە ڕای زۆربەو جەماوەر دووربینیو (إحتیاط) ی زیاتری تێدایەو ئەو فەرموودەیەش کە بە بەڵگەیان هێناوەتەوە ئەوەی لێنافامرێتەوە کە کەمتر لەدوو شایەد مەسەلەی دیترانی مانگی پێئیسپات ناکرێ، ئاشکراشە کە کارپێکردنی هەموو فەرموودەکان چاکترە لەواز لێهێنانی بەشێکیان! بەڵێ ڕای یەکەم کە (شافعي و احمد وابن المبارك) پەسەندیان کردوە[41] ئاسانکاری زیاتری تێدایەو ڕای دووەمیش[42] دووربینی زیاتری تێدا ڕەچاوکراوە، کە دیارە هەرکام لەئاسانکاری و دووربینیش دەگونجێ لەشوێنی تایبەتی خۆیان دا بەکاربهێنرێن.

ئەوە بۆ دیترانی مانگ لەم سەرەوە کە مانگی ڕەمەزانە، بەڵام بۆ دیترانی مانگ لەو سەرەوە کە مانگی شەووالە، ئەوە زۆربەی زانایان پاش ئەوە کەلەسەر ئەوە ڕێك کەوتوون کە مانگەکانی عارەبی دەگونجێ سی (٣٠) پڕ بن یان بیستونۆ (٢٩) بن[43]، لەسەرئەوە کە ئایا دیترانی مانگی یەك شەوە (هلال)ی شەووالیش وەك هی ڕەمەزان بەشایەدێك ئیسپات دەبێ یان دوو شایەدی پێویستن؟ ڕایان جیاوازە، زۆربەی[44] هەرە زۆریان کە (أبوحنیفة و مالك و شافعي وأحمدو اسحاق و ثوري وطبري و اوزاعي) یان لەنێودان دەڵێن: دیترانی مانگی شەووالو مانگەکانی دیکەش بێجگە لەڕەمەزان بەدوو شایەد کەمتر ئیسپات نابێ، بەڵگەشیان ئەوەیە کە بۆ مانگی ڕەمەزان دەق (نص) هەیە بۆیە لەو بنچینە (قاعدة) شەرعی‌یە لامان دا کە بۆ ئیسپاتی هەر دەعوایەك دوو شایەد بەمەرج دەگرێ، بەڵام دیترانی مانگی شەووالو مانگەکانی دیکە هیچ دەقێکی شەرعی‌یان لەسەر نیە کە بەیەك شایەد ئیسپات بێ، بۆیە هەر بەپێی بنچینە شەرعی‌یەکە ڕەفتاریان لەگەڵ دەکەین. (ابو ثور و ابن المنذر) یش دەڵێن شایەدێك بەسە بۆ ئیسپاتی. ئنجا (ابن حزم)[45] یش وەك عادەتی خۆی زۆر بەسەختی بەرگری لەڕای (أبوثورو ابن المنذر) دەکاتو زۆر توندیش هێرش دەکاتە سەر ڕای جەماوەرو زۆربەی زانایان، وە ڕای وایە کە یەك شایەد - چ پیاو

---

[41] بڕوانە: (المغني) ج٣ص٨.

[42] بەڵام (ابوحنیفة) ڕایەکی دیکەی سێیەمی هەیە کە دەڵێ: ئەگەر ئاسمان هەوری تەمومژ بوو شایەدێك بەسە بۆ دیتنی مانگ، بەڵام ئەگەر ئاسمان ساف بوو نەك یەك بگرە دوو شایەدیش بەس نین و دەبێ ژمارەیەکی زۆربن. بڕوانە: (المجموع) ج٦ص٢٨٤، ٢٨٥.

[43] پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (...الشهر هكذا وهكذا، يعني مرة تسعةً وعشرين، ومرة ثلاثين) متفق عليه عن ابن عمر رضي الله عنهما، بڕوانە: (المجموع) ج٦ص٢٨٧.

[44] بڕوانە: (المجموع) ج٦ص٢٨٣.

[45] بڕوانە: (المحلی) ج٦ص١٦٣تا١٦٦، مسألة: ٧٥٧.

بێ چ ئافرەت - بەسە بۆ شایەدیدانو ئیسپاتی دیترانی هەموو مانگەکانی ساڵ بەبێ جیاوازی، هەروەها (شوکاني)یش پشتگیری هەمان ڕای کردوە[٤٦]، منیش پێم وایە وەڵامی هەموو بەڵگەکانی (ابن حزم) زۆر زەحمەتەو هەرچەندە ڕای جەماوەر دووربینی زیاتری تێدایە، بەڵام ڕایەکەی (ابوثورو ابن حزم)یش بەدوور نازانم[٤٧].

## جیاوازی شوێنەکانی هەڵهاتنی مانگ (إختلاف المطالِع):

هەروەها زانایان لەبارەی ئەوەوە کە ئایا دیترانی مانگ لەشوێنێك یان وڵاتێك دا دەبێتە بەڵگەی شەرعی بۆ پێویست بوونی دەست پێکردنی ڕۆژووی ڕەمەزان یان تەواوبوونی ڕەمەزانو هاتنی جەژن لەسەر مسوڵمانانی شوێنەکانی دیکە یان نا؟! دیسان ڕایان جیاوازە:

جارێ پێویستە ئەوە بزانرێ کە زانایان تێکڕا لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە ئەو شوێنانەی مانگ لێیانەوە هەڵدێ کە بەعارەبی (مطالع)ی پێدەڵێنو کۆی (مَطْلَع)ە، جیاجیان[٤٨]، بەڵام نوختەی جێگای ڕا جیایی (اختلاف)یان ئەوەیە کە ئایا ئەو جیاجیاییەی (مطلع)ەکانی مانگ لەکاتێك دا مانگ لەشوێنێك دەبینرێ، دەبێتە پاساو (مُبَرِّر)ی پێویست نەبوونی دەست پێکردنی گرتنی ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان لەسەر مسوڵمانانی شوێنو وڵاتانی دیکە، یان هەرکاتێك لەهەر جێیەکی جیهانی ئیسلامیدا مانگ بینرا لەسەر سەرجەم مسوڵمانان فەرز دەبێ کە بەڕۆژوو بن؟!

جا هەرچی زۆربەو جەماوەری زانایانن ڕایان وایە کە جیاوازی (مطالع) نابێ بکرێتە پاساوی بەڕۆژوو نەبوونی مسوڵمانانی شوێنو وڵاتانی دیکەو هەرکاتێك لەهەر شوێنێکی جیهانی ئیسلامی مانگی یەك شەوەی ڕەمەزان دیترا، ئەوە لەسەر تێکڕای مسوڵمانان پێویست دەبێ دەست بەگرتنی ڕۆژووی ڕەمەزان بکەن، بەڵگەشیان ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەری خوایە ﷺ کە تێیدا فەرموویەتی: (صوموا لرؤيته وأفطِروا لِرُؤْيَتِهِ) متفق عليه.

چونکە هەرکام لەفەرمانی (صُومُوا) و (أفطِروا) ڕوویان لەسەرجەم و تێکڕای مسوڵمانانە لەهەر شوێنو وڵاتێك بن، ئەمەش وەك گوتمان ڕای زۆربەی زانایانە کە بەپێی قسەی (ابن المنذر) کە (نووي) لێینەقڵ کردوە، هەرکام لە

---

[٤٦] بڕوانە: ( نيل الأوطار) ج٦ص٢٦٠.

[٤٧] هەندێك لەشافیعییەکانیش ڕایان وایە، بڕوانە: (المجموع) ج٦ص٢٨٣.

[٤٨] بڕوانە: (المفصل في احكام المرأة والأسرة في الشريعة الأسلامية) ج٢ص٢٨.

(ابوحنيفة و مالك و شافعي احمد وليث) يان لەنێودا هەن[٤٩]، هەندێکیشیان ڕایان وایە کە دیترانی مانگ لەهەر شوێن و وڵاتێک بەس خەڵکی ئەو شوێنە پابەند (مُلْزَمْ) دەکات بەگرتنی ڕەمەزانەوەو بۆ شوێنەکانی دیکە کاریگەری نیە[٥٠].

ڕایەکی دیکەی سێیەمیش[٥١] هەیە کە من وای بۆ دەچم لەهەموویان چاکترو ڕاست تر دەبێت، ئەویش ئەوەیە کە ئەگەر شوێنەکان لەیەک نزیک بوون، بۆ وێنە تەنیا چەند سەعاتێکی کەم جیاوازی لەنێوان کات و شوێنەکانی هەڵهاتنی مانگ (مطالع القمر)دا هەبوو، ئەوە پێویستە جیاوازی (مطلع)ەکان کارنەکاتە سەر پاش و پێشی ڕەمەزان و لەهەر جێیەک و لەهەر شوێنێک دیترانی مانگ ئیسپات بوو، سەرجەم مسوڵمانان بگرنەوەو پێیەوە پابەند بن، بەڵام ئەگەر هات و شوێنەکان زۆر لەیەک دوورو (مطلع)ەکان زۆر لەیەک جیاواز بوون، بۆ وێنە: وەک ئوسترالیاو ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست، یان ئاسیاو ئەمریکا، کە لەیەکێکیان ڕۆژو لەوی دیکەیان شەو دەبێ، ئەوە پێویستە دیترانی مانگ لەهەرکام لەو شوێنانە تایبەت بێ بەخەڵکەکەیەوەو خەڵکی لایەکەی دیکە نەگرێتەوە، ئنجا لەڕاستیدا ئەم ڕایەی سێیەم وێڕای کۆکردنەوەی هەردووک ڕای یەکەم و دووەم، هەم لەگەڵ ڕووحی شەریعەت دا کەهەمیشە لەگەڵ یەکبوون و یەکدەنگی و یەکڕەنگی مسوڵمانان دایەو، هەم لەگەڵ واقیعی جوگرافیایی جیهانیش دا زۆر گونجاو و تەباو ڕێکە[٥٢].

ئاشکراشە کە لە یەکتر دووری یەک کاریگەری لەسەر جیاوازی کات و شوێنی هەڵهاتنەکانی مانگ (مطالع القمر) هەیە کە لە ڕۆژهەڵاتەوە بەرەو لای ڕۆژئاوا بێت، بە زاراوەی جوگرافیایی هاوچەرخ لەئاستی هێڵەکانی پانی (خطوط العرض) بێت و هێڵەکانی درێژی (خطوط الطول) ببڕێ، چونکە جووڵان و سووڕانەوەی مانگ لەڕۆژهەڵاتەوە بەرەو ڕۆژئاوایەو سەرێ و خوارێ (شمال و جنوب) کارناکاتە سەر جیاواز بوونی شوێنی هەڵهاتن (مطلع)ەکانی.

پێویستە ئەوەش بگوترێ کەزۆربەی جیهانی ئیسلامی شوێنی هەڵهاتن (مَطْلَعْ)ەکانی مانگیان تێدا لەیەک نزیکەو ئەوپەڕی چەند سەعاتێکی[٥٣] کەمیان نێوانە، بۆیە دەگونجێ هەموو وڵاتانی جیهانی ئیسلامی یان بەلای کەمەوە زۆربەیان پێکەوە بەڕۆژووبن و پێکەوەش بیکەنە جەژن، کە بێگومان ئەمە یەکبوونی ئوممەتی ئیسلامی چاکترو زیاتر دەردەخات.

---

[٤٩] بروانە: (المجموع) ج٦ص٢٧٦، وە بروانە: (المغني) ج٣ص٧، وە بروانە: (مجموعة الفتاوى) ج٢٥ص٦٣تا٦٧

[٥٠] ئەمە ڕای (إسحاق)ە . بروانە: (المجموع) ج٦ص٢٧٦

[٥١] بروانە: (المجموع) ج٦ص٢٧٤، ٢٧٥، وە بروانە: (المغني) ج٣ص٧

[٥٢] بروانە: (المفصل) ج٢ص٢٨تا٣٠، وە بروانە: (الفقه الأسلامي وادلته) ج٣ص١٦٥١تا١٦٦٢، وە بروانە: (فقه السنة) ج١ص٥٧٨، ٥٧٩.

[٥٣] لەیەک دوورترین دوو وڵاتی ئیسلامی نۆ (٩) سەعاتیان بەینە، بروانە: (الفقه الأسلامي) ج٣ص١٦٦٢، ط٤

## ٥-خواپەرستی و طاعەتی مانگی ڕەمەزان:

وەك پێشتریش باسمان کرد مانگی ڕەمەزان مانگی بەخۆداچوونەوەو لەخوا نزیك بوونەوەیە هەر بۆیە دەبینین کە لە مانگی ڕەمەزان دا پێغەمبەری خوا ﷺ هەم بۆ خۆی زیاترو چاکتر کۆششی کردوەو خۆی ماندووکردوە لە طاعەتو خواپەرستیو چاکەکاریدا، وە هەم فەرمانیشی بە ئوممەتەکەی کردوەو هانیداون کە هەرچی زیاترو چاکتر لەو مانگەدا کردو کۆش بکەن، جا ئێمە لەبەر تیشکی چەند دەقێك دا جۆرو چۆنیەتی ئەو خواپەرستی و طاعەتەی مانگی ڕەمەزان دەخەینەڕوو:

*(خوای پەروەردگار فەرموویەتی: (أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ الصِّيَامِ الرَّفَثُ إِلَى نِسَائِكُمْ هُنَّ لِبَاسٌ لَكُمْ وَأَنْتُمْ لِبَاسٌ لَهُنَّ عَلِمَ اللَّهُ أَنَّكُمْ كُنْتُمْ تَخْتَانُونَ أَنْفُسَكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ وَعَفَا عَنْكُمْ فَالآنَ بَاشِرُوهُنَّ وَابْتَغُوا مَا كَتَبَ اللَّهُ لَكُمْ) البقرة: ١٨٧.

واتە: لەشەوی ڕۆژووگرتن دا چوونە لای هاوسەرەکانتان بۆ حەڵاڵ کرا، ئەوان پۆشاکن بۆ ئێوەو ئێوەش پۆشاکن بۆیان، خوا زانی کە -خۆتان ڕاناگرنو بەهۆی چوونەلایانەوە لەحاڵێك دا کەلێتان قەدەغەکراوەو - سەرەنجام ئێوە خیانەت بەخۆتان دەکەن، جا ئەوە پەشێمان بوونەوەتانی وەرگرتو لێتان خۆش بوو، دەجا ئێستا بچنە لایانو هەوڵی وەدەست هێنانی ئەوە بدەن کە خوا بۆی نووسیون - لەمنداڵی چاكو یەکتر پاراستنو لەگوناحو هەڵە-.

لەم ئایەتەوە دەزانرێ کە لەسەرەتای فەرزبوونی ڕۆژووی مانگی ڕەمەزانەوە لەسەر مسوڵمانان شەوانەش چوونە لای ژنەکانیانیان لێقەدەغە بووە، بەڵام دوایی خوای بە بەزەیی بۆی حەڵاڵ کردوون، (بخاري) لە (جامع الصحيح) ەکەی خۆیدا لەوبارەوە ئەم دەقەمان لە (براء) ەوە بۆ دەگێڕێتەوە[٥٤]:

(كان أصحاب محمد ﷺ اذا كان الرجلُ صائِماً فَحَضَرَ الأفطارُ فَنامَ قَبل أن يُفطرَ لم يأكل ليلتَهُ ولايومَهُ حتى يُمْسيَ، وإنَ قيس بن صرمةَ الأنصاري كان صائماً فلما حضر الأفطارُ أتى امرأتَه فقال لها: أعندكِ طعامٌ؟ قالت لا، ولكن أنطلقُ فأطلبُ لَكَ، وكان يومَهُ يعمَلُ فغلَبَتْه عيْناه، فجاءتهُ امرأتُهُ، فلما رأتْهُ قالت: خَيْبةً لكَ! فلمّا أنتصف النهارُ غُشيَ عليه، فذكر ذلك للنبيِّ ﷺ فنزلت هذه الآية: ﴿أحلَّ لكم ليلة الصيام الرفث الى نساءكم﴾ فَفَرِحوا بها فَرَحاً شديداً، ونزلت: ﴿وكُلوا واشربوا حتى يتبين لكم الخَيْطُ الأبيضُ من الخيط الأسود﴾.)

---

[٥٤] بڕوانە: (فتح الباري) ج٤ص٦٢٦.

واتە: هاوەڵانی موحەممەد ﷺ ئەگەر پیاوێکیان بەڕۆژو بوایەو کاتی بەربانگ هاتبایەو بەرلەوەی بەربانگ بکاتەوە نوستبایە. بۆی نەبوو ئەشەوەکەی و نە ڕۆژەکەش هیچ بخوات هەتا ئێوارەیەکی دیکە! جا (قیس بن صرمە)ی ئەنصاری بەڕۆژوو بوو کاتێک بەربانگ بوو هاتەلای ژنەکەی و پێی گوت: خواردنت لایە؟ گوتی: نەء، بەڵام دەچم بۆت دێنم، بەڕۆژانەش (صرمة) کاری دەکرد بۆیە - لەبەر ماندوێتی - خەوی لێکەوت، جا کە ژنەکەی هاتەوەو بینی، گوتی: پەشیمانی بۆ تۆ! وە کاتێک ڕۆژ نیوەڕۆ بوو صرمە لەخۆچوو، جا ئەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ باس کرا، وە ئەم ئایەتە هاتە خوار: ﴿أحل لكم ليلة الصيام الرفث الى نسائكم﴾ وە - هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ - بەیەکجار پێی دڵخۆش بوون، وە: ﴿وكُلوا وٱشربوا حتى يتبين لكم الخيط الأبيض من الخيط الأسود﴾ هاتە خوارێ.

جا شایەنی باسە کە (نووي)[٥٥] پێی وایە کە پاش هەرکام لەنوێژی خەوتنان کردن و نووستن. خواردن و خواردنەوەو جیماع قەدەغە بوو ون و ئەم دەقەی (ابن عباس)یش خوا لەخۆی و بابای ڕازی بێ بەبەڵگە دێنێتەوە: (كان الناس علىٰ عهدِ رسولِ الله ﷺ اذا صلّوا العَتَمَةَ حُرِّمَ عليهم الطعامُ والشرابُ والنّساءُ وصاموا الىٰ القابلة) رواه ابوداود والبيهقي.

واتە: خەڵکی لەڕۆژگاری پێغەمبەری خوادا ﷺ ئەگەر -ڕەمەزانان - نوێژی خەوتنانیان کردبایە خواردن و خواردنەوەو -چوونەلای - ژنانیان لێ قەدەغە دەبوو، وە دەبووایە هەتا شەوێکی دیکە ئەوکاتە بەڕۆژووبن..

بەڵام (ابن حجر)[٥٦] ئەو ڕایەی پێ ڕاستترە کە هۆکاری لێ قەدەغەکرانەکە بەس نووستن بووەو گوتوویەتی: وا پێدەچێ باسی نوێژی خەوتنانیش لەبری نووستن بێت، چونکە بەزۆری پاش نوێژی خەوتنان نووستوونە.

واش پێدەچێ قسەکەی (الحافظ ابن حجر) ڕاست بێت، چونکە زۆربەی فەرموودەکان بەس باسی خەوتن (نوم)یان کردوە، پاشان دەقەکەی (ابن عباس)یش کە (ابوداود وبیهقي) هێناویانە، (نووي)[٥٧] بە بێهێز! (ضعیف)ی داناوە.

جا خوێنەری بەڕێز! لەمەوە دەردەکەوێ کە مانگی ڕەمەزان مانگی تەزکیەو تەقواو بەهێزکردنی لایەنی مەعنەوییە چ ڕۆژەکانی و چ شەوەکانیشی! وە مانگی خۆپاک و چاککردن و وەرزشێکی ڕووحییە لەهەموو بوارێکدا، کە بەسەرنج دانی چەند دەقێکی دیکەش زیاترو چاکتر لەوبارەوە دڵنیادەبین، بۆ وێنە:

[٥٥] بڕوانە: (المجموع) ج٦ص٢٤٨.
[٥٦] بڕوانە: (فتح الباري) ج٤ص٦٢٧.
[٥٧] بڕوانە: (المجموع) ج٦ص٢٤٨.

*(عن ابن عباس رضي الله عنهما قال: كان النبيُّ ﷺ أجْوَدَ الناس بالخَيْرِ وكان أجوَدَ مـايكون في رمضان حين يَلْقاهُ جبريل، وكان جبريلُ عليه السلامُ يَلْقاهُ كلَّ ليلـةٍ في رمضـان حتـى ينسـلخ، يَعْرِضُ عليه النبيُّ ﷺ القرآن، فاذا لَقِيَهُ جِبْريلُ عليه السلام كان أجْوَدَ بالخَيْرِ من الرِّيـحِ المُرْسَـلَةِ) رواه البخاري.

واته: پێغەمبەر ﷺ لەماڵ بەخشیندا لەهەموو کەس بەخشەرتر بوو. وە لە ڕەمەزانان دا کاتێك بەجوبرائیل دەگەیشت لەهـەموو کـاتێك بەخشـەرتر دەبـوو، وە جوبرائیـل هـەموو شەوێکی ڕەمەزان پێی دەگەیشتو هـەتا ڕەمـەزان دەڕۆیـی، پێغەمبەر ﷺ قورئانی لەسـەر ڕادەنواند - و دەوری دەکردەوە -، جا کاتێك جوبرائیل پـێی دەگەیشت لـە (با)ی خـێرا بەخشەرتر بوو بۆ ماڵ و سامان.

لەم دەقەش دا دەبینین کە پێغەمبـەری پێشـەوامان ﷺ لەڕەمـەزانان دا لەهـەموو کـاتێك زیاتر جەختی لەسەر ماڵو سامان بەخشینو پێداچوونەوەو تێوەڕامانو دەورکردنـەوەی قورئان کـردوە! بـەڵێ ڕەمـەزان تـەنیا مـانگی ڕۆژووگرتـن نیـە، بـەڵکو مـانگی بەخشـینو سەخاوەتیشەو، مانگی زیاتر وردبوونەوەو سەرنج دانی قورئانیشە!

*هـەروەها ڕەمـەزان مـانگی شـەونوێژو شـەوبێداریو شەونخوونیشـە، وەك لـەم دەقانـەدا دەبینرێ، کە (بخاري) لە (الجامع الصحيح)ەکەی خۆیدا لەژێر ناونیشانی:

(كتاب التراويح) دا هێناونی:[٥٨]

أ-(عن أبي هريرة ﷺ أن رسول الله ﷺ قال: مَنْ قـامَ رَمَضـان إيمانـاً وَٱحْتِسـاباً غُفِـرَ لَـهُ مـاتَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِه) رواه مسلم وغيره.

واته: هەرکەسێك بەئیمانو ئیخلاسەوە لە -شەوانی - ڕەمەزان دا شەونوێژ بکات هـەرچی گوناهی پێشوویەتی دەبووررێ.

(الحافظ ابن حجر) لەڕاڤەی ئەم فەرموودەیەدا نووسیویەتی[٥٩]: (کە فەرموویەتی: (غُفِـرَ لَـهُ) بە ڕواڵەتەکەی گوناحە گچکەو گەورەکان دەگرێتـەوەو (ابن المنذر)یش داکۆکی لەسـەر ئەوە کردوە، بـەڵام (نووي) گوتوویـەتی: ئـەوەی بـاوە تایبەتـە بەگوناحـە گچکەکانـەوە، وە (امـام الحرمين)یش داکۆکـی لەسـەر ئـەم ڕایـە کـردوەو پاڵیشـی داوەتـە لای (أهـل السـنة)، هەندێکیشیان گوتوویانـە: دەگونجێ ئەگـەر گونـاحی گچکـەی لـێ هەڵنەکەوێ گـەورەکان سووك بکات).

[٥٨] بڕوانە: (فتح الباري) ج٤ص٧٧٨، ٧٧٩.

[٥٩] بڕوانە: (فتح الباري) ج٤ص٧٨٠.

ب-(عن عبدالرحمن بن عبدالقاريّ انه قال: خرجتُ مع عمر بن الخطاب ﷺ ليلةً في رمضـان الى المَسْجِد فاذا الناس أوْزاعٌ متفرّقون يصلّيّ الرّجُلُ لِنَفْسِهِ، ويُصلّي الرجُلُ فَيُصَلّيّ بِصَلاتِـهِ الرّهْطُ، فقال عُمَرُ: إني أرى لَوْ جَمَعْتُ هؤلاءِ على قارئٍ واحدٍ لكانَ أمْثَلَ، ثمَّ عَزَمَ فَجَمَعَهُمْ على أُبَـيِّ بـن كَعْبٍ..) رواه البخاري.

واته: شەوێکی ڕەمەزان لەگەڵ عومەری کوڕی خەطّاب دا چووەمە مزگەوتێ، دیاربوو خەڵك بەجیا جیاو پرژو بڵاوی نوێژیان دەکرد، پیاوی واهەبوو بۆ خۆی نوێژی دەکرد، وە پیاوی واش هەبوو کۆمەڵێك لەگەڵ نوێژەکەیدا نوێژیان دەکرد، عومەر گوتی: من پێم وایە ئەگەر ئەم خەڵکە لەسەر قورئان خوێنێك کۆبکەمەوە باشتر دەبێ پاشان بڕیاریداو لەسەر (ابي بن کعب) کۆی کردنەوە - کەپێش نوێژی یان بۆ بکات -.

ج-(عن عروة أن عائشة رضي الله عنهما أخْبرتْهُ أن رسول الله ﷺ خَرَجَ لَيْلَـةً مـن جـوْف اليـل فَصَلّى في المَسْجِد وَصَلّى رجالٌ بصلاتِه، فاصبح الناسُ فَتحدّثُـوا، فاْجتمعَ اكـثرُ منـهم، فصلـوا معـه، فاصبح الناس فتحدَّثُوا فَكَثُرَ أهْلُ المَسْجِدِ من الليلة الثالثة، فَخَرَجَ رسولُ الله ﷺ فَصَلى فَصَلُّوا بصَلاتـه، فَلَما كانت الليلة الرابعةُ عَجَزَ المسجِدُ عن أهْلِهِ حتى خرج لصلاة الصُّبْحِ، فَلَما قَضىْ الفَجْرَ أقبل على الناسِ فتشهَّدَ ثم قال: أما بَعْدُ فانه لَمْ يَخْفَ عليَّ مكانُكُمْ ولكني خَشِيْتُ أنْ تُفْرَض عليكـم فَتَعْجَـزوا عنها، فَتوفي رسولُ الله ﷺ والأمْرُ عليُ ذلك). رواه البخاري.

واتـه: عائشه خـوا لێـی ڕازی بـێ هـەواڵی بـە (عـروة بـن الزبـیر) داوە کـە شـەوێکیان پێغەمبەر ﷺ لەنیوەشەودا چۆدەرێ‌و لەمزگەوتێ نوێژی کردو، چەند پیاوێکیش لەگەڵ نوێژەکەیدا نوێژیان کرد، جا بەیانی خەڵکی باسی ئەو مەسەلەیان کرد، وە -بۆ شەوی دووەم - خـەڵکێکی پـتر کۆبوونـەوەو نوێژیـان لەگـەڵ کـرد، دیسـان بەیانییەکـەی خـەڵك باسیان کرد، وە لەشەوی سێیەم دا خەڵکی مزگەوت زۆربوون، جا پێغەمبەر ﷺ چووە دەرو نوێژی کردو ئەوانیش نوێژیان لەگەڵ کرد، جا شەوی چوارەم -هێندە قەڵەباڵغ بوو بوو - مزگەوت جێی خەڵکەکەی تێدا نەدەبوو، - ئیدی پێغەمبەر ﷺ بۆ شەونوێژ نەچووە مزگەوت - تا بۆ نوێـژی بەیانیچوو. جا کـاتێك نوێـژی بـەیانی تـەواوکرد. ڕووی کـردە خەڵکەکەو شایەتمانی هێناو پاشان فەرمووی: (( أمّا بَعْدُ): بێگومـان لـێرەبوونی ئێـوەم دەزانی و پەنهان نەبوو، بەڵام لەوە ترسام - کە بەهۆی بەردەوام بوونمانەوە - لەسەرتان پێویست بکرێ‌و پاشان بۆتان نەکرێ))، جا چۆنیەتی نوێژی تەراویح هەر بەو جۆرە بوو کەپێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی دوایی کرد.

د-دەربارەی ڕکاتەکانی نوێژی تەراویحیش هەرچەندە زۆربەی[٦٠] هەرە زۆری زانایان کە (حەنەفی یەکان و شافیعی یەکان و حەنبەلی یەکان و ثوري و ابن المبارك و داود)یان لەنێودان ڕایان وایە کە بیست (٢٠) ڕکات بێ بێجگە لەوەتر، بەڵام ئەوەی کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ هاتوە ئەوەیە کە شەوانە بەنوێژی وەترەوە لەڕەمەزان و غەیری ڕەمەزانیش دا هەر یازدە (١١) ڕکاتی کردوون، وەك (عائشة) خوا لێی ڕازی بێ گوتوویەتی: (ماكان يزيدُ في رمضان ولا في غَيْرِهِ علىٰ إِحْدىٰ عَشْرَةَ رَكْعَةً) رواه البخاري ومسلم وغيرهما، واتە: پێغەمبەر ﷺ لەڕەمەزان و غەیری ڕەمەزانیش دا - شەونوێژی لەیازدە ڕکات زیاتر

---

[٦٠] بەڵام (مالك) ڕای وایە کە (٣٦) ڕکات بێ بێجگە لە وەتر، واتە: بەوەترەوە کە سێ ڕکاتە سی ونۆ (٣٩) ڕکات، وە لە (أسود بن مزيد) گێڕاوەتەوە کە چل (٤٠) ڕکاتی کردوە لەگەڵ حەوت (٧) ڕکاتی وەتر کە دەکاتە چل وحەوت (٤٧) ڕکات، جا وەك (نووي) گوتوویەتی: (مالك) کردەوەی خەڵکی مەدینە (عمل أهل المدينة) ی کردۆتە بەڵگەی ڕایەکەی خۆی، ئەوانەش کە دەڵێن دەبێ تەراویح بیست ڕکات بێت - واتە بە وەترەوە بیست وسێ (٢٣) ڕکات -، ئەم دەقانە بە بەڵگە دێننەوە:

أ-(عن السائب بن يزيد رضي الله عنه قال: كانوا يقومون على عهد عمر بن الخطاب رضي الله عنه في شهر رمضان بعشرين رَكْعَةً، وكانوا يقومون بالمائتين، وكانوا يتوكؤون على عِصِيِّهم في عهد عثمان -رضي الله عنه - من شِدَّةِ القيامِ) رواه البيهقي وغيره بلأسناد الصحيح لما يقول (النووي).

ب- (عن يزيد بن رومان قال: كان الناس يقومون في عهد عمر بن الخطاب رضي الله عنه بثلاث وعشرين ركعة) رواه مالك في الموطأ والبيهقي لكنه مرسل كما يقول النووي.

ج- (عن علي رضي الله عنه أنه قال: قيام رمضان بعشرين ركعة) رواه البيهقي.

بەڵام ئەم دەقانە - وەك (ناصرالدين الألباني)ساغی کردۆتەوە کە دواتر قسەکانی لێوە نەقڵ دەکەین - بێ هێز (ضعيف)ن بۆیە ئەوە ناکەن ئیسپاتی ئەوەیان پێ بکرێ کەبیست ڕکات سوننەت بێت.

بەڵام پێویستە لێرەدا چەند شتێك بزانرێ کە تێکڕای زانایان لەسەریان یەکدەنگن: یەکەم: بەکۆمەڵ کردنی نوێژی تەراویح سوننەتەو خێرترە لەوەی کە بەتەنیا بکرێ، دووەم: سوننەتە زۆر قورئان لەڕکاتەکانی تەراویح دا بخوێنرێ و کەم قورئان تێدا خوێندران و بەپە پەل کرانیان بیدعەتەو پێچەوانەی سوننەتە.

سێیەم: نوێژی تەراویح لەشێوەی کردنی‌داو لەخوێندنی (دعاء الأستفتاح) و (استعاذة) زیکرەکانی ڕکووع و سەجدەو دووعایەکانی تەحییات و هەموو سوننەت و شێوە پەسەندەکانی دیکەی نوێژدا کت ومت وەك نوێژە فەڕزەکان - کە بەدرێژی باسمان کردوون - وایەو هیچ جیاوازی یان نیە، کەواتە:

با هەموو ئەو کەسانەی کە لەئەنجامی نەزانی و بێ ئاگایی لەدەقەکانی سوننەت و کتێبە شەرعی یەکانیش وا حاڵی بوون یان وا حاڵی کراون کە هەتا نوێژەکانی تەراویح بەپەلە پرووزەترو خێرا خێرا تر بکرێن چاکترە! بزانن کە بە هەڵەدا چوون و هیچ کام لەزانایان شتی وایان نەگوتوە سەرجەمیان لەسەر ئەوە ڕێك کەوتوون کە دەبێ قورئانی زۆر لەڕکاتەکانی تەراویح دا بخوێنرێ، بۆ وێنە: (نووي) لە (المجموع) دا لەژێر سەرباسی: (فرع فيما كان السلف يقرؤن في التراويح)دا، چەند دەقێك لەوبارەوە نەقڵ دەکات کە ئەمە یەکێکیانە: (كان القارئ يقوم بسورة البقرة في ثمان ركعات) رواه مالك في الموطأ عن داود بن الحصين عند عبدالرحمن الأعراج، واتە: عادەت وابوو بابای قورئان خوێن - مەبەست ئیمامە - سوورەتی، (البقرة)ی لەهەشت ڕکاتان دا دەخوێند، بڕوانە: (المجموع) ج٤ص٣٩.

بۆ زانیاری زیاتریش دەربارەی نوێژی تەراویح بڕوانە ئەم سەرچاوانە:

١-(المجموع) ج٤ص٣٦تا٤٠، ٢-(المغني والشرح الكبير) ج٢ص٧٩٨تا، ٨٠٢، ٣- (فتح الباري) ج٤ص٧٧٨تا٧٨٣، ٤-(فقه السنة) ج١ص٢٤٤تا ٢٢٦.

جا بێگومان مەبەستی (عائشة) خوا لێی ڕازی بێ شەونوێژو وەترە بەیەکەوە، [61] وەك لە فەرموودەکانی دیکەدا

---

[61] بەپەسەندی دەزانم کە لێرەدا پوختەی نامیلکەی (صلاة التراويح)ی زانای ناوداری فەرموودەناس (مُحَدِّث)ی ئەم ڕۆژگارە: (شیخ ناصرالدين الألباني)، خوا لێی خۆشبێ بۆ بەرچاوڕوونی زیاتری خوێنەرە بەڕێزەکان لەبارەی نوێژی (تەراویح)ەوە بێنمەوە، ئنجا شایانی باسیشە کە ئەم پوختەیەی دەشی نووسین هەر خۆی کردوویەتی لەکۆتایی نامیلکەکەدا کە بەڕاستی لێکۆڵینەوەیەکی وردو زانستییانەیە لەبارەی تەراویحەوە، بەتایبەت ژمارەی ڕکاتەکانی، جا من بۆ ئاسانکردنی تێگەیشتنی ئەوەی نووسیویەتی کە چەند بڕگەیەکە لە هەر بڕگەیەك ژمارەیەك دادەنێم پاش لێکۆڵینەوەیەکی تێرو تەسەل نووسیویەتی:

پوختەی مەبەست:

١-بەکۆمەڵ کردنی نوێژی تەراویح سوننەتەو بیدعەت نیە، چونکە پێغەمبەر ﷺ چەند شەوێك کردوویەتی، بەڵام دوایی وازی لێهێنا - واتە وازیلە بەکۆمەڵ کردنی هێنا - لەترسی ئەوە ئەوەك یەکێك لەئوممەت بەفەڕزی بزانێ ئەگەر لەسەری بەردەوام بێ، جا ئەو مەترسییە بەکۆچی دوایی ئەو ﷺ کە شەریعەت تەواوبووە، نەماوە.

٢-وە پێغەمبەر ﷺ بەیازدە ڕکات کردوویەتیو، ئەو فەرموودەیەی کە دەڵێ بەبیست ڕکات کردوویەتی زۆر بێهێز (ضعيف)ە.

٣-وە دروست نیە لەیازدە ڕکات زیاتر بکرێ، چونکە زیادکردنی دەبێتە مایەی هەڵوەشاندنەوەی کردەوەی ئەو ﷺ و کارپێنەکردنی فەرموودەی: (صلوا كما رأيتموني أصلي) هەر بۆیەشە کە دروست نیە سوننەتی پێش نوێژی بەیانیو غەیری دیش لێیان زیاد بکرێ.

٤- وە ئێمە کەسانێك کە نوێژی تەراویح بەزیاتر لەو - یازدە ڕکات -ە دەکەن بیدعەچیو گومڕا دانانێین، مادام ڕێبازی پێغەمبەریان بۆ ڕوون نەبووبێتەوەو لەسۆنگەی ئەوەوە شوێنی نەکەوتبن.

٥-وە ئەگەر گریمان بشگوترێ: دروستە لەو ژمارەیە زیاد بکرێ ئەوە بێگومان هەر چاکتر وایە بەس ئەو ئەندازەیە بکرێ چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: (خير الهَدْيِ هَدْيُ مُحمد) باشترین ڕێباز ڕێبازی موحەممەدە ﷺ.

٦-وە عومەر خوا لێیڕازیبێ هیچ شتێکی لەنوێژی تەراویح دا دانەهێناوە، بەڵکو بەس سوننەتی بەکۆمەڵ کرانی زیندوو کردۆتەوەو پارێزگاریشی لەسەر ژمارە سوننەتییەکەی کردوە، وە ئەوە کە گوایە لێی زیاد کردوە هەتا کردوویەتییە بیست ڕکات، هیچ کام لە ڕێیەکان - واتە زنجیرەی ڕاوییەکان - ی ڕاست نین، وە ئەو ڕێیانە لەوجۆرە نین کە هەندێکیان هەندێکیان بەهێز بکات، وە هەرکام لەشافیعیو ترمذي ئاماژەیان کردوە بۆ بێهێزی ئەو ڕێیانە، وە (نووي)و (زيعلي) و غەیری ئەوانیش هەندێکیانیان بەبێ هێز داناوە.

٧-وە ئەگەر گریمان ئەو زیادکردنە بشسەلمێنرێ، ئەوە ئێستا پێویست نیە کاری پێبکرێ، چونکە لەبەر هۆیەك بووە کەئێستا نەماوە*، وە زۆرجار سووربوون لەسەر کردنی بیست ڕکات وا لەخاوەنەکانیان دەکات کە نوێژەکانیان بەپەلە پەل بکەنو گەردن کەچی (خشوع)یان تێدا نەمێنێ، بگرە هەندێك جار هەر بەریش نەکەون**.

٨-وە ڕەفتار نەکردنی ئێمە بەو قسەو ڕایەی عومەر کە لەنوێژی تەراویح زیاد بکەین و { بیکەینە بیست ڕکات }*، ڕاست وەك ڕەفتار نەکردنی دادگا شەرعییەکان (المحاكم الشرعية)*بەو ڕایەی عومەر کە تەڵاقی سێبەسێ بەسێ دابنرێ (إقاع الطلاق الثلاث ثلاثا) وە هیچ جیاوازییان نیە! بەڵکو تەنانەت لەلای شوێنکەوتووان (مقلّدين)ی مەزەبەکانیش ئەوەی ئێمە لەپێشترە***!

٩-وە لەهیچ کام لەهاوەڵانەوە بەڕێیەکی ڕاست ئیسپات نەبووە کە تەراویحیان بە بیست ڕکات کردبێ، بەڵکو (ترمذي) ئاماژەی کردوە کەئەوەی لەوبارەوە لە (علي) خوا لێیڕازیبێ هاتوە بێهێز (ضعيف)ە.

١٠- وە { بەپێچەوانەوەی ئەوەوە کە هەندێك گوتوویانە }* یەکدەنگی - زانایان - لەسەر ئەو ژمارەیە {واتە ژمارەی بیست}* دانەمەزراوە.

١١-وە پێویستە بەو ژمارەیەوە پابەندبین کە سوننەتە، چونکە هەر ئەوە لەپێغەمبەرەوە ﷺ ئیسپات بووە، وە لەعومەریشەوە، دیارە فەرمانیشمان پێکراوە کە شوێن ڕێبازی ئەو ﷺ و ڕێبازی جێنشینە سەر ڕاستەکانی -خوا لێیان ڕازی بێ - بکەوین.

ڕوون کراونەتەوە، ئاشکراشە کە شوێن کەوتنی ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ پێویستە هەر قسەو بیروڕایەکی دیکەی بەقوربان بکرێ ئەگەر خەڵکی دنیاش سەرجەم لەسەری کۆببوون، وەك بۆ خۆی فەرموویەتی:

(وخَيْرَ الهَدْيِ هَدْيِ مُحَمَّدٍ ﷺ) رواه مسلم.

* ئنجا بێگومان مانگی ڕەمەزان هەمووی هەر خێرو بەرەکەتە، بەڵام دە شەوی کۆتایی ئیمتیازو پلەو پایەیەکی تایبەتیان هەیە لەسۆنگەی ئەوەوە کە شەوی (قَدرْ) یان تێدایە، پێغەمبەر ﷺ لەوبارەوە فەرموویەتی: (تَحَرَّوا ليلـةَ القـدر في العشـر الأواخـر مـن رمضـان) رواه البخاري عن عائشة رضي الله عنها، واتە: لەدەیەکانی کۆتایی ڕەمەزان دا بۆ شەوی قەدر بگەڕێن.

جا هەر بۆیەش پێغەمبەری خوا ﷺ گرنگیو بایەخێکی تایبەتی بەخواپەرستیکردن لەو دەشەوەدا ﮪەدا، وەك (عائشة) خوا لێیڕازیبێ گێڕاویەتەوە: (كان النبيُّ ﷺ إذا دَخَلَ العَشْـرُ شَدَّ مِئْزَرَهُ، وأحيا لَيْلَهُ. وأيْقَظَ أهْلَهُ) رواه البخاري، واتە: پێغەمبەر ﷺ عادەتی وابوو کە دەیەکان - ی کۆتـایی ڕەمـەزان - دەهـاتن خـۆی گـورج و گـۆڵ دەکـرد (یـان دووری لەخێزانـەکانی

---

١٢-وە زێدەکردن لەو ژمارەیە {مەبەستی یازدە ڕکاتە} * هەرکام لە (مالك وابن العربي) و زانایانی دیکەش بەهەڵەیان داناوە.

١٣- وە ڕەخنەگرتنیش لەو زیادکردنە مانای ڕەخنەگرتن نیە لەو پێشەوا موجتەهیدانەی کە ئەو ڕایەیان هەڵبژاردوە، هەروەها پێچەوانەی ئەوانبەسیرکردنەوەو ڕەفتارکردنیش تانە لێدان لەزانیاریان یان بەچاکتر دانانی پێچەوانە ڕەفتارکەریان لە زانیاریو تێگەیشتن دا، ناگەیەنێ.

١٤-وە هەرچەندە دروست نیە لەیازدە ڕکات زیاتر بکرێ، بەڵام بەلای کەمکردنەوەدا هەتا یەك ڕکاتیش دروستە، چونکە ئەوە لەسوننەت دا ئیسپاتە، وە پێشین - سلف - یش وایان کردوە.

١٥-وە هەموو ئەو شێوانەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی وەتری پێکردوون دروستن. بەڵام چاکترینیان زۆر ترینیانەو سەلام دانەوەیە لەدوای هەر دوو ڕکاتێك****.

---

* ئەویش ئەوەیە کە لەسۆنگەی ئەوەوە لەڕۆژگاری عومەردا خوا لێی ڕازیبێ مسوڵمانان زۆریان قورئان لەنوێژی تەراویح دا دەخوێند تەنانەت هەتا تەواو دەبوون لەبەرەبەیانی نزیك دەبوونەوە، گوایە عومەر خوا لێی ڕازیبێ ویستوویەتی بە مەبەستی لەسەر سووك کردنیان ڕکاتەکانیان بۆ زیاد بکات، بۆئەوەی بەهۆی زۆر ڕاوەستانەوە ماندوو و شل نەبن، جا نووسەر (شێخ ناصر) دەڵێ: مادام ئێستا مسوڵمانان نوێژی تەراویحیان زۆر کورت کردوونەوەو کەمیان قورئان تێدا دەخوێنن، ئەوە پاساو (مبڕر)ی ناوبراو نەماوە بۆ زۆرکردنی ڕکاتەکانی تەراویح..

** بەهۆی ئارام نەگرتن لەڕکووعو سەجدەکان دا،فڕیانەکەوتنی خوێندنی فاتیحەو تەحییات بەڕاستو ڕەوانیو لەپێش هەموو شتێکیشەوە نەبوونی بیر لێکردنەوەو گەردن کەچی (خشوع) کە ڕووحو کاکڵەی نوێژە!

*** چونکە ئەگەر سەرپێچی کردنی ڕای عومەر خوا لێی ڕازی بێ گوناح بێت، بێگومان لەمەسەلەی تەڵاق دا گوناحترو مەترسیدارترەو شوێنەواری خراپی زیاترن لەنوێژی تەراویح کە شتێکی شەخسییە.

**** بڕوانە نامیلکەی ناوبراو (صلاة التراويح) ص١٠٦تا١٠٨ ، کە بەندە وەك خۆیو بێهیچ دەستکارییەك وەرم گێڕاوەتە سەر کوردی، چاپی دووەمی ساڵی ١٤٠٥/١٩٨٥.

* ئەمەی نێوان کەوانەکانی ئاوا: { } خۆم زیادم کردوە.

دەگــرت و نــەدەچووە لایــان)[٦١]، وە شــەوگاری زینــدوو دەکــردەوە - بەخواپەرســتی و نەدەنووست یان کەمێك دەنووست -، وە خێزانی بێدار دەکردەوە.

## ٦-ئەوانــەی کــە مۆڵــەتیان هەیــە لــەکاتی خــۆیدا ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان نەگرن:

وەك پێشتر باسمان کرد گرتنی ڕۆژووی ڕەمەزان فەرزی تایبەتی (فرض العين) ە لەسەر هەموو مسوڵمانێکی عاقڵ و باڵغ، بەڵام خوای پەروەردگار و بەخشندە لەچەند حاڵەتێك دا مۆڵەتی داوە کە بابای مسوڵمان ڕۆژووی ڕەمەزان نەگرێ، بۆئەوەی دووچاری سەغڵەتی و زەحمەت نەبێ، چونکە خوا حەز ناکات بەندەکانی سەغڵەت و تەنگەتاو بکات وەك فەرموویەتی: ﴿وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ.... ﴾ الحج:٧٨، واتە: وە -خوا- ئاسانی بۆ ئێوە دەوێ و نایەوێ لەسەرتان قورس بکات.

هەروەها فەرموویەتی: ﴿ يُرِيدُ اللَّهُ بِكُمُ الْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ﴾ البقرة: ١٨٥،

واتە: خوا ئاسانی بۆ ئێوە دەوێ و نایەوێ لەسەرتان قورس بکات.

جا ئەو کەسانەی کە بۆیان هەیە، بگرە جاری وایە لەسەریشیان پێویستە، کە ڕۆژووی ڕەمەزان لەکاتی خۆیدا نەگرن، بەگشتی سێ جۆرە کەسن:

جۆری یەکەم: مۆڵەتیان پێدراوە نەیگرن بەڵام دەبێ فیدیە (فدية) بدەن:

ئەمانیش چەند بەشێکن:

یەك: پیرەمێردو پیرەژنی بەساڵداچووی کەنەفت کە تواناو برستی ڕۆژووگرتنیان نیە لەهیچ کام لەکەش (فصل)ەکانی ساڵ دا، چونکە خوای بە بەزەیی فەرموویەتی:

﴿وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَـهُ فِدْيَـةٌ طَعَـامُ مِسْـكِينٍ ﴾البقرة: ١٨٤، واتـە: وە ئەوانـەی بەبەکارهێنانی هـەموو[٦٣] وزەیانـەوە ئـەوجار دەتوانـن بیگـرن، بـا فیدیـە بـدەن کـە خواردنـی نەدارێکـە -بۆ هەر ڕۆژێك-[٦٤].



[٦٢] بڕوانە: (فتح الباري) ج٤ص٢٠٨..

[٦٣] چونکە (اطاق) ئەو مانایەشی هەیە، بڕوانە: (المعجم الوسيط) ص٢٥٧١ وە بڕوانە: (الفقه الأسلامي..) ج٣ص١٧٤٢ کە لەتەفسیری، (وعلى الذين يطيقونه)دا نووسیویەتی: (أي على الذين يتحمّلون الصوم بمشقة شديدة، الفدية)، یانی وە ئەوانەی کە بەزۆر زەحمەت و نارەحەتی ڕۆژوویان بۆ دەگیرێ، با فیدیە بدەن.

[٦٤] ئەم ئایەتە تەفسیری دیکەشی هەیە بڕوانە: (فتح الباري) ج٤، ٢٤، ٣٥.

وە ئەوە کە پیاوو ئافرەتی پیرو کەنەفت ڕۆژوویان لەسەر نیەو دەبێ فیدیە بدەن، بۆ ڕۆژوو لەسەر نەبوونیان - مادام لەتوانایان دا نەبێ مەگەر بەزەحمەت و ناڕەحەتی یەکی زۆر، کە بێگومان مەترسی تێداچوون هەبوونیشی تێدا بەمەرج نەگیراوە -، زانایان یەکدەنگن، بەڵام فیدیە دانیان ئەوە ڕای زۆربەی زانایانە کە (ابو حنيفةو شافيعي واحمدو ثوري اوزاعي)[٦٥] یان لەنێودا هەن، هەندێکیشیان کە (مالك و مَكْحُول و ربيعة ابوثور و ابن المنذر)[٦٦] یان لەنێودان دەڵێن: فیدیەیان لەسەر نیە.

بەڵام وا پێدەچێ ڕای زۆربەو جەماوەر ڕاست تر بێت، چونکە (ابن عباس) خوا لێیان ڕازیبێ لەتەفسیری ڕستەی: (وعلى الذين يطيقونه فدية طعام مسكين)دا گوتوویەتی[٦٧]: (للشيخ الكبير والمرأة الكبيرة، لايَسْتطيعان أنْ يصوما فَيُطْعِمان مَكانَ كلِّ يوم مِسْكيناً) رواه البخاري عن عطاء.

واتە: ئەم ئایەتە دەربارەی پیاوی پیرو ئافرەتی پیرە کە ناتوانن بەڕۆژووبن، جا لەجیاتی هەر ڕۆژێک خواردنی نەدارێک دەدەن.

دیارە هەندێک لەزانایانیش ڕایان وایە کەڕستەی: (وعلى الذين يطيقونه فدية طعام مسكين) بەڕستەی: (فَمَنْ شَهِدَ منكم الشهر فَلْيَصُمْهُ) کە لە ئایەتی دوایی‌دا هاتوە نەسخ کراوەتەوەو لەسەرەتاوە مسوڵمانان بۆیان هەبووە بەڕۆژووبن، یان بەڕۆژوو نەبن و فیدیە بدەن و پاشان ئەو حوکمە بۆ کەسانێک کە توانای ڕۆژووگرتنیان هەیە نەسخ کراوەتەوەو بۆ کەسانێکیش کە لەوزەو توانایان دا نیە، هەر لەشوێنی خۆیەتی[٦٨].

بەڵام بەهەرحاڵ ئەوەی گرنگە ئەوەیە کە سەرجەم زانایان لەسەرئەوە یەکدەنگن کە پیاوو ئافرەتی پیری بێ‌توانا ڕۆژووگرتنیان لەسەر نیەو دەبێ - بەڕای زۆربەیان - فیدیە بدەن، بەڵام ئەگەر فیدیەشیان لەتواناد نەبوو و نەیان بوو ئەوە ئەویشیان لەسەر لادەچێ[٦٩] چونکە: (لايُكَلِّفُ الله نَفْساً إلاّ وُسْعَها...) البقرة:٢٨٦.



[٦٥] (المجموع) ج٦ص٢٥٨.

[٦٦] سەرچاوەی پێشوو هەمان بەرگو لاپەرە.

[٦٧] بڕوانە: (نيل الاوطار) ج٤ص٣١٤.

[٦٨] بڕوانە: (جامع البيان) للطبري ج٢ص١٨٥تا١٩١، وە بڕوانە: (الجامع لأحكام القرآن) للقرطبي ج١ص٢١٩تا٢٢١ وە بڕوانە: (فتح الباري) ج٤ص٦٩٨تا٧٠٠.

[٦٩] بڕوانە: (المفصل) ج٢ص٣٧، وە بڕوانە: (المغني) ج٣ص١٦، وە: (المجموع) ج٦ص٢٥٧.

ئنجا لەبارەی ئەندازەی ئەو فیدیەیەشەوە کە خوای کاربەجێ بۆ خۆی بە خواردنی نەدارێك (طعام مسكين) تەفسیری کردوە، زانایان چەند قسەیەکیان هەیە کە لەیەکترەوە نیزیکن:

هەرچی (شافیعی طاوس و سعید بن جبیر و ثوري اوزاعي)[٧٠]ین دەڵێن: مست (مُدّ)ێکە لەبژێوی زۆربەی خەڵکی ئەو شوێنە، (احمد)یش ڕای وایە کە ئەگەر (گەنم) بێت ئەوە مستێکە بەڵام ئەگەر (خورماو جۆ) بوون دەبێ دوو مست بێ[٧١]، (ابو حنیفة)ش ڕای وایە لەگەنم نیو صاع و ئەگەر خورماش بوو صاعێك[٧٢]، دیارە (صاع)یش چوار مستە[٧٣].

دوو: نەخۆشێك کە هیوای چاکبوونەوەی لێناکرێ و (مریض لایُرجی بَرؤه) ئەمیش هەم لەنەگرتنی ڕۆژوو داو هەم لەفدیە دان دا کتومت وەك پیرەمێردو پیرەژنی کە نەفت وایە[٧٤]، بەڵام ئەگەر ئومێدی چاکبوونەوەی هەبێ ئەوە جۆرێکی دیکەیەو حوکمەکەشی جیایە، وەك دوایی باسی دەکەین.

ئنجا شایانی باسیشە کە هەرکام لەبابای پیرو نەخۆش ئەگەر هات و دڵنیابوون کە لەئەنجامی ڕۆژووگرتن دا حاڵیان زیاتر شپرز دەبێ و بەرەو مەرگ دەچن، ئەوە لەسەریان حەرام دەبێ بەڕۆژووبن و ئایەتی (وَلَا تُلْقُوا بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ..) البقرة:١٩٥، وە ئایەتی: (وَلَا تَقْتُلُوا أَنفُسَكُمْ إِنَّ اللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا) النساء:٢٩، دەیانگرنەوە.

سێ وچوار: ئافرەتی ئاوس(سك پڕ) و ژنی شیردەر (الحامل والمُرْضِع)، بەڵگەی مۆڵەت پێدرانی ئەم دووانەش ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەرە ﷺ: (إن الله عزَّ وجَلَّ وضَعَ عن المُسافِر الصَّومَ وشَطْرَ الصلاة، وعن الحُبْلىٰ والمُرْضِعِ الصَّوم) رواه احمد واصحاب السنن، عن أنس بن مالك الكعبي.

واتە: بێگومان خوای زاڵ و خاوەن شکۆ ڕۆژوو و نیوەی نوێژی لەسەر ڕێبوار لابردوە وە ڕۆژووی لەسەر ژنی ئاوس و ژنی شیردەر لابردوە.

بەڵام بێگومان مەرجی مۆڵەت پێدرانی ئەم دوو جۆرە ژنە ئەوەیە کە ئەگەر بەڕۆژوو بن مەترسییان لەخۆیان یان لەخۆیان و کۆرپە شیرەخۆرەکەیان، یان تەنیا لەکۆرپە شیرەخۆرەکەیان هەبێ.



[٧٠] بڕوانە: (المجموع) ج٦ص٢٥٨.
[٧١] هەمان سەرچاوەی پێشوو
[٧٢] هەمان سەرچاوەی پێشوو
[٧٣] لەباسی زەکات دا پێناسەی (صاع)مان کردوە.
[٧٤] بڕوانە: (المغني) ج٣ص١٦، وە: (المجموع) ج٦ص٢٥٧، وە: (الفقه الأسلامي) ج٣ص١٧٠٠، ط٤.

جا ئەگەر بەهۆی ڕۆژووگرتنەوە مەترسی‌یان لەخۆیان یـان لـەخۆیان‌و منداڵـەکانیان هەبوو، ئـەوە زۆربـەی زانایـان دەڵێـن: بـەڕۆژوو نـابن بـەڵام دەبـێ دوایـی ڕۆژووەکانیـان بگێڕنەوە[٧٥]، بەڵام ئەگەر مەترسی‌یان تەنیا لەمنداڵەکانیان هەبوو، ئەوە دیسان زۆربەیان کە (عطاء و حسن و ضحاك و نخعي و زهري و ربيعة و اوزاعي و ابوحنيفة و ثـوري و ابوعبيد وابوثور واصحاب الراي) یان لەنێودان، دەڵێن: بەڕۆژوونابن‌و پاشان ڕۆژوەکانیان دەگێڕنەوەو فیدیە نادەن، (شافعي واحمد)یش دەڵێن: دەبێ وێڕای گێڕانەوەی ڕۆژوەکان فیدیەش بدەن، (مالك)یش دەڵێ: ئافرەتی ئاووس بەس ڕۆژووەکانی دەگێڕێتەوە، بەڵام شیردەر (مرضع) وێڕای گێڕانەوە دەبێ فیدیەش بدات[٧٦].

بەڵام (ابن عمر وابن عباس وسعيد بن جبير) خوا لێیان ڕازی‌بێ، دەڵێن: ژنـی ئـاوس‌و ژنـی شـیردەر لەهـەموو حـاڵان دا واتـە مەترسـی‌یان تـەنیا لـەخۆیان هـەبێ بـەهۆی ڕۆژووگرتنەوە، یان تەنیا لەمنداڵەکانیان یان لەخۆیان‌و منداڵەکانیان، ئەوە بەڕۆژوو نابن‌و دواییش نایگێڕنەوە بەڵکو بەس فیدیە دەدەن[٧٧].

واش پێ‌دەچێ کەڕای زۆربە بەهێزتر بێ، چونکە مادام دەق نەبێ لەسەر فیدیە دانیان، دەگونجێ بەعەقڵ تەماشای مەسەلەکە بکەین‌و، کاتێکیش بەعەقڵ ڕادەمێنین، دەتوانین بڵێین:

هەرکام لە ژنی ئاوس‌و شیردەر مادام لەکاتی خۆی‌دا شەرع ڕێی داون بەڕۆژوو نەبن، جا چ لەبەر خۆیان وە چ لەبەر خۆیان‌و منداڵەکانیان یان هەر لەبەر کۆرپەو منداڵەکەیان بێ، کەواتە تـەنیا ڕۆژوو قـەرزدارن‌و شـەرعیش ئـەو قـەرزەی پـێ‌داون‌و ئـەو ڕێیـەی داون! دەجـا باشـە بۆچـی لـەکاتی وەرگێرانـەوەی قەرزەکـەدا سـوود (ربـا)ی فیدیـەی دەچێتە سەری؟![٧٨]

---

[٧٥] بگرە ئەگەر لەبەر (ابن عمر وابن عباس‌و ابن جبير) نەبووایە دەمانگوت: تێکڕای زانایان، وە بڕوانە: (المجموع) ج٦ص٢٦٩.

[٧٦] بڕوانە/ (المجموع) ج٦ص٢٦٩، وە (الفقه الأسلامي) ج٣ص١٧٠١.

[٧٧] بڕوانە: (المجموع) ج٦٢٦٩، وە: (المغني) ج٣ص٢١، وە: (فقه السنة) ج١ص٥٨٣.

[٧٨] ئەوەی سەرێ وەڵامی (شافیعی و احمد و مالك) ە، کە شافیعی‌و ئەحمەد بۆ هەرکام لەئاوس (حامل) و شیردەر (مرضع) مالیکیش بۆ شیردەر وێڕای گێڕانەوە (قضاء) فیدیەشیان بەفەرز زانیوە، جا دیارە بێ ئاگاش نیم لەوەی کە ئەوە بە بەڵگە دێننەوە کە ئاوس‌و شیردەریش دەچنە نێو جوغزی مانای گشتی (وعلى الذين يطيقونه فدية)! بەڵام لەڕاستی‌دا ئەو ڕایە ڕاست نیە چونکە پیاوو ئافرەتی پیرو کەنەفت‌و نەخۆشی بێ‌ئومێد لەچاکبوونەوە هەرسێکیان عوزرێکی هەمیشەیی‌و بەردەوامیان هەیـە بـۆ نـەگرتنی ڕۆژوو، بەڵام ژنی ئاوس و ژنی شیردەر تـەنیا بەشێوەیەکی کاتی (مؤقت) خاوەن عوزر (معذور) ن بـۆ نـەگرتنی ڕۆژووەکانیـان‌و پـاش تێپـەڕینی ئـەوکات‌و هەل‌ومەرجـە کاتی‌یـە، دەتوانـن ڕۆژووەکانیـان بگێڕنەوە، کەواتە (ئاوس و شیردەر) لەپیرو نەخۆشی نائومێد جیان‌و ئایەتەکە نایانگرێتەوە، وە ئاوس‌و

دیاره وەك پێشتر گوتم ئەگەر دەقی شەرعی هەبێ ملمان کەچەو ڕێی ئەوجۆرە هەڵسەنگاندنە عەقڵیەمان نیە، بەڵام مادام دەق نەبێ و هەر بەقیاس و عەقڵ و ڕاوبۆچوون دانرابێ، ئێمەش ڕێی هەڵسەنگاندنی عاقڵانەمان هەیە.

پێویستە ئەوەش بگوترێ کە زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە ئافرەتی شیردەر یەکسانە دایکی منداڵە شیرە خۆرەکە بێت یان نا[79].

وە بۆ دیاریکردنی سنووری هەبوون و نەبوونی مەترسی (خوف) کە گوتمان هەرچی مۆڵەت (رخصة) پێدرانی ڕۆژوونەگرتنی ژنی ئاوس و ژنی شیردەرە، زانایان گوتوویانە یان دەبێ لەسەر بناغەی گومانێکی زاڵ (ظَنٌّ راجِحٌ) بێت کە لەئەزموون و شارەزایی پێشترەوە پەیدابووە، یان پزیشکێکی مسوڵمانی شارەزاو دادگەر بڕیار بدات[80].

**جۆری دووەم:** مۆڵەتیان پێدراوە کەنەیگرن بەڵام دەبێ دوایی بیگێڕنەوە:

ئەمانیش چەند بەشێکن:

یەك و دوو: نەخۆش و ڕێبوار، خوای پەروەردگار لەبارەیانەوە فەرموویەتی:

(شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذِي أُنزِلَ فِيهِ الْقُرْآنُ هُدًى لِلنَّاسِ وَبَيِّنَاتٍ مِنَ الْهُدَى وَالْفُرْقَانِ فَمَنْ شَهِدَ مِنْكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ وَمَنْ كَانَ مَرِيضًا أَوْ عَلَى سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِنْ أَيَّامٍ أُخَرَ يُرِيدُ اللَّهُ بِكُمُ الْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ وَلِتُكْمِلُوا الْعِدَّةَ...) البقرة: ١٨٥. واتە: ئەو مانگی ڕەمەزانەی کە قورئانی تێدا نێرراوەتە خوار ڕێنوونییە بۆ خەڵك و بەڵگە گەلێکە لەڕێنوونی و جیاکردنەوەی هەق و ناهەق، جا هەر کامێکتان لەو مانگەدا ئامادەو نیشتەجێ بوو با بیگرێ، وەهەر کەسێکیش نەخۆش بوو یان لەسەفەر بوو باچەند ڕۆژێك - بەئەندازەی ڕۆژووە فەوتاوەکانی - لەڕۆژانی دیکە بگرێتەوە، خوا ئاسانی بۆتان دەوێ و نایەوێ لەسەرتان قورس بکات، وە بۆئەوەی ژمارەی ڕۆژوەکان - ی ڕەمەزان - تەواوبکەن..

---

شیردەر کتومت وەك نەخۆش و ڕێبوار (المريض والمسافر) وانە، کە لەکاتی خۆیدا ڕۆژوو ناگرن، بەڵام پاشان دەیگێڕنەوە، بێ ئەوەی فیدیە بدەن، وەك دوایی باسیان دەکەین.

بۆ وەڵامی ڕایەکەی (ابن عمر وابن عباس و ابن جبير)یش دەڵێین: مادام پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (ان الله عز وجل وضع عن المسافر الصوم وشطر الصلاة، وعن الحبلى والمرضع الصوم) کەواتە وەك چۆن ڕێبوار ڕۆژووەکانی بەس دەگێڕێتەوەو فیدیە نادات دەبێ (ئاوس و شیردەر)یش هەروابن، چونکە پێغەمبەر ﷺ پێکەوە باس کردوون و دیارە حوکمیان یەکە، وە لەڕاستیدا ئەم فەرموودەیە بەڵگەشە لەسەر (شافعي واحمد ومالك)یش، وە ئەو شتانەش کە(ابن عمر) و ئەوان بە بەڵگەیان دێننەوە توانای خۆڕاگرییان نیە لەئاقار ئەم دەقەدا کەهێنامانەوە چونکە بەڵگەکانی ئەوان زیاتر قیاس و هەڵهێنجان (استنباط)ن بێگومان هەر خواش زاناترە.

[79] بڕوانە: (المجموع) ج٦ص٢٦٨، وە (الفقه الأسلامي) ج٣ص١٧٠٠.

[80] بڕوانە: (الفقه الأسلامي) ج٣ص١٧٠٠، ط٤.

جا زانایان دەربارەی مەرجەکانی ئەو سەفەرو نەخۆشی‌یەی کە دەبنە پاساو (مبرّ) ی ڕۆژوونەگرتن لە ڕەمەزان دا زۆریان شت گوتوە، بەڵام پوختەی قسان ئەوەیە:

أ-بۆ بابای نەخۆش هەرچەندە خوای پەروەردگار بەموتڵەقی و بەبێ بەندو مەرج (قيد وشرط) فەرموویەتی، بەڵام شتێکی ئاشکراو ڕوونە کە پەنجە بریندار بوونێک‌و دان ئێشەیەک‌و ژانە سەرێک نابنە هۆی سەغڵەتکردن‌و ناڕەحەت بوونی بابای ڕۆژوگر، کەواتە نەخۆشی‌یەک پاساوی بەڕۆژوو نەبوونە کە حاڵ‌و باڵی ئینسان شپرز بکات، یان ڕۆژووگرتنەکە ببێتە مایەی سەخت تر بوونی‌و چاک نەبوونەوە یان درەنگ چاکبوونەوە[81].

هەرچەندە هەندێک لەزانایانی پێشین (علماء السلف) وەک (ابن قدامة) گوتوویەتی[82] موتڵەقی نەخۆشی‌و نەساغی‌یان کردوە بە بیانووی ڕۆژوونەگرتن تەنانەت ئەگەر ئازاری پەنجەو دان ئێشەیەکیش بێت، کە ئەمە ڕای (بخاري وعطاء)وظاهیری‌یەکانیشە[83]، بەڵام بێگومان ڕای زۆربەو جەماوەری نزیک بەیەکدەنگی زانایان چاکترو بەهێزترە کەدەڵێن: دەبێ نەخۆشی‌یەکی وابێ کە ئەو سیفەتانەی تێدابن کەپێشتر باسمان کردن.

ب- بۆ ڕێبواریش کاتێک مۆڵەتی ڕۆژوونەگرتنی مانگی ڕەمەزانی پێ‌دەدرێ کە سەفەرەکەی لەوجۆرە بێ کە کورت کردنەوە (قصر) ی نوێژە چوار ڕکاتی‌یەکانی تێدا دروست بێ، کە لەباسی نوێژدا بەوردی باسمان کردوە قسەو بیروڕای زانایان‌و بەڵگەکانیانمان خستۆتەڕوو، هەروەها ئەو ماوەیەی کەبابای ڕێبوار لەسەفەرەکەی‌داو لەکاتی مانەوەو نیشتەجێ‌بوونی‌دا بۆی هەیە ڕۆژووی تێدا نەگرێ، ئەو ماوەیەیە کە بۆی هەیە نوێژەکانی تێدا کورت بکاتەوە. کە دیسان ئەم مەسەلەیەشمان لەباسی (کورت کردنەوەو کۆکردنەوەی نوێژەکان)دا چاک ڕوون کردۆتەوە.

ئنجا زانایان[84] دوای ئەوەی لەسەر ئەوە کۆکن کە ئەگەر هات‌و هەرکام لەبابای نەخۆش‌و ڕێبوار بەڕۆژووبوون‌و مۆڵەتەکەیان وەرنەگرت، ڕۆژووەکەیان دروستە[85]، مەگەر لەحاڵێک دا کە لەسۆنگەی بەڕۆژوبوونەوە گیرۆدەی نەخۆشی زیاترو ناڕەحەتی‌و زیانێکی

---

[81] بڕوانە: (المجموع) ج٦ص٢٥٧.

[82] بڕوانە: (المغني)ج٣ص١٦.

[83] بڕوانە: (فقه السنة) ج٥٨٥.

[84] بێجگە لەظاهری‌یەکان.

[85] بڕوانە: (المجموع) ج٦ص٢٥٦، ٢٥٧، وە بڕوانە: (مجموعة الفتاوى) ج٢٥ص١١٤، وە بڕوانە: (المغني) ج٣ص١٦، کە گوتوویەتی: (والمريض اذا خاف الضرر والمسافر أستُحِبَ لهما الفطر، فان صاماً اجزاهما). وە بڕوانە: (بداية المجتهد) ج١ص٣٠٤، کە گوتوویەتی: (والمفطرون في الشرع على ثلاثة اقسام: صنف يجوز له الفطر والصوم بأجماع... أما الذين يجوزلهم الأمران: فالمريض باتفاق والمسافر باختلاف).

زۆر ببن یان بەرەو مەرگ بچن، کە بێگومان ئەوکاتە بەڕۆژوو نەبوونەکەیان فەرزو ڕۆژوو گرتنەکەیان حەرام دەبێ[٨٦]، بەڵێ دوای یەکدەنگ بوونیان لەسەر ئەوە کە ڕابرد، لەوبارەوە کە ئایا ئەگەر هەرکام لەبابای نەخۆش و ڕێبوار لەخۆیان ڕاببینن و دڵنیابن کە بێزیان دەبن، کام لایان بۆ چاکترە: ڕۆژووگرتن یان نەگرتن، یان وەك یەکن و یەکسانن؟!

ئەوە ڕایان جیاوازە:

جارێ بۆ نەخۆش ئەوە زۆربەیان کە (حەنەفی‌یەکان و مالیکی‌یەکان و شافیعی‌یەکان) یان لەنێودان دەڵێن: هەردووك لا (بەڕۆژووبوون و نەبوون) وەك یەکن[٨٧] - دیارە بەو مەرجەی کە پێشتر باسمان کرد -، (أحمد)یش ڕای وایە کەبەڕۆژوو نەبوون سوننەت و ڕۆژووگرتنی ناپەسەند (مکروه)ە[٨٨]، هەندێکیشیان - وەك ظاهیری‌یەکان - ڕۆژووگرتن بۆ بابای نەخۆش بەحەرام دەزانن[٨٩]، مەگەر نەخۆشیەك کەهیچ نارەحەتی بۆ ڕۆژوگر پەیدا نەکات.

بەڵام لەبارەی بەڕۆژووبوونی بابای ڕێبوارەوە، زانایان پێنج ڕایان هەن:

١-زۆربەیان کە جگە لەژمارەیەك لەهاوەڵان و شوێن کەوتووان (الأصحاب والتابعين)، وەك: (حذيفة بن اليمان و وانس بن مالك وعثمان بن العاص) خوا لێیان ڕازیبێ و (عروة بن الزبيرو الأسود بن يزيد وأبوبكر بن عبدالرحمن بن الحارث وسعيد بن الجبير والنخعي وفضيل بن عياض) هەرکام لە: (أبوحنيفة و مالك وشافعي و عبدالله بن المبارك، وابوثور و ثوري)یش لەنێویان دا هەن، دەڵێن، بەڕۆژووبوونی چاکترە[٩٠].

٢-بەشێکیشیان کە جگە لە (ابن عمر وابن عباس) خوا لێیان ڕازیبێ لەهاوەڵان و (ابن المسيب وشعبي) لەشوێن کەوتووان، هەرکام لە: (اوزاعي وأحمد اسحاق وعبدالملك بن الماجشون) یان لەنێودان، دەڵێن: بە ڕۆژوو نەبوونی پەسەندترە[٩١].

٣-هەندێکیشیان ڕایان وایە کە هەردووك لا - گرتن و نەگرتن - یەکسانن[٩٢].

٤-هەندێکیشیان کە (مجاهد و قتادة وعمر بن عبدالعزيز) یان لەنێودان، دەڵێن، کام لایەی بۆ ئاسانتر بێت ئەوەیان چاکترە، (ابن المنذر) یش ئەم ڕایەی پەسەند کردوە[٩٣].

---

[٨٦] بڕوانە (الفقه الأسلامي) ج٣ص١٦٩٨، ط٤، کە گوتوویەتی: (وان غَلَبَ علىٰ الظَنِّ الهَلاكُ بِسَبَبِ الصَّوْمِ أو الضرر الشديد كتعطيل حاسّةٍ من الحواس وجَبَ الفِطْرُ).

[٨٧] بڕوانە: (الفقه الأسلامي..) ج٣ص١٦٩٩، ١٧٠٠، ط٤.

[٨٨] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[٨٩] بڕوانە: (المحلى) ج٦ص١٦٨.

[٩٠] بڕوانە: (المجموع) ج٦ص٢٦٦.

[٩١] بڕوانە: (المجموع) ج٦ص٢٦٦، وە بڕوانە: (مجموعة الفتاوى) ج٢٥ص١١٤.

[٩٢] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٥-شیعەکان و هەندێك لە ظاهرییەکانیش رایان وایە کە ڕۆژووی بابای ڕێبوار بەرناکەوێو دەبێ بیگێڕێتەوە[٩٤].

(شوکانی)یش لەوبارەوە ڕایەکی جوانی هەیە کە لەڕای زۆربەو جەماوەری زانایانەوە نزیکە، دەڵێ: هەرکاتێك بابای ڕێبوار ڕۆژوگرتنی بۆ زەحمەتو بەزیان بوو، یان لەخۆی دەترسا کە بەهۆی ڕۆژووگرتنەوە تووشی ریاکاری بێت، یان لەو جۆرە کەسانە بوو کە مۆڵەت وەرگرتنی پێڕەوا نەبوو، ئەوە بەڕۆژوو نەبوونی خێرترە، بەڵام ئەگەر ئەم هۆیانەی تێدا نەبوون بەڕۆژووبوونی چاکترە[٩٥].

ئنجا بەرلەوەی رای خۆم دەربارەی ئەو ڕایانەی زاناو پێشەوایانمان بڵێم، بەپێویستی دەزانم سەرنجێکی ئەو دەقانە بدەین کە لەو بارەوە هاتوونو زانایانیش بۆ راوبۆچوونەکانی خۆیان پشتیان پێبەستوون:

* (عن عائشة رضي الله عنه قالت: سألَ حَمْزَةُ بن عَمْرٍ و الأَسْلَميّ رسولَ الله ﷺ عن الصيام في السَّفر؟ فقال: إنْ شئْتَ فَصُمْ، وإنْ شِئتَ فأَفْطِرْ) رواه مسلم.

وەك دەبینین پێغەمبەری خوا ﷺ (حمزة بن عمر والأسلمي) سەرپشك كردوە لەنێوان ڕۆژووگرتنو نەگرتنیدا لەسەفەرێ.

*(عن أبي الدرداء ﷺ قال: خَرَجْنا مع رسول ﷺ في شهر رمضان في حَرٍّ شديدٍ، حتى ان كان أحدنا لَيَضَعُ يَدَهُ على رأسهِ من شِدَّةِ الحرِّ، وما فينا صائمٌ الاّ رسولُ اللهﷺ وعبدُالله بن رواحة) متفق عليه.

لەم فەرمودەیەش دا دەردەکەوێ کە پێغەمبەری خواﷺ لەڕەمەزان داو لەکاتی سەفەردا - کەزۆر نزیکە جەنگو غەزاش بووبێ - لەحاڵێك دا کە لە گەرمان هاوەڵان خوا لێیان ڕازیبێ دەستیان خستۆتە سەر سەریان بەڕۆژوو بووە!

*(عن جابر ﷺ كان رسول الله في سَفَرٍ فرأى رَجُلاً قد ظُلِّلَ عليه، فقال: ما هذا؟! قالوا: صائمٌ، فقال: لَيْسَ البِرُّ الصَّوْمُ في السَّفَرِ) متفق عليه.

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەفەرێك بوو پیاوێکیدی کە سێبەری لێکرابوو فەرمووی: ئەوە چییە؟! گوتیان: بەڕۆژوویە، فەرمووی: چاکەکاری بریتی نیە لە ڕۆژووی سەفەرێ.

---

[٩٣] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[٩٤] بڕوانە: (مجموعة الفتاوی) ج٢٥١١٤، وە بڕوانە: (الفقه علی المذاهب الخمسة) ص١٥١، کە گوتوویەتی: (وقال الأمامية: اذا تمت للمسافر شروط قصر الصلاة لايقبل منه الصوم. ولو صام قضـ دون أن يكفر)، وە بڕوانە: (بداية المجتهد) ج١ص٣٠٥، کە گوتوویەتی: (وذهب أهل الظاهر الى انه لايجزيه وان فرضه هو ايام اخر).

[٩٥] بڕوانە: (نيل الأوطار) ج٤ص٣٠٩.

*(عن أبي سعيد الخدري وجابر رضي الله عنهما قالا: سافَرْنا مع رسول الله ﷺ فَيصومُ الصّائمُ ويُفطِرُ المُفْطِرُ ولايَعِيْبُ بعضهم على بَعضٍ) متفق عليه.

واته: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا سەفەرمان دەكرد، جا هەبوو بەڕۆژوو دەبوو، هەشبوو پێ نەدەبوو، وەهیچ كامیان ڕەخنەیان لەوی دیكە نەدەگرت.

*(جابر) خوا لێی ڕازیبێ گێڕاویەتەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ ساڵی فەتح لەڕەمەزان دا بەرەو مەككە دەرچوو، هەتا گەیشتە (كراع الغميم) بەڕۆژوو بوو، خەڵكیش پێ بوو، پاشان قاپە ئاوێكی داواكردو بەرزیكردەوە هەتا خەڵكی تەماشایان كرد ئنجا خواردیەوە، دوای ئەوە گوترا، هەندێك كەس بەڕۆژوون، فەرمووی: (اولئك العُصاة اولئك العُصاة) روا مسلم.

واتە: ئەوانە سەرپێچی كەرن، ئەوانە سەرپێچیكەرن.

جا دیارە جگە لەمانە فەرموودەی دیكەش هەن، كە وەك دەبینین سەرجەمی فەرموودەكان پشتگیری ڕای زۆربەو جەماوەری زانایان دەكەن و، ئەو فەرموودانەش كە وایان لێ دەفامرێتەوە ڕۆژووگرتنی سەفەرێ ناپەسەند بێت لەدەق و سیاقی خۆیان دا دەبینرێ كە ئەو ڕۆژووگرتنە لەهەلومەرجێكی نەگونجاو دا بووە، وەك حاڵەتی نەخۆشی و بێ توانایی ڕۆژووگرو سەغڵەت بوونی، وە حاڵەتی جەنگ و بەرەنگاربوونەوەی دوژمن، كە وەك دواتر باسی دەكەین حاڵەتی جەنگ و بەرەنگاری دوژمن بەتەنیاو بەبێ سەفەریش عوزرو پاساوی بەڕۆژوو نەبوون بگرە جاری وا هەیە فەرزبوونی بەڕۆژوونەبوونیشە! ئنجا وەك زانای ناودارو پارێزكارو هۆشیار (نووي) گوتوویەتی: (ولابُدّ من هذا التأويل ليُجْمَعَ بين الأحاديث)[96] بۆ پێكەوە كۆكردنەوەی فەرموودەكان ئەم جۆرە لێكدانەوەیە پێویستە.

سێ و چوارو پێنج: جەنگاوەر (مقاتل) و، تینوو برسی فرزە لێ بڕاوو، خاوەن كاری زۆر قورس و زەحمەتی ناچار، ئەمانیش، بۆ یەكەم و دووەمیان تێكڕاو بۆ سێیەمیان زۆرێك لە زانایان ڕایان وایە كە مۆڵەتیان هەیە لەكاتی خۆیدا ڕۆژووی ڕەمەزان نەگرن و دوایی بیگێڕنەوە.

جا با ئێستا یەك یەك بیان توێژینەوە لەبەر تیشكی دەقەكانی قورئان و سوننەت و بیروڕای زاناو شەرعزانان دا:

أ-بابای جەنگاوەر (مقاتل، غازي)

(عن أبي سعيد الخدري: سافَرْنا مع رسول الله ﷺ الى مكّة ونحن صِيامٌ، قال: فَنَزَلْنا مَنْزِلاً، فقال رسولُ الله ﷺ: (إنكم قَدْ دَنَوْتُمْ من عَدُوِّكُمْ والفطرُ أقْوىْ لكم)، فكانت رُخْصةً، فَمِنّا مَنْ صام ومِنّا مَنْ أفْطَرَ، ثم نَزَلْنا منزِلاً آخر، فقال: (إنّكم مُصَبِّحوا عَدُوّكُمْ والفِطرُ أقْوى لكم فَأفْطِروا)، وكانت عَزْمةً فَأفْطَرْنا ..) رواه مسلم وأبوداود.

---

[96] بروانە: (المجموع) ج٦ص٢٦٦.

واتە: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ بەرەو مەککە سەفەرمان کردو بەڕۆژووبووین، گوتی: جا لەمەنزڵێك دابەزین پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: (ئێوە لەدوژمنتان نزیك بوونەتەوەو ئەگەر بەڕۆژووش نەبن هێزو پێزتان زیاتر دەبێ)، جا ئەوە مۆڵەتێك بوو هەمانبوو بەڕۆژوو بوو هەشمانبوو بەڕۆژوو نەبوو، پاشان لەمەنزڵگایەکی دیکە دابەزین، فەرمووی: (بێگومان ئێوە بەیانی بەرەنگاری دوژمنتان دەبن، جا ئەگەر بەڕۆژوونەبن تین و وزەتان زیاتر دەبێ، بۆیە ڕۆژوو مەگرن)، وە ئەمجارەیان فەرمان بوو بۆیە بەڕۆژوو نەبووین.

جا خوێنەری بەڕێز! هەرچەندە فەرمانیشتەکانی پێغەمبەر ﷺ خودی ئاییننو وەك قسەی زانایان و شەرعزانان نین کە بە بەڵگە نەهێنرێنەوەو بەڵگەیان بۆ بهێنرێتەوە[97] وە لەهەر بابەتێك دا ئەگەر دەقێکی قورئان نەبوو فەرمودەیەکی پێغەمبەر ﷺ مادام لەوە دڵنیابین کە ڕاست (صحیح)ەو ئەو زاتە فەرموویەتی بەسە، بەڵام بۆ زێدە دڵنیایی و ئاشنابوونیش بەچۆنیەتی تێگەیشتنی زانایان لەو فەرمایشتانە بۆیە زۆرجار قسەو بیروڕاو بۆچوونی زانایانیش دەخەینەڕوو.

جا ئێستا کە زانیمان پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی داوە بابای جەنگاوەر ڕۆژووی ڕەمەزان نەگرێ، با بزانین زاناو شەرعزانانیش لەوبارەوە چییان گوتوە:

١-حەنەفییەکان گوتوویانە[98]: ( إن المُحارِبَ الذي يَخافُ الضُعْفَ عن القتال ولَيْس مسافِراً لَهُ الفِطْرُ قبل الحَرْبِ) واتە: ئەو جەنگاوەرەی کە مەترسی هەیە -بەهۆی ڕۆژووگرتنەوە - لەکاتی کوشتاردا لاواز بێت و ڕێبواریش نەبێ، بۆی هەیە بەر لەجەنگ بەڕۆژوونەبێ.

٢-حەنبەلییەکانیش گوتوویانە:[99] (ومَنْ قاتَلَ عَدُوّاً أو احاط العدوُّ ببلده والصومُ يُضْعِفُهُ عن القتالِ ساغ له الفِطْرُ بدون سَفَرٍ للحاجَةِ اليه) واتە: وە هەر کەسێك دژی دوژمنێك لەجەنگ دابوو یان دوژمن ئابڵووقەی وڵاتەکەی دابوو، وە ڕۆژووش بێهێزی دەکرد لەجەنگ کردن، ئەوە بێئەوەی لەسەفەردابێ بۆی هەیە بەڕۆژوونەبێ لەبەر پێویستی.

---

[97] گوتراوە: (أقوال العلماءِ يُسْتَدَلُّ لَها ولا يُسْتَدَلُّ بها).

[98] بڕوانە: (الفقه الأسلامي وادلته)، ج٣١٦٩٩، ط٤.

[99] بڕوانە: (كشف القناع) ج٨٠١٥٠، لە: (المفصل) ج٢ص٤١.

٣- هەندێك لەشافیعی‌یەكان فەتوایان داوە كە (ئەگەر باباى ڕۆژووەوان لە ڕەمەزانێ‌دا كەسێك ببینێ كە خەریكی خنكان‌و شێوەی ئەوەیەو بەبێ ڕۆژوو شكاندنیش نەیدەتوانی قوتاری بكات ئەوە دروستە بگرە فەرزە ڕۆژووەكەی بشكێنی‌و دوایی بیگێڕێتەوە.)[100].

٤- وە (ابن تیمیة) فەتوای داوە كە ئەگەر ڕۆژوو بوو بە مایەی بێ‌هێزكردنی بابای موجاهیدو جەنگاوەر ئەوە ناپەسەند (مكروه)ە بەڕۆژووبێ، بەڵكو مادام بەبێ‌شكاندنی ئەو فەرزەی بۆ ئەنجام نەدرێ پێویستە پێشگیری لێ‌بكرێ لەڕۆژووەكەی، وەكاتێك تەتەرو مەغۆلەكان لەمانگی ڕەمەزان دا بەرەو دیمەشق چوون (ابن تیمیة) فەتوای دا بۆ جەنگاوەران كە بەڕۆژوو نەبن بۆئەوەی بۆ جەنگو جیهاد بەهێزبن، وە گوتی: (الفِطْرُ في هذه الحالِ أَوْلىٰ مِن الفِطْرِ في السَّفَرِ) واتە: بەڕۆژوو نەبوون لەم حاڵەتەدا پێویست ترە وەك لەسەفەردا[101].

ب- بابای تینوو و برسی و فرزە لێبڕاو بەهۆی ڕۆژووەوە:

ئەمیش سەرجەم زانایان لەسەر ئەوە یەكدەنگن كە مادام بەهۆی ڕۆژووەكەیەوە مەترسی مەرگ یان نەخۆش كەوتن‌و پەیدابوونی ناتەواوی (نقص)یەكی لەجەستەی‌دا هەبێ، ئەوە نەك بۆی هەیە بگرە لەسەریشی فەرزە كەڕۆژووەكەی بشكێنێ، بەڵگەشیان چەند دەقێكە بۆ نموونە.

(...وَلَا تَقْتُلُوا أَنفُسَكُمْ إِنَّ اللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا) النساء:٢٩،

وە: (وَلَا تُلْقُوا بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ) البقرة:١٩٥.

(نووي) لەوبارەوە گوتوویەتی[102]: (قال أصحابُنا وغَيْرُهُمْ مَنْ غَلَبَهُ الجُوعُ والعَطَشُ وخافَ الهلاكَ لَزِمَهُ الفِطْرُ وان كان صحيحاً مقيماً) واتە: هاوەڵانمان‌و هی دیكەش گوتوویانە هەركەسێك برسیەتی‌و تینوێتی تینیان بۆ هێناو مەترسی فەوتانی هەبوو لەسەری پێویستە كە ڕۆژووەكەی بشكێنێ هەرچەندە ساغ‌و نیشتەجێش بێ.

---

[100] بڕوانە: (المجموع) ج٦ص، هەروەها ئەمە ڕای حەنبەلی‌یەكانیشە، بڕوانە: (الفقه الأسلامي) ج٣ص١٧٠٢، كە لە (غاية المنتهي) ج١ص٣٢٣ وەری‌گرتوە، جا دیارە ئەگەر قوتاركردنی ئینسانێك لەمەترسی مەرگ ڕۆژوو شكاندنی بۆ ڕەوا بێت، جیهادو جەنگ كە ڕزگاری‌و سەرفرازی گەلێك‌و بگرە ئۆممەتێكی پێوە بەندە هەوجار هەوجار بۆی ڕەوایە.

[101] بڕوانە (الأختيارات الفقهية من فتاوى شيخ الأسلام ابن تيمية) ص١٠٧.

[102] بڕوانە: (المجموع) ج٦ص٢٥٧، وە بڕوانە: (الفقه الأسلامي) ج٣ص١٧٠١، وە بڕوانە: (المفصل) ج٢٣٧، وە بڕوانە: (المحلى) ج٦ص١٥٩.

ج- کەسێك لەبەر ژیانو گوزەرانی خۆیو ئەوانەی بەئەستۆیەوەن ناچاری جۆرە کاروکاسبی‌یەك بێت کە زۆر قورسو زەحمەت بێتو ڕۆژوی بۆنەگیرێ:

**ئەمیش زۆربەی زانایان ڕایان وایە کە مۆڵەتی هەیە ڕۆژوەکانی لەکاتی خۆیدا نەگرێو پاشان بیان گێڕێتەوە، بەڵام ئەوەی تێدا بەمەرج گیراوە کە بابای ئیشکەر هیچ ئیش‌وکارێکی دیکەی وای چنگ نەکەوێ کەبایی دابین کردنی ژیانو گوزەرانی بکات[102].**

**جۆری سێیەم: ئەوانەی کە لەسەریان فەرزە بەڕۆژوو نەبنو پاشانیش گێڕانەوەی ڕۆژووەکانیان لەسەر فەرزە، ئەمانیش تەنیا ژنانی زەیستانو ئافرەتانی حەیزدارنو تێکڕای زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە ئافرەتی حەیزدار (حائض) و ژنی زەیستان (النفساء) لەسەریان فەرزە کە هەتا لەماوەی حەیزو زەیستانی دابن بەڕۆژوو نەبنو، لەوکاتانەدا ڕۆژوو گرتنیان لێقەدەغەکراوەو ئەگەر گریمان بەڕۆژووش بوون ڕۆژووەکانیان بەرناکەوێو بەتاڵنو سەربارە گوناحباریشن[104].**

**بەڵام لەسەریان فەرزە کەپاش پاکبوونەوەو چاکبوونەوەیان ڕۆژوەکانیان بگێڕنەوە، جا هەرچەندە وێڕای ڕۆژووگرتن نوێژکردنیشیان هەر لێقەدەغەیە، بەڵام تەنیا گێڕانەوەی ڕۆژوەکانیان لەسەر فەرزە، (عائشة) خوا لێی‌ڕازی بێ لەوبارەوە گوتوویەتی: (كُنَّا نحيض على عَهْدِ رسول الله ﷺ فَنُؤمَرُ بقضاءِ الصَّومِ، ولانُؤمَرُ بقضاءِ الصَّلاةِ) متفق عليه.**

**واتە: ئێمە لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ دەکەوتینە حەیزەوە جا فەرمانمان پێدەکرا کە ڕۆژوو بگێڕینەوە، بەڵام فەرمانمان پێنەدەکرا کە نوێژ بگێڕینەوە.**

**ئنجا شایانی باسیشە کە هەر کاتێك ئافرەتی زەیستانو حەیزدار پاك بوونەوە ئەگەر تاو (لحظة) یێکیش بەر لە سپێدەی بەیانی (طلوع الفجر) بەڕۆژوو بوونی ئەو ڕۆژەیان دەکەوێتە سەرو درەنگ خۆشۆردنیش زیانی بەڕۆژووەکەیان ناگەیەنێ، بەڵام نابێ بهێڵن نوێژی بەیانی‌یان بچێت.**



[102] بڕوانە: (الفقه الأسلامي) ج٣ص١٧٠٢، وە (فقه السنة) ج١ص٥٨٢، وە (المفصل) ج٢ص٣٧، ٣٨.

[104] بڕوانە: (المجموع) ج٦ص٢٥٤، (نووي) گوتوویەتی: (لايصح صوم الحائض والنفساء ولايجب عليهما ويحرم عليهما ويجبُ قضاه، وهذا كله مجمعٌ عليه).

## ٧-گێڕانەوەی ڕۆژووی بەئانقەست چوێنراوی مانگی ڕەمەزان:

ڕۆژووی ڕەمەزان کە دەچوێنرێ لەدوو حاڵان بەدەر نیە یان لەبەر عوزرێکەو بابای ڕۆژووگر مۆڵەتی پێدراوە کە نەیگرێ، یان بەئانقەست (عمد)ە ، جا ئێمە سوپاس بۆ خوا لەخاڵی پێشوودا (ئەوانەی کە مۆڵەتیان پێدراوە کە لەکاتی خۆیدا ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان نەگرن) بەدرێژی باسی حاڵەتی یەکەممان کردو لەیازدە (١١) بڕگەدا باسی هەموو ئەو کەسانەمان کرد کە لەبەر عوزرێکی ڕەوا مۆڵەتیان پێدراوە کە لەکاتی خۆیدا ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان نەگرن، جا چ دوایە هەر فیدیە بدەنو نەیگێڕنەوە، وە چ بیگێڕنەوەو فیدیە نەدەن، وە چ - بەڕای هەندێك لەزانایان - هەم فیدیەش بدەنو هەم بیشیگێڕنەوە.

ئنجا ئەوە لەم خاڵی حەوتەمەش دا باسی حوکمی ئەو کەسانە دەکەین کە بەئانقەست ڕۆژووی ڕەمەزان دەچوێنن یان دەیشکێنن، دیارە ئەو کەسانەش لەدوو حاڵان بەدەرنین:

ا- یان بەهۆی جیماعو ئاوی خۆهێنانەوەوە - بەهەر شێوەیەك بێ - ڕۆژووەکەیان دەشکێننودەیچوێننە

ب- یان بەهۆی یەکێك لە بەتاڵکەرەوەکانی دیکەی ڕۆژوو جگە لەجیماعو ئاوی خۆهێنانەوە ڕۆژووەکەیان دەشکێنن.

جا لەبەرئەوەی ئێمە سوپاس بۆ خوا پێشتر لەخاڵی حەوتەمی بەندی یەکەم لە هەشت(٨) باسی بەتاڵکەرەوەکانی ڕۆژوومان کرد کە بریتین لە: (خواردنو خواردنەوەو ڕشانەوەی بەئانقەست جیماعو ئاوی خۆهێنانەوەو کەوتنە حەیزو زەیستانیو نیەتی شکاندنو خواردنو خواردنەوە و جیماعو ئاوی خۆهێنانەوە بەگومانی ئەوە کە هەر شەوەو نەبۆتە ڕۆژ، یان شەو داهاتوەو ڕۆژووەکە تەواو بووە، پاشان دەربکەوێ کە وانەبووە).

هەروەها باسی حوکمی هەرکام لە حاڵەتەکانی: لەبیرچوونەوە (نسیان) و بەهەڵەداچوون (خطأ) زۆرلێکران (إکراه)مان کرد، ئێستا هەر بەکورتیو پوختی دەڵێین:

أ-ڕۆژووشکاندنی بەئانقەست بەهۆی یەکێك یان زیاتر لەهەڵوەشێنەرەوەکانی ڕۆژوو جگە لەجیماع و ئاوی خۆهێنانەوە:

حوکمی ئەم حاڵەتە بەڕای زۆربەی هەرە زۆری زانایان کە (أبوحنیفة و مالك و شافعيو احمد) یان لەنێودان ئەوەیە کە بابای ڕۆژووشکێن زۆر گوناحبارەو دەبێ دوایی

ئەو ڕۆژووە بگێڕێتەوەو لەدوای شکاندنی ڕۆژووەکەشییەوە لەبەر ڕێزو حورمەتی ڕەمەزان خۆی لەهەر شتێکی ڕۆژووشکێن بپارێزێ هەتا ئێوارە[105].

بەڵام هەندێکیان کە (زهري و ثوري و اوزاعي و إسحاق) یان لەنێودان دەڵێن: بەهەر شتێك ڕۆژووی ڕەمەزان بشکێ دەبێ وێڕای گێڕانەوە کەفارەتی گەورە (الكفارة العُظمى)ش بدات کە لە برگەی (ب)دا باسیدەکەین[106].

دیارە لە هەرکام لە (ابو حنیفة و مالك) ڕای تریش گێڕراونەوە لەوبارەوە[107].

واش پێدەچێ ڕای یەکەم کە (نووي)[108] گوتوویەتی: هی زۆربەی هەرەزۆری زانایانە، ڕاست تر بگرە ڕاست بێ، چونکە وەك (ابن رشد)[109] ڕوونی کردۆتەوە خاوەنی ڕای دووەم هیچ دەقێکیان بەدەستەوە نیەو پشتیان بەقیاس بەستوە، کە قیاسی ڕۆژوو شکێنەری بەغەیری جیماعیان کردۆتەسەر ڕۆژووشکێنی بەهۆی جیماعەوە، ئاشکراشە کە پەنابردنە بەر قیاسو عەقڵ لەم جۆرە مەسەلانەدا ڕایەکی بێهێزە[110].

ب- ڕۆژووشکاندنی بەئانقەستو بەهۆی جیماع یان ئاوی خۆهێنانەوەوە:

حوکمی ئەم حاڵەتەش[111] بەڕای زۆربەی هەرەزۆری نزیك بەیەکدەنگی زانایان کە وەك (نووي) گوتوویەتی[112]: هەرکام لە: (مالك و ابوحنیفة و شافعي و احمدو داود الظاهري و كافة العلماء) یان لەنێودان، ئەوەیە کە وێڕای گوناحباریو گێڕانەوەی ڕۆژووەکەی پێویستە کەفارەتیش بدات، هەندێکیشیان وەك[113]: (شعبي و سعید بن جبیر ونخعي و قتادة) ڕایان وایە کە تەنیا گێڕانەوەی لەسەرەو کەفارەتی ناکەوێتە سەر.

---

[105] بڕوانە: (المجموع) ج٦ص٣٤٠، ٣٤١.

[106] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[107] بڕوانە: (بداية المجتهد) ج١ص٣١٣، کە گوتوویەتی: (ابو حنیفة و مالك)یش دەڵێن کەفارەتی لەسەرە.

[108] بڕوانە: (المجموع) ج٦٣٤٠.

[109] بڕوانە: (بداية المجتهد) ج١ص٣١٣.

[110] لەبەرئەوەی لەخاڵی حەوتەمی بەندی یەکەم دا ئەو دەقانەمان هێناونەوە کە زانایان کردوویانن بە بەڵگەی گێڕانەوەی ئەو ڕۆژووانەی بەو شتانە دەشکێنرێن، بۆیە لێرەدا باسیان ناکەین.

[111] دیارە بۆ (جیماع) ئەوە ڕایانە، بەڵام بۆ ئاوهاتنەوە بەشتی دیکە، (ابو حنیفة و شافعي) ڕایان وا نیەو دەڵێن: کەفارەتی نیە، جگە لە پشتەوەی ژن یان پیاو کە زۆربەی هەرە زۆر وەك جیماعیان داناوە، (المجموع) ج٦٣٥٤، ٣٥٥.

[112] بڕوانە: (المجموع) ج٦ص٣٥٧، وە بڕوانە: (بداية المجتهد) ج١ص٣١١، ٣١٢.

[113] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

بەڵام بێگومان ڕای یەکەم کە هی زۆربەی نزیك بەیەکدەنگی تێکڕای زانایانە، ڕاستە، چونکە فەرموودەی پێغەمبەری خوایان ﷺ بەدەستەوەیە کەئەمە دەقەکەیەتی:

* (عن أبي هريرة ﷺ قال: جاء رَجُلٌ الى النبيَّ ﷺ فقالَ: هلكتُ يا رسول الله! قال: وما أهْلَكَكَ!! قال: وَقَعْتُ على إمرأتي في رمضان! قال: هَلْ تجِدُ ما تُعْتِقُ رَقَبَةً؟ قال: لا، قال: فَهَلْ تَسْتَطيعُ أن تصومَ شَهْرَين متتابِعَيْنِ؟! قال: لا، قال، فَهَلْ تَجِدُ ما تُطْعِمُ سِتِّيْن مِسْكيناً؟ قال: لا، قال: ثم جَلَس، فَأُتِيَ النَّبيُّ ﷺ بعَرَقٍ فيه تمرٌ، فقال: تَصَدَّقْ بهذا!! قال عليَّ أَفْقَر مِنَّا؟ فما بَيْن لابَتَيْها أهلُ بَيْتٍ أحْوَجَ إليه منا، فَضَحِكَ النبيّ ﷺ حتّى بَدَتْ أنْيابَهَ، ثم قال: إذْهَبْ فَأطْعِمْهُ أهْلَكَ) رواه البخاري ومسلم وأصحاب السنن[114].

واتە: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا فەوتاوم! فەرمووی: بە چ شتێك فەوتاوی؟ گوتی: لەڕەمەزانیدا چوومە لای ژنەکەم! فەرمووی: هێندەت ماڵ هەیە کە کۆیلەیەك ئازاد بکەی؟ گوتی: نەء، فەرمووی: ئەدی دەتوانی دوو مانگان بەدوای یەکدا -بێ پسانەوە - بەڕۆژووبی؟ گوتی: نەء، فەرمووی: ئەدی هێندەت هەیە کە خواردنی شەست نەدار بدەی؟ گوتی نەء، دەڵێ:- ئنجا دانیشت، وە زەمبیلەیەکیان بۆ پێغەمبەر ﷺ هێنا کە خورمای تێدا بوو، جا -پێغەمبەر - فەرمووی ئەوە بکە بەخێر! گوتی، جا بیدەم بە لەخۆم هەژارتر؟ بێگومان لەنێو دوو لایەکان - ی شاری مەدینە - یدا هیچ خێزانێکی تێدا نیە کە لەئێمە بۆی ئاتاج تر بێت، جا پێغەمبەر ﷺ پێکەنی هەتا ددانەکانی دەرکەوتن، پاشان فەرمووی: برۆ دەرخواردی ماڵو خێزانەکەتی بدە.

<u>ئنجا کۆتایی ئەم خاڵەش بەم چەند وردە تێبینییە دێنین:</u>

١-زۆربەی هەرە زۆری زانایان ڕایان وایە کە ڕەچاوکردنی ڕیز (ترتيب) لەسێ جۆرە کەفارەتەکان دا (ئازاد کردنی کۆیلە، دوو مانگ ڕۆژووی بێپسانەوە، خواردنی شەست نەدار)، پێویستە (نووي) گوتوویەتی: ئەمە ڕای (ابو حنيفة و ثوری و اوزاعي و شافعي و احمد)ە.

(مالك)یش ڕای وایە کە بابای کەفارەت دەر سەرپشکە لەنێوان هەرسێکیان دا[115].

٢-زۆربەی هەرەزۆری زانایان بەدوا یەك دا هاتنو نەپسانەوە (تتابع)ی دوو مانگە ڕۆژووەکان بەفەرز دەزانن، هەشیانە دەڵێ مەرج نیەو تەنیا سوننەتە[116].

---

[114] بڕوانە: (شرح صحيح مسلم) ج٥ص٣٠٠٨، وە: (فتح الباري) ج٤ص٦٦٨، ٦٦٩.

[115] بڕوانە: (المجموع) ج٦ص٣٥٧، ٣٥٨، وە (نيل الأوطار) ج٤ص٢٩٥.

[116] بڕوانە: (المجموع) ج٦ص٣٥٨، وە (شرح صحيح مسلم) ج٥ص٣٠١٥، وە: (المحلى) ج٦ص١٣٨.

٣-بەشێك لەزانایان کە (بغوي) بەزۆربەی داناونو (ابوحنیفة و مالك و ابوثورو ابن المنذر)یان لەنێودانو قسەیەکی (احمد)یشە، دەڵێن: ژنیش - مادام تۆبزی لێکراوو خاوەن عوزر نەبێ -پێویستە کەفارەت بدات وەك مێردەکەی، هەندێکیشیان کە (داودو شافعي و اوزاعي) یان لەنێودان دەڵێن: ژن کەفارەتی لەسەر نیە[117].

٤- زانایان لەسەرئەوە یەکدەنگن کە بابای ڕۆژووشکێن بەجیماع ئەگەر لەیەك ڕۆژدا چەند جارێکیش جیماعەکەی دووبارە بکاتەوە هەریەك کەفارەتی لەسەرە، بەڵام ئەگەر لەڕۆژێك زیاتر بێ، ئەوە بۆ هەر ڕۆژێك کە بەهۆی جیماع کردنەوە چواندوویەتی کەفارەتێکی لەسەرە[118]، بەڵام (ابو حنیفة و شوێن کەوتووانی تۆزێك ڕایان جیایە)[119].

٥-بابای ڕۆژووگێڕەوەی ڕەمەزان بێجگە لەڕەمەزانی ساڵی دووەمو ئەو ڕۆژانە کە ڕۆووگرتنیان تێدا قەدەغەکراوە، لەسەر لەبەری ساڵێدا بۆی هەیە ڕۆژووەکانی بگرێ، ئەمە ڕای زۆربەی هەرە زۆری زانایانە، بەڵام لە (علي بن ابي طالب) خوا لێی ڕازیبێ و (الحسن البصري والزهري)یەوە هاتوە کەڕۆژووگێڕانەوەیان لەمانگی (ذوالحجة)دا پێ پەسەند نەبووە[120].

٦-زۆربەی هەرە زۆری زانایان کە جگە لە: (علي بن ابي طالب و معاذ و ابن عباس و انس و ابوهريرة) خوا لێیان ڕازیبێ (أوزاعي و ثوري و أبوحنيفة و مالك و احمد و اسحاق و ابوثور) یشیان لەنێودان خوا لەهەموویان ڕازیبێ ڕایان وایە کە پەسەند ئەوەیە ڕۆژووە چوێنراوەکانی ڕەمەزان بەدوای یەك داو بێپسانەوە بگێڕێنەوە، ئەگەرنا بەجیا جیاش هەر دروستە، بەڵام (ابن عمر و عائشة والحسن البصري و عروة بن الزبيرو النخعي و داود الظاهري) گوتوویانە: فەرزە بەدوای یەك دا بیانگێڕێتەوە[121].

---

[117] بڕوانە: (شرح صحيح مسلم) ج٥ص٣٠١٦، وە (نيل الأوطار) ج٤ص٢٩٥، ٢٩٦. وە بڕوانە: (بداية المجتهد) ج١ص٢١٥.

[118] بڕوانە: (بداية المجتهد) ج١ص٣١٦، وەبڕوانە: (الفقه الأسلامي) ج٣ص١٧٤٢، ط٤.

[119] ئەویش ئەوەیە کە ئەگەر کەسێك لەڕەمەزان دا جیماعی کرد، پاشان بەر لەوەی کەفارەت بدات ڕۆژێکی دیکە جیماعی کردەوە، ئەوە بەس یەك کەفارەتی دەوێ. بڕوانە: (الفقه الأسلامي) ج٣ص٧٤٢..

[120] بڕوانە: (المجموع) ج٦ص٣٨٨، وە بڕوانە: (المفصل) ج٢ص٧٧.

[121] بڕوانە: (المجموع) ج٦ص٣٨٧، وە بڕوانە: (المفصل) ج٢ص٧٨، ٧٩.

٧-زۆربەی زانایان کە جگە لە (ابو هريرة وابن عباس و عطاء بن رباح و قاسم بن محمد و زهري) خوا لێیان ڕازیبێ (اوزاعي و مالك و ثوري و شافعي و احمد و اسحاق)یشیان لەنێودان دەڵێن: هەرکەسێك ڕۆژووی ڕەمەزانێك قەرزدار بوو، وە بەبێ عوزر گێڕانەوەکەی دواخست تا ڕەمەزانی دیکە هات ئەوە پێویستە وێڕای گێڕانەوە بۆ هەر ڕۆژوویەکیش فیدیە (خواردنی نەدارێك) یەك بدات، بەڵام ئەگەر دواخستنەکەی لەبەر هۆیەکی ڕەوا وشەرعی بوو، ئەوە هەر گێڕانەوەی لەسەرەو فیدیەی ناوێ، بەڵام (ابو حنيفة و مزني و داود) دەڵێن: هەرچۆن بێت هەر گێڕانەوەی لەسەرەو فیدیەی ناوێ، (ابن عباس و ابن عمر و سعيد بن جبير و قتادة) ش دەڵێن: مادام ڕەمەزانێکی دیکەی بەسەرداهات گێڕانەوەی ناوێ و دەبێ لەجیاتی هەر ڕۆژێك فیدیەیەك بدات[١٢٢].

وە (نووي) گوتوویەتی: ڕای ڕاست تر لەمەزهەبی شافیعیدا ئەوەیە کە ئەگەر چەند ڕەمەزانێك بەبێ هۆی عوزری شەرعی ڕۆژووە قەرزەکانی دواخست ئەوە بە ژمارەی ڕەمەزانە تێپەڕبووەکان بۆ هەر ڕۆژوویەك فیدیەی دەکەوێتە سەر[١٢٣].

٨-ئەگەر ڕۆژووگرێك لەڕۆژێکی ڕەمەزان دا چووە لای هاوسەرەکەی (جیماعیکرد) وە گوتی: نەمزانیوە کە حەرامە! تەماشا دەکەین ئەگەر لەو جۆرە کەسانە بوو کە بەهۆی تازە مسوڵمان بوونی یان دووری لەزانایانو ئەهلی ئیسلامەوە ئەوجۆرە زانیاریانەی لێ پەنهان بێ، ئەوە کەفارەتی[١٢٤] ناکەوێتە سەر، ئەگەرنا دەکەوێتە سەریو، هەرچۆنیش بێ ڕۆژووەکەی بەتاڵە[١٢٥].



[١٢٢] بڕوانە: (المجموع) ج٦ص٣٨٧، وە بڕوانە: (المفصل) ج٢ص٧٧، ٧٨.

[١٢٣] بڕوانە: (المجموع) ج٦ص٣٨٥، ٣٨٦.

[١٢٤] وشەی (كفارة) یانی: سڕەرەوەو خاوێن کەرەوەو ئەسڵی وشەکەش (كَفْر) ە کە بەمانای (سِتْر)ە.

[١٢٥] بڕوانە: (المجموع) ج٦ص٣٥٧.

## ٨-کەسێك بمرێو ڕۆژووی ڕەمەزان قەرزاربێ حوكمی چی‌یە؟!

**ئەو كەسەی كە دەمرێو ڕۆژوی ڕەمەزان قەرزدارە لەدوو حاڵەت بەولاوە نیە:**

أ-كە هۆیەكی شەرعی هەبووبێ كە نەیتوانیوە ڕۆژووەكان بگێڕێتەوە، ئەو هۆیەش بەردەوام بووبێ تا كاتی مەرگی، ئەوە تێكرای[١٢٦] زانایان یان بەلای كەمەوە زۆربەی هەرە زۆریان دەڵێن: هیچی لەسەر نیەو میراتگرو خزمەكانی نەڕۆژووگرتن نەفیدیەیان لەسەر پێویست نیە، چونكە هەر لەئەسڵ دا قەرزدار نیە لەسۆنگەی ئەوەوە كە هەتا مردوە لەتوانای‌دا نەبووە ئەو فەرزە جێبەجێ بكات، خواش فەرموویەتی: (لَايُكَلِّفُ اللهُ نَفْساً اِلاَّ وُسْعَهَا) البقرة: ٢٨٦، وە فەرموویەتی: (فَاتَّقُوا اللَّهَ مَا اسْتَطَعْتُمْ.....) التغابن:١٦، پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: (وإذا أمرتكُمْ بأَمْرٍ فَأْتُوا منه ما اسْتَطَعْتُمْ) رواه البخاري ومسلم عن ابي هريرة رضي الله عنه.

ب-كە توانیبێتی‌و دەرفەتی هەبووبێ ڕۆژووە چوێنراوەكانی بگێڕێتەوە، بەلام هەر بەئانقەست كەمتەرخەمی كردبێ‌و گوێی نەدابێتێ تا مردوە، جا ئەم جۆرەیان بێگومان قەرزدارەو زانایانیش لەوبارەوە كە ئایا خزمو نزیكەكانی چی بۆ بكەن‌و چۆن ئەو قەرزەی بۆ بدەنەوە بەگشتی سێ ڕایان هەن:

**یەكەم:** بەشێكیان كە (طاوس الحسن البصري والزهري وقتادة و أبوثورو و داود الظاهري[١٢٧] وابن حزم[١٢٨] والشيعة الأمامية[١٢٩]) یان لەنێودان‌و (نووي) یش بە یەكێك لەدوو ڕایەكانی شافیعی داناوەو گوتوشیەتی[١٣٠]: (أصحهما في الدليل) لەڕووی بەڵگەوە ڕاستترینیانە، وە زۆربەی هەرەزۆری زانایانی فەرموودەناس (محدِّث)یش پەسەندیان كردوە[١٣١] وەك (بخاري[١٣٢] وأبوالطيب[١٣٣] الطبري ونووي و ابن حجر العسقلاني[١٣٤] وشوكاني[١٣٥] قَنُّوجي[١٣٦]) دەڵێن: سوننەتە خزمو كەس‌وكاری ڕۆژووەكانی بۆ بگرنەوە.

---

[١٢٦] بڕوانە: (المجموع) ج٦ص٣٩٥، وە (المفصل) ج٢ص٩٣.
[١٢٧] بڕوانە (المجموع) ج٦ص٣٩٥.
[١٢٨] بڕوانە: (المحلى) ج٦ص١٩١، مسألة: ٧٧٥.
[١٢٩] بڕوانە: (الفقه على المذاهب الخمسة) ص١٥٨.ديث الصحيحة الصريحة).
[١٣٠] بڕوانە: (المجموع) ج٦ص٣٩٥، وە لە: (شرح صحيح مسلم) ج٥ص٢٠٧٤دا گوتوویەتی: (وهذا القول هو الصحيح المختار الذي نعتقده وهو الذي صححه محققوا أصحابنا الجامعون بين الفقه والحديث لهذه الأحاديث الصحيحة الصريحة).
[١٣١] بڕوانە: (نيل الأوطار) ج٤ص٣٢٠.
[١٣٢] بڕوانە: (فتح الباري) ج٤ص٧٠٦، ٧٠٧.
[١٣٣] هەمان سەرچاوەی پێشوو.
[١٣٤] هەمان سەرچاوەی پێشوو.
[١٣٥] بڕوانە: (نيل الأوطار) ج٤ص٣٢١.

بگره (ابن حزم) بەفەرزیشی دەزانێ لەسەریان[136]! جا زۆر لەم زانایانەش دەڵێن کەس‌وکاری مردووەکە سەرپشکن لەنێوان ڕۆژووگرتن‌و فیدیەدان‌و هەرکامێکیان بێ هەر دەبێ[137].

دووەم: هەندێکیشان وەك: (لیث و احمد واسحاق وابوعبید) دەڵێن: دروستە ڕۆژووی لەخۆگیراو (نذر)ی بۆ بگێڕرێتەوە، بەڵام هی دیکە چ هی ڕەمەزان‌و چی غەیری ڕەمەزان دروست نیە بۆ مردوو بگێڕرێتەوە،

سێیەم:(ابوحنیفة و مالك) یش دەڵێن: هیچ جۆرە ڕۆژوویەك بۆ مردوو ناگێڕرێتەوە، بەڵکو دەبێ فیدیەی بۆ لەجیاتی ڕۆژووەکانی بدرێ، وە (قاضي عياض) گوتوویەتی، ئەمە ڕای جەماوەری زانایانە[138].

بەڵام لەڕاستی‌دا وەك پێشتریش لەزمانی زانایانەوە باسمان کرد مادام فەرموودەی ڕاست‌و ڕاشکاو (صحيح و صريح)ی پێغەمبەر ﷺ لەوبارەوە هەبێ، ئەگەر نەك جەماوەرو زۆرینە بگرە سەرجەم زانایانیش لەسەر ڕاو بۆچوونێك کۆبن کە لەبەرانبەری‌دا فەرمایشتی ئەو زاتە هەبێ کەم‌وزۆری ئەو زانایانە لەگەڵ ڕێزو حورمەتی تەواومان دا بۆیان هیچ لەمەسەلەکە ناگۆڕێ، ئنجا هەر بۆیەشە کە زانایەکی پایەبەرزی وەك (نووي) لەگەڵ ئەوەش دا کە خۆی بەشوێن کەوتوو و پەیڕەوی شافیعی دەزانێ، بەڵام چونکە دەزانێ پێغەمبەر ﷺ لەوبارەوە فەرموودەو بڕیاری هەیە بەبێ سڵ کردن‌و سڵەمینەوە هەم لەکتێبی: (المجموع) و هەم لە (شرح صحيح مسلم) ەکەی‌دا فەرموودەکەی کردۆتە پێشەواو چرای ڕێگاو ڕۆیشتووەو گوتوویەتی: (وهذا القولُ هو الصحيح المختارُ الذي نَعْتَقِدُهُ).

کەواتە: مردوو مادام قەرزداری ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان بێ بۆ خزمان‌و کەس‌وکاری سوننەتە هەندێکیش بەفەرزی دەزانن کە ڕۆژووە قەرزەکانی بۆ بگرنەوە، ئەگەرنا بەلای کەمەوە لەمیراتی خۆی ئەگەر هەیبوو دەنا لەماڵ‌و سامانی خۆیان بەئەندازەی ڕۆژووەکانی فیدیەی بۆ بدەن.

ئەو فەرموودانەش کە زانایان کردوویانن بە بەڵگەی ڕۆژوو بۆ گێڕانەوەی مردوو لەلایەن کەس‌وکاری‌یەوە زۆرن، بۆ وێنە:

---

[135] بڕوانە: (الروضة الندية) ج1ص340.

[136] بڕوانە: (المحلى) ج6ص191.

[137] بڕوانە: (فتح الباري) ج4ص706، 707. کە گوتوویەتی: (... وانما قالوا يتخير الولي بين الصيام والأطعام)، وە بڕوانە: (المفصل) ج2ص97، وە بڕوانە (شرح صحيح مسلم) ج5ص3074، کە گوتوویەتی: (... فان مَنْ يقولُ بالصيام يجوز عنده الأطْعامُ، فثبت ان الصواب المتعين تجويز الصيام وتجويز الأطعام والولِيُّ مُخيرٌ بينَهُما).

[138] بڕوانە (شرح صحيح مسلم) ج5ص3074.

* (عن عائشة رضي الله عنهما أن رسول الله ﷺ قال: مَنْ ماتَ وعليــه صيـامٌ، صـامَ عَنْـهُ وَلِيُـهُ) متفق عليه، واتە: هەركەسێك مردوو ڕۆژووگرتنی لەسەر بوو، با نزیكەكەی بۆی بگرێتەوە.

* ( عن ابن عباس رضي الله عنهما أن رسول الله ﷺ فقالَتْ: إن أُمي ماتَتْ وعليها صـوم شهر، فقال: أرأيتِ لَوْ كــان عَلَيْها دَيْـنُ أكُنْتِ تَقْضِيَـهُ؟! قـالت: نَعـمْ، قـال: فَدَيْـنُ الله أحَـقُ بالقضـاء) رواه البخاري ومسلم واصحاب السنن.

واتە: ئافرەتێك هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ گوتی: دایكم مردوەو ڕۆژووی مانگێكیش قەرزدارە! فەرمووی: ئایا ئەگەر دایكت قـەرزی خـەڵكی لەسـەر بووایـە بـۆت دەدایـەوە؟ گوتی: بەڵێ، فەرمووی: دەجا قەرزی خوا شایستەترە بدرێتەوە.

ئنجا زانایان دەربارەی ئەوە كە ئایا كێ و كێ لەخزمو نزیكانی مردوو بۆیان هەیـە ڕۆژووە قەرزەكانی بۆ بگرنەوەو بگێڕنەوە؟ زۆرشتیان گوتوە، بەڵام پوختەكەی ئەوەیە كە مەبەست لەوشەی: (ولِي) كە لەفەرموودەكەدا هاتوە، وەك هەركام لە (نووي) و (الحافظ ابن حجر العسقلاني) گوتوویانە:[140] (والمراد بالولِيّ القريب، سواء كان عَصَبَةً[141] او وارثاً او غيرهما، وقيل المراد الوارث. وقيل العَصَبَةُ، والصحيح الأول) واتە: وە مەبەست لەدۆست (ولِي) نزیكو خزمە، جا ئایا هی پشتێ بێ یان هەر میراتگرێك بێت یان غـەیری ئەوان، وە گوتـراوە مەبەست مـیراتگرە، وە گوتـراوە خزمـی پشــتێیە، بـەڵام قسـەی ڕاسـت هــەر یەكەمیانە - كە خزمو نزیكە جاهەر پلەیەكی هەبێ -.

هـەروەها زانایـان لەسـەر ئەوەش مشتومڕیان بووە كە ئایا ئەگەر بابایـەكی بێگانـەو دوور بۆ بابای مردوو بەڕۆژووبێ و بۆی بگێڕێتەوە بۆی بەردەكەوێ؟!

هەندێكیشیان بۆ وێنە: (نووي)[142] و (شوكاني)[143] ڕایان وایـە كە بـەبێ ئیزنو مۆڵـەتی خزمو نزیكەكانی بەرناكەوێ، بەڵام (بخاري و أبوالطيب الطبري و ابن حجر العسقلاني)[144] ڕایان وایە كە هەرچۆن بێ بەردەكەوێ، وەك چۆن ئەگەر بابایەكی بێگانەش قەرزی مردوو بداتەوە لەسەری لادەچێ؛ واش پێدەچێ ڕای (بخاري) و هاوەڵەكانی پێكابیەتی پێم وایە ئەوەش لە لوتفو كەڕەمی بێسنووری خوا نزیكترەو هەر خواش زاناترە.

---

[140] بڕوانە: (شرح صحيح مسلم) ج٥ص٣٠٧٤.

[141] وشەی (عصبة) لە ئەسڵی زمان دا ئەوەیە كە نووسیومانە (خزمی پشتێ) بەڵام لـەزانیاری فرائض دا بەو كەسانە دەگوترێ كە بەشێكی دیاریكراو (مفروض) یان لـەمیرات دا بۆ دانـەنراوەو هەرچییـەك كە لەبەر خاوەن بەشەكان (ذَوُو الفروض) مایەوە دەیبەن، (المعجم الوسيط) ص٦٠٤.

[142] بڕوانە: (شرح صحيح مسلم) ج٤ص٥٣٠٧.

[143] بڕوانە: (نيل الأوطار) ج٤ص٣٢١.

[144] بڕوانە: (فتح الباري) ج٤ص٧٠٧.

## ٩-چۆنیەتی گرتنی ڕۆژووی ڕەمەزان بۆ بابای دیلو بۆ کەسانێك كە لەوڵاتێکن ڕۆژی تێدا کورتو شەوی تێدا درێژە یان بەپێچەوانەوە:

لەبارەی چۆنیەتی بەڕۆژوو بوونی بابایەکی دیل (اسیر) یان دوورخراوە (نفي) یەك كە لەشوێنێکی دوورو پەرێدەو دوور لەخەڵك، یان لەنێو خەڵکێکی کافردا گیراون و ئاگایان لەمانگەکانی ساڵ یان تەنانەت لەشەوو ڕۆژیش نیە بۆ وێنە ئەگەر لەحەپسخانەیەکی تاریكو تەڵەم دابن، ئەوە زۆربەی هەرە زۆری[١٤٥] زانایان ڕایان بەم شێوەیە:

پێویستە هەوڵ بداتو کۆشش (اجتهاد) بکات کە بزانێ داخوا ڕەمەزان هاتوە یان نا جا ئەوکاتە بەپێی زانیاریو مەزەننەیەك كە بۆی پەیدا بووە بەڕۆژوو دەبێ، جا ئەگەر ڕۆژووگرتنەکەی ڕێك لەکاتی ڕەمەزان دا بوو، یان لەدوای ڕەمەزان ئەوە ڕۆژووەکانی بۆ وەبەر دەکەون، بەڵام ئەگەر کەوتبوونە پێش ڕەمەزان بۆی حیساب ناکرێنو دەبێ دوایی بیانگێڕێتەوە، بەڵام (الحسن بن صالح) ڕای وایە کە هەرچۆنێکی بێ هەر بۆی بەرناکەونو دەبێ بیانگێڕێتەوە؛ هەروەها زۆربەی هەرە زۆری زانایان ڕایان وایە کە ئەگەر هەندێ لەڕۆژووەکانی کەوتبوونە ڕەمەزانەوەو هەندێکیشیان پێش ڕەمەزان بوون، ئەوە ئەوانەی کەوتوونە نێو ڕەمەزانەوە بەردەکەونو ئەوانی دیکەش هیچو دەبێ بیانگێڕێتەوە[١٤٦].

دەربارەی کەسانێکیش کەلەوڵاتێکن کە ڕۆژەکانی تێدا درێژترن لەشەوان یان بەپێچەوانەوە، ئەوە زانایان دوو ڕایان هەن:

ا- بەشێکیان دەڵێن: دەبێ ئەندازەگیری ڕۆژانی ڕۆژوو تێداگیران بەگوێرەی ئەو وڵاتو شوێنانەن بکرێ کەشەو ڕۆژیان تێدا میانە (معتدل)ن، وەك شارەکانی مەککەو مەدینە کەشەرع دانان (تشریع)یش هەر لەوان دا بووە[١٤٧].

ب-بەشێکیشیان ڕایان وایە کە ئەندازەگیری (تقدیر) یەکە دەبێ بەپێی ئەندازەی شەوو ڕۆژی نیزیکترین وڵاتی میانە (معتدل) بێت، لێیانەوە[١٤٨].

ئاشکراشە کە لەم ڕۆژگارەدا کە بەهۆی پەرەستاندنو بەرەو پێش چوونی دامو دەزگاکانی ڕاگەیاندنی هەمەجۆرەوە دنیا وەك شارێکی لێهاتوە، چارەسەری ئەو مەسەلەیە شتێکی زۆر سێنایە، جا بەهەر بارێکیان دا بێ گرفتی تێدا نیەو هەردوو ڕایەکەش لەنیوەڕۆك دا ئەگەر یەکیش نەبن زۆر لەیەکەوە نزیکن.

---

[١٤٥] کە هەرکام لە (ابوحنیفة و مالك و شافعي و ابوثور واحمد) لەنێودان، بڕوانە: (المجموع) ج٦ص٣٩١، وە بڕوانە: (المغني والشرح الكبير) ج٣ص١١، ١٢.

[١٤٦] بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو: (شرح صحیح مسلم) و (فتح الباري) هەمان بەرگو لاپەڕە.

[١٤٧] بڕوانە: (فقه السنة) ج١ص٦١٦.

[١٤٨] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

## ١٠- شەوی قەدر (ليلة القدر):

خوا پشتیوان بێ لەچوار بڕگەدا باسی شەوی قەدر دەکەین:

**یەك: پێناسەی شەوی قەدر[149]:**

شەوی قەدر گەورەترین و چاکترین شەوە لە شەوەکانی ساڵ، چونکە خوای زاناو پەنهان بین فەرموویەتی: (لَيْلَةُ الْقَدْرِ خَيْرٌ مِنْ أَلْفِ شَهْرٍ) القدر:٣، واتە: شەوی قەدر لەهەزار مانگ چاکترە، کە دیارە مەبەست لەچاکتربوونی ئەو شەوە چاکتر بوونی خواپەرستی و دینداری یە لەو شەوەدا، لەڕووی خێرو پاداشتەوە.

وشەی (قَدْر)یش یان مەبەست پێی قەدرو حورمەت و ڕێزو شەرەفە، یان مەبەست ئەندازەگیری یە، جا ئەگەر مەبەست حورمەت و ڕێزو کەرامەت بێ ئەوە دیارو ڕوونە، چونکە بێگومان شەوی ناوبراو شەوێکی خاوەن ڕێزو شەرەف و کەرامەتە.

وەئەگەر ئەندازەگیری (تقدیر) بێت، ئەوە هۆی ناونرانی بەو ناوەو وەسف کردنی بەو سیفەتە ئەوەیە کە لەو شەوەدا هەرچی کاروبارو بڕیاری ئەو ساڵەیە لەلایەن فریشتەکانەوە دەنووسرێ و تۆماردەکرێ، وەك خوای کاربەجێ فەرموویەتی: (تَنَزَّلُ الْمَلَائِكَةُ وَالرُّوحُ فِيهَا بِإِذْنِ رَبِّهِمْ مِنْ كُلِّ أَمْرٍ) القدر: ٤، واتە: فریشتەکان و جوبرائیل بەفەرمانی پەروەردگاریان تێیدا دێنە خوار بۆ هەر کاروبارێك - کە ئەندازەگیری بکەن -.

**دوو: پلەو پایەی شەوی قەدرو گەورەیی و پاداشتی خواپەرستی و طاعەت تێداکردن:**

خوای پەروەردگار فەرموویەتی:( بسم الله الرحمن الرحيم: إِنَّا أَنزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةِ الْقَدْرِ، وَمَا أَدْرَاكَ مَا لَيْلَةُ الْقَدْرِ، لَيْلَةُ الْقَدْرِ خَيْرٌ مِنْ أَلْفِ شَهْرٍ، تَنَزَّلُ الْمَلَائِكَةُ وَالرُّوحُ فِيهَا بِإِذْنِ رَبِّهِمْ مِنْ كُلِّ أَمْرٍ، سَلَامٌ هِيَ حَتَّى مَطْلَعِ الْفَجْرِ) القدر.

واتە: بەناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە. ئێمە ناردوومانەتە خوار - واتە قورئان - لەشەوی ڕێز - یان ئەندازەگیری - دا. وە تۆ چووزانی شەوی ڕێز چی یە؟ شەوی ڕێز - خواپەرستی و طاعەت تێداکردنی - لەهەزار مانگ باشترە. فریشتەکان و جوبرائیل بەفەرمانی پەروەردگاریان بۆ بڕیار و ئەنجام دانی هەر کارێك تێیدا دێنە خوارێ وە ئەو شەوە هەر خێرو خۆشی و ئاشتی یە هەتا شەبەقی بەیانی.

پێغەمبەری خواش ﷺ لەوبارەوە فەرموویەتی: (.. وَمَنْ قَامَ لَيْلَةَ الْقَدْرِ إِيمَاناً وَاحْتِسَاباً غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ) رواه البخاري ومسلم.

واتە: وە هەر کەسێك لەشەوی قەدردا بەئیمان و ئیخلاصەوە هەستێ - بۆ خواپەرستی - هەرچی گوناحی ڕابردوویەتی دەبوورێ.

---

[149] بڕوانە: (فتح الباري) ج٤ص٧٨٤، ٧٨٥، وە بڕوانە: (شرح صحيح مسلم) ج٥ص٣١٣٧، ٣١٣٨.

## سێ: شەوی قەدر کەنگێیە؟!

زانایان دەربارەی ئەوە کە شەوی قەدر کەنگێیەو چ شەوێکە وەك (الحافظ ابن حجر) هێناویەتی زیاتر لەچل (٤٠) قسەی لەسەرە[150] ! بەڵام ئەوەی زیاتر دەقەکانی سوننەت دەیگەیەنن‌و تاڕاددەیەکی زۆر جێگای دڵنیایی‌یە ئەوەیە کە لەشەوە تاقەکانی دەشەوی کۆتایی ڕەمەزانە، لەوبارەوە چەندان فەرموودە هەن، بۆ وێنە:

*( عن عائشة رضي الله عنها أن رسـول الله ﷺ قـال: تحرَّوْا لَيْلَـةَ القَـدْرِ في الوِتْـر مـن العَشـرِ الأواخِرِ من رَمَضان) متفق عليه.

واتە: لە تاکەکانی دەشەوی کۆتایی ڕەمەزان دا بۆ شەوی قەدر بخەفتێن.

هەروەها فەرموویەتی:

*(إلْتَمِسوها في العَشْرِ الأواخِرِ من رمضان...) متفق عليه.

واتە: – بۆ شەوی قەدر – لە دە شەوەکانی کۆتایی ڕەمەزان بۆی بگەڕێن..

جا لەسۆنگەی ئەوەوە کە مانگی ڕەمەزان وەك مانگـەکانی دیکـەی عـارەبی بیسـت‌و نۆیی‌یان هەیەو سی (٣٠) ڕۆژیان هەیە، ئەگەر مسوڵمان بیەوێ بەمسۆگەری بیپێکێ دەبێ دەشەوەکانی کۆتایی هەموویان بەطاعەت‌و خواپەرستی زیاترو چاکتر زیندوو بکاتەوە، چونکە ئەگەر وا بکات جەبی نادات‌و هەر دەیپێکێ.

ئنجا لەبەرئەوەی لەچەند فەرموودەیەکیش دا هاتوە کە لەو حەوت شەوانەی کۆتایی دایە کەواتە ئامانجەکە نزیك کەوتۆتەوە، بۆ وێنە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

*(أرىٰ رؤياكم قَدْ تواطأتْ في السَّبْعِ الأواخر فَمَنْ كان مُتَحَرِّيَـها فَلْيَتَحرَّهـا في السَّبع الأواخـر) رواه البخاري ومسلم عن ابن عمر رضي الله عنهما.

واتە: دەبینم خەونەکانتان لەسەر حەوت شەوی کۆتایی یەکیان گرتۆتەوە، جا هەر کەسێك بۆی دەگەڕێ با لەو حەوت شەوەی کۆتایی‌دا بۆی بخەفتێ.

## چوار: لەشەوی قەدردا چ جۆرە خواپەرستی‌یەك باشترە؟!

بێگومان خواپەرستی لەهەموو کات‌و شوێنێك دا هەر شتێکی پێویست‌و پەسەندو چاکە، بەڵام لەوکات‌و شوێنانەدا کە خوای کاربەجێ‌و پەنهان بین ڕێزو حورمەتی زیاتری لێناوە پێویست ترو پەسەندترەو خێرو پاداشتی زیاترو چاکتری هەیە.

---

[150] بڕوانە: (فتح الباري) ج٤ص٧٩١.

جا یەکێك لەو کاتانە بگرە گرنگترین و مەزنترینیان شەوی قەدرە، بەڵام ئایا چ جۆرە خواپەرستی‌یەك لەو شەوەدا گەورەترەو پاداشتی زیاترە؟ وەڵامەکەی لەبەر تیشکی ئەم دوو فەرمودەیەی پێغەمبەری خوادا ﷺ دەدەینەوە، کە فەرموویەتی:

*(مَنْ قام ليلة القدر ايماناً واحتساباً غُفِرَ له ماتَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ) رواه البخاري و مسلم عن ابي هريرة.

واتە: هەرکەسێك بەئیمان و خوا پێ‌مەبەست بوونەوە شەوی قەدر شەو نوێژ بکات ئەوە هەرچی گوناحی پێشوویەتی دەبووردرێ.

*(عن عائشة رضي الله عنها قالت: قلتُ يا رسول الله! أرأيتَ إنْ عَلِمتُ أيَّ ليلَةٍ ليلةُ القدر، ما أقول فيها!! قال: قولي: أللهمَّ انك عَفُوٌّ تُحِبُّ العَفْوَ فَاَعْفُ عَنِّي) رواه احمد وابن ماجة والترمذي وصححه.

واتە: عائیشە خوا لێی‌ڕازی‌بێ گوتوویەتی: گوتم ئەی پێغەمبەری خوا، دەبینی ئەگەر زانیم چ شەوێك شەوی قەدرە، ئایا چی تێدا بڵێم؟! فەرمووی: بڵێ ئەی خوایە بێگومان تۆ لێبوردەی و حەز لە لێبوردن دەکەی دەجا لێم ببورە.

بەڵێ شەوی قەدر شەوی هەموو جۆرەکانی خواپەرستی‌یە، بەتایبەت نوێژکردن – کە لەقورئان خوێندن و ڕکووع و سەجدەو زیکری خواو تەحییات پێك دێ – و لەخوا پاڕانەوەو داوای لێبوردن کردن لێ‌ی.

# بەندی سێیەم: ڕۆژووە سوننەتەکان

ڕۆژووە سوننەتەکان بەگشتی دە جۆرن:

یەك: شەش ڕۆژ لەمانگی شەووال؛ پێغەمبەر ﷺ لەوبارەوە فەرموویەتی: (مَـنْ صام رمضان ثم أتْبَعَهُ ستاً من شوال كـان كصيـام الدَّهْـرِ) رواه مسلم و وابوداود و الترمذي و ابن ماجة واحمد عن ابي ايوب الأنصاري رضي الله عنه.

واتە: هەرکەسێك ڕەمەزان بگرێ پاشان شەشیش لەشەووال بەدوای‌دا بگرێ ئەوە وەك ئەوە وایە هەموو ساڵ بەڕۆژوو بووبێ[151].

جا هەرچی (ابو حنيفة و شافعي و داود)ن ڕایان وایە کە یەکسەر لەدوای جەژنەوەو بێ‌پسانەوە بەدوای یەکدا بگیرێن چاکترە، ئەگەرنا مادام بکەونە نێو شەووالەوە هەر دروستەو ئەسڵی سوننەتەکە دێتەدی، بەڵام (احمد) ڕای وایە کە خێرو پاداشتەکەی هەرچۆن بێ یەکسانەو جیاوازی نیە[152].

(مالك)یش ڕای وایە کە شەشی شەووال سوننەت نین بگیرێن[153] ! بەڵام وەك (نووي)[154] بەرپەرچی داوەتەوە ڕایەکەی بێ‌هێزەو، نەك ڕای وی ڕای هەر کەسێکی دیکەش کە لەگەڵ فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ تێك بگیرێ هەر بێ هێزەو ڕەت کراوەیە.

دوو: ڕۆژی عەرەفە، واتە ئەو ڕۆژەی کە حاجی‌یەکان لەدەشتو کێوی عەرەفات ڕادەوەستن: کە دەبێتە هۆی سڕانەوەی گوناحەکانی ساڵی ڕابردوو و داهاتوو، وەك لەم فەرموودەیەدا دەردەکەوێ: (عن أبي قتادة رضي الله عنه قال: سُئِلَ رسولُ الله ﷺ عن صَوْمِ يَوْمِ عرفة؟ فقال: يُكَفِّرُ السَّـنَةَ الماضيـةَ والباقيـةَ) رواه مسلم والترمذي وابوداود وابن ماجة واحمد وغيرهم.

بەڵام زۆربەی هەرە زۆری زانایان ڕایان وایە کە بۆ کەسانێك کە لەعەرەفات بن - واتە لەحەج بن - سوننەت نیە بگرە ناپەسەند (مكروه) یشە چونکە دەبێتە هۆی بێ‌هێزبوونی و چاك دووعاو پاڕانەوە پێ‌نەکرانی کە گەورەترین عیبادەتی ئەو ڕۆژو شوێنەیە، هەندێکیش دەڵێن مادام لەخۆیڕا ببینێ و نەبێتە هۆی بێ‌هێزی‌و شپرزەبوونی هەر سوننەتە بیگرێ[155] ؛ دیارە ڕای زۆربەش بەهێزترو بەڵگەدارترە.

---

[151] چونکە چاکە یەك بەدەیەو ساڵیش دەوری (٣٦٠) ڕۆژە، کەواتە: (٣٦×١٠= ٣٦٠).

[152] بڕوانە: (المجموع) ج٦ص٤٠١.

[153] بڕوانە: (الموطا) ص٢٦٢.

[154] بڕوانە: (شرح صحيح مسلم) ج٥ص٢١٢٨.

[155] بڕوانە: (المجموع) ج٦ص٤٠٣.

**سێ: ڕۆژی دەیەمی مانگی موحەڕڕەم (عاشوراء)**: کە ئەمیش وەك (ابو قتادة) گێڕاویەتەوە خوا لێی ڕازی بێ، پێغەمبەر ﷺ کە لەبارەیەوە پرسیاری لێکراوە فەرموویەتی: (يُكَفِّرُ السَّنَةَ الماضية) رواه مسلم والترمذي وابوداود وابن ماجة واحمد.

واتە: گوناحەکانی ساڵی ڕابردوو دەسڕێتەوە.

ئنجا وەك (نووي) و زانایانی دیکەش گوتوویانە: مەبەست لەگوناح سڕرانەوە ووردە گوناحەکانن، نەك گوناحە زلەکان، کەسێکیش هەر گوناحی گەورەی هەبن ئومێد وایە ببێتە هۆی سووك کرانیانو بۆ بابای بێگوناحیش مایەی بەرزکرانەوەی پلەو پایەن[156].

شایەنی باسیشە کەوێڕای تێدا بەڕۆژوو بوونی دەیەمی مانگی موحەڕڕەم، گرتنی ڕۆژی نۆیەمیشی هەر سوننەتە چونکە پێغەمبەر ﷺ لەساڵی تێدا وەفات کردنیدا فەرموویەتی: (... فاذا كان العام المُقْبلُ إن شاءَالله صُمْنا اليوم التاسِعَ) رواه مسلم وابوداود والبيهقي واحمد عن ابن عباس رضي الله عنهما.

واتە: ئەگەر ساڵی ئایندە هات ئەگەر خوا بیەوێ ڕۆژی نۆیەمیش بەڕۆژوو دەبین.

**چوار: نۆ ڕۆژەکانی سەرەتای مانگی (ذي الحجة)**: کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەبارەیانەوە فەرموویەتی: ( ما مِنْ أيّامٍ العَمَلُ الصالحُ فيها أفْضَلَ مِنْهُ في هذهِ الأيام) رواه البخاري.

واتە: هیچ ڕۆژانێك کردەوەی چاکیان تێدا چاکترو خێرتر نیە لەم ڕۆژانە - کەمەبەستی دە ڕۆژەکانی سەرەتای مانگی (ذي الحجة)یە.

بەڵگەی سوننەت بوونی تێدا بەڕۆژووبونی نۆ ڕۆژەکانی سەرەتای مانگی ناوبراو کە گەورەترینیان ڕۆژی نۆیەمە وەك پێشتر باسمان کرد - ئەم فەرموودەیەیە:

(عن هُنَيْدَةَ بن خالد عن امرأتِهِ عن بعض أَزْواج النبيّ ﷺ قالت: كان رسول الله ﷺ يصومُ تِسْعَ ذي الحجة..) رواه ابوداود وهذا لفظهُ واحمد والنسائي.

**پێنج: زۆربەی ڕۆژەکانی مانگی موحەڕڕەم**: چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (أفْضَلُ الصَّوم بَعْدَ شَهْرِ رمضان شَهْرُ المُحَرَّم، وأفْضَلُ الصَّلاة بَعْدَ الفَريضَةِ صَلاةُ اللّيْلِ) رواه مسلم واصحاب السنن واحمد والبيهقي.

واتە: پەسەندترین ڕۆژوو دوای مانگی ڕەمەزان ڕۆژوی مانگی موحەڕڕەمە، وە چاکترین نوێژیش دوای فەرزەکان شەونوێژە.

---

[156] بڕوانە: (شرح صحيح مسلم) ج٥ص٣١١٩.

شەش: زۆربەی ڕۆژەکانی مانگی شەعبان: بەڵگەی ئەمیش ئەم دەقەیە:

(عَنْ عائشة رضي الله عنها قالت: مارأيت رسول الله ﷺ اسْتَكْمَلَ صيام شَهْرٍ قطُّ إلاَّشَهْرَ رَمَضَانَ، وما رَأيْتُهُ في شَهْرٍ أكْثَرَ مِنْهُ صياماً في شَعْبانَ) متفق عليه.

واتە: پێغەمبەری خوام ﷺ نەدیوە بێجگە لەمانگی ڕەمەزان هەرگیز ڕۆژووگرتنی هیچ مانگێکی تەواوکردبێ، وە نەمدیوە لەهیچ مانگێك دا هێندەی شەعبان بەڕۆژوو بووبێ.

حەوت: مانگە حەرامەکان (الأشهر الحرم) کە بریتین لە : (ذوالقعدة وذوالحجة والمحرم ورجب) : وەك لەم فەرموودەیەدا هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ بە پیاوێکی (باهلی) فەرمووە: (صُمْ من الحُرُمِ واتْرُكْ، صُمْ من الحُرُمِ واتْرُكْ، صُمْ من الحُرُمِ واتْرُك) رواه احمد وابوداود وابن ماجة والبيهقي بسند جيد.

هەشت: ڕۆژانی دووشەممە و پێنج شەممە لەهەفتەدا: کە لەو بارەشەوە چەندان فەرموودە هەن بۆ وێنە:

(عن عائشة رضي الله عنها قالت: كان رسولُ الله ﷺ يَتحرَّى يومَ الإثْنَيْنِ والخَمِيسِ) رواه النسائي والترمذي وحسنه.

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ لەڕۆژانی دووشەممەو پێنج شەممە دەخەفتا -بۆ ڕۆژووگرتن -.

ئنجا حیکمەتی تایبەت کردنی ئەو دوو ڕۆژەش بەڕۆژووەوە ئەوەیە - وەك پێغەمبەر ﷺ خۆی فەرموویەتی :-

(تُعْرَضُ أعمالُ الناسِ في كل جُمعةٍ مَرَّتَيْنِ: يَوْمَ الإثْنَيْنِ ويَوْمَ الخَمِيسِ) رواه مسلم عن ابي هريرة رضي الله عنه، واتە: کردەوەکانی خەڵکی هەموو هەفتەیەك دووجار ڕادە نوێنرێن[157]: ڕۆژی دوو شەممەو ڕۆژی پێنج شەممە.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ کە لەبارەی ڕۆژیی دوو شەممەوە پرسیاری لێکراوە فەرموویەتی:

(ذلك يومٌ وُلدتُ فيه ويوم بُعثتُ أو أُنْزِلَ عليَّ فيه) رواه مسلم عن ابي قتادة رضي الله عنه، واتە: ئەو ڕۆژە ڕۆژێکە کە تێیدا لەدایك بووم، وە ڕۆژێکە کەتێیدا ڕەوانە کراوم، یان تێیدا قورئانم بۆ نێرراوەتە خوار.

---

[157] واتە لەسەر خوای پەروەردگار ڕادە نوێنرێن وەك لەو فەرموودەیەدا هاتوە کە (ابوداود ونسائي) لە (أسامة)ی دەگێڕنەوە، بڕوانە: (المجموع) ج٦ص٤١١.

**نۆ: سێ ڕۆژ لەهەر مانگێك:** لەوبارەشەوە چەندان فەرمووده هەن، بۆ وێنە:

(عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: أوصاني خليلي بثلاثٍ: صيامِ ثلاثةِ أيامٍ من كل شَهْرٍ وركعتي الضُحَى وأن أُوتِرَ قَبْلَ أَنْ أَنَامَ) رواه البخاري.

واته: خۆشەویستەکەم ڕای سپاردووم کە سێ شتان بکەم: بەڕۆژووبوونی سێ ڕۆژان لەهەر مانگێك دا، وە دوو ڕکاتی چێشتەنگاو، وە کە نەخەوم هەتا نوێژی وەتر نەکەم.

جا هەرچەندە وەك زانایان گوتوویانە هەرچۆن بێ مادام لەهەر مانگێك دا سێ ڕۆژان بەڕۆژووبێت سوننەتە کە دێتەدی،[158] بەڵام پەسەندتر وایە کە ئەو سێ ڕۆژە بن کە ڕۆژە سپیەکان (أَيّام البِيْض) یان پێدەگوترێ، جا ئەمانیش هەرچەندە زانایان لەسەر دیاریکردنیان ڕایان جیاوازەو (الحافظ ابن حجر) دە (١٠) ڕای زانایانی لەوبارەوە هێناون[159]، بەڵام وەك (نووي)[160] گوتوویەتی: ئەوەی کە زۆربەی هەرە زۆری زانایانی لەسەرن ئەوەیە کە مەبەست پێیان ئەو ڕۆژانەن کە شەوەکانیان بەهۆی مانگەوە زۆر سپی و ڕۆشنن کە سێزدەو چواردەو پازدەن، چونکە چەند فەرموودەیەك لەوبارەوە هەن بۆ وێنە: (عن جرير بن عبدالله رضي الله عنه عن النبي ﷺ قال: (صيامُ ثلاثةِ أيّامٍ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ صيامُ الدهْرِ، أيّامُ البِيْضِ: ثَلاثَ عَشْرَةَ وأَرْبَعَ عَشْرَةَ وخَمْسَ عَشْرَةَ) رواه النسائي بسند حسن.

واته: بەڕۆژوو بوونی سێ ڕۆژان لەهەر مانگێك بە بەڕۆژوو بوونی تێکڕای ساڵ هەیە. ئەوانیش ڕۆژە سپیەکانن، سێزدەو چواردەو پازدە.

**دە: ڕۆژێك نا ڕۆژێك:** کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئەوە شێوەی ڕۆژووگرتنی (داود) ە عليه السلام، وەك لەو فەرموودەیەدا دەبینرێ کە (عبدالله بن عمر و بن العاص) گێڕاویەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

(لا صوم فوق صومِ داودَ، شَطْرُ الدَّهْرِ، صيامُ يَوْمٍ وإفْطارُ يَوْمٍ) متفق عليه.

واته: هیچ ڕۆژوویەك لەسەرووی ڕۆژووی داوودەوە نیە، نیوەی ساڵ، بەڕۆژووبوونی ڕۆژێك و پێنەبوونی ڕۆژێك.

[158] بڕوانە: (المجموع) ج٦ص٤٠٩.
[159] بڕوانە: (فتح الباري) ج٤ص٧٤٩.
[160] بڕوانە: (المجموع) ج٦ص٤١٠.

جا خوێنەری بەڕێزا هەرچەندە ئەو ڕۆژووانە هەموویان سوننەتن، بەڵام وەك لەدەقەكانی سوننەتیش دا دەركەوت هەیانە خێرو پاداشتی زیاترەو، ئەگەر بشگونجێ وا پەسەندە ئینسان هەموو ئەو دە جۆرە ڕۆژانە بگرێ، بەڵام بێگومان لەیەك كات دا نا، چونكە ئەوە گونجاو نیە و هەندێكیان پێكەوە تێك دەگیرێن، بەتایبەت پێنج شەممەو دوو شەممە لەهەفتەداو ڕۆژێك نا ڕۆژێكو سێ ڕۆژ لەمانگێ‌دا، بەڵام دەتوانێ هەر ماوەیە یەكێك لەوجۆرانە بگرێ، بۆئەوەی ڕەفتار بەسەرجەم دەقەكانو سوننەتەكانی پێغەمبەری خوا ﷺ بكات، كە بێگومان وەك كاتی خۆی لەبابەتی دووەم (بنچینە گرنگەكانی هەڵس‌وكەوتی شەرعی‌یانەو ژیرانە لەگەڵ وردە بابەتە خیلافی‌یەكان دا) دا ڕوونمان كردەوە، ئەوە چاكترو خێردار ترەو لەڕێبازو سوننەتی پێغەمبەر ﷺ نزیك ترە، نەك دەق گرتنو خوو پێوەگرتنی جۆرو شێوەیەك لەجۆرو شێوەكانی خواپەرستی‌یەكانو لێ‌لانەدانو واز لێ‌نەهێنانی، كە بێگومان ئەوجۆرە ڕەفتارە سەرەڕای پشت گوێ‌خستنی بەشێكی سوننەت مایەی پەیدابوونی دەمارگیری‌و تەسك بینی‌و لایەك لەهەق بینینیشە!

لەكۆتایی ئەم بەندی سێیەمەش دا كە بۆ ڕۆژووە سوننەتەكانمان تەرخان كردبوو بەپێویستی دەزانم ئاماژەیەكی كورت بەمەسەلەیەكی گرنگ بكەین كە بریتیە لە تەواوكردن و نەكردنی ڕۆژووی سوننەت[١٦١]:

زۆربەی هەرە زۆری زانایان كە جگە لە: (عمر و علي و ابن مسعود وابن عمر و ابن عباس و جابر بن عبدالله) خوا لێیان ڕازی‌بێ، هەركام لە: (سفيان الثوري و شافعي و احمد و إسحاق)یشیان لەنێودان، دەڵێن: وا پەسەندە بگەیەنرێتە سەر، بەڵام ئەگەر شكێنراش بەعوزریان بێ عوزر نەحەرامەو نەگێڕانەوەشی دەوێ، (ابوحنيفة)ش ڕای وایە كە تەواوكردنی فەرزە بەڵام ئەگەر بەعوزرێكەوە شكاندی هەر گێڕانەوەی لەسەرەو گوناحبار نیە، بەڵام بەبێ عوزر گوناحبارەو دەبێ بیشیگێڕێتەوە، (مالك و ابوثور)یش ڕایان وایە تەواوكردنی فەرزە، بەڵام ئەگەر بەعوزرێك شكاندی گێڕانەوەی لەسەر نیە، ئەگەرنا لەسەریەتی[١٦٢].

---

[١٦١] نوێژی سوننەتیش هەمان حوكمی هەیە، بڕوانە: (المجموع) ج٦ص٤٢١.

[١٦٢] بڕوانە: (المجموع) ج٦ص٤٢١.

بەکورتی: هەرکام لەحەج و عومرە لەزاراوی شەرع دا بریتین لەسەردانی ماڵی خوا – کە کابەیە– (بیت الله الحرام)[9] وە هەرکامێکیان لەچەند پایەو فەرزو سوننەتێك پێك دێن، ئەوەندە هەیە حەج چەند ئیمتیازێکی بەسەر عومرەدا هەن، کە گرنگترینیان ڕاوەستانە لەعەرەفات، کە پایەو کۆڵەکەی سەرەکی حەجە، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (الحجُّ عرفةٌ) رواه اصحاب السنن، واتە: حەج کردن ڕاوەستانە لەعەرەفات.

## ٢–پلەو پایەی حەج و عومرە:

هەم خوای بێوێنەو هاوەڵ و هەم پێغەمبەری سەروەریشمان ﷺ لەزۆر دەقی قورئان و سوننەت باسی حەج و عومرەو پایەو فەرزو سوننەتەکانیانیان کردوەو بەرزی پلەو پایەیان گەورەیی خێرو پاداشتی ئەنجام دەرانیانیان خستۆتەڕوو. کە ئێمە چەند دەقێك لەهەر کامێکیان بەنموونە دێنینەوە:

یەك: لەقورئانیدا:

(وَأَتِمُّوا الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ) البقرە: ١٩٦، واتە: وە حەج و عومرە بۆ خوا تەواو بکەن.

*(وَلِلَّهِ عَلَى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْتِ مَنِ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا وَمَنْ كَفَرَ فَإِنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ عَنِ الْعَالَمِينَ) ال عمران: ٩٧ ((پێشتر تەرجەمە کرا).

*(وَأَذِّنْ فِي النَّاسِ بِالْحَجِّ يَأْتُوكَ رِجَالًا وَعَلَى كُلِّ ضَامِرٍ يَأْتِينَ مِنْ كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٍ) الحج: ٢٧، واتە: وە بەنێو خەڵکیدا جاڕ بدە بێن بۆ حەج، بەپێیان و بەسواری هەر وڵاخێکی لەڕولاواز – بەهۆی ڕێی دووربڕینەوە – کە لەهەموو ڕێیەکی دوورەوە دێن.

دوو: لەسوننەتدا:

*(عن ابي هريرة رضي الله عنه قال: سُئِلَ رسولُ الله ﷺ أيُّ الأعمالِ أفضَلُ؟! قال: إيمـانٌ بالله ورسولِه، قيل:ثم ماذا؟! قال: حَجٌّ مبرورٌ) متفق عليه.

واتە: پرسیار لەپێغەمبەری خوا ﷺ کرا: چ کردەوەیەك چاکترە؟ فەرمووی: بڕوا – یەکی پتەو– بەخواو بەپێغەمبەرەکەی، گوترا: ئەدی دوای ئەوە؟ فەرمووی: حەجێکی تێرو تەواو[10].

---

[9] بۆیە کابە (كعبة) بە (بيت الله الحرام) ناونراوە، چونکە زێدە حورمەت و ڕێزی هەیە بەسەر شوێنەکانی دیکەداو چەند شتێکی تێدا حەرام کراون کە لەشوێنەکانی دیکەدا موباح و ڕەوان.

[10] بۆیە وشەی (مبرور) م بە(تێرو تەواو) لێکدایەوە، چونکە زانایان بە (مقبول) وە (الذي لاتخالِطُهُ المعصيةُ) وە (الذي وفيت احكامُهُ ووقع مَوْقِعاً لما طلب من المكلّف على الوجه الأكمل) تەفسیریان کردوە، بڕوانە: (المجموع) ج٧ص٤، وە: (فتح الباري) ج٤ص١٥٧.

*(عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: سمعت رسول الله ﷺ يقولُ: مَنْ حَجَّ فَلَمْ يَرْفُثْ ولَمْ يَفْسُقْ رَجَعَ كيومِ وَلَدَتْهُ أُمُّهُ) متفق عليه، واته: هەر كەسێك حەج بكاتو هیچ قسەو[11] ڕەفتارێكی ناشیرینی نەبوو، وە گوناحی نەكرد، ئەوە وەك ئەو ڕۆژەی كە تێیدا لەدایك بووە دەگەڕێتەوە – ماڵ –.

(واتە:وەك چۆن منداڵی تازە لەدایك بوو هیچ گوناحێكی نیەو پاكو بێگەردە ئەویش بەهۆی حەجەكەیەوە ئاوا پاك دەبێتەوە).

*( عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: قال رسول الله ﷺ: العُمْرَةُ الى العُمْرَةِ كفارةُ لما بينهما، والحجُّ المبرورُ لَيْسَ لَهُ جزاءٌ إلا الجنَّةُ) متفق عليه، واته:عومرە هەتا عومرەیەكی دیكە نێوان خۆیان – لەگوناح - دەسڕنەوە، وەحەجی تێرو تەواو جگە بەهەشت پاداشتێكی دیكەی نیە.

*(عن عائشة رضي الله عنها قالت: قلت يا رسول الله نرى الجهاد أفْضَل العمل أفلا نُجاهِدُ؟ قال: لَكُنَّ أفْضَلَ من الجهادِ حَجٌّ مَبْرورٌ) رواه البخاري والنسائي وابن ماجة وأحمد والبيهقي.

واتە: عائیشە خوا لێیڕازیبێ دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەبینین جیهاد چاكترین كردەوەیە، جا ئایا جیهاد نەكەین؟! فەرمووی: بەڵام – بۆ ئێوەی ئافرت – حەجی تێرو تەواو لەجیهاد چاكترە.[12]

*(عن ابن عباس رضي الله عنهما أن النبي ﷺ قال: عُمْرةٌ في رمضان تَعْدِلُ حَجَّةً أو حَجةً مَعي) متفق عليه، واتە: عومرەكردنێك لەڕەمەزان دا بارتەقای حەجێكە –یان حەجێكی گەڵ منە –.

*( عن عائشة رضي الله عنها أن رسول الله ﷺ قال: ما من يَوْمِ أكثر مِنْ أنْ يَعْتِقَ الله فيه عبداً من النار من يوم عرفة) رواه مسلم، واتە: لەهیچ ڕۆژێك دا خوا هێندەی ڕۆژی عەرەفە بەندەكان لە –سزای – ئاگر ئازاد ناكات. هەڵبەتە دەقی دیكەش هەن بەڵام ئەوانەی هێنرانەوە بەسن بۆ ئیسپاتی بەرزی پلەو پایەو پاداشتی حەجو عومرە.

---

[11] وشەی (رَفَثْ) بەمانای جیماعو پێشەكییەكانی و قسەی جینسییانە لەگەڵ ژنانو هەر قسەو ڕەفتارێكی دزێوو ناشیرین هاتوە، بڕوانە: (فتح الباري) ج٤ص١٥٨، وە بڕوانە: (الجامع لأحكام القرآن) للقرطبي، ج١ص٣١٤، ٣١٥.

[12] ئەو فەرموودەیە بەو شێوەیە لە (المجموع) م نەقڵ كردوە، ج٧ص٤، بەڵام (فتح الباري) ئاوای هێناوە: (لكنْ أفْضَلَ الجهادِ) بڕوانە: (ج٤ص١٥٧)، دیارە دەبێ هەردووكیشیان هاتبن.

## ٣-حوکمی حەج و عومرە:

حەج یەکێکە لەپێنج پایەکانی ئیسلام و زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن[13] کە لەسەر هەر مسوڵمانێکی عاقڵ و باڵغ و ئازادو خاوەن توانا (مستطیع) فەرزی عەینە، چونکە دەقەکانی قورئان و سوننەت لەوبارەوە زۆر ڕوون و ڕاشکاو (واضح وصریح)ن، هەروەها زانایان لەسەر ئەوەش یەکدەنگن کە ئافرەت و پیاو تێیدا یەکسانن و[14]، لەتەمەنیش دا تەنیا جارێك فەرزە[15].

ئەمەش چەند دەقێکی قورئان و سوننەت کە زانایان کردوویاننە بەڵگەی فەرزبوونی حەج و بناغەی یەکدەنگی‌یان لەوبارەوە:

* (وَلِلَّهِ عَلَى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْتِ مَنْ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا) آل عمران:٩٧.

* (وأتموا الحج والعمرة لله...) البقرة: ١٩٦.

*(عن ابن عمر رضي الله عنهما قال: قال رسول الله ﷺ: بُني الأسلامُ على خَمْسٍ: شهادةِ أن لا اله الا الله و أن محمداً رسولُ الله، وإقامِ الصلاةِ وإيتاءِ الزكاة وحَجِّ البَيتِ وصيامِ رمضان) متفق عليه.

واتە: ئیسلام لەسەر پێنج -پایە- ان بنیات نراوە: شایەتمان هێنان بەوە کە جگە لەخوا هیچ پەرستراو نین وە کە موحەممەد ڕەوانەکراوی خوایە، وەنوێژ بەرپاکردن و، وە زەکات دان، وەحەجی ماڵ -ی خوا-، وە ڕۆژووگرتنی ڕەمەزان.

* (عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: خَطَبَنا رسول الله ﷺ فقال: أيُها الناسُ ان الله قَدْ فَرَضَ عليكم الحجَّ فحجوا، فقال رَجُلٌ: أكُل عامٍ يا رسول الله؟ فَسَكَتَ حتى قالَها ثلاثاً، ثم قال ﷺ: لَوْ قُلْتُ نَعَم لَوَجَبَتْ ولما آستطعتُمْ..) رواه مسلم والنسائي.

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری بۆ داین و فەرمووی: ئەی خەڵینە! بێگومان خوا حەجی لەسەر پێویست کردوون جا حەج بکەن! پیاوێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا هەموو ساڵێکە؟! جا بێدەنگ بوو هەتا سێ جاران گوتیەوە، ئەوجار فەرمووی: ئەگەر گوتبام بەڵێ ئەوە -هەموو ساڵێك- لەسەرتان پێویست دەبوو وەنەشتان دەتوانی... ئەمە دەربارەی حوکمی حەج کردن.

---

[13] ئەو فەرموودەیە بەوشێوەیە (المجموع)م نەقڵ کردوە، دەبێ هەردووکیشیان هاتبێ.

[14] بڕوانە: (فتح الباري) ج٤ص١٥٢، وە: (احکام القرآن) ج١ص١٦٩.

[15] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

دەربارەی عومرەش زانایان ڕایان جیاوازە هەرچی (شافعي و ثوري و احمد و اسحاق و داود الظاهري و ابن عبيد)ن بەفەڕزیان زانیوە[16]، هەروەها هەرکام لە (بخاري[17] و ابن حزم[18] و شوکاني[19])یش هەمان ڕایان هەیە، بەڵام (ابوحنيفة و مالك و ابوثور و نخعي) بەسوننەتیان داناوە[20]، وە هەرکام لە (ابن تيمية[21] و صنعاني[22] و ابن العربي[23])یش پشتگیری ئەم ڕایەیان کردوە.

واش دێتە بەرچاو کەڕای ئەوانە ڕاستتر بێت کە عومرە بەفەڕز نازانن، چونکە وەك گوتوویانە[24]: هیچ بەڵگەیەك لەوبارەوە نیەو ڕستەی: (وأتموا الحج والعمرة لله)ش نابێتە بەڵگە چونکە ڕای بەهێزتری توێژەرەوانی قورئان لەبارەیەوە ئەوەیە کە خوای پەروەردگار فەرمانی کردوە بەتەواوکردنو بەتەواوی بەجێهێنانی حەجو عومرە پاش دەست پێکردنیان، دیارە ئەمەش بەڵگە نیە لەسەر فەڕزبوون لەسەرەتاوە[25].

هەروەها لەوبارەوە کە ئایا حەج کردن - وەلەسەر ڕای ئەوانە کە عومرەش بەفەڕز دەزانن عومرە کردنیش - پێویستە دەستبەجێ (فوراً) بکرێن، یان بەکاوەخۆ (تراخي) ش هەر دروستە؟ دیسان ڕایان جیاوازە، هەرچی (ابوحنيفة و مالك و احمد و ابو يوسف و بعض أصحاب الشافعي)ی ڕایان وایە کە پێویستە دەستبەجێ بێت[26]، بەڵام (شافعي ثوري وأوزاعي و محمد بن الحسن) ڕایان وایە کە بەکاوەخۆش بێت هەر دەبێو مادام پێش مردن ئەنجامی بدات گوناحبار نابێ[27].

واش پێدەچێ ڕای یەکەم بەهێزترو چاکتر بێت چونکە وێڕای هەبوونی چەند دەقێکی سوننەت دووربینی (إحتياط)یشی تێدایەو هیچ کەس نازانێ هەتا سبەینێ چی لێ بەسەردێ!

---

[16] بڕوانە: (المجموع) ج٧ص٨٥٧.

[17] بڕوانە: (فتح الباري) ج٤ص٤٣١.

[18] بڕوانە: (المحلى شرح المجلى) ج٧ص٥، مسالة: ٨١١.

[19] بڕوانە: (الروضة الندية) ج١ص٣٦٠.

[20] بڕوانە: (المجموع) ج٧ص٨، وە: (احكام القرآن) ج١ص١٦٩.

[21] بڕوانە: (مجموعة الفتاوى) ج٢٦ص٨.

[22] بڕوانە: (سبل السلام شرح بلوغ المرام) ج٢ص٩٢٢.

[23] بڕوانە(احكام القرآن) ج١ص١٦٩.

[24] بڕوانە: (الجامع لأحكام القرآن)، ج٢ص٢٨٣، وە بڕوانە: (مجموعة الفتاوى) ج٢٦ص٨.

[25] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[26] بڕوانە: (فقه السنة) ج١ص٦٣٧.

[27] هەمان سەرچاوەو بەرگ ص٦٣٦.

*ئەو دەقانەش کە ئەنجام دانی حەج دەستەبەجێ (فوراً) دەگەیەنن، بۆ وێنە:*

* **(عن ابن عباس رضي الله عنهما أن رسول الله ﷺ قال: مَنْ أرادَ الحج فليُعَجِّل فانه قَدْ يمرضُ المريض وتضِلُ الراحِلةُ وتكون الحاجةُ)** رواه احمد وابن ماجة والبيهقي والطحاوي.

**واتە: هەرکەسێك ویستی حەجی بکات با پەلە بکات، چونکە ئینسان نەخۆش دەبێ و، وڵاخ -وەسیلەی سواریی- بزر دەبێ و، ئیش وکاری دیکە دێتە پێش.**

***(عن ابن عباس رضي الله عنهما أن رسول الله ﷺ قال: تعجَّلوا الى الحجَ فانَّ أحدكُمْ لايدري مايَعرِضُ لَهُ)** رواه احمد والبيهقي.

**واتە: بەپەلەو خێرا بچن بۆ حەجێ، چونکە یەکێکتان نازانێ چی دێتە پێش.**

**دیسان زانایان دەربارەی ساڵی فەرزکرانی حەج رایان جیاوازە، زۆربەیان رایان وایە کەساڵی شەشەمی کۆچی فەرزکراوە، هەندێکیشیان رایان وایە کە ساڵی نۆیەم یان دەیەمی کۆچی فەرز کراوەو هەرکام لە (ابن تیمیة و ابن القیم)یش ئەم رایەیان پەسەند کردوە.**[28]

**دیارە ئەم مەسەلەیەش شتێکی مێژووییەو بەهەر بارێکیان دابنێ بۆ ئێمە جیاوازییەکی ئەوتۆی نیە، بەڵام بەنیشانەی ئەوە کە ئایەتی: (.. ولله على الناس حج البيت مَن أستطاعَ اليه سبيلاً..)ی (آل عمران) پاش (وأتِمّوا الحج والعمرةَ)ی (البقرة) هاتۆتەخوارو ئایەتەکەی (آل عمران)یش روون و راشکاوانەتر فەرزبوونی حەج دەگەیەنێ لەئایەتەکەی (البقرة) کە مشت ومڕی لەسەرە لەوبارەوە، بەڵێ بەنیشانەی ئەوە وا پێدەچێ رای دووەم بەهێزتر بێت.**



[28] **بڕوانە: (مجموعة الفتاوى) ج٢٦ص٧تا٩، وە بڕوانە: (زاد المعاد في هدي خير العباد) ج١ص١٧٥، وە بڕوانە: (فتح الباري) ج٤ص١٥٢، ١٥٣، وە بڕوانە: (الفقه السلامي وادلته) ج٣ص٢٠٦٥، وە: (فقه السنة) ج١ص٦٢٣.**

# بەندی دووەم

# جۆرەکانی حەج و عومرەو مەرجەکانیان

**خوێنەری بەڕێز!**

پاش ئەوەی لە بەندی یەکەم دا زانیمان حەج و عومرە چین و چۆنن و، ئەنجام دەرانیان چ خێرو پاداشتێکیان هەیەو، حوکمی هەرکامێکیان چی یە! خوا یارمەتی دەر بێت لەم بەندەدا لەدوو خاڵ هەم جۆرەکانیان و هەم مەرجەکانی ئەنجام دانیشیان ڕوون دەکەینەوە:

## ١- جۆرەکانی حەج و عومرە:

تێکڕای[٢٩] زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە جۆرەکانی حەجکردن سێ (٣)ن و هەرسێکیان دروستن، کە ئەمانەن:[٣٠]

أ- إفرادْ) کە بریتیە لەوەی لەپێش دا ئیحرام بەحەج ببەسترێ و، کارەکانی حەج تەواو بکرێن، پاشان عومرە بکرێ.

ب- تَمَتُّعْ) کە بریتیە لەوەی کە لە مانگەکانی حەج دا عومرە بکرێ، پاشان ئیحرام بشکێنرێ و دوایی دووبارە ئیحرام بەحەج ببەسترێ و حەجەکەش ئەنجام بدرێ.

ج- قِرانْ) کە بریتیە لەوەی لەیەك کات دا وێکڕا ئیحرام بەحەج و عومرە ببەسترێ و پێکەوە ئەنجام بدرێن.

ئنجا زانایان پاش یەکدەنگ بوونیان لەسەر دروست (جائز)ی و ڕەوایی هەرکام لەم جۆرە حەج و عومرە کردنانە، لەوبارەوە کە ئایا کامیان چاکترەو خێرو پاداشتی زیاترە؟ ڕایان جیاوازەو قسەو باسی زۆریان کردوە، هەندێکیان کە (شافعی یەکان و مالیکی یەکان)یان لەنێودان ڕایان وایە کە تاق کردنەوەی حەج (إفراد) چاکترە،[٣١] هەندێکیشیان کە (حەنەفی یەکان)یان لەنێودان جووتکردنی حەج و عومرە (قِرانْ) بەچاکتر دەزانن،[٣٢]

---

[٢٩] بڕوانە (المجموع) ج٧ص١٢٠، ١٢١، وە: (فقه السنة) ج١ص٦٦٦، وە (المغني) ج٣ص٢٣٢.

[٣٠] چونکە هاوەڵان خوا لێیان ڕازیبێ لەحەجیماڵئاوایی دا هەرسێك جۆریان کردوون وەك (عائشة) گێڕاویەتەوە: (خَرَجْنا مع رسول الله ﷺ موافين لهلال ذي الحجة، منا مَنْ أهلّ بعُمْرةٍ، ومِنّا مَنْ أهلّ بحَجّةٍ وعُمْـرةٍ، ومِنـا مَـنْ أهـلّ بِحجـةٍ، فكنت فيمن أهل بعمرةٍ..) رواه مسلم، (المجموع) ج٧ص١١٨.

[٣١] بڕوانە: (فقه السنة) ج١ص٦٦٨، وە بڕوانە: (المجموع) ج٧ص١٢١.

[٣٢] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

هەندێکیشیان کە (حەنبەلیەکان)یان لەنێودان جۆری (تمتع) لەهەموویان بەچاکتر دادەنێن،[33] شیعەی (إمامیة)ش ڕایان وایە کە هەرکەسێك چل و هەشت (٤٨) میل لە مەککەوە دووربێت مەگەر زۆر ناچار بێت ئەگەرنابێجگە لەجۆری (تمتع) هیچ جۆرێکی دیکەی بۆ نیە، وەك چۆن خەڵکی مەککەو دەوروبەریشی بەنزیکی کەمتر لە (٤٨) میل بەس جۆری (إفراد)و (قران)یان بۆ هەیەو مەگەر زۆر تێگیراوو ناچار بن ئەگەرنا بۆیان نیە بە (تمتع) بیکەن.[34] بەڵام بەڵگەی شیعەکان بۆ ئیسپاتی دەعوایەکەیان شتێکی ئەوتۆ نیە.

واش پێدەچێ کە ئەم سێ جۆرە یەکسان بن و[35] بۆیەش حەج و عومرەکردن بەسێ جۆر دانراوە تاکو بۆ مسوڵمانان ئاسان بن و بەگوێرەی حاڵەتە جیاجیاکانیان کام جۆرەیان بۆ ئاسانتربوو ئەویان هەڵبژێرن، بۆیەش ئەم ڕایەم هەڵبژارد چونکە پەسەندکەرانی هەرکام لەو سێ جۆرانە بەڵگەیان بەدەستەوە هەن و ئەوەندی سەرنجم دان هیچ کامیانم بۆ هەڵنەبژێررا بەسەر ئەوانی دیکەدا[36].

بەڵام هەرکام لەجۆری (تمتع) و (قران)، لەسەر خاوەنەکانیان پێویستە خوێن بدەن کە سەربڕینی مەڕ - یان بزن -ێکە یان حەوت یەك (٧/١)ی حوشترێك یان مانگایەك، وە ئەگەر نەیبوو پێویستە دە (١٠) ڕۆژان بەڕۆژوو بێت سێ یان لەکاتی حەجەکەی‌داو حەوتیشیان پاش گەڕانەوەی، وەك خوای پەروەردگار لەو بارەوە فەرموویەتی: (...فَمَنْ تَمَتَّعَ بِالْعُمْرَةِ إِلَى الْحَجِّ فَمَا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْيِ فَمَنْ لَمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ فِي الْحَجِّ وَسَبْعَةٍ إِذَا رَجَعْتُمْ تِلْكَ عَشَرَةٌ كَامِلَةٌ..) البقرة:١٩٦، (واتە: .. جا هەرکەسێك - بەهۆی ئیحرام شکاندنەوە - لەدوای عومرەوە لەززەتی وەرگرت (لەو شتانەی کە بەهۆی ئیحرام بەستنەوە لێی قەدەغە کرابوون) هەتا هاتنی کاتی ئیحرام بەستن بەحەج، ئەوە دەبێ ئەوەی ئاسانە لەقوربانی - کە یەك سەر مەڕ یان بزنە - سەرببڕێ، بەڵام کەسێك نەیبوو ئەوە ڕۆژووگرتنی سێ ڕۆژان لەحەجێ و حەوتیش کە گەڕایەوە قەرزدارە، کە دەکاتە دە - ڕۆژوو - ی تەواو.



[33] هەمان سەرچاوەو بەرگ و لاپەرە.
[34] بڕوانە: (الفقه على المذاهب الخمسة) محمد جواد مغنيه، ص٢٠٦، ٢٠٧.
[35] (نووي) یش ڕایەکی وای لە (قاضي عياض) و ئەویش لە (بعض العلماء) ەوە هێناوە، المجموع ج٧ص١٢١.
[36] بڕوانە: (المغني والشرح الكبير) ج٣ص٢٣٣تا٢٣٨، وە (المجموع) ج٧ص١١٩تا١٤٠.

دیسان پێویستە ئەوەش بزانرێ کە بەڕای زۆربەو جەماوەری زانایان لەجۆری جووتکردنو وێکڕاکردنی حەجو عومرە (قران)دا تەنیا یەك جار سووڕانەوەی دەوری کەعبە (طواف) و یەك جار هاتنو چوونی نێوان صەفاو مەروە (سعي) و یەك جار سەرتاشین یان کورت کردنەوەو هەڵپاچین هەیە، واتە: جیاوازی جۆری (قِرانْ) و (افراد) تەنیا لەوەدایە کە جۆری (قِران) لەکاتی نیەت هێنانو ئیحرام بەستنەکەیدا هەرکام لە حەجو عومرە ئامادە دەبنو نیەتیان لێدەهێنرێو ئیحرامیان پێدەبەسترێ.[٣٧]

بەڵام (ابو حنیفة) ڕای وایە کە دەبێ دوو طەوافو دوو (سعي) هەرهەبن،[٣٨] دیارە ڕای جەماوەریش بەهێزترە کە ئەم دەقانەیان بەدەستەوە هەن:

*(عن جابر رضي الله عنه قال: قَرَنَ رسولُ الله ﷺ الحجَّ والعُمْـرةَ وطـافَ لهمـا طوافـاً واحـداً) رواه الترمذي وحسنه، واتە: پێغەمبەری خوا حەجو عومرەی وێکڕاکردنو تەنیا یەك طەوافی بۆ کردن.

* (عن ابن عمر رضي الله عنهما ان رسول الله ﷺ قال: مَنْ أَهلَّ بالحج والعمرة أجـزأه طـوافٌ واحدٌ وَسَعْيٌ واحدٌ) رواه الترمذي وقال حسن صحيح غريب واخرجه الدارقطني وزاد، (ولايَحـلُّ منـهما حتـى يحلَّ منهما جميعاً).

*وە پێغەمبەر ﷺ لەحەجیماڵئاواییدا بەعائیشەی فەرموو: (طوافكِ بالبَيْتِ وبين الصَّفا والمـروة يكفيـكِ لحَجِّـكِ وعُمْرَتِـكِ) رواه مسلم، واتە: سووڕانەوەت بەدەوری کابەداو بەنێوان صەفاو مەروەدا وەبری حەجەکەت و عومرەکەشت دەکەوێ.

کەواتە: پوختەی مەبەست ئەوەیە کە زانایان هەموویان لەسەر ئەوە یەکدەنگنو ڕێك کەوتوون کە حەجو عومرە بەسێ جۆر دەکرێنو هەرسێکیشیان ڕەوان، ئەوەندە هەیە لەسەر ئەوە کە کامیان چاکترو خێترە ڕایان جیاوازەو، هەرکام لەو سێ جۆرە کە (إفرادو قِران و تَمَتُّعْ)، بەشێك لەزانایان بەچاکتریان داناوە، بەڵگەی دروست (جائز) بوونی ئەو سێ جۆرەش چەند دەقێکە کە یەکێکیان ئەمەیە:

* (عن عائشة رضي الله عنها أنها قالت: خَرَجْنا مع رسول الله ﷺ عامَ حَجّةِ الـوداعِ فَمِنـا مَـنْ أَهلَّ بِعُمْرةٍ، ومِنا مَنْ أَهَلَّ بِحَجّةٍ وعُمْرَةٍ، ومِنا مَنْ أهلَّ بالحجِّ وأَهَلَّ رسولُ الله ﷺ بالحَج، فأما مَنْ أَهَلَّ بالحجِ أو جَمَعَ الحجَّ والعُمْرة، لَمْ يَحِلُوا حتى كان يَوْمَ النحْرِ) رواه البخاري.[٣٩]

---

[٣٧] بڕوانە: (المجموع) ج٧ص١٤٥، وە بڕوانە: (فقه السنة) ج١ص٦٧٠.
[٣٨] بڕوانە: (فقه السنة) ج١ص٦٧١.
[٣٩] بڕوانە: (فتح الباري) ج٤ص٢٠٧.

واتە: لەساڵی حەجیماڵئاوایی‌دا لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ -بۆ حەج و عومرەکردن - چووینەدەر، جا هەمان بوو ئیحرامی بەعومرە بەستبوو، وە هەمان بوو ئیحرامی بەحەج و عومرە بەستبوو، هەشمان بوو ئیحرامی بەحەج بەستبوو، وەپێغەمبەری خوا ﷺ ئیحرامی بەحەج بەستبوو، جا ئەوانەی نیەتی حەجیان هێنا بوو یان حەج و عومرەیان کۆکردبوونەوە، ئەوە هەتا ڕۆژی قوربانی سەربڕین ئیحرامیان نەشکاند.

*ئێستاش بەرلەوەی ئەم باسە بەجێ‌بهێڵین چەند وردە ڕوونکردنەوەیەکی دیکەش بەپەسەند دەزانم:*

<u>**یەك**</u>: زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن[40] کە ئەگەر کەسێك بەموتڵەقی و بەگشتی نیەت بهێنێ‌و ئیحرام ببەستێ بێ‌ئەوەی جۆری حەجەکەی دیاری بکات، ئەوە ئیحرام بەستنەکەی دروستەو دامەزراوەو پاشانیش سەرپشك (مختار) ە داخوا کام جۆرەیان هەڵدەبژێرێ. هەروەها ئەگەر لەکاتی نیەت هێنان‌و ئیحرام بەستنەکەی‌دا گوتی: وەك فلانە کەس - کەسێکی دیاری‌کراو - حەج‌و عومرە دەکەم بێ‌ئەوەی بزانێ ئەو کەسە چ جۆرێکی هەڵبژاردوە دیسان دروستە، بەڵگەش ئەم دەقەیە:[41]

*(عن أبي موسى الأشعري رضي الله عنه قال: **قَدِمْتُ على رسول الله ﷺ وهو مُنِيخٌ بالبَطْحاءِ، فقال لي: بما أَهْلَلْتَ؟ قلت: لَبَّيك بإهلالٍ كإهلالِ رسول الله ﷺ، قال: أحْسَنْتَ، فأمَرني فطُفْتُ بالبيتِ وبالصفا والمروة ثم قال: حُلَّ**) متفق عليه. واتە: لەسەفەر گەڕامەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ کە لە بەطحاء بارگەی خستبوو پێی فەرموم: بەچی ئیحرامت بەستوە؟ گوتم: گوتوومە (لَبَّيك) بەئیحرام بەستن وەك ئیحرامی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرمووی: چاکت کردوە، ئنجا فەرمانی پێ‌کردم بەدەوری کابەدا سووڕامەوەو بەنێوان صەفاو مەڕوەدا هاتم‌و چووم، پاشان فەرمووی: ئیحرام بشکێنە.

<u>**دوو**</u>: ئەو کەسەی کە بەهۆی جۆری حەجی (تَمَتُّع)[42] وە خوێنی دەکەوێتە سەر کەسێکە کە خەڵکی دەرەوەی مەککەو سنووری حەرەم‌و دەرەوەی حەرەمیشە بەئەندازەی ماوە (مسافة) ی نوێژ تێدا کورت کردنەوە (مسافة القصر)، کە لەزاراوی شەرع دا پێی دەگوترێ! (آفاقي)، چونکە خەڵکی مەککەو دەوروبەری میقاتی ئیحرام بەستنیان بەحەج

---

[40] بڕوانە: (المغني والشرح الكبير) ج٣ص٢٥٠، ٢٥١، وە: (المجموع) ج٧ص١١٩، ١٢٠.

[41] بڕوانە: (المغني والشرح الكبير) ج٣ص٢٥١.

[42] بۆیە وشەی (تمتع) کە بەمانای ڕابواردن‌و لەززەت لێ‌وەرگرتنی شتێك دێ، بۆ ئەوجۆرە حەج کردنە بەکارهاتوە، چونکە بابای حاجی بەهۆی ئیحرام شکاندنی‌یەوە دوای عومرەکردن بۆی هەیە هەموو ئەو شتانەی کە بەهۆی ئیحرام بەستنەوە لێی قەدەغەکرابوون کەڵکیان لێ‌وەربگرێ‌و بێگومان بەسترانەوەی ئینسانیش بەئیحرام‌و پێویستی‌یەکانی‌یەوە سەغڵەتی زۆری تێدایە.

هەر ماڵەکانی خۆیانن و ئەمەش زانایان[43] لەسەری یەکدەنگن، چونکە خوای پەروەردگار فەرموویەتی: (فَمَنْ تَمَتَّعَ بِالْعُمْرَةِ إِلَى الْحَجِّ فَمَا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْيِ فَمَنْ لَمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ فِي الْحَجِّ وَسَبْعَةٍ إِذَا رَجَعْتُمْ تِلْكَ عَشَرَةٌ كَامِلَةٌ ذَلِكَ لِمَنْ لَمْ يَكُنْ أَهْلُهُ حَاضِرِي الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ) البقرة: ١٩٧، واتە:.... ئەوە – واتە ئەو قوربانیدان یان ڕۆژووگرتنە – بۆ کەسێکە کە ماڵی لەنیزیك مزگەوتی حەرامەوە نەبێ.

**سێ**: هەرکاتێك بابای (مُتَمَتِّع) پاش عومرەکردن و ئیحرام شکاندن بۆ ئیحرامی حەج گەڕایەوە بۆ میقات، ئەوە قوربانی یان برێتی (بدل)یەکەی کە ڕۆژووگرتنە، ناکەوێتە سەر، ئەمە ڕای زۆربەی زانایانەو (ابو حنيفة)ش ڕای وایە کە هەر لەسەری دەبێ.

بەڵام ڕای زۆربە ڕاست ترە چونکە بێگومان بابای (متمتع) لەبەر نەچوونەوە بۆ میقات بۆ ئیحرام بەستن کەفارەتی خوێن یان ڕۆژووی دەکەوێتە سەرو، کەچوە وە بۆ میقات پاساو (مبرر)ی ئەو کەفارەتە نامێنێ[44].

**چوار**: زانایان یەکدەنگن لەسەر ئەوە کە ئەگەر کەسێك لەمانگەکانی حەج کردن دا ئیحرامی بەعومرەوە بەست، مادام طەوافی نەکردبێ بۆی هەیە حەجیشی بخاتە گەڵ و ببێتە (قارن) بەڵام ئەگەر طەوافی کردبێ ڕایان جیاوازە، هەروەها لەو بارەشەوە ڕایان جیاوازە کە ئەگەر ئیحرامی بەحەج بەست بۆی هەیە یا دروستە عومرەشی ڕەگەڵ بخات یان نا؟![45]

**پێنج**: هەروەها زانایان پاش ئەوەی لەسەر ئەوە یەکدەنگ بوو ون کە بابای (متمتع) هەم بۆی هەیە ڕۆژی شەشەمی مانگی (ذوالحجة) ئیحرام بەحەج ببەستێ بۆئەوەی پێش چونە عەرەفات فریای ڕۆژووگرتنی سێ ڕۆژەکانی حەج بکەوێ – ئەگەر قوربانی نەبوو – ، وەبۆشی هەیە ڕۆژی هەشتەم کە (يوم التروية)[46]ی پێدەڵێن ئیحرام بەحەج ببەستێ، وە بۆشی هەیە کە لەسەرەتای مانگی (ذوالحجة)وە ئیحرام ببەستێ، لەسەر ئەوە کە کام لەم سێ حاڵەتانە چاکترە، ڕایان جیاوازە.[47]

---

[43] بڕوانە: (المغني والشرح الكبير) ج٣ص٢٤٢.

[44] بڕوانە: (المغني...) ج٣ص٢٤١، وە: (المجموع) ج٧ص١٥١.

[45] بڕوانە: (المجموع) ج٧ص١٥٦.

[46] بۆیە بەو ناوە ناونراوە چونکە لەو ڕۆژەدا حوشترەکانیان تێراوکردوون و ئاویشیان هەڵهێنجاوە، بڕوانە: (فتح الباري) ج٤ص٣١٧.

[47] بڕوانە: (المجموع) ج٧ص١٥٥.

**شەش**: زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە بابای (متمتع) مادام قوربانی (هَـدْي) پێنەبێ هەرکات کارەکانی عومرەی تەواوکردن ئیحرام دەشکێنێ و هەموو شتێکی بۆ حەڵاڵ دەبێ، بەڵام ئەگەر قوربانی پێبوو ئەوە (مالكو شافعي) بۆ ئەمیش هەر ڕای پێشوویان هەیە، بەڵام (ابوحنیفة و احمد) دەڵێن: مادام قوربانی پێبێ دروست نیە ئیحرام بشکێنێ هەتا دووبارە ئیحرام بەحەج دەبەستێتەوە، هەرکام لەو دوو ڕایانەش بەڵگەیان هەیە، بەڵام وەك (نووي) ساغی کردۆتەوە ڕای (مالك و شافعي) بەهێزترە.[48]

## ٢-مەرجەکانی حەج و عومرە:

**مەرجەکانی حەج و عومرە بەڕای تێکڕای زانایان پێنجن:**

*ا- مسوڵمان بوون (الأسلام).*

*ب-عاقڵ بوون (والعقل).*

*ج-باڵغ بوون ( و البلوغ).*

*د-ئازادبوون (والحرية).*

*هـ-بۆلوان و بۆگونجان (والأستطاعة).*

**جا ئەم پێنج مەرجەش دەبنە سێ بەش:**

**یەك**: کە مەرجی فەرزبوون و دروست (جائز) بوونن، کە (مسوڵمان بوون) و (عاقڵ بوون)ن، چونکە حەج لەسەر بابای کافرو بابای شێت نە فەرز دەبێ و نە ئەگەر ئەنجامیشی بدەن دورستە.

**دوو**: کە مەرجی فەرزبوون و بۆ وەبەرکەوتن (إجزاءٌ)ن، کە (باڵغ بوون) و (ئازاد بوون)ن، بەڵام مەرجی دروست (جائز، صحیح) بوون نین، چونکە منداڵ و کۆیلەش حەجەکەیان دروستە، بەڵام بۆیان وەبری حەجی فەرز ناکەوێ و هەرکات منداڵی نەباڵغی حەج کردوو باڵغ بوو، وە بابای کۆیلەی حەجکردوو ئازاد بوو، وە توانایان هەبوو پێویستە حەج بکەن.

**سێ**: کە مەرجی فەرزبون (وجوب)ە، ئەویش توانا هەبوون و بۆلوان )(استطاعة) ە، چونکە کەسێك کە توانای نیەو بۆی نالوێ حەج بکات، ئەگەر خۆی ماندووکردو هەرچۆن بوو حەجی کرد، ئەوە حەجەکەی دروستەو بۆیشی بەردەکەوێ و حەجی لەسەر لادەچێ، کەواتە توانا هەبوون (استطاعة) تەنیا مەرجە بۆئەوەی حەجی لەسەر فەرز بێت، بەڵام مەرجی دروست بوون و وەبەرکەوتنی نیە.

[48] بڕوانە: (المجموع) ج٧ص١٥٤.

بەڵگەی ئەم مەرجانەش چەند دەقێکی قورئان‌و سوننەتن، بۆ وێنە:

١-ئیسلامەتی: خوای پەروەردگار فەرموویەتی: (أُوْلَئِكَ لَمْ يُؤْمِنُوا فَأَحْبَطَ اللَّهُ أَعْمَالَهُمْ) الأحزاب: ١٩، واتە: ئەوانە چونکە بڕوایان نەهێناوە خوا کردەوەکانیانی پووچەڵ کردۆتەوە – و هەڵیوەشاندوونەتەوە – .

بەڵێ ئینسانی نا مسوڵمان شایستەی ئەرك پێسپێرراني نیەو هەرچی بیشیکات بێسوودەو پووچە.

٢و٣- عاقڵ بوون‌و باڵغ بوون: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (رُفِعَ القَلَمُ عن ثلاثةٍ: عن النائمِ حتى يَستَيقِظَ، وعن الصَّبِيِّ حتى يَشُبَّ، وعن المعتوهِ حتى يَعقِلَ) رواه ابوداود وابن ماجة والترمذي وقال: حديث حسنٌ، واتە: قەڵەمی گوناح نووسین لەسەر سێ جۆرە کەسان هەڵگیراوە: لەسەر نووستوو تا بێداردەبێتەوە، ولەسەر منداڵ هەتا دەبێتە گەنج – و باڵغ دەبێ – ، و لەسەر شێت هەتا عەقڵی دێتەوە سەر.

٤-ئازادبوون: ئەمیش چەندان دەق هەن لەسەر ئەوە کە بەبێ ڕێپێدانی خاوەن‌و گەورە (سید)ەکەی بۆی نیە بەملاولادا بڕوات‌و سەفەری دوور بکات.[٤٩]

٥-توانا هەبوون ( إستطاعة ): خوای پەروەردگار فەرموویەتی:

* (لَا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا) البقرة: ٢٨٦،

*(وَلِلَّهِ عَلَى النَّاسِ حِجُّ الْبَيْتِ مَنْ اسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا) آل عمران:٩٧،

جا ئەوەی کە لەم مەرجانە زاناو شەرعزانان زۆریان توێژینەوە لەسەر کردوە ئەم مەرجی پێنجەمەیە، واتە: توانا هەبوون‌و بۆلوان (إستطاعة).

جا زانایان هەرچەندە هەموویان لەسەر بەمەرج گیرانی ئەم مەرجە یەکدەنگن بەڵام لەبارەی ماهیەت‌و لق‌و پۆپەکانی‌یەوە ڕایان جیا جیایە.

بەڵام هەموویان یان بەلای کەمەوە زۆربەی هەرە زۆریان لەسەر ئەم پێنج بڕگەیە بۆ تەفسیری توانا هەبوون (إستطاعة) پێکهاتوون:

یەك: لەش ساغ بوون، جا ئەگەر لەبەر پیری یان نەخۆشی‌یەك کە ئومێدی چاکبوونەوەی نەبێ نەیتوانی، وە ماڵ‌و دارایشی هەبوو، ئەوە پێویستە یەکی دیکە لەجێی خۆی بنێرێ، وەك دواتر ئەوجۆرە حەج کردنە ڕوون دەکەینەوە.

---

[٤٩] بێگومان حەج‌و عومرەکردنیش سەفەری دوورو پارەو مەصرەفیان دەوێ‌و بەبێ ئەوانە نالوێ بکرێن، کەواتە مەرجی توانا هەبوون (استطاعة)یش ئەم هەر دەگرێتەوە.

دوو: هێمنی و سەلامەتی ڕێو بان، بەجۆرێك کە لەماڵ و گیانی خۆی دڵنیابێ، بەڵام ئەگەر دڵنیا نەبوو، ئەوە هەتا بارودۆخ دەگۆڕێ لەسەری پێویست نیە بچێ.

سێ: نەبوونی پەرچ ڕێگرێك وەك حەپس کران، یان ترس و بیم هەبوون لە دەستەڵاتدارێکی ستەمکار، یان هەر ڕێ پێنەدران بەهەرشێوەیەك بێ.

چوار: دابین کردنی بژێوو پێداویستیە بنەڕەتی یەکان (الحاجات الأصلية)ی خۆی و ئەوانەی بە ئەستۆیەوەن بۆ کاتی چوون و گەڕانەوە.

(شیرازی) لەوبارەوە گوتوویەتی:[٥٠]

(وان وَجَدَ مايشتري به الزاد والراحلَةَ وهو محتاجٍ اليه لَدَيْنٍ عليه لم يَلْزَمْهُ حالاً كان الدينُ او مؤجّلاً.. وان كان محتاجاً اليه لنفقةِ مَنْ تلزمُهُ نَفَقَتُهُ لَمْ يَلْزَمْهُ الحجّ.. وان احتاج اليه لِمَسْكَنٍ لابُدَّ لَهُ مِنْ مِثْلِهِ، او خادمٍ يحتاجُ الى خِدْمته لَمَ يَلْزَمْهُ... وان احتاجَ الى النكاحِ وهو يخافُ العَنَتَ قُدِّمَ النكاحُ..)

واتە: وە ئەگەر کەسێك کە دەیەوێ حەجێ بکات هێندەی پارەو ماڵ هەبوو کە توێشووی ڕێگاو وڵاخی سواری پێبکڕێ بەڵام بۆ دانەوەی قەرزێك پێویستی پێ ی هەبوو حەجی لەسەر نیە، جا قەرزەکە چ کاتی درانەوەی هاتبێ چ نەهاتبێ.. هەروەها ئەگەر پێویستی بەو پارەو ماڵە بوو بۆ مەسرەفی ئەوانەی کە بەئەستۆیەوەن دیسان حەجی لەسەر نیە.. دیسان ئەگەر بۆ خانوویەك کە بابای وەك وی بۆ ئەوجۆرە خانووە ئاتاج بێ، یان بۆ گرتنی خزمەتچی یەك کە پێویستی بەخزمەتکردنەکەی هەبێ پێی ئاتاج بێ، حەجی ناکەوێتە سەر، وە ئەگەر پێویستی بەژن هێنان بوو وەمەترسی گوناح و ناڕەحەتی زۆری هەبوو - بەهۆی بێژنی یەوە ئەوە دەبێ ژن هێنانەکە پێش بخرێ.

پێنج: هەبوونی هۆکاری گەیشتن (وسيلة الوصول) کە شەرعزانان بە (راحلة) ناویان بردوە وە لەم ڕۆژگارەدا کرێ (أُجرة) ی گرتنی سەییارە یان کەشتی یان فڕۆکە جێگای دەگرێتەوە، چونکە ئێستا ئەم هۆکارانە بەکاردێن بۆ گەیشتنە مەککەو شوێنی حەج لێکردن.

---

[٥٠] (شیرازی) خاوەنی (المهذب) لەفیقهی مەزەبی شافیعی دا کە (نووي) شەرح و لێکدانەوەی ناوازەی (المجموع)ی لەسەر کردوە، بڕوانە: (المجموع) ج٧ص٤٥تا٤٧. هەروەها بڕوانە: (المغني والشرح الكبير) ج٣ص١٦٩تا١٧٤، کە بەتەعبیری جیا هەمان مەبەستی (شیرازي) هێناوە، هەروەها شیعەی (إمامية)ش هەمان ڕایان هەیە، بڕوانە: (الفقه على المذاهب الخمسة) محمد جواد مغنيه. ص١٩٠،١٩١، وە ١٩٤.

پێویستە ئەوەش بگوترێ کە هەرچەندە چەند دەقێك لەپێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕراونەوە وشەی توانا هەبوون (استطاعة)یان بەتوێشوو و وڵاخ (الزاد و الراحلة) تەفسیر کردوە، بەڵام تێکڕای زانایان لەسەر ئەوەش یەکدەگن کە دەبێ ئەو توێشوو و وڵاخە لەدابین کردنی پێداویستییە بنەڕەتییەکانی خۆیو ئەوانەی بەئەستۆیەوەن هەتا دەچێو دەگەڕێتەوە، زیاد بێ، خاوەنی (المغني والشرح الكبير) لەوبارەوە نووسیویەتی:[51]

(الشرط الخامس: استطاعة وهي أن يملك زاداً وراحلةً صالحة لمثلِه بآلتها الصالحة لمثلِه او مايقدر بهِ على تحصيل ذلك، فاضلاً عَما يحتاج اليه من مَسْكَنٍ وخادمٍ وقضاء دينهِ ومؤنة عيالِه على الدَّوام) واتە: مەرجی پێنجەم: تواناهەبوون، ئەمیش ئەوەیە کە توێشوو و وڵاخێکی وای هەبێ کە بۆ کەسایەتی وەك وی بشێ، وێڕای کەلوپەلێك بۆ وڵاخەکەی کەشایستەی وی بێت، یان هێندەی ماڵ هەبێ کە بتوانێ پێی وەدەست بهێنێ، وە دەبێ لەپێداویستییەکانی زیاد بێت لەخانوو و بەرەو خزمەتچیو قەرزدانەوەو مەسرەفی ماڵو خێزانی بە بەردەوامی - تا دەگەڕێتەوە -.

ئەمەش چەند دەقێك لەوانەی کە تەفسیری (إستطاعة) بە (الزاد والراحلة) دەکەن، هەرچەندە زانایان تێبینییان لەسەر (سند) ەکانیشیان هەیە:

* (عن جابر وعبدالله بن عمر وعبدالله بن عمرو وأنس وعائشة رضي الله عنهم أجمعين أن النبي ﷺ سُئِلَ مالسَّبيل ؟ قال: الزاد والراحلة) رواه الدارقطني، واتە: پرسیار لەپێغەمبەر کرا ﷺ دەربارەی مانای وشەی[52] (سبيلاً)؟ فەرمووی: توێشوو و وڵاخە.

*(عن ابن عمر رضي الله عنهما أن رجلاً جاءَ الى النبي ﷺ فقال: يا رسول الله مايوجِبُ الحجَّ؟ قال: الزاد والراحلة) رواه الترمذي وقال: حديث حسن.

واتە: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا -هەبوونی - چ شتێك حەجێ فەرز دەکات؟ فەرمووی: توێشوو و وڵاخ.

شایانی باسیشە کە بەمەرج گیرانی هەبوونی هۆکاری گەیشتن (وسيلة الوصول) تایبەتە بەو کەسانەوە کە خەڵکی شاری مەککەو دەوروبەری نزیکی نین، ئەگەرنا بۆ ئەمان بەمەرج نەگیراوە.[53]



[51] بڕوانە: (المغني والشرح الكبير) ج٣ص١٦٩.

[52] مەبەست وشەی (سبيلاً) کە لەئایەتی (ولله على الناس حج البيت من استطاع اليه سبيلاً)دا هاتوە.

[53] بڕوانە: (المغني) ج٣ص١٧٠، ١٧١.

## حەجكردنی ئافرەت

دەربارەی حەج و عومرەكردنی ئافرەتیش جگە لەو مەرجانەی ڕابردن زۆربەی هەرە زۆری زانایان لەسەر بەمەرج گرتنیو مەرجێكی دیكەش یەكدەنگن، كە بریتیە لەوەی ئەگەر مێردی لەگەڵی نەبوو - لەسۆنگەی ئەوەوە كە مێردی نەكردبوو، یان مردبوو، یان لەگەڵی نەهاتبوو پێویستە خزمێكی مەحرەمی یان كۆمەڵە ئافرەتێكی متمانەپێكراوی لەگەڵ بن، ئەگەرنا حەجەكەی لەسەر پێویست نابێ، چونكە دروست نیە بەبێ لەگەڵ بوونی مێرد یان مەحرەمێك یان كۆمەڵە ئافرەتێكی متمانە پێكراو سەفەر بكات نە بۆ حەج و نەبۆ غەیری حەجیش، مادام سەفەرەكە دوور بێت.[٥٤]

هەندێكیش لەزانایان وەك: (داود الظاهري[٥٥] و ابن حزم[٥٦])و هەندێك[٥٧] لەشافیعیەكانو شیعەی[٥٨] (إمامیة)ش ڕایان وایە كە ئافرەت هەركات حەجی لەسەر فەرزبوو، مێردیشی نەبوو یان هەیبوو بەڵام لەگەڵی نەچوو وەكەسی مەحرەمیشی چنگ نەكەوت لەگەڵی بچێ، ئەوە نەك بۆی هەیە حەجەكەی بكات، بگرە لەسەری فەرزە بچێو ئەنجامی بدات، مادام ڕێ سەلامەت بێ.

بەڵام بەسەرنج دانی بەڵگەكانی هەردووك لایان زۆر بەڕوونی دەردەكەوێ كەڕای زۆربەو جەماوەری زانایان بەهێزترەو بەڵگەدارترە، چونكە بەڵگەكانی ئەمان دەق (نص)ن لەو بابەتەدا كە قسەی لێدەكرێ - كە سەفەركردنی ئافرەتە بەبێ مەحرەم -، بەڵام بەڵگەكانی ئەوانی دیكە دەقی گشتی (نصوص عامة)نو تایبەت نین بەو بابەت (موضوع) ەوە، ئنجا وەك زانایانی (أصول الفقه)یش بڕیویانەتەوەو بڕیاریان داوە، هەركاتێك بابەتو مەسەلەیەك دووجۆرە دەقی گشتیو تایبەتی لەسەر هەبوون، ئەوە پێویستە دەقە تایبەتیەكان پێش بخرێنو چەمكو واتای دەقە گشتیەكانیان پێتایبەت (تخصیص) بكرێ[٥٩].

---

[٥٤] بڕوانە: (المجموع) ج٨ص٢٤٣، ٢٤٤، وە: (المغني) ج٣ص١٩٠تا١٩٥، وە: (فتح الباري) ج٤ص٥٥٢تا٥٦٠.

[٥٥] بڕوانە: (المجموع) ج٨ص٢٤٣.

[٥٦] بڕوانە: (المحلى) ج٧ص١٤تا١٧، مسالة: ٨١٣.

[٥٧] بڕوانە: (المجموع) ج٨ص٢٤٢.

[٥٨] بڕوانە: (الفقه على المذاهب الخمسة) ص١٩٣، ١٩٤.

[٥٩] بڕوانە: (المفصل) ج٢ص١٦٧تا١٧٢، كە زۆر جوان ڕای جەماوەری سەرخستوە.

ئەمەش چەند دەقێك كە زۆربەو جەماوەری زانایان كردوویاننە بەڵگەی ڕایەكەیان:

*(عن ابن عباس رضي الله عنهما قال: قال النبي ﷺ: لاتُسافِرُ المرأة إلاَّ مع ذي مَحْرَمٍ ولايَدْخِلُ رجُلٌ إلاَّ ومعها مَحْرَمٌ، فقال رجُلٌ، يا رسول الله إني أُريدُ أن أخْرُجَ في جَيْشِ كـذا وكـذا، وأمرأتي تُرِيْدُ الحجَّ، فقال: أُخْرُجْ مَعَها) متفق عليه.

واتە: ئافرەت لەگەڵ مەحرەمیدا نەبێ سەفەر ناكات، وە هیچ پیاوێك لـێی وەژوور ناكەوێ، مەگەر مەحرەمێكی لەلابێت، پیاوێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا من دەمەوێ لەگەڵ سوپایەكی ئاواو ئاوادا دەربچم – بۆ غەزا – ژنەكەشم دەیەوێ حەجێ بكات! فەرمووی: لەگەڵی بچۆ – بۆ حەج –.

* (لاتُسافِرُ إمرأةٌ مَسيرة يومين لَيْس معها زَوْجُها أوذُو مَحْرمٍ) رواه البخاري ومسلم عن ابي سعيد الخدري مرفوعاً.

واتە: نابێ هیچ ئافرەتێك دوو ڕۆژە ڕێ بەسەفەر بچێ، مادام مێردی یان خزمێكی مەحرەمی لەگەڵ نەبێ.

*(عن أبي هريرة عن النبي ﷺ قال: لايَحِلُّ لأمرأةٍ تُؤمِنُ بالله واليوم الآخر أنْ تُسافِر مسيرة يوم وليلة ليس معها حُرْمةٌ) متفق عليه، واتە: هەر ئافرەتێك بڕوای بەخواو بەڕۆژی دوایی هەبێ بۆی نیە بۆ ماوەی شەوو ڕۆژێك بەسەفەربچێ مادام خزمێكی مەحرەمی لەگەڵ نەبێت.

ئەو فەرموودانەی ڕابردن بەڵگەی ئەوە بوون كەئافرەت بـۆی نیـە بـەبێ مـێردی یـان خزمێكی مەحرەمی سەفەر بكات، بەڵگەی ئەوەش كە ئەگەر مێردو مەحرەم[٦٠] نەبوون، بەڵام كۆمەڵە ئافرەتێكی متمانەپێكراو هەبوون لەگەڵی بچن بۆی هەیەو لەسەری فەرزە كەحەجی فەرز بكات ئەم دەقەیە:[٦١]

(أذِنَ عُمَرُ رضي الله عنه لأزْواج النبي ﷺ في آخِرِ حَجَّةٍ حَجَّهَا ، فَبَعثَ مَعَهُنَّ عثمان بن عفـان و عبدالرحمن بن عوفٍ) رواه البخاري عن ابراهيم عن ابيه عن جده.

واتە: عومەر خوا لێی ڕازیبێ لەدوایین حەجیدا كە كردی مۆڵەتیدا كە هاوسەرەكانی پێغەمبەر ﷺ –خوا لێیان ڕازی بێ – حەجێ بكەن، جا (عثمان بن عفان) و (عبدالرحمن بن عوف) ی لەگەڵ ناردن – خوا لێیان ڕازیبێ –.

---

[٦٠] (الحافظ ابن حجر) لەپێناسەی مَحْرَمْ دا گوتوویەتی: (وضابِطُ المَحْرَم عند العلماء من حَرُمَ عليه نكاحُها على التأبيد بسبب مباح لحرمتها) (فتح الباري) ج٤ص٥٥٨، واتە: وە پێناسەی مەحرەم لەلای زانایان هەركەسێكە كە بەهەمیشەیی نیكاحی ئەو ئافرەتەی لێحەرام بێ دیارە ئەو كەسانەش كە بەهەمیشەیی لەئافرەت حەرامن، یان بەهۆی نەسەبەوەیە وەك بابی، یان بەهۆی شیر خواردن (رضاع) وەیە، وەك برای شیری، یـان بـەهۆی ژن و ژن خوازییەوەیە وەك بابی مێردی‌و كوڕی مێردی، بڕوانە: (المغني) ج٣ص١٩٢.

[٦١] بڕوانە: (فتح الباري) ج٤ص٥٥٢.

هەروەها (ابن سعد)یش لە(طبقات)دا هەمان مەبەستی لە (أمّ معبد الخزاعیة) گێڕاوەتەوە بە (سند)ێکی ڕاست[62].

دیارە مەبەستیش لەنێررانی (عثمان وعبدالرحمن) خوا لێیان ڕازی بێ، خۆیان و ئافرەتەکانیانە، چونکە خۆیان مەحرەم نەبوو ون و، لەگەڵ بوونی ئافرەتەکانیان چ ژن چ کچ.. هتد قەرەبووی ئەو بێ‌مەحرەمییەیان کردۆتەوە.

ئنجا ئەو مەسەلەیەش کە عومەری خەلیفەی سەر ڕاست خوالێی ڕازی بێ بەئاگاداری سەرجەم هاوەڵان پێی هەستاوە، بەیەکدەنگی (إجماع) دادەنرێ، وەك زانایان گوتوویانە.[63]

لەکۆتایی باسی حەجی ئافرەت دا پێویستە ئاماژەش بەوە بکەین کەتێکڕای زانایان مەگەر[64] - بەدەگمەن - لەسەرئەوە کۆکن کە ئافرەت بۆ حەجی فەرز لەسەری پێویست نیە مۆڵەت لەمێردی وەربگرێ، بەڵکو سوننەتە پرسی پێ بکات، وە مێردیشی بۆی نیە کە ژنەکەی لەسەفەری حەجی فەرز بگێڕێتەوە، بەڵام بۆ سەفەری حەجی سوننەت و بۆ عومرە هەم ژن پرس کردن و مۆڵەت وەرگرتنی لەسەر فەرزە، هەم مێردیشی بۆی هەیە نەهێڵێ بچێ.[65]

هەروەها زۆربەی[66] زانایان دەڵێن لە (عِدَّة) دا نەبوونی ئافرەت، جا چ (عِدَّة)ی جیابوونەوە (طلاق) بێت چی هی (مێرد مردن) مەرجێکی دیکەی حەج لەسەر فەرز بوونیەتی، چونکە خوای کاربەجێ فەرموویەتی: (وَأَحْصُوا الْعِدَّةَ وَاتَّقُوا اللَّهَ رَبَّكُمْ لَا تُخْرِجُوهُنَّ مِنْ بُيُوتِهِنَّ وَلَا يَخْرُجْنَ) الطلاق:١، واتە: وە عیددە بژمێرن و پارێز لەپەروەردگارتان بکەن ئەو ئافرەتانە لە ژوورەکانیان وە دەرمەنێن و باخۆشیان نەچنە دەرێ - تاعیددەیان بەسەردەچێ -.



---

[62] هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص٥٥٤.

[63] بڕوانە: (المفصل في احكام المراة والأسرة) ج٢ص١٧١، وە بڕوانە: (فتح الباري) ج٤ص٥٥٧.

[64] بڕوانە: (المجموع) ج٨ص٢٣٩، ٢٤٠، بەڵام ڕای دیکەشیان هەیە وەك ڕای زۆربەی زانایان.

[65] بڕوانە: (المغني) ج٣ص١٩٤، کە گوتوویەتی: (وليس للرجل منع امراته من حجة الإسلام وبهذا قال: النخعي واسحاق وابوثور واصحاب الراي وهو الصحيح من قولي الشافعي وله قول آخر: لَهُ منعها).

[66] بڕوانە: (المفصّل) ج٢ص١٨٠، ١٨١، وە: (المجموع) ج٨ص٢٤٠، ٢٤١.

# بەندی سێیەم

# میقاتە کاتی و شوێنی یەکانی حەج و عومرە

**خوێنەری بەڕێز!**

بۆ ئیحرام بەستن بەهەرکام لەحەج و عومرە چەند کات و شوێنێك بە مەرج گیراون کە لەدوو خاڵ دا باسیان دەکەین:

## ١-کاتەکانی ئیحرام بەستن بەحەج و عومرە:

خوای پەروەردگار فەرموویەتی: (يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْأَهِلَّةِ قُلْ هِيَ مَوَاقِيتُ لِلنَّاسِ وَالْحَجِّ) البقرة: ١٨٩، واتە: دەربارەی مانگەکان لێت دەپرسن؟ بڵێ: ئەوانە -مایەی - کاتی دیاریکراون بۆ -کاروباری - خەڵك و بۆ حەج.

هەروەها فەرموویەتی: (الْحَجُّ أَشْهُرٌ مَعْلُومَاتٌ) البقرة:١٩٧، واتە: کاتی حەج تێدا کردن چەند مانگێکی زانراون.

زۆربەی هەرەزۆری زانایان رایان وایە کە مانگەکانی حەج تێداکردن (شوال) و (ذوالقعدة) و دە (١٠) ڕۆژی سەرەتای (ذوالحجة)ن، کە هەرکام لە (ابوحنیفة و شافعي واحمد و نخعي وثوري وابوثور وداود)یان لەنێودا هەن، ئەوەندە هەیە (شافعي و نخعي وثوري و ابوثور و ابویوسف و داود) رایان وایە کە ڕۆژی دەیەم کە ڕۆژی قوربانی سەربڕین (یوم النحر) و جەژنە - کاتی حەج نیە بەس شەوەکەی هەوە، بەڵام ئەوانی دیکە دەڵێن: هەم ڕۆژەکەی و هەم شەوەکەشی کاتی حەجە.

(مالك)یش رای وایە کە وێڕای: (شوال) و (ذوالقعدة) سەرجەم مانگی (ذوالحجة) ش کاتی حەج تێداکردنە.[٦٧]

ئنجا زانایان پاش ئەوەی لەسەر ئەوە یەکدەنگ بوو ون کە دروست نیە هیچ کام لەکردەوەکانی حەج (اعمال الحج) لەغەیری مانگەکانی حەج دا بکرێن[٦٨]، لەسەر ئەوە کە ئایا دروستە لەپێش مانگەکانی حەج دا ئیحرام بەحەج ببەسترێ یان نا؟ رایان جیاوازە، هەرچی (ابوحنیفة و نخعي وثوري و مالك واحمد)ن دەڵێن: دروستە بەڵام پەسند نیە، بەڵام (شافعي و ابوثور) دەڵێن: ئەگەر ئیحرامی بەحەج بەست دانامەزرێ بەڵکو بە (عومرە)

---

[٦٧] بڕوانە: (المجموع) ج٧ص١١٢، وە: (الفقه الأسلامي)ج٣ص٢١٢١تا٢١٢٣.

[٦٨] بڕوانە: (المجوع) ج٧ص١١٠، وە: (الفقه الأسلامي) ج٣ص٢١٢١تا٢١٢٣.

بۆی حیساب دەکرێو دەتوانێ بەو ئیحرامەی عومرە بکات بەڵام حەج نا، (داود)یش رای وایە کەئیحرامەکەی هەر دانامەزرێ نە بەحەج نە بەعومرە.

واش پێدەچێ رای ئەوانە بەهێزتر بێت کە دەڵێن لەغەیری مانگەکانی حەج دا ئیحرام بەحەج دانامەزرێ چونکە (بخاري)[69] لە (ابن عباس)ەوە هێناویەتی کە گوتوویەتی: (مِنَ السُّنَّةِ أن لايُحرِم بالحج إلاّ في أشهر الحج) هەروەها لە (ابن عمر)ەوە هێناویەتی کە گوتوویەتی: (أشهر الحج شوال وذوالقعدة وعشر من ذي الحجة).

ئەوەی رابرد دەربارەی کاتەکانی ئیحرام بەستن بوو بەحەج.

بەڵام بۆ عومرە ئەوە زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە هەموو مانگەکانی ساڵ کاتن بۆ عومرە تێداکردن بەبێ جیاوازی.[70]

## ٢-شوێنەکانی ئیحرام تێدا بەستن بەحەجو عومرە:

زانایان لەسەر ئەم پێنج شوێنە کە (میقات)[71]ی ئیحرام تێدا بەستنی بابای (حاج) و(معتمر)ن لەهەر پێنج لای کابە (بیت الحرام)ەوە یەکدەنگن:

یەك: میقاتی خەڵکی مەدینە کە (ذو الحُلَیْفة) یان (آبار علي)یشی پێدەڵێنو شەش میل لەمەدینەوە دوورەو چوار سەدو شەت (٤٦٠) کلم لەمەککەوە دوورە، وە دوورترین (میقات)ە لەمەککەوە.

دوو: میقاتی خەڵکی شامو میصرو مەغریب کە (جُحْفَة)یە و (رابغ)یشی پێدەڵێن وە دووسەدو چوار (٢٠٤) کلم لەمەککەوە دوورە.

سێ: میقاتی خەڵکی عێراقو غەیری ئەویش لەولاتانی رۆژهەڵاتی مەککە کە (ذات عرق)ە وە سەدو نەوەدو چوار (١٩٤) کلم لەمەککەوە دوورە.

چوار: میقاتی خەڵکی نەجدو کوەیتو ئیماراتو طائیف کە (قَرْن المنازل)ەو (قرن الثعالب)یشی پێدەڵێنو لەنیزیك شوێنێکە کەئێستا (سیل)ی پێدەڵێنو، نەوەدو چوار (٩٤) کلم لە مەککەوە دوورە.

پێنج: میقاتی خەڵکی یەمەنو تیهامەو هیند کە (یَلَمْلَمْ)ی پێدەڵێن.[72]

---

[69] بڕوانە: (فتح الباري) ج٤ص٢٠٤، وە: (فقه السنة) ج١ص٦٦١، ٦٦٢.

[70] بڕوانە: (المجموع) ج٧ص١١٣تا١١٦.

[71] وشەی (میقات) لەئەسڵی زمان دا بەمانای سنووری شتێك (حَدُّ شيء) دەگوترێو لەزاراوی شەرعیش دا یانی کات یان شوێن (وَقْت لو مَوْضِع)ێکی دیاریکراو بۆ خواپەرستییەکی تایبەت. بڕوانە:: (الفقه الأسلامي) ج٣ص٢١٢٥.

[72] بڕوانە: (المجوع) ج٧ص١٧٦تا١٧٢، وە: (فقه السنة) ج١ص٦٦٢، ٦٦٣.

شایانی باسیشه هەرکەسێك لەڕێیەکەوە بڕوات – چ وشکانی چ دەریایی چ هەوایی – کە بکەوێتە نێوان دوو میقاتەوە ئەوە پێویستە هەرکاتێك گەیشتە ئاقار (ئاست) یەکێك لەمیقاتەکان ئیحرام ببەستێ، بەڵام پێویستە بۆ دووربینی (إحتیاط) بەرلەوەی بگاتە ئاستی ئیحرام ببەستێ، چونکە بەر لە گەیشتن بەمیقات ئیحرام بەستن دروستە، بەڵام کەتێپەڕبوو تازە ئیحرام بەستنەکەی دروست نابێ و ئەگەر نەگەڕێتەوە بۆ میقات خوێنی دەکەوێتە سەر.

دیارە گەیشتنە ئاست هەرکام لەمیقاتەکانیش لەڕێی هەواییەوە هەمان حوکمی حاڵەتی پێشووی هەیە.[73]

وە زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە ئەو میقاتانەی باس کران بۆ هەموو ئەو کەسانەیە کە لەو شوێنانەوە دێن کەناویان هێنراوە، یا خەڵکی خودی ئەو شوێنانەش نەبن وەك لەو فەرمایشتانەدا دەردەکەوێ کە لەوبارەوە هاتوون.[74]

هەروەها زانایان لەسەر ئەوەش ڕێك کەوتوون، کەئیحرام بەستن بەحەج و عومرە لەو شوێنانەدا کە بە (المواقیت المکانیة) ناو دەبرێن بۆ کەسانێکە کە بە (آفاقي) ناسراون و خەڵکی دەرەوەی مەککەو دەرەوەی سنووری میقاتەکانن[75]، ئەگەرنا خەڵکی شاری مەککەو خەڵکی نێوان میقاتەکان و شاری مەککە هەر لەماڵەکانی خۆیانەوە ئیحرام بەحەج دەبەستن، بەڵام بۆ ئیحرامی عومرە پێویستە بچنە دەرەوەی سنووری حەرەم، جا زانایان دەربارەی چاکترین شوێن (میقات) بۆ ئیحرام تێدا بەستن بۆ عومرە ڕایان جیاوازە:

هەرچی حەنەفییەکان و حەنبەلییەکانن دەڵێن (تَنْعیم) باشترین شوێنە، چونکە (بخاري ومسلم) گێڕاویانەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی بە (عبدالرحمن بن ابي بکر) خوا لێیان ڕازیبێ کە عومرە بە (عائشة) بکات لە (تنعیم)، چونکە نیزیکترین شوێنی دەرەوەی حەرەمە لەمەککەوە، پاشان (جِعرانة) ئەوجار (حُدیبیة) لەهەموو شوێنەکان باشترن[76].

بەڵام شافیعییەکان ڕایان وایە کە چاکترین شوێن (جعرانة)یە چونکە وەك (بخاري ومسلم) گێڕاویانەتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ لەوێدا ئیحرامی بە عومرە بەستوە، پاشان (تَنْعیم) چونکە فەرمانی بە (عائشة) کردوە کە لەوێ ئیحرام بەعومرە ببەستێ، پاشان (حُدَیبیة) لەهەموو شوێنەکانی دیکە چاکترە.[77]

---

[73] بڕوانە: (الفقه الأسلامي) ج٣ص٢١٢٩، ٢١٣٠.

[74] بڕوانە: (المجموع) ج٧ص١٧٢.

[75] بڕوانە: (فتح الباري) ج٤ص١٦٠تا١٦٤، وە: (المجموع) ج٧ص١٧١تا١٧٣.

[76] بڕوانە: (المجموع) ج٧ص١٧٩تا١٨١، وە: (الفقه الأسلامي) ج٣ص٢١٢٦، ٢١٢٧.

[77] بڕوانە:سەرچاوەی پێشوو هەمان بەرگ و لاپەڕە، وە: (فقه السنة) ج١ص٦٦٢.

ئێستاش باچەند فەرموودەیەك دەربارەی میقاتەكانی حەج و عومرە بێنینەوە:

*(عن ابن عباس رضي الله عنهما أن النبي ﷺ وقَّتَ لأهلِ المدينة ذا الحُلَيْفَة، ولأهل الشام الجُحْفَة، ولأهل نجدٍ قرن المنازل، ولأهل االيمن يَلَمْلَم، وقال: هُنَّ لَهُنَّ ولكل من أتى عليهنَّ من غيرهنَّ ممَّنْ أراد الحج والعمرة ومَنْ كان دون ذلك فَمِنْ حيث أنشا حتى أَهْلُ مَكَّةَ مـن مكة، (وفي رواية لهما) : فَمَنْ كان دُونَهُنَّ فَمهلُه من أَهْلَه) رواه البخاري ومسلم.

واتە: پێغەمبەر ﷺ (ذالحليفة)ی كردە میقاتی خەڵكی مەدینەو، (جُحفة) بۆ خەڵكی شامو، (قرن المنازل) بۆ خەڵكی نەجدو، (يَلَمْلَمْ) بۆ خەڵكی یەمەن، وەفەرمووی: ئەمانە میقاتی خەڵكی ئەو شوێنانەو هەركەسێكی دیكەشە كە بەمەبەستی حەج و عومرەكردن پێیان دا دێ، كەسێكیش كە لەملاوەیە - واتە كە لەمیقاتەكان لەمەككەوە نیزیكترە - ئەوە میقاتەكەی شوێنی خۆیەتی، تەنانەت خەڵكی مەككە لەمەككە - ئیحرام دەبەستن - ، (لەڕیوایەتێكی دیكەیان دا) : وە هەركەسێك لەو میقاتانە بەرەو لای مەككە نیزیكتربوو ئەوە ماڵەكەی شوێنی ئیحرام بەستنیەتی.

*(عن عائشة رضي الله عنهما أن النبي ﷺ وقت لأهل العراق ذات عِرْقٍ)

واتە: پێغەمبەر ﷺ (ذات عِرْق)ی بەمیقاتی خەڵكی عێراق داناوە.

* (عن أبي الزبير أنه سَمْعَ جابراً يُسالُ عن المُهَلِّ فقال: سَمْعتُ أَحْسَبُهُ رُفِعَ الى النبي ﷺ قال: ومُهَلُّ أهل العراق مِن ذات عِرْقٍ) رواه مسلم.

*(عن عطاء عن النبي ﷺ أنه وقَّت لأهلِ المَشْرقِ ذات عرقٍ) رواه الشافعي والبيهقي باسناد حسن مُرْسلاً.

واتە: پێغەمبەر ﷺ (ذات عرق) ی كردوە بەمیقاتی خەڵكی ڕۆژهەڵات.

وەك پێشتریش گوتمان ئەم پێنج میقاتانە زانایان لەسەریان یەكدەنگن، وەك (نووي) لە (ابن المنذر) دوە هێناویەتی.[78]



[78] بڕوانە: (المجموع) ج٧ص١٧١، وە: (الفقه الأسلامي) ج٣ص٢١٢٥تا٢١٣٤.

## بەندی چوارەم

## پایەو فەڕزو سوننەتەکانی حەج وعومڕە

خوێنەری خۆشەویست! ئەم بەندی چوارەمە بۆ توێژینەوەی کردەوەکانی حەج و عومڕە (أعمال الحج والعمرة) تەرخان کراوە، کە هەرکامێکیان لەخاڵێکی سەربەخۆدا دەتوێژینەوە؛ بەڵام بە پەسەندی دەزانم بەرلەوەی باسی هەرکام لەپایەو فەڕزو سوننەتەکانی حەج و عومڕە بکەین، سەرەتا بۆ بەرچاوڕوونی کردەوەکانی هەرکام لەحەج و عومڕە بەڕیز بنووسین جا هەر جۆرێك بن - واتە چ پایە بن چ فەڕز چ سوننەت -

### أ-کردەوەکانی حەج:

١-ئیحرام بەستن: کە بریتیە لەنیەت هێنان بەئەنجام دانی حەج یان عومڕە یان هەردووکیان.

٢-چوونە نێو شاری مەککە لەلای سەروویەوە پاشان مزگەوتی حەرام و دوایی طەوافی چوونە مەککە (طواف القدوم).

٣-شەو مانەوە (المبيت) لە مینا کە شەوی نۆیەمی (ذوالحجة)یە.

٤-ڕاوەستان لە عەرەفات (الوقوف بعرفات) کە لە ڕۆژی نۆیەم دایە.

٥-شەومانەوە لەموزدەلیفە (المبيت بِمُزْدَلِفَةَ).

٦-بەرد تێفڕێدانی سێ جەمرەکان (رمي الجمرات الثلاث) کە لەڕۆژی دەیەمی (ذوالحجة) وە دەخایەنێ هەتا سێزدەیەمی و ژمارەیان حەفتا (٧٠) بەردۆچکەیە.

٧-قوربانی سەربڕین پاش بەرد تێفڕێدانی جەمرەی عەقەبە، کەپێشی دەگوترێ، جەمرەی گەورە (الجمرة الكبرىٰ)، لەڕۆژی دەیەمی (ذوالحجة)دا.

٨-سەری خۆتاشین یان کورت کردنەوەی پاش سەربڕینی قوربانی،هەر لەڕۆژی دەیەم دا.

٩-طەوافی دەوری کابە (الطواف حول الكعبة)، کە بەطەوافی پایە (طواف الركن) یان (طواف الأفاضة) ناودەبرێ.

١٠- هاتن و چوون (سعي) نێوان صەفاو مەروە.

١١-طەوافی خوا حافیزی (طواف الوداع).

### ب-کردەوەکانی عومڕە:

١-ئیحرام بەستن. ٢-طەواف کردن. ٣-هاتن و چوون لەنێوان صەفاو مەروەدا.

٤-سەری خۆتاشین یان کورت کردنەوە.

ئاشکراشە کە هەرکام لەم کردەوانە ڕوونکردنەوەی زۆریان دەوێ، کە دواتر باسیان دەکەین، بەڵام ڕیز (ترتيب)ی جێبەجێکردنیان بەوجۆرەیە کە نووسیومانن.

## یەکەم: پایەو فەرزو سوننەتەکانی حەج:

**خوێنەری بەڕێز!**

زانایان دەربارەی زۆر لەکردەوەکانی حەج لەڕووی پایەبوون یان فەرزبوونیان، وە فەرز یان سوننەت بوونیانەوە ڕاجیایی (اختلاف)ی زۆریان هەیە، جا ئێمە خوا یاربێ بەپێی ئەو ڕایانە کە زۆربەی زانایان لەسەریان پێکهاتوون یان پێمان وایە بەڵگەکانیان بەهێزترن ئەوە لەخوارەوە لەسێ خاڵدا هەرکام لەپایەو فەرزو سوننەتەکانی حەج دەنووسین و وەك عادەتی خۆشمان ئاماژە بەبیروڕایەکانی دیکەی زانایانیش دەکەین:

### یەك: پایەکانی حەج:

**١-ئیحرام بەستن:**

کە بریتیە لەنیەت هێنان بەئەنجام دانی حەج بەڕای زۆربەی هەرەزۆری زانایان پایەیەو حەنەفی‌یەکانیش بەمەرج (شرط) ی دادەنێن، جیاوازی نێوان ڕای زۆربەو جەماوەری زانایان و حەنەفی‌یەکانیش هەر ئەوەیە کە ئەمان ئیحرام لەدەرەوەی حەج دادەنێن، بەڵام زۆربەو جەماوەری زانایان دەڵێن لەنێو حەج دایە، ئەگەرنا وەك چۆن هیچ خواپەرستی‌یەك بەبێ هەموو پایە (رکن) ەکانی دانامەزرێ، بەبێ مەرجاکانیشی بەهەمان شێوە دروست نابێ و بەرناکەوێ.[79]

جا هەرچەندە ئێمە دواتر باسی فەرزو سوننەتەکانی ئیحرام بەستن دەکەین و چۆنیەتی‌یەکەی ڕوون دەکەینەوە، بەڵام پێویستە لێرەدا ئەوە هەربگوترێ کە تێکڕای زانایان ڕایان وایە کەبەلای کەمەوە سوننەتە لەکاتی ئیحرام بەستن و نیەت هێنانی حەج دا - بەپێچەوانەی نیەت هێنانی هەموو خواپەرستی‌یەکانی دیکەوە - دەنگ بەنیەتەکە بەرزبکرێتەوەو، دەنگیش بە (تَلْبية) بەرزبکرێتەوەو، بەشێکیشیان دەنگ بەرزکردنەوە بە ئیحرام بەستن و نیەت هێنان بەفەرز دەزانن، جا هەندێکیان کە مالیکی‌یەکانن دەڵێن: هەرچەندە فەرزە بەڵام ئیحرام و نیەتەکە ئەگەر بەبێ کردەوەو قسەیەکی پەیوەست بەحەجەوەبوو، ئەوە دادەمەزرێ بەڵام دەبێ قوربانی‌یەك سەربڕێ، حەنەفی‌یەکانیش پێیان وایە کە ئەوجۆرە ئیحرام و نیەتە هەر دروست نیەو دانەمەزراوە.[80]

---

[79] بڕوانە: (الفقه الأسلامي وادلته) ج٣ص٢١٨٠تا ٢١٨٣.

[80] هەمان سەرچاوەو بەرگ و لاپەڕە، وە: (المفصل) ٣٧٤، ٣٧٥.

چۆنیەتی ئیحرام و نیەتەکەش ئەوەیە کە بەدەنگی بەرز بڵێ: (لَبَّيْك اللهم بِحَجَّةٍ) یان (لَبَيْك اللهم بِحَجَّةٍ وعُمْرَةٍ) یان (نويتُ الحجَّ لله تعالى) یان هەر شێوەیەکی دیکە کەهەمان مەبەست بگەیەنێ، دیارە مەرجیش نیە بەزمانی عارەبی بێت و بەهەر زمانێك بێت هەر دروست و ڕەوایە، چونکە ئەسڵ ئەوەیە کەلەدڵ دایە.[81]

ئەمەش چەند دەقێك لەبارەی ئیحرام بەستن و نیەت هێنان و (تلبية) کردنەوە:

*(عن عمر رضي الله عنه قال سمعت رسول الله ﷺ يقول: إنما الأعمالُ بالنياتِ وانما لكل امرئ ما نوى) متفق عليه، (ئاشکراشە کە مەبەست لە (الأعمال) کردەوە پەسەندو باشەکانن بەتایبەت خواپەرستییەکان).

* (عن أنس رضي الله عنه قال: سَمعتُ رسول الله ﷺ يقول: لَبَّيك بحَجَّةٍ و عُمْرةٍ) رواه مسلم. (دیارە بیستنی (انس)یش بەڵگەیە لەسەر دەنگ پێبەرزکردنەوەی پێغەمبەر ﷺ).

* (عن سالم بن عبدالله بن عمر رضي الله عنهم عن أبيه قال: سمعتُ رسول الله ﷺ يُهِلُّ مُلَبِّداً)[82] رواه البخاري، واتە: گوێم لەپێغەمبەری خوا ﷺ بوو کە لەکاتێك دا قژی سەری کۆکردبۆوە سەریەك دەنگی بەنیەت و ئیحرام بەرز کردەوە.

*(عن سالم بن عبدالله عن أبيه رضي الله عنهما أنه سمعه يقول: ((ما أهَلَّ رسول الله ﷺ الاّ من عِنْدِ المسْجِد)) يعني: مسجد ذي الحُلَيْفَةَ).

دیارە میقاتی خەڵکی مەدینە (ذوالحلفية)یەو پێغەمبەریش ﷺ لە مەدینەوە هاتوە بۆ حەج بۆیە لەوێوە ئیحرامی بەستوەو نیەتی هێناوە.

ئەمانە دەربارەی نیەت هێنانەوە، دەربارەی چۆنیەتی (تلبية)[83] ش:

(عن نافع عن عبدالله بن عمر رضي الله عنهما أن تلبية رسول الله: لَبَّيْكَ اللهم لَبيك لبيك لاشريك لك لبيك، إن الحمدَ والنعمةَ لك والملك، لا شريك لك) رواه البخاري، واتە: (تلبية)ی پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوابوو: ئەی خوایە بەدەم فەرمانتەوە هاتم و لەخزمەت دام، لەخزمەت دام هیچ هاوبەشت نین لەخزمەت دام، بێگومان ستایش و چاکەو موڵك هەر هی تۆیەو بەس، هیچ هاوبەشت نین.

---

[81] سەرچاوەکانی پێشوو، وە، (فتح الباري) ج٤ص١٦١، وە ص (١٨٠).

[82] وشەی (مُلبداً) بۆیە وا وەرگێراوە چونکە چەمك و واتاکەی وایەو (لباد)ی کوردیش دیارە هەر لەوەوە هاتوە کە خورییەکە دەشێلرێتە سەریەك و پێکەوە دەچەسپێ.

[83] وشەی (تلبية) جگە لە (إستجابة) بەدەنگەوەهاتن و لەخزمەت دا بوون بەچەند واتایەکی دیکەش تەفسیرکراوە، بەڵام وەك خاوەنی: (فتح الباري) ج٤ص١٩١، گوتوویەتی: بێ‌هێزن.

* واپێدەچێ حیکمەت و هۆی بەشێوەی کۆ (جمع) باس کرانی ئەو شتانە ئەوەبێ کەهەموو جۆرەکانیان بگرێتەوە.

هەڵبەتە بەر لەنیەت هێنانو ئیحرام بەستنو دەست بە (تلبیة) کردن پێویستە بابای ئیحرام بەستوو (مُحْرِمْ) هەرچی جلوبەرگو پۆشاکی ڕواڵەتیو ژێرەوەی هەیە تەنانەت کڵاوو پێڵاوو گۆرەویش داینابنو خۆی تەنیا بەدوو پارچە قوماش - کەباشتروایە سپی بن - پۆشتەکردبێ، ئەمەش زانایان لەسەری یەکدەنگن، چونکە چەندان دەقی ڕاستو ڕاشکاوی سوننەتی لەسەرن بۆ وێنە ئەم دەقە:

(عن أبن عمر رضي الله عنهما أنَّ رَجُلاً قال يا رسول الله مايلبَسُ المُحْرِمُ من الثّيابِ؟ قال رسول الله ﷺ: لايَلْبِسَ القُمُصَ ولاالعَمائمَ ولا السراويلاتِ ولا البرانسَ ولا الخِفافَ، الا أَحَدٌ لايَجِدُ نَعْلَيْنِ فَلْيَلْبَسْ خُفَّيْنِ لْيَقْطَعْهُما أسفَلَ من الكَعْبَيْنِ، ولاتَلْبَسوا من الثيابِ شيئاً مَسَّهُ الزَّعْفرانُ والوَرْسُ) رواه البخاري، واتە: پیاوێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا بابای ئیحرام گرتوو چ جۆرە جلوبەرگێك دەپۆشێ؟ پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: نابێ نەکراسان دەبەر بکات نەمێزەران لەسەر بکات نەشەڕواڵان دەبێ بکات نەکڵاوان[84] لەسەرنێ نەخوففو[85] پێڵاوان دەپێ بکاتو، مەگەر کەسێك نەعلی نەبێ ئەوە بادو خوفف - پێڵاو - ان دەپێ بکاتو لەخوار گوێزینگانەوە (قولاپە) بیانبڕێ، هەروەها هیچ بەرگێك -مەبەست قوماشە- دەبەرمەکەن کە زەعفەران[86] یان وەرسی[87] پێکەوتبێ.

(نووي) گوتوویەتی[88] - وەك (ابن حجر العسقلاني) لێیەوە نەقڵ کردوە - کە زانایان گوتوویانە: هەرچەندە پێغەمبەر ﷺ لەبارەی ئەوجۆرە بەرگانەوە پرسیاری لێکراوە کەدروستە لەکاتی ئیحرام دا بپۆشرێن، بەڵام ئەو جۆرانەی دیاریکردوون کە درووست نیە بابای ئیحرام گرتوو بەکاریان بێنێ، جا بێگومان ئەوەش وەڵامێکی حەکیمانەیە چونکە ئەوجۆرە بەرگو پۆشاکانەی دروست نیە دەربەر بکرێن دیاریکراو (محصور) ن، بەڵام ئەوانەی دروست نیە بپۆشرێن سەرژمێر ناکرێنو دیارینەکراو (غیر محصور) ن!

بەڵێ ڕاستە چونکە پێغەمبەری لێزان ﷺ لەم فەرموودەیەیدا ڕوونی کردۆتەوە کە:

ا- دروست نیە بابای ئیحرام گرتوو هیچ شتێك لەسەرنێو سەری بەهیچ شتێك دابپۆشێ بۆیە هەم باسی مێزەر (عمامة)ی کردوە هەم باسی کڵاو (بُرنُس).

---

* واپێدەچێ حیکمەتو هۆی بەشێوەی کۆ (جمع) باس کرانی ئەو شتانە ئەوەبێ کەهەموو جۆرەکانیان بگرێتەوە.

[84] (برانس) کۆی (برنس) ە کە هەم جۆرەکانی کڵاوو کلێتەو تەپلەو شەبقەو، هەم هەر بەرگێك دەگرێتەوە کە سەرو کڵاوەکەی پێیەوە لکابێ، بڕوانە: (المعجم الوسيط) وشەی (برنس).

[85] هەرچەندە بەپێی عورف (خُفْ) گۆرەوی چەرمە، بەڵام وا دیارە پێڵاویش دەگرێتەوە لەئەسڵ دا.

[86] (زعفران ورس) دوو جۆرە گیاو گوڵی بۆنخۆشن، بڕوانە: (المعجم الوسيط) ص٣٩٤ وە ص١٠٢٥.

[87] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[88] بڕوانە: (فتح الباري) ج٤ص١٨٢، ١٨٣.

ب–وەدروست نیە هیچ شتێکی بەتەقەڵو درووماان لە پشتێن بەرەو ژووری دەبەر بکات، بۆیە باسی کراس (قمیص)ی کردوە.

ج– وە دروست نیە لەپشتێن بەرەو ژێری هیچ شتێك کە تەقەڵو دروومانی هەبێ دەپێ بکات بۆیە باسی شەرواڵ (سَرْوال)ی کردوە.

د–وە دورست نیە هیچ شتێك بکاتە پێ‌ی کە گوێزینگی بگرێ چ پێڵاو چ خوفف چ گۆرەوی، بۆیە باسی خوفف (خُف) ی کردوە.

هـ–وە دروست نیە کە هیچ جۆرە بەرگو پۆشاکێك بپۆشێو بکاتە بەرگی ئیحرام کەبۆنی[89] خۆشی لێدرابێت، دیارە بۆنی خۆش لەخۆدانیش[90] بەهەمان شێوە قەدەغەیە، بەڵام بۆنی خۆش (طیب) لەجەستەدان لەکاتی پۆشینی بەرگی ئیحرام دا دروستە، چونکە (بخاري) لە (عائشة) ی گێڕاوەتەوە کە گوتوویەتی: (كنتُ أُطَيِّبُ رسولَ الله ﷺ لأحْرامِه حين يُحْرِمُ ولحِلِه قَبْلَ أن يطوفَ بالْبيتِ)، واتە: من پێغەمبەری خوام ﷺ بۆنخۆش دەکرد کاتێك کە ئیحرامی دەبەست، وە کاتێك کەئیحرامی دەشکاند بەرلەوەی طوافی کابە بکات.

بەڵام پێویستە بزانرێ کەزانایان تێکڕا[91] لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە دروست نەبوونی پۆشینی ئەوجۆرە بەرگو کەلوپەلانە تایبەتە بەپیاوانەوەو بۆ ئافرەتان هەرجۆرە بەرگو پۆشاکێك بپۆشن دروستەو تەنیا سێ شت بۆ ئافرەت دروست نینو لێیان قەدەغەکراون:

ا–بۆنی خۆش لەبەرگو پۆشاك دان

ب–پەرچە (نقاب) کردنو ڕوو داپۆشین مەگەر لەکاتی مەترسی گوناحو تەماشاکران دا.

ج–دەستکێش (قفاز) لەدەست کردن.

لەبارەی بەرگو پۆشاکی کاتی ئیحرامی ئافرەتانیش دەقی سوننەت زۆرن، بۆ وێنە:

(عن ابن عمر رضي الله عنهما نهى النبي ﷺ النساءَ في إحرامهنَّ عن القفازين والنقاب، ومامسَّ الوَرْسُ والزعفرانُ من الثياب، ولْتَلْبَسْ بَعد ذلك ماأحبتَ من ألوان الثيابِ، من مُعَصْفَرٍ أو خَزٍ أو حُليٍ أو سراويل أو قَميصٍ أو خُفٍ) رواه أبوداود والبيهقي والحاكم ورجالهُ رجال الصحيح.

واتە: پێغەمبەر ﷺ ئافرەتانی لەکاتی ئیحرامیان دا لەپۆشینی دەستکێشو پەچەو هەر بەرگێك کە وەرسو زەعفەرانی لێدرابێ قەدەغە کردوە، بەڵام غەیری ئەوە با هەرجۆرە بەرگێکی حەزیان لێیەتی بیپۆشن: لە ڕەنگ کراو بەڕەنگی سوور، یان ئاوریشم، یان خشڵ، یان دەرپێ، یان کراس، یان پێڵاو.

---

[89] واتە بەرلەوەی خۆی پێ‌بپۆشێ بۆنی خۆشی لێدرابێت.

[90] واتە دوای ئەوەی دەبەرکراوەو پۆشراوە بۆنی خۆشی لێبدرێ.

[91] بڕوانە: (فتح الباري) ج٤ص١٨٣، وە بڕوانە: (المغني والشرح الكبير) ج٣ص٣٠٧، ٣٠٨.

بەڵگەی ئەوەش کە ئافرەتان لەکاتی ئیحرام دا بۆیان هەیە لەکاتی مەترسی گوناح و تەماشاکران دەموچاویان داپۆشن ئەم دەقەیە:

*(عن عائشة رضي الله عنها قالت: كان الرُّكْبان يَمُرُّون بنا ونحن مع رسول الله ﷺ مُحْرِماتٌ، فإذا حاذوا بنا سَدَلَتْ إحْدانا جِلْبابَها على وجْهِها، فإذا جاوزونا كشفناهُ) رواه ابوداود وابن ماجة.

واتە: لەکاتێك دا کە ئێمە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ بووین و لەئیحرام دا بووین سوارەکان بەلامان دا ڕەت دەبوون، جا کاتێك دەگەیشتنە ئاقارمان هەر یەکێکمان چارشێو[92] (جلباب)ەکەی بەسەر ڕووی‌دا شۆڕدەکردەوە، وەکاتێك لێمان تێدەپەڕین ڕووی خۆمانمان دەردەخستەوە.

دیارە ئەمەش ڕای زۆربەی[93] زانایانە وەك: مالك و ثوري و شافعي و احمد و إسحاق و (شوكاني)[94]یش پەسەندی کردوە.

هەندێکیشیان ڕایان وایە کە دروست نیە ئافرەتی ئیحرام گرتوو دەموچاوی داپۆشێ لەهیچ حاڵێك دا، هەندێك لەوانەش کە بەدروستیان داناوە ئافرەت لەکاتی مەترسی گوناح (خوف الفتنة)دا ڕووی خۆی داپۆشێ ئەوەیان بەمەرج گرتوە کەنابێ ئەو پۆشاك و پەچەیەی ڕووی خۆی پێدەپۆشێ بەر پێستی دەموچاوی بکەوێ و دەبێ لێی‌دووربێ بەلام ڕای ڕاست تر ئەوەیە کە ئەو مەرجە پێویست نیەو هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نیە کەشایانی باس بێت[95].

٢-ڕاوەستان لەعەرەفات (الوقوف بعرفة):

زانایان تێکڕا[96] لەسەر ئەوە یەکدەنگن کەڕاوەستان لەعەرەفات پایەی بنەڕەتی و هەرە مەزنی حەجە، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (الحَجُّ عَرَفَةٌ) رواه اصحاب السنن واحمد.

شوێنی لێ‌ڕاوەستان:

زانایان لەسەر ئەوەش یەکدەنگن[97] کە لەهەر بەشێکی عەرەفات بوەستێ دروستە، بەلام چاکتر وایە لەنیزیك و دامێن (جَبَل الرحمة) وە بێت لەلای تاشە بەردە زلەکان و ڕوو بە کابە ڕابوەستێ.

---

[92] (جِلْباب) پۆشاکێکە کە هەموو جەستەی ئافرەت بگرێتەوە وەك عەبا، یان بەسەر سەروشان و ملدا بدرێ وەك چارشێوو کۆڵوانە، بڕوانە: (المعجم الوسيط) ص١٢٨.

[93] بڕوانە: (المغني والشرح الكبير) ج٣ص٣٢٣، ٣٢٤، وە: (فقه السنة) ج١ص٦٨٥.

[94] بڕوانە: (نيل الأوطار) ج٥ص٦.

[95] بڕوانە: (المغني والشرح الكبير) ج٣ص٣٢٤، وە بڕوانە: (المفصل) ج٢ص٣٠٦.

[96] بڕوانە: (المجموع) ج٨ص٩٧تا١١٣.

[97] هەمان سەرچاوەو بەرگ ص١٠٤.

بەڵگـەی ئـەوەش کـە دەشـتی عـەرەفات هـەمووی دروسـتە لـێی بوەسـتی ئـەم فەرموودەیەیە: (قَـدْ وَقَفْـتُ هَهُنا وَعرفـةَ كُلُّها مَوْقِـفٌ) رواه ابوداود وابن ماجة، واتـە: ئـەوە مـن (قسەكەر پێغەمبەری خوایە ﷺ) لێرە وەستاوم، بەڵام بزانن كەعەرەفات هەمووی شوێنی لێ‌ڕاوەستانە.

وە بەڵگەی پەسـەندو سـوننەت بوونـی دامێـن (جبـل الرحمـة) ئـەو دەقەیـە كـە لـەو فەرموودەیەدا هاتوە كە (مسلم) لە (جابر) خوا لێی‌ڕازی‌بێ گێڕاویەتەوە:

(ثم ركبَ رسول الله ﷺ حتى أتى الموقفَ فَجَعَلَ بَطْنَ ناقتِه القصواء الى الصَّخَراتِ وَجَعَلَ حبل المشاة بين يَدَيْه واستقبل القبلة) واتـە: پاشـان پێغەمبـەری خـوا ﷺ سواربوو هـەتا هاتـە شـوێنی وەسـتان، جا كەلەكـەی حوشـترە تۆزێـك لـەگوێ قرتاوەكـەی كـردە گابـەردەكان‌و ئاپۆرایی پێڕۆیانی خستە پێش خۆی‌و رووی كردە قیبلە.

وە زانایان لەسەر ئەوەش یەكدەنگن[98] كە هەر كەسێك لەعەرەفات نەوەستێ حەجەكەی بەتاڵەو دانەمەزراوە.

كاتی ڕاوەستان:

زۆربەی هەرەزۆری[99] زانایان ڕایان وایە كەكاتی ڕاوەستان لەعەرەفات لەوكاتەوە دەست پێ‌دەكات كە خۆر لەنێوەڕاستی ئاسمان بەرەو لای ڕۆژئاوا لادەدات لـەڕۆژی نۆیـەمی (ذي الحجة) وەهـەتا سپێدەی بەرەبەیانی ڕۆژی دەیـەم دەخایـەنێ، بـەڵام حەنبەلی‌یەكان دەڵێـن لەبەرەبەیانی ڕۆژی نۆیەمەوەیە، بەڵام زانایان لەسەر ئەوە یەكدەنگن[100] كە ئەگـەر كەسێك پێش نیوەڕۆی ڕۆژی نۆیـەم ڕابوەستێ بەر لـەلادان (زوال) ی خـۆر عـەرەفات بەجێ‌بـهێڵێ ئەوە ڕاوەستانەكەی بەرناكەوێ.

هـەروەها زۆربـەی زانایـان كـە (حەنەفی‌یـەكان‌و مالیكی‌یـەكان‌و حەنبەلی‌یـەكان)یـان لەنێودان، دەڵێن فەرزە هەتا دوای خۆرئاوا بوون بوەستێ بۆئـەوەی شـەوو ڕۆژان پێكـەوە كۆبكاتـەوە لەڕاوەسـتانەكەی‌دا، بـەڵام (شـافیعیەكان) بـەس بەسـوننەتی دەزانـن‌و ڕای جەماوەریش بەڵگەدارترە[101].

---

[98] بڕوانە: (الفقه الأسلامي) ج٣ص٢٢٣٢، ط٤، وە: (المجموع) ج٨ص٩٧.

[99] بڕوانە: (المجموع) ج٨ص١١٢.

[100] بڕوانە: (الفقه الأسلامي) ج٣ص٢٢٣٤.

[101] چونكە پێغەمبـەر ﷺ وەك (مسلم) هێناویـەتی هـەتا خۆرئـاوا نـەبوو عـەرەفاتی جێ‌نەهێشـت، بـەڵام بەپێی ڕای زۆربەش حەجەكەی هەر دروستە، ئەوەندە هەیە خوێنی دەكەوێتە سەر.

ئەندازەی ڕاوەستان:

زانایان لەسەر ئەوەش یەکدەنگن[102] کە ئەوەندە بەسە بۆ ڕاوەستان (وقوف) لەسەر عەرەفات کە ماوەیەکی کەم لەدوای لادانی خۆر (زوال الشمس) دوە هەتا بەرەبەیان بمێنێتەوە، هەروەها لەسەر ئەوەش یەکدەنگن کە پاکیو دەستنوێژ هەبوونو خۆداپۆشینو ڕووکردنە قیبلە - هیچ کامیان مەرج نین بۆ ڕاوەستان لەسەر عەرەفات.[103]

لەوبارەشەوە کە ئایا چاکتر وایە ڕاوەستان لەعەرەفات بەسواری بێت یان پیادە زانایان ڕایان جیاوازەو، هەندێکیان ڕایان وایە کە وەك یەکنو بەشێکیشیان سواریو بەشێکیشیان پیادەبوون بە پەسەندتر دەزانن.[104]

حوکمی ڕانەوەستان لەعەرەفات:

وەك پێشتریش گوتمان ڕاوەستان لەعەرەفات پایەی بنەڕەتیو هەرە مەزنی حەجەو هەرکەسێك لەدەستی بچێ ئەوە حەجەکەی بەرنەکەوتوەو ئەمەش زانایان لەسەری یەکدەنگن.[105]

٣-طەواف (حەوت جار سووڕانەوە بەدەوری کابەدا):

طەوافەکانی حەج سێ جۆرن:

أ-طەوافی هاتنە نێو مەککەوە (طواف القدوم)، کە زۆربەی زانایان بەسوننەتی دەزانن.[106]

ب-طەوافی هاتنە خوار لەعەرەفات (طواف الأفاضة) کە بەیەکدەنگی زانایان پایەیە.[107]

ج-طەوافی بەجێهێشتنی مەککەو مزگەوتی حەرام (طواف الوداع)، کە زۆربە بەفەرزی دەزانن.[108]

جا سەرجەم زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە طەوافی دوای گەڕانەوە لەعەرەفات کە (طواف الأفاضة) و (طواف الركن) و (طواف الزيارة)شی پێدەڵێن، یەکێکە لەپایە گرنگەکانی حەجو بەبێ وی حەج دروست نابێ.[109]

---

[102] بڕوانە: (المجموع) ج٨ص١٠٣.

[103] بڕوانە: (المجموع) ج٨ص١٠٦، وە بڕوانە: (الفقه الأسلامي) ج٣ص٢٢٤٠، ط٤.

[104] بڕوانە: (المجموع) ج٨ص١٠٦، ١٠٧.

[105] بڕوانە: (المجموع) ج٨ص٩٧، وە (الفقه الأسلامي) ج٣ص٢٢٣٢، ط٤.

[106] بڕوانە: (الفقه الأسلامي...) ج٣ص٢١٧٧، وە ٢١٧٩، ط٤.

[107] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[108] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

خوای پەروەردگار دەربارەی طەوافی پایە فەرموویەتی: (ثُمَّ لِيَقْضُوا تَفَثَهُمْ وَلْيُوفُوا نُذُورَهُمْ وَلْيَطَّوَّفُوا بِالْبَيْتِ الْعَتِيقِ) الحج:٢٩، واتە: ئنجا - کە لەعەرەفات و مزدەلیفە گەڕانەوە - با چڵك و چەپەریان لابەرن و قوربانییەکانیان سەربڕن، وە با بەدەوری ماڵی لەمێژینە - ی خوا - دا بسووڕێنەوە.

زۆربەی هەرەزۆری زانایانیش لەسەر ئەوە ڕێك کەوتوون کە پێویستە طەواف بەپۆشتەیی بەجەستەو بەرگ و پۆشاکیخاوێن و بەدەست نوێژ و نیەتەوە بێت، ئەمانە مەرجن بۆ دروست بوونی طەواف، بەڵام (ابوحنیفة) خاوێنی (النظافة)ی جەستەو پۆشاك بە سوننەت و پۆشتەیی و لەش پاکی (طهارة) یش بەفەرز دەزانێ، وە نیەت بەمەرج دەزانێ بەڵام (مالك) نیەت بەفەرزو (شافعي و احمد)یش بەسوننەتی دەزانن،[110] پێشم وایە کە لەبەمەرج گرتنی پۆشتەییو[111] خاوێنی (نظافة) و پاکی (طهارة) دا زۆربەو جەماوەر ڕایەکەیان بەهێزترە، بەڵام لەنیەت دا ڕای (ابوحنیفة) بەهێزترە کە بەمەرجی گرتوە.

ئەمەش چەند دەقێکی سوننەت کە زانایان کردوویانن بە بەڵگەی ڕاکانیان:

(عن عائشة أن النبي ﷺ أَوَّلَ شيئ بَدَأَبِه حين قَدِمَ مكةَ أنْ توضَّأ ثم طافَ بالبَيْتِ) متفق عليه، واتە: پێغەمبەر ﷺ کاتێك چووە مەکە یەکەمین شت کە دەستیپێکرد ئەوەبوو کەدەست نوێژی گرت، پاشان بەدەوری ماڵ - ی خوا دا سوور ایەوە.

* (عن عائشة رضي الله عنها أن النبي ﷺ قال لَها حين حاضَتْ وهي مُحْرِمةٌ: إصْنَعي مايَصْنَعُ الحاجُ غَيْرَ أن لاتطوفي بالبيتِ حتىَّ تَغْتَسِلي) متفق عليه.

واتە: پێغەمبەر ﷺ بەعائیشەی فەرموو کاتێك کەوتە حەیزەوە کە لەئیحرام دا بوو؛ هەرچی حاجی دەیکات تۆش بیکە بەڵام هەتا خۆت نەشۆری طەوافی کابە مەکە.

*(عن ابن عباس رضي الله عنها أن النبي ﷺ قال: الطوافُ بالبَيْتِ صلاة إلا انَّهُ أذِنَ فيه بالمنطق، فمن استطاع أن لاينطق الاّ بخير فَلْيَفْعَلْ) اخرجه البيهقي.

واتە: طەوافی ماڵێ خواش هەر نوێژە، بەڵام مۆڵەتی داوە قسەی تێدابکرێ، جا هەرکەسێك کەبۆی لوا با قسەی خێر نەبێ نەکات.

*پێغەمبەری خوا ﷺ لەحەجی پێش حەجی ماڵئاواییدا (ابوبکر الصدیق)ی خوا لێیڕازیبێ کردە ئەمیرو لەگەڵ کۆمەڵێك ناردی کە بەنێو خەڵکیدا جاڕ بدات لەڕۆژی قوربانی سەربڕین دا: (أن لا يَحُجَّ بعد العام مَشرِكٌ ولا يطوف بالبَيْتِ عُرْيانٌ) متفق عليه.

---

[109] خاوەنی (المغني) ج٣ص٤٦٥، گوتوویەتی: (.. وهو ركن للحج لايتم إلاّ به لانعلم فيه خلافاً).

[110] بڕوانە: (المجموع) ج٨ص١٨، ١٩، وە: (الفقه الأسلامي) ج٣ص٢٢١٩، ٢٢٢٠.

[111] مەبەست لەپۆشتەیی داپۆشینی عەورەتە (ستر العورة).

واتە: با لەم ساڵ بەدواوە هیچ هاوبەش بۆ خوا دانەرێك حەج نەكات، وە هیچ كەس بەڕووتی طەوافی ماڵی خوا نەكات.

هەروەها زانایان لەسەر ئەوەش ڕێك كەوتوون كە دەبێ ژمارەی سووڕانەوەكانی دەوری كابە حەوت (٧)بێ‌و هەموو جارێكیش لەبەردە ڕەشی (الحجر الأسود)ەوە بۆ بەردەڕەش بێت، وەدەبێ سووڕانەوەكەش لەنێو مزگەوتی حەرام دا بێ، وە بەڕیز (ترتیب) یش بێت، واتە لەبەردەڕەش (الحجر الأسود) ەوە دەست پێبكات‌و لەلای چەپی‌یەوە بسووڕێتەوە،[112] وە زۆربەیان دەڵێن مەرجە بەپێیان بێ نەك بەسواری مەگەر ناچاربێ[113]. بەڵام لەسەر چەند مەسەلەیەك ڕایان جیاوازە:

ا-بەدوای یەكدا هاتن (الموالاة)ی سووڕانەوەكان، كە حەنەفی‌یەكان‌و شافیعی‌یەكان تەنیا بەفەرز، بەڵام مالیكی‌یەكان‌و حەنبەلی‌یەكان بەمەرجیشی دەزانن.[114]

ب- كاتی طەوافی پایە، كە شافیعی‌یەكان‌و حەنبەلی‌یەكان ڕایان وایە لەدوای نیوەشەوی جەژنی قوربانەوە دروستە، بەڵام حەنەفی‌یەكان‌و مالیكی‌یەكان ڕایان وایە كە لەپاش بەرەبەیانی ڕۆژی جەژنەوە دروستە و پێشتر دروست نیە.[115]

ج-دوو ڕكاتی طەواف كەشافیعی‌و حەنبەلی‌یەكان بەسوننەت‌و حەنەفی‌و مالیكی‌یەكانیش بەفەرزی دەزانن.[116]

٤-هاتن‌و چوون (سَعْي) ی نێوان صەفاو مەڕوە:

ئەمیش لەسەر ڕای زۆربەی هەرەزۆری[117] زانایان پایەیەو پێویستە لەدوای طەوافیشەوەبێ وە لەسەر ئەوەش یەكدەنگن كە دەبێ حەوت كەڕەت بێت‌و، لەصەفاوە دەست پێبكرێ‌و لەمەڕوە كۆتایی بێت، وە لەسەر ئەوەش یەكدەنگن كە هەر چوونێك لەصەفاوە بۆ مەڕوە كەڕەتێكەو هەر گەڕانەوەیەكیش لەمەڕوەوە بۆ صەفا كەڕەتێكی دیكەیە.[118]

هەروەها زۆربەی هەرە زۆری زانایان لەسەر ئەوەش یەكدەنگن كە هاتن‌و چوونی نێوان صەفاو مەڕوە لەش پاكی (طهارة) و دەست نوێژ هەبوونی تێدا بەمەرج نەگیراوە.[119]

---

[112] بڕوانە: (المجموع) ج٨ص١٤، وە: (الفقه الأسلامي) ج٣ص٢٢٢٠، ط٤.

[113] بڕوانە: (المفصل) ج٢ص٢٠٧.

[114] بڕوانە: (الفقه الأسلامي) ج٣ص٢٢٢٠، ط٤.

[115] بڕوانە: (الفقه الأسلامي) ج٣ص٢٢٢٠، ط٤.

[116] هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص٢١٧٧، وە بڕوانە: (فقه السنة) ج١ص٧١٦.

[117] بڕوانە: (المجموع) ج٨ص٨١، بەڵام (ابوحنیفة) وە (احمد) لەڕیوایەتێكی‌دا بەفەرزی دەزانن.

[118] هەمان سەرچاوەو بەرگ ص٧٤تا٧٩، وە بڕوانە: (فقه السنة) ج١ص٧٢٥تا٧٢٨.

[119] هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص٨٣، وە بڕوانە: (فقه السنة) ج١ص٧٢٧.

ئەمەش چەند دەقێك دەربارەی هاتنوچوونی نێوان صەفاو مەروە:

* (إنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِنْ شَعَائِرِ اللَّهِ فَمَنْ حَجَّ الْبَيْتَ أَوْ اعْتَمَرَ فَلا جُنَاحَ عَلَيْهِ أَنْ يَطَّوَّفَ بِهِمَا) البقرة:١٥٨، واتە: بێگومان صەفاو مەروە لەدرووشمەکانی – ئایینی – خوان، جا هەرکەسێك حەجیماڵی خوای کرد یان عومرەی کرد ئەوە گوناهی ناگاتێ کە لەبەینیان دا بسوورێ.

دیارە هۆی ئەم جۆرە تەعبیرەش وەك (عائشة) خوالێیڕازیبێ بۆ (عروة بن الزبیر) ی خوشکەزای ڕوونی کردۆتەوە،[120] ئەوەیە کە لەسەردەمی نەفامیدا بتێك بەناوی (مناة) لەسەر هەرکام لەصەفاو مەروە یان یەکێکیان هەبووەو (انصار) پێش مسوڵمان بوونیان لەکاتی هاتنو چوون (سعي) یان لەنێوانیاندا ناوی ئەو بتەیان هێناوە جا پاش هاتنی ئیسلام هەستیان بەسەغڵەتی کردوە کە لەبەینیان بێنو بچن بۆیە خوای پەروەردگار ئاوای فەرمووە.

*(يا أيها الناس إسْعَوْا فإن السَّعْيَ قَدْ كُتِبَ عليكم) رواه الدارقطني والبيهقي بإسنادٍ حسنٍ.

واتە: ئەی خەڵکینە! – لەنێوان صەفاو مەروەدا – بێنو بچن چونکە بێگومان هاتنوچوونتان لەسەر پێویست کراوە.

*وە لەو فەرموودەیەدا کە (مسلم) لە (جابر بن عبدالله) ی گێڕاوەتەوە کە دەربارەی حەجی پێغەمبەری خوایە ﷺ لەساڵی دەیەمی کۆچیدا، هاتوە کە دوای ئەوەی طەوافی کردوە، لە نێوان صفاو مەروەدا هاتوەو چووە. (دواتر ئەو فەرموودەیە بەتەواوی دێنین).

خوێنەری خۆشەویست! ئەو چوار کردەوە گرنگو گەورەیەی کە ڕابردن: (ئیحرام بەستنو ڕاوەستان لەعەرەفاتو طەوافی ماڵێ خواو هاتنو چوونی نێوان صەفاو مەروە) بەڕای زۆربەی هەرەزۆری زانایان هەر چواریان کۆڵەکەو پایەی پێکهێنەری حەجن، دیارە هەندێك لەزانایانیش چەند کردەوەیەکی دیکەی حەج بەپایە دەزانن، بۆ وێنە شافیعییەکان زۆربەیان تاشینی سەر یان کورت کردنەوە (حلق الرأس أو التقصير) بەپایە دەزانن،[121] وە هەشیانە[122] شەومانەوە لەموزدەلیفە (المبيت بِمُزْدلِفَة)ش بەپایە دەزانێ،[123] بەڵام زۆربەی زانایان هەر ئەو چوارەی گوتمان بەپایە دەزاننو، کردەوەکانی دیکەی حەج یان بەفەرز یان بەسوننەت دادەنێن.

---

[120] (بخاري و مسلم) گێڕاویانەتەوە، بڕوانە: (المجموع) ج٨ص٨٢.

[121] بڕوانە: (المجموع) ج٨ص١٥١، ١٥٢، وە بڕوانە: (الفقه الأسلامي) ج٣ص٢١٧٩، ط٤.

[122] ووشەی (هەشیانە) دەگەڕێتەوە بۆ (هەندێك لەزانایانیش) نەك بۆ شافیعییەکان.

[123] بڕوانە: (الوجيز في فقه السنة والكتاب العزيز) ص٢٤٦، عبدالعظيم بن بدوي، بەڵام لەهیچ سەرچاوەیەکی دیکەدا ئەم ڕایەم نەدیوەو سەرجەم زانایان شەومانەوە لەموزدەلیفە بەس بەفەرز دەزانن، بەڵام دوایی لە (المجموع) دا بینیم کە پێنج لەزانایانی تابیعین کە (علقمة والأسود والشَّعْبِي والنَّخعي والحسن البصري) ین، وە هەرکام لە (ابن خُزَيمة) و (ابن بنت الشافعي) بەپایەیان زانیوە، بڕوانە: (المجموع) ج٨ص١٣٠.

دیاره جیاوازی نێوان پایە (ركن) و پێویست (فرض، واجب) و پەسەند (سنة، مَنْدوب) هەربەکورتی ئەوەیە کە: هەبوونی پایە مەرجی دروست بوونو وەبەرکەوتنی ئەو کردەوەیەو بەنەبونی کردەوەکە پەکی دەکەوێو نایەتە دیو، هیچ شتێکیش قەرەبوو (تعویض) ناکاتەوە، بەڵام فەرز پەکی ئەسڵی کارەکە ناخاتو بەخوێن (قوربانی سەربڕین)یش قەرەبوو دەبێتەوە، سوننەتیش بەهەبوونی خێرو پاداشتی زیاتر دەبێو کارەکە چاکترو تێرو تەواوتر دەبێ، بەڵام نەبوونی زیانێکی ئەوتۆ لەکارەکە نادات کەپێویستی بەقەرەبوو کردنەوە بکات.[١٢٤]

جا ئێمە خوا پشتیوان بێ دوای ئەوەی بەکورتی باسی پایەکانی حەجمان کرد ئەوجار دەچینە سەر فەرزەکانی حەجو دواتریش سوننەتەکانی.

## دوو: فەرزەکانی حەج:

بەڕای زۆربەی هەرە زۆری زانایان فەرزەکانی حەج ئەمانەی خوارەوەن:

### ١-ئیحرام بەستن لەمیقات:

زۆربەی هەرە زۆری[١٢٥] زانایان کەشوێنکەوتووانی هەر چوار مەزهەبەکانیان لەنێودان ئیحرام بەستن لەمیقات دا بەفەرز دەزانن، بەڵام شیعەی دوازدە ئیمامی بەپایەی دەزانن.[١٢٦]

دیارە مەبەستیش لەمیقات هەرکام لەمیقاتی کاتی (زماني) و شوێنی (مكاني)یە وەك پێشتر روونمان کردەوە، دیارە پێویست بوونی ئیحرام بەستران لەمیقاتی شوێنیدا تایبەتە بەکەسانێکەوە کە لەدەرەوەی شاری مەککەو سنووری حەرەم و سنووری نێوان میقاتەکانو شاری مەککە دان، وەك پێشتر لەبەندی سێیەم دا باسمان کردو پێویست بەدووبارە کردنەوە ناکات.



[١٢٤] بڕوانە: (المجموع الشرح المهذّب) ج٨ص١٩٣.
[١٢٥] بڕوانە: (الفقه الأسلامي) ج٣ص٢١٧٧، ط٤، وە: (المفصل) ج٢ص٢٧٥تا٢٧٩.
[١٢٦] بڕوانە: (الفقه علی المذاهب الخمسة) ص٢٠٨، محمد جواد مغنية.

**٢-وەستان یان شەومانەوە لەموزدەلیفە:**[127]

سەرجەم[128] زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە وەستان لەموزدەلیفە لەبەشێکی شەوگاردا[129] پاش هاتنە خوار لەعەرەفات لەشەوی دەیەمی (ذوالحجة)دا فەرزە، وەهەندێکیان شەومانەوە (المبیت)ی سەرجەم شەوی ناوبراویش بەفەرز دەزانن، واش پێدەچێ ئەم رایەی دوایی کەرای (عطاء و زهري و قتادة و ابوثور و إسحاق و احمد) و زەیدیی‌یەکان و[130] هەندێك لەشافیعی‌یەکانیشە،[131] بەهێزتربێت، چونکە:

أ- خوای پەروەردگار ئاماژەی پێکردوە کە فەرموویەتی: ﴿فَإِذَا أَفَضْتُمْ مِنْ عَرَفَاتٍ فَاذْكُرُوا اللَّهَ عِنْدَ الْمَشْعَرِ الْحَرَامِ وَاذْكُرُوهُ كَمَا هَدَاكُمْ وَإِنْ كُنْتُمْ مِنْ قَبْلِهِ لَمِنَ الضَّالِّينَ﴾ البقرة: ١٩٨، واتە: جا هەرکاتێك لەعەرەفاتەوە بەرەو خوار هاتن ئەوە لەلای (المشعر الحرام) یادی خوا بکەن، وەیادی بکەنەوە کەچۆن هیدایەتی‌دان کەئێوە پێشتر لەرێ لێ‌ونبووان بوون.

ب-وەك لەو فەرموودەیەدا هاتوە کە (مسلم) لە (جابر بن عبدالله) ی گێراوەتەوە پێغەمبەر ﷺ لەحەجیماڵئاوایی‌دا شەو لەموزدەلیفە ماوەتەوە، وە فەرمووشیەتی: (خُذوا عَنِّيَ مَناسِكَكُمْ) واتە: ئەنجام دانی خواپەرستی‌و درووشمەکانی حەجم لێ‌وەربگرن!.

**٣-بەردووچکە باران[132] کردنی سێ جەمرەکان[133] (رَمْيُ الجمرات الثلاث):**

ئەمیش بەیەکدەنگی زانایان[134] فەرزەو، بەدوو قۆناغیش تەواو دەبێ: قۆناغی یەکەم: بەردووچکە باران کردنی جەمرەی گەورە یان جەمرەی عەقەبە لەرۆژی جەژن دا کەدەیەمی مانگی (ذوالحجة) یەو، پاش بەجێهێشتنی موزدەلیفە ئەنجام دەدرێ‌و بەیەکدەنگی

---

[127] موزدەلیفە کە (المشعر الحرام) و (جَمْع) یشی پێدەڵێن شوێنێکی دیاریکراوە لەنێوان عەرەفات‌و مینادا، لەبەر لێ‌خڕبوونەوەی خەڵك ناونراوە (جمع) و بۆیەش پێ‌ی گوتراوە (مزدلفة) چونکە خەڵك تێیدا لەخوا نیزیك دەبنەوە، یان لەبەرئەوەی لەبەشێکی شەودا بۆی دەچن، بۆیەش بە (المشعر الحرام) ناونراوە چونکە یەکێکە لەدرووشمەکانی حەج‌و خواپەرستی‌و راووشکاری تێدا حەرام کراوە، (المفصل) ص٢٢٧.

[128] بڕوانە: (الفقه الأسلامي) ج٣ص٢١٧٨، وە: (المفصل) ج٢ص٢٢٨، ٢٢٩.

[129] حەنەفی‌یەکان دەڵێن دەبێ دوای بەرەبەیان (طلوع الفجر) بێت، بڕوانە: (المفصل) ج٢ص٢٢٩.

[130] بڕوانە: (المجموع) ج٨ص١٢٢، ١٢٣، وەص ١٣٠، وە: (المفصل) ج٢ص٢٢٨.

[131] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[132] وشەی (رمي الجمار) واتە: بەردووچکە هاویشتن، چونکە (جِمار) کۆی (جَمْرة) یە کە بە بەردووچکەی گچکە دەگوترێ. بڕوانە: (الفقه الأسلامي وادلته) ج٣ص٢٢٢٥٢، ط٤.

[133] بۆیە پێیان دەگوترێ (جَمَرات) چونکە شوێنی تێدا خڕبوونەوەو کەڵەکەبوونی وردە بەردانن.

[134] بڕوانە: (المجموع) ج٨ص١٤١.

زانایانیش پەسەندو سوننەت وایە کە لە دەمی چێشتەنگاودابێ[135]، بەڵام مالیکی یەکان و حەنەفی یەکان کاتی ناوبراو بەفەرزیش دەزانن، شافیعی یەکان و حەنبەلی یەکانیش دەڵێن هەر سوننەت و چاکتر وایە ئەگەرنا لەپاش بەرەبەیانەوە دروستە.[136]

وە زانایان لەسەر ئەوەش یەکدەنگن کەڕۆژی جەژن تەنیا جەمرەی گەورە بەردووچکە باران دەکرێ و، دەبێ حەوت (٧) دانە بەردووچکەی وەك بەردی پەلاپیتکە (خَذْفْ) بن، واتە لەدەنکە نۆك زلترو هێندەی دەنکە پاقلەیەکی ئاسایی، وە دەبێ حەوت بەردووچکەکانیش بەحەوت کەڕەتان فڕێبدات،[137] نەك هەموویان بەیەك جار، چونکە ئەگەر بەیەك جار هەموویان بهاوێژێ هەر بەیەك بەردووچکە بۆی حیسابە.[138]

قۆناغی دووەم: بەردووچکە باران کردنی هەرسێك جەمرەکان (جەمرەی گچکەو جەمرەی نێوەنجی و جەمرەی گەورە) لەهەرسێك ڕۆژەکانی (أيام التشريق)دا، کە ڕۆژانی یازدەو دوازدەو سێزدەی (ذوالحجة)ن و، دەبێ لەهەرکام لەوسێ ڕۆژەدا پاش لادانی خۆر[139] (زوال الشمس) بەرەو ڕۆژئاوا هەرکام لەوسێ جەمرەیە بەردووچکەباران بکات. واتە هەر ڕۆژی (٧×٣=٢١) بەردووچکە بهاوێژێ، کە دەکاتە: (٣×٢١=٦٣) بەردووچکەو، لەگەڵ حەوت بەردووچکەکەی ڕۆژی جەژن دەکەنە: (٧+٦٣=٧٠) بەردووچکە.[140]

بەڵام ئەگەر کەسێك پەلەی بێت بۆ گەڕانەوە دەتوانێ بەس دوو ڕۆژ لە سێ ڕۆژەکانی (أَيَّام التشريق) جەمرەکان بەردووچکەباران بکات و، دوای نیوەڕۆ ڕۆژی دووەم مینا بەجێبهێڵێ واتە تەنیا چل و نۆ (٤٩) بەردووچکە بهاوێژێ، وەك خوای میهرەبان فەرموویەتی: (وَاذْكُرُوا اللَّهَ فِي أَيَّامٍ مَعْدُودَاتٍ فَمَنْ تَعَجَّلَ فِي يَوْمَيْنِ فَلا إِثْمَ عَلَيْهِ...) البقرة:٢٠٣، واتە: وە لەچەند ڕۆژێکی دیاریکراودا یادی خوا بکەن. بەڵام کەسێك لەڕۆژی دووەم دا پەلەی – گەڕانەوە – ی کرد گوناحی ناگاتێ...[141]

---

[135] بڕوانە: (المجموع) ج٨ص١٤١، ١٤٢، وە بڕوانە: (المفصل) ج٢ص٢٣٦تا٢٤١.

[136] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[137] بڕوانە: (المجموع) ج٨ص١٤٣، وە بڕوانە: (المغني والشرح الكبير) ج٣ص٤٥١، وە بڕوانە: (الفقه الأسلامي) ج٣ص٢٢٥٨، ط٤.

[138] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[139] بڕوانە: (المجموع) ج٨ص١٦٩، وە بڕوانە: (المغني والشرح الكبير) ج٣ص٤٧٤، ٤٧٥.

[140] بڕوانە: (المجموع) ج٨ص١٦٨.

[141] هەمان سەرچاوەو بەرگ ص١٧٩تا١٨٢.

ئەميش چەند دەقێك دەربارەی بەردووچكەباران كردنی سێ جەمرەكان:

*(عن جابر رضي الله عنه قال: رأَيْتُ النبيَّ ﷺ يَرْمي الجَمْرَةَ على راحِلَتِهِ يــوم النَّحْــرِ، ويقــول: لِتــأْخُذوا عنيّ مناسِكَكُمْ، فاني لا أدري لَعليَ لا أحُجُ بَعْدَ حَجتي هذه) رواه أحمد ومسلم والنسائي.

*واتــه: پێغەمبــەرم ﷺ بينــی كــە جــەمرەی[142] بــەردباران دەكــرد بەســەر وڵاخەكەيــەوە لەرۆژی قوربــانی ســەربڕين دا، وە دەيفــەرموو: بۆئــەوەی درووشــمو خواپەرســتیيەكانتانم لێ‌فێربن، چونكە من نازانم ڕەنگە لەپاش ئەم حەجەم هيچ حەجی ديكە نەكەم.

*(عن أبن عباس رضي الله عنه أن النبي ﷺ بَعَثَ بِضَعَفَةِ أهلهِ فـأمرهم أن لايرمُـوا حتــى تطلــع الشَمْسُ) رواه احمد واصحاب السن وصححه الترمذي وقال: والعمل على هذا الحديث عند أهل العلم.

واته: پێغەمبەر ﷺ – شەوی دەيەمی (ذوالحجة) – ئەوانەی لاوازو بێهێز بوون لەماڵو خێزانی – بــەرەو مينــا – ڕەوانــەی كــردنو فــەرمانی پــێكردن كــە هــەتا خــۆر هەڵنەيــەت – بەردووچكەكان – نەهاوێژن.

*(عن عائشة رضي الله عنها أن النبي ﷺ أرْسَلَ أمَّ سَلَمَةَ رضي الله عنها يوم النَّحْــرِ فرَمَتْ قبـل الفَجْرِ..) رواه ابوداود.

واتــه: پێغەمبــەر ﷺ ڕۆژی قوربــانی ســەربڕين (أمُّ سَــلَمة) ی خوالێــی‌ڕازی بــێ نــارد –بەرەو مينا –، ئەويش پێش بەرەبەيان بەردووچكەكانی هاويشتن.

* (عن جابر رضي الله عنه أن النبي ﷺ أتى الجَمْرةَ يعني يوم النَّحْرِ فرماها بِسَبْعِ حَصياتٍ يُكبِّرُ مع كل حَصاةٍ منها، مثـل حَصـىٰ الخَـذْفِ..) رواه مسلم. واتــه: پێغەمبــەر ﷺ هاتــە لای جــەمرە –[143]واتــە ڕۆژی قوربــانی ســەربڕين – وە حــەوت بەردووچكــەی پــێدادان لەگــەڵ هــەر بەردووچكەيەك دا (الله اكبر) ی دەكرد، بەردووچكەكان وەك بەردی پەلاپيتكە هاويشتن بوون.

* (عن جابر رضي الله عنه أن النبيَّ ﷺ رَمىٰ الجَمْرَةَ أولَ يومٍ ضُحَىًّ ثم لَمْ يَرْمِ بَعْد ذلك حتـى زالت الشَّمْسُ) رواه مسلم، و رواه البخاري تعليقاً.

واته: پێغەمبەر ﷺ ڕۆژی يەكەم دەمی چێشتەنگاو جەمرەی[144] بەردووچكە باران كرد، پاشان دوای ئەوە هەتا خۆر لای نەدا – بەلای ڕۆژئاوادا – بەردووچكەكانی نەهاويشتن.

*(عن ابن عمر رضي الله عنهما قال: كُنَّا نَتَحيَّنُ فاذا زالت الشَّمْسُ رَمَيْنا) رواه البخاري،

واته: ئێمە چاوەڕێمان دەكرد، جا كاتێك خۆر لای دەدا ئەوجار – بەردووچكەكانمان – دەهاويشت.

---

[142] مەبەست لەجەمرە لەم جێيانەدا جەمرەی گەورەيە كە وەك پێشتر گوتم (جمرة العقبة) يشی پێ‌دەبێژن.

[143] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[144] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

ئنجا لەکۆتاییدا پێویستە ئاماژە بەچوار مەسەلەی دیکە بکەین کە هەموو یان زۆربەیان زانایان لەسەریان پێکهاتوون:

یەکەم: پێویستە بەردووچکە تێفڕێدانی هەرسێك جەمرەکان لەڕۆژەکانی تەشریق دا بەڕیز بێت، سەرەتا جەمرەی گچکە کە نیزیکترینیانە لەمیناوەو دوورترینیانە لەمەککەوە، ئنجا جەمرەی نێوەنجی، وە لەکۆتاییدا جەمرەی گەورە یان عەقەبە کە دوورترینیانە لەمیناوەو نیزیکترینیانە لەمەککەوە، دیارە ئەمە ڕای زۆربەی[١٤٥] زانایانەو دەڵێن ئەگەر ریزی جەمرەکان ڕەچاو نەکات بۆی بەرناکەوێ، بەلاّم هەندێك لەزانایان کە حەنەفییەکانیان لەنێودان دەڵێن ڕەچاوکردنی ڕیز سوننەتە بەلاّم فەڕزو مەرج نیە،[١٤٦] دیارە قسەی زۆربەش بەهێزترو بەڵگەدارترە چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ وای کردوە، وەك (ابن عمر) خوا لەخۆیو بابی ڕازیبێ گێڕاویەتەوەو (بخاري) لە (جامع الصحیح)ەکەیدا هێناویەتی.

دووەم: کەسێك لەبەر نەخۆشی یان هەر هۆیەکی دیکەی شەرعی نەتوانێ خۆی ئەو فەڕزە - فەڕزی بەردووچکە هاویشتن بۆ جەمرەکان - جێبەجێبکات، دروستە کەسێکی دیکە ڕاسپێرێو لەجیاتی ئەنجامی بدات، بەلاّم هەندێك لەزانایان ڕایان وایە کە هەرکەسێك بۆ خۆی ئەو فەڕزە ئەنجام نەداتو وەکیل بگرێ ئەوە خوێنی دەکەوێتە سەر.[١٤٧]

بەلاّم مەرجە بابای وەکیل بەردهاویشتنی خۆی ئەنجام دابێ، ئەوجار لەجیاتی بەوەکیل دانەر (مُوکِّل)ی بهاوێژێ.[١٤٨]

سێیەم: پێویستە لەگەڵ هاویشتنی یەکەم بەردووچکە دا واز لە (تلبیة) بهێنێ، وە ئەگەر بەر لەوردە بەردهاویشتن (رمي الجمار) سەریخۆی تاشی بوو یان کورت کردبۆوە، دەبێ پاش سەرتاشین یان کورت کردنەوەی کۆتایی بە (تلبیة) بهێنێ، چونکە (تَلْبیة) لەگەڵ ئیحرام بەستن دا دەستی پێدەکرێو بەئیحرام شکاندن پاساو (مبرّر)ی بەردەوام بوونی نامێنێ، ئەوەی گوترا ڕای: (ابوحنیفةو ثوري و ابوثورو شافعي و جماهیر العلماء من الصحابة والتابعین)ە وەك (نووي) نووسیویەتی،[١٤٩] هەندێك لەزانایانیش وەك (إسحاق واحمد) ڕایان وایە کە هەتا تەواوکردنی بەردباران کردنی جەمرەی گەورە هەر بەردەوام دەبێ، (مالك)یش ڕای وایە کە دەبێ بەر لەوەستان لەعەڕەفات کۆتایی پێبهێنرێ.[١٥٠]

---

[١٤٥] بڕوانە: (المجموع) ج٨ص١٦٩، وە بڕوانە: (المغني) ج٣ص٤٧٧.

[١٤٦] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[١٤٧] بڕوانە: (المفصل) ج٢ص٢٥٣، وە: (الفقه الأسلامي) ج٣ص٢٢٥٤، وە بڕوانە: (المجموع) ج٨ص١٧٣تا١٧٦.

[١٤٨] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[١٤٩] بڕوانە: (المجموع) ج٨ص١٤٢.

[١٥٠] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

چوارەم: بەردووچکە هاویشتن بۆ جەمرەکان وەك پێشتر باس کرا فەرزەو ئەمیش وەك هەموو فەرزەکانی دیکەی حەج بەچوێنرانی یان کەموکووڕی تێدا پەیدابوونی فیدیە لەسەر خاوەنی پێویست دەکات کەخوێن (دم)ە یان جێدار (بَدَلْ) ەکەیەتی کە گرتنی دە ڕۆژوویە، سێ (٣) یان لەکاتی حەج و حەوت (٧) یشیان پاش گەڕانەوە لەحەج.[١٥١]

٤-سەری خۆتاشین یان کورت کردنەوەی (الحَلْقُ أو التقصير):

ئەمیش زانایان لەسەر پێویست بوونی یەکدەنگن و هەندێکیشیان - بۆ وێنە زۆر لەشافیعی یەکان - بەپایەشی دەزانن.

جا هەرچەندە زۆربەی زانایان[١٥٢] لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە هەرکام لەبەردووچکە هاویشتن (رمي الجمار) و قوربانی سەربڕین و سەری خۆتاشین یان کورت کردنەوە، دروستە پاش و پێشیان پێ بکرێ، بەڵام لەسەر ئەوەش ڕێك کەوتوون کە پەسەندو سوننەت وایە بەردووچکە هاویشتن بخرێتە سەرەتاوەو ئنجا قوربانی سەربڕین و پاشان سەرتاشین یان هەڵپاچین بێن.

هەروەها لەسەر ئەوەش یەکدەنگن کە تاشین (حَلْق) لەکورت کردنەوە (تقصير) چاکترو خێرترەو، تاشینیش تایبەتە بەپیاوانەوەو، بۆ ئافرەتان تەنیا کورت کردنەوە هەیە.

ئەمەش چەند دەقێك لەبارەی ئەم چوارەمین فەرزەی حەجەوە:

* (لَقَدْ صَدَقَ اللَّهُ رَسُولَهُ الرُّؤْيَا بِالْحَقِّ لَتَدْخُلُنَّ الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ إِنْ شَاءَ اللَّهُ آمِنِينَ مُحَلِّقِينَ رُءُوسَكُمْ وَمُقَصِّرِينَ) الفتح: ٢٧، واتە: بێگومان خوا لەگەڵ خەونی پێغەمبەرەکەیدا ڕاستی کردو هێنایەدی، مسۆگەر ئێوە دەچنە نێو مزگەوتی حەرامەوە ئەگەر خوا بیەوێ بەهێمنی و ئاساییشەوەو - هەندێکتان -سەرتان دەتاشن و -هەندێکتان - کورتی دەکەنەوە.

* (عن ابن عمر رضي الله عنهما قال: حَلَقَ النبي ﷺ وحَلَقَ طائفة من أصْحابه وقصَّر بَعْضُهُمْ) متفق عليه، واتە: پێغەمبەر ﷺ سەری خۆی تاشی و کۆمەڵێکیش لەهاوەڵانی تاشییان، وەهەندێکشیان کورتیان کردەوە.

*(عن أنس رضي الله عنه أن رسول الله ﷺ أتى منىً، فأتى الجَمْرَةَ فرماها،ثم أتى مَنْزِلَهُ بمنىً ونَحَرَ، ثم قال للحلاّق: خُذْ وأشارَ الى جانبهِ الأيْمَنِ ثم الأيْسَرِ، ثم جَعَلَ يُعْطِيه الناسَ) رواه احمد ومسلم وابوداود.

---

[١٥١] بڕوانە: (الفقه الأسلامي) ج٣ص٢٢٦٢تا٢٢٦٥.

[١٥٢] بڕوانە: (المجموع) ج٨ص١٤٨، وە بڕوانە: (المفصل) ج٢ص٢٥٧، ٢٥٨.

واتـه: پێغەمبـەری خـوا ﷺ هاتـه مینـا، پاشـان چـوه لای جـەمرە - ی گـەورە - و بەردووچکەبارانی کرد، دوایی هاتەوە مەنزڵەکەی لەميناو قوربانی‌یەکەی سەربڕی، پاشان بەسەرتاشی فەرموو: دەست پێبکە وە ئاماژەی بۆ لای ڕاستی سەری کرد، پاشان لای چەپی، دوایی مووەکانی بەسەر خەڵکیدا بەخشیەوە.

*(عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: قال رسول الله ﷺ: اللّهُمَّ اغْفِرْ لِلمُحَلِّقِين قالوا: يارسول الله وللمقصِّرين؟ قال: اللهُّم اغفر للمحلّقين، قالوا: يارسـول الله وللمقصرين؟! قال: اللهم اغفر للمحلقين، قالوا يا رسول الله وللمقصرين، قال: وللمقصرين) متفق عليه.

واته: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی خوایە لەسەری خۆتاشەران ببوورە، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا وە لەسەری خۆ کورتکەرەوانیش؟ فەرمووی: ئەی خوایە لەسەری خۆتاشەران ببورە، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا وە لەسەری خۆ کورتکەرەوانیش؟ فەرمووی: ئەی خوایە لەسەری خۆتاشەران ببورە، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا وە لەسەری خۆ کورتکەرەوانیش؟! فەرمووی: وە لەسەری خۆ کورت کەرەوانیش -ببوورە -.

*(عن ابن عباس رضي الله عنه أن النبي ﷺ قال لَـهُ في الذَّبْحِ والحَلْقِ والرَّمي والتقديمِ والتأخير، فقال: لاحَرَجَ) متفق عليه.

واتـه: پێغەمبـەر ﷺ لەسـەربڕین‌و سەرتاشـین‌و بەردووچکـە هاویشـتن دا، وە لـە پێشخسـتن‌و دواخسـتن دا فەرموویـەتی‌و پـێی فـەرمووە - واتـە بـە (ابـن عبـاس) - قەیدیٚ ناکات.

*(عن عبدالله بن عمر بن العاص رضي الله عنهما أنه شَهِدَ النبي ﷺ يوم النَّحْرِ في حَجَّةِ الوداعِ وهم يَسألُونَهُ، فقال رَجُلٌ: لَمْ أشْعُرْ فَحَلَقْتُ قَبْلَ أن أذْبَحَ، فقال: إذْبَحْ ولاحَرَجَ، فجاءَ آخَرُ فقال: لَمْ أشْعُرْ فنحرتُ قَبْلَ أنْ أرمِيَ، فقال: إرْمِ ولا حَرَجَ، فما سُئِلَ يومئذٍ عن شيئٍ قُدِّمَ ولا أُخِّرَ إلا قال: أفْعَلْ ولاحَرَجَ) متفق عليه.

واتـه: پێغەمبـەری ﷺ لـەرۆژ قوربـانی سـەربڕین لەحـەجی ماڵئـاواییدا بینیـوە کـە پرسیاریان لێکردوە، پیاوێك وتی: هەستم نەکرد سەری خۆم تاشی بەرلەوەی قوربانی یەکەم سەربڕم، فەرمووی: سەری بڕەو قەیناکات، یەکێکی دیکە هات‌و وتی: لەبیرم نەبوو بەرلەوەی بەردووچکان بهاوێژم قوربانیم سەربڕی، فەرمووی: بهاوێژەو قەیناکات، ئەو ڕۆژە لەهیچ شتێك پرسیاری لێنەکرا کەپێش یان دواخرابێ مەگەر فەرمووی: بیکەو قەیناکات.

### ٥-شەو مانەوە لەمینا لەشەوەکانی (أيام التشريق)دا:

زانایـان دوای ئـەوەی سـەرجەم لەسـەر ئـەوە ڕێککـەوتوون[١٥٣] کـە شـەومانەوە لـەمینا لەشەوی ڕۆژی نۆیەمی (ذوالحجة) واتە ئەو شەوە کە بەیانییەکەی بەرەو عەرەفات دەچن - سوننەتە، لەسەر ئەوە کە ئایا شەومانەوە لـەمینا لەشـەوەکانی (ایام التشریق) دا کـە شـەوەکانی یـازدەو دوازدەو سـێزدەن، فـەرزە یـان سـوننەتە ڕایـان جیـاوازە، هـەرچی زۆربـەن[١٥٤] کـە (مالیکی‌یـەکان‌و شافیعی‌یەکان‌و حەنبەلی‌یـەکان) یـان لـەنێودان بەفـەرزی دەزانن، مەگەر بۆ کەسێك کە عوزرێکی ڕەوای هەبێ، هەڵبەتە فەرزبوونەکە تـەنیا شـەوانی یـازدەو دوازدە دەگرێتـەوە چونکـە وەك پێشـتر باسمـان کـرد شـەوی کۆتـایی دەرفـەتی نەمانەوەی هەیە بەدەقی قورئان.

دیـارە ڕای زۆربـەش بـەهێزترە چونکـە وەك (بخـاري و مسـلم) هێناویانـە (ابـن عمـر) خوا لێیان ڕازیبێ گێڕاویەتەوە کە (عباس) خوا لێی‌ڕازی بێ مۆڵەتی لەپێغەمبەر ﷺ وەرگرتـوە کە ئەو شەوانە لەمەککە بمێنێتەوە بۆ خاتری ئاودان بەخەڵکی، هەروەها (ترمذي) لە (أبي الدحداح بن عاصم عن أبيه) گێڕاویەتەوەو بە (حدیث حسـن صحیـح)یشـی دانـاوە کـە پێغەمبـەر ﷺ بۆ شوانان مۆڵەتی داوە،[١٥٥] جا ئەم فەرموودانە بەڵگەن لەسەر ئـەوەی کـە هەرکەسێك عوزرێکـی ڕەوای نـەبێ شـەومانەوەی لـەو شـەوانەدا کـە لـە ڕۆژەکانیـاندا بەردووچکەبارانی جەمرەکان دەکات فەرزە.

### ٦-طەوافی خوا حافیزیکردن (طواف الوداع):

ئـەمیش زۆربـەی زانایـان کـە (حەنەفی‌یـەکان‌و شـافیعی‌یەکان‌و حەنبەلی‌یـەکان) یـان لەنێودان بەفەرزی دەزانن، بەڵام مالیکی‌یەکان بەسوننەتی دەزانن،[١٥٦] واش پێدەچێ ڕای زۆربە ڕاست تر بێت چونکە ئەم دەقانەیان بەدەستەوە هەن:

---

[١٥٣] بڕوانە: (الفقه الأسلامي) ج٣ص٢٢٦٥.

[١٥٤] بڕوانە: (المغني) ج٣ص٤٨٠، ٤٨١، وە: (المجموع) ج٨ص١٧٧، ١٧٨.

[١٥٥] بڕوانە: (المغني) ج٣ص٤٨١، وە بڕوانە: (المجموع) ج٨ص١٧٧، کە گوتوویەتی: (أمات حديث عاصم بن عدي فرواه أبوداود والنسائي والترمذي وابن ماجة وغيرهم بأسانيد صحيحة..).

[١٥٦] بڕوانـە: (المغـني والشـرح الكبـير) ج٣ص٤٨٥، وە بڕوانـە: (المجمـوع) ج٨ص١٨٥، وە: (الفقه الأسلامي) ج٣ص٢٢٠٦.

* (عن أبن عباس رضي الله عنهما قال: أمِرَ الناسُ أن يكون آخر عَهْدِهِمْ بالبَيْتِ إلا أنَّـه خُفِّفَ عن الحائِضِ) متفق عليه.

واته: خەڵکی فەرمانیان پێکراوە کە دوایین کار – بەر لەگەڕانەوەیان – بریتی بێ لە طەوافی ماڵ – ی خوا –.

(عن ابن عباس رضي الله عنهما قال: كان الناس ينصرفون من كل وَجْهٍ، فقال رسول الله ﷺ: لايَنْفِرَنَّ أحدٌ حتّى يكون آخِرَ عَهْدِهِ بالبَيْت) رواه مسلم.

واته: خەڵکی – پاش تەواوکردنی ئەرکەکانی حەج – عادەتیان وابوو بەهەموو لایان دا دەڕۆیشتن. جا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: با هیچ کەس نەڕوات – و حەرەم بەجێنەهێڵێ – هەتا دوایین شت ماڵی خوا دەبێ.

* (عن عمر رضي الله عنه قال: مَنْ حَجَّ البَيتَ فليكن آخر عهده بالبيت، إلاّ الحُيَّضَ، ورَخَّصَ لهنَّ رسولُ الله ﷺ) رواه النسائي والترمذي والحاكم والشافعي وقال الترمذي: حديث حسن صحيح.

واته: هەرکەسێك حەجی ماڵی خوای کرد با دوایین شت کەبەجێی دەهێڵێ ماڵی خوا بێت، جگە لەحەیزداران، ئەویش پێغەمبەری خوا ﷺ مۆڵەتی داون.

کەواتە:

تێکڕای حاجی‌یان پێویستە طەوافی خوا حافیزی لەماڵی خوا بکەن بەرلەوەی مەککە بەجێبهێڵن دوای ئەوەی کارو پێویستی‌یەکانیان تەواو بوون، بەڵام ئافرەتی زەیستان یان حەیزدار، مادام پێشتر طەوافی پایە (طواف الركن)ی کردبێ، طەوافی خوا حافیزی لەسەر نیەو فیدیەشی ناکەوێتە سەرێ،[١٥٧] بەپێچەوانەی پیاوانەوە کە بەهۆی چواندنی ئەم طەوافەوە فیدیەیان دەکەوێتە سەر، وەك چواندنی هەر فەرزێکی دیکەی حەج.



[١٥٧] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

## سێ: سوننەتەکانی حەج:

خوێنەری بەڕێز ! پێشتر باسمان کرد کە جیاوازی نێوان پایەو فەرز ئەوەیە کە هەبوونی سەرجەم پایەکان مەرجە بۆ دروست بونو بەرکەوتن (إجزاء)ی حەج، بەڵام هەبوونی فەرزەکان مەرج نیە، ئەوەندە هەیە بۆ پڕکردنەوەی کەلێنی هەر فەرزێك فیدیە پێویستە.

جیاوازی نێوان فەرزو سوننەتیش ئەوەیە کە چواندنی سوننەت تەنیا لەدەست دانی خێرو پاداشتێکی زیادەیەو پێویستی بەفیدیە نیە بۆ قەرەبوو کردنەوەی.

جا ئەوە ئێمە لەخوارەوە بەڕیز (ترتیب) بەسەرژمێری سوننەتەکانی حەج دا دێین، کە سەرجەم چلو نۆ (٤٩) سوننەتنو لە نۆ (٩) برگەدا دەیانخەینەڕوو:

**یەکەم: سوننەتەکانی ئیحرام بەستن:**

١-دانانی جلوبەرگی ئاساییو خۆشۆردن:

چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ وای کردوە، وەك ئەم دەقە دەلالەتی لەسەر دەکات:

* **(عن زيد بن ثابت رضي الله عنه أنه رأىٰ النبيَّ ﷺ تجرَّدَ لأهْلالِهِ وَاْغْتَسَلَ)** رواه الترمذي وصححه الألباني.

٢-بۆنی خۆش لەجەستەدان پێش پۆشینی بەرگی ئیحرام:

چونکە (عائشة) خوالێیڕازیبێ گوتوویەتی: **(كنت أُطَيِّبُ رسولَ الله ﷺ لأحرامِهِ حين يُحْـرِمُ، ولِحِلِّهِ قبل أن يطوفَ بالبيتَ)** رواه الستة (اي البخاري ومسلم واصحاب السنن)

٣-لەخۆوە پێچانی دوو پەشتەماڵی سپی بۆ سەرو پشتێندو خوار پشتێند:

چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ وای کردوە، وەك ئەم دوو فەرموودەیە دەیگەیەنن:

*(**عن ابن عباس رضي الله عنهما قال: إنطلق النبيُّ ﷺ من المدينة بعدما تَرَجَّل وأدَّهَنَ ولَبِسَ إزارهُ ورداءَهُ هو وأصحابُهُ**) رواه البخاري.

واتە: پێغەمبەر ﷺ پاش ئەوەی قژی شانەکردو چەورکرد وە خۆیو هاوەڵانی یەکی بەدوو پەشتەماڵ – خۆیانیان پۆشی لەمەدینە وەڕێکەوتو دەرچوو.

وە بەڵگەی ئەوەش کە پەسەند وایە بەرگی ئیحرام سپی بێت ئەم فەرموودەیەیە:

* (**إلْبَسوا من ثيابكُمْ البياضَ، فانها من خير ثيابكم وكَفِّنوا فيـها موتـاكُمْ**) رواه ابوداود وابن ماجة والترمذي وصححه الألباني.

واتە: پۆشاکی سپی دەبەر بکەن، چونکە باشترین جۆرە پۆشاکتانە، وە مردووەکانیشتانی پێ کفن بکەن.

٤-دەنگ هەڵێنان بەگوتنی (تلبية):

چونکە پێغەمبەر ﷺ لەحەجیماڵئاوایی دا فەرموویەتی: (أتاني جبريلُ فـأمرني أنْ آمُـرَ أصْحـابي أنْ يَرْفَعـوا أصْواتَـهُمْ بـالأهْلالِ أو التلبيـة) رواه اصحاب السنن. عن السائب بن خلاد، واتـه: جوبرائیل هاتە لام و فەرمانی پێکردم کە فەرمان بەهاوەڵانم بکەم دەنگیان بەئیحرام بەستن یان بەگوتنی: (لبيك اللهم لبيك لبيك لاشريك لك لبيك ان الحمد والنعمة لك والملك لاشريك لـك) بەرزبکەنەوە.

٥-گوتنی (سبحان الله) و (الحمدالله) و (الله اكبر) بەر لەدەنگ بەرزکردنـەوە بـە بەسـتنی ئیحرام: چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ وای کردوە وەك (أنَسْ) خوالێیڕازیبێ گێڕاویەتەوە:

*(صَلَّى رسولُ الله ﷺ ونحن بالمدينة الظُّهْرَ أربعاً والعَصْرَ بذي الحُلَيفة ركعتين، ثم بات بها حتـى أصْبَح، ثُمَّ رَكِبَ حتى آستوتْ به علىُ البَيْداءِ حَمِدَالله وسَبَّح وكبرَّ، ثُمَّ أهلَّ بحَجٍ وعُمْرَةٍ) رواه البخاري.

واتە: ئێمە جارێ هەر لەمەدینەدا بووین پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی نیوەڕۆی بەچوار ڕکات کرد وە – نوێژی – ئێوارەشی لە (ذوالحليفة) بەدوو ڕکات کرد وە شەویش لەوێبوو هەتا بەیانی، پاشان سـوار – ی وڵاخەکـەی – بـوو هـەتا کـاتێك کـە گەیشـتە دەشـت (الحمدالله) و (سبحان الله) و (الله اكبر) ی کرد، پاشان بەدەنگی بەرز نیەتی حەج و عومرەی هێنا.

٦-نیەت هێنان بەدەنگی بەرزو ڕووەو کابە (کەعبە):

چونکە (نافع) لەوبارەوە گێڕاویەتەوە: (كان ابن عمر – رضي الله عنهما – اذا صلّى بالغَداةِ بذي الحُلَيْفة أمَرَ بِراحلته فَرُحِّلَتْ ثم رَكِبَ، فاذا آستوتْ بهِ آستَقْبَلَ القبلةَ قائماً ثم يُلـبِّي.. وزَعَـمَ أن رسولَ الله ﷺ فَعَلَ ذلك) رواه البخاري.

واتـە: عـەبدوڵڵای کـوڕی عومـەر – خـوا لێیـان ڕازی بـێ – دوای ئـەوەی نوێـژی بـەیانی لـە (ذوالحليفة) دەکرد، فەرمانی دەکرد کە وڵاخەکەی بۆ جل بکەن، جا جل دەکراو پاشان سـوار دەبوو، وەکـاتێك دەچووە سـەر پشـتی ڕێـك ڕوو بەقیبلـە دەوەسـتا پاشـان نیـەتی دەهێناو دەستی بە (تلبية) دەکرد.. وە دەیگوت کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوای کردوە.

دووەم: سوننەتەکانی چوونە نێو شاری مەککەوە:

١و٢- خۆشوردن بۆ چوونە نێو مـەککەو بەڕۆژ چوونە نێوی:

چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ بەوشێوەیەی کردوە، وەك ئەم دەقە دەلالەتی لەسەر دەکات: (عـن نافع قال: كان ابن عمر رض الله عنهما اذا دَخَلَ أدْنى الحَرَم أمْسَك عن التَلْبيةِ ثم يَبيتَ بذي طـوى ثم يصلي به الصُّبحَ ويَغتسِلُ، ويُحَدِّثُ أن النبيَّ ﷺ كانَ يَفْعَلُ ذلك) رواه البخاري ومسلم.

واتە: (ابن عمر) خوا لێیان ڕازیبێ کاتێك پێی دەنایە نێو حەرەم -ی مەککە -وە وازی لە (لَبَيك اللهم لبيك..) گوتن دەهێناو شەو لە (ذي طوى) دەمایەوە پاشان نوێژی بەیانی لەوێ دەکردو خۆی دەشۆری، وەباسی دەکرد کەپێغەمبەریش ﷺ هەروای کردوە.

٣-لە (الثَّنِيَّةَ العُلْيا) [108] وە چوونە نێو شاری مەککەوە:

چونکە (ابن عمر) خوا لێیان ڕازیبێ گێڕاویەتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ وای کـردوە: (كان رسول الله ﷺ يَدْخُلُ من الثَّنيةِ العُليا ويخرجُ من الثَّنيةِ السُّفْلَىٰ) رواه البخاري ومسلم والنسائي وابن ماجة.

٤- پێشخستنی لاقی ڕاست بۆچوونە نێو مزگەوتی حەرامەوەو خوێندنی چەند زیکرێکی تایبەت:

دیارە پێشخستنی پێی ڕاستو گوتنی: (أعوذُ بالله العظيم وبوجهِهِ الكريم، وسُلْطانِهِ القديم من الشيطان الرَّجيم، بسم الله، أللهمَّ صَلِّ على محمد وسَلِّمْ، اللهمَّ افْتح لي أبْوابَ رَحْمتِكَ)

واتە: (پەنا دەبەمە بەر خوای مەزن وە پەنا بەڕووی بەڕێزی دەگرم، وە بەدەستەڵاتی لەمێژینەی لەشەیتانی نەفرین لێکراو، بەناوی خوا، ئەی خوایە صەڵاتو سەلام بنێرە سەر موحەممەد، ئەی خوایە دەرگاکانی بەزەییتم بۆ ئاوەڵا بکەوە). ئەوە لەچوونە ژوورەوەی هەموو مزگەوتێـدا سوننەتە.

٥-دەست بەرزکردنەوەو دوعاکردن لەکاتی دیتنی ماڵی خوا (كعبة) دا:

(نووي) گوتوویەتی: [109] زۆربەو جەماوەری زانایان ڕایان وایە کە لەدەمی دیتنی ماڵی خوادا هەردوو دەست بەرەو ئاسمان بەرز بکرێنەوە، کە جگە لە (ابن عمر و ابن عباس) خوا لێیان ڕازیبێ، هەرکام لە (سفيان الثوري و ابن المبارك وشافعي وأحمد وإسحاق و ابن المنذر) یان لەنێودان، بەڵام (مالك) دەست بەرزکردنەوەی بەسوننەت نەزانیوە، جا هەرچەندە لەوبارەوە دوو دەق لەدەمی (جابر بن عبدالله) وە گێڕراونەوە کەپێچەوانەی یەکترن:

* (عن المهاجر المكي قال: سُئِلَ جابر بن عبدالله عن الرَّجُلِ الذي يرى البَيْتَ يرفَعُ يَدَيْه! فقال: ماكنت أرى أحداً يفعل هذا إلا اليهودَ، قد حَجَجْنا مع رسول الله ﷺ فلم يكن يَفْعَلُهُ) رواه ابوداود والنسائي باسناد حسن.

---

[108] وشەی (الثَّنِيَّة العُلْيا) لێرەدا مەبەست پێچو دەروازەیەکی شاخاوییە کە لەسەرووی شاری مەککەوەیە، (الثَّنِيَّة السُّفْلَىٰ)ش لەخوارەوەیەتی.

* هەندێك لەزانایانیش ڕایان وایە کە بەشەو باشترەو هەندێکیشیان ڕایان وایە کەشەوو ڕۆژ وەك یەکن. بڕوانە: (المجموع) ج٨ص٧، ٨.

[109] بڕوانە: (المجموع) ج٨ص١٠.

*(عن المهاجر المكي قال: سُئِلَ جابر بن عبدالله: أَيَرْفَعُ الرجُـلُ يَدَيْـهِ إذا رأى البيت؟ فقـال: حَجَجْنا مع النبي ﷺ فكُنا نَفْعَلُهُ) رواه الترمذي واسناده حسن.

بـەڵام وەك هـەركام لـە (بيـهقي و نـووي) گوتوويانـە: ڕای دەسـت بەرزكردنەوەكـە بەهێزترە.[160]

جا زانایان چەند جۆرە دووعایەكیان پێشنیار كردوون بۆ ئەوكاتە كە ئەمە یەكێكیانەو لەعومەرەوە خوا لێی ڕازی بێ گێڕراوەتەوە: (أللهمَّ أنت السلامُ ومنك السَلامُ فَحَيِّنَـا رَبَّنـا بالسَّـلام) رواه البيهقي بأسناد حسن.[161]

## سێیەم: سوننەتەكانی طەواف كردن:

پێشتر باسمان كردن كە جگە لە (مالك) و هەندێك لەزانایان زۆربەو جەماوەری زانایـان طـەوافی هاتنـە نێـو مەككـە (طـواف القـدوم) بەسـوننەت دەزانـن، بـەڵام (مـالك) بەفـەڕزی دەزانێ، جا ئەمانەی خوارێ سوننەتەكانی هەرجۆرە طـەوافێكن بەگشتی لەگـەڵ یـەك دوو وردە جیاوازیدا كە دوایی ڕوونیان دەكەینەوە:

١-دەرخستنی شان و قۆڵی ڕاست (الأضْطِباعْ):

كە بریتیـە لـەوەی پەشتەماڵەكەی سـەرو پشتێندی بـەجۆرێك لـێبكات كەشان و قۆڵـی ڕاستی بـەدەرەوە بێـت، ئـەویش بـەوە دەبێـت كە نێوەڕاسـتی پەشـتە ماڵەكـەی بخاتـە بـن هەنگڵی ڕاستی و ئەملاو لایەكانیشی هەڵبداتە سەرشانی چەپی.

بەڵگەی (اضطباع) یش چەند دەقێكە كە ئەمە یەكێكیانە:

* (عن أبي يَعْلى بن أمية رضي الله عنه أن رسـولَ الله ﷺ طـافَ بـالبَيْتِ مُضْطَبِعاً بِبُرد) رواه ابوداودوالترمذي وابن ماجة بأسانيد صحيحة وقال الترمذي: حسن صحيح.

واتـە: پێغەمبـەری خـوا ﷺ طـەوافی ماڵی خـوای كـرد بەشان و قۆڵـی ڕاسـت بـەدەرەوە بونەوە كە قوماشێكی خەت خەتی لەخۆی وەرگرتبوو.

٢-گوتنی (الله اكبر) و ئاماژەكردن بەدەستی ڕاست بۆ بەردە ڕەشەكە:[162]

چونكـە پێغەمبـەر ﷺ وای كـردوە، وەك (ابن عبـاس) خـوا لێیـان ڕازیبێ گێڕاویەتـەوە: (طاف النبي ﷺ بالبَيْتِ على بَعِيرٍ كلَّما أتى الرُّكْنَ أشارَ اليه بشيء كان عنده وكَـبَّرَ) رواه البخاري.

واتـە: پێغەمبـەر ﷺ بەسواری حوشـترەكەی طـەوافی ماڵـی خـوای كـرد، جـا هـەركاتێك دەگەیشتە لای گۆشە – ی بەردە ڕەشـەكە – بەشتێك كە لـەلای بـوو – واتـە بەدەستەیەوە بوو – ئاماژەی بۆ دەكردو (الله اكبر) ی دەكرد.



[160] بڕوانە: (المجموع) ج٨ص٩ تا ١١.

[161] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[162] بڕوانە: (المغني والشرح الكبير) ج٣ص٣٩٥، ٣٩٦.

٣-دەست گەیاندنە بەردە ڕەشەکەو ماچ کردنیو سەجدە لەسەر بردنی ئەگەر بۆی لوا:
ئەمەش چەند دەقێك لەوبارەوە:

* (عن ابن عمر رضي الله عنه قال: رأيتُ رسول الله ﷺ حين يَقْدِمُ مكة اذا آستَلَمَ الركن الأسود أول مايطوف يَخُبُّ ثلاثة أطْوافٍ من السّبْعِ) متفق عليه.

واتە: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی کاتێك کەهاتە مەککە، کە لەیەکەمین طەوافیدا پاش دەست لەبەردە ڕەشەدان سێ سووڕ لەحەوتەکان بەخێرایی ڕۆیشت.

*(عن زيد بن أسلم عن أبيه قال: رأيت عمر بن الخطاب رضي الله عنه قَبَّلَ الحَجَر وقال: لَوْلا أنّي رأيتُ رسولَ الله قَبّلك ما قَبّلْتُكَ) متفق عليه ورواه أصحاب السنن أيضاً.

واتە: عومەری کوڕی خەتتابم خوا لێیڕازیبێ دی کە بەردەکەی ماچ کردو گوتی: ئەگەر لەبەرئەوە نەبووایە پێغەمبەری خوام دیوە ماچی کردووی ماچم نە دەکردی.

*(عن ابن عمر رضي الله عنهما قال: رأيت عمر بن الخطاب قَبّلَ الحجر وسَجَدَ عليه، ثم عاد فَقَبَّلَهُ وسَجَدَ عليه، ثم قال: هكذا رأيتُ رسولَ الله ﷺ) رواه البزار وحسنه الالباني في إرواء الغليل،

واتە:، عومەری کوڕی خەتتابم دی بەردە ڕەشەکەی ماچ کردو سەجدەی لەسەر برد، پاشان گەڕایەوەو ماچیکردو سەجدەی لەسەر بردو، ئنجا گوتی: پێغەمبەری خوام ﷺ ئاوا بینی.

٤- دەست گەیاندنە گۆشەی یەمانی:

چونکە (ابن عمر) خوا لێیان ڕازی بێ گوتوویەتی: (لَمْ أرَ النبيَّ ﷺ يَسْتلِمُ من البَيْتِ إلاّ الرُكنين اليَمانِيَّيْنِ) متفق عليه، واتە: پێغەمبەرم ﷺ نەبینی دەست لەهیچ شوێنێکی ماڵی خوا بدات جگە لەدوو گۆشەکەی یەمانی.

( کە ئەو دوو گۆشەیەن کە کەوتوونەتە لای یەمەنو یەکێکیان بەردەڕەشەکەی تێدایەو بەگۆشەڕەشەکە (الركن الأسود)یش ناسراوە).

٥- پاڕانەوەو زیکرکردن لەکاتی طەواف دا بەگشتیو بەتایبەت لەنێوان دوو گۆشەکانی یەمانیدا:

زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە هەرچەندە دروستە لەکاتی طەواف دا قسەی ئاسایی بکرێ بەڵام چاکتر وایە مەگەر قسەی پێویست ئەگەرنا جگە لەپاڕانەوەو زیکرو قورئان خوێندن بابای طەواف کەر بەهیچی دیکەوە سەرگەرم نەبێت، بەتایبەت لەنێوان دوو گۆشەکان (بين الركنين)دا سوننەتە ئەم دووعایە بڵێ: (ربّنا آتنا في الدنيا حَسَنَةً وفي الآخرة حَسَنة وقِنا عَذاب النار) چونکە (عبدالله بن السائب) خوالێیڕازی بێ گێڕاویەتەوە: (سَمِعْتُ رسول الله ﷺ يقول بين الركنين: ربَّنا آتِنا في الدنيا حسنة وفي الآخرة حسنة وقنا عذاب النار) رواه أبوداود والنسائي وهو حديث حسن.

٦-خێرا ڕۆیشتن و هەنگاوی ورد لەسێ سووڕی پێشەوەدا:

یەکێ دیکە لەسوننەتەکانی طەوافی دەوری ماڵی خوا ئەوەیە کە لەسووڕی یەکەم و دووەم و سێیەم دا لەبەردە ڕەشەوە تا دەگاتەوە بەردە ڕەشە بەخێرایی هەنگاوی ورد بڕوات، بەڵام چوار سووڕەکانی دیکە بەڕۆیشتن و هەنگاوی ئاسایی بڕوات، لەو بارەشەوە فەرمووده زۆرن، بۆ وێنە:

* (عن جابر رضي الله عنه قال: رأيتُ رسول الله ﷺ رَمَلَ من الحَجَرِ الأسْوَدْ حتَّى انتَهَى اليه ثلاثة أطْواف) رواه مسلم والنسائي والدارمي.

*(عن ابن عمر رضي الله عنهمات قال: رَمَلَ رسولُ الله ﷺ من الحَجَرِ الى الحَجَرِ ثَلاثاً ومشىٰ أرْبَعاً) رواه مسلم وابن ماجة؛ جا هەرچەندە زانایان لەبارەی ئەوەوە کە ئایا ڕۆیشتنی خێرا (رَمَلْ) لەچ جۆرە طەوافێك دا سوننەتە؟ ڕایان جیاوازە،[١٦٣] بەڵام هەموویان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە لەطەوافی خوا حافیزی (طواف الوداع) و طەوافی سوننەت (طواف التطوع) دا سوننەت نیەو، زۆربەشیان[١٦٤] ڕایان وایە کە تەنیا لەطەوافێکدا سوننەتە کەهاتن و چوون (سعي)ی نێوان صەفاو مەروەی بەدوادا بێت، هەروەها زۆربەیان دەڵێن لەطەوافی یەکەمدا سوننەتە، وە هەموشیان یان بەلای کەمەوە زۆربەی هەرەزۆریان ڕایان وایە کە (رَمَلْ) بۆ ئافرەتان سوننەت نیە.[١٦٥]

٧-کردنی دوو ڕکات نوێژ پاش تەواوبوونی طەواف لەپشت (مقام ابراهيم): چونکە (ابن عمر) خوا لێیان ڕازیبێ گێڕاویەتەوە: (قَدِمَ رسولُ الله ﷺ فطاف بالبيتِ سَبْعاً ثم صلَّى خَلْفَ المَقامِ ركعتينِ وطاف بين الصفا والمروة) رواه البخاري. (ماناکەی ڕوونە).

٨- بەر لەدەست کردن بەدوو ڕکاتەکەی ئەوە بخوێنێتەوە: (واتَّخِذوا من مقام ابراهيم مُصلًّى) وە لەدوو ڕکاتەکان دا پاش فاتیحە هەرکام لە (الكافرون) و (الأخلاص) بخوێنێ، چونکە (جابر) خوا لێی ڕازیبێ گێڕاویەتەوە: (أن رسول الله ﷺ لما انتهى الى مقام ابراهيم عليه السلام قرأ: (واتخذوا من مقام ابراهيم صلى) ثم صلى ركعتين وكان يقرأ فيهما، (قل هو الله أحد) و (قل يا أيها الكافرون)) رواه مسلم.

دیارە پێشتریش باسمان کرد کە هەندێك لەزانایان ئەم دوو ڕکاتەی دوای طەواف بەفەرز دەزانن، بەڵام ڕای بەسوننەت دانانی کەڕای زۆربەی زانایانە بەهێزترە.[١٦٦]

---

[١٦٣] بڕوانە: (المجموع) ج٨ص٤٤تا٤٩، وە بڕوانە: (الفقه الأسلامي) ج٣ ص٢٢٢٥، ٢٢٢٦، ط٤.

[١٦٤] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[١٦٥] (ابن المنذر) گوتوویەتی: (اجمع العلماء على أن المرأة لاترمَلُ ولاتَسْعى بل تمشي) بڕوانە: (المجموع) ج٨ص٦٤، وە بڕوانە: (المغني) ج٣ص٣٩٢.

[١٦٦] بڕوانە: (المجموع) ج٨ص٦٧.

۹- خواردنەوە لەئاوی زەمزەم:

چونکە پێغەمبەر ﷺ وەك (جابر بن عبدالله) خوالێی ڕازی بێ گێڕاویەتەوەو (مسلم) لە (جامع الصحیح) ەکەیدا هێناویەتی وای کردوە، واتە: پاش تەواوکردنی طەواف لەئاوی زەمزەمی نۆش کردوە، وە لەبارەی ئاوی زەمزەمەوە فەرموویەتی:

*(خیر ماء علی الأرض زَمْزَمْ فیه طعام الطُعْمِ وشفاء السُّقْمِ) رواه الطبراني في الكبیر وابن حبان وقال المنذري رواته ثقاتٌ.

واتە: باشترین ئاو لەسەر ڕووی زەمین ئاوی زەمزەمە جێگای خواردن دەگرێ و شیفای نەخۆشی یە.

**چوارەم: سوننەتەکانی هاتن و چوون (سعي) نێوان صەفاو مەڕوە:**

۱-ماچ کردن یان لانی کەم دەست لێدان (إستلام)ی بەردەڕەشە، ئەگەر نەلوا ئاماژە بۆکردنی بەدەست یان بەگۆچان و وێنەی ئەوە:

بەڵگەی ئەم سوننەتەش ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ وای کردوە وەك (جابر) خوا لێی ڕازی بێ گێڕاویەتەوە: (ثم رَجَعَ الی الركنِ فاَستَلَمَهُ، ثم خَرَجَ الی الصَّفا..) رواه مسلم.

واتە: پاشان - دوای ئەوەی دوو ڕکاتی دوای طەوافی کردن گەڕایەوە بۆ لای گۆشەی بەردەڕەشەکەو دەستی گەیاندێ، ئنجا بەرەو صەفا چوو...

۲-پاش نیزیك بوونەوە لەصەفا خوێندنی: (ان الصَّفا والمروة من شعائر الله فَمَنْ حجَّ البَیْتَ أو آعتمر فَلا جُناحَ علیه أَن یطوف بهما ومن تطوع خیراً فان الله شاكرٌ علیم) وەك (مسلم) لە (جابر بن عبدالله) ەوە گێڕاویەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ وای کردوە.

۳- سەرکەوتنە سەر صەفاو ڕووکردنە قیبلەو گوتنی ئەم زیکرانە:

(لا اله الا الله، الله اکبر) (لا اله الا الله وحده لا شریك له له الملكُ ولَهُ الحمدُ یحي ویمیت وهوعلی کلّ شيء قدیر، لا اله الا الله وحده، انجَزَ وَعْدَهُ ونَصَرَ عَبْدَهُ وهَزَمَ الاحزابَ وَحدَهُ)

واتە: بێجگە لەخوا هیچ پەستراوێك نییە، خوا گەورەترە، جگە لەخوا چ پەستراو نین تاکەو هاوبەشی نیە موڵك هەر هی ویەو ستایش هەر شایستەی ویە، دەژیەنێ و دەمرێنێ، وە ئەو لەسەر هەموو شتێك بەتوانایە، جگە لە خوا هیچ پەستراو نین و تاکە، بەڵێنی خۆی بردەسەرێ و بەندەکەی خۆی سەرخست و بەتەنیا هەموو کۆمەڵەکانی - کوفری - تێك شکاند.

سێ جار ئەم زیکرانە دووبارە دەکاتەوەو لەنێوانیشیان دا دەپاڕێتەوە، (جابر) خوای لێ ڕازی بێ ئاوای لەپێغەمبەر ﷺ گێڕاوەتەوە وەك (مسلم ونسائي) لە کتێبەکانیان دا هێناویانە.[۱٦۷]

---

[۱٦۷] هەمان سەرچاوەو بەرگ ص۷۱.

٤- هاتن و چوونی نێوان صەفاو مەروە بەرۆیشتنی ئاسایی دەبێ بەڵام لەنێوان دوو نیشانە سەوزەکاندا سوننەتە بەگورگەلۆقە (واتە خێراتر) لەرۆیشتنی خێراو هێواشتر لە (ڕاکردن) بڕوات؛ چونکە پێغەمبەر ﷺ وای کردوە، دیارە ئەمەش لە سەرجەم هاتن و چوونەکان دا دەبێ، واتە لەهەر حەوت هاتن و چوونەکانی نێوان صەفاو مەروەدا، (جابر) خوا لێی ڕازی بێ لەوبارەوە گێڕاویەتەوە:

(ثم نَزَلَ الىٰ المَرْوةِ حتى اذا انْصَبَّتْ قَدَماهُ في بَطْنِ الوادي سَعىٰ، حتى إذا صَعِدْنا مَشىٰ حتّىٰ أتىٰ المَرْوَةَ) رواه مسلم.

واتە: پاشان بەرەو مەروە دابەزی هەتا کاتێك کە پێیەکانی بەرەو قووڵایی دۆڵەکە شۆڕبوونەوە گورگە لۆقەی کرد، هەتا کاتێك کە بەرەو مەروە سەرکەوتینەوە ئەوجار بەرۆیشتن ڕۆیشت تا گەیشتە مەروە. دیارە گورگە لۆقە (هرولة) ی (سعي) یش وەك خێرا ڕۆیشتن (رَمَل)ی طەواف بەرای زۆربەی زانایان تایبەتە بەپیاوانەوەو بۆ ئافرەتان سوننەت نیە، بەڵام هەندێك لەزانایان ئەگەر چۆڵ بێ بۆ ئەوانیش بەسوننەتی دەزانن.[١٦٨]

هەروەها بێجگە لەشافیعی یەکان هیچ کام لەزانایان (إضطباع) بۆ (سعي) بەسوننەت نازانن و ، ڕای شافیعی یەکانیش چونکە دەقی لەسەر نیەو لەسەر بناغەی (قیاس) دامەزراوە بێ هێزەو شتێکی ئەو تۆ نیە.[١٦٩]

٥- دووبارەکردنەوەی هەموو ئەو شتانەی کە لەسەر صەفا کراون؛ لەسەر مەروەش، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ وای کردووە، وەك (جابر) گێڕاویەتەوە:

(حتى أتى المَرْوَةَ، فَعَلَ على المَرْوَةِ كَما فَعَلَ على الصَّفا) رواه مسلم، واتە: هەتا هاتە مەروە، جا چی لەسەر صەفا کردبوو لەسەر مەروەش ئاوای کرد.

٦-هەڵبەتە بێجگە لەوانەی ڕابردن سەرجەم زانایان لەسەر چەند شتێکی دیکەش ڕێك کەوتوون کەسوننەتن: وەك:

ا- بەدوای یەك دا هاتن (موالاة)ی طەواف و هاتن و چوون (سعي)

ب-دەستنوێژ هەبوون و جەستەو پۆشاك خاوێن بوون.

ج-بەپیادە ئەنجام دانی نەك بەسواری، کە ئەمە لە طەوافیش دا هەر سوننەتە.

د-بەدوای یەکدا هاتن و لێك نەپچڕاندنی هاتن و چوونەکان (أشواط).

دیارە هەمووشیان فەرمووده ڕاست (صحیح)ەکان دەلالەتیان لەسەر دەکەن بەتایبەت فەرموودەکەی (جابر) کە (مسلم) هێناویەتی.

---

[١٦٨] بڕوانە: (المجموع) ج٨ص٨٠.

[١٦٩] بڕوانە: (المجموع) ج٨ص٨٠، ٨١، وە بڕوانە: (الفقه الأسلامي) ج٣ص٢٢٢٦، ط٤.

**پێنجەم: سوننەتەکانی دەرچوون بەرەو مینا:**

١- ئیحرام بەستن بەحەج لەرۆژی هەشتەمدا کە بە (یوم التروية) ناسراوە:

چونکە (جابر) خوا لێی ڕازیبێ گێڕاویەتەوە: (فلمّا كان يوم التَّرْوِيَةِ توجَّهوا الى مِنىً فـاهلُّوا بـالحَجِّ..) رواه مسلم، واتە: جا کەرۆژی تەرویە (هەشتەمی مانگی "ذوالحجة") هات - هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ خوا لێیان ڕازیبێ - ڕوویان کردە میناو دەنگیان بەنیەت هێنان بۆ حەج کردن بەرزکردەوە.

٢-شەومانەوە لەمیناو کردنی نوێژەکانی نیوەڕۆ و ئێوارەو شێوانو خەوتنانو بەیانیو پاش خۆرکەوتن دەرچوون بەرەو عەرەفات:

چونکە پێغەمبەرو ﷺ هاوەڵانی بەڕێزی وایان کردوە، وەك لەم دەقەدا دەردەکەوێ:

* (وركِبَ رسول الله ﷺ فَصلى بِهِمْ الظُهرَ والعَصْرَ والمغرِبَ والعِشاءَ والفَجْرَ، ثم مكث قليـلاً حتـى طَلَعَتِ الشَمْسُ...) رواه مسلم.

واتە: وە پێغەمبەری خوا ﷺ سواربوو - بەرەو میناو لەوێ - نوێژەکانی نیوەڕۆو ئێوارەو شێوانو خەوتنانو بەیانی پێکردن، پاشان تۆزێك مایەوە تا خۆر هەڵهات...

**شەشەم: سوننەتەکانی ڕاوەستان لەعەرەفات:**

١-مانەوە لەنەمیرە (نَمِرة) هەتا کاتی لادانی خۆر (زوال الشمس) پاشان درانی دوو وتار، وەك ڕۆژی جومعە، پاشان بانگ درانو بەرپاکردنی هەردووك نوێژی نیوەڕۆو ئێوارە (عەصر) بەکۆمەڵو بەکۆکردنەوەو کورت کردنەوەو پێشخستن (جمعاً وقصراً وتقديماً) - واتە هێنانی ئێوارە بۆلای نیوەڕۆ -، چونکە پێغەمبەر ﷺ وای کردوە، وەك (جابر) خوا لێیڕازی بێ گێڕاویەتەوە:

(وأمَرَ بِقُبَّةٍ مِنْ شَعرٍ تُضْرَبُ لَهُ بِنَمِرةٍ... فأَجازَ رسولُ الله ﷺ حتـى أتَـىُ عرَفَـةَ فَوَجَـد القُبَّـة قـدْ ضُرِبَتْ لَهُ بنمِرة فَنَزَلَ بها، حتى إذا زاغتِ الشَمْسُ أَمَرَ بالقَصْواءِ فَرُحِّلَتْ لَهُ، فاتى بَطْنَ الوادي فَخَطَبَ النّاسَ... ثم أَذَّنَ ثم أقامَ فَصلى الظهر، ثم أقامَ فَصلى العَصْرَ ولم يُصَلِّ بينهما شَيْئاً) رواه مسلم.

واتە: وە - پێغەمبەر ﷺ - فەرمانی کرد کە چادرێکی لەموو چنراوی لەنەمیرە بۆ هەڵبدرێ... جا پێغەمبەری خوا هاتو -لەموزدەلیفە - ڕەت بو هەتا گەیشتە عەرەفات، لەوێش چادرەکەی لەنەمیرە بۆ هەڵدرابوو چووە نێوی، هەتا کاتێك کە خۆر لای‌دا فەرمانی کرد حوشترەکەیان بۆ جل کرد، جا هاتە (بطن الوادي) وە وتاری بۆ خەڵکیدا.. پاشان

بانگ دراو قامەت کرا وەنوێژی نیوەڕۆی - بەخەڵکی - کرد، دوایی قامەت کراو نوێژی ئێوارە (عصر)یشی کرد، وە لەنێوانیان دا هیچ نوێژی نەکرد.

وە ئەوە کە دەبێ وتاری عەرەفات - واتە ئەو وتارەی کە لە (نَمِرَة) دەدرێ - دووان بێ تێکڕا یان بە لای کەمەوە زۆربەی هەرە زۆری زانایان لەسەری یەك دەنگن چونکە (جابر) خوا لێی ڕازی بێ گێڕاویەتەوە: **(أن النبي ﷺ خَطَبَ يوم عرفة، وقال: إن دِماءَكُمْ وأمْوالكم حَـرامٌ عليكم الىٰ آخِرِ خُطْبَتِه..)** رواه مسلم،[170] واتە: بێگومان پێغەمبەر ﷺ ڕۆژی عەرەفات وتاریدا، وە فەرمووی: دڵنیابن کە خوێنتان‌و سامانتان لێتان حەرامە - واتە بەشێوەی ناشەرعی - .. هەتا کۆتایی دوو وتارەکانی..

٢-خۆشۆردن (ألأغتسال) لەنەمیەو بەرلەوەی بچێتە عەرەفات‌و بوەستێ:

چونکە (ابن عمر) خوا لەخۆی‌و بابی ڕازی‌بێ وای کردوەو ئاشکراشە کە (ابن عمر لەسەرچاولێکردنی پێغەمبەر ﷺ و جێبەجێکردنی سوننەتەکانی زۆر مکووڕ (حريص) بووە، بەڵگەی ئەوەش کە (عبدالله بن عمر) بۆ ڕاوەستان لەعەرەفات خۆی شۆردوە، ئەوەیە کە هەرکام لە (مالك) و (بيهقي) گێڕاویانەتەوە: **(عن نافع أنَّ عبدالله ابن عمر كان يغتسلُ لأحْرامِهِ قبل أن يُحْرِمَ، و لِدُخولِهِ مكة ولِوُقوفِهِ عَشِيَّةَ عَرَفَةَ)**،[171] واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر - خوا لێیان ڕازی بێ - عادەتی وابوو بۆ ئیحرام بەستنی پێش ئیحرامەکەی خۆی دەشۆرد، وە بۆ چوونە مەککەوە، وە بۆ ڕاوەستان - لەعەرەفات - دوای نیوەڕۆی ڕۆژی وەستان لەعەرەفات.

٣-وە سوننەتە ڕاوەستانەکە لەنزیك (صخرات)ەوە بێ، هەرچەندە هەموو عەرەفات هەر شوێنە بۆ ڕاوەستان:

وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: **(عَرَفَـةُ كلُّها مَوْقِفٌ)** رواه[172] البيهقي عن ابن عباس رضي الله عنهما. بەڵگەی ئەوەش کە لەنزیك (صخرات) ەوە وەستان باشترە ئەوەیە کە (جابر) خوا لێی ڕازی بێ گێڕاویەتەوە: **(وقَفَ عند الصَّخْراتِ وجَعَلَ بطن ناقته الى الصخراتِ)** رواه مسلم، وەك پێشتریش باسمان کروە.

---

[170] بڕوانە: (المجموع) ج٨ص٩٥، وە بڕوانە: (الفقه الأسلامي) ج٣ص٢٢٤٠. ط٤.

[171] بڕوانە: (الوطا) ص٣٢٧، وە: (المجموع) ج٨ص٩٧.

[172] هەروەها (مسلم)یش گێڕاویەتەوە، بڕوانە: (المجموع)، ج٨ص١٠٠.

٤-هەروەها سوننەتە ڕاوەستانەکە ڕووبە قیبلە بێ: چونکە (مسلم)[173] لە (جابر) ی گێڕاوەتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ بەرەو قیبلە ڕاوەستاوە.

٥- وە سوننەتە بەسواری ڕابوەستێ: چونکە پێغەمبەر ﷺ بەسواری وەستاوە، هەروەها وا باشە بەڕۆژوو نەبێ حیکمەتی بەسواری وەستان‌و بەڕۆژوو نەبوونیش لەو کاتەدا ئەوەیە کە بۆ طاعەت‌و پاڕانەوەو لالآنەوەی ئەو ڕۆژە موبارەکە بەهێزو پێزتر بێت، بەڵگەی ئەم دووانەش ئەم دەقەیە:

(عن ام الفضل بنت الحارث رضي الله عنها أنَّ الناسَ تَمارَوا عندها يوم عرفة في رسولِ الله ﷺ، فقال بَعْضُهمْ: هو صائمٌ، و قال بَعْضُهمْ: لَيس بصائمٍ فارْسَلَتْ اليه أمُّ الفَضلِ بِقَدحِ لَبنٍ وهو واقِفٌ على بَعيرِ فَشَرِبَ) رواه البخاري ومسلم ومالك وأبوداود والبيهقي.

واتە: خەڵکی لەڕۆژی عەرەفەدا لەلای (أم الفضل) دەربارەی پێغەمبەری خوا ﷺ کەوتنە مشت‌ومڕەوە، هەندێکیان گوتیان بەڕۆژوویەو هەندێکیشیان گوتیان بەڕۆژوو نییە، جا(ام الفضل) قاپە شیرێکی بۆ نارد لەکاتێکدا کە بەسواری حوشتر ڕاوەستابوو خواردیەوە.

٦-وە سوننەتێکی دیکەی گەورەو گرنگی ڕاوەستان لە عەرەفات ئەوەیە کە بابای حاجی زۆر بەکوڵ‌و بەدڵگەرمییەوە سەرگەرمی دووعاو پاڕانەوەو لالآنەوەو کڕووزانەوە بێ.

جا هەرچەندە زانایان چەند جۆرە پاڕانەوەیەکیان کە واباشە لەو ڕۆژەدا بگوترێن، گێڕانەوە، بەڵام فەرموودەناسانی وەك (ترمذي) و (نووي) بە بێهێز (ضعيف)یان داناون، کە ئەمە یەکێکیانە:

(خَيرُ الدعاءِ دعاءُ يوم عرفة، وخير ماقُلْتُ أنا والنَبيوُنَ من قَبْلي، لا اله الا الله وحدهُ لاشريك لَهُ، لَهُ الملك ولَهُ الحَمْدُ وهو على كل شئٍ قدير) رواه مالك في الموطأ والترمذي والبيهقي، وضعفه الترمذي والبيهقي والنووي[174].

دیارە زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە هەموو جۆرەکانی پاڕانەوەو زیکرو قورئان خوێندن‌و صەڵات‌و سەلام ناردن بۆ پێغەمبەر ﷺ و (تلبية) کردن‌و.. هتد خێرو سوننەتن، وە بێگومان چاکترین طاعەتی خوای پەروەردگارن لەو حاڵ‌و کات‌و شوێنەداو، وا باشە هەموو جۆرەکانیان بڵێ، هەرتاوە یەکێکیان،[175] وە واباشە بەگریان‌و بەکوڵ‌و دڵگەرمییەوە بێت چونکە ڕاوەستان لەعەرەفات پایەی بنەڕەتی‌و مەزنی حەجەو کاکڵەی

---

[173] بروانە: (المجموع) ج٨ص١٠٠، وە بروانە: (الفقه الأسلامي) ج٣ص٢٢٤٠، ط٤.

[174] بروانە: (الموطا) ص٣٥٧، ٣٥٨.

[175] بروانە: (المجموع) ج٨ص١٠٧تا١١١، وە: (الفقه الأسلامي) ج٣ص٢٢٤٠تا٢٢٤٣.

لەعـەرەفات وەسـتانیش پاڕانـەوەو زیکـرو لالأنـەوەو گریانـە کـە لوتکـەی هـەرە بـەرزی خواپەرستیی و بەندایەتیی و طاعەتن.

پێغەمبەر ﷺ لەبارەی گەورەیی و پلەو پایەی ڕۆژی عەرەفەوە فەرموویەتی: (مامن يَوم أكثر أن يَعتِقَ الله فيه عَبداً من النار مِنْ يوم عرفةِ وانه لَيدْنُو ثم يُباهي بهم الملائكةَ فيقول: ما ارادَ هؤلاء!) رواه مسلم عن عائشة رضي الله عنها.

واتـە: لـەهیچ ڕۆژێك دا خـوا هێندەی ڕۆژی عەرەفە بەندەکانی لەئاگری دۆزەخ قوتـارو ئازاد ناکات، وە بێگومان لێیان نیزیك دەکەوێتەوە پاشان شانازییان پێوە دەکات لـەلای فریشتەکانیی و، دەفەرموێ: ئەمانە چییان دەوێ؟! (مەبەست ئەوەیە کە هەر داوایەکیان هەبێ جیٚبەجێ دەکرێ و وەلام دەدرێتەوە).

٧- هەروەها سوننەتە کە لەو ڕۆژەدا بابای حاجی خۆی بخاتە بەر هەتاوو نەچێتە ژێر سـێبەرە مەگـەر عوزرێکـی بـەجێی هـەبێ، وەك ئـەوەی بەتیشـکی ڕۆژ تووشـی زیـان ببـێ، یـان پاڕانەوەو زیکری باش بۆ نەکرێ،[١٧٦] چونکە پێغەمبـەری خـوا ﷺ لـەو ڕۆژەدا نەچۆتـە بـن سێبەرو سێبەری لێنەکراوە، بەلام لەشوێنی دیکەدا سێبەری لـێکراوە، وەك لـەم دەقـەدا دەردەکەوێ: (عن أمِّ الحصين رضي الله عنهما أن النبي ﷺ ظُلِّلَ عليه بِثَوْبٍ وهـو يَرْمـي الجَمـرَةَ) رواه مسلم وأبوداود والبيهقي.[١٧٧]

واتە: پێغەمبەر ﷺ لەکاتێك دا کە بەردووچکەی دەهاویشتن بۆ جەمرە – ی گەورە – بە پۆشاکێك سێبەری لـێکرابوو.

## حەوتەم: سوننەتەکانی هاتنە خوار لەعەرەفات و شەومانەوە لە موزدەلیفە:

١-لەعـەرەفات هاتنە خوار پاش خۆرئاوابوون بەئارامیی و هێمنییەوە:

بەڵگەی هاتنەخوار لەعەرەفات (الأفاضة من عرفات) پاش خۆر ئاوابوون ئەم دەقەیە کە (جابر) خوالێیڕازیبێ گێڕاویەتەوە: (عـن جـابر أن رسـول الله ﷺ لم يَـزَلْ واقِفـاً حتَّـى غَرَبـت الشمسُ وذهبـتِ الصُّفْـرَةُ قليـلاً حتـى غـابَ القُـرْصُ) رواه مسلم. واتـە: پێغەمبـەری خـوا ﷺ هـەر بەردەوام بوو لەسەر ڕاوەستانی لەعەرەفات هەتا خۆر ئاوابوو وە تۆزێك زەردەش ڕۆیشت تا بەتەواوی خودی خۆر ون بوو.

[١٧٦] بڕوانە: (المجموع) ج٨ص١١٠، ١١١.

[١٧٧] هەمان سەرچاوەو بەرگ و لاپەڕە.

وە بەڵگەی ئارامیو هێمنیش لەکاتی داگەڕان لەعەرەفاتەوە ئەو دەقەیە کە (ابن عباس) خوا لێیان ڕازی بێ گێڕ اویەتەوە: (عن أبن عباس عن الفضْلِ وكان رديف رسول الله ﷺ أنه قـال في عشية عَرَفة وغداة جَمْعٍ للناس حين دفَعُوا: عليكم بالسَّكينة وهو كافٍ ناقَتـهُ..) رواه مسلم واحمد وابوداود والبيهقي وابن خزيمة.

واتـە: (فَضْل)ی کوڕی (عبـاس) خوا لێیـان ڕازیبـێ کـە لەپشـت پێغەمبـەری خـواوە ﷺ سـواربووە گێڕاویەتەوە کە لەئێوارەی ڕۆژی عەرەفەو بەرەبەیانی کۆبوونـەوەی خەڵکیدا – لەموزدەلیفە – کاتێك بەرەو مینا چوو ون فەرموویەتی: ئارامو هێمن بن، وە لەوکاتەشدا جڵەوی حووشترەکەی خۆی توند کردبوو.

٢-بەرپاکردنی هەردووك نوێژی شێوانو خەوتنان بەکۆکراوەییو کورتکراوەیی (جمعاً وقصراً):

چونکە (بخاري ومسلم) لەکۆمەڵێك لەهاوەڵان وەك: (ابن مسعود و ابن عمر وابن عباس و ابو ايـوب الأنصـاري و اسـامة بـن زيـد و جـابر)[١٧٨] خـوا لێیـان ڕازی بـن گێڕاویانەتـەوە کـە پێغەمبەری خوا ﷺ لەموزدەلیفە هـەردووك نوێـژی شێوانو خـەوتنانی بـەوجۆرە کـردوون، بۆوێنە ئەو فەرموودەیەی کە (بخاري) لە (ابن عمر)ەوە هێناویەتی دەڵێ:[١٧٩] (صلَّى المغـربَ والعشـاءَ بالمزدلفـة جَمْعـاً) وە ئـەوەیان کـە (بخـاري ومسـلم) لـە (ابوايـوب الأنصـاري)يـەوە هێناویانە دەڵێ: (أنَّهُ صلَّى مع رسول الله ﷺ في حجة الوداع المغرب والعشاء بالمُزدَلِفَة).[١٨٠]

٣-بەرپاکردنی نوێژی بەیانی لەسەرەتای کاتەکەیەوە (في أول وقتها):

چونکە پێغەمبـەری خـوا ﷺ وای کردوە وەك (بخـاري ومسـلم) لـە (ابـن مسـعود) یـان گێڕاوەتەوە خوا لێیڕازیبێ: (عن عبدالله بن مسعود رضي الله عنـه قـال: مـارأيتُ رسـول الله ﷺ صلى صلاة الا لميقاتِها الا المغرب والعِشـاءَ بِجَمْعٍ وصـلاة الفجـر يومئـذٍ قبـل ميقاتـها) دیـارە وەك زانایـانی سوننەتناسـیش گوتوویانـە: مەبەسـت لـە (قبـل ميقاتـها) ئـەوە نیـە کـە بـانگ نـەبووبێو بکرێ، بـەڵکو ئەوەیـە کـە بـەزوویی بکـرێو دوا نـەخرێ، هەربۆیـەش (مسـلم) لەکتێبەکەی خۆیدا لەژێر سەرباسی: (باب إستِحباب زيادة التغليس بصلاة الصبح يوم النحر بالمزدلفة والمبالغة فيه بعد تُحقق طلوع الفجر) دا ئەو فەرموودەیەی (ابن مسعود)ی هێناوە بۆئەوەی هیچ کەس بەهەڵە لێیحاڵی نەبێت.

[١٧٨] بڕوانە: (المجموع) ج٨ص١١٦.

[١٧٩] بڕوانە: (المجموع) ج٨ص١١٤، پەراوێزەکەی.

[١٨٠] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٤-ڕاوەستان ڕووەو قیبلە پاڕانەوەی گەرمو گوڕو بەکوڵ لەبەر خواو زیکری جۆراوجۆر کردن:

بەڵگەی ئەمەش فەرموودەکەی (مسلم) ە کە لە (جابر بن عبدالله) ەوە گێڕاویەتەوە کە وەسفی حەجیماڵئاوایی پێغەمبەری خوای ﷺ پێکردوە کە لەبارەی چۆنیەتی ڕاوەستان لەموزدەلیفە گوتوویەتی: **(ثم رَكِبَ القَصْواء حتى أتى المَشْعر الحرامَ فَاسْتَقْبَلَ القِبْلَةَ فَدعاهُ وكَبَّرَهُ وهَلَّلَهُ ووَحَّدَهُ فَلَمْ يَزَلْ واقِفاً حَتىً أسْفَرَ جِداً)** واتە: پاشان سواری حووشترەکەی بوو هەتا هاتە لای (المشعر الحرام) جا ڕووی کردە قیبلەو لەخوا پاڕایەوەو (الله اکبر) ی کردو (لا الـه الا الله)ی فەرموو و خوای بەتاکو گرتو هەتا تەواو دنیا ڕووناك داهات ئاوا بە ڕاوەستاوی مایەوە.

خوای پەروەردگاریش دەربارەی پاڕانەوەو یادی خوا لەلای (المشعر الحرام) فەرموویەتی: (فَإِذَا أَفَضْتُمْ مِنْ عَرَفَاتٍ فَاذْكُرُوا اللَّهَ عِنْدَ الْمَشْعَرِ الْحَرَامِ) البقرة: ١٩٨.

٥-شۆڕبوونەوە بەرەو مینا بەر لەخۆر هەڵهاتن:

چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ لە (حجة الوداع) دا وای کردوە وەك (مسلم) لە (جابر بن عبدالله)ی گێڕاوەتەوە: **(فَدَفَعَ قَبْلَ أنْ تَطْلُعَ الشمسُ وأرْدَفَ الفَضْلَ بن عباس)** واتە: جا بەرلەوەی خۆر بکەوێ - بەرەو مینا - کەوتەڕێ، وە (فَضْل) ی کوڕی عەبباسیشی لەپشتەخۆیەوە سوار کرد.

٦- هەڵگرتنەوەی بەردووچکەکانی پێ بەرد باران کردنی سێ جەمرەکان:

کە وەك پێشتر باسمان کرد سەرجەم سوننەتە حەفتا (٧٠) بەردووچکە بن و فەرزیشە کە لەچل ونۆ (٤٩) دانە کەمتر نەبن، وە سوننەتە بەئەندازەی سەری پەنجە، یان دەنکە پاقلەی ئاسایی بن.

بەڵگەی سوننەت بوونی هەڵگرتنەوەی بەردووچکەکان لەموزدەلیفە ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کردوە کە لەوێ بۆی کۆبکەنەوە وەك لەم دەقەدا دەردەکەوێ: **(عن الفَضْلِ بن العباسِ أنَّ النبي ﷺ قال غَداةَ يوم النَّحْرِ إلْقُطْ لي حَصىً، فَلَقَطْتُ لَهُ حَصَياتٍ مثل حَصىْ الخَذْفِ)** اخرجه البيهقي باسناد صحيح، ورواه النسائي عن ابن عباس بلفظ قريب من هذا، ورواه احمد وابن ماجة والحاكم.[181]

[181] بڕوانە: (المجموع) ج٨ص١١٥، ١١٦، ١١٧.

واتە: پێغەمبەر ﷺ بەرەبەیانی ڕۆژی قوربانی سەربڕین فەرمووی: بەردووچکانم بۆ هەڵگرەوە، منیش ژمارەیەك بەردووچکەی وەك بەردووچکەی پەلە پیتکەم بۆ هەڵگرتنەوە.

٧-ڕۆیشتن بەئارامیو هێمنی بەرەو مینا جگە لەدۆڵی موحەسیر (وادي المُحَسِّرْ) کە سوننەتە بەخێرایی پێیدا تێپەڕین:

چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (أيُّها الناس عليكم السَّكِينَةُ فإن البِرَّ لَيْسَ بِالإِيْضَاعِ) رواه البخاري عن ابن عباس، واتە: خەڵکینە ئارام بن‌و هێمن بن چونکە خێرو چاکە خێرا ڕۆیشتن نیە.

بەڵگەی پەلەکردن‌و خێرا ڕۆیشتنیش لەکاتی ڕەت بوون بە (وادي المُحَسِّرْ)دا ئەو فەرموودەیەیە کە (مسلم) لە (جابر بن عبدالله)ی گێڕاوەتەوە.[182]

شایانی باسیشە کە وەك (نووي) گوتوویەتی:[183] ماوەی نێوان شاری مەککەو مینا فەرسەخێکەو، میناو موزدەلیفەش فەرسەخێك لەیەك دوورن‌و، موزدەلیفەو عەرەفاتیش بەهەمان شێوە فەرسەخێك لەیەك دوورن، دیارە فەرسەخیش سێ میلە کەواتە لەمەککەوە بۆ عەرەفات نۆ (٩) میلە.

هەروەها دۆڵ (شیو) ی موحەسسریش[184] پانییەکەی پێنج سەدو چل‌و پێنج (٥٤٥) باسك (ذراع) ە.[185]



[182] هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص١١٦، وە: (الفقه الأسلامي) ج٣ص١٢٢٥، ٢٢٥٣، ط٤.

[183] بڕوانە: (المجموع) ج٨ص١١٨.

[184] ئەو شیوەیە بۆیە ئەو ناوەی لێنراوە چونکە فیلەکانی ئەبرەهە کە هاتبوون بۆ ڕووخاندنی ماڵی خوا لەو شوێنە ماندوو بوون‌و پەکیان کەوتوە، وشەی (حَسَرَ وكَلَّ) ش یەك مانایان هەیە، بڕوانە: (المجموع) ج٨ص١١٧.

[185] هەمان سەرچاوەو بەرگ ص١١٧،(ذراع)یش (٤٦) سانتیمەترە، واتە دەوری نیو مەترە، بڕوانە: (الأدلة الرضية) ص٩٠.

## هەشتەم: سوننەتەکانی بەردووچکە هاویشتن بۆ جەمرەکان:

١-هاویشتنی بەردووچکەکان بەدەستی ڕاستو (الله اکبر) کردن لەگەڵ هەر بەردووچکەیەکدا:

چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ وای کردوە وەك (جابر) گێڕاویەتەوە: (أتى الجَمْرةَ يعني يوم النَّحرِ فرماها بِسَبْعِ حَصاتٍ يُكَبِّرُ مَعَ كُلِّ حَصاةٍ..) رواه مسلم.

٢- وە سوننەتە لەکاتی بەردووچکە هاویشاتنەکان دا مینا بخاتە لای ڕاستیو کابە بخاتە لای چەپی: بەڵگەی ئەم سوننەتەش ئەم دەقەیە[186]: (عن عبدالرحمن بن زيد أن عبدالله بن مسعودٍ – رضي الله عنه – انْتَهى الىٰ الجَمْرَةِ الكُبْرىٰ فَجَعَلَ البَيتَ عن يَسارِهِ ومِنىً عن يَمينِهِ ورَمىٰ بِسَبْعِ حَصَياتٍ ثم قال: هذا مَقامُ الَّذي أُنْزِلَتْ عليه سُورَةُ البقرةِ) رواه البخاري ومسلم.

واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود خوا لێیڕازیبێ گەیشتە لای جەمرەی گەورەو کابەی خستە لای چەپیو مینای خستە لای ڕاستیو حەوت بەردووچکەی هاویشتن، پاشان گوتی: ئێرە شوێنی – بەردووچکە لێهاویشتنی – ئەو کەسەیە کە سوورەتی (البقرة)ی بۆ سەر نێرراوەتە خوار.

٣-وە سوننەتە کەپاش بەردووچکە هاویشتن بۆ جەمرەی گچکەو نێوەندی، لەهەرسێك ڕۆژەکانی (أيام التشريق)دا، تۆزێك لەجەمرەکان دووربکەوێتەوە ئەوجار ڕوو بە قیبلە بوەستێو دەستەکانی بەرز بکاتەوەو بپاڕێتەوە، بەڵام جەمرەی گەورە پاڕانەوەی لەپاش نیەو، پاش بەردووچکە هاویشتنەکان یەکسەر بەجێی دەهێڵێ: ئەم دەقەش یەکێکە لەبەڵگەکانی ئەم سوننەتە:[187]

(عن سالِمٍ عن ابن عمر رضي الله عنهما أنه كان يَرمي الجَمْرَةَ الدنيا بِسَبْعِ حَصَياتٍ يُكَبِّرُ على إِثْرِ كَلِّ حَصاةٍ، ثم يتقدم حتى يُسْهِلَ فيقومُ مُسْتَقْبِلَ القبلةَ فيقومُ طويلاً، ويَدْعوا ويرفَعُ يَدَيْهِ، ثم يَرمي الوسْطىٰ، ثم يأخذ ذات الشِّمالِ فَيَستَهِلُ ويقومُ مُستقبلَ القِبلةَ، فيقومُ طويلاً ويَدْعو ويَرفَعُ يَدَيهِ، ثم يَرْمي الوسْطىٰ، ثم يأخذ ذات الشمال فَيستَهِلُ ويقومُ مُستقبل القبلة، فيقوم طويلاً ويَدْعو ويَرْفَعُ يَدَيْهِ ويقومُ طويلاً، ثم يَرْمي جَمرة ذات العَقَبةِ من بَطْنِ الوادي ولايقفُ عندها ثم ينصرِفُ فيقولُ: هكذا رأَيْتُ النبيَّ ﷺ يَفْعَلُهُ) رواه البخاري.

---

[186] بڕوانە: (فتح الباري) ج٤ص٤١٠.

[187] هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص٤١٣.

واتە: (ابن عمر) عادەتی وا بوو کە حەوت بەردووچکەی بە جەمرەی نیزیك دا[188] دەدان لەپاش هەر بەردووچکەیەك (الله اكبر) ی دەکرد، دوایی دەچوە پێش هەتا دەگەیشتە دەشتایی ئنجا بەرەو قیبلە ماوەیەکی درێژ ڕادەوەستا، وە دەپاڕایەوەو دەستەکانی بەرز دەکردنەوە، پاشان جەمرەی نێوەنجی بەردووچکە باران دەکرد ئەوجار لای چەپی دەگرتو دەچووە دەشتایی وە بەرەو قیبلە ڕادەوەستاو ماوەیەکی زۆر ڕادەوەستاو دەپاڕایەوەو دەستی بەرز دەکردنەوەو زۆر دەمایەوە، پاشان لەلای خوارەوەی شیوەکەوە جەمرەی عەقەبەی بەردووچکە باران دەکردو لەلای ڕانەدەوەستا، دوایی دەڕۆیو دەیگوت: پێغەمبەری خوام ﷺ دی ئاوای دەکرد.

## نۆیەم: وتاردانە سوننەتەکانی حەج:

زانایان دوای ئەوەی لەسەر ئەوە یەکدەنگ بوو ون کەوتاردانەکانی حەج هەموویان سوننەتنو فەرز نین،[189] لەبارەی ژمارەی ئەو وتارانەوە ڕایان جیاوازە، هەندێکیان[190] وەك شافیعییەکانو (داود الظاهري) دەڵێن: چوارن، یەکەمیان لەڕۆژی حەوتەمی (ذوالحجة) دایە لەمەککە، دووەمیان لەڕۆژی عەرەفەدایە لەمزگەوتی نەمیرە، سێیەمیان لەڕۆژی قوربانی سەربڕین دایە لەمینا، چوارەمیشیان لەڕۆژی دوازدەیەم دایە هەر لەمینا.

(ابو حنيفة و مالك)[191]یش ڕایان وایە وتارەکانی حەج سێن: وتاری ڕۆژی حەوتەمو نۆیەمو سێزدەیەم.

(احمد)[192]یش ڕای وایە کە سێن: ڕۆژی حەوتەمو نۆیەمو دوازدەیەم.

(زُفَر)[193]یش پێی وایە کە وتارەکانی حەج سێن، بەڵام لەڕۆژانی هەشتەمو نۆیەمو دەیەم دا دەدرێن.

---

[188] بۆیە بەجەمرەی یەکەم دەگوترێ (الجمرة الدنيا) چونکە لەدووەکانی دیکە لەمیناوە نیزیکترە.

[189] بڕوانە: (المهذب) للشيرازي، لە: (المجموع) ج٨ص٨٣، وە: (الفقه الأسلامي) ج٣ص٢٢٧٣، ٢٢٧٤.

[190] بڕوانە: (المجموع) ج٨ص٩٢.

[191] بڕوانە: هەمان سەرچاوەو بەرگو لاپەڕە.

تێبینی: خاوەنی: (الفقه الأسلامي..) ج٣ص٢٢٧٦، تووشی هەڵەیەك بووە لەوەدا کەڕۆژی یازدەیەمی بەدووەمین ڕۆژی (ايام التشريق) داناوە، کە لەڕاستیدا یەکەم ڕۆژیانە، لەوەدا کە وای زانیوە هەرکام لەشافیعییەکانو حەنبەلییەکانو حەنەفیو مالیکییەکان لەڕۆژی یازدەیەمی (ذوالحجة) دا وتاردان بەسوننەت دەزانن! بەڵام ئەوەش هەڵەیەو شافیعیو حەنبەلییەکان ڕۆژی دوازدەو حەنەفیو مالیکییەکانیش ڕۆژی سێزدەیەم بەڕۆژی و[illegible]ان دەزانن، بڕوانە: (المجموع) ج٨ص٩٢، وە: (المغني) ج٣ص٤٨٢.

[192] بڕوانە: (المجموع) ج٨ص٩٢، ٩٣.

جا ئێمە لەسۆنگەی ئەوەوە کە ڕای یەکەم (کە ڕای شافیعی‌یەکان‌و ظاهیری‌یەکانە)مان لەڕووی بەڵگەوە پێ لەڕایەکانی دیکە بەهێزترە، بەپێی ئەو ڕایە وتارە سوننەتەکانی حەج باس دەکەین:

١-وتاردانی ڕۆژی حەوتەمی (ذوالحجة):

بەڵگەی ئەم وتارەش ئەوەیە کە (ابن عمر) خوا لێیان ڕازی بێ گێڕاویەتەوە:

(كان رسول الله ﷺ إذا كان قبل التروية بِيَوْمٍ خطب الناسَ وأخْبَرَهُمْ بِمَنَاسِكِهِمْ) رواه البيهقي باسناد جيد كما قال النووي.

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژێك بەر لەڕۆژی (ترویة) وتاری بۆ خەڵکی دەداو خواپەرستی‌یەکانی حەجی پێڕا دەگەیاندن.

شایانی باسە کە ئەم وتارە لەشاری مەککە لەمزگەوتی حەرام دا دەدرێ، وە هەم ئەو وتارەو هەم سەرجەم وتارەکانی دیکەش لەلایەن ئەو کەسەوە دەدرێن کە بڕا گەورە یان سەرپەرشتی کەرو مشوور خۆری حەجی مسوڵمانانە.[١٩٤]

وە لە هەرکام لەو وتارانەدا پێویستە وتاربێژ وێڕای ئامۆژگاری گشتی مسوڵمانان حوکم‌و یاساکانی ئەو کردەوەو ڕەفتارانەی حەجیان بۆ ڕوون بکاتەوە کە لەپێشیانەوەن.

وە بێجگە لەوتاردانی ڕۆژی عەرەفە لەمزگەوتی نەمیرە کەدوو وتارن، ئەوانی دیکە هەموویان یەك یەکن‌و هەمووشیان لەپاش نوێژی نیوەڕۆ دەبن،[١٩٥] بەڵام ئەوەی عەرەفات لەپێشیەوە دەبێ.

٢-وتاردانی ڕۆژی نۆیەمی (ذوالحجة) کە ڕۆژی عەرەفەیە:

کەپێشتر باسمان کردو ڕوونمان کردەوە کە دوو وتارن‌و وەك وتارەکانی ڕۆژی جومعەش دەخرێنە پێش نوێژەکانی نیوەڕۆو ئێوارەوە کە بەکورتکراوەیی‌و کۆکراوەیی‌و پێشخران (قصراً وجمعاً وتقديماً) دەکرێن.

---

[١٩٣] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[١٩٤] هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص٨٧.

[١٩٥] بڕوانە: (المجموع) ج٨ص٨٦.

٣-وتاردانی ڕۆژی دەیەم، ڕۆژی قوربانی سەربڕین و جەژن:

دەقی سوننەتیش لەسەر سوننەت بوونی ئەم وتاردانەش زۆرن کە ئەمە یەکێکیانە:[١٩٦]

* (عن ابن عباس رضي الله عنهما أن رسول الله ﷺ خَطَبَ الناسَ يوم النَّحْرِ فقال: يا أيها الناسُ أي يومٍ هذا؟ قالوا: يومٌ حَرامٌ، قال: فأيُّ بَلَدٍ هذا؟ قالوا: بَلَدٌ حَرامٌ، قال: فأيُّ شَهرٍ هذا: قالوا: شَهْرٌ حَرامٌ، قال: فانَّ دِماءَ كُمْ وأموالكم وأعراضكم عليكم حرامٌ كَحُرمةِ يومكم هذا في بلدكم هذا في شهركم هذا، فاعادها مراراً، ثم رفع رأسهُ، فقال: أللهم هل بَلَّغْتُ؟ أللهُمَّ هل بَلَّغْتُ؟ قال ابن عباس رضي الله عنهما: فَوَالذي نَفْسي بِيَدِهِ إنَّها لَوصيَّتُهُ الیٰ أُمَّتِه، فَلْيُبَلِّغِ الشاهِدُ الغائِبَ: لاتَرجِعُوا بَعْدي كُفّاراً يَضْرِبُ بعضكُمْ رِقابَ بَعْضٍ) رواه البخاري.

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژی قوربانی سەربڕین وتاری بۆ خەڵکی داو فەرمووی ئەرێ ئەی خەڵکینە ئەمڕۆ چ ڕۆژێکە؟ گوتیان: ڕۆژێکی حەرامە، فەرمووی: ئەدی ئەم وڵاتە چ وڵاتێکە؟ گوتیان: وڵاتێکی حەرامە، فەرمووی: ئەی ئەم مانگە چ مانگێکە؟ گوتیان: مانگێکی حەرامە، فەرمووی: دەجا دڵنیابن کە خوێنتان و سامانتان و ئابڕووتان لەسەر یەکتر حەرامە وەك حەرامی ئەم ڕۆژەتان لەم وڵاتەتان داو لەم مانگەتان دا، چەند جارێك وە ئەم قسەیەی دووبارە کردەوە، پاشان سەری بڵند کردو فەرمووی: ئەی خوایە ئایا پێم ڕاگەیاندن؟ ئەی خوایە ئایا پێم ڕاگەیاندن؟

(ابن عباس) خوالێیان ڕازیبێ دەڵێ: جا سوێند بەو زاتەی گیانمی بەدەستە ئەمە وەصیەتی ئەوبوو بۆ ئوممەتەکەی و با ئەوەی لێرە ئامادەیە بەوانە ڕابگەیەنێ کە لێرەدا نین -فەرمووی- : دوای من خۆتان کافر مەکەنەوە هەندێکتان لەگەردنی هەندێکتان بدەن!.

٤-وتاردانی ڕۆژی دوازدەیەمی (ذوالحجة):

بەڵگەی ئەم وتاردانەش چەند دەقێکی سوننەتەبۆ وێنە:

* (عن عبدالله بن أبي نجيح عن أبيه عن رجلين من بني بكر قالا: رَأَيْنا رسولَ الله ﷺ يَخْطُبُ أَيّامَ التشريقِ ونحن عند راحلته وهي خطبة رسول الله ﷺ التي خَطَبَ بِمِنیٰ) رواه ابوداود باسناد صحيح.

واتە: پێغەمبەری خوامان ﷺ بینی کە ئێمە لەلای حوشترەکەی بووین، لە ڕۆژەکانی تەشریق دا[١٩٧] وتاری دەدا، وە ئەو وتارە ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەمینادا دای.

---

[١٩٦] بڕوانە: (فتح الباري شرح صحيح البخاري) ج٤ص٤٠١.

[١٩٧] لەباسی (ڕۆژووگرتن و ئیعتیکاف) دا پێناسەی (أيام التشريق) مان کردوە.

*(عن سَرَّاء بنتِ نَبْهان الصَّحابية رضي الله عنها قالَتْ: خَطَبنا رسول الله ﷺ يوم الـرؤسِ، فقـال: أي يوم هذا؟ قُلْنا: الله وَرسولُهُ أعْلَمُ، قال: ألَيْسَ أوْسَطَ ايام التشريق؟) رواه ابوداود باسناد حسن.

واتـه: پێغەمبەری خوا ﷺ لەڕۆژی سەران[198] (ڕۆس) دا وتـاری بـۆ دایـن‌و فـەرمووی: ئەمڕۆ چ ڕۆژێکە؟ گوتمـان: خـواو پێغەمبەرەکـەی زانـاترن، فـەرمووی: ئایـا نێوەڕاسـتی ڕۆژەکانی تەشریق نیە؟

ئاشکرایە کە ڕۆژەکانی تەشریق (ایام التشريق) بەڕای[199] زۆربەی هەرەزۆری زانایـان سـێ (٣)ن‌و نێوەڕاستەکەشیان ڕۆژی دووەمـە، کـە دەکاتـە ڕۆژی دوازدەیـەمی مـانگی (ذوالحجة).



## تێبینی:

(نووي) گوتوویـەتی:[200] "ڕۆژانی تێدا ئەنجام درانی خواپەرستیەکانی حەج (مناسك الحج) حەوتن: یەکەمیان ڕۆژی حەوتەمی (ذوالحجة)یە لـەپاش خۆرلادان (زوال الشمس) ەوەو، ڕۆژی کۆتاییشیان ڕۆژی سـێزدەیەمە لـەپاش خـۆر لادانــەوە، کەدوایـین ڕۆژی (أيام التشريق)ە".

جا هەرچی ڕۆژی حەوتەمی (ذوالحجة)یە ناوێکی تایبەتی نیە، بەڵام ڕۆژی هەشتەمی وەك پێشتر باس کرا پـێی دەگوتـرێ ڕۆژی تەرویـە (یـوم الترویـة)،[201] نۆیەمیشـیان ڕۆژی عەرەفەیە، دەیەمیش ڕۆژی قوربانی سەربڕینە، یازدەیـەمیش پـێی دەگوتـرێ (یـوم القَرّ) چونکە لـەو ڕۆژەدا حاجیـیان لـەمینادا سـەقامگیر یـان نیشـتەجێ دەبـن‌و ئـارام دەگـرن، دوازدەیـەمیش ڕۆژی بارکردن‌و کۆچکردنـی یەکـەم (یـوم النَّفْـرِ الأول)ەو، سـێزدەیەمیش ڕۆژی کۆچ و باری دووەم (یوم النَّفْرِ الثاني) ە.

ameer.maktab@yahoo.com
 /AliBapir  /AliBapir 
www.alibapir.net

[198] بۆیە ئەو ناوەی لێنراوە چونکە لەو ڕۆژەدا حاجیـیان عادەتیان وا بووە سەروپێی قوربانیـیەکانیان خواردوە، بڕوانە: (المجموع) ج٨ص٩٥، پەراوێز.

[199] پێشتر ئەو مسەلەیەمان ڕوون کردۆتەوە، لەباسی ڕۆژووگرتن دا.

[200] بڕوانە: (المجموع) ج٨ص٨٦، ٨٧.

[201] پێشتر پێناسەی (یوم التروية) مان کردوە.

## دووەم: پایەو فەرزو سوننەتەکانی عومرە

خوێنەری بەڕێز! لەسۆنگەی ئەوەوە کە کردەوەکانی عومرە وەك پێشتر باسمان کرد تەنیا چوارن (ئیحرام بەستن و طەواف و سەعی و سەری خۆتاشین یان کورت کردنەوە) وە لەباسی (پایەو فەرزو سوننەتەکانی حەج)یش بەوردی باسی ئەو کردەوانەمان کرد، لێرەدا پێویست بەدووبارە کردنەوەو درێژە پێدان ناکات، چونکە هەموو ئەو شتانەی کە لەکردەوەکانی حەج دا فەرز یان سوننەتن، لەعومرەش دا مەگەر بەدەگمەن ئەگەرنا بەهەمان شێوەن.

کەواتە لێرەدا هەر بەکورتی پایەو فەرزەکانی عومرە دەخەینەڕوو:

### پایەکانی عومرە:

زانایان لەبارەی پایەکانی عومرەوە ڕایان جیاوازە، هەیانە تەنیا (طەواف) بەپایەی عومرە دەزانیو کردەوەکانی دیکەی بەفەرزو سوننەت دادەنێ، وە هەشیانە هەر چوار کردەوەکانی بەپایە دەزانێ![202]

بەڵام واپێدەچێ ئەو ڕایەی کە دەڵێ:

١- ئیحرام بەستن.

٢- طواف کردن (سووڕانەوە بەدەوری کەعبەدا حەوت جاران).

٣- هاتنو چوونی نێوان صەفاو مەروە.

سێ پایەکانی عومرەن، لەهەموو ڕایەکانی دیکە ڕاست ترو بەڵگەدار تر بێت.

### فەرزەکانی عومرە:

فەرزەکانی عومرەش ئەم دووانەن:

١-ئیحرام بەستن لەمیقات.

٢-سەری خۆتاشین یان کورت کردنەوەی (الحَلْق أو التقصير).

شایانی باسیشە کە پیاوو ئافرەت لەعومرەدا جیاوازییان نیە مەگەر لەپۆشاکی ئیحرام دا، وە حەجو عومرەش وەك یەکن لەو شتانەدا کە ئیحرامیان پێدەشکێو حەجو عومرەیان پێهەڵدەوەشێتەوە، یان حەجو عومرەیان پێهەڵناوەشێتەوە بەڵام قەدەغەنو فیدیە پێویست دەکەن.

---

[202] بڕوانە: (المفصل) ٣٧١، وە: (الوجيز في فقه السنه والكتاب العزيز) ص٢٦٠، ٢٦١.

وە پێغەمبەری خوا ﷺ لەژیانیدا بەس یەك حەجی کردوە کە حەجی ماڵئاوایی بووە، بەڵام چوار عومرەی کردوون، وەك (بخاري) لەهەرکام لە (ابن عمر و عائشة و انس بن مالك) ەوە خوالێیان ڕازیبێ گێڕاویەتەوە، کە ئەمە یەکێك لەو ڕیوایەتانەیە:

*(عن قتادة سألْتُ أنساً رضي الله عنه كَمْ اعتمر النبي ﷺ؟ قال: أربَعٌ: عمرة الحُدَيْبية في ذي القعدة حيث صَدَّهُ المشركون، وعمرةٌ من العام المُقْبِلِ في ذي القعدة حيث صالحهم، وعمرة الجِعْرانَة اذ قسم غنيمة – أُراهُ – حُنَيْن، قلتُ: كَمْ حَجَّ؟ قال: واحِدةً) رواه البخاري.[203]

واتە: لەئەنەسم پرسی – خوا لێیڕازیبێ – پێغەمبەر ﷺ چەند عومرەی کردوون؟ گوتی چوار عومرەن: -یەکەمیان – عومرەی حودەیبییە لە (ذوالقعدة)دا کە هاوبەشی پەیداکەرەکان گێڕایانەوە، وە – دووەمیان – عومرەیەك لەساڵی داهاتوودا هەر لەمانگی (ذوالقعدة)دا کە لەگەڵیان – واتە لەگەڵ هاوبەشی بۆ خوادانەرەکان دا – ڕێك کەوتبوو، وە –سێیەمیان – عومرەی جیعرانە کە دەستکەوتی – لام وایە – حونەینی دابەش کرد، – (قتادة) دەڵێ – گوتم: چەند حەجی کردوون؟ گوتی: یەکێك.

جا دیارە ئەنەس بەڕواڵەت بەس سێ عومرەی باس کردوون، بەڵام وەك (الحافظ ابن حجر العسقلاني) گوتوویەتی:[204] وا دیارە ئەنەس خوا لێیڕازیبێ ئەو عومرەیەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ حەجی ماڵئاواییدا کردوویەتی لەبەر زێدە ئاشکرابوون و زانرانی بەپێویستی نەزانیوە باسی بکات.

جا خوێنەری خۆشەویست!

لێرەدا کۆتایی بەم بەندی چوارەمە دێنن کە لەڕاستیدا گەورەترین و گرنگترین باس و بابەتەکانی چوارەمین درووشمی خواپەرستی (حەج و عومرە) پێك دێنێ و بەکاکڵەو جەهەوری بەندەکانی دیکە دادەنرێ، وە بەپشتیوانی خوا دەچینە سەر توێژینەوەو باسی بەندی پێنجەم (ئەو شتانەی کە لەماوەی ئیحرام دا قەدەغەن).



[203] بڕوانە: (فتح الباري) ج٤ص٤٣٥.

[204] بڕوانە: هەمان سەرچاوە بەرگ، ص٤٣٥، ٤٣٦.

# بەندی پێنجەم
## ئەو شتانەی کە لەماوەی ئیحرام[1] حەرامن

ئەو شتانەی کە لەماوەی ئیحـرام دا لـەبابای حـاجیو عومرەکـەر (الحـاج والمعتمـر) قەدەغە (محظور)ن بەگشتی پێنج جۆرن:

١-پۆشینی بەرگو پۆشاکی ئاسایی کە تەقەڵو دروومان یان جێدار (بدیـل) ی ئـەوی هەبێ وەك قۆپچەو زریزەو قرتینە (لُبْسُ المخيط و مافي معناهُ)[205].

٢-خزمەت کردنی جەستە (ترفیه البدن) بەهەرشێوەیەك لەشێوەکان، وەك خۆ بۆنخۆش کردنو لابردنی موو و کردنی نینۆكو .. هتد.

٣-لەگەڵ هاوسەردا جووت بون (جمـاع الزوجـة) کـە ئەمـەیان وێـڕای قەدەغـەبوونی مایەی تێکدانو هەڵوەشاندنەوەی حەجو عومرەشە.

٤-هەر قسەو کردەوەیەکی لەخودی خۆیدا خراپ، یان لەگەڵ کەشوهـەوا (منـاخ) ی حەجو عومرەدا نەگونجاو، وەك: دم بەدەمـەو شەڕەقسـە (جـدال) و جنێـو گاڵتـە پـێکردن (إستهزاء) و نازاردان، وە قسەو باسی جینسیو دەستبازی لەگـەڵ هاوسـەرداو خوازبێنـی ژنو مارەکردنیو لـێمارەکرانی.

٥-ڕاووشکار (الصَّيد) و کوشتنی هەر گیـانداریك جگـە لەوانـەی کەشـەرع ڕێیداوە بکوژرێن.

جا ئێستا با لەبەر تیشکی چەند دەقێکی قورئانو سوننەت دا هەرکام لەو پێنج شتانە بتوێژینەوەو روون بکەینەوە:



[205] بڕوانە: (المجموع) ج٧ص٢٢٨، ٢٢٩، کە گوتوویەتی: (وانما يحرم عليه لبس المخيط وماڤي معناه)، واتە: وە بێگومان تەنیا پۆشینی شتی دووراوو هەرشتێك کەوەك وی بێ، لێیقەدەغەکراوە. (ئاشکراشە کە قۆپچەو زیرزەو قرتینەو... هتد لەڕیزی تەقەڵو درووماننو وەك وینو جێدار (بدیل)ی وین بۆیە هەمان حوکمیان هەیە)، ئەمەش زانایان لەسەری یەکدەنگن، بڕوانە: (الفقه الأسلامي) ج٣ص٢٢٩٣.

## ١-پۆشینی بەرگ و پۆشاکی ئاسایی تەقەڵدار (لُبْسُ المَخيْط):

ئەمە چەند دەقێك لەوبارەوە:

*(عن ابن عمر رضي الله عنهما أن رجلاً قال: يا رسول الله مايَلْبَسُ المُحْـرِمُ مـن الثيـابِ؟ قـال رسول الله ﷺ: لايَلْبَسُ القُمصَ ولاالعمائمَ ولا السَّـراويلات ولا البرانِسَ ولا الخِفـافَ، الا أحدٌ لايجـدُ نَعْلَين فَلْيَلْبَسْ خُفَّيْنِ وليقطَعْهُما أسْفَلَ من الكَعْبَيْنِ، ولاتَلْبَسـوا مِـنَ الثيـابِ شَيئاً مَسَّـهُ زَعْفَـرانٌ أو وَرْسٌ) رواه البخاري ومسلم وابوداود والنسائي.

جا لەبەر ئەوەی ئێمە لەسەرەتای بەندی چوارەم دا ئەم فەرموودەیەمان تەرجەمە کردوەو شیکردۆتەوە لێرە دووبارەی ناکەینەوە، بەڵام پێویستە ئەوە بگوترێ کە زۆربەی[٢٠٦] هەرەزۆری زانایان لەسەر ئەوە رێك کەوتوون کە ئەگەر کەسێك نەعل و پەشتەماڵی چنگ نەکەوتن مۆڵەت دراوە کە پێڵاوو شەرواڵ دەپێ بکات بۆئەوەی دەستکاری‌یان بکات و بیان درێ، بەڵگەشیان ئەم دەقەیە:

*(عن ابن عباس رضي الله عنهما قال: سَمِعْتُ رسـول الله ﷺ يَخْطُبُ بِعَرَفـاتٍ: مَنْ لَمْ يَجِدِ النَّعلَيْنِ فَلْيَلْبَسِ الخُفَّيْنِ، ومَنْ لَمْ يَجِدْ إزاراً فَلْيَلْبَسْ سَراويلَ لِلمُحْرِمِ) رواه البخاري ومسلم واصحاب السنن الا ابن ماجة.

واتە: لەپێغەمبەری خوام ﷺ بیست کە لە عەرەفات وتاری دەدا : دەیفەرموو: هەرکەسێك دوو نەعلی چنگ ناکەون با دوو گۆرەوی چەرم (خُفّ) کە بێگومان پێڵاویش دەگرێتەوە دەپێ بکات، وە هەر کەسێك پەشتەماڵی خوار پشتێندی چنگ ناکەوێ باشەرواڵ دەپێ بکات، بۆ بابای ئیحرام گرتوو.

دیارە هەرکام لەسەرداپۆشین (تغطية الراس) بۆ پیاوی خاوەن ئیحرام و دەست و دەم و چاو داپۆشین (تغطية اليدين والوجه) ی ئافرەتی خاوەن ئیحرامیش قەدەغەن بەڵام بۆ ئافرەت ئەگەر مەترسی تەماشاکران (خوف الفتنة) ی هەبێ زۆربەی هەرەزۆری زانایان بەدروست (جائز)ی دەزانن کە رووی خۆی بپۆشێ، وە لەسەرەتای بەندی چوارەم دا ئەو مەسەلانەمان بە بەڵگەکانیانەوە خستوونەروو بۆیە لێرە دووبارەیان ناکەینەوە.

---

[٢٠٦] بڕوانە: (المجموع) ج٧ص٢٣٥، ٢٣٦ وە: (الفقه الأسلامي) ج٣ص٢٢٩٢، ٢٢٩٣. وە بڕوانە: (الوجيز..) ص٢٥١، وە: (المغني والشرح الكبير) ج٣ص٢٧٢تا ٢٧٥، بەڵام شایانی باسە کە بۆ گۆرەوی چەرم (خف) و پێڵاو زۆربە رایان وایە کەپێویستە هەتا خوار گوێزینگ ببڕێن ئەگەرنا فیدیەی دەکەوێتە سەر، هەرچەندە من پێم وایە رایەکەی دیکەی بەهێزترەو وەك لایەنگرانی ئەو رایەش گوتوویانە ئەو فەرموودەیەی کەباسی بڕین (قطع) ناکات مادام لە (عەرەفات) گوترابێ (ناسخ)ی ئەوەی پێشەوەیە کە بڕین (قطع)ی تێدایە، دەشتوانین بڵێین: بڕینی پێڵاوو (خُف) هەر سوننەتە ئەگینا بێ‌بڕینیش دروستن.

هەروەها سەرجەم زانایان لەسەر ئەوەش یەكدەنگن كە بابای خاوەن ئیحرام بۆی هەیە قایش یان هەر شتێكی دیكە بكاتە پشتێند بۆ بەستنەوەی پەشتەماڵی خوار پشتێنە (إزار) ی و هەڵگرتنی پارەو شتی وا،[207] وە لەسەر ئەوەش یەكدەنگن كە بۆ ی هەیە لەبەر برین یان سەرماو گەرما سەری داپۆشێ، بەڵام رایان وایە كە فیدیەی دەكەوێتە سەر،[208] چونكە خوای كاربەجێ فەرموویەتی: (فَمَنْ كَانَ مِنكُمْ مَرِيضًا أَوْ بِهِ أَذًى مِنْ رَأْسِهِ فَفِدْيَةٌ مِنْ صِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍ) البقرة: ١٩٦.

## ٢- خزمەت كردنی جەستە (ترفیه البدن) :

ئەمەش چەند دەقێك لەوبارەوە:

* (عن ابن عمر رضي الله عنهما قال: قام رَجُلٌ الى النبي ﷺ فقال: مَنِ الحاجُ؟ فقال: الشَعِثُ التَفِلُ) رواه الترمذي وابن ماجة.

واتە: پیاوێك هەستاو هاتە لای پێغەمبەر ﷺ و گوتی: حاجی كێیە؟! فەرمووی: بابای سەرو قژ هاڵۆزو چڵكنە.

لەم فەرموودەیەوە دەردەكەوێ كە هەر شتێك پێچەوانەی چڵكنیو قژ بڕژو ئاڵۆزبوونو دژوێن بوونو تۆزو خۆڵاویو ئارەقاوی بوون بێ، لەكاتی ئیحرام هەبوونی قەدەغەیە، هەربۆیەش تێكڕای زانایان خۆبۆنخۆش كردنو موو لەخۆكردنەوەو نینۆك كردنیان بەحەرامو، بەشێكیشیان خۆشۆردنیان بەمەبەستی پاكوخاوێنی دیسان بە قەدەغە زانیوە، خوای پەروەردگاریش لەوبارەوە فەرموویەتی: (ثُمَّ لِيَقْضُوا تَفَثَهُمْ وَلْيُوفُوا نُذُورَهُمْ وَلْيَطَّوَّفُوا بِالْبَيْتِ الْعَتِيقِ) الحج: ٢٩، واتە: پاشان با بەهۆی ئیحرام شكاندنی یەكەمەوە (التحلل الأصغر) - چڵكو چەپەریان لابەرن، (مەبەست سەرتاشینو نینۆك كردنو خۆشۆردنو خۆگۆڕینە) وەبا قوربانییەكانیان سەرببڕن، وە با طەوافی ماڵی لەمێژینە ی خوا - بكەن.

لەم ئایەتە بەپێزەشەوە دەردەكەوێ كە هەتا دوای ئیحرام شكاندن خزمەتكردنی جەستەو پاكو خاوێن كردنەوەی بەهەر شێوەیەك بێ پێچەوانەی حاڵەتی لەئیحرام دا بوونە، چونكە وشەی (تَفَثْ) بەمانای چڵكو چەپەرو تۆزو خۆڵ ودژوێنی دێ.[209]

---

[207] بڕوانە: (المجموع) ج٧ص٢٢٩، كە گوتوویەتی: (ولَهُ ان يتقلّد المصحف وحمائل السيف وان يَشُدَّ الهميان والمنطقة في وسطه ويلبس الخاتم ولا خلاف في جواز هذا كُلِّه.. و به قال العلماء كافة الا ابن عمر في أصح الروايتين عنه فكرهها)، وە بڕوانە: (المغني..) ج٣ص٢٧٧تا٢٧٩.

[208] بڕوانە: (المجموع) ج٧ص٢٣٢، وە بڕوانە: (الفقه الأسلامي) ج٣ص٢٢٩٦، ط٤.

[209] بڕوانە: (المعجم الوسيط) وشەی (تَفَثْ).

دەربارەی بۆنی خۆش بەکارنەهێنانیش پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ( ولاتَلْبَسوا مِن الثيابِ شيئاً مَسَّهُ زَعْفَرانٌ أو وَرْسٌ) متفق عليه، کە پێشتر مانامان کردوەو ڕوونمان کردۆتەوە کە (زەعفەران و وەرس) یش دووجۆرە گوڵ و گیای بۆنخۆشن.

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ لەبارەی بابایەکی حاجی‌یەوە کە حوشترەکەی فڕێی دابوو و ئەستۆی شکابوو مردبوو فەرموویەتی: (لاتُحَنِّطُوهُ ولاتُخَمِّرُوا رأْسَهُ فانه يُبْعَثُ يوم القيامة مُلَبِّياً) رواه البخاري ومسلم وأبوداود والنسائي.

واتە: حەنووطی تێمەدەن وە سەری دامەپۆشن، چونکە ڕۆژی دوایی بە (لبيك اللهم لبيك..) گوتنەوە زیندوو دەکرێتەوە.

دەربارەی لابردنی مووی جەستەش چ هی سەر چ هی شوێنەکانی دیکەی جەستە خوای پەروەردگار فەرموویەتی: (وَلَا تَحْلِقُوا رُءُوسَكُمْ حَتَّى يَبْلُغَ الْهَدْيُ مَحِلَّهُ....) البقرة: ١٩٦، واتە: وەسەرتان مەتاشن هەتا قوربانی‌یەکان دەگەنە شوێنی خۆیان.. هەروەها وەك (ابن المنذر) گوتوویەتی:[٢١٠] زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە بابای خاوەن ئیحرام نینۆك کردنی لەسەر قەدەغەکراوە.

دەربارەی خۆشۆردنیش وەك پێشتر ئاماژەمان پێکرد، زانایان ڕایان جیاوازەو هەرچی شافیعی‌یەکان و حەنبەلی‌یەکانن بەدروستی دەزانن ئەگەر بەصابوونیش بێت، بەڵام بەمەرجێك سەری شانە نەکات و نەهێڵێ موو لەجەستەی هەڵوەرن، بەڵام حەنەفی‌یەکان بەصابوون و وێنەی ئەو بەدورستی نازانن، وە مالیکی‌یەکانیشی مەگەر بۆ خۆ فێنك کردنەوە ئەگەرنا بەهیچ شێوەیەك بۆ خۆ خاوێن کردنەوە بەدروستی نازانن، واش دێتە بەرچاو کەڕای مالیکی‌یەکان لەڕایەکانی دیکە بەڵگەدارتر بێ و بێگومان سەلامەتی و دووربینی (إحتياط) یشی تێدایە.[٢١١]

بەڵام چەورکردن (إدهان)ی جەستە، ئەوە وەك (ابن المنذر) گوتوویەتی:[٢١٢] زانایان لەسەر دروست بوونی یەکدەنگن، بەڵام بەمەرجێك بەمەبەستی بۆنخۆشی نەبێت.

هەروەها زانایان لەسەر ئەوەش یەکدەنگن کە بابای ئیحرام بەستوو هیچ جۆرە خواردنەوەو خۆراکێکی لێ‌قەدەغە نەکراوە مەگەر لەئەسڵ دا حەرام و ناشەرعی بێت.[٢١٣]

---

[٢١٠] بڕوانە: (المعجم) ج٧ص٢٢٣، بەڵام (داود الظاهري) گوتوویەتی: نینۆك کردن دروستەو فیدیەشی ناوێ، کەواتە ناگونجێ بڵێین زانایان لەوبارەوە یەکدەنگن، مەگەر وەك (نووي) گوتوویەتی گوێ بە (داود) نەدرێ! کە من ئەو ڕایەم پێ ڕاست نیە.

[٢١١] بڕوانە: (الفقه الأسلامي) ج٣ص٢٣٠٠، وە بڕوانە: (المغني والشرح الكبير) ج٣ص٣٠٦، ٣٠٧.

[٢١٢] بڕوانە: (المجموع) ج٧ص٢٥٠.

[٢١٣] هەمان سەرچاوەو بەرگ.

## ٣-چوونه لای هاوسەر (جماع الزوجة):

خوای پەروەردگار فەرموویەتی: (الْحَجُّ أَشْهُرٌ مَعْلُومَاتٌ فَمَنْ فَرَضَ فِيهِنَّ الْحَجَّ فَلَا رَفَثَ وَلَا فُسُوقَ وَلَا جِدَالَ فِي الْحَجِّ) البقرة: ١٩٧.

واتە: کاتی حەج کردن چەند مانگێکی زانراون جا هەرکەسێك حەجی تێیان دا لەسەرخۆی پێویست کرد، ئەوە نابێ جیماعو گوناحو دم بەدمە بکات لەکاتی حەج کردن دا..

مانا لێدانەوەی (رَفَث) یش بەچوونە لای هاوسەر (جماع الزوجة) لێرەدا ڕای (ابن عمر وابن عباس و عطاء بن ابي رباح و عطاء بن يسار و مجاهد والحسن البصري و النخعي و الزهري وقتادة)[٢١٤] یەو بەڵگەی ڕاستیی ئەو تەفسیرەش ئەوەیە کە وشەی (رفث) لەشوێنێکی دیکەش لەقورئان دا هاتوە کە مەبەست پێی (جماع) ە: (أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ الصِّيَامِ الرَّفَثُ إِلَى نِسَائِكُمْ) البقرة: ١٨٧،

وەك پێشتریش گوتمان (جماع) وێڕای حەرامی‌یەکەی دەبێتە هۆی تێکدانو هەڵوەشاندنەوەی حەجو عومرەش، (ابن المنذر) لەوبارەوە گوتوویەتی:[٢١٥] (أجْمَعَ اهْلُ العِلْمِ على أن الحجَّ لايَفْسُدُ بأتيانِ شيئ في حال الإحْرام إلا الجماع)

واتە: زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە لەکاتی ئیحرام دا حەج هەروەها عومرەش بێجگە لەجیماع بەهیچ شتێکی دیکە -ی قەدەغەکراو - تێك ناچێ.

دیارە ئێمە دوایی باسی فیدیەو (کفارة)ی کردنی هەرکام لەشتە قەدەغەکراوەکان دەکەین، بۆیە لێرە لێیان دەگەڕێینو بۆ ئەوێیان هەڵدەگرین.

## ٤- هەر قسەو ڕەفتارێکی گوناح، یان نەگونجاو لەگەڵ حاڵەتی ئیحرام دا:

خوای بەرزو مەزن لەوبارەوە فەرموویەتی: (الْحَجُّ أَشْهُرٌ مَعْلُومَاتٌ فَمَنْ فَرَضَ فِيهِنَّ الْحَجَّ فَلَا رَفَثَ وَلَا فُسُوقَ وَلَا جِدَالَ فِي الْحَجِّ ...) البقرة: ١٩٧.

کە پێشتر مانامان کرد، جا هەرچەندە زۆربەی زانایان ڕایان وایە کە مەبەست لە (رفث) جیماعە، بەڵام بێگومان پێشەکی‌یەکان (مقدمات)ی جیماعیش دەگرێتەوە وەك ڕوانین (نظر) و ماچ کردنو دەستبازی (ملاعبة) و ..هتد، هەربۆیەش زۆربەی[٢١٦] هەرەزۆری

---

[٢١٤] بڕوانە: (المفصل في احكام المراة والأسرة) ج٢ص٢٩٩.

[٢١٥] بڕوانە: (المغني) ج٣ص٣١٥.

[٢١٦] بڕوانە: (المجموع) ج٧ص٢٥٤تا ٢٥٨، ئەمە ڕای تێکڕای زانایانە جگە لە (ثوري ابو حنيفة) کە ئەو سێ‌شتانەیان بەموباح زانیون، بەڵام ڕای جەماوەر بەڵگەکەی بەهێزترە، وەك (نووي) ڕوونی کردۆتەوە.

زانایان هەرکام لە خوازبێنی (خِطْبة) و مارەکردن (نكاح) و لێمارەکردن (إنكاح) یشیان بۆ بابای خاوەن ئیحرام بەقەدەغە داناوە، پێغەمبەریش ﷺ لەوبارەوە فەرموویەتی:( عن عثمان رضي الله عنه أن النبي ﷺ قال: لايَنْكِحُ المُحْرِمُ ويُنْكَحُ ولايَخْطُبُ) رواه مسلم والنسائي وأبوداود والترمذي.

واتە: خاوەن ئیحرام نەژن مارە دەکات نە لەخەڵکی مارە دەبڕێ نەخوازبێنی دەکات.

ئاشکراشە کە وشەی (فُسوق) هەموو جۆرە گوناح و خراپەیەکی زمانی و کردەیی دەگرێتەوە کە یەکێکیان دم بەدمەو شەڕە قسە (جِدال) یە، بەڵام بۆیە بەتایبەتیش باس کراوە چونکە لەکاتی سەفەردا زەمینەی پەیدابوون و سەرهەڵدانی لەبارترەو زیان و شوێنەواری خراپیشی لەسەر هاوەڵایەتی (رِّفاقَة) دیارترن و زۆرجار دەبێتە مایەی لەیەک ترازان و لەیەک دابڕانی هاوەڵان.

## ٥- ڕاووشکارکردن لەزەوی ووشکانیدا:

خوای پەنهان بێن فەرموویەتی: (وَحُرِّمَ عَلَيْكُمْ صَيْدُ الْبَرِّ مَا دُمْتُمْ حُرُمًا) المائدة: ٩٦،

واتە: وە ڕاوکردنتان لە ووشکانیدا لێقەدەغەکراوە هەتا لەئیحرام دا بن.

قەدەغەبوونی ڕاووشکاریش لەکاتی ئیحرام دا زانایانی ئوممەت لەسەری یەکدەنگن وەك (نووي) گوتوویەتی.[٢١٧]

ئنجا هەروەك چۆن ئەسڵی ڕاوکردن (إصطياد) قەدەغەیە، خواردنی گۆشتی نێچیری ڕاویش بەهەمان شێوە، جا چ ئەو نێچیرە خۆی ڕاوی کردبێ، چ بۆیان ڕاوکردبێ، وە چ بەهەرشێوەیەك لەشێوە ئاشکراو پەنهانەکان دەستی هەبووبێ لە گرتن و کوشتن و ڕاوکردنیدا.[٢١٨]

بەڵام ئەگەر هیچ دەستی تێیدا نەبووبێ ئەوە هیچ ئیشکال لەگۆشت خواردنەکەیدا نیە،[٢١٩] بەڵگەی ئەوەش کەرابرد ڕووداوی (أبو قتادة)یە خوالێیڕازیبێ کە (بخاري ومسلم) گێراویانەتەوەو پوختەکەی ئەوەیە کە ساڵی حودەیبییە (عام الحُديبية) کاتێك کە پێغەمبەری خواو ﷺ هاوەڵانی بەڕێزی خوا لێیان ڕازیبێ ئیحرامیان بەستوە و (أبو قتادة)

---

[٢١٧] بڕوانە: (المجموع) ج٧ص٢٦٠تا ٢٧١، کە فەرموودەی ناوبراوی بەزۆربەی ڕیوایەتەکانی بێژە (لفظ)ەکانییەوە هێناوەو زۆربەیان (بخاري و مسلم) لەسەریان یەکدەنگ (متفق) ن و ئەوانی دیکەش ئی (بخاري) یان (مسلم) ن.

[٢١٨] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[٢١٩] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

جارێ ئیحرامی نەبەستوە، کەرە کێوی‌یەکی دیوەو پەلاماری‌داوەو کوشتوویەتی و هەرچەندە داوای هاوکاری لەهاوەڵان کردوە، بەلام هیچیان هاوکاری‌یان نەکردوە، جا دوای ئەوەی هەموویان لێیان خواردوە لەوبارەوە لەپێغەمبەریان ﷺ پرسیوە، ئەویش فەرموویەتی: (كُلوهُ حَلالٌ) واتە: بیخۆن، حەڵاڵە، هەروەها لەهەمان دەق و ڕوداودا هاتوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی:

(هل منكم أحَدٌ أمَرَهُ أن يَحْمِلَ عليه وأشار اليه؟)

واتە: ئایا هیچ کامتان پێی گوت کە پەلاماری بدات وە ئاماژەی بۆ لاکرد؟!

شایانی باسیشە کە زانایان لەسەر ئەوەش یەکدەنگن کە بابای خاوەن ئیحرام بۆی هەیە هەرجۆرە ئاژەڵ و گیانداروپەرەوەرێکی ماڵیی بکوژێتەوە، هەروەها بۆی هەیە لەدەریادا ڕاو بکات و نێچیری دەریایی بخوات، چونکە خوای زانا فەرموویەتی: (أُحِلَّ لَكُمْ صَيْدُ الْبَحْرِ وَطَعَامُهُ مَتَاعًا لَّكُمْ وَلِلسَّيَّارَةِ ...) المائدة: ٩٦.

واتە: نێچیری دەریایی و خواردەمەنی دەریاتان بۆ حەڵاڵ کراوە کەڵك و سوودە بۆ خۆتان و بۆ کاروان و ڕێبوار.

هەروەها بابای خاوەن ئیحرام بۆی هەیە هەر گیاندارو زیندەوەرێکی درندەو زیانبەخش بکوژێ و لەخۆی دوور بخاتەوە، بەڵگەشیان کۆمەڵێك فەرموودەی پێغەمبەری خوان ﷺ بۆ وێنە:

(عن عائشة رضي الله عنهما أن رسول الله ﷺ قال: خَمْسٌ من الدوابِّ كُلُّهُنَّ فاسقٌ يَقْتُلُـهُنَّ في الحَرَم: الغُرابُ والحِدَأةُ والعَقْرَبُ والفارة والكلبُ العَقُورُ) متفق عليه.

واتە: پێنج گیاندار کەهەموویان خراپەکارن بابای خاوەن ئیحرام لەحەرەم دا بۆی هەیە بیانکوژێ: قەلەڕەشە (یان قەلە بەڵەکە) و باشوو و دووپشك و مشك و سەگی خەڵك گر.

شایانی باسیشە کە زۆربەی[٢٢٠] زانایان ڕایان وایە کە جگە لەم پێنج گیاندارە هەر گیاندارو زیندەوەرێکی دیکەش کە زیانبەخش بێت هەمان حوکمی هەیە، وەك مار (حية) کە لە (صحيح مسلم) یش دا هاتوەو گورگ و شێرو پڵنگ و زەردەواڵەو ژەنگەسوورەو ئەسپێ و کێچ و.. هتد.

---

[٢٢٠] بروانە: (فتح الباري) ج٤ص٥١٢، کە گوتوویەتی: (وذهب الجمهور كما تقدم الى الحاق غير الخمس بها في هذا الحكم).

هەندێکیشیان[٢٢١] کوشتنی کێچو ئەسپێو ڕشك بەناپەسەند (مكروه) دەزانن چونکە پێچەوانەی حاڵەتی حەج کردنو ئیحرامەو، جۆرێکە لەخزمەتکردنی جەستە (ترفيه الجسد) ، وە دەڵێن هەرکەسێك ئەسپێو کێچ لەخۆی بکوژێ وا باشە ئەگەر پارووە خواردنێکیش بێت فیدیە بدات *.

پێویستە ئەوەش بگوترێ کە سەرجەم یان لانی کەم زۆربەی زانایان کوشتنی چەند گیاندارێك لەهەموو حاڵێك دا بەحەرام دەزانن و کوشتنی هەر گیاندارو زیندەوەرێکی بێ زیانیش بەلای کەمەوە بەناپەسەند (مكروه) دەزانن، لەوبارەشەوە چەند دەقێك لەسوننەت بە بەڵگە دێننەوە بۆ وێنە:

* (عن ابن عباس رضي الله عنهما أن النبي ﷺ نَهى عن قَتْلِ أرْبَعٍ من الدوابّ: النَّمْلَةُ والنَّحْلَةُ والهُدْهُدُ والصُّرَدُ) رواه ابوداود بإسناد صحيح على شرط البخاري ومسلم.

واتە: پێغەمبەر ﷺ کوشتنی چوار گیانداری قەدەغەکردوە: مێروولە و هەنگو پەپوو سلێمانەو صورەد[٢٢٢].

دیارە بۆق (ضفدع) و پەرەسێلکەو حاجی لەق لەق و شەمشەمەکوێرەش هەمان جۆرن و هەمان حوکمیشیان هەیە،[٢٢٣] هەروەها هەر گیاندارێکی دیکە وەك وانیش.

*ئەو فەرموودەیەی کەباسی گەزرانی یەکێك لەپێغەمبەری خوا ﷺ لەلایەن مێروولەیەکەوەو فەرمان کردنی بەسووتاندنی شارە مێروولەکەو گلەیی لێکرانی لەلایەن خواوە، دەکات، کە (بخاري و مسلم) لە (أبوهريرة) یان گێڕاوەتەوە.



---

[٢٢١] بڕوانە: (المجموع) ج٧ص٢٨٥.

* بڕوانە: (المجموع) ج٧ص٣١٧.

[٢٢٢] صورەد (الصرد) وەك (المعجم الوسيط) ص٥١٢، گوتوویەتی: باڵندەیەکی سەرو دەندوك زلە لەچۆلەکە گەورەترەو مێشو مەگەزو زیندوەرو شتیوا دەخوات و ڕاو دەکات.

[٢٢٣] سەرچاوەی پێشوو هەمان بەرگ، ص ٢٨٤.

# بەندی شەشەم

# ئەو شتانەی کە لەماوەی ئیحرام دا موباح و ڕەوان

خوێنەری بەڕێز: لەبەندی پێشودا بەگوشراوی باسی ئەو شتانەمان کرد کە لەکاتی ئیحرام هەبوون دا قەدەغەن و بەکردنیان فیدیە پێویست دەبێ، جا ئەوە لێرەش دا سەرجەم ئەو شتانە دەخەینەڕوو کە لەکاتی ئیحرام دا موباح یان ئەوپەڕی ناپەسەند (مكروه)ن بەڕای هەندێك لەزانایان ئینسان بەکردنیان گوناحبار نابێ و فیدیەی ناکەوێتە سەر:

## ١- خۆشۆردن:

زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە شتێکی موباح و ڕەوایە بابای ئیحرام گرتوو بەئاوێ خۆی بشوات و خۆیشی لەئاوێدا نقووم بکات، (نووي) لە (ماوردي) یەوە هێناویەتی کە ئەم مەسەلەیە زانایان تێیدا جیاوازنین،[٢٢٤] بەڵگەشیان ئەو دەقەیە کە (بخاري ومسلم) لە (أبو أيوب) ەوە گێڕاویانەتەوە: (عن أبي أيوب رضي الله عنه: رأيت رسول الله ﷺ يَغْتَسِلُ وهو مُحْرِمٌ) واتە: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی کە لەکاتێك دا لەئیحرام دا بوو خۆی دەشۆری.

بەڵام وەك پێشتریش باسمان کرد (ابو حنيفة ومالك) ڕایان وایە کە ئەگەر بەصابوون و شتیوا بێت و بەمەبەستی خۆ خاوێن کردنەوەو چڵك و چەپەڕ لابردن بێ دروست نیەو فیدیەشی دەکەوێتە سەر،[٢٢٥] منیش هەرچەندە لەبەندی پێنجەم دا ئەم ڕایەم پێ پەسەندتر بوو بە بەڵگەی ئەوە کە لەسەرجەم دەقەکاندا وا دەبینرێ کە تۆزو خۆڵاوی بوون و چڵکنی و دزوێنی لەحەجێ دا شتێکی ویستراوبێ، بەڵام ئێستا دەڵێم: مادام فەرموودەی ڕاست (صحيح) هەبێ کە پێغەمبەر ﷺ خۆی شۆردوە، هەروەها مادام فەرموودەی ڕاست هەبێ کە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کردوە حاجییەك کە وڵاخەکەی فڕێی داوەو مردوە بەئاوو سیدر[٢٢٦] بشۆرێ (.. إغْسِلوهُ بماءٍ وسِدْرٍ) متفق عليه، کەواتە ناچارین بڵێین هەر ڕای زۆربە کە (شافعي وأحمد وابن المنذر) یان لەنێودان ڕاست ترەو ئەوپەڕی بەکارهێنانی صابوون و لابردنی چڵك و چەپەڕ ناپەسەند (مكروه) ە، بەڵام ناتوانین بڵێین: حەرامە.

---

[٢٢٤] بڕوانە: (المجموع) ج٧ص٣١٨.

[٢٢٥] هەمان سەرچاوەو بەرگ لاپەڕە، وە بڕوانە: (المفصل) ج٢ص٣١٩تا ٣٢١.

[٢٢٦] سیدر گەڵای درەختی (نبق)ە.

## ٢-چوونه ژێر سێبەرو سێبەر لەخۆکردن:

ئەمیش زۆربەی زانایان بەموباحی دەزانن‌و هەندێکیشیان بەناپەسەندو هەندێکیشیان بۆ کەسێك کە لەحاڵەتی ڕێکردن (سَیر)دابێ بەدروستی نازانن، بەڵام بۆ بابای دانیشتوو بەدروستی دەزانن، بەڵام بێگومان ڕای زۆربە کە (شافعي و ثوري و ربيعة و ابن عيينة وابن المنذر) یان لەنێودان ڕاست ترە، چونکە وەك (ابن المنذر) گوتوویەتی: هیچ دەقێکی ڕاست لەوبارەوە نیە کە قەدەغەی کردبێت‌و هەرشتێکیش کە بۆ بابای ئیحرام نەگرتوو (حَلالْ) ڕەوابێ، بۆ ئیحرام گرتوو (مُحرِمْ)ش ڕەوایە مەگەر دەقێکی ڕاست (صحیح) پێشگیری لێبکات.[٢٢٧]

ئنجا وێڕای ئەمەش دەقی ڕاست هەیە کەپێغەمبەر ﷺ سێبەری لێکراوە:

*(عن أمّ الحصين رضي الله عنهما قالت: حَجَجْتُ مع النبي ﷺ حَجَّةَ الـوداعِ فرأيـتُ أسامة وبـلالاً وأحَدُهُما آخِذٌ بخِطام ناقة النبي ﷺ والآخر رافعٌ ثوبَهُ يَسْتُرُهُ من الحَرِّ حتّى رَمىٰ جَمْرَةَ العَقَبَةِ) رواه مسلم.

واتە: لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ حەجیماڵئاوایی (حجة الوداع) م کرد، جا(اسامة و بلال)م بینی خوا لێیان ڕازیبێ یەکێکیان ڕێشمەی حووشترەکەی پێغەمبەری ﷺ بەدەستەوەبوو، ئەوی دیکەشیان پۆشاکەکەی خۆی بڵیند ڕاگرتبوو لەبەر گەرما سێبەری لێدەکرد هەتا بەردووچکەکانی بە جەمرەی عەقەبە دادان.

## ٣-سەروڕیش شانەکردن‌و خۆ خوراندن بە نینۆك:

زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە دروستە بابای ئیحرام گرتوو بێجگە لەسەرو ڕیشی هەموو جەستەی بخورێنێ،[٢٢٨] بەڵگەشیان ئەم دەقەیە کە (مالك) لە (موطأ) داهێناویەتی:[٢٢٩]

* (عن عَلْقَمة بن أبي عَلْقَمة عن أمه أنّها قـالَتْ: سَمِعْتُ عائشة زوج النبي ﷺ تُسْألُ عن المُحْرِمِ: أيَحُكُّ جَسَدَهُ؟ قالَتْ نَعم فَلْيَحْكُكْهُ ولْيَشْدُدْ ولَوْ رُبِطَتْ يداي ولَمْ أجِدْ إلاّ رِجْلَيَّ لَحَكَكْتُ)

واتە: دایکی (علقمة) گوتوویەتی: گوێم لێبوو پرسیار لەعائیشەی هاوسەری پێغەمبەر ﷺ کرا، دەربارەی بابای ئیحرام گرتوو؛ ئایا بۆی هەیە جەستەی خۆی بخورێنێ؟ گوتی: بەڵێ با خۆی بخورێنێ‌و بەتوندیش، وە ئەگەر من هەردووك دەستشم بەسترابن‌و تەنیا لاقەکانم مابن خۆم دەخورێنم.

---

[٢٢٧] بڕوانە: (المجموع) ج٧ص٣١٩، ٣٢٠، وە: (الفقه الأسلامي) ج٣ص٢٣١٦.

[٢٢٨] بڕوانە: (المجموع) ج٧ص٣١٩، ٣٢٠، وە: (الفقه الأسلامي) ج٣ص٢٣١٥، ٢٣١٦.

[٢٢٩] بڕوانە: (الموطأ) ص٣٠٦، (باب: مايجوز للمحرم ان يفعله).

بەڵام بۆ خوراندنی سەروریش و شانەکردنیان زۆر[٢٣٠] لەزانایان بە ناپەسەند (مکروه) ی دەزانن نەبادا مووی سەروریشی بکەونە خوارو هەڵبقەندرێن، کەواتە بەڵگەی بە ناپەسەند دانانی بەنینۆك سەرویش خوراندن و شانەکردنیان بەس مەترسی موو هەڵقەندرانەو ئەگەر کابرای سەرو ریش خورێن لەوبارەوە دڵنیابێ هیچی تێدا نیەو ناپەسەند نیە،[٢٣١] هەرچەندە خۆپاراستن و دووربینی (إحتياط) یش هەر چاکە.

## ٤-چاوڕشتن بەکل و قەترەو دەرمان تێکردنی چاو:

زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە بەمەبەستی چارەسەر (علاج) کل تێکردنی چاو هەروەها قەترەو دەرمان دروستەو هیچی لەسەر نیە، هەروەها لەسەر ئەوەش یەکدەنگن کە ئەگەر پێویست بوو بۆ چارەسەر کل (کحل) ە کە بۆنی خۆشی تێبکرێ دیسان دروستە، بەڵام دوایی فیدیەی دەکەوێتە سەر، بەڵام ئەگەر هەر بەشێوەیەکی ئاسایی چاوی برێژێ و کلەکەش بۆنی خۆشی تێدا نەبێ ئەوە هەندێکیان کە (شافعي)یان لەنێودایە بەناپەسندو زۆربەش کە : (أصحاب الرأي و ثوري واسحاق و احمدو وابن المنذر)یان لەنێودان بەموباحی دەزانن و[٢٣٢] ڕای زۆربەش وێچووترە، مادام هیچ بەڵگەیەك لەسەر ناپەسند بوونی نیە.

## ٥-کەڵەشاخ لەخۆگرتن و خوێن دان و خوێن تێکران:

ئەمیش زۆربەی هەرەزۆری زانایان بەموباح و هەندێکیشیان وەك (مالك) ، مەگەر لەبەر ناچاری ئەگەرنا بەدروست (جائز)ی نازانن، بەڵام بێگومان ڕای زۆربە کە (ثوري و اسحاق و شافعي و احمد وابن المنذر) یان لەنێودان ڕاست ترە، چونکە ئەم دەقە پشتگیری ڕایەکەیان دەکات:[٢٣٣]

* (عن ابن عباس رضي الله عنهما أن رسول الله ﷺ إحْتَجَمَ وهُوَ مُحْرِمٌ) رواه احمد والبخاري ومسلم واصحاب السنن.

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ لەکاتێك دا کە ئیحرامی هەبوو کەڵەشاخی لەخۆی گرت.

---

[٢٣٠] بڕوانە: (المجموع) ج٧ص٣١٦.

[٢٣١] ئەوە زیاتر ڕاو بۆچوون و ئەنجامگیری بەندەیە.

[٢٣٢] بڕوانە: (المجموع) ج٧ص٣١٨.

[٢٣٣] هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص٣١٩.

## تێبینی:

ئاشكرایه كه كاتی خۆی تـەنیا خوێـن لەجەسـتە دەرهێنـان هـەبووە بـەهۆی كەڵەشاخ گرتن (حجامة) و خوێن لەدەمارگرتن (فَصْد)ەوە، بەڵام خوێن تێكردن نەبووە بۆیە باس نەكراوە ئەگەرنا هەروەك یەكن و یەك حوكمیشیان هەیە، بۆیەش لەسەر باسەكەدا پێكەوەم هێنان.

### ٦-پۆشینی پەشتەماڵی ڕەنگدار (لُبْسُ الثیابِ المُصَبَّغة):

ئەمیان زۆربەی زانایان بەناپەسند (مكروه) ی دەزانن، بەمەرجێك بۆندار نەبێت ئەگەرنا حەرامە، بەڵگەی ناپەسند بوونیشی ئەم دەقەیە:[٣٢٤]

*( عن اسلم عن ابن عمر أن عمر بن الخطاب راى على طلحة بن عبيدالله ثوباً مصبوغاً وهو مُحْرِمٌ فقال عمر (رضي الله عنه): ماهذا الثوبُ المصبوغُ ياطَلْحةُ؟ فقال: طلحة: يا امير المؤمنين إنما هو مَدَرٌ، فقال: عمر: إنكم ايها الرَّهْطُ أئمةٌ يقتدي بكمُ الناسُ فَلَوْ ان رَجُلاً جاهلاً راى هذا الثوبَ لقال: إن طلحة بن عبيدالله كان يَلْبَسُ الثيابَ المُصَبَّغة في الأحرام، فلا تَلْبَسوا ايها الرهطُ شيئاً من هذهِ الثيابِ المُصَبَّغة).

واتـە: عومـەری كـوڕی خـەتتاب (خوا لێی ڕازی بێ) بـەرگێكی ڕەنگـداری بـە (طلحـة بـن عبيدالله)وە (خوا لێی ڕازی بێ) بینی كە لەئیحرام دا بوو، جا عومەر گوتی: ئەم بەرگە ڕەنگ كراوە چی‌یە ئەی طەڵحە؟! طەڵحەش گوتی: ئەی فەرماندەی بڕواداران ئەمە خاكی‌یـە، عومـەر گوتـی: ئـەی كۆمـەڵـــی هاوەڵـە پێشینەكان ئێوە پێشـەوان خـەڵكی چاوتـان لێدەكەن. ئێسـتا ئەگـەر پیـاوێكی نـەزان ئـەم پۆشـاكە ببینـێ، دەڵـێ: طەڵحـەی كـوڕی عوبەیدوڵلا لەئیحرام دا بەرگی ڕەنـگ كـراوی دەپۆشـی، جـا ئـەی كۆمـەڵ- ی دانسـقەو چاولێكراو هیچ شتێك لەو پۆشاكە ڕەنگدارانە مەپۆشن لەكاتی ئیحرام دا.

### ٧-تەماشاكردنی ئاوێنە:

زۆربەی هەرە زۆری زانایان كە (أسحاق و شافعي وأحمد وابن المنذر) یـان لەنێودان ڕایان وایە كە تەماشاكردنی ئاوێنەش بۆ بابای ئیحرام دار موباحە، هەندێكیشیان كـە



[٣٢٤] بڕوانە: (الموطا) ص٢٨٠، (باب : لُبْسُ الثياب المصبَّغة في الأحرام).

(مالك) یان لەنێودایە ڕای وایە ئەگەر ناچار نەبێ ناپەسەندە، بەڵام ڕای زۆربە ڕاست ترەو ئەم دەقەش پشتگیریەتی:[٢٣٥]

*(عن نافِعٍ أن أبن عمر نَظَرَ في المرآةِ) رواه الشافعي والبيهقي باسناد صحيح على شرط البخاري ومسلم، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر کە لەئیحرام دا بوو تەماشای ئاوێنەی کرد.

## ٨- قسەکردنی ئاسایی:

تێکڕای[٢٣٦] زانایان لەسەر ئەوە کۆکن کە بابای ئیحرام دار بۆی هەیە هەرجۆرە قسەیەکی ئاسایی بکات، بەڵام هەمووشیان بەپەسندی دەزانن کە بەزۆری سەرگەرمی زیکرو فیکرو پاڕانەوە بێ و جگە لەقسەی خێرو چاکە هیچی دیکە نەڵێ و خۆی لەقسەی پووچ (لَغو) و بێکەڵك بپارێزێ، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَنْ کانَ یؤمِنُ باللهِ والیوم الأخر فلْیَقُلْ خَیْراً أو لِیَصْمُت) رواه البخاري ومسلم وأصحاب السنن الا النسائي.

واتە: هەرکەسێك بڕوای بەخواو بەڕۆژی دوایی هەیە با یان قسەی چاك بکات یان بێدەنگ بێت.

ئەگەرنا زانایان گوتوویانە بابای ئیحرام دار بۆی هەیە قسەی موباح و ئاسایی بکات ئەگەر شیعریش بێت بەتایبەت لەوجۆرەی کە پێغەمبەر ﷺ لەبارەیەوە فەرموویەتی: (إنَّ من الشِّعْرِ لحِكْمَةً) رواه أحمد والبخاري وابوداود وابن ماجة.

واتە: شیعری وا هەیە حیکمەتە.



[٢٣٥] بڕوانە: (المجموع) ج٧ص٣٢١.

[٢٣٦] هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص٣٢٠.

# بەندی حەوتەم

# چۆنیەتی ئیحرام شکاندن و تەواوکردنی حەج و عومرە

شتێکی ئاشکرایە کە بابای حاجی و عومرەکەر هەرکاتێك پایەو فەرزەکانی هەرکام لەحەج و عومرەیان تەواوکردن و بەوجۆرەی کە خستمانەڕوو ئەنجامیان دان، ئەوە بۆیان ڕەوایە کە ئیحرام بشکێنن و کۆتایی بەحەج و عومرەکەیان بهێنن.

جا سەرجەم زانایان لەوبارەوە لەسەر ئەوە ڕێك کەوتوون کەئیحرام شکاندن و کۆتایی پێهێنانی خواپەرستی‌یەکانی حەج و عومرە (إتمام مناسك الحج والعُمرة) بە دوو قۆناغ ئەنجام دەدرێ:

## قۆناغی یەکەم:

### ئیحرام شکاندنی یەکەم ( التَّحلُّلُ الأولُ):

کەئیحرام شکاندنی گچکە (التحلل الأصغر) یشی پێدەگوترێ و ئەمیش بەئەنجام دانی دوو شت لەم سێ‌یانە دێتەدی:

ا- وردە بەرد هاویشتن بۆ جەمرەی گەورە کە جەمرەی عەقەبە (جمرة العقبة)یشی پێدەگوترێ و وەك پێشتر ڕوونمان کردەوە پێش نیوەڕۆی ڕۆژی دەیەمی (ذوالحجة) کە بەڕۆژی قوربانی سەربڕین (یوم النحر) ناسراوە، جێبەجێ‌دەکرێ.

ب-سەری خۆتاشین یان کورت کردنەوە (الحَلْقُ او التَّقْصير) ، کە ئاشکرایە بۆ ئافرەتان بەس کورت کردنەوە دروستە.

ج- بەدەروی کەعبەدا سووڕانەوەی پاش شۆڕبوونەوە لەعەرەفات کە بە (طَـوافُ الأفاضة) ناودەبرێ، هەروەها بەطەوافی پایە (طواف الركن) یش.

جا بەم ئیحرام شکاندنی یەکەمە بەڕای زۆربەی زانایان کە (حەنەفی‌یەکان و شافیعی‌یەکان و حەنبەلی‌یەکان) یان لەنێودان هەموو شتێك بۆ ئینسان حەلاڵ دەبێ وەك پێش ئیحرام بەستن جگە لەجیماعی هاوسەرو پێشەکی‌یەکانی‌بەلاّم مالیکی‌یەکان ڕایان وایە کەوێڕای ئەوە ڕاووشکارو بۆنی خۆش بەکارهێنانیش هەر بە قەدەغەیی دەمێننەوە.[٢٣٧]

---

[٢٣٧] بڕوانە: )(الفقه الأسلامي وادلته) ج٣ص٢٢٨٩، ٢٢٩٠، هەروەها بروانە: (فقه السنة) ج١ص٧٤١.

بەڵگەی جەماوەری زانایان ئەم دەقەیە:

* (عن ابن عباس رضي الله عنهما قال: قال رسول الله ﷺ: اذا رَمَيْتُم الجَمْرَةَ فَقَدْ حَلَّ لكُمْ كل شئٍ الاّ النساء) رواه النسائي وابن ماجة، وفي رواية ابوداود عن عائشة رضي الله عنهما: (إذا رَمَيْتُـمْ وحَلَقْتُمْ فقد حلَّ لكم الطيبُ والثيابُ وكل شيء الا النساءُ) ، کەماناکەیان ڕوونو ئاسانە.

مالیکی‌یەکانیش بۆ قەدەغە بوونی ڕاووشکار ئەم ئایەتە:

(لَا تَقْتُلُوا الصَّيْدَ وَأَنْتُمْ حُرُمٌ) المائدة: ٩٥،

وە بۆ بەقەدەغەیی مانەوەی بۆنی خۆش بەکارهێنانیش ئەم دەقە:

*(عن عبدالله بن الزبير رضي الله عنهما أنه قال: من سنة الحَجّ : إذا رمى الجَمْرَة الكبرى حَلَّ لَهُ كل شيئٍ حُرِمَ عليه الا النساءُ والطيبُ حتى يزور البيت) رواه الحاكم وقال: على شرط الشيخين.

## قۆناغی دووەم:

## ئیحرام شکاندنی دووەم (التَحلُّلُ الثاني):

کە ئیحرام شکاندنی گەورە (التحلل الأكبر) یشی پێ‌دەگوترێ، کە ئەمیش بە ئەنجام دانی شتی سێیەم لەو سێ شتانەی گوتمانن دێتە دی، کە بەزۆری بریتیە لە طەوافی پایە یان (طواف الأفاضة)، چونکە مەگەر چۆن دەنا وردە بەرد هاویشتن بۆ جەمرەی گەورەو سەری خۆتاشین یان کورت کردنەوە بەزۆری بەدوای یەك دا دێن.

جا بەیەکدەنگی تێکرای[٢٣٨] زانایان هەرکاتێك بابای ئیحرام دار ئەو سێ شتانەی ئەنجام دان ئەوە لەئیحرام داری چۆتە دەرێ، بەڵام هەر پێویستە کە بەلای کەمەوە دوو ڕۆژی دوایشی واتە یازدەو دوازدە وردە بەردەکان بەسێ جەمرەکان دا بداتو ئەگەر هەرسێك ڕۆژەکانیش بێتو حەفتا (٧٠) بەردووچکەکان تەواو بکات چاکتریشە.

هەروەها بێجگە لەحەنەفی‌یەکانیش زۆربەی زانایان بەفەرزی دەزانن کە ئەو ماوەیەش هەر لە (مینا) بمێنێتەوە، هەرچەندە لەحاڵەتی ئیحرام داریش دا نەماوە، وەك چۆن نوێژکەر بەسەلامی لای ڕاست لەنوێژەکەی دەچێتە دەرێ، بەڵام داوای لێ‌کراوە کە هی دووەمیش هەر بداتەوە، ئەوەندە هەیە سەلام دانەوەی دووەمی نوێژ سوننەتە، بەڵام ئەو مانەوەیەی حاجی لەمینا فەرزە.[٢٣٩]

ئەوەی ڕابرد پوختەیەك بوو دەربارەی چۆنیەتی ئیحرام شکاندنو کۆتایی پێ‌هێنانی حەجو عومرە بەتایبەت حەج.

---

[٢٣٨] بڕوانە: (الفقه الأسلامي وأدلته) ج٣ص٢٢٩٠.

[٢٣٩] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

# بەندی هەشتەم

# چۆنیەتی حەج و عومرەکردن

**خوێنەری بەڕێزو خۆشەویستم!**

خوا پشتیوان بێ بۆ ڕوونکردنەوەی چۆنیەتی حەج و عومرەکردن سەرەتا حەجی ماڵئاوایی پێغەمبەری خوا ﷺ دەخەینەڕوو، پاشان بەکورتی و پوختی و بەڕێز چۆنیەتی جێبەجێکردنی کردەوەکانی حەج و عومرە دەخەینەڕوو، واتە ئەم بەندە لەدوو خاڵی سەرەکی دا پێشکەش دەکەین:

**١-حەجی ماڵئاوایی پێغەمبەری خوا ﷺ:**

**دەقی تەرجەمەی ئەو فەرموودەیەی کە (مسلم) لەوبارەوە هێناویەتی:**

**گوتوویەتی:**

(ابوبکر بن ابي شيبة) و (إسحاق ابن ابراهيم) هەردووکیان لە (حاتم)ەوە بۆیان باس کردم (ابوبکر) گوتی: (حاتم بن اسماعيل المدني) لە (جعفر بن محمد) ئەویش لەبابیی‌یەوە بۆی گێڕامەوە، گوتوویەتی: چووینە لای (جابر بن عبدالله) خوا لێی ڕازی‌بێ ئەویش لەخەڵکەکەی پرسی هەتا گەیشتە من، گوتم: من موحەممەدی کوڕی عەلی کوڕی حوسێن (ی کوڕی(علي)کوڕی (ابوطالب) م، ئەویش دەستی بۆ لای سەرم ڕاکێشاو قۆپچەی سەرەوەی کراسەکەمو پاشان قۆپچەی خوارەوەی کردەوە کە ئەوکاتە من تازە دەگەیشتمێ، لەپە دەستی خستە سەر سینگم،[٢٤٠] ئنجا گوتی برازای خۆم بەخێربێی، چیت دەوێ پرسیار بکە، جا منیش پرسیارم لێکرد وە ئەو ئەوکاتە کوێربوو وەکاتی نوێژ هات، جا هەڵساو عەبایەکی لەخۆوەرگرت، لەبەر گچکەیی کە دەیخستە سەر شانی ئەملاو لای دەگەیشتنەوە یەك، وە کراسەکەش لەتەنیشتی‌یەوە لەسەر هەرزاڵێك دانرابوو، نوێژی بۆمان کرد، ئنجا گوتم: دەربارەی حەجی پێغەمبەر ﷺ هەواڵم بدەیە، ئەویش بەدەستی ژمارەی نۆی دروست کرد وە گوتی: پێغەمبەری خوا نۆ ساڵان مایەوەو حەجی نەکرد، ئنجا لەساڵی دەیەم دا لەنێو خەڵکیدا جاڕیدا کە پێغەمبەری خوا حەج دەکات، جا خەڵکێکی زۆر هاتنە مەدینەوە، هەموویان دەیانویست چاو لەپێغەمبەری خوا بکەن و

---

[٢٤٠] لەبەرئەوەی تازە ساڵو گەنج بووە ویستوویەتی بیلاوێنێتەوەو دڵی خۆش بکات، بڕوانە: (شرح صحيح مسلم) ج٣ص٢٣٢٩.

وەك وی بكەن، جا لەگەڵی ڕۆیشتن هەتا گەیشتینە (ذو الحُليفة) لەوێ (اسماء بنت عُمَیس)[241] موحەممەدی كوڕی ئەبووبەكری بوو، وە بۆلای پێغەمبەری خوای نارد ﷺ كە چی بكەم؟! فەرمووی: خۆت بشۆو بەپەڕۆیەك خۆت بپێچەو ئیحرام ببەستە، جا پێغەمبەری خوا ﷺ لەمزگەوتێ نوێژی كردو سواری حوشترەكەی بوو، جا كاتێك بەسواری حوشترەكەی گەیشتە دەشت، تەماشای بەردەمیم كرد هەتا چاو بڕدەكات لەسوارو پیادە هەبوو، هەروەها لەلای ڕاستیو لای چەپیو لەپشتەوەی بەهەمان شێوە، وە پێغەمبەری خواش لەنێومان دابوو، قورئانی بۆ دەهاتە خوارێو ئەویش مەبەستەكەی دەزانی، وەهەرچی ئەو ڕەفتاری پێكردبایە ئێمەش كارمان پێدەكرد.

جا پێغەمبەر ﷺ دەنگی بەخوا بەیەكگرتن (لبيك اللهم لبيك، لبيك لا شريك لك لبيك، إن الحمد والنعمة لك والملك، لاشريك لك) بەرزكردەوە، خەڵكیش هەر بەو وشانەی كە ئێستا بەدەنگی بەرز دەیانڵێن، دەنگیان بەرزكردەوە، وە پێغەمبەری خوا ﷺ بەرپەرچی هیچ وشەیەكیانی نەدانەوە، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر (تلبية)كەی بەردەوام بوو. (جابر) خوالێی ڕازیبێ گوتی: جگە لەحەجێ بەتەمای هیچ شتێكی دیكە نەبووین، عومرەمان نەدەزانی، هەتا لەگەڵی هاتینە لای ماڵی خوا، جا دەستی گەیاندە بەردە ڕەشەكەو سێجار بەخێراییو چواریشیان بەڕۆیشتنی ئاسایی - بەدەوری كەعبەدا - سووڕایەوە، دوایی چووە لای (مقام إبراهيم) سەلامی خوای لێبێ وە ئەمەی خوێند: (واتخذوا من مقام ابراهيم مُصَلّى) وە (مقام) ی خستە نێوان خۆیو كابەوە و نوێژی دابەست ، جا بابم دەیگوت: (وە پێشم وایە هەر لەپێغەمبەرەوە ﷺ باسی دەكرد) لەدوو ڕكاتەكان دا (قل هو الله أحد و قل يأيها الكافرون)[242] ی دەخوێند، پاشان گەڕایەوە بۆلای بەردەڕەشەكەو دەستی گەیاندەوەپێی، دوایی لەدەرگاكەوە بەرەو صەفا چوو و كەلێینیزیك بۆوە، (إن الصّفا والمروة من شعائر الله) ی خوێند، وە فەرمووی: - بەوە دەست پێدەكەم كە خوا لێیەوە دەستی پێكردوە، جا لەصەفاوە دەستی پێكردو سەركەوتە سەریو كاتێك ماڵی خوای بینی ڕووی كردە قیبلەو تاكێتیو گەورەیی خوای ڕاگەیاندو فەرمووی: (لا الـه الا الله وحده لاشريك لَهُ، لَهُ الملك ولَهُ الحمدُ وهو على كل شيئٍ قدير، لا الـه الا الله وحدَهُ، أنجَزَ وَعْدَهُ، ونَصَرَ عَبْدَهُ وهَزَمَ الأحْزابَ وَحْدَهُ)[243] وە لەو نێوانەش دا دەپاڕایەوە، دەڵێ:

---

[241] كە هاوسەری (ابوبكر الصديق) بووە خوا لێیان ڕازی بێ.

[242] واتە لەڕكاتی یەكەم دا پاش فاتیحە (كافرون)و لەڕكاتی دووەمیش دا (قل هو الله احد) ی خوێندوە.

[243] پێشتر مانامان كردوە بۆیە لێرە دووبارەی ناكەینەوە.

سێ‌جاران ئاوای کرد، پاشان بەرەو مەروە هاتە خوار، هەتا کاتێك کە پێیەکانی بەرەو نزمایی شیوەکە شۆڕبوونەوە بەگورگە لۆقە ڕۆیشت، بەڵام کە بەرەو سەرێ تێ‌هەڵکشایەوە بەڕۆیشتن ڕۆیی هەتا گەیشتە مەروە، وە لەسەر صەفا چی‌کردبوو لەسەر مەروەش کردی، جا لەجاری کۆتایی سەر مەروەدا فەرمووی: ئەگەر ئەوەی تێپەڕی بۆم بێتەوە پێش قوربانی لەگەڵ خۆم ناهێنم‌و ئەمەیان دەکەمە عومرە، جا هەرکامێکتان قوربانی نەهێناوە با ئیحرام بشکێنێ‌و ئەم طەواف‌و سەعی‌یــە بکاتە عومرە،[٢٤٤] لەوکاتەدا (سُراقة بن مالك بن جعشم) هەڵساو گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا هەر بۆ ئەمساڵمان یان بۆ هەمیشەیە؟! پێغەمبەری خواش ﷺ پەنجەکانی هەردووك دەستی خستنە نێو یەك‌و دووجاران فەرمووی: عومرە چووە نێو حەجەوە، نەخێر بەڵکو بۆ هەتا هەتایە.

وە عەلی خوا لێی‌ڕازی‌بێ کە لەیەمەنەوە هاتبۆوەو حوشتری هێنابوون چووە لای پێغەمبەر ﷺ، فاتیمەی بینی خوا لێی‌ڕازی‌بێ لەوانەیە کە ئیحرامیان شکاندوەو بەرگ‌و پۆشاکی ڕەنگداری پۆشیوەو چاوی ڕشتوون، عەلییش لەوبارەوەوە گلەیی لێ‌کرد، ئەویش گوتی: بابم بەمە فەرمانی پێ‌کردووم، گوتی: جا عەلی لەعێراق دەیگوت منیش چوومە لای پێغەمبەری خوا ﷺ کە گلەیی لەفاتیمە بکەم‌و ئەوی لێ‌هان بدەم کە لێپرسینەوەی لەگەڵ بکات لەسەرئەوە کە کردوویەتی! وە لەوبارەوە کە لەدەمی پێغەمبەرەوە ﷺ دەیگێڕایەوە لێی بپرسم، جا کە هەواڵم پێ‌دا من لەوبارەوە گلەییم لێ‌کردوە، فەرمووی: ڕاست دەکات (ئینجا فەرمووی) ئەوە کاتێك کە ئیحرامت بە حەج بەست چیت گوت؟ دەڵێ گوتم: ئەی خوایە ئەوە من دەنگ بەرز دەکەمەوەو ئیحرام دەبەستم بەو شتەی کە پێغەمبەرەکەت ئیحرامی پێ بەستووە فەرمووی: دەجا...من قوربانیم هێناون تۆش جارێ ئیحرام مەشکێنە، دەڵێ: جا ئەو کۆمەڵە قوربانی‌یەی کە عەلی لەیەمەنەوە هێنابوونی‌و ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ هێنابوونی سەد (١٠٠) سەر بوون.

جا سەرجەم خەڵکی ئیحرامیان شکاندو سەری خۆیانیان کورت کردەوە بێجگە لەپێغەمبەر ﷺ و ئەو کەسانەی کە قوربانی‌یان هێنابوو.

ئنجا لە ڕۆژی تەرویەدا ڕوویان کردە مینا، وە ئیحرامیان بەحەج بەست وە پێغەمبەری خواش ﷺ سواربوو، وە نوێژەکانی نیوەڕۆو ئێوارەو شێوان‌و خەوتنان و بەیانی لەوێ (واتە لەمینا) کرد، ئنجا هەتا خۆرکەوتن مایەوەو فەرمانی کرد کە چادرێکی لەموو چنراوی لەنەمیرە بۆ هەڵ بدەن.

---

[٢٤٤] کە ئەم جۆرە حەج کردنە پێی دەگوترێ (تمتع) و ئەوەی پێغەمبەریش ﷺ (قران)ە.

ئەوجار پێغەمبەری خوا ﷺ کەوتە ڕێو قورەیشی یەکان دڵنیابوون کە لەلای (المَشْعَرُ الحرام)[٢٤٥] ڕادوەستێ، وەك چۆن قورەیش لەسەردەمی نەفامێتیدا دەیکرد، بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ ڕەت بوو هەتا هاتە عەرەفات، وەبینی ئەوە چادرەکەی لەنەمیرە بۆ هەڵدراوەو لەوێدا دابەزیو سەقامگیربوو، هەتا کاتێك کە خۆر لایدا فەرمانی کرد حوشترەکەیان بۆ جل کردو هاتە لای (بَطْنُ الوادي)،[٢٤٦] جا لەوێ وتاری بۆ خەڵکی داو فەرمووی: {بێگومان خوێنتانو ماڵو سامانتان وەك قەدەغەیی ئەم ڕۆژەتان لەم مانگەتانو لەم وڵاتەتان دا (بەناهەق) لێتان قەدەغەیە! بزانن کە هەر شتێك پەیوەندی بەنەفامێتییەوە بێ لەژێر ئەم دوو پێیەم دایە، وە خوێنەکانی سەردەمی نەفامێتی بەفەوتاو (هَدَرْ) دادەنرێن، وە یەکەمین خوێن کە بە بەزایەچووی دادەنێم لەخوێنەکانمان خوێنی (ابن ربيعة بن الحارث) کە لەنێو تیرەی (بَني سَعْد) بەدایەن درابوو، تیرەی (هُذَيْل) کوشتیان، هەروەها سوود (رِبا) ی سەردەمی نەفامێتی بەفەوتاو دادەنێم، وەیەکەمین سوود کە بەبەزایە چووی دادەنێم سودی خۆمانە، سوودی (عباس بن عبدالمطلب) ئەوە هەمووی بەفەوتاو حیسابە (و هیچ کەس بۆی نیە داوای ئەوجۆرە خوێنو سوودانە بکاتەوە).

وە دەربارەی ژنان پارێز لەخوا بکەن، چونکە ئێوە بەئەمانی خوا وەرتان گرتوونو بەئیزنو فەرمانی خوا داوێنیانتان حەڵاڵ کردوە، وە مافی ئێوەیە لەسەریان کە هەر کەسێك ئێوە حەز لەچارەی نەکەن نەهێڵن بێنە ماڵتانو فەرموویان نەکەن،[٢٤٧] وە ئەگەر ئەوەیان کرد (وە بەئامۆژگاریکردن چاك نەبوون) ئەوە بۆتەمبێ کردنیان بەشێوەیەك کە زۆر توند نەبێ لێیان بدەن، وە مافی ئەوانیشە بەسەر ئێوەوە کە بەچاکەو بەشێوەی باو بژێوو و بەرگو پۆشاکیان بۆ دابین بکەن.

وەشتێکم لەنێوتان دا بەجێهێشتوە کە ئەگەر چاك دەستی تێبگرن، هەرگیز پاش پەیڕەویتان لێی سەرگەردان نابن، ئەویش کتێبی خوایە.

وە ئێوەش دەربارەی من پرسیارتان لێدەکرێت، جا ئایا چی دەڵێن؟ گوتیان: شایەدی دەدەین کە بەڕاستی تۆ پەیامی خوات پێڕاگەیاندینو جێبەجێت کردو دڵسۆزیو

---

[٢٤٥] مەشعەری حەرام شاخۆلکەیەکە لە موزدەلیفە پی دەگوترێ: قوزەح، هەندێکیش گوتوویانە سەرجەم موزدەلیفە مەشعەرەی حەرامەو قورئانیش ئەوە دەگەیەنێ، بڕوانە: (شرح صحيح مسلم) ج٣ص٢٣٤٣.

[٢٤٦] (بطن الوادي) بریتیە لەدۆڵی (عُرَنَة) کە بەڕای زۆربەی زانایان لەڕیزی عەرەفات دا ناژمێررێ بەڵام (مالك) گوتوویەتی: ئەویش هەر عەرەفاتە، بڕوانە: (شرح صحيح مسلم) ج٣ص٢٣٤٤.

[٢٤٧] (نووي) گوتوویەتی: هەرکەسێك لەخزمو بێگانەو پیاوو ئافرەتومێرد حەز لەچارەی نەکات دروست نیە ژن فەرمووی لێبکات، با مێردەکەی بەڕاشکاوییش لێیقەدەغە نەکات، مادام بزانێ کە مێردەکەی حەز لەچارەی ناکات، بڕوانە: (شرح صحيح مسلم) ج٣ص٢٣٤٧.

پەرۆشت نواند، ئەویش بەپەنجەی شایەتمانی ئاماژەی بەرەو ئاسمان کردو بەرزی کردەوەو رووی پێکردە خەڵکەکەو فەرمووی: (أَللَّهُمَّ اشْهَدْ، أللهمَّ اشْهَدْ) ئەی خوایە شایەد بە ئەی خوایە شایەدبە، سێ کەرەتان }.

پاشان بانگی‌داو قامەتی خوێندو نوێژی نیوەڕۆی‌کرد، دوایی قامەتی خوێندو نوێژی ئێوارەی کرد، وە لەنێوانیان دا هیچ نوێژی نەکرد.

ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ سواربوو هەتا هاتە شوێنی راوەستان (مَوْقِفْ) لەعەرەفات و رووی کردە قیبلەو زگی حوشترەکەی کە بە (قَصْواءْ) ناسراوە کردە تاتەبەردەکان (صَخرات) و ریێچکەو ئاپۆرایی خەڵکەکەی خستە بەردەمی خۆی، ئنجا هەر ئاوا بەراوەستاوی مایەوەو (زیکرو پارانەوەی کرد) هەتا خۆر ئاوابوو وە زەردەش تۆزێك رۆیشت و قورسی خۆر ون بوو.[٢٤٨]

ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ، کە (اسامة)ی لەپشت خۆیەوە سوارکردبوو، بەرەو موزدەلیفە شۆڕبۆوە، لەکاتێك دا کەهێندە جڵەوی (قَصواء) توندکردبوو سەری لەقەرپووزی کورتانەکەی دەدا، وە بەدەستی راستی ئاماژەی دەکردو دەیفەرموو: "ئەی خەڵکینە ئارامی، ئارامی" هەرکات دەگەیشتە گردێك لەگردۆلکەکان تۆزێك جڵەوی بۆ شل دەکرد هەتا لێی‌سەردەکەوت، تا هاتە موزدەلیفە، جا لەوێ نوێژی شێوان‌و خەوتنانی بە بانگێك‌و دوو قامەت کردو هیچ نوێژی سوننەتی لەنێوانیان دا نەکرد، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ هەتا سپێدەی بەیانی راکشا و خەوت، وە کاتێك بەیانیی بۆ رۆشن بۆیەوە بانگێك‌و قامەتێك نوێژی بەیانی کرد، ئنجا سواری حوشترەکەی (قَصواء) بۆوە هەتا هاتە لای مەشعەری حەرام، جا لەوێ رووەو قیبلە وەستاو لێی پارایەوەو (الله اکبر)ی کردو (لا اله الا الله)ی کردو یەکتایی‌خوای راگەیاندو هەروا بەرادەستاوی مایەوە هەتا تەواو دنیا رووناك داهات، ئنجا بەرلەوەی رۆژ دەربکەوێ کەوتەرێ.

وە (الفضل بن عباس) ی لەپشت خۆیەوە سوارکرد کە پیاوێکی قژ جوان‌و سپی پێست‌و بەرچاوو بوو، جا کاتێك پێغەمبەری خوا کەوتەرێ ﷺ چەند ئافرەتێك کە دەرۆیشتن بەلای‌دا رەت بوون، (فَضْل)یش دەستی کرد بەسەرنج دانیان پێغەمبەری خواش ﷺ دەستی خستە سەر رووی (فَضْل) و (فضْل)یش رووی بەلایەکەی دیکەدا سووڕاندو هەر تەماشای دەکرد، دووبارە پێغەمبەری خوا ﷺ بەلایەکەی دیکەدا دەستی

---

[٢٤٨] چونکە هەم بە (جبل) و هەم بە (حَبْل)یش هاتوە، جا یەکەمیان رێچکە بەستنی خەڵك‌و بەدووەمیشیان حەشامات‌و ئاپۆرایی دەگەیەنێ، بڕوانە: (شرح صحیح مسلم) ج٣ص٣٣٥٠.

خستەسەر دەم‌وچاوی (فَضْـل) ڕووی لەلایەکـەی دیکـەش وەرچـەرخاند چونکـە هـەر تەماشای ئافرەتەکانی دەکرد، هەتا گەیشتە دۆڵی موحەسسیر (وادي المُحَسِّر) تۆزێـك وڵاخەکەی خێراکرد، پاشان ئـەو ڕێیـەی نێوەڕاسـتی گـرت کـە بـەرەو جـەمرەی گـەورە دەچـێ، هـەتا هاتـەلای ئـەو جەمرەیـەی کـە لـەلای درەختەکەیـەو حـەوت بەردووچکـەی تـێ‌گرتن، لەگـەڵ هـەر بەردووچکەیـەك دا (الله اکـبر)ی دەکـرد، کـە وەك بەردووچکـەی پەلاپیتکە بوون‌و لە (بَطْنُ الوادي)یەوە دەیهاویشتن.

دوایی بەرەو کوشتارگە (مَنْحَرْ) چوو، جا شەست‌وسێ (٦٣) حوشتری بەدەستی خۆی کوشتنەوە، دوایی دایە دەست عـەلی‌و ئەوەی مابوون سـەری‌بڕین، وە لە قوربانی‌یـەکانی خـۆی‌دا بەشـداری‌کرد، پاشـان فـەرمانی کـرد لەهـەر حوشـترێك پشـکێکی بخرێنـە مەنجەڵێکەوەو کوڵێنرا، وە لەگۆشتەکەیان خواردو لەچەلاوەکەیشی‌یان خواردوە.

دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ سـوار بـۆوەو بـەرەو مـاڵی خـوا ڕۆیشـت‌و طـەوافی کـرد، وەنوێژی نیوەڕۆی لەمەککە کرد، ئنجا هاتە لای (بني عبدالمطلب) کە لـەزەمزەم ئاویـان دەدا بەخەڵکی‌و فەرمووی: ئەی وەچەی (عبدالمطلب) هەڵهێنجن ئەگەر لەبەرئەوە نەبووایە کـە خـەڵکی ئـەو ئاوپێدانـەتان لـێ‌بستێنن منیـش لەگـەڵتان هـەڵم دەهێنجـا، پاشـان دۆلکەیەکیان دایەو لێی‌خواردەوە.

شایانی باسە کە ئەم فەرموودەیە وێڕای (مسلم) هـەرکام لـە (ابـوداود نسـائي و ابـن ماجـة)یـش گێڕاویانەتـەوەو[249] زۆر لـەزانایان شـەرح‌و ڕاڤەیـەکی باشـیان لەسـەر کـردوە بەتایبەت (ابوبکر ابن المنذر) کە وەك (نووي) لێیەوە نەقڵ کردوە سەدو پـەنجاو ئەوەندە جۆرە حوکمی لـێ‌هەڵهێنجاون.[250]

هەروەها (نووي) خۆیشی چل (٤٠) لاپەڕەی بۆ تەرخان کردوە.[251]

## ٢-چۆن حەج‌و عومرە دەکەی؟!

دیارە عومرە ئەگەر بەتەنیا بکرێ جا چ پێش حەج چ دوای حـەج، وە چ لەمانگـەکانی غەیری حەج دا، ئەوە وەك پێشتر باسمان کرد هەر ئەوەیە کە ئیحرام ببەستێ‌و پاشان طەوافی کەعبەو هاتووچۆی نێوان صـەفاو مـەروە بکات‌و لـەکۆتاییدا سـەری بتاشـێ یـان کورتی بکاتەوەو بەو جۆرە عومرەکەی تەواودەبێ.

---

[249] بروانە: (شرح صحیح مسلم) ج٣ص٣٣٢٧.

[250] هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص٣٣٢٨.

[251] کە لەلاپەرە (٣٣٢٧) تا (٣٣٦٦)ی بەرگی سێیەمی (شرح صحیح مسلم)ی گرتۆتەوە.

بەڵام ئەگەر حەج و عومرە وێکڕا بکرێن ئەوە وەك پێشتر ڕوونمان کردۆتەوە سێ حاڵەتی هەن:

ا- (تَمتُّعْ) کە لەئەسڵی زمان دا بەمانای کەڵك و سوود وەرگرتن دێ و، لەزاراوی شەرعیش دا بریتیە لەوەی کە لەمانگەکانی حەج دا ئیحرام بەعومرە ببەسترێ و پاش تەواوکردن و بەجێهێنانی کردوەکانی ئیحرام بشکێندرێ و، ئنجا دووبارە ئیحرام بەحەج ببەسترێ و ئەویش تەواوبکرێ.

ب-(قِرانْ) کە لەئەسڵی زمان دا یانی پێکەوە جووت کران و کۆکردنەوەی دوو شت و، لەزاراوی شەرعیش دا ئەوەیە کە حەج و عومرە لەیەك سەفەردا کۆبکرێنەوە، واتە لەکاتی ئیحرام بەستن دا نیەتی ئەنجام دانی هەردووکیان بهێنێ، جا زۆربەی هەرە زۆری زانایان رایان وایە کە لەم جۆرە حەج و عومرەکردنەدا بۆ هەردووکیان یەك طەواف و یەك سەعی پێویستە، بەڵام (ابو حنیفة) ڕای وایە کە هەرکامێکیان طەوافێك و عومرەیەکی سەربەخۆی پێویستە،[252] دیارە ڕای جەماوەریش ڕاست و تەواوە چونکە لەچەندان فەرموودەی ڕاست و ڕاشکاودا هاتوە کە بابای (قارِنْ) طەوافێك و سەعی‌یەکی بەسن بۆ حەجەکەی و عومرەکەیشی، بۆ وێنە:

*(مَنْ أحْرَمَ بالحجِ والعُمْرة أجْزَأهُ طوافٌ واحدٌ وسَعْيٌ واحدٌ حَتى يحلَّ منهما جَمِيْعاً) رواه الترمذي وصححه و رواه ايضاً احمد وابن ماجة بلفظ قريب منه عن ابن عمر رضي الله عنهما.

واتە: هەرکەسێك ئیحرام بەحەج و عومرە ببەستێ ئەوە یەك طەواف و یەك سەعی بەسە هەتا دوایی ئیحرامی هەردووکیان دەشکێنێ.

هەروەها عائیشە خوا لێی ڕازی بێ گوتوویەتی: (وأما الَّذين جَمعوا بين الحج والعُمْرَةِ فانَّما طافوا طوافاً واحداً) متفق عليه.

وەپێغەمبەر ﷺ بەعائیشەی فەرموو: (يُجْزِيءُ عَنْكِ طوافُكِ بالصَّفا والمَرْوَةِ عن حَجَكِ وعُمْرَتِكِ) رواه مسلم.

بەڵام زانایان یەکدەنگن[253] کەهەرکام لەبابای: (مُتَمَتِعْ) و (قارِنْ) خوێنیان دەکەوێتە سەر کە مەڕێك یان بزنێك یان حەوتیەك (٧/١) ی حوشترێك یان مانگایەکە، چونکە خوای پەروەردگار فەرموویەتی: (فَمَنْ تَمَتَّعَ بِالْعُمْرَةِ إِلَى الْحَجِّ فَمَا اسْتَيْسَرَ مِنْ الْهَدْيِ) البقرة: ١٩٦.

---

[252] بڕوانە: (الفقه الأسلامي) ج٣ص٢٢٨٤، ٢٢٨٥.

[253] بڕوانە: (المغني) ج٣ص٣٢٤.

ج- (إفْراد) كە لەئەسڵی زمان دا بەمانای تاقکردنەوەی شتێك و جیاکردنەوەیەتی لەغەیری خۆی بەڵام لەزاراوی شەرع دا بریتیە لە لەیەك جیاکردنەوەی حەج و عومرە بەجۆرێك كە هەتا لەکردەوەکانی حەج نەبێتەوە ئیحرام بەعومرە نەبەستێ و هەرکامێکیان بەجیا لەوی دیکەیان بکات.

ئێستاش دوای ئەوەی باسی چۆنیەتی عومرەکردنمان کرد چ بەتەنیاو چ لەگەڵ حەجێدا، با ئەمجار باسی چۆنیەتی حەج کردنیش بکەین، بەڵام لەسۆنگەی ئەوەوە کە لەباسەکانی ڕابردوودا بەوردی باسی هەموو کردەوەکانی حەجمان کردوە بەپایەو فەرزو سوننەتەوەو لەسەر هەموویان بەڵگەو دەقەکانمان خستۆتەڕوو، لێرەدا هەروا بەکورتی و گوشراوی و بەڕیز باسی چۆنیەتی ئەنجام دانی حەج و جێبەجێ کردنی کردەوەکانی دەکەین:

**یەکەم**: هەرکاتێك بەرێکەوتنت بۆ سەفەری حەج نیزیك بۆوە جوان خۆت بشۆو نینۆکەکانی دەست و پێت بکەو سمێڵت کورت بکەوەو.. هتد، جا ئەگەر بۆ گەیشتنە میقات زۆری نەمابوو دەتوانی بەرگی ئیحرامیش بپۆشی کە چاکتروایە دوو پەشتەماڵ یان پارچە قوماشی سپی پاك بن، ئەگەرنا دەتوانی سەعاتێك یان کەمتر بەر لەگەیشتنە میقات بیپۆشی و لەمیقات یان لەئاست میقات ئەگەر سواری فڕۆکە بووی و باشتریش وایە ئیحتیات بکرێ و پێش گەیشتنە میقات نیەت بهێنرێ نەوەك لێی تێبپەڕێ و نیەت لەمیقات هێنانەکەت بۆ وەبەر نەکەوێ، دیارە سوننەتە پێش نیەت هێنان دوو ڕکات نوێژیش بکرێ دوایی یەکسەر نیەت بهێنرێ و ئیحرام ببەسترێ، جا ئەگەر بتەوێ بەتەنیا حەج بکەی و (مُفْرِدْ) بی ئەوە نیەت و ئیحرامەکە بەس باسی حەجی تێدا دەکەی، بەڵام ئەگەر بتەوێ سەرەتا عومرەو پاشان حەج بکەی و (مُتَمَتِعْ) بی ئەوە بەس ئیحرام بەعومرە دەبەستی، وە ئەگەر بشتەوێ هەردووکیان پێکەوە ئەنجام بدەی و (قارِنْ) بی باسی هەردووکیان دەکەی و نیەتی هەردووکیان دەهێنی. ئنجا پاش ئیحرام بەستن و نیەت هێنان یەکسەر دەست بەگوتنی (لبيك اللهم لبيك لَبَّيك لاشريك لك لبيك ان الحمد والنعمة لك والملك لاشريك لك) دەکەی.

وە بێجگە لەگوتنی (تلبية) و زیکرو قورئان خوێندن و پاڕانەوە مەگەر بەئەندازەی پێویست ئەگەرنا خۆت لەهەرجۆرە قسەیەکی ئاساییش بپارێزە، چ جای قسەی خراپ و حەرام و شەڕە دەندووکەو شەڕە قسە لەگەڵ ئەم و ئەودا.

**دووەم**: پاشان کەچوویە شاری مەککەو چوویە مزگەوتی حەرام‌و چاوت بەکەعبە کەوت سێ‌جاران (الله اکبر) و (لا اله الا الله) بکەو بپاڕێوە، ئەوجار یەکسەر بچۆ طەوافی چوونە مەککەوە (طواف القدوم) بکەو، ئەگەر (مُفْرِدْ) بووی یان (قارِن)، بەلام ئەگەر (مُتَمتِّعْ) بووی ئەوە یەکسەر سەعیش بکەو عومرەکەت تەواو بکە.

**سێیەم**: ئنجا ئەگەر (مفرد) یان (قارن) بوی ئەوە دیارە ئیحرامت هەر هەیەو نەتشکاندوە بەلام ئەگەر (مُتَمَتِعْ) بوی‌و ئیحرامت شکاندبوو، ئەوە ڕۆژی هەشتەمی (ذوالحجة) کە ڕۆژی تەرویەی پێ‌دەڵێن، ئیحرام بەحەج ببەستەوەو، بچۆ بۆ میناو نوێژەکانی نیوەڕۆو ئێوارەو شێوان‌و خەوتنان‌و بەیانی لەوێ بکەو پاش هەڵهاتنی خۆری ڕۆژی نۆیەمی (ذوالحجة) سەرەتا بەرەو نەمیرەو کردنی نوێژەکانی نیوەڕۆو ئێوارەش بەکۆکراوەیی‌و کورت کراوەیی‌و، پاشان بەرەو عەرەفات بچۆ.

**چوارەم**: لەعەرەفاتیش لەهەر جێیەك بوەستی هەر دروستە بەلام باشتر وایە کە لەلای تاتە بەردەکان‌و ڕووەو قیبلە بوەستی‌و هەتا دوای خۆرئاوابوون سەرگەرمی پاڕانەوەو لالانەوەو زیکر بی.

**پێنجەم**: ئنجا پاش خۆرئاوابوون بەتەواوی‌و لەگەڵ بوولێڵ دا بەرەو موزدەلیفە بچۆو لەوێش پاش کردنی نوێژەکانی شێوان‌و خەوتنان بەکۆکراوەیی‌و کورتکراوەیی، هەتا بەیانی ئیسراحەت بکەو پاش نوێژی بەیانی‌و دنیا ڕووناك بوونەوەش بەرەو مینا بکەوەڕێ.

**شەشەم**: ئنجا کەچوویە مینا سەرەتا بچۆ حەوت بەردووچکە بەجەمرەی گەورەدا بدە، پاشان ئەگەر قوربانیت هەبوو یان خوێنت لەسەربوو بچۆ سەری بڕەو پاشان سەرت بتاشە یان کورتی بکەوە، کە ئەمانەشت کرد گەیشتوویە قۆناغی یەکەمی ئیحرام شکاندن‌و، جگە لەچوونە لای هاوسەرو پێشەکی‌یەکانی هەموو شتێکت بۆ ڕەوایەو دەتوانی خۆت بشۆری‌و پەشتەماڵەکانت دابنێی و خۆت بگۆڕی‌و.. هتد.

**حەوتەم**: پاشان بەرەو مەککەو مزگەوتی حەرام بچۆو طەوافی پایە (طواف الرکن) کە (طواف الزیارة) و (طواف الأفاضة) شی پێ‌دەگوترێ بکەو پاشان ئەگەر (مفرد) یان (قارِن) بووی‌و پاش (طواف القدوم) سەعییت نەکردبوو ئەوە سەعییش بکەو، دوای ئەوەش دەگەیە قۆناغی دووەو کۆتایی ئیحرام شکاندن‌و دوای تەواوکردنی بەردووچکە هاویشتن بۆ سێ جەمرەکان (رمي الجمار الثلاث) لە ڕۆژانی یازدەو دوازدەو سێزدەی مانگ دا یەکجاری خواپەرستی (مَنْسك) یەکانی حەجەکەتت تەواو کردوەو پاش طەوافی خوا حافیزی (طواف الوداع) دەتوانی شاری مەککەی بەڕێز بەجێ‌بهێڵی‌و بەرەو ماڵ بگەڕێیەوە.

# بەندی نۆیەم

## چەند وردە بابەتێکی دیکە لەبارەی حەج و عومرەوە

خوا پشتیوان بێ لەم بەندەش دا چەند بابەتێکی دیکە لەبارەی حەج و عومرەوە دەتوێژینەوە کە لەباسەکانی ڕابردوودا یان هەر باس نەکراون یان زۆر بەکورتی و خێرایی ئاماژەیان پێکراوە.

### ١-ئایا دروستە حەج لە جیاتی زیندوو و مردوو بکرێ؟!

أ-حەج کردن لەجیاتی زیندوو:

زۆربەی هەرەزۆری زانایان کە (ابوحنیفە و شافیعي و أحمد) یان لەنێودان بەدروست و ڕەوا بگرە بەفەرزی دەزانن کە کەسێك لەبەر پیری و کەنەفتی یان لەبەر نەخۆشی‌یەك کە ئومێدی چاکبوونەوەی نەماوە حەجی بۆ نەکرێ و پارەو ئیمکانیەتی حەج کردنیشی هەبێ، یەکێکی دیکە بکاتە جێدار (نائب)ی خۆی و حەجی لەجیاتی بکات، بەڵام (مالك) ڕای وایە کەمادام خۆی لەتواناییدا نەبێ لەسەری پێویست نیە.[٢٥٤]

بەڵام ئەگەر نەخۆشی‌یەکەی وابوو کە ئومێدی چاکبوونەوەی هەبوو، یان گیراو (مسجون) بوو وە هیوای ئازادکرانی هەبوو ئەوە (شافعي وأحمد) دەڵێن بۆی نیە کەس لەجیاتی خۆی بنێرێ و دەبێ چاوەڕێ بکات هەتا چاك دەبێتەوە یان ڕزگاری دەبێ بەڵام (ابوحنیفة) ڕای وایە کە بۆی هەیەو دواییش ئەگەر بۆی لوا پێویستە بیکاتەوە، ئەگەرنا لەسەری لاچووە.[٢٥٥]

بەڵگەی دروست بوونی حەج کردنیش لەجیاتی زیندووی بۆ نەلواو ئەم فەرموودەیەیە:

*(عن ابن عباس رضي الله عنهما أن آمرأة من خَثْعَم قالت یارسول الله إن فریضة الله علی عبادهِ في الحج أدْرَکَتْ أبي شیخاً کبیراً لایثبت علی الراحلة، أفاحجُ عنه؟ قال: نَعَم) رواه البخاري.

واتە: ئافرەتێکی خەثعەمی گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا لەکاتێك دا فەرزی حەجی خوا لەسەر بەندەکانی لەسەر بابم پێویست بووە کە بۆتە پیرێکی گەورەو لەسەر وڵاخ ڕاناوەستێ، جا ئایا حەجی لەجیاتی بکەم؟! فەرمووی: بەڵێ.

---

[٢٥٤] بڕوانە: (المغني والشرح الكبیر) ج٣ص١٧٧.

[٢٥٥] بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو هەمان بەرگ، ص١٧٩.

بەڵام مەرجی ئەو کەسەی کە دەبێتە جێدار و حەج لەجیاتی یەکێك دەکات ئەوەیە کە بۆ خۆی حەجی کردبێ، بە بەڵگەی ئەم دەقە:

*(عن ابن عباس رضي الله عنهما أن رسول الله ﷺ سمعَ رَجُلاً يقولُ: لَبَّيْكَ عــن شُـبْرُمَة، فقـال: أحَجَجْتَ عن نَفْسِك؟ قال: لا، قال: فَحُجَّ عن نفسك ثم حج عن شـبرمة) رواه ابوداود وابن ماجة وقال البيهقي هذا اسناد صحيح.

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ گوێی لەپیاوێك بوو دەیگوت: (لَبَيك) لەجیاتی شوبرەمە، ئەویش فەرمووی: ئایا بۆ خۆت حەجت کردوە؟ گوتی: نەء، فەرمووی: دەجا لەجیاتی خۆت حەجێ بکە پاشان لەجیاتی شوبرەمەش بیکە.

ئنجا ئەمەش کە کەسێك بۆ خۆی حەجی نەکردبێ دروست نیە لەجیاتی یەکێکی دیکە بیکات رای زۆربەی زانایانە.[256] ئنجا وەك (ابن المنذر) یش نەقڵیکردوە زانایان سەرجەم لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە کەسێك بۆ خۆی توانای هەبێ دروست نییە یەکێکی دیکە حەجی لەجیاتی بکات[257].

ب- حەج کردن لەجیاتی مردوو:

زانایان دەربارەی حەج کردن لەجیاتی مردوو رایان جیاوازەو بەشێکیان کە (طاوس) و شافیعی‌یەکان‌و حەنبەڵی‌یەکانیان لەنێودان رایان وایە کە دروستە مردوو حەجی لەجیاتی بکرێ جا وەصیەتی کردبێ یان نا، بەڵام حەنەفی‌یەکان‌و مالیکی‌یەکان گوتوویانە: مەگەر وەصیەتی کردبێ ئەگەرنا دروست نیە،[258] بەڵام بێگومان رای یەکەم راست و تەواوە چونکە چەند فەرموودەیەك لەوبارەوە هەن، بۆ وێنە:

* (عن ابن عباس رضي الله عنهما أن امرأة سالت رسول الله ﷺ عــن أبيـها مـات ولَـمْ يَحُـجَّ، فقال: حَجِّي عن أبيكِ) رواه النسائي.

* (عن ابن عباس رضي الله عنهما أن امــرأة قـالت لرسـول الله ﷺ أن أمـها مـاتَتْ ولَـمْ تحُـجَّ أفيُجْزِئُ عن أُمِّها أن تَحُجَّ عنها؟ فقال: نَعَمْ) رواه النسائي.

وەك دەبینین پێغەمبەر ﷺ لەوەڵامی هەرکام لەو دوو ئافرەتە کە پرسیاریان کردوە ئایا دروستە لەجیاتی باب‌و دایکیان حەج بکەن؟ فەرموویەتی: بەڵێ.

---

[256] بڕوانە: (فقه السنة) ج١ص٦٤٧، وە (المفصل) ج٢ص١٦٢، ١٦٣.

[257] بڕوانە: (المغني) ج٣ص١٨٠.

[258] بڕوانە: (المفصل) ج٢ص١٦٣.

## ٢-مەرج گرتن لەكاتی ئیحرام بەستن دا:

زۆربەی زۆری زانایان بەدروست (جائز) و بگرە بەپەسەندی دەزانن كە بابای حاجیو عومرەكەر لەدەمی ئیحرام بەستن دا مەرج بگرنو بڵێن لەهەر شوێنێك ڕێگامان لێگیراو بۆمان نەكرا، بۆمان هەبێ كە ئیحرام بشكێنین، سوودی ئەم مەرج گرتن (اشتراط) ەش ئەوەیە كە لەهەرجێیەك بەهۆی نەخۆشی یان پارە لێبزر بوون یان ڕێگا لێبەسترانەوە بۆیان نەكرا كەحەجو عومرەكەیان تەواو بكەن ئەوە بۆیان هەیە ئیحرام بشكێننو فیدیەشیان ناكەوێتە سەرێ.

بەلاّم (ابو حنیفة و مالك) ڕایان وایە كە ئەو بەرمەج گرتنە دروست نیە![٢٥٩] بەلاّم بێگومان ڕای زۆربە كە (شافعي و احمد و إسحاق و ابوثور) یان لەنێودا هەن ڕاستو تەواوە چونكە چەندان فەرموودەیان بەدەستەوە هەن بۆ وێنە:[٢٦٠]

* (عن عائشة رضي الله عنها قالت: دَخَلَ رسول الله ﷺ على ضُباعة بنت الزبير، فقال لَها: أردتِ الحجَّ؟! قالَتْ والله! ماأجِدُني إلاّ وَجِعَةً، فقال لها: حُجِّي وَٱشْتَرِطي، وقولي: اللهم مَحَلِّي حيث حَبَسْتَني) رواه البخاري ومسلم واصحاب السنن.

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ چووە لای (ضُباعة)ی كچی (زُبَیر) پێی فەرموو: دەتەوێ حەجێبكەی؟! گوتی: بەخوا پێم وایە نەخۆش دەكەوم، پێی فەرموو: حەجێبكەو مەرج بگرەو بڵێ: ئەی خوایە شوێنی ئیحرام شكاندنی من ئەو جێیەیە كە پێشگیریم لێدەكات.

## ٣-فیدیە[٢٦١] چیەو بەچیوچی پێویست دەبێ؟!

فیدیە بەدەقی قورئان یەكێكە لەسێ شتان، كە خوای پەروەردگار دەربارەی سەرتاشینی بابای ئیحرام دار خستوویەنەڕوو: (وَلَا تَحْلِقُوا رُءُوسَكُمْ حَتَّى يَبْلُغَ الْهَدْيُ مَحِلَّهُ فَمَنْ كَانَ مِنْكُمْ مَرِيضًا أَوْ بِهِ أَذًى مِنْ رَأْسِهِ فَفِدْيَةٌ مِنْ صِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍ) البقرة: ١٩٦.

واتە: وە سەرتان مەتاشن تاكو قوربانیەكە دەگاتە شوێنی كوشتنەوەی خۆی جا ئەگەر یەكێكتان نەخۆش بوو یان سەری ئازارێكی هەبوو پێویستی بەتاشین بوو ئەوە با فیدیە بدات لەڕۆژوگرتن یان بەخشین یان سەربڕین ـی مەڕ یان بزن ـ یێك.

---

[٢٥٩] بڕوانە: (شرح صحیح مسلم) ج٥ص٣٢٦٤، ٣٢٦٥.

[٢٦٠] سەرچاوەی پێشوو، هەمان بەرگ، ص٣٢٦٢.

[٢٦١] زانایان ئاوا پێناسەی فیدیەیان كردوە: (الفداءُ مايُقَدّمُ لله جزاءً لتَقْصيرٍ في عبادة، ككفارة الصّوم والحلق ولبس المخيط في الأحرام.. والأضحية) بڕوانە: (المعجم الوسيط) ص٦٧٨.

پێغەمبەری خواش ﷺ ئەندازەی ئەو ڕۆژوگرتن و بەخشین و سەربڕینەی ڕوون کردۆتەوە وەك لەم فەرموودەیەدا دەبینرێ:[٢٦٢]

*(عن كعب بن عُجْرة رضي الله عنه أن رسول الله ﷺ مَرَّ بهِ زمن الحُديبيَّة، فقال لَهُ: آذاكَ هَوامُّ رأسِك؟! قال كعبٌ: نعم، فقال له النبي ﷺ: إحلِقْ رأسَك ثم اَذبَحْ شاةً نُسُكاً، أو صُمْ ثلاثة ايام، أو أَطْعِمْ ثلاثة آصُعٍ من تَمْرٍ ستة مساكين) رواه مسلم، وهذا لفظه والبخاري وأصحاب السنن.

وەك دەبینین پێغەمبەری خوا ﷺ كە دیتوویەتی ئەسپێی زۆر ئەو هاوەڵەیان ناڕەحەت كردوە، پێی فەرمووە كەسەری بتاشێ، پاشان بۆ پڕكردنەوەی ئەو كەلێنە یەكێك لەسێ شتان بكات و سەرپشك بێت كامیان هەڵدەبژێرێ: سەربڕینی مەڕێك یان بزنێك، گرتنی سێ ڕۆژوو، سێ صاع لەخورما كە بدرێنە شەش نەدار، واتە یەكی دوو مست، چونكە هەر صاعێك چوار مستە.

فیدیەش بەگشتی بۆ چوار شتان دەدرێ:

أ-كردنی شتێك لەو شتانەی كە لەحاڵەتی ئیحرام دا قەدغەكراون جگە لەجیماع، وەك لابردنی مووی جەستەو سەرتاشین،[٢٦٣] نینۆك كردن، جل و بەرگی ئاسایی پۆشین، پێڵاو دەپێ كردن، بۆنی خۆش بەكارهێنان، داپۆشینی سەر بۆ پیاوو دەم و چاو بۆ ئافرەت، ڕاووشكار وبڕین و شكاندنەوەی دارو درەخت و ڕووەكی حەرەم، ماچ كردن و دەستبازی لەگەڵ هاوسەر.

بەلاَم جیماع دەبێتە هۆی تێكدانی حەج و عومرەو دوایی باسی دەكەین سزاكەی چۆنە.

ب-چواندنی یەكێك لەفەڕزەكانی حەج، وەك وردە بەرد هاویشتنەكان، ئیحرام بەستن لە میقات، شەومانەوە لەموزدەلیفە، شەومانەوە لەمینا لەكاتی وردە بەرد هاویشتنەكان دا، نەكردنی طەوافی خوا حافیزی و .. هتد.

شایانی باسیشە كەپێویست بوونی فیدیە بۆ كردنی شتێك لەقەدەغەكراوەكان (محظورات)ی ئیحرام، وە چواندنی یەكێك لەفەڕزەكانی حەج هەموویان یان دەقی قورئان و سوننەت یان لەسەرە، یان یەكدەنگی زانایان، یاخود بەلای كەمەوە یەكدەنگی زۆربەی هەرەزۆریان.[٢٦٤]

---

[٢٦٢] بڕوانە: (شرح صحیح مسلم) ج٥ص٢٢٣٩.

[٢٦٣] ئەوە ڕای زۆربەیە ، بەلاَم (أهل الظاهر) و (مالك) لەڕیوایەتێكیدا دەڵێن مووی هیچ شوێنێك لەجەستەدا جگە لەهی سەر فیدیەی ناوێ، بڕوانە: (المجموع) ج٧ص٢٢٢، ٢٢٣.

[٢٦٤] بۆ وێنە: نینۆك نەمزانیوە هیچ دەقی لەسەربێ بەلاَم یەكدەنگی زانایانی لەسەرە بێجگە لە (داود الظاهري)، بڕوانە: (المجموع) ج٧ص٢٢٣.

ج- و د- ئەنجام دانی حەج و عومرە بەشێوەی (تَمَتُّع) و (قِران) ئەمیش زانایان لەسەری یەکدەنگن کەهەر کەسێك بەیەکێك لەو دووجۆرە حەج و عومرەی کرد پێویستە فیدیە بدات، (ابن قدامە) لەوبارەوە گوتوویەتی: (لانَعْلَمُ خِلافاً في وجوبِ الدمِ على المتَمَتِّع والقارِن..)[٢٦٥]

ئنجا پێویستە ئەوەش بزانرێ کە ئەو شێوە فیدیەدانەی باسمان کرد، دوو شت تۆزێك جیاوازییان تێیدا هەیە:

ا-فیدیەی حەج و عومرەکردن بەشێوەی ( تَمَتُّع) و (قِران) کە بریتیە لە سەربڕینی مەڕێك یان بزنێك، ئەگەر نەیبوو گرتنی دەڕۆژوو، سێیان لەکاتی حەج داو حەوتیشیان پاش گەڕانەوە لەحەج، کەپێشتر روونمان کردۆتەوە.

ب-فیدیەی ڕاوو شکارو بڕین و شکاندنەوەی دارو درەخت و ڕووەکی حەرەم بێجگە لەڕووەکی ئیذخەر (الإذخر)، خوای پەروەردگار دەربارەی فیدیەو کەفارەتی ڕاووشکار لەکاتی ئیحرام دا فەرموویەتی: (يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَقْتُلُوا الصَّيْدَ وَأَنتُمْ حُرُمٌ وَمَن قَتَلَهُ مِنكُم مُّتَعَمِّدًا فَجَزَاءٌ مِّثْلُ مَا قَتَلَ مِنَ النَّعَمِ يَحْكُمُ بِهِ ذَوَا عَدْلٍ مِّنكُمْ هَدْيًا بَالِغَ الْكَعْبَةِ أَوْ كَفَّارَةٌ طَعَامُ مَسَاكِينَ أَوْ عَدْلُ ذَٰلِكَ صِيَامًا) المائدة: ٩٥.

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە لەکاتێك دا کەئیحرامتان هەیە نێچیر مەکوژن، وە هەرکەسێك لەئێوە بەئانقەست بیکوژێ ئەوە سزایەکی وێنەی ئەوەیە کە کوشتوویەتی لەئاژەڵان (حوشترو مانگاو مەڕو بزن) دوو کەسی دادگەرتان بڕیاری لەسەر دەدەن، بکرێتە قوربانی و بەرەو کەعبە ببرێ، یان خواردن بۆ نەداران بکرێتە کەفارەت، یان بارتەقای ئەو خواردنە ڕۆژوو گرتن.

کە سەرجەم زانایان جگە لە (ابوحنیفة) دەڵێن دەبێ چ جۆرە گیانداریکی ڕاوکردوە ئاژەڵێکی هێندەی وی بکرێتە قوربانی، یان بارتەقای نرخەکەی خواردن بدات بەنەداران، یان لەجیاتی هەر مست (مُدّ) یێك خواردن ڕۆژوویەك بگرێ.

بەڵام (ابوحنیفة) ڕای وایە کە فیدیەکەی بەپارەیەو ئەوجار سەر پشك دەکرێ کە قوربانی‌یەکی پێ‌بکڕێ و سەری ببڕێ، یان بارتەقای ئەوە خواردن بکڕێ و هەر نیو صاعی بداتە نەدارێك، یان لەجیاتی هەر نیو صاع ڕۆژوویەك بگرێ.[٢٦٦]

---

[٢٦٥] بڕوانە: (المغني والشرح الكبير) ج٣ص٣٣٤.

[٢٦٦] بڕوانە: (الفقه الأسلامي) ج٣ص٢٣٤٢.

بڕینی دارو درەخت و ڕووەکی حەرەمی مەککەش، مالیکی‌یەکان گوتوویانە تۆڵەی نیە، بەڵام ئەوانی دیکە یەکدەنگن لەسەر تۆڵەو فیدیە، جا هەرچی (ابوحنیفة) یە ڕای وایە کە نرخەکەی بدرێو ببەشرێتەوە، بەڵام شافیعی‌یەکان و حەنبەلی‌یەکان دەڵێن دەبێ بەگوێرەی گەورەیی‌و گچکەیی درەختەکە ئاژەڵێك سەرببڕێ وەك: حوشتر، مانگا، مەڕ، بزن، وە بۆ ڕووەکەکەش بەگوێرەی نرخەکەی ئاژەڵێك دیاری بکرێو بکوژرێتەوە.[٢٦٧]

دەقی سوننەتیش لەسەر قەدەغەیی بڕینو شکاندنەوەی دارو درەختو ڕووەکی حەرەمی مەککە زۆرن، بۆ وێنە:[٢٦٨]

*(عن ابن عباس رضي الله عنهما قال: قال رسول الله ﷺ يوم فتح مكة: إن هـذا البلـد حَرَّمَهُ الله، لايُعْضَدُ شوكُهُ ولايُنَفَّرُ صَيْدُهُ ويُلْتَقَطُ لُقَطَةُ إلاّ مَنْ عَرَّفَها) متفق عليه.

وفي رواية (مسلم): (فقال العَبّاسُ: يا رسول الله إلاّ الأذخر، فإنَّه لِقَيْنِهِمْ ولِبُيُوتِهِمْ: فقـال ﷺ: إلاّ الأذْخَرَ)

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕۆژی گرتنی مەککە فەرمووی: خوا ئەم وڵاتەی حەرام کردوە، نابێ چڕۆو لقو پۆپی دارو درەختی ببڕێ، وە نابێ نێچیرەکانی بسڵەمێنرێنەوە، وە نابێ شتی کەوتووی لێ‌هەڵبگیرێتەوە مەگەر کەسێك کە بیناسێنێو خاوەنی بۆ بدۆزێتەوە.

بەڵام دیارە ڕووەکی ئیذخەر لەو حوکمە گشتی‌یە هەڵاوێرراوە، وەك (عباس) خوالێی‌ڕازی‌بێ پێشنیاری کردوەو پێغەمبەریش ﷺ پێشنیارەکەی وەرگرتوە.

## ٤-هۆی تێکچوونی حەجو عومرە چی‌یەو پێویستە چی بکرێ؟!

زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە هیچ کام لە قەدەغەکراوەکان (محظورات) نابنە مایەی تێکچوونی حەجو عومرەو بەرنەکەوتنیان جگە لەجیماع، (ابن المنذر) لەوبارەوە گوتوویەتی:[٢٦٩] (اجمع اهلُ العلم على أن الحج لايَفْسُدُ بأتيان شيئ في حال الأحرام إلاّ الجماع).

هەروەها زانایان لەسەر ئەوەش یەکدەنگن کە دەبێ بابای جیماع کەر لەحاڵەتی ئیحرام دا کەفارەتو فیدیە بدات، جا هەرچی زۆربەن کە (مالك و شافعي و احمد) یان لەنێودان دەڵێن: دەبێ ئەو فیدیەیە حوشترێك بێت جا چ نێر بێ چ مێ، بەڵام (ابوحنیفة) دەڵێ: دەبێ مەڕێك یان بزنێك بێت.[٢٧٠]

---

[٢٦٧] سەرچاوەی پێشوو، هەمان بەرگ، ص٢٣٤٣.

[٢٦٨] بڕوانە: (المغني) ج٣ص٣٦٤، ٣٦٥.

[٢٦٩] بڕوانە: (المغني والشرح الكبير) ج٣ص٥١٣.

[٢٧٠] بڕوانە: (المفصل) ج٢ص٣٤٨، ٣٤٩.

هەروەها زۆربەی زانایان ڕایان وایە کە بابای حەج و عومرە لێ‌تێکچوو لەسەری فەرزە کە درێژە بەحەج و عومرەکەی بداتو بیانگەیەنێتە سەر هەرچەندە بۆیشی بەرناکەون، چونکە خوای کاربەجێ فەرموویەتی: ﴿وَأَتِمُّوا الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ لِلَّهِ﴾ البقرة: ١٩٦.

(مالك)یش ڕای وایە کە ئەگەر حەج بوو بیکاتە عومرە، (داود الظاهري)یش گوتوویەتی: هەرکام لەحەجو عومرە لەوحاڵەتەدا دروست نیە لەسەریان بەردەوام بێتو دەبێ دەستیان لێ‌هەڵگرێ،[٢٧١] واش پێ‌دەچێ بەڵگەی جەماوەر لەهی ئەوانی دیکە بەهێزتربێت.

وە تێکڕای زانایان لەسەر ئەوەش کۆکن کە گێڕانەوە (قضاء) ی ئەوجۆرە حەجو عومرەیە پێویستە، ئەوەندە هەیە بەشێکیان کە شافیعی‌یەکان و حەنبەلی‌یەکانیان لەنێودان دەڵێن دەبێ بەزووترین کات واتە ساڵی ئاییندە بیانگێڕنەوەو هەندێکیشیان گوتوویانە دەستبەجێ (فوراً) گێڕانەوەیان فەرز نیە.[٢٧٢]

## ٥-ڕێگا لێ‌گیرانو فریانەکەوتنی وەستان لەعەرەفات (الأحْصارُ والفَوات):

أ-وشەی (إحْصار) لەئەسڵی زمان دا بەمانای نەهێشتنو ڕێ‌لێ‌گرتن (المنع والحبس) دێت، بەڵام لەزاراوی شەرع دا (مُحْصَرْ) ناوە بۆ کەسێك کەئیحرامی بەستوە پاشان پێشگر (مانع) ێکی هاتۆتە بەر کە لەڕووی شەرعی‌یەوە ئیعتیباری پێ‌دەکرێو ڕێی تەواوکردنی حەجو عومرەی لێ‌گرتوە.[٢٧٣]

ئنجا سەرجەم زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە هەرکەسێك لەترسی دوژمنەکەی حەجی بۆ نەکرێ ئەوە لەڕووی شەرعەوە خاوەن عوزرەو بۆی هەیە ئیحرامەکەی بشکێنێ، بەڵام ئایا نەخۆشیو پارە لێ‌بزر بوونو حەپس کرانو.. هتدیش بەعوزر دادەنرێن یان نا؟! زانایان لەوبارەوە دوو ڕایان هەن، بەشێکیان ڕایان وایە کە ئەو شتانە بەعوزر دانانرێنو هەرکام لە (مالك و شافعي و اسحاق و احمد) خاوەنی ئەو ڕایەن، بەشێکیشیان کە (حەنەفی‌یەکانو النخعي و ثوري و ابوثور)یان لەنێودان، ڕایان وایە کە بەهەر شتێكو هەر شێوەیەك ئینسان ڕێی لێ‌بگیرێو دەرفەتی بەجێ‌هێنانی حەجو عومرەی نەبێ ئەوە بە (مُحْصَرْ) دادەنرێ[٢٧٤]



[٢٧١] بڕوانە: (المفصل) ج٢ص٣٥٤.

[٢٧٢] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[٢٧٣] بڕوانە: (النهایة في غریب الحدیث والأثر) ج١ص٣٩٥، وە بڕوانە: (الفقه السنة) ج١ص٧٧٢، وە بڕوانە: (الفقه الأسلامي وادلته) ج٣ص٢٣٤٧تا ٢٣٥٦.

[٢٧٤] بڕوانە: (المفصل) ج٢ص٢٩٤، وە بڕوانە: (الفقه الأسلامي) ج٣ص٢٣٤٨.

بێگومانیشم کەڕای دووەم بەهێزترە چونکە فەرمایشتی خوای کاربەجێ: (وَأَتِمُّوا الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ لِلَّهِ فَإِنْ أُحْصِرْتُمْ فَمَا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْيِ) البقرة: ١٩٦، واتە: وە حەج و عومرە بۆ خوا بەتەواوی بەجێ بهێنن، وە ئەگەر ڕێتان لێ بەسترا، ئەوە قوربانییەك كە بۆتان هەڵدەسووڕێ و ئاسانە بیکوژنەوە.. ، بەڵێ وشەی (أُحْصِرْتُمْ) گشتییەو تایبەت نەکراوە بەدوژمنەوەو پێویستە هەروەك خۆیشی بەگشتی بهێڵرێتەوە، مادام بەڵگەیەکی شەرعی ڕوونو بێ چەندو چوون نیە لەسەر تایبەت کردن (تخصیص)ی چەمکەکەی بەشتێکەوە.

حوکمی بابای ڕێی حەجو عومرەکردن لێگیراویش ئەوەیە کە:

یەك: ئیحرام بشکێنێ، بەڵام دەبێ دوایی فیدیە بداتو مەڕێك یان بزنێك سەرببڕێ، ئەمەش ڕای زۆربەی زانایانە، بەڵام (مالك) گوتوویەتی فیدیەی لەسەرنیە،[٢٧٥] بەڵام مادام خوای پەروەردگار فەرموویەتی: (فَإِنْ أُحْصِرْتُمْ فَمَا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْيِ) ڕایەکەی مالك وەك (ابن قدامة) گوتوویەتی: ڕاست نیە.[٢٧٦]

دوو: ساڵی دوایی یان هەرکاتێك بۆی لوا ئەوەی کە ئیحرامی بۆ بەستوە کە دەگونجێ حەج یان حەج و عومرە یان بەس عومرە بێت بیگێڕێتەوە.[٢٧٧]

بەڵام وەك پێشترو لەخاڵی دووەمی ئەم بەندەدا گوتمان ئەگەر لەکاتی ئیحرام بەستن دا مەرجی گرتبێ کە لەهەر شوێنێك ڕێی لێگیرا ئیحرام بشکێنێ، ئەوە بەڕای زۆربەی زانایان فیدیەی ناکەوێتە سەر.[٢٧٨]

دیارە لەسەر ڕای ئەوانەش کە بەس ترسی دوژمن بەپێشگیر (مانع) دەزانن، بابای ڕێلێگیراو بەهۆی نەخۆشیو حەپس کرانو وڵاخ و پارە لێ بزربوونو.. هتدەوە، مادام مەرجی نەگرتبێ بۆی نیە ئیحرامەکەی بشکێنێ هەتا قوربانییەکەی دەنێرێتە مەککەو لەوێ دەکوژرێتەوە،[٢٧٩] دەبێ ئیحرامی هەر هەبێ و قەدەغەکراوەکان (محظورات) ی ئیحرامیشی هەر لێ قەدەغەن.

ب-وشەی (فَوات) لەئەسڵی زمان دا بەمانای لەدەست چوونو فریانەکەوتنەو، لەزاراوی شەرعیشدا بەوە دەگوترێ کە کەسێك ئیحرامی حەجی بەستبێ و بەرەو ئەنجام

---

[٢٧٥] بڕوانە: (المفصل) ج٢ص٢٩٥.

[٢٧٦] بڕوانە: (المغني) ج٣ص٣٧١.

[٢٧٧] هەمان سەرچاوەو بەرگ، ص٣٧٩، وە: (المفصل) ج٢ص٢٩٧.

[٢٧٨] سەرچاوە بەرگی پێشوو، ص٣٧٧.

[٢٧٩] هەمان سەرچاوەو بەرگ و لاپەڕە.

دانی کەوتبێتەڕێ، بەڵام بەهۆی پێڕانەگەیشتن‌و فریانەکەوتنی ڕاوەستان لەعەرەفاتەوە کە پایەی هەرەمەزن‌و بنەڕەتی حەجە حەجەکەی بفەوتێ.

جا هەر کەسێك بەوجۆرە حەجی فەوتا ئەوە بەڕای زۆربەی نیزیك بەیەکدەنگی زانایان پێویستە سێ شتان بکات:

*یەك: کردەوەکانی عومرە ئەنجام بدات، واتە حەجەکەی بگۆڕێ بەعومرە.*

*دوو: ساڵی ئاینده حەجەکەی بگێڕێتەوە.*

*سێ: مەڕێك یان بزنێك بکاتە قوربانی وەك فیدیەو کەفارەت.*

بەڵگەی ئەم ڕایەش کە لە (عمر بن الخطاب و ابن عمرو زید بن ثابت و ابن عباس و ابن الزبیر) خوالێیان ڕازیبێ گێڕاراوەتەوەو (حەنەفی‌یەکان‌و مالك و ثوري و شافیعی‌یەکان و حەنبەلی‌یەکان)یش لەسەری پێکهاتوون ئەم دەقەیە:[280]

* (عن سليمان بن يسار أن أبا ايوب الأنصاري خرج حاجاً حتى إذا كان بالنازية من طريق مكة أَضَلَّ رَوَاحِلَهُ، وانه قدِمَ على عمر بن الخطاب يوم النحر، فذكر ذلك لَهُ فقال عمر: إصْنَع كما يَصْنَعُ المُعتمِرُ ثم قدْ حَلَلْتَ، فاذا أدْرَكك الحجُّ قابلاً فَاحْجُجْ وأهدِ مااسْتَيْسرَ من الهدي) رواه مالك والشافعي.

واتە: (ابو أيوب الأنصاري) چووە حەج‌و لەناوچەی نازیە لەڕێی مەککە وڵاخەکانی لێ‌ون بوو، پاشان ڕۆژی قوربانی سەربڕین بە (عمر بن الخطاب) خوالێی‌ڕازیبێ گەیشت‌و ئەوەی بۆ باس کرد. عومەریش پێی گوت: بابای عومرەکەر چی دەکات بیکەو دوایی ئیحرام بشکێنە، ئنجا ئەگەر ساڵی دوایی فریای حەج کەوتی حەجێ بکەو مەڕێك یان بزنێك سەربڕەو، بیکە قوربانی.شایانی باسیشە کە (أبوحنيفة) بەپێچەوانەی ڕای زۆربەو جەماوەرەوە پێی وایە کە بابای حەج فەوتاو خوێنی لەسەر نیە.[281]

## ٦- جیاوازی‌یەکانی ئافرەت لەپیاو لەچەند کردەوەیەکی حەج‌و عومرەدا:[282]

پیاوو ئافرەت لەکردەوەکانی حەج‌و عومرەدا وەك یەکن، بەڵام بەڕای سەرجەم یان لانی کەم زۆربەی هەرەزۆری زانایان لەچەند وردە شتێك دا لەیەك جیان:

---

[280] بڕوانە: (الموطأ) ص٣٢٦، وە بڕوانە: (الأم) للشافعي، ج٢ص١٦٦، هەروەها بڕوانە (المفصل في احكام المرأة والبيت المسلم) ج٢ص٣٥٩، ٣٦٠، وە بڕوانە: (المجموع) ج٨ص٢٢٠.

[281] بڕوانە: (الفقه الأسلامي) ج٣ص٢٣٤٤.

[282] بۆ نووسینی ئەم خاڵە پشتم بە (المجموع) ج٧ص٣٢٢، ٣٢٣، بەستوە.

یەك: لەبەرگو پۆشاكی ئیحرام دا كە ئافرەت هەر بەرگی ئاسایی خۆی دەپۆشێ.

دوو: لەكاتی گوتنی: (لبيك اللهم لبيك ... الخ) ئافرەت دەنگی هەڵناهێنێ و بەنزمی دەیڵێ.

سێ: پیاو سەری داناپۆشێ بەڵام ئافرەت ڕووی داناپۆشێ مەگەر لەكاتی مەترسی گوناح دا.

چوار: (رَمَلْ) و (إضْطِباعْ) بۆ پیاو سوننەتن بەڵام بۆ ئافرەت یەكەمیان بەلای كەمەوە ناپەسەند (مكروه) و دووەمیشیان بەمسوگەری حەرامە.

پێنج: لەكاتی هاتنو چوونی (سعي) نێوان صەفاو مەروەدا پیاولەنێوان دوو كۆڵەكە سەوزەكان (العمودين الأخضرين) بەگورگە لۆقە دەڕوات، بەڵام ئافرەت نا.

شەش: سوننەتە پیاو سەركەوێتە سەر صەفاو مەروە، بەڵام بۆ ئافرەت سوننەت نیە، بگرە ناپەسندیشە.

حەوت: پیاو لەكاتی بەردووچكە هاویشتنەكان دا دەست بەرز دەكاتەوە، بەڵام ئافرەت نا.

هەشت: سوننەتە پیاو بۆ خۆی قوربانییەكەی سەرببڕێ، بەڵام بۆ ئافرەت سوننەت نیە.

نۆ: تاشینی سەر لەكورت كردنەوەی بۆ پیاوان خێرترەو چاكترە، بەڵام بۆ ئافرەتان تەنیا كورت كردنەوە هەیەو تاشین ناپەسندە وەك (نووي) گوتوویەتیو، منیش پێم وایە قەدەغەیە چونكە بۆ ئافرەتان سەرتاشران ئەتكە.[٢٨٣]

دە: هەروەها بۆ ئافرەتان بەپێچەوانەی پیاوانەوە چوونە لای تاتە بەردەكان (صخرات) لەعەرەفاتو نیزیك كەوتنەوە لەكابە (كعبة) لەكاتی طەواف كردن دا مەگەر ئاسان بێو تێكەڵاوی زۆر دروست نەبێ ئەگەرنا سوننەت نین، هەروەها هەر جۆرە پارێزكردنو خۆ دوور گرتنێكی دیكەی لەو بابەتە لەكاتو شوێنو حاڵەتە قەڵەباڵغەكان دا بۆ ئافرەت شتێكی پەسندە، وەك لەدەقە گشتییەكانی قورئانو سوننەت كە لەوبارەوە هاتوون دەفامرێتەوە.



[٢٨٣] دیارە ئەگەر عورفی كۆمەڵگایەك وابێ كەسەرتاشینی ئافرەتان بەئەتكو سوكایەتی نەزانێ حوكمەكەی جیایە.

## ٧-سنووری تایبەتمەندییەکانی حەرەمی مەککەو مەدینە:

وشەی حەرەم (الحَرَمْ) لەئەسڵی زمان دا بەهەر شوێنو شتێکی خاوەن رێزو حورمەت دەگوترێ کە پاراستنو پارێزگاری لێکردنی پێویستە، هەربۆیەش بەناموسی ئینسانو ماڵو خێزانی دەگوترێ (حەرەم)، هەروەها حەرەم ناوە بۆ پەناگەو حەشارگەیەك کەئینسان تێیدا سەلامەتو پارێزراو دەبێ.[٢٨٤]

بەڵام لەزاراوەوعورفی شەرع دا وشەی حەرەم بۆ هەردووك شاری موبارەکی مەککەو مەدینەو دەوروبەریان بەکاردێت.

جا ئێمە خوا یاربێ لەم خاڵەدا بەکورتی سەرەتا چەند دەقێك دەربارەی حەرەم بوونی هەرکام لەمەککەو مەدینە دەخەینەڕوو، پاشان سنوورەکانیان واتە سنووری حەرەمەکانیان ڕوون دەکەینەوەو، لەکۆتاییش دا تایبەتمەندییەکان (خصائص) یان دەخەینەڕوو:

**یەك: چەند دەقێك دەربارەی بەحەرەم دانرانی مەککەو مەدینە:**

*(عن أنس رضي الله عنه أن النبي ﷺ قال: أللهمَّ أن إبراهيم حَرَّمَ مكةَ وإنـي أحـرِّمُ المدينـة ومابَيْنَ لابَتَيْهَا) متفق عليه.

واتە: ئەی خوایە بێگومان ئیبراهیم مەککەی حەرام کردوە، جا منیش مەدینەو ئەوەی دەکەوێتە نێوان دوو تەنیشتەکانییەوە حەرام دەکەم.

*(عن جابر رضي الله عنه قال: قال رسول الله ﷺ إن ابراهيم حَرَّمَ مكّةَ وإنـي حَرَّمْتُ المدينـة مابَيْنَ لابَتَيْها لايُعْضَدُ عضاهُها ولايُصادُ صَيْدُها) رواه مسلم.

واتە: بێگومان ئیبراهیم مەککەی حەرام کردوە، وەمنیش مەدینەم حەرام کردوە ئەوەی دەکەوێتە نێوان دوو لایەکانییەوە، نابێ ڕووەکی دڕکاوی ببڕدرێو نێچیری ڕاوبکرێ.

کەواتە: مەبەست لەحەرام کردنی مەککەو مەدینە ڕێزو حورمەت بۆ دانانێکی زیادەیە بەهۆی ڕاونەکردنی نێچیرەکانیانو نەبڕینو هەڵنەپساندنو شکاندنەوەی دارو درەختو ڕووەکیان مەگەر ئەو جۆرانەی یان لەو حاڵەتانەدا و بۆ ئەو ئامانجانەی کەشەرع ڕێی داوە.

شایانی باسیشە کە زۆربەی[٢٨٥] زانایان ڕایان وایە کە مەککەو دەوروبەری هەر لەڕۆژی بەرێوە خوا ڕێزو حورمەتی زیادەی لێناوەو ئەو شتانەی تێدا حەرام کردوون کە لەشوێنەکانی دیکەی دنیادا حەڵاڵن، بەڵگەشیان چەند فەرموودەیەکە کە ئەمە یەکێکیانە:

---

[٢٨٤] بڕوانە: (المعجم الوسيط) ص١٦٨، ١٦٩.

[٢٨٥] بڕوانە: (المجموع) ج٧ص٣٨٦، ٣٨٧، هەندێکیشیان گوتوویانە: بەس لەڕۆژگاری ئیبراهیمەوە حەرام کراوە.

* (عن ابن عباس رضي الله عنهما أن النبي ﷺ قال يوم فتح مكة: هذا بَلَدٌ حَرَّمَهُ الله تعالى يوم خلق السَّموات والأرض وهو حرامٌ بحرمةِ الله الى يوم القيامة) متفق عليه.

واتـه: ئەوە وڵاتێکە کە خوای بەرز لەو ڕۆژەوە کـە ئاسمانـەکانو زەوی خوڵقـاندوون حەرامی کردوە جا بەهۆی حەرام کردنی خواوە هەتا ڕۆژی قیامەت حەرامە.

وە مەبەست لەوشـەی (لابَتَیْها) دوو لایـەکانی کە دەربارەی مەدینە فەرموویـەتی، وەك لـەم فەرموودەیـەدا دەردەکـەوێ، ئـەو دوو زنجیرە بـەردە[286] ڕەشـانەن کـە لەڕۆژهـەڵاتو ڕۆژئاوای مەدینەن، وەك دوو زنجیرە چیای گچکەو نزم:

*(عن أنس رضي الله عنه أن النبيَّ ﷺ لما أشرَف على المدينةِ قال: أللهمَّ إنـي أحَـرِّمُ مـابَيْنَ جَبَلَيْـها مثلَ مـاحَرَّم بـهِ إبراهيـمُ مكــةَ) رواه البخاري، واتـه: کـاتێك وەڕووی مەدینـە کـەوت، فەرمووی: ئەی خوایە وەك چۆن ئیبراهیم مەککەی حـەرام کرد منیش ئەوەی دەکەوێتـە نێوان دوو چیاکانی‌یەوە حەرامی دەکەم.

دوو: سنووری حەرەمی مەککەو حەرەمی مەدینە:

(نووي) گوتوویەتی:[287] مەبەست لەحەرەمی مەککە مەککەو دەوروبەریەتی.. کە لـەلای مەدینەوە بەدووری سێ (٣) میلو لەلای یەمەنەوە بەدووری حەوت (٧) میل لەمەککەوەو، لەڕێگای (طـائف) ەوە ڕووەو عەرەفات بۆ ماوەی حـەوت (٧) میـلو، لـەڕێگای عێراقـەوە دیسـان بـەدووری حـەوت (٧) میـلو، لـەڕێگای (الجعرانـة) وە بـەدووری نـۆ (٩) میـلو، لەڕێگای (جِدة)وە بەدووری دە (١٠) میل لەمەککەوەیە.

ئەمـە بـەکورتی سـنووری حـەرەمی مەککی‌یـە، سـنووری حـەرەمی مەدینـەش وەك لەفـەرموودەکانی پێغەمبـەردا ﷺ بـەڕوونی و ڕاشـکاوی خراوەتـەڕوو بریتیـە لەمەدینــەو دەوروبـەری ئـەوەی کەدەکەوێتـە نێـوان دوو لایـە شـاخاوی‌یەکەیەوە بـەباری درێــژی و پانی‌دا،[288] وەك لەچەندان فەرموودەدا هاتووە پێشتر ئاماژەمان بەهەندێکیان کرد، ئەمەش یەکێکی دیکەیانە:

* (عن أبي سعيد رضي الله عنه أن رسول الله ﷺ قـال: أللـهمَّ إنَّ ابراهيـم حَـرَّم مكـةَ فجعلـها حَراماً واني حرَّمْتُ المدينةَ حَراماً مابين مَأْزَمَيها أنْ لايُهراق فيـها دَمٌ ولا يُحمل فيـها سِلاحٌ لِقتـالٍ ولايُخْبَطَ فيها شجَرٌ إلا لِعَلْفٍ) رواه مسلم.

---

[286] بڕوانە: (الفقه الأسلامي) ج٣ص٢٣٩٦، کە گوتوویەتی: (واللاّبة: ارض ذات حجارةٍ سود).

[287] بڕوانە: (المجموع) ج٧ص٣٨٥، وە : (الفقه الأسلامي) ج٣ص٢٣٨٠، ٢٣٨١.

[288] بڕوانە: (المجموع) ج٧ص٣٩٨.

واتە: ئەی خوایە ! ئیبراهیم مەککەی حەرام کردوەو بەقەدەغەی داناوە، جا منیش مەدینەم حەرام کردوەو ئەوەی دەکەوێتە نێوان دوو تەنیشتەکانی‌یەوە کردوومەتە قەدەغە کە هیچ خوێنێکی تێدا نەرێژرێ‌و هیچ چەکێکی بۆ جەنگ تێدا هەڵنەگیرێ‌و گەڵای درەختی تێدا نەوەرێنرێ مەگەر بۆ ئالف.

بەشێکیش لەزانایانی شەرعزان‌و شوێنەوارناس بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی سنووری حەرەمی مەدینە گوتوویانە:[٢٨٩] سنووری حەرەمی مەدینە لەهەر چوار لایەوە بەدووری بەرید (بَريدْ)ێکە جا دیارە بەریدێك چوار فەرسەخ‌و هەر فەرسەخێکیش سێ میلە، کەواتە بەریدێك دەکاتە دوازدە (١٢) میل، بەڵگەشیان ئەم دەقەیە:

*(عن علي رضي الله عنه قال: قال رسول الله ﷺ : المدينة حَـرامٌ مـابَيْنَ عَـيْرٍ الى ثَـوْر) متفق عليه، واتە: مەدینە لەعەیرەوە تا ثەور حەرامە.

جا گوتوویانە:[٢٩٠] عەیر چیایەکی ناودارە لەنیزیك مەدینەوەو ثەوریش چیایەکی گچکەیە لەپشت چیای ئوحودەوە لەلای سەروویەوە.

## سێ: تایبەتمەندی‌یەکانی دوو حەرەمەکان (خصائص الحرمين):

### أ-تایبەتمەندی‌یەکانی حەرەمی مەککە:

١-زۆربەی زانایان ڕایان وایە فەرزەو شافیعی‌یەکانیش دەڵێن سوننەتە کە بەبێ ئیحرام نەچی‌یە نێو حەرەمی مەککەوە.[٢٩١]

٢-بەیەکدەنگی زانایان ڕاوکردنی نێچیری‌و برین‌و هەڵپساندنی دارو درەخت‌و ڕووەکی حەرامە، وەك پێشتر باسمان کرد، دیارە ئەهلی حەرەم‌و بێ‌ئیحرامیش لەو حوکمەدا یەکسانن.[٢٩٢]

٣-زۆربەی زانایان نیشتەجێبون‌و پێدا ڕەت بوونی ئینسانی کافر لەحەرەم دا بەحەرام دەزانن، بەڵام (ابوحنيفة) پێدا تێپەڕبوون بەدروست (جائز) دەزانێ.[٢٩٣]

٤-هیچ کەس بۆی نیە شتی دۆزراوە (لقطة) هەڵبگرێتەوە مەگەر بۆ کەسێك کە خاوەنی بۆ پەیدا بکاتەوەو بانگ بکات‌و بیناسێنێ.[٢٩٤]

---

[٢٨٩] بڕوانە: (الفقه الأسلامي) ج٣ص٢٣٩٥، ٢٣٩٦، وە : (المجموع) ج٧ص٣٩٨.
[٢٩٠] بڕوانە: (الفقه الأسلامي) ج٣ص٢٣٩٦، لە :(إعلام الساجدْ) ص ٢٢٦تا ٢٢٩.
[٢٩١] بڕوانە: (الفقه الأسلامي) ج٣ص٢٣٩٠، وە: (المجموع) ج٧ص٣٨٨,٩
[٢٩٢] بڕوانە: (المجموع) ج٧ص٣٨٨، وە: (الفقه الأسلامي) ج٣ص٢٣٩٠، ٢٣٩٢.
[٢٩٣] هەمان سەرچاوەی پێشوو.
[٢٩٤] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٥-تێدا نێژرانی هاوبەش بۆ خوا دانەر، یان دەرهێنانەوەی ئێسکو پرووسکی حەرامە.[٢٩٥]

٦- کەسێك لەحەرەم دا یەکێك بکوژێ خوێنەکەی قورستر دەکرێ لەکوشتن لەشوێنەکانی دیکە.[٢٩٦]

٧-بەڕای زۆر لەزانایان کە (ابوحنیفة و احمد) و ظاهیریەکانیان لەنێودان کەسێك سزا (حَدّ) و تۆڵە (قصاص)ێکی شەرعی لەسەر پێویست بووبێ هەتا لەسنووری حەرەمی مەککەدا بێ نابێ بەسەریدا بچەسپێنرێ، بەڵام مالیکیەکانو شافیعیەکان دەڵێن حەرەمیش وەك شوێنەکانی دیکەیە لەوبارەوە،[٢٩٧] چونکە خوای کاربەجێ فەرموویەتی: (وَلا تُقَاتِلُوهُمْ عِندَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ حَتَّى يُقَاتِلُوكُمْ فِيهِ) البقرة: ١٩١، وە پێغەمبەریش ﷺ ڕێی داوە کەپێنج گیاندارە زیانبەخشەکان (الفواسق الخمس) لەهەموو شوێنێك بکوژرێن.

لایەنگرانی ڕای یەکەمیش بەفەرمایشتی خوا: (وَمَنْ دَخَلَهُ كَانَ آمِنًا) آل عمران: ٩٧، وە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ: (ان مكة حَرَّمها الله ولم يُحَرِّمْها الناسُ فلا يَحِلُّ لِامرئٍ يؤمن بالله واليوم الآخر أن يَسفِك بها دَماً..) متفق عليه، بەڵگە دێننەوە.

منیش وای بۆ دەچم ڕای دووەم بەهێزتربێت، چونکە دەگونجێ بگوترێ مەبەست لە: (وَمَنْ دخَلَهُ كان آمِناً) ئەوەیە کە خوای پەروەردگار ئازاردانو خوێن ڕشتنی بەناهەقی تێدا حەرامتر کردوە لەشوێنەکانی دیکە، هەروەها: (.. فلا يحلّ لامرئ يؤمن بالله واليوم الآخر أن يسفك بها دَماً..) بەهەمان شێوە مەبەست خوێن ڕشتنی بەناهەقە.

ئەگەر یەکێکیش بڵێ: جا خۆ ئازاری خەڵك دانو خوێن ڕشتنیان لەهەموو جێیەك هەر حەرامە!! دەڵێین: ڕاستە بەڵام لەوێدا حەرامترو گوناحو سزای گەورەترە.

٨- بابای (متمتع) و (قارن) مادام خەڵکی سنووری حەرەم بن خوێنو فیدیەیان لەسەر نیە.[٢٩٨]

٩- چەك هەڵگرتن بەبێ پێویست بوون لەسنووری حەرەمی مەککەدا حەرام یان لانی کەم ناپەسندە، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لايَحِلُّ أنْ يُحْمَلَ السلاحُ بمكة) رواه مسلم عن جابر رضي الله عنه.[٢٩٩]

---

[٢٩٥] بڕوانە: (المجموع) ج٧ص٣٩٨، وە : (الفقه الأسلامي) ج٣ص٢٣٩٢.

[٢٩٦] بڕوانە: (المجموع) ج٧ص٣٩٨، وە (الفقه الأسلامي) ج٣ص٢٣٩٢.

[٢٩٧] بڕوانە: (الفقه الأسلامي) ج٣ص٢٣٩٢، ٢٣٩٣.

[٢٩٨] بڕوانە: (المجموع) ج٧ص٣٩٨، وە : (الفقه الأسلامي) ج٣ص٢٣٩٢.

١٠-سەرجەم زانایان ڕایان وایە کە هەموو ئەو فیدیانەی کە بەهۆی ئیحرامەوە لەسەر بابای ئیحرام دار (مُحْرِمْ) فەرز دەبن، وەك فیدیەی (تَمتُّعْ) و (قِرانْ) و کردنی یەکێك لەشتە حەرام کراوەکان وەك بەکارهێنانی بۆنی خۆش، وە سزاو تۆڵەی ڕاوکردنی نێچیرو بڕینی دارو درەخت و ڕووەکی حەرەم، بەڵێ هەموو ئەو فیدیانە چ ئاژەڵی سەربڕاو بن چ خواردەمەنی پێویستە بدرێن بەخەڵك و دانیشتووانی حەرەم، چونکە خوای پەروەردگار فەرموویەتی: (.. ..هَدْيًا بَالِغَ الْكَعْبَةِ) المائدة: ٩٥.[٣٠٠]

١١- بەڕای زۆربەی هەرەزۆری[٣٠١] زانایان مەککە چاکترین (أفْضَل) شوێنە لەسەر زەوی بە بەڵگەی ئەوە کە (عدي بن الحمراء) خوالێیڕازیبێ گێڕاویەتەوە کە لەکاتێك دا پێغەمبەر ﷺ سواری وڵاخەکەی بوو بو ڕوو بەمەککە فەرمووی: (والله إنَّكِ لَخَيْرُ أرضِ الله وأحَبُّ الى الله ولولا أني أُخرِجْتُ ماخَرَجْتُ) رواه احمد واصحاب السنن الا ابا داود وقال الترمذي : حسن صحيح.

١٢- نوێـژو طاعەتـەکانی دیکـەش لەمەککـەدا و بەتایبـەت لەمزگـەوتی حـەرام دا پاداشتیان زیاترە، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (صلاةٌ مِن مَسْجدي هذا أفْضَلُ من ألْف صلاةٍ فيما سِواهُ من المساجِدِ إلاّ المسجِدَ الحرامَ وصلاة في المسجد الحرام أفْضَلُ من مائة صلاة في مَسجدي) رواه احمد والبيهقي باسناد حسن، کە پێشتر لەباسی نوێژدا تەرجەمەمان کردوە.

١٣-مزگەوتی حەرام یەکەمین مزگەوتە لەسەر زەوی دروست کراوە بۆ خواپەرستی تێداکردن، بە بەڵگەی ئەم فەرموودەیە:

*(عن أبي ذر رضي الله عنه قال: سألْتُ رسول الله ﷺ عن أوَّلِ مَسْجِدٍ وُضِعَ في الأرض؟ قال: المسجدُ الحرامُ، قُلتُ: ثـم أيُّ؟ قـال: المَسجِدُ الأقْصى، قُلْـتَ كَـمْ بَيْنَـهُما؟! قـال: أربعونـه عامـاً) رواه البخاري ومسلم.

واتە: پرسیارم لەپێغەمبەری خوا ﷺ کرد لەبارەی یەکەمین مزگەوتەوە کە لەسەر زەوی دانـراوە؟ فـەرمووی: مزگـەوتی حەرامـە، گـوتم: ئـەدی دوای ئـەو؟ فـەرمووی: مزگـەوتی ئەقصا، گوتم: ماوەی چەندیان نێوان بووە؟ فەرمووی: چل (٤٠) ساڵ.

---

[٢٩٩] بڕوانە: (المجموع) ج٧ص٣٨٩.

[٣٠٠] بڕوانە: (المجموع) ج٧ص٤٠٠، ٤٠١.

[٣٠١] هەمان سەرچاوەو بەرگ و لاپەرە.

ب- تایبەتمەندییەکانی حەرەمی مەدینە:

١-نوێژێك لەمزگەوتی پێغەمبەردا ﷺ پاداشتی هەزار نوێژی هەیە کە لەشوێنەکانی دیکە بکرێ جگە لەمزگەوتی حەرام لە مەککە وەك پێشتر باسمان کردو ئەمەش فەرموودەیەکی دیکەیە لەوبارەوە: (صلاة في مَسْجِدِي هذا خَيرٌ مِن أَلْفِ صلاة في غَيْرِه من المساجِد، الا المَسجِد الحرام) رواه البخاري ومسلم عن ابي هريرة رضي الله عنه.

٢-ڕاوکردنی نێچیری حەرەمی مەدینەو بڕینو شکاندنەوەی دارو درەختو ڕووەكو وەراندن (خَبْط) ی گەڵای دارو درەختەکانیشی وەك هی حەرەمی مەککە حەرامە مەگەر ئەوەی بۆ خانوو و بەرە پێویست بێ، یان بۆ ئالفی وڵاخو مەڕو ماڵات،[٣٠٢] وەك پێشتر باسمان کردو چەند فەرموودەیەکمان لەوبارەوە هێنانەوە، دیارە ئەمەش ڕای زۆربەی هەرەزۆری زانایانە.[٣٠٣]

٣- سەفەرکردنو بارگەو بنەپێچانەوە بۆ سەردانی هیچ مزگەوتێك دروست نیە بێجگە لەمزگەوتی حەرام لەمەککەو، مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ لەمەدینەو، مزگەوتی ئەقصا لەقودس، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لاتُشَدُّ الرِّحال إلا الى ثلاثة مساجِدَ: مَسْجِدي هذا، ومسجد الحرام، ومَسْجِد الأقصى) متفق عليه عن ابي هريرة رضي الله عنه.

٤-بێگومان سەردانو زیارەتی گۆڕستان لەئەسڵدا ڕەوایەو بگرە سوننەتیشە، جا گۆڕی بەڕێزی پێغەمبەری خوا ﷺ و دوو هاوەڵو وەزیرە بەڕێزەکەیشی ئەبووبەکرو عومەر خوالێیان ڕازیبێ، لەمزگەوتی پێغەمبەردایە ﷺ بۆیە شتێکی سوننەتو پەسەندە بۆ هەر کەسێك کە چووە مەدینەو مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ سەردانی گۆڕی پڕ ڕێزو حورمەتی پێغەمبەر ﷺ و دوو هاوەڵە بەڕێزەکەیشی بکاتو سەلامیان لێبکاتو صەڵاتو سەلام و بەرەکات لەخوا بۆ پێغەمبەر ﷺ داوا بکاتو، دووعای خێریش بۆ دوو وەزیرو هاوەڵە پایە بەرزو بەڕێزەکانی بکات.[٣٠٤]

پێغەمبەری خوا ﷺ لەبارەی ئەوەوە کە ئەگەر سەلامی لێبکرێ پێی دەگات وەڵامیشی دەداتەوە فەرموویەتی: (مامِنْ رَجُلٍ يُسَلِّمُ عَلَيَّ إلاّ ردَّ الله عليَّ روحي حتى أَرُدَّ عليه السَّلامَ) رواه ابوداود عن ابي هريرة رضي الله عنه.

---

[٣٠٢] بڕوانە: (فتح الباري) ج٤ص٥٦٧، وە: (المغني والشرح الكبير) ج٣ص٣٧٠، ٣٧١، وە بڕوانە: (الفقه الأسلامي) ج٣ص٢٣٩٩.

[٣٠٣] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[٣٠٤] بڕوانە: (مجموعة الفتاوى) ج٢٦ص٨١، وە: (المغني) ج٣ص٥٨٨، ٥٨٩.

واته: هیچ پیاوێك (ئاشکرایه ئافرەتیش هەمان حوکمی هەیە) سەلامم لێناکات مەگەر خوا گیانەکەمم بۆ دەگێڕێتەوە تاکو وەڵامی سەلامەکەی دەدەمەوە.

وە (عبدالله بن عمر) خوالێیان ڕازیبێ عادەتی وابوو کە دەچووە مزگەوتی پێغەمبەرەوە ﷺ دەیگوت: (السَّلامُ علیك یا رسول الله، السلام علیك یا اَبابكرٍ، السَّلام علیكم یا اَبَتِ) پاشان دەڕۆیشت.[٣٠٥]

هەروەها باقی هاوەڵانیش هەر ئاوا سەلامیان لێدەکردن.[٣٠٦]

وە بەڕای زۆربەی هەرە زۆری زانایان کە (مالك و شافعي و احمد)یان لەنێودان وا پەسەندە کە لەکاتی سەلام کردن دا ڕووبکەیە گۆڕەکان و پشت بکەیە قیبلە، بەڵام (ابوحنیفة) ڕای وایە کە ڕووبکرێتە قیبلە.[٣٠٧]

بەڵام دەست لێدان و ماچ کردنی دەرو دیواری گۆڕی پێغەمبەر ﷺ و پاڕانەوەو دووعاکردن ڕووەو گۆڕی پڕ حورمەت و ڕێزی ئەوە ناپەسەندەو بگرە سەرجەم پێشەواو زانایەکان قەدەغەیان کردوە،[٣٠٨] چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ لەزۆر فەرمایشتیدا مسوڵمانانی لەوجۆرە شتانە ئاگادارکردۆتەوە کە حەرامن و توخنیان نەکەون، بۆ وێنە:

*(اَللهُمَّ لاتَجْعَلْ قَبْري وَثَناً يُعْبَد) رواه احمد ومالك، واتە: ئەی خوایە مەهێڵە گۆڕەکەم بکرێتە بت و بپەرسترێ.

* (لاتَتَّخِذوا قَبْري عِيْداً) رواه احمد وابوداود، واتە: گۆڕەکەم مەکەن بەجەژن. (واتە وەك چۆن خەڵکی لەجەژنەدا لەکات و شوێنێکی دیاریکراودا قەڵەباڵغی دەکەن، ئێوەش لەسەر گۆڕەکەم وا مەکەن).

هەڵبەتە ئەگەر ئنیسان جگە لەصەڵات سەلام و بەرەکات داواکردن لەخوا بۆ پێغەمبەری پایەبەرز ﷺ هەر وشەو تەعبیرێکی دیکەش بەکاربهێنێ، مادام وشەو تەعبیری بەڕێزو شایستەبن و تێپەڕاندن (غُلوّ)یشیان تێدانەبێ ئەوە هەر شتێکی ڕەواو پەسندە،[٣٠٩] بۆ وێنە ئەگەر بڵێ:



[٣٠٥] بڕوانە: (مجموعة الفتاوی) ج٢٦ص٢٨١، وە بڕوانە: (المغني) ج٢ص٥٩٠، ٥٩١.

[٣٠٦] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[٣٠٧] بڕوانە: (مجموعة الفتاوی) ج٢٦ص٨١، وە بڕوانە: (المغني) ج٣ص٥٩١، وە بڕوانە: (الفقه الأسلامي) ج٣ص٢٤٠٤، وە بڕوانە: (المجموع) ج٨ص٢٠٣.

[٣٠٨] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[٣٠٩] بڕوانە: (مجموعة الفتاوی) ج٢٦ص٨١، وە: (الوجيز في فقه السنة والكتاب العزيز) ص٢٦٤، ٢٦٥.

(السلام عليك يا حبيب الله: يا خَيرَةَ اللهِ منْ خَلْقِه، يانبيَّ الله، يا اكرم الخلق على ربّه، يا إمام المتقين وقائد المجاهدين، وياسّد الأولين والآخرين... الخ)

چونكه بێگومان هەموو ئەم وەسفانەو زۆر زیاتریشی شایستەن، بەڵام گرنگ ئەوەیە لەرێزی بەندەكان (عباد) نەبرێتە دەرو سیفەتەكانی خوای پەروەردگاری بۆ دانەنرێ.

٥-لەبەرئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (مَــا بَيْنَ قَــبْرِي و مِنْــبَرِي رَوْضَــةٌ من رياض الجنة) رواه البخاري ومسلم عن ابي هريرة رضي الله عنه، وا پەسەندە كە ئینسان ئەوەندەی بتوانێ لەو شوێنە پیرۆزو پڕ پیت و پێزەدا نوێژو پاڕانەوە بكات، بەڵام لەئازاردان و سەغڵەت كردنی مسوڵمانان وریابێ.

كۆتایی ئەم خاڵەش بەپێناسەیەكی كورتی چەند شوێنێك دێنین كە لەحەرەمی مەككی و مەدەنی یان لەنیزیك و دەوروبەریان دان:

**يەكەم: چەند شوێنێكی گرنگی سنووری حەرەمی مەككەو دەوروبەری:[٣١٠]**

أ- ئەشكەوتی حیراء (غار حراء) كە لەچیای ڕووناكی (جَبَلُ النور) ەو ئەمیش پێنج كیلۆمەتر لەمەككەوە دوورە لەلای سەروویەوەو دەوری دووسەد (٢٠٠) مەتر بەرزەو، سەرەتای دەست پێكردنی هاتنی وەحی كەئایەتەكانی سەرەتای سوورەتی (العلق) بوون، لەئەشكەوتی ناوبراودا بوو.

ب-ئەشكەوتی ثەور كە لەچیای (ثور)دایەو دەوری پێنج سەد (٥٠٠) مەتر بەرزەو، دەكەوێتە خوارووی مەككەوەو شەش میل دوورەو حەشارگەی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵە بەرێزو خۆشەویستەكەی (ابوبكر) بوو لەكاتی كۆچكردنیان دا بەرەو مەدینە.

ج-خانووی ئەرقەم (دار الأرقم) كە لەنیزیك صەفاوەیەو ماڵی (الأرقم المخزومي) بووەو حەوتەمین كەس بووە لەهاوەڵان مسوڵمان بووەو بنكەی بانگەوازی نهێنی پێغەمبەر ﷺ بووەو عومەریش خوا لێیرازیبێ هەرلەوێ مسوڵمان بووە.

د-گۆڕستانی (المَعْلاة) یان (الحجون) كە لەرۆژهەڵاتی باكووری مەككەوەیەو گۆڕی زۆر لە (بني هاشم) ی لێیەو گۆڕی (آمنة)ی دایكی پێغەمبەر ﷺ و هاوسەری دڵسۆزو بەرێزی (خديجة الكبرى) و گۆڕی (عبدالله بن الزبير) و (أسماء) ی دایكی لێیە.

هـ- (مِنى) مینا كە حەوت كیلۆمەتر لەمەككەوە دوورەو هەرسێك جەمرەكانی لێن و هەركام لەمزگەوتەكانی (الكبش) و (البيعة) و مزگەوتی گەورەی (الخَيف) ی لێیە.



[٣١٠] بڕوانە: (الفقه الأسلامي وأدلته)

و-عەرەفات (عرفات) یش چیاو گردێکی مەیلەو تەختە کەدەوری دووسەدو بیست و پێنج (٢٢٥) مەتر لەئاستی ڕێکاری دەریا بەرزترەو دەوری بیست و پێنج کیلۆمەتر لەمەککەوە دوورەو دەکەوێتە خواروی ڕۆژهەڵاتی یەوە، وە چیای بەزەیی (جبل الرحمة)یش دەکەوێتە باکووری یەوەو ئەو شاخۆلکەیە کەپێغەمبەری خوا ﷺ لەساڵی دەیەمی کۆچی و حەجیماڵئاوایی‌دا لەسەری وەستاو ئایەتی: (الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ) المائدة: ٣، ی بۆ هاتە خوار.

## دووەم: چەند شوێنێکی گرنگی سنووری حەرەمی مەدینەو دەوروبەری:[٣١١]

١- چەند مزگەوتێك جگە لەمزگەوتی پێغەمبەر ﷺ لەنێو شاری مەدینەدا هەن کە ناودارترینیان مزگەوتی قوباء (قُباءُ) ە کە یەکەمین مزگەوتە لەمەدینەدا دروست کراوە، وە پێغەمبەر ﷺ لەبارەیەوە فەرموویەتی:[٣١٢] (مَنْ تطهَّر في بَيتِهِ وأحسَنَ الطُّهُورَ ثم أتى مَسْجِدَ قُباءَ لايُرِيدُ الا الصَّلاة فيه كان لَهُ كَاجرِ عُمْرَةٍ) رواه احمد والنسائي وابن ماجة عن سهل بن حنيف.

واتە: هەرکەسێك لەماڵی خۆی دەستنوێژ بگرێ و چاك دەستنوێژ بگرێ پاشان بێتە مزگەوتی قوباء و بێجگە لەنوێژ تێداکردنی مەبەستێکی دیکەی نەبێ ئەوە پاداشتی عومرەیەکی هەیە.[٣١٣]

یەکی دیکەشیان مزگەوتی نوێژگە (مَسجد المُصلَّى) یان مزگەوتی (الغَمامةَ)یە کەکاتی خۆی پێغەمبەر ﷺ نوێژی جەژنەکانی لەو شوێنە کردوەو دوایی کراوەتە مزگەوت.

هەروەها مزگەوتی (الفتح) کە لەسەر چیای (سَلْع) و لەو شوێنەیە کە کاتی خۆی خەندەك (خندق) ی لێ بووە لەجەنگی (الأحزاب)دا.

وە مزگەوتی دوو قیبلەکان (مَسْجدُ القبلتين) کە لەسەر قەراغی شیوی (العتيق) ەو هۆی ناونرانیشی بەوناوە ئەوەیە کە دوو میحرابی هەن یەکیان بەرەو باکوور ڕووی لە (بيت المقدس)ەو ئەوی دیکەشیان بەرەو باشوور ڕووی لەمەککەیە، هۆی ئەمەش ئەوەبوو کە کاتێك هەواڵی وەرچەرخان (تحويل) ی قیبلە بۆ خەڵکی ئەو مزگەوتە هاتوە لەنوێژدا بوون و یەکسەر لەنوێژەکەیان دا ڕوویان بەرەو کەعبە وەرسووڕاندوە.



[٣١١] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[٣١٢] بڕوانە: (مجموعة الفتاوى) ج٢٦ ص٨٣.

[٣١٣] (نووي) گوتوویەتی: (يستحب استحباباً متاكداً ان ياتي مسجد قُباء.) بڕوانە: (المجموع) ج٨ص٢٠٤.

ب-گۆڕستانی بەقیع (مَقـبَرة البَقیـع) کـە دەکەوێتـە لای ڕۆژهـەڵاتی مزگـەوتی پێغەمبەرەوە ﷺ و چەند سەد مەترێك لێیەوە دوورەو گۆڕی هەزارەها کەس لەهاوەڵان و خزمان و بنەماڵەی پێغەمبەر ﷺ لێیەو بێگومان سەردان کردن و دووعای خێر بۆکردنیان کارێکی پەسەندو چاکە.

ج- گوندی بەدر (قریة بدر) کە دەکەوێتە خوارووی ڕۆژئاوای مەدینەوەو سەدو پەنجاو شەش (١٥٦) کیلۆمەتر لێیەوە دوورەو، شەڕگەی جەنگی بەدری لێیە کە لەحەڤدەی ڕەمەزانی ساڵی دووەمی کۆچی ڕوویدا، وە گۆڕستانی شەهیدەکانی بەدریش نیزیکەی یەك میل لەخوارووی گوندی بەدرەوەیە.

د- چیای ئوحود (جبل احد) کە پێغەمبەر ﷺ لەبارەیەوە فەرموویەتی: (أُحُدٌ جَبَلٌ يُحِبُّنا ونُحِبُّهُ) رواه البخاري والترمذي عن سهل بن سعد.

واتە: ئوحود چیایەکە خۆشی دەوێین و خۆشمان دەوێ.

چیای ناوبراویش چوار کیلۆمەتر لەسەرووی مەدینەوەیەو درێژییەکەی دەوری شەش کیلۆمەترەو دەوری هەزارو دووسەد (١٢٠٠) مەتر بەرزەو، لەدامێنییەوە شاخۆلکەی (جَبَلُ الرُّماة) و گۆڕی سەروەری شەهیدان (سَيِّدُ الشهداء) حەمزەی مامی پێغەمبەر ﷺ و گۆڕستانی شەهیدەکانی دیکەی جەنگی ئوحودە، خوا لێیان ڕازیبێت.

**تێبینی:**

پێویستە بزانرێ کەبێجگە لەو شوێنانەی دەقی شەرعییان لەسەرە کە سەردانیان سوننەتە وەك مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ و گۆڕی پڕ حورمەت و ڕێزی و مزگەوتی قوباء سەردانی گۆڕستانی شەهیدان و موسڵمانانی دیکەو دووعا بۆکردنیان، سەردانی شوێنەکانی دیکە سوننەت نیە، بەڵام ئەگەر بەمەبەستێکی شەرعیشەوەبێ قەدەغەش نیەو موباحە، بەڵام گرنگ ئەوە بەجۆرە خواپەرستییەك دانەنرێ، دیارە خێرو پاداشت پێگەیشتنیش تایبەت نیە بەفەڕزبوون یان سوننەت بوونی شتێکەوەو زۆر کردەوەی موباح بەهۆی نیەتی چاکەوە پاداشتی زۆریان هەیە.

# بەندی دەیەم

## بەرهەم و سوودەکانی حەج عومرە

بێگومان سوودو بەرهەمەکانی حەج و عومرەکردن زۆرو جۆراوجۆرن و هەوڵ دەدەین هەروا بەخێرایی و بەکورتی ئاماژە بۆ گرنگترینیان بکەین، چونکە لەڕاستیدا حەج و عومرە وەك چۆن شارەزابوون دەربارەی چۆنیەتی ئەنجام دانیان کەمتر بەهۆی موتالاو خوێندنەوەو بیستنەوە دەستگیر دەبێ و، ئینسان هەتا بۆ خۆی بەکردەوە جێبەجێیان نەکات وەك پێویست لێیان تێناگات، کەڵك و بەرهەمەکانیشیان بەهەمان شێوە زیاتر کەسێك پەییان پێدەبات کەحەج و عومرەی کردبێ و تام و چێژی لێ وەرگرتبێ، ئەگەرنا بەقەڵەم و قسە کەمتر دەگونجێ تەعبیر لەو هەموو بەهرەو بەرهەمە جۆراوجۆرانەیان بکرێ کە لەنێو خۆیانیانەوە گرتوون.

جا ئەوە ئێمە لەم چەند خاڵەی خوارەوەدا بەکورتی و گوشـراوی ئەوەندەی کە لەتەعبیرو دەربڕین دا جێگای بێتەوە ئاماژەیان پێدەکەین:

### ١-پاکبوونەوە لەچڵك و چەپەڕی گوناح و هەڵدانەوەی لاپەڕەیەکی سپی لەگەڵ خوادا:

لەوبارەوە چەندان دەقی سوننەت هەن، بۆ وێنە:

*(عن أبي هريرة رضي الله عنه عن النبي ﷺ أنه قال: مَن حَجَّ فَلَمْ يَرْفُث وَلَمْ يَفسقْ رجَعَ مِن ذنوبِه كيوم ولَدتْهُ أُمهُ) رواه البخاري ومسلم وأصحاب السنن الا ابا داود.

واتە: هەرکەسێك حەج بکات و قسەی ناشیرین نەکات و ڕەفتاری هەڵە نەکات ئەوە وەك ئەو ڕۆژەی کە لەدایك بووە گوناحەکانی لێ دەسڕێنەوە.

*( عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: قال رسول الله ﷺ : العُمْرَةُ الى العُمْرَةِ كفارةٌ لما بَينَهُما والحجُّ المَبْرورُ لَيْس لَهُ جَزاء إلا الجنة) رواه الجماعة إلا أبا داود.

واتە: عومرە بۆ عومرە گوناحەکانی نێوان خۆیان لادەبەن، وە حەجی چاك و تێرو تەواو جگە لەبەهەشت پاداشتێکی دیکەی نیە.

بەڵێ خوێنەری بەڕێز! یەکەمین و گەورەترین بەرهەمی حەج و عومرەکردن ئەوەیە کە ئەگەر بەوشێوەیە ئەنجام بدرێن کە خوا فەرموویەتی و پێغەمبەر ﷺ کردوویەتی ئەوە مسۆگەر خاوەنەکەیان لەچڵك و چەپەڕی گوناح و هەڵەکانی پاك خاوێن دەکەنەوەو هیچ لەکەو پەڵەیەکی پێوە ناهێڵن و دەتوانێ لاپەڕەیەکی سپی کەهیچی تێدا نەنووسرابێت لەگەڵ پەروەردگاری خۆیدا هەڵداتەوە.

## ٢-پتـــەوتربوونی ئیمـــان و تازەکردنـــەوەی پـــەیمانی بەندایـــەتی‌و زیادبوونی پارێزکاری:

ئەگەر چاوێك بەسەرجەم کردەوەکانی حەج‌و عومرەدا بخشێنین وەك ڕۆژی ڕوون بۆمان ئاشکرا دەبێت کە هەرکام لە: (دەمە زەرد بوونەوەو پتەوتربوونی ئیمان) و (نوێکردنەوەی پەیمانی بەندایەتی‌و تۆخترکردنی خواپەرستی) و (زیادبوون‌و گەشەکردنی پارێزکاری) بەرهەم و زادەی بێ‌چەندوچوونی ئەو دووجۆرە خواپەرستی‌یەن بەتایبەت (حەج) کە بێگومان گەورەترو گرنگتر و کاریگەرتریشە، بابزانین چۆن؟:

نیەت هێنان‌و ئیحرام بەستن: کە یەکەمین پایەو هەنگاوی دەست پێکردنی حەج‌و عومرەشە، یەکلایی بوونەوەو ساغ بوونەوەی ئینسان بۆ خواو فڕێدان‌و لابردنی هەموو ناوونیشان‌و پلەو پایە دنیایی‌و ڕواڵەتی‌یەکانی تێدا دەدرەوشێتەوەو بابای مسوڵمان ئەگەر بۆماوەیەکی کورتی چەند ڕۆژەش بێت حەقیقەت‌و چی‌یەت (ماهیة) ی خۆی بەبێ توێکڵ‌و دیکۆر دەبینێ‌و بەشێوەیەکی کردەیی‌و واقیعی بەندە (عَبْد) بوونی خۆی وەك باقی خەڵکی‌و نەبوونی هیچ ئیمتیازێك بەسەریان‌دای لەلا بەرجەستە دەبێ.

پاشان ئەو حاڵەتەی کەدوای ئیحرام بەستن بۆ ئینسان دێتە دی کەبریتیە لەئەوپەڕی هۆشیاری‌و لەخۆ وریابوون‌و توخن نەکەوتنی هیچ کام لە قەدەغەکراوەکان (مَحظورات) تەنانەت قرتاندن‌و هەڵقەندنی تاڵەموویەکیش![٣١٤] بەندایەتی‌و پابەندی‌و پارێزکاری (العبودية والالتزام والتقوى)ی تێدا پتەو و تۆخ دەکات‌و دەبێتە مایەی سەرشکاندنەوەی نەفس‌و جڵەوتوندکردنی ئینجا پاش ئیحرام بەستن‌ دەست کردن بەگوتنی (لبيك اللهم لبيك، لبيك لاشريك لك لبيك، ان الحمد والنعمة لك والملك، لا شريك لك) وە بەردەوام بوون لەسەری هەتا دەست پێکردن بەردووچکە پێدادانی سێ‌جەمرەکان نیشانەی هەمیشە دەست لەسەر سینگ بوون و فەرمانبەربوونە بۆ بەندایەتی کردن بۆ خواو فیداکاری‌و خەبات‌و خۆبەخت کردن لەپێناویدا.

سوڕانەوە بەدەوری ماڵی خوادا: کە دەبێ لەبەردە ڕەشە (الحجر الأَسود)ەوە دەست پێبکات‌و هەر بەویش کۆتایی پێ‌بێ، وە سوننەتە هەموو کەرەتێکیش لەحەوت سووڕانەوەکان بەردە ڕەشە ماچ بکرێ یان دەستی لێ‌بدرێ، یان لانی کەم ئاماژەی بۆ

---

[٣١٤] (نووي) گوتوویەتی: (اما إذا حلق شَعْرة او شعرتين فَعَلَيهِ الضمانُ، هذا مذهبنا، قال العَبْدي، و به قال اكثر العلماء..) بڕوانە: (المجموع) ج٧ص٣٢٧.

بکرێ ئەوەی تێدا دەخوێندرێتەوە کە بابای مسوڵمان پێویستە هەردەم پەپوولەی دەوری خواپەرستی بێت و بێجگە لەو مەبەستە بەرزە بەدەوری هیچ شتێکی دیکەدا وێڵ نەبێ و نەخولێتەوە، وە دەبێ جم و جۆڵ و کردو کۆش و هەوڵەکەشی بە پەیمان بەستن لەگەڵ خوای پەروەردگارو بەڵێنی بەندایەتی بۆ کردن پێدانی دەست پێبکات، چونکە بەردە ڕەشە ڕەمزو هێمای دەستی ڕاستی خوای بەرزو بێوێنەیەو ماچ کردن و دەست لێدان یان سەلام و ئاماژە بۆ کردنیشی بەڵێن و پەیمانە لەگەڵ خوادا سبحانە وتعالی.

ڕاوەستان لەعەرەفات: ئەمیش کە پایەی هەرە گەورەو بنەڕەتی حەجە، زەقترین و جوانترین شێوەی پێشاندانی بەندایەتی و فەرمانبەری و ئامادەیی و چاوەڕوانییە بۆ جێبەجێکردنی هەموو ئەرک و فەرمانێکی بەندایەتی، وەک چۆن سەرباز (جندي) بەپێوەو بەسلاو (تحیة) کردنەوە لەبەردەم فەرماندە (قائد) ەکەیدا ڕادەوەستێ و چاوەڕێی فەرمانی دەکات.

شەومانەوە لەمیناو لەموزدەلیفە: ئەمیش ئەوە دەگەیەنێ کەبابای مسوڵمان هەمیشە ئامادەی شەونخوونی و شەوبێدارییە لەپێناوی خواداو ئامادەیە کە وەک سەربازو خزمەتگوزارێکی چوست و چالاکی ڕێبازی خوا شەووڕۆژان پێکەوە گرێبدات لەو پێناوەدا ئاسوودەیی و سرەوتنی نەبێت.

وردە بەرد پێدا دانی سێ جەمرەکان: ئەمیش ڕەمزو هێمای یاخیبوون لەشەیطان و بەقسە نەکردن و ڕەفزکردن و بەرپەرچ دانەوەی خوتخوتەی بەدو خراپییەتی، چونکە وەک لەمێژووی ژیانی ئیبراهیم و هاجەرەی هاوسەری و ئیسماعیلی کوڕیان دا هاتوە،[۲۱۵] کاتێک خوای کاربەجێ فەرمانی بەئیبراهیم کرد کە ئیسماعیلی تاقە کوڕو جگەر گۆشەی سەرببڕێ: (.. قَالَ يَابُنَيَّ إِنِّي أَرَى فِي الْمَنَامِ أَنِّي أَذْبَحُكَ فَانظُرْ مَاذَا تَرَى؟) الصافات: ۱۰۲، شەیطان سەرەتا لەشوێنی جەمرەی گەورە ڕێی بەئیبراهیم گرت و خوتخوتەی بۆ کرد یان لەشێوەی پیاوێک دا پێی گوت کە کاری وانەکات! ئیبراهیم بەرد بارانی کرد، هەروەها هاجەرەش لەشوێنی جەمرەی نێوەنجی ئیسماعیلیش لەشوێنی جەمرەی گچکە بەهەمان شێوە بەردبارانیان کردو گوێیان بۆ نەگرت و سووربوون لەسەر جێبەجێکردنی فەرمانی خوا، ئیدی بەوجۆرە ئیبراهیم و هاجەرەو ئیسماعیل علیهم السلام بوونە سەرمەشقی پیاوان و ئافرەتان و منداڵانی بڕوادار بۆ گوێ بە شەیطان نەدان و جێبەجێکردنی فەرمانی خوای پەروەردگار.

---

[۲۱۵] بڕوانە: (الكامل في التاريخ) ج۱ص۱۱۱، ۱۱۲، تاليف: ابن الأثير.

### ٣-ڕاهاتن لەسەر ڕەوشت بەرزیو هێمنیو ئارامیو خۆدوورگرتن لەگوناح و هەڵە:

لەڕاستیدا حەجو عومرە هەرکامێکیان قوتابخانەیەکن بۆ تێدا فێربوونی ڕەوشت و خەسڵەتە بەرزو جوانەکانی وەك: خۆڕاگری (صبر)و هێمنی (سكینة) و لێبووردنو بەخشینو .. هتد وەخۆ پاراستن لەگوناحو هەڵەو پەڵەو خەسڵەتە بەدو دزێوەکان، وەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی: (الْحَجُّ أَشْهُرٌ مَعْلُومَاتٌ فَمَنْ فَرَضَ فِيهِنَّ الْحَجَّ فَلَا رَفَثَ وَلَا فُسُوقَ وَلَا جِدَالَ فِي الْحَجِّ وَمَا تَفْعَلُوا مِنْ خَيْرٍ يَعْلَمْهُ اللَّهُ وَتَزَوَّدُوا فَإِنَّ خَيْرَ الزَّادِ التَّقْوَى وَاتَّقُونِي يَاأُولِي الْأَلْبَابِ) البقرة: ١٩٧.

واتە: حەج لەچەند مانگێکی زانراودا دەکرێ، جا هەرکەسێك نیەتی حەجی تێیاندا هێنا، ئەوە نابێ لەکاتی حەج کردن دا هیچ جۆرە قسەیەکی جینسیو ڕەفتاری ناشایستو شەڕە قسە بکات، وەهەر چاکەیەکیش بکەن خوا پێی دەزانێ، وە توێشوو هەڵگرن بێگومان پارێزکاری چاکترین توێشوویە، وە ئەی خاوەن عەقڵان پارێزم لێبکەن.

### ٤-لەبەرچاو بەرجەستەو نمایان بوونی سیرەو ژیانی پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی:

بەڵێ یەکی دیکە لەحیکمەتو بەرهەمە گرنگەکانی حەج ئەوەیە کە ئینسان بەهۆی دیتنی ئەو وڵاتو نیشتمانەوە کەپێغەمبەر ﷺ یەکەمین جاری خوا بەیەککگرتن (التوحید)ی تێدا داو هاوەڵە بەڕێزەکانی خوا لێیان ڕازیبێ لەسەر پەروەردەکردو پێگەیاندو پاشان کۆمەڵی مسوڵمانو کۆمەڵگای ئیسلامی کیانو قەوارەی ئیسلامی تێدا بنیات ناو هەموو جۆرو شێوەکانی ئازارو ئەشکەنجەو نارەحەتی دەروونیو جەستەییو تاکیو کۆمەڵییان تێدا بینی کەقەڵەم لەنووسینیدا کوڵو زمان لەدەربڕینی دا لاڵە، بەڵێ بەهۆی دیتنی ئەو شوێنەوارانەوە ئینسان چۆنیەتی سەرهەڵدانی ئیسلامەتیو خەملانی کۆمەڵو کۆمەڵگای مسوڵمانو بنیات نرانی کیانو قەوارەی ئیسلامی لەلا بەرجەستە دەبێو ئەگەر تا ئێستا لەڕێی خوێندنەوەو بیستنەوە تەنیا لەئاوێنەی زەینو خەیاڵیدا بینیویەتی، ئێستا لەدنیای واقیع داو بەچاوی سەر دەیبینێو تێیەوە ڕادەمێنێو گوتراویشە: (لَيْسَ الخَبَرُ كالعَيان).

ئنجا بەر لەپێغەمبەر و هاوەڵانی علیهم الصلاة والسلام بەهۆی حەجو عومرە کردنەوە ئینسان شوێنەوارەکانی ئیبراهیمو ئیسماعیلو هاجەرە علیهم الصلاة والسلام و ڕاددەی

لێبڕاوی و خۆیەکلاکردنەوە (التجرد)یان بۆ خوا بە بەرجەستەیی دەبینیٌ و، تێدەگات کە بەندایەتی ڕاستەقینە بۆ خوا ئەوەیە کە سەرو ماڵ و کوڕو خێزان و هەموو شتێکت لەپێناوی خوادا بەخت بکەی و هیچ شتێکت پێ لەوە بەرزتر نەبێ کەلەڕێی خوادا بیکەیە قوربانی ئەگەر تاقە ڕۆڵەو جگەرگۆشەکەیشت بێت!!

## ٥-بە نمایانی و بەرجەستەیی دیتنی زۆر لەبەها بەرزەکان (القیم العلیا) ی ئیسلام:

بەڵێ زۆر بیردۆزە هەن کەلافی هەبوونی گەلێ لەو بەها بەرزانە لێ دەدەن کە سروشت و فیترەتی ئینسان تێنوو و عەودالیانە، بەلام هەر بەتیۆری (نظري) لەدوو تویێ کتێبەکانیان دا دەمێننەوەو چاو بەدنیای ڕوونی بوون هەڵناهێنن! بەلام ئیسلام حەج و عومرەشی- وەك هەموو خواپەرستییەکانی دیکە - کردوون بە ئاوێنەیەك کە زۆر لەو بەها بەرزو جوانانەی بەکردەوەو لەدنیای واقیع دا تێدا دەردەکەون:

ئایا ئەوە کە ئینسانەکان تێکڕا بەندەی خواو برای یەکترن و هیچ کەس هیچ زیادەو ئیمتیازێکی بەسەر کەس دا نیە وەك لەحەج دا دەردەکەوێ، لەکوێ و لەچی دیکەدا ئاوا دەردەکەوێ؟! هەزارەها کەس لەشوێنەکانی وەك میناو موزدەلیفەو عەرەفات و دەوری کەعبە بە بەرگی سادەو یەك شێوەی ئیحرام و سەری ڕووت و پێی نیوەڕووت[316] پێکەوەو بەتێکەڵی و بێ جیاوازی سەرگەرمی (لبیك اللهم لبیك) گوتن و جێبەجێکردنی خواپەرستییەکان (مَناسك) ی حەج و عومرەن!

وە ئایا یەکڕیزی یەکڕەنگی و یەکدەنگی و یەکسەنگی موسڵمانان وەك لەسووڕانەوەیان بەدەوری کەعبەدا بەیەك شێوەو بەیەك ئاڕاستەدا دەردەکەوێ، کە ئەگەر لەشوێنێکی بڵندەوە بڕوانی هەست دەکەی کە ماڵی خوا دڵی ئوممەتی ئیسلامەو هەمووی بەدەوری خۆیدا دەخولێنێتەوە! لەچ کاتێك و چ شتێکی دیکەدا ئەو بەها بەرزەی یەکبوون (وَحدة)ە ئاوا بەرجەستەو نمایان دەبێ؟!

وە ئایا یەك هەڵوێستی موسوڵمانان لەبەرانبەر دوژمنان و ناحەزانیان دا کە ئیبلیسی بەرجەستە لە سێ جەمرەکان (الجمرات الثلاث)دا ڕەمزو هێمایەتی، وەك لەبەردووچکە باران کردنی جەمرەی گەورەو نێوەنجی و گچکەدا کە ڕەمزی هەموو جۆرە شەیطانەکانن

---

[316] پۆشاکی ئافرەتان هەر پۆشاکی ئاسایی خۆیانەو تەنیا لەسەر پیاوان فەرزە کە سەریان ڕووت و پێیان نیوەڕووت بێ و دوو پەشتەماڵ بپۆشن.

لەهەر چوار ڕۆژەکانی دەیەمو یازدەیەمو دوازدەیەمو سێزدەیەمدا دەردەکەوێ لەچ شتێکی دیکەدا ئاوا بەزەقی ئەو بەها بەرزەی دۆستایەتیو دوژمنایەتی (الموالاة والمعاداة) یە بەرجەستە دەبێ؟!

ئنجا جێی سەرنجیش ئەوەیە کە هەموو پایەو فەرزەکانی حەج تەنیا جارێكو بەس لەکاتێك دا ئەنجام دەدرێن، بەڵام بەردووچکە باران کردنی سێ جەمرەکان چوار ڕۆژ لەسەریەكو هەر حاجیەك دەبێ حەفتا (٧٠) بەردووچکە یان لانی کەم چلونۆ (٤٩) بەردووچکەیان پێدا بدات، کە بێگومان ئەوە دەگەیەنێ کە دژایەتی کردنمان بۆ شەیتانو پێڕو دارو دەستەکەی دەبێ درێژخایەنو بەردەوامو نەپساوە بێت.

وە ئایا ئەوە کە پیاوو ئافرەت لەئەسڵی مرۆڤ بوونو بەندێی خوا بوون دا وەك یەكنو جیاوازنینو کامیان پارێزکارترو بەندەیەکی شایستەتری خوا بێت ئەویان لەلای خوا بەڕێزو حورمەت ترە: (..إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ) الحجرات: ١٣،

وەك لەجێبەجێکردنی سەرجەم خواپەرستییەکان (مناسك)ی حەج دا دەبینرێ کە ئافرەتو پیاو وێکڕاو بەتێکەڵی جێبەجێیان دەکەن بەبێ جیاوازیو لەیەك جیاکردنەوەیەك لەهیچ شتێك دا جگە لە پۆشاکی ئیحرام کە ئافرەتان تێیدا ئازادترن، لەچ شتێکی دیکەدا، یەکسانی،[٣١٧] و وەك یەك بوونی پیاوو ئافرەت ئاوا نمایان دەبێ؟!

## ٦-خۆبەخت کردنو قوربانیدان لەپێناوی خوادا:

قوربانی سەربڕینی حاجیەیان لە ڕۆژی دەیەمی (ذوالحجة)دا کە لەلایەکەوە بەڕۆژی جەژن (عيد الأضحى)و لەلایەکی دیکەشەوە بە ڕۆژی قوربانی سەربڕین (يوم النحر) ناو دەبرێ، جا چ قوربانی سەربڕینەکە فەرزبێ وەك لەخۆگرتن (نذر) و کەفارەتو فیدیە، وە چ هەر سوننەت بێت، ئەوە دەگەیەنێ کە دەبێ مسوڵمانان هەمیشەو دایم ئامادەی قوربانیدانو فیداکاری بن، وە ئامادەی کوشتارو خوێن ڕشتنیش بن لەپێناوی بەرزکردنەوەی بەیداغی ئایینی خواو چەسپاندنی بەرنامەکەیداو بەرگریکردن لەیاساکانی شەریعەتی خواو پاراستنی سنوورەکانی کیان و قەوارەی ئیسلامیدا.

کەواتە: ئەو مسوڵمانەی کە لە زللە لێدرانو مریشك سەربڕینێکیش دەسڵەمێتەوە بابزانێ کە خراپ لەئایینەکەی حاڵی بووە!

---

[٣١٧] یەکسانییەکە لەئەسڵی مرۆڤایەتیو بەندەی خوابوون دایە، نەك لەسروشتو ئەرك دا کە بێگومان جیاوازن.

## ٧-ڕاهاتن به گوێڕایەڵی فەرمانبەری (السمع والطاعة)یەوە:

ئەگەر بەوردی سەرنج بدەینە کردەوەکانی حەج و عومرە دەبینین کە سەرجەمیان نهێنیدار (مرموز)ن و حیکمەتی پەنهانیان هەیە، جا بێگومان کاکڵ و جەوهەری بەندایەتی بۆ خوا کردن (العبودیة لله) یش ئەوەیە کە ئینسان بەموتڵەقی و بەبێ مەرجوبەند (بدون شرط وقید) بەندایەتی خوا بکات و هەموو فەرمانەکانی بەبێ هەڵوەستە کردن (وقفة) و لام جیم جێبەجێبکات، چونکە تۆ مادام دان بەوەدا بهێنی کە خوا پەروەردگارو پەرستراوتە هەر لەسەرەتاوە ڕێگای ئەوەت لەخۆت بڕیوە کەهیچ تێبینیی و ڕەخنەیەکت لەهیچ یاسایەکی هەبێ، وەك فەرموویەتی: (وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلاَ مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْرًا أَنْ يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ..) الاحزاب: ٣٦.

وە هەر بۆیەش ڕستەی: (سَمِعْنَا وأَطَعْنا) درووشمی ئینسانی مسوڵمان و کۆمەڵ و کۆمەڵگای مسوڵمانە، وەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی: (آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْهِ مِنْ رَبِّهِ وَالْمُؤْمِنُونَ كُلٌّ آمَنَ بِاللَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ لا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِنْ رُسُلِهِ وَقَالُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ) البقرة: ٢٨٥،

بەڵێ بەندە تەنیا دەبێ تا ئەوکاتە وردبێتەوەو سەرنج بدات و هەڵوەستە بکات تاکو دڵنیا دەبێ کەفلانە مەسەلەیە لەلایەن خواوەیە، جا هەرکاتێك لەوبارەوە دڵنیاو مسۆگەر بوو، ئەوە ڕۆڵی عەقڵ بەس ئەوەیە کە باش لەوە حاڵی بێت کەلەلایەن خواوە هاتوە بۆئەوەی تەسلیمی بێت و جێبەجێی بکات.

## ٨-حەج و عومرە سەربازگەیەکن بۆ مەشق (تدریب) و ڕاهێنان:

هەرکەسێك چووبێتە حەج دڵنیا دەبێ کە یەکێك لەحیکمەتە بەرزەکانی حەج و عومرە ئەوەیە کە مسوڵمانان بەو سەفەرو گەشت و کۆچ کۆچباری حەج و عومرەیەهەل و مەرجی ئیسراحەت و ئاسوودەیی‌یەوە بگوازرێتەوە بۆ واقیع بارودۆخێکی دیکەی پڕ ڕەنج و زەحمەت و ماندوێتی و دەردەسەری، کە بێگومان هیچ سەفەرێك لێی خاڵی نیە بەتایبەت سەفەری حەج.

ئنجا ئەوەی زۆر جێی سەرنج وردبوونەوەیە ئەوەیە کە خوای کاربەجێ سەرزەمینی حیجازی هەڵبژاردوە بۆ ئەو مەڵبەندی مەشق و ڕاهێنانە کە بیابانێکی گەرم و وشك و ناڕەحەت کەرە، وە ئاشکراشە کە مانگە عارەبی‌یەکان وەك مانگە خۆری‌یەکان (الشهور الشمسیة) چەسپاوو نەگۆڕنین و هەموو وەرزەکانی ساڵ دەگەڕێن، کەواتە مسوڵمانان لەهەموو وەرزەکانی ساڵ (فصول السنة) دا حەج دەکەن.

## ٩-هەڵگرتنی باری دینداریو بەجێهێنانی ئەرکی بەندایەتی بەشداریکردنو دەستبار بۆ یەکتر گرتنی هەموو ئەندامانی پێویستە:

ئاشکرایە کە هاتنو چوونی نێوان صەفاو مەروە (السَّعي بين الصَّفا والمروة) کە یەکێکە لەپایەکانی حەجو عومرە، شوێنەواری هاجەرەی هاوسەری ئیبراهیمە عليهما السلام کەوەك (بخاري) لە (ابن عباس)ەوە گێراویەتەوە: دوای ئەوەی ئیبراهیم هاجەرەو ئیسماعیلی کوڕی عليهم الصلاة والسلام لەوجێیەی کەئێستا کەعبەی لێیە بەجێهێشتو کوندەیەك ئاوو هەمبانەیەك خورمای لەلا دانان، وە پاش ئەوەی ئاوو خورمایەکەیان بڕاو هاجەرەو کوڕەکەی زۆر تینوو بوون، هاجەرە سەرنجیدا تەپۆڵکەی صەفا لەنیزیکیەوەیە بۆیە چووە سەریو ڕوانی، بەڵام هیچ کەسی بەدی نەکرد، دوایی لەوێ هاتە خوارو بەرەو تەپۆڵکەی مەروە هەندێکی بەرۆیشتن هەندێکی بەگورگە لۆقە ڕۆیشتو سەرکەوتە سەریو تەماشای ئەملاو لای کردو دیسان هیچی نەبینی، وە حەوت کەڕەتان ئەو هاتن چوونەی کردو سەری حەوتەم جار کەلەسەر مەروە بوو، دەنگی فریشەی بیست بینی ئەوە بەپاژنەی یان بەباڵی زەوی دەکوڵیو دوایی ئاو دەرکەوت... هتد[318]

*جا لەم بەسەرهاتەوە بۆمان دەردەکەوێ کە:*

<u>یەکەم</u>: یەکێك لەپایەو فەرزە مەزنەکانی حەج و عومرە شوێنەوارو یادو بیرەوەرییەکی هاجەرەیە خوالێیڕازیبێ کە لەئەسڵ دا کەنیزەیەکێك بووەو پادشای میصر بەدیاری خەڵاتی (سارا خاتوون)ی هاوسەری ئیبراهیمی کردوە عليهما السلام و ئەویش داویەتی بەئیبراهیم عليه الصلاة والسلام.

<u>دووەم</u>: بەجێهێنانی ئەرکی بەندایەتیو دینداری بۆ خواکردن دەستبار بۆیەکتر گرتنی پیاوو ئافرەت و منداڵی دەوێ باری قورسو مەزنی دینداری کردن بەتەنیا دەست نادرێتیو پێویستی بەهاوکاری هەموو ئەندامانی خێزان و کۆمەڵگا هەیە.

هەروەها لەبنیاتنانی کەعبەش دا هەمان هاوکاریو دەستبار بۆ یەکترگرتن دەبینرێ کەئیسماعیل عليه السلام هاوکاری ئیبراهیمی بابی کرد: (وَإِذْ يَرْفَعُ إِبْرَاهِيمُ الْقَوَاعِدَ مِنَ الْبَيْتِ وَإِسْمَاعِيلُ..) البقرة: ١٢٧.

ئاشکراشە کە حەوشۆکەی ئیسماعیل (حِجْرُ إسماعيل) کە بابای طەوافکەر ئەگەر ئەویش نەخاتە نێو جوغزو بازنەی سووڕانەوەکەیەوە طەوافەکەی بۆ وەبەر ناکەوێ!!

---

[318] بڕوانە: (فتح الباري) ج٧ص٤٦تا٤٩، کە فەرموودەی ناوبراوی بەدرێژی هێناوە.

شوێنەوارو پەرێزی بەرجەستەی ئەو هاوکاریکردنەی ئیسماعیله بۆ بابی بەرێزی لەدروست کردنی ماڵی خوادا، بەطەواف کردنیش بەدەروی (حِجْر)دا وەك کەعبە، رێزو تەقدیرداناانی ئێمە و مانانی مسوڵمانە بۆ ئەو هاوکاریو دەستبار بۆ گرتنەی ئیسماعیل علیه السلام.

## ١٠-کۆمەڵێك بەرژەوەندی دیکەی سیاسیو ئابووری فەرهەنگیو کۆمەڵایەتی:

خوای کاربەجێو بەخشەر لەوبارەوە فەرموویەتی: (وَأَذِّنْ فِي النَّاسِ بِالْحَجِّ يَأْتُوكَ رِجَالًا وَعَلَى كُلِّ ضَامِرٍ يَأْتِينَ مِنْ كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٍ، لِيَشْهَدُوا مَنَافِعَ لَهُمْ..) الحج: ٢٧-٢٨،

واتە: وە بەنێو خەڵکیدا بۆ حەج جاڕ بدە کە بەپێیانو بەسواری هەر وڵاخێکی کە لەئەنجامی ڕێی دووربڕین دا زگی بەپشتییەوە نووسابێت، لەهەر ڕێیەکی دوورەوە بێن. بۆئەوەی قازانجو بەرژەوەندی زۆری خۆیان وەدەست بهێنن...

بەڵێ بێگومان کەساڵانە بەهۆی حەجو عومرەوە مسوڵمانانی سەرتاسەری دنیا بەهەموو ڕەنگو زمانە جیاجیاکانیانەوە لەدەوری مزگەوتی حەرام لەميناو لەعەرەفات موزدەلیفەو دواتر لەمەدینەی پێغەمبەر ﷺ کۆدەبنەوەو یەکتر دەناسنو پێکەوە ڕاوێژ و پرس ڕا دەکەنو لەحاڵو باڵی یەکتر ئاگادار دەبنو بە بارودۆخو هەلومەرجی یەکتر ئاشنا دەبنو لەبارەی وەزعی ئۆممەتەوە بەرچاویان ڕوونتر دەبێت، ئەمە لەلایەکەوەو لەلایەکی دیکەشەوە کە دەرفەتی هەڵشوێڵشو مامەڵەو بازرگانییان بۆ دەڕەخسێ، وەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی: (لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَنْ تَبْتَغُوا فَضْلًا مِنْ رَبِّكُمْ..) البقرة: ١٩٨.

واتە: گوناحتان ناگاتێ ئەگەر لەکاتی حەج دا بەهۆی مامەڵەو بازرگانییەوە لە ڕۆزی و بەخششی پەروەردگارتان وەدەست بێنن.

وە کە بەهۆی گوێبیست بوونی ئەو وتارانەوە کە لەمزگەوتی حەرامو لەمزگەوتی خەیف لەميناو لەمزگەوتی نەمیرەدا لەنیزیك عەرەفاتەوە دەدرێن کە پێویستە وێڕای تیشك خستنەسەر چۆنیەتی جێبەجێکردنی خواپەرستییەکانی حەجەوە، تێیاندا باسی بارودۆخی مسوڵمانانو کێشەو گرفتەکانیشیان بکرێو چارەسەریشیان بۆ دیاری بکرێ..

بەهۆی هەموو ئەمانەوە بێگومان مسوڵمانان لەهەموو ڕووەکانی سیاسیو کۆمەڵایەتی فەرهەنگی و ئابوورییەوە لەحەج و عومرەکەیان بەهرەمەند دەبنو کەڵك و سوودی جۆراوجۆر وەردەگرنو شارەزاییو بەرچاوڕوونی جیاجیا دەربارەی حاڵو باڵی ئۆممەتی ئیسلام پەیدا دەکەن.

خوێنەری بەڕێزو سەنگین!

ئەوەی لەم دە خاڵەدا خستمانەڕوو بەشێك لەو بەرهەمو بەهرانەی حەجو عومرەكردن بوون كەبابای حاجیو عومرەكەر وەدەستیان دێنێ، وەك لەپێشەوەش گوتمان وەك پێویست خستنەڕووی ئەو سوودو كەڵكو بەرهەمانە لە وزەی هیچ زمانو قەڵەمێك دا نیەو بەدەردی ئەهلی دڵو عیرفان گوتوویانە:

(مَنْ ذاقَ عَرَفَ ومَنْ لَمْ يذُقْ لَمْ يَعْرِفْ)

ئەوەی بیچێژێ دەیزانی، بەڵام كەسێك نەیچێژتبێ نازانێ.

خواش بەكەرەمو بەخششی خۆی ئەو دوو جۆرە خواپەرستییە ناوازەو پڕ پیت پێزو بەهرەیە بۆ مسوڵمانان ئاسان بكاتو، ئەو سەفەری حەجو عومرەیە كە سەروەری سەفەرانە بۆ بڕواداران مەیسەر بكاتو هیدایەتو هاوكاریشیان بدات كە حەج عومرەكەیان حەج و عومرەی ڕاستەقینە بنو ساغو ڕاست بنو خڵتەی ڕیاكاریو ناشەرعییان تێكەڵ نەبێ.



## دوا قسەم دەربارەی حەجو عومرە

خوێنەری بەڕێزو شیرین!

دوا قسەی خۆمت دەربارەی حەج عومرە لەم پێنج برگە كورتەدا ئاڕاستە دەكەم:

یەكەم: ئەگەر خوا قسمەتی كردو ویستت حەج و عومرە بكەی بەر لەهەر شتێكو دوای نیازو مەبەست ساغ كردنەوەت بۆ خوا هەوڵ بدە ورو ورد شارەزای حەج و عومرەكردن بی بەپایەو فەرزو سوننەتەوەو با بەرچاوت ڕوون بێو بزانی چۆن چۆنیو بۆچی حەج و عومرەكەت دەكەی؟!

دووەم: ئەگەر خواكردی حەج و عومرەت كردنو گەڕایەوە، ڕێژەو ئەندازەی قبووڵ كرانو نەكرانی حەجو عومرەكەت بەوە بزانە داخوا تا چ ڕاددەیەك گۆڕیویانی و پاكو چاكیان كردوویو بەرەو خوایان بردووی، بەڵێ ئەگەر (حجّ)ت (مبرور) و (سعي) یت (مشكور) بێت، دەبێ (ذنب) یشت (مغفور) بێتو، ئەگەر واش بی دەبێ لەمەودوا ڕوو لەخوابیو بۆ خوا بەندەی پوخت و باشو لەگەڵ مسوڵمانانیش براو تەبا بی! ئەگەرنا بەناووشۆرەتی حاجی فلان فریومەخۆ!

**سێیەم:** زۆر وریابە حەج عومرەکردن جگە لەهی فەرز نەکەیە خولیاو ئاواتی خۆتو چوونە حیجازت لێببێتە نەخۆشیو هەموو ساڵێ حجاز بگرەو هاتم!

وە ئاگاداربە کە حەجو عومرە کردنەکەت لەسەر حیسابی لایەنەکانی دیکەی ئیسلام نەبێ! بۆ وێنە ئەگەر هاتو خوا ماڵو سامانێکی زیادەی پێ بەخشیت پێت وانەبێ ئەگەر حەجو عومرەی سوننەتی پێنەکەی بەبەلاش دەڕوات، وە بزانە کە لەکاتێك دا فەرزێکی کیفایە یەکی خرابێ خۆ خەریك کردن بەسوننەتانەوە نیشانەی کرچو کاڵ بوونو ناحاڵی بوونە، بەتایبەت لەکاتو شوێنێك دا کە مسوڵمانان خاوەنی کیانو قەوارەی شەرعی خۆیان نین لەژێر باری طاغوت دا دەناڵێنن!

**چوارەم:** وەك لەخاڵی دەیەم دا باسمان کرد، بازرگانی مامەڵەکردن لەحەج دا شتێکی ڕەواو موباحە، بەلاَم نابێ هەموو کردو کۆش تەقەللاشمان ببێتە کاری ئابووری بازرگانی لەحەجیش دا هەر سەرگەرمی دنیاو شمەك کەلوپەل بین، خۆ ئەگەر شەیطان زەفەرمان پێببات و بازرگانی مامەڵەکەش بەفرتو فێڵو قۆڵبڕین بێت، یان ئەو کەلوپەلانەی دەیان کڕینو دەیان هێنینەوە لەو جۆرانە بن کە بۆ گوناحو خراپە بەکاربهێنرێن ئەوە یەکجاری لەحاجی شۆڕاوین بووینە قاچاخچی!! خوا پەنامان بدات.

**پێنجەم:** ئاشکرایە کە حەج لەسەر کەسێك فەرز نابێ کە توانای ماڵ و سامانیی نەبێ، وە مەسەلە تەنیا چوونە حەجو عومرە نیە بەڵکو لەوەش گرنگتر ئەوەیە کە ئینسان بەماڵی حەلاڵو زەلاڵ بچێ، چونکە لەئیسلام دا وێڕای ئامانج پێویستە وەسیلەکانیش شەرعیو چاك بنو دەبێ لەڕێی پاکەوە بەرەو ئامانجی چاك هەنگاو بنێین، ئەگەرنا خوانەکردە ڕەنج بەخەسارو شەرمەزار دەبین.

ئا لێرەشدا کۆتایی بەم درووشمی چوارەمەش دێنینو بەپشتیوانی خوای بەخشەر دەچینە سەر باسو توێژینەوەی درووشمی پێنجەمو کۆتایی کە بریتیە لە (زیکری خوا کردن).

# درووشمی پێنجەم
# زیکری خوا کردن (ذکرالله)

*واتاو پێناسەی زیکر لە ئەسڵی زمان و زاراوی شەرع دا.

*گرنگی و پلەو پایەی زیکری خوا.

*جۆرەکانی زیکر (أنواع الذكر).

*چۆن زیکری خوا بکەین؟

*بەرهەمی زیکری خوا کردن.

# ڕێ خـۆشـــكردن

خوێنەری بەڕێزو خۆشەویست !

هەرچەندە وا باوە كە پێنج پایەكانی ئیسلام (شایەتمان، نوێژ، زەكات، ڕۆژوو، حەج) ئەو دروشمو نیشانە سەرەكی‌یانەن كە ئینسانی مسوڵمانو كۆمەڵو كۆمەڵگای مسوڵمان لەغەیری خۆیـان جیادەكەنـەوە! بـەڵام بەسـەرنج دانو تێوەڕامـانی دەقـەكانی قورئـانو سوننەت زۆر بـەڕوونی بۆمـان ئاشـكرا دەبێ كـە زیكـرو یـادی خـوا كردنیـش یەكێكـە لەنیشـانەو سـیما بنەڕەتی‌یـەكانی تـاكو كۆمـەڵی مسـوڵمانو، وەك دواتـر دەیخەینـەڕوو چەندان دەقی قورئانو سوننەت ئەو ڕاستی‌یە ئیسپات دەكەن.

هەربۆیەش بەپەسەندم زانی كە وێڕای خستنەڕووی دروشمو نیشانەكانی دیكەش زیكری خوا (ذكر الله) ش بتوێژینەوەو لەوانی دیكەی جیا نەكەینەوە.

هەڵبەتە جیاوازی بنەڕەتی مسوڵمانو نامسوڵمانیش هەر ئەوەیە كە بابای مسوڵمان خواناسو خواپەرستەو نامسوڵمانیش بەپێچەوانەوەیە، واتە مسوڵمانو نامسوڵمان بەر لەهەر شتێكی دیكە لەخوا (الله)دا جل جلاله لەیەكتر جیادەبنەوە؛ مسوڵمان تـەنیا خـوا بـە بەدیهێنـەرو پـەروەردگارو پەرستراوو سـەروەرو فـەرمانڕەوای خـۆی دەزانـێ، لەسـەر ئـەو بنەڕەتـەش خـوای بێوێنـەو تـاكی لەهـەموو كـەسو هـەموو شتێك تەنانـەت خـۆیو بـابو دایكیو ڕۆڵەكانیشی لەلا شیرین ترو بەڕێزو خۆشەویست ترەو ڕێزو خۆشەویستیشی بۆ هـەر كەسـێكو هـەر شـتێكیش بـەڕێژە (نِسْـبَة)ی نـیزیكی ئـەو كەسـەو ئـەو شـتەیە لەخوای پەروەردگار!

هەربۆیەش بابای مسوڵمان پاش خوای تاكو پاك پێغەمبەری خوای ﷺ لەهەموو كەس خۆشتر دەوێ، چونكە پێغەمبەری خوا ﷺ نیزیكترینو خۆشەویست ترین بەندەیە لەلای خوا، دیارە پێغەمبەرانی دیكەش علیهم الصلاة والسلام هـەمان حوكمیـان هەیـە، هەرچـەندە موحەممەد ﷺ گەورەو سەروەری هەموویانە.

خوای پەروەردگار لەوبارەوە كە دەبێ خۆشەویست ترین شتو خۆشەویست تریـن كەس لەلای ئینسانی مسوڵمان خوای بێوێنەو تاك بێت فەرموویەتی: (وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَتَّخِذُ مِنْ دُونِ اللَّهِ أَندَادًا يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ اللَّهِ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ) البقرة: ١٦٥،

پێغەمبەری خواش ﷺ لەوبارەوە كە خۆشویستنی پێغەمبەری خوا ئەنجامو بەرهەمی ڕاستەوخۆی خۆشویستنی خوای پەروەردگارە فەرموویەتی (ثلاثٌ مَنْ كُـنَّ فيـه وجـد بِهنَّ حلاوة الأيمان: أن يكون اللهُ ورسولُهُ أَحَبَّ إليه مِمّا سِواهما..) متفق عليه.

ئنجا شتێکی ئاشکراو ڕوونیشه که هەرکەسێك شتێکی یان کەسێکی خۆش بوێ بەئەندازەی خۆشویستنەکەی بەدڵو دەروونو زمان یادی دەکاتو باسی دەکات، بۆیە هەمیشەو دایم خوا لەیادبوونی مسوڵمان نیشانەو بەڵگەی زێدە نیزیکیو خۆشەویستییەتی بۆ خوای پەروەردگار سبحانه وتعالى.

جا ئێمە خوا پشتو پەنا بێت لەم پێنج بەندەدا بەکورتی باسی زیکری خواکردن دەکەین:

١-واتاو پێناسەی زیکر لە ئەسڵی زمانو زاراوی شەرع دا.

٢-گرنگی و پلەو پایەی زیکری خوا.

٣-جۆرەکانی زیکر (أنواع الذكر).

٤-چۆن زیکری خوا بکەین؟

٥-بەرهەمی زیکری خوا کردن.

بەهیوای ئەوە کە بتوانین لەو پێنج بەندەدا ئەوەی کەپێویستە دەربارەی یادی خواکردن (ذكرالله) بیخەینەڕوو.

خواش یارمەتیمان بدات کە یەکەم باش لەزیکری خواکردن تێبگەینو پاشان بەهۆی چاك یادی خوا کردنەوە کامڵ بینوپێبگەین، چونکە وەك پسپۆڕانی بواری تەزکیەو عیرفان گوتوویانە:[1] (الذِّكْرُ منشورُ الوَلاية الذي مَنْ أُعْطيهُ آتصَّلَ ومَنْ مُنِعَهُ عُزِلَ) واتە: یادی خوا کردن بریارو بڕوانامەی دۆستایەتی خوایە، هەرکەسێك پێی بدرێ دەگاتێو هەرکەسێکیش نەیدرێتێ دادەبڕێ.

جا خوای بەخشەر بەکەرەمو بەخششی خۆی لەو کەسانەمان بگێڕێ کە شایستەی ئەوەبین لەڕیزو لیستی: (..والذاكرين الله كثيراً والذاكرات) دا تۆمار بکرێینو بەپەیژەی زۆر یادی خواکردن دا پلەکانی بەندایەتی بۆ خواکردن ببڕینو سەربکەوینو بەرەو خوا بچینو دەستی شوومی تەماعی ئیبلیسیش لەخۆمان ببڕین کە لەسۆنگەی لەخوا بێئاگابوونەوە زەفەرمان پێدەباتو یەخسیرمان دەکات، وەك خوای پەنهان بین فەرموویەتی: (اسْتَحْوَذَ عَلَيْهِمُ الشَّيْطَانُ فَأَنسَاهُمْ ذِكْرَ اللَّهِ أُوْلَئِكَ حِزْبُ الشَّيْطَانِ) المجادلة: ١٩،

---

[1] بڕوانە: (مدارج السالكين، شرح منازل السائرين) لأبن قيم الجوزية، ج٢ص٤٢٣. وشەی: (منشور) یش بەمانای بڵاوکراوەو (بیان) دێ بەڵام لێرەدا مانای بڕیارو بڕوانامە دەگەیەنێ، بڕوانە: (المعجم الوسيط) ص٩٢١.

واتە: شەیطان خستووینەتە (واتە دەغەڵەکان) ژێر ڕکێفی خۆیەوەو یادی خوای لەبیر بردوونەتەوە، ئا ئەوانە پێڕی شەیطان.

ئنجا لەڕاستیدا شەیتانی نەگریس تەنیا کاتێکو لەحاڵێك دا زەفەر بەئینسان دەبات کە لەخوا بێ ئاگابێتو کەبەهۆی بێئاگایی (غَفْلَة)یەوە حاڵی دڵو دەروونی تاریكو تەڵەم داهات ئیبلیسی پیس وەك دزی ماڵبڕ دەرفەت وەردەگرێو پارێزی بۆ دەباتو دزی لێدەکات، هەربۆیەش شەیطان خوای کاربەجێو پەنهان بین بە (الوسواس الخناس) خوتخوتەکەری خۆ پەنهان کەر، پێناسەی کردوەو (ابن عباس) یش گوتوویەتی: (الشيطان جاثِمْ على قَلْب ابن آدم، فأذا سَها وغَفَلَ وَسْوَسَ، فأذا ذكرالله تعالى خَنَسَ) رواه البخاري مرفوعاً تعليقاً، واخرجه الطبري، وقال الألباني، صحيح بلفظ آخر، واتە: شەیطان چۆکی لەسەر دڵی ئادەمیزاد داداون، جا هەرکات لەخوا بێئاگابوون خوتخوتە دەکاتو کەخوای بەرزیشی هاتەوە یاد خۆی پەنهان دەکات.

## ١-واتاو پێناسەی زیکر

### أ-لەئەسڵی زمان دا:

زمانزانان بەچەند شێوەیەك پێناسەی وشەی (ذكر)یان كردوە كە وشەیەكی عارەبیيە، بەڵام هەموو پێناسەكان لەنێوەڕۆك دا یەكن، بۆ وێنە:

*خاوەنی كتێبی (مختار الصحاح) گوتوویەتی[٢]: (الذِّكر والذكرىٰ والذِّكرة: ضِدُّ النِّسيان) واتە: هەركام لە: (ذِكرٌ، ذِكرى، ذِكرة) دژی لەبیرچوونەوەن، كەواتە (ذكر) یانی لەبیربوونو وەبیرهاتنەوە.

*(راغب الأصفهاني)یش دەربارەی وشەی (ذكر) گوتوویەتی[٣]: (وتارة يُقالُ لحضور الشيئ القلب أو القولَ، ولذلك قيل: الذكر ذكرانِ: ذكر بالقلب وذكر باللسانِ، وكل واحد منهما ضربان: ذكر عن نسيان وذكر لا عن نسيان) واتە: وە جاری وا هەیە (ذكر) بەشتێك دەگوترێ كە لەدڵدا یان لەسەر زمان ئامادە دەبێ، بۆیە گوتراوە، یادكردن دووجۆرە: یادی بەدڵو یادی بەزمان، هەركامێكیشیان دوو جۆرە: یادكردن دوای بیرچوونەوە، وەیادكردن بەبێ لەبیرچوونەوە.

كەواتە (ذكر) یانی باس كردن و یادكردنی شتێك بەدڵ یان بەزمان یان بەهەردووكیان.

* (زمخشري)یش هەر لەوبارەوە گوتوویەتی[٤]: (.. وأجْعَلْهُ مِنيّ على ذِكْرٍ، أي لاأنْساه) واتە: وام لێبكە كەفلانە شتم لەبیربێت، یانی لەیادم نەچێ.

* هەروەها (لسان العرب)[٥] و (المعجم الوسيط)[٦] یش هەمان ئەو قسانەی پێشوویان دووبارە كردوونەوە لەبارەی پێناسەو واتای وشەی (ذكر).

### ب-لەزاراوی شەرع دا:

دیارە شەرعیش وشەی (ذكر)ی هەر لەسەر ئەسڵی واتا زمانیيەكەی خۆی بەكارهێناوە وەك سەرجەم وشەكانی دیكەی وەك (صلاة وصوم وزكاة وحج و جهاد و .. الخ) بەڵام

---

[٢] بڕوانە: چاپی یەكەم، ساڵی ١٩٢٦، لاپەڕە ٢٢١.

[٣] بڕوانە: (معجم مفردات ألفاظ القرآن) ص١٨١.

[٤] بڕوانە: (أساس البلاغة) لفظ: (ذكر).

[٥] بڕوانە: (ج٤ص٣٠٨، ٣٠٩).

[٦] بڕوانە: ص٣١٣.

تایبەت و بەندداری (مُقَیَّد) ی کردوە بەخوای بێوێنەو تاکو پاکەوە، کەواتە پێناسەی (ذکر) لەزاراوی شەرع دا ئاوا ی لێهاتوە:

(ذکر) بریتیە لەبەسەر دڵ و زمان دا هێنانی یادی خواو سیفەتە بەرزەکانی و ناوە پەسەندەکانی و بە پاکگرتن و ستایشکردن و بەگەورەو مەزن و بەرزگرتنی.

ئەم پێناسەیە پوختەی سەرجەم قسەو شیکردنەوەی زانایانە کە بەمەبەستی زیاتر بەرچاوروونی ئەم چەند نموونەیان لێدەخەینەڕوو:

١-(مجاهد) گوتوویەتی:[٧] ئینسان ناچێتە ڕیزی (الذاکرین الله کثیراً والذاکرات) هەتا بەپێوەو بەدانیشتنەوەو بەڕاکشانەوە یادی خوا نەکات.

٢-(سعید بن جُبَیر)یش گوتوویەتی:[٨] هەرکەسێك لەفەرمانبەری (طاعة) ی خوادا بجووڵێ و کاربکات ئەوە یادی خوای کردوە.

٣-(عطاء)یش گوتوویەتی:[٩] کۆڕەکانی زیکر بریتین لەکۆڕەکانی حەلاڵ و حەرام باس کردن چۆن دەکڕی و دەفرۆشی و نوێژ دەکەی و بەڕۆژوو دەبی و ژن دێنی و تەلاقی دەدەی و چۆن حەج دەکەی و ئەوجۆرە شتانە.

٤-وە پرسیار لە (ابن الصلاح الشهرزوري) کراوە: ئایا ئینسان بەچ ئەندازەیەك لەیادی خواکردن دەچێتە ڕیزی: (الذاکرین الله کثیراً والذاکرات)ەوە؟! ئەویش گوتوویەتی:[١٠] (ئەگەر لەسەر ئەوجۆرە زیکرو ویردانە بەردەوام بێ کە لەڕێی ڕاستەوە ئیسپات بوو ون لەبەیانیان و ئێواران داولەحاڵەتە جۆراوجۆرەکانی شەوو ڕۆژدا دەگوترێن، دەچێتە ڕیزی ئەوانەوە کە بە: (الذاکرین الله کثیراً والذاکرات) ناوبراون.

٥-(قرطبي)یش، لەو بارەوە گوتوویەتی:[١١] کۆڕی زیکر، یانی کۆڕی زانست و ئامۆژگاری ئەو کۆڕانەی کە قورئانی خواو سوننەتی پێغەمبەرەکەی یان تێدا دەخرێتەڕوو،

---

[٧] بڕوانە: (فقه السنة) ج٢ص٨٦.

[٨] بڕوانە: (فقه السنة)ج٢ص٨٧، وە بڕوانە: (الأذکار) للنووي ص ٤١، ٤٢.

[٩] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[١٠] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[١١] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

هەروەها هەواڵی پێشینە چاکەکانو پێشەوایانی پێشووی، دنیا بەکەمگرمان - کە دووربووون لە ڕیاکاریو داهێنانو دیناویستیو طەماع - یانمان تێدا دەگێڕرێتەوە.

٦-هەروەها یەکێك لەزانایانی خواناس لەبارەی چەمكو واتای یادی خواکردن لەزاراوی شەرع دا گوتوویەتی:[١٢]

(إ ن الذكر على سبعة أنحاء: فَذِكرُ العَيْنَيْنِ البُكاءُ، وذكر الأذُنَيْنِ الأصْغاءُ، وذكر اللِسان الثناءُ، وذكر اليَدَيْنِ العَطاءُ، وذكر البَدَنِ الوَفاءُ، وذكر القَلْبِ التسليمُ والرضاءُ وذكر الرّوحِ الخَوفُ والرجاءُ)

واتە: یادکردنی خوا حەوت جۆرە:

یادی چاوان گریانەو، یادی گوێیان گوێ هەڵخستنەو، یادی زمان مەدحو ستایش کردنەو، یادی دەستان بەخشینەو، یادی جەستە وەفاداریو جێبەجێکردنەو، یادکردنی دڵ گەردن کەچیو ڕازیبوونەو، یادکردنی گیان ترسو ئومێدە.

*پوختەی قسان:*

زیکری خواکردن ئەوەیە کە ئینسان خوای پەروەردگارو بێوێنەی لەبیر بێتو بەناوو سیفەتە بەرزو پەسەندەکانی باس و یادی بکاتو بەپاکگرتن (تسبیح) و ستاییش کردنو بەگەورەو مەزنو بەرزو پیرۆز گرتنی ڕابگەیەنێ، جابێگومان هەتا ئینسان سەرگەرمی فەرمانبەریو بەندایەتیکردن بۆ خوا بێت بەهەر جۆرێك لەجۆرەکانی فەرمانبەریو بەندایەتی، ئەوە خوای بەرزو مەزنی لەیادو بیردایەو ئاگای لێی نەبڕاوە، بۆیە هەندێکیان هەرجۆرە پەیوەندی هەبوونێکیان بەخواوە بەیادکردن (ذکر) داناوە، هەرچەندە ئەوە لەئەندازەی سروشتی خۆ زیاتر فراوان کردنی چەمكو واتای زیکرە.



[١٢] بڕوانە: (ریاض الجنة) ص١٤٠، نووسراوی: الشیخ عبدالحمید الکشك؛ وە بڕوانە: (یادی خوا) بەرگی یەکەم، لاپەرە، (٣٥)، چاپی یەکەم ساڵی ١٩٨٧.

## ٢-گرنگی و پلەو پایەی زیکری خوا

خوێنەری سەنگین و شیرین ! خوا پشتیوان بێ لەسێ خاڵ دا گرنگی و بایەخ و پلەو پایەی زیکر ڕوون دەکەینەوە، یەکەم: لەبەر تیشکی ئایەتەکانی قورئان دا، دووەم: لەبەر ڕۆشنایی دەقەکانی سوننەت دا، سێیەم: لەبەر ڕووناکی قسەی زاناو پێشەوایان دا.

### یەکەم: گرنگی و پلەو پایەی زیکر لەقورئانیدا:

(ابن القيم الجوزية) گوتوویەتی:[١٣]

گرنگی و پلەو پایەی یادی خوا لەقورئانیێ بەدە (١٠) شێوە خراوەتەڕوو.

١-فەرمان پێکردنی:

وەك خوای بەخشندە فەرموویەتی: (يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اذْكُرُوا اللَّهَ ذِكْرًا كَثِيرًا وسبحوه بكرة واصيلاً) الأحزاب:٤١،

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە یادی خوا بکەن بەیادکردنێکی زۆر، وە بەیانیان و ئێواران بەپاکی بگرن.

٢-قەدەغەکردنی بێئاگایی لەخوا کە پێچەوانەی زیکرە:

وەك خوای پەنهان بین فەرموویەتی:

(وَاذْكُرْ رَبَّكَ فِي نَفْسِكَ تَضَرُّعًا وَخِيفَةً وَدُونَ الْجَهْرِ مِنَ الْقَوْلِ بِالْغُدُوِّ وَالْآصَالِ وَلَا تَكُنْ مِنَ الْغَافِلِينَ) الاعراف: ٢٠٤،

واتە: وە یادی پەروەردگارت بکە لەبەرخۆتەوەو بەلالانەوەو ترسەوەو بەبێ دەنگ بەرزکردنەوە، بە بەیانیان و ئێواران و لەبێئاگایان مەبە !

هەروەها فەرموویەتی: (وَلَا تَكُونُوا كَالَّذِينَ نَسُوا اللَّهَ فَأَنْسَاهُمْ أَنْفُسَهُمْ أُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ) الحشر: ١٩، واتە: وە لەو کەسانە مەبن کە خوایان لەبیرچۆتەوە، ئەویش خۆیانی لەبیربردوونەوە، وە هەر ئەوانەن لەڕێدەرچوان.

٣-پێوەی پەیوەست کردنی سەرفرازی (فلاح):

وەك فەرموویەتی: (..وَاذْكُرُوا اللَّهَ كَثِيرًا لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ) الأنفال: ٤٥، وە الجمعە:١٠،

واتە: وە زۆر یادی خوا بکەن بۆئەوەی سەرفرازبن.

---

[١٣] بڕوانە: (مدارج السالكين شرح منازل السائرين) ج٢ص٤٢٤تا٤٢٨.

٤-مەدحو ستایش كرانی ئەنجام دەرانیو پاداشتی بەرز بۆ دانرانیان:

وەك خوای دادگەر لەمەدحی بڕوادارانی پیاوو ئافرەت دا فەرموویەتی: (إِنَّ الْمُسْلِمِينَ وَالْمُسْلِمَاتِ وَالْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ وَالْقَانِتِينَ وَالْقَانِتَاتِ وَالصَّادِقِينَ وَالصَّادِقَاتِ وَالصَّابِرِينَ وَالصَّابِرَاتِ وَالْخَاشِعِينَ وَالْخَاشِعَاتِ وَالْمُتَصَدِّقِينَ وَالْمُتَصَدِّقَاتِ وَالصَّائِمِينَ وَالصَّائِمَاتِ وَالْحَافِظِينَ فُرُوجَهُمْ وَالْحَافِظَاتِ وَالذَّاكِرِينَ اللَّهَ كَثِيرًا وَالذَّاكِرَاتِ أَعَدَّ اللَّهُ لَهُمْ مَغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا) الأحزاب:٣٥.

٥-هەواڵدان بە زەرەرمەندیو زیانباری واز لـێهێنەرانی:

وەك فەرموویەتی: (يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُلْهِكُمْ أَمْوَالُكُمْ وَلَا أَوْلَادُكُمْ عَنْ ذِكْرِ اللَّهِ وَمَنْ يَفْعَلْ ذَلِكَ فَأُولَئِكَ هُمُ الْخَاسِرُونَ) المنافقون:٩، واتە: ئەی ئەو كەسانەی بڕواتان هێناوە بامالو سامانتانو ڕۆڵەكانتان لەیادی خوا بێئاگاتان نەكەن، چونكە بێگومان هەركەسێك وا بكات ئائەوانەن زیانباران.

٦-خوا یادكردنی خۆی بۆ بەندەكانی كردۆتە پاداشتو بەرانبەری یادی ئەوان بۆ وی:

وەك فەرموویەتی: (فَاذْكُرُونِي أَذْكُرْكُمْ وَاشْكُرُوا لِي وَلَا تَكْفُرُونِ) البقرة: ١٥٢.

واتە: جا یادم بكەن منیش یادتان دەكەم، وە سوپاسگوزاریم بۆ بكەنو سپڵە مەبن.

٧-هەواڵدان بەوە كە زیكری خوا لەهەمو شتێك گەورەترە:

وەك فەرموویەتی: (اتْلُ مَا أُوحِيَ إِلَيْكَ مِنَ الْكِتَابِ وَأَقِمِ الصَّلَاةَ إِنَّ الصَّلَاةَ تَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنْكَرِ وَلَذِكْرُ اللَّهِ أَكْبَرُ وَاللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَصْنَعُونَ) العنكبوت: ٤٥.

واتە: ئەوە بخوێنە كە لەكتێبی خوا پێت ڕاگەیەنراوە، وەنوێژ بەرپابكە بێگومان نوێژ -ئینسان - لە ڕەفتاری ناقۆڵاو خراپ دەگێڕێتەوە، وە بەتەئكید یادی خواكردن (كە ڕووحو كاكڵەی نوێژو خواپەرستییەكانی دیكەشە) لەهەمووشتێك گەورەترە وەخوا دەزانێ چی دەكەن.

٨- ڕوونكردنەوەی ئەو ڕاستییە كە خوا یادكەران خاوەنی عەقڵنو سوودمەندن لەنیشانەكانی؛ وەك خوای میهرەبان فەرموویەتی:

(إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لَآيَاتٍ لِأُولِي الْأَلْبَابِ، الَّذِينَ يَذْكُرُونَ اللَّهَ قِيَامًا وَقُعُودًا وَعَلَى جُنُوبِهِمْ) آل عمران: ١٩٠-١٩١،

واتە: بەڕاستی لەدورستكرانی ئاسمانەكانو زەویو جیاوازیو جێگۆڕكەی شەوو ڕۆژدا نیشانەگەلێك هەن بۆ خاوەن عەقڵان. ئەوانەی كە بەپێوەو بەدانیشتنەوەو لەسەر تەنیشتیان یادی خوا دەكەن...

**٩-کردنی و گێڕانی بەکۆتایی (خَتْم) ی، سەرجەم خواپەرستی و کردەوە چاکەکان:**

ا-نوێژ: (فَإِذَا قَضَيْتُمُ الصَّلَاةَ فَاذْكُرُوا اللَّهَ قِيَامًا وَقُعُودًا وَعَلَى جُنُوبِكُمْ) النساء:١٠٣.

ب-ڕۆژوو: (شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذِي أُنزِلَ فِيهِ الْقُرْآنُ هُدًى لِلنَّاسِ وَبَيِّنَاتٍ مِنَ الْهُدَى وَالْفُرْقَانِ فَمَنْ شَهِدَ مِنْكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ وَمَنْ كَانَ مَرِيضًا أَوْ عَلَى سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِنْ أَيَّامٍ أُخَرَ يُرِيدُ اللَّهُ بِكُمُ الْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ وَلِتُكْمِلُوا الْعِدَّةَ وَلِتُكَبِّرُوا اللَّهَ عَلَى مَا هَدَاكُمْ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ) البقرة: ١٨٥، **دیارە بەڕای تێکڕای توێژەرەوانی قورئانیش مەبەست لە (وتكبّروا الله) گوتنی (الله اكبر) ەکانی پێش نوێژی جەژنە**جەژنە.

ج-حەج: (فَإِذَا قَضَيْتُمْ مَنَاسِكَكُمْ فَاذْكُرُوا اللَّهَ كَذِكْرِكُمْ آبَاءَكُمْ أَوْ أَشَدَّ ذِكْرًا) البقرة: ٢٠٠، **واتە: وە هەرکاتێك خواپەرستی یەکانی حەجەکەتانتان تەواوکردن ئەوە وەك باس و خواسی باب و باپیرانتان بگرە زیاترو چاکتریش یادی خوا بکەن.** بکەن.

د-نوێژی جومعە: (فَإِذَا قُضِيَتِ الصَّلَاةُ فَانتَشِرُوا فِي الْأَرْضِ وَابْتَغُوا مِنْ فَضْلِ اللَّهِ وَاذْكُرُوا اللَّهَ كَثِيرًا لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ) الجمعة: ١٠،

**١٠-جووت کردنی لەگەڵ سەرجەم کردەوە چاکەکان داو گێڕانی بەڕووح و کاکڵیان:**

بۆ وێنە دەربارەی نوێژ فەرموویەتی: (وَأَقِمِ الصَّلَاةَ لِذِكْرِي) طه:١٤، **واتە: وە نوێژ بەرپا بکە بەمەبەستی یادکردنی من، (واتە یادی خواکردن ئامانج و نوێژ وەسیلەیە).**

**پێشتریش باسمان کرد کە لەگەڵ ڕۆژوو و حەج دا باس کراوە، وە لەگەرمەی جەنگ و جیهادیش دا هەر هەیە، وەك فەرموویەتی:** (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا لَقِيتُمْ فِئَةً فَاثْبُتُوا وَاذْكُرُوا اللَّهَ كَثِيرًا لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ) الأنفال: ٤٥، **بگرە هۆکاری بنەڕەتی سەرکەوتن و سەرفرازیشە.**

## دووەم: گرنگی و پلەو پایەی زیکر لەسوننەت دا:

**دەقی سوننەت لەبارەی گرنگی و گەورەیی و پلەو پایەبەرزی زیکری خواکردن یەکجار زۆرن ئەمانە چەند نموونەیەکیانن:**یانن:

**١-(..سَبَقَ الْمُفَرِّدُونَ، قيل وما المفردون يارسول الله؟ قال: الذاكرون الله كثيراً والذاكرات)** رواه مسلم والترمذي عن ابي هريرة رضي الله عنه.

واتە: تاق بووە[١٤] وەکان پێش هەموو خەڵکی کەوتوونەوە، گوترا: جا ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ تاق بووەوان کێن؟ فەرمووی: پیاوان و ئافرەتانی زۆر خوا لەیادان.

٢-(لايَقعُدُ قَوْمٌ في مجْلسٍ يذكرون الله فيه إلا حَفَّتْهُمُ الملائكة وغَشِيَتْهُمُ الرَّحْمَةُ ونزلَتْ عليهم السكينة وذكرهم الله فيمنْ عنْدَه) رواه أحمد ومسلم والترمذي عن أبي هريرة.

واتە: هیچ کۆمەڵێك لەشوێنێك دا دانانیشن و یادی خوای تێدا ناکەن، مەگەر فریشتەکان دەوریان دەدەن و بەزەیی -خوا- دایان دەپۆشێ و ئارامیو ئۆخژنیان بۆ دێتە خوار، وە خوا لەلای ئەوانەی کە لەلانی باسیان دەکات.

٣-(مثل الذي يذكُرُ ربَّهُ والذي لايذكُرَ ربَّهُ مَثَلُ الحيّ والميتِ) رواه البخاري وهذا لفظه ومسلم بلفظ آخر عن أبي موسى الأشعري رضي الله عنه.

واتە: وێنەی کەسێك کەیادی پەروەردگاری دەکات و کەسێك کەیادی پەروەردگاری ناکات وەك زیندوو و مردوو وایە.

٤- (.. وآمرُكُمْ أن تذكروا الله تعالى فإن مَثَلَ ذلك كَمَثَلِ رَجُلٍ خَرجَ العَدُوُّ في أثَرِه سِراعاً حتى اذا أتى الى حِصْنٍ حَصْينٍ فأحرز نَفْسهُ منهم، كذلك العَبْدُ لايُحْرِزُ نَفْسَهُ من الشيطان إلاّ بذكرِ الله) رواه احمد والترمذي وصححه، وكذا صحَّحَهُ كل من ابن حبان والحاكم والألباني،[١٥] والراوي هو: الحارث الأشعري رضي الله عنه.

واتە: وە فەرمانتان پێدەکەم کەیادی خوای بەرزبکەن، چونکە وێنەی ئەوە وەك پیاوێك وایە کە دوژمن بەخێرایی بەدوای‌دا بچێ هەتا خۆی دەگەیەنێتە قەڵایەکی قایم و خۆی لەوێدا لەچنگ دوژمن دەپارێزێ، جا بەندەش ئاوایە و بەیادی خوا نەبێ خۆی پێ لە شەیطان پەنا نادرێ و ناپارێزرێ.

٥- (عبدالله بن بسر) خوا لێی ڕازی بێ دەگێڕێتەوە کەپیاوێك گوتوویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێیەکانی چاکەکردن زۆرن و منیش ناتوانم هەموویان ئەنجام بدەم جا شتێکم پێ بڵێ کە جەختی لەسەر بکەم، بەڵام با زۆر نەبێ لەبیرم بچێتەوە، ئەویش فەرمووی: (لايَزالُ لِسانُكَ رَطْباً بِذِكرِالله تعالى) رواه الترمذي واحمد وابن ماجة وصَحَحهُ ابن حبان والحاكم و وافقه الذهبي،[١٦]

واتە: با بەردەوام زمانت بەیادی خوا پاراو بێت.

---

[١٤] بڕوانە: (تاج الأصول) ج٥ص٨٨.

[١٥] بڕوانە: (الوابل الصيب ورافع الكلم الطيب) ص٣٠، ٣١ و پەراوێزەکەشیان.

## سێیەم: گرنگی پلەو پایەی زیکری خوا لەڕوانگەی زانایانەوە:

١-(ابن عباس) خوا لێیڕازیبێ گوتوویەتی:[١٧]

(إن الله تعالى لم يَفرضْ على عباده فريضة إلاّ جَعَلَ لَها حَداً مَعْلوماً وعَذَرَ أهلَها في حال العُذْرِ غير الذكر، فأن الله لم يَجْعَل له حَداً ينتهي اليه، ولَمْ يَعْذُرْ احداً في تَرْكِهِ إلاّ مَغْلوباً على عقله، فقال: ((اذكروا الله قياماً وقعوداً وعلى جنوبكم)) أي: بالليل والنهار في البَرّ والبَحْرِ وفي السَّفرِ والحضر والغنى والفقرِ والسقم والصحة. والسّرّ والعلانية وعلى كل حال)

واتە: بێگومان خوای بەرز هیچ فەرزێکی لەسەر بەندەکانی پێویست نەکردوە مەگەر سنوورێکی زانراوی بۆ دانـاوە، وە لـەکاتی بـۆ نـەگونجانیش دا دەرفـەتو مۆڵـەتی خەڵکەکەی داوە کە نەیکەن، بێجگە لەزیکر، کە خوا سنوورێکی بۆ دانەناوە لەوێ کۆتایی بێت، وە مەگەر کەسێك هۆشی لەسەر خۆی نەمابێ ئەگەرنا مۆڵەتی بەکەس نەداوە بۆ نەکردنی، فەرموویەتی: (بەپێوەو بەدانیشتنەوەو لەسەر تەنیشت تان یادی خوا بکەن) یانی: بەشەوێو بەڕۆژێ، لەئیشکانیو لەدەریادا، لەسەفەرێو لەماڵێ بەدەوڵەمەندیو بەهەژاری، بەنەخۆشیو بەساغیو بە پەنهانیو بەئاشکرا، وە لەهەموو حاڵان دا.

٢-(الحسن البصري) لەوبارەوە گوتوویەتی:[١٨]

(الذكْرُ ذِكران: ذِكْرُ الله عز وجل بين نفسك وبين الله عزَّ وجلَّ ما أحْسَنَهُ وأعظم أجْرَهُ!، وأفْضَلُ من ذلك ذكر الله سُبْحانَهُ وتعالى عندما حَرَّمَ الله عز وجل)

واتە: زیکر دوو جۆرە: زیکری خوای زاڵو پایەدار لەنێوان خۆتو خوای باڵادەستو پایە بەرزدا، چەند چاکەو پاداشتی چەندە مەزنە!! بەڵێ لەوە چاکتریش بریتیە لەیادی خوای پاكو بەرز لەئاست ئەو شتانەدا کە خوای باڵا دەستو پایەبەرز قەدەغەی کردوون.

٣- (ابن عطاء الله السكندري)یش هەر لەوبارەوە زۆر شتی گوتوە، بۆ نموونە:[١٩]

(لايَسْتَحْقِرُ الوِرْدَ إلا جهولٌ. الوارِدُ يُوجَدُ في الدار الآخرة، والورِدُ ينطوي بِانطواء هذه الدنيا. وأولىٰ مايُعتنىٰ به مالا يُخْلَفُ وجُودُهُ. الوردُ هو طالِبُهُ منك، والواردُ أنت تَطْلُبُهُ منه، وأين ماهو طالِبُهُ منك مما هو مَطْلَبكَ منهُ!!. ورودُ الأمْدادِ بِحَسَبِ الأسْتِعْداد. وشروقُ الأنوار على حَسَبِ صفاءِ الأسْرار)

---

[١٧] بڕوانە: (تفسير الجلالين) ص١٢٠، ط٢، مكتبة النهضة،، وە: (فقه السنة) ج٢ص٨٧.

[١٨] بڕوانە: (إحياء علوم الدين) للغزالي ج١ص٢٩٥.

[١٩] بڕوانە: (إيقاظ الهِمَمْ في شرح الحِكَم) ج٢ص٤٦٢.

واتە: بابای نەفام نەبێ ویرد[٢٠] بەکەم ناگرێ. بەرهەمی ویرد لەمەنزڵگای دواڕۆژدایە، بەڵام بەپێچەرانەوەی ئەم ژیانە دنیاییە ویرد خوێندن کۆتایی دێ، جا دیارە لەپێشترین شتیش کە دەبێ بایەخی پێبدرێ شتێکە کەبەهیچ شوێنێ پڕ نابێتەوە. ویرد ئەو (خوا) لێی داواکردوی، بەڵام بەرهەمی ویرد (بۆ وێنە کەرامەت) تۆ لەوی داوا دەکەی! دەجا ئەوەی ئەو لەتۆی داوا کردوە، زۆر جیاوازە (بەرزترو چاکترە) لەوەی کەتۆ لەوی داوا دەکەی. هاتنی یارمەتی ئیمدادی مەعنەوی بەپێی ئامادەییە، وە لەدڵ دا پەیدابوونی ڕووناکییەکانی هیدایەت بەگوێرەی پاکیی‌و ساف بوونەوەی دەروونەکانە.

مەبەستی (ابن عطاء الله) ئەوەیە کە بەهۆی بەردەوام بوون لەسەر زیکرو ویرد ئینسان ئامادەیی بۆ هاتنە خوارەوەو پێبەخشرانی یارمەتیی‌و هیدایەتی خوایی پەیدا دەکات وە هەتا زیاتر ئەهلی زیکر بێت دڵی صافترو دەروونی پاکتر دەبێ‌و لەئاکامی ئەوەش دا زیاترو چاکتر شایستەیی ئەوەی تێدا پەیدا دەبێ کە بەڕووناکی هیدایەتی خوا دڵ‌و دەروونی ڕۆشن و شوعلەوەر بێت.

## ٣-جۆرەکانی زیکر (أنواع الذکر)

ئەم بەندی سێیەمە بەکاکڵ‌و نێوەڕۆکی باسی (زیکری خوا کردن) دادەنرێ‌و بەتەنیاش لەسەرجەم بەندەکانی دیکە زیاترە، جا ئێمە بۆ ئاسانکاری خستنە ڕووی بابەتەکانی، بەم جۆرەی خوارێ پێشکەشی دەکەین:

یەکەم: قورئان خوێندن

دووەم: پاڕانەوە (الدعاء)

سێیەم: زیکری خوا هەر لەدەمی لەخەو هەڵسانەوە هەتا کاتی نووستن.

چوارەم: دوای پێنج نوێژە فەڕزەکان.

پێنجەم: زیکری خوا لەسەفەرێدا.

شەشەم: زیکری خوا لەکاتی جەنگ‌و جیهاددا.

حەوتەم: زیکری خوا لەکاتی خواردن‌و خواردنەوەدا.

هەشتەم: زیکری خوا لەچەند حاڵەتێکی جیا جیادا.

نۆیەم: چەند زیکرێکی گەورەو گرنگ.

دەیەم: داوای لێبوردن لەخواکردن (الأستغفار).

یازدەیەم: صەڵات‌و سەلام ناردن بۆ پێغەمبەر (محمد) ﷺ.

---

[٢٠] ویرد کە کۆیەکەی (اوراد)ە بەو زیکرانە دەگوترێ کە دەوامیان لەسەردەکرێ‌و دووبارە دەبنەوە.

## یەکەم: قورئان خوێندن:

زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە قورئان خوێندن گەورەترین و چاکترین جۆری زیکرە، هەرچەندە جاری واش دەبێ کە جۆرە زیکرێك لەقورئان خوێندن باشتر دەبێ و بەپێی جیاوازی حاڵەتەکانی ئینسان حوکمی ئەو مەسەلەیە دەگۆڕێ، (ابن القیم) گوتوویەتی: (ڕۆژێك بە (ابن تیمیة)م گوت: پرسیار لەهەندێ لەزانایان کراوە، کە ئایا (سبحان الله) گوتن بۆ بەندە چاکترە یان (استغفرالله) گوتن؟! ئەویش گوتی: پۆشاك ئەگەر خاوێن بێت ئەوە بخوورو گوڵاوی بۆ چاکترە، بەڵام ئەگەر چڵکن بێت ئاوی گەرم و صابوونی باشتر بەکەڵك دێت).[21]

ئەمەش چەند فەرموودەیەکی پێغەمبەر ﷺ دەربارەی قورئان خوێندن:

* (عن أبي أمامة رضي الله عنه قال: سَمِعتُ رسول الله ﷺ يقول: إِقرَؤا القرآن فإنَّهُ يأتي يوم القيامةِ شفيعاً لأصْحابِهِ) رواه مسلم.

واتە: قورئان بخوێنن چونکە ڕۆژی قیامەتێ دێت تکا بۆ هاوەڵانی دەکات.

*(الذي يقرأُ القرآن وهو ماهِرٌ بهِ مَعَ السَّفَرةِ الكِرَامِ البَرَرَةِ..) رواه البخاري ومسلم عن عائشة رضي الله عنها.

واتە: ئەو کەسەی کە قورئانێ دەخوێنێ و تێیدا کارامەیە لەگەڵ نوێنەرە بەڕێزە چاکەکارەکان (فریشتەکان)ە.

* (عن ابن مسعود رضي الله عنه قال: قال رسول الله ﷺ: مَنْ قَرأَ حَرْفاً مِن كتاب الله فَلَهُ حَسَنَةٌ، والحسنةُ بِعَشرِ أمثالها، لاأقولُ: (ألم) حرفٌ ! ولكن ألِفُ حَرفٌ ولامٌ حَرْفٌ ومِيمٌ حَرفٌ) رواه الترمذي وقال: حسن صحيح. واتە: هەرکەسێك پیتێك لەکتێبی خوا بخوێنێ چاکەیەکی هەیە، هەر چاکەیەکیش بە دە (١٠) دەنووسرێ، ناشڵێم (ألم) هەمووی پیتێکە، بەڵکو ئەلیف پیتێکەو لام پیتێکەو میم پیتێکە.

*(عن أبي موسى رضي الله عنه عن النبي ﷺ قال: تعاهَدوا هذا القرآن فو الذّي نَفْسُ محمدٍ بيدهِ لَهُوَ أَشَدُّ تفلُّتاً من الأبلِ في عُقُلِها) متفق عليه.

واتە: ئاگاداری ئەم قورئانە بن چونکە سوێند بەو کەسەی کە گیانی موحەممەدی بەدەستە لەحوشتران کە بەپەتك دەبەسترێنەوە بزۆزترە.

(واتە: ئەگەر زوو زوو نەیخوێنن لەبیرتان دەچێتەوەو خۆی لەپەتی زەین و مێشکتان بەرهەڵدادەکات).[22]

---

[21] بڕوانە: (الوابل الصَّيِب..) ص١٨٨.

[22] بۆ قورئان خوێندن چەند ئەدەب و ڕەوشتێك هەن دەبێ ڕەچاو بکرێن کە لێرەدا مەودای باس کردنیان نیە، بۆ وێنە سەرنجی (التبيان في آداب حَمَلَة القرآن)ی (نووی) بدە کە لەو بارەوەیە.

دووەم: پاڕانەوە (الدّعاء)

وشەی (دُعاءُ) کە لە (دعیٰ یَدعو) ەوە هاتوە لەئەسڵی زمان دا بەمانای داواکردن دێ و لەزاراوی شەرعیش دا بریتیە لە: (داواکردنی شتێك لەخوای پەروەردگار).

جا ئێمە لەسێ برگەی کورت دا باسی پاڕانەوە دەکەین:

أ- گرنگی پلەو پایەی پاڕانەوە:

خوای پەروەردگار فەرموویەتی: (أدعوني استجبَ لَكُمْ، ...) غافر:٦، واتە: لێم بپاڕێنەوە وەڵامتان دەدەمەوە.

پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: (الدُعـاءُ هـو العِبـادَةُ) رواه احمد واصحاب السنن، واتە: هەر پاڕانەوە خواپەرستییە.

هەروەها فەرموویەتی: (الدعـاءُ مُـخُّ العبـادةِ) رواه الترمذي، واتـە: پاڕانـەوە کاکڵـەی خواپەرستییە.

هەروەها فەرموویەتی: (لَيْس شيئٌ أكرمَ على الله من الدعـاءِ) رواه الترمذي وابن ماجة، واتە: هیچ شتێك لەپاڕانەوە بەرێزتر نیە لەلای خوا.

ئنجا خـوای پـەروەردگار لـەقورئانیدا پاڕانـەوەو نـزای سـەرجەم پێغەمبـەرانی خـۆی علیهم الصلاة السلام وەك مـەدح و پێهـەڵگوتنیان - نـەقڵ کـردوە، کـە ئـادەم علیه السلام ئـاوا پاڕاوەتەوەو نووح علیه السلام بەوجۆرە نزای کردوەو ئیبراهیم علیه السلام بەوشێوەیە داوای کردوەو ... هتد.

کەواتە دیارە لەخوا پاڕانـەوەو کڕووزانەوەو داواکردن کردەوەو ڕەفتارێکی پەسەندو بـەرزەئەگـەرنا سـەرجەم پێغەمبـەرانی پایـە بـەرزی خـوا صلـی الله علیـهم وسلم لەسـەری کۆ نەدەبوون و خوای کاربەجێش ئاوا لەڕووی مەدح و ستایشەوە پاڕانەوەو نزایەکانیانی نەدەگێڕایەوە!

ب-شێوازو چۆنیەتی پاڕانەوە:

بۆئـەوەی پاڕانـەوە گـیراو قبـووڵ بێـت پێویسـتە ئـەم شـتانەی خـوارەوەی تێـدا ڕەچاو بکرێن:

یەك: خۆپاراستن لەحەرام:

*(عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: قال رسول الله ﷺ: يأيها النـاسُ إنَّ الله طَيِّبٌ لايقبـلُ إلاّ طَيباً وان الله أمر المؤمنين بما أمرَ به المرسلين، فقال: (يأيها الرسلُ كلـوا مـن الطيبـات وأعملـوا صالحاً إنِّي بما تعملون عليم) وقال: (يأيها الذين آمنوا كلوا مـن طيبـات مـا رزقنـاكم)، ثـم ذكـر الرجل يطيلُ السفر أشعث أغبر، ومطعمهُ حرامٌ و ملبسهُ حرام، وغذّي بالحرام يمدُّ يدَيْهِ الى السـماء: يارب: فأنىٰ يُستجابُ لذلك) رواه احمد ومسلم.

واتە: ئەی خەڵکینە خوا چاكو پاكەو شتی چاكو پاك نەبێ وەرناگرێ، وە خوا بەوە كە فەرمانی بەپێغەمبەران كردوە فەرمانیشی پێ بە بڕواداران كردوە، فەرموویەتی: (ئەی پێغەمبەرینە لەڕۆزیی حەڵاڵەكان بخۆنو كردەوەی چاك بكەن من بەوەی كە دەیكەن زانام)، وە فەرموویەتی: (ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە لەو ڕۆزییە پاكو چاكانە بخۆن كە پێمان داون) پاشان باسی كابرایەكی كرد كەسەفەرێ درێـژ دەكاتـەوەو سـەرقژنو چڵكن، وە خواردنی حەرامەو پۆشاكی حەرامەو بەحـەرام بـەخێوكراوە، كـەچی هـەردووك دەسـتی بـەرەو ئاسمانـێ هـەڵدێنێ: ئـەی پـەروەردگارم ئـەی پـەروەردگارم، ئـاخر ئـەوە چـۆن وەڵامی بدرێتەوە!!

دوو: ستایشـی خـوا كـردنو بـە بـەرزو پـاك گرتنـی و صـەڵاتو سـەلام نـاردن بـۆ پێغەمبەر ﷺ پێش داواكردنی هیچ شتێك لە خوای بەخشەر:

پێغەمبەر ﷺ لەوبارەوە فەرموویەتی: (إذا صلّى أَحَدُكُمْ فَلْيَبدأْ بِتَمْجيد رَبّه جلّ وعـزَّ والثنـاء عليه، ثم يُصلّي علىٰ النبي ﷺ ثم يَدْعو بَعْدُ بما يَشاءُ) رواه اصحاب السنن إلا اباداود عن فضالة بن عبيد وصححه الترمذي.

واتە: ئەگەر یەكێكتان پاڕایەوە با بە بەرزو مەزن گرتنـی پـەروەردگاری پایـە بـەرزو باڵادەستیو ستایش كردنی دەست پێبكات، پاشان صەڵەوات لەسەر پێغەمبەر ﷺ بدات، ئنجا دوایی چی دەوێ با داوای بكات.

سـێ: دڵ بێـداریو پێشـاندانی پێویسـتیو ناچـاریو گـەردن كـەچیو كڕوزانەوەو لاڵانەوە:

خوای بێ وێنە فەرموویەتی: (ادْعُوا رَبَّكُمْ تَضَرُّعًا وَخُفْيَةً إِنَّهُ لا يُحِبُّ الْمُعْتَدِيـنَ) الأعراف: ٥٥،

واتـە: بەلاڵانـەوەو پەنـهانی لەپـەروەردگارتان بپاڕێنـەوە، چونكـە ئـەو لـەڕێ دەرچوانـی خۆش ناوێن.

پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: (القلوب أوعية وبعضها أوعىٰ مِنْ بعض فإذا سـألتم الله -أيها الناس- فأسألوهُ وأنتم موقنون بالأجابة فانه لايستجيبُ لعَبْدٍ دعاهُ عن ظهرِ قَلْبٍ غافِلٍ) رواه احمد عن عبدالله بن عمر رضي الله عنهما.

واتە: دڵەكان شوێنی هیدایەتو زانیاری تێكرانن، وە هەندێكیان لەهەندێكیان زیاتر دەگرن، جا ئەی خەڵكینە هـەركاتێك لـەخوا پاڕانەوە، بەدڵنیاییو مسۆگەر بوون بەوەڵام درانەوەتان داوای لـێبكەن، چونكە خوا وەڵامی بەندەیەك ناداتەوە كە بەدڵێكی بێئاگا لێی بپاڕێتەوە.

چوار: بەپەلە نەبوون لەگیرابوون و وەڵامدانەوە:

پێغەمبەر ﷺ لەوبارەوە فەرموویەتی: (يُسْتَجابُ لأحَدِكُمْ مالَمْ يَعْجَلْ، يقولُ، قَدْ دَعَوْتُ رَبـي فَلَمْ يَسْتَجِبْ لي) متفق عليه عن ابي هريرة رضي الله عنه.

واتە: یەکێکتان - کە دەپاڕێتەوە - مادام پەلە نەکات وەڵامی دەدرێتەوە، کە بڵێ: لەپەروەردگارم پاڕامەوەو وەڵامی نەدامەوە.

وە لە ڕیوایەتێکی (مسلم)دا کە پرسیار لەپێغەمبەر ﷺ کراوە دەربارەی پەلەکردن فەرموویەتی:[22] (ئەوەیە کە بەندە بڵێ پاڕامەوەو پاڕامەوە، پێم وا نیە کە وەڵامم بداتەوە ئنجا لەپاڕانەوە وازدێنێ و کۆڵ دەدات). (وە بەهۆی کۆڵ دان و وازهێنانییەوە لەگیرابوون و وەڵامدرانەوەی پاڕانەوەکەی بێبەش (محروم)بێ).

پێنج: نەپاڕانەوە بۆ شتی گوناح و تاوان:

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (ما من مُسْلم يَدْعو الله عزَّوجلَّ بدَعْوةٍ لَيْس فيها إثْمٌ ولاقطيعةُ رحم، إلا أعطاهُ الله بها إحدى ثلاث خصال، إما أنْ يُعَجِّلَ لَهُ دعوتَهُ وإمّا أنْ يَدَّخِرَها لَهُ في الآخرة، وإما أن يَصْرِف عَنه من السوءِ مِثْلَها، قالوا: إذاً نكثِرُ، قال: الله أكْثَرُ) رواه احمد عن ابي سعيد الخدري رضي الله عنه.

واتە: هیچ مسوڵمانێك نیە کە لەخوای زاڵ و پایە بەرز بپاڕێتەوە بەپاڕانەوەیەك کە گوناح و خزمایەتی پچڕاندنی تێدا نەبێ، مەگەر خوا بەو پاڕانەوەیە یەکێك لەسێ شتانی دەداتێ: یان پاڕانەوەکەی گیرادەبێ و جێبەجێ دەبێ، یان بۆی هەڵدەگیرێ بۆ ڕۆژی دوایی، یان بەبارتەقای ئەو شتە کە داوای کردوە شەڕو خراپەی لێلادەدرێ، گوتیان، کەواتە زۆر دەپاڕێینەوە، فەرمووی: بەخششی خوا زیاترە.

شەش: خەفتان لەو کات و حاڵەتانەی کە پاڕانەوەیان تێدا چاکتر گیرا دەبێ:

چەند کات و حاڵەتێك هەن کە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕایگەیاندوە کە پاڕانەوەیان چاکتر تێدا وەردەگیرێ، بۆ وێنە: ڕۆژی عارەفات و مانگی ڕەمەزان و شەوو ڕۆژی جومعەو سێیەکی کۆتایی شەوگارو پێش بەرە بەیان (سَحَرْ) و حاڵەتی سەجدە بردن و نێوان بانگ و قامەت و دەمی تێك ڕژانی سوپای ئیسلام و کوفرو کاتی ڕۆژوو شکاندن و.. هتد.

کە هەموو ئەوکات و حاڵەتانە فەرموودەیان لەسەر هەن، بەڵام ئێمە بەس بۆ وێنە بەم دوو فەرموودەیە وازدێنین:

* (عن ابي أُمامة رضي الله عنه قال: قيل يا رسول الله أيُّ الدعاءِ أسْمَعُ؟! قال: جَوْفَ الليلِ الآخِر، ودُبُرَ الصلوات المكتوبات) رواه الترمذي بسند صحيح.

---

[22] بڕوانە: (رياض الصالحين) للنوي، ص٤٢١.

واتـە: گوتـرا ئـەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ پاڕانـەوە لـەچ کـاتێك دا گـیراترە؟ فـەرمووی: لەنێوەڕاستی بەشی کۆتایی شەوگارداو، لەپاش نوێژە فەرزەکان.

*(عن أبي هريرة رضي الله عنه أن النبي ﷺ قال: أَقْرَبُ مايكون العَبْدُ مِـن رَبِّـهِ وهـو سـاجِدٌ، فاكثروا الدعاء فَقَمِنٌ أن يُسْتَجابَ لكم) رواه مسلم.

واتە: نیزیکترین حاڵەتی بەندە لەپەروەردگاریەوە کاتێکە کە سەجدەی بردوە، جا لەوحاڵەتەدا زۆر بپاڕێنەوە شایستەی ئەوەیە وەڵامتان بدرێتەوە.

حەوت: چەند وردە ئەدەبێکی دیکە:

وەك: أ- ڕووکردنە قیبلەو ب-دەست بەرزکردنەوەو ج-دووبارە کردنەوەی پاڕانەوەکان سێجار سێجارو د- دەست بەدەمو چاوداهێنان لەکۆتاییدا، کە یەکەمیان لـەزۆر دەقی سوننەت دا هاتوە، بۆ وێنە لە (دعاء الأستسقاء)[24] ولەپاڕانـەوەی (عرفات)[25] دا هـاتوە کـە پێغەمبـەر ﷺ ڕووەو قیبلـە پاڕاوەتـەوە، دووەمیشـیان بەهـەمان شـێوە لەچـەندان دەقـی سوننەت دا هاتوە،[26] سێیەمیشیان (ابوداود) لـە (عبدالله بن مسعود) ەوە هێناویـەتی کـە گوتوویەتی پێغەمبەر ﷺ وای کردوە،[27] چوارەمیشیان هەرچەندە لەچەند ڕێیەکەوە هاتوە کـە پسـپۆڕانی سـوننەت بـەلاوازیان دادەنێـن، بـەڵام (الحـافظ ابـن حجـر) گوتوویـەتی: بەهەموویان دەگەنە پلەی فەرموودەیەکی باش (حَسَنْ)[28].

---

[24] وەك (بخاري ومسلم) لـە (عبـدالله بـن زيـد المـازني) گێڕاویانەتـەوە، بڕوانـە: (شـرح صحيـح مسـلم) ج٤ص٢٥١١، ٢٥١٢.

[25] وەك (مسلم) لە (جابر بن عبدالله) وە هێناویەتیو لەباسی حەج دا بەدرێژی هاتوە.

[26] (نووي) دوای ئەوەی ئەم فەرموودەیەی هێناوە: (عن أنس رضي الله عنه أن النبي ﷺ كان لايرفع يَدَيْـه في شـيء من دُعـاءِ إلا في الأستسـقاء حتـى يـرى بيـاض إِبْطَيـهِ) رواه مسلم، گوتوویـەتی: (ئەم فەرموودەیە ڕواڵەتەکەی ئەوە دەگەیەنێ کەپێغەمبەر ﷺ جگە لـەکاتی داواکردنی باران (إستسقاء) دەستەکانی بەرز نەکردبنـەوە، بەڵام وانیـە ئیسپات بووە کە لەغەیری پاڕانەوەی (استسقاء) یش دا لەزۆر حاڵەتان دا دەستی بەرز کردوونەوە کە لەوە زیاترن سەرژمێر بکرێن، کە من دەوری سی (٣٠) فـەرموودەم لـەوبارەوە لەڕیوایـەتی هـەرکام لـە (بخـاری ومسـلم) یـان یەکێکیان لەکۆتایی باسی (صفة الصلاة) لە (شرح المهذب) دا کۆکردوونەوە، وە ئەم فەرموودەیەش بەوە تەئویل دەکرێ کە پێغەمبەر ﷺ تەنیا لەکاتی (إستسقاء)دا هێندەی دەست بەرزکردنەوە کە بن هەنگڵەکانی دیاربن، یان مەبەست ئەوەیە کە نەیدیوە کە دەستی بەرزکردبنەوە، بەڵام غەیری ئەو زۆران دیتوویانەو قسـەی ئەوانیش پێش دەخرێ). بڕوانە: (شرح صحیح مسلم) ج٤ص٢٥٢٥.

[27] بڕوانە: (فقه السنة) ج٢ص٩٩.

[28] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

ج- چەند پاڕانەوەیەکی هەڵبژاردە:

یەك: لەقورئانیدا:

* خوای پەروەردگار لەسەر زمانی کۆتایی و بڕوادارانی شوێن کەوتووی فەرموویەتی: (رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذْنَا إِنْ نَسِينَا أَوْ أَخْطَأْنَا رَبَّنَا وَلَا تَحْمِلْ عَلَيْنَا إِصْرًا كَمَا حَمَلْتَهُ عَلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِنَا رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلْنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِ وَاعْفُ عَنَّا وَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَا أَنْتَ مَوْلَانَا فَانْصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ) البقرة: ٢٨٦،

واتە: پەروەردگارمان! ئەگەر شتێکمان لەبیرچوو یان هەڵەمان کرد لێمان مەگرە، پەروەردگارمان! وە ئەو کۆڵە قورسەی کە لەوانەی پێش ئێمەت بار کردوە لێمان بارمەکە، پەوروەردگارمان! وە ئەرکێکمان پێ مەسپێرە (یان) دووچاری حاڵەتێکمان مەکە کە لەتوانامان دا نەبێ، وە لێمان ببوورەو بمان پۆشەو بەزەیت پێمان دا بێتەوە، بەس تۆ پشت و پەنامانی جا سەرمان بخە بەسەر کۆمەڵی کافران دا.

* وە لەسەر زمانی هاوەڵانی ئەشکەوت (اصحاب الكهف) فەرموویەتی: (رَبَّنَا آتِنَا مِنْ لَدُنْكَ رَحْمَةً وَهَيِّئْ لَنَا مِنْ أَمْرِنَا رَشَدًا) الكهف: ١٠، واتە: پەروەردگارمان لەلایەن خۆتەوە بەزەیی تایبەتیمان پێببەخشە، وە لەکاروبارمان دا سەر ڕاستمان بکە.

*وە لەسەر زمانی ڕەببانییەکانی شوێن کەوتووانی پێغەمبەران عليهم الصلاة والسلام فەرموویەتی: (رَبَّنَا اغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَإِسْرَافَنَا فِي أَمْرِنَا وَثَبِّتْ أَقْدَامَنَا وَانْصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ) آل عمران:١٤٧.

واتە: پەوەردگارمان لەگوناحەکانمان و زیادەڕۆییمان لەکاروبارمان دا بمانبەخشە، وە پێیەکانمان بچەسپێنەو بەسەر کۆمەڵی کافران دا سەرمان بخە.

*وە لەسەر زمانی قووڵ ڕۆچوان لەزانیاریدا فەرموویەتی: (رَبَّنَا لَا تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا وَهَبْ لَنَا مِنْ لَدُنْكَ رَحْمَةً إِنَّكَ أَنْتَ الْوَهَّابُ) آل عمران: ٨،

واتە: پەوردگارمان دوای ئەوە ڕێڕوونیت کردووین دڵەکانمان لامەدە، وە لەلایەن خۆتەوە بەزەییمان پێببەخشە، بێگومان هەر تۆی بەخشەر.

*وە لەسەر زمانی (یونس) عليه السلام فەرموویەتی: (لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ سُبْحَانَكَ إِنِّي كُنْتُ مِنَ الظَّالِمِينَ) الأنبياء: ٨٧، واتە: بێجگە لەتۆ چ پەرستراو نین (ئەی خوایە) تۆ پاك و بێگەردی و بێگومان من لەستەمکاران بووم.

دوو: لەسوننەت دا:

*(انـس) خوا لێی ڕازی‌بێ گوتوویـەتی: پێغەمبـەر ﷺ بـەزۆری ئـەم دووعایـەی دەکـرد: (ربَّنا آتنا في الدُّنيا حَسَنةً وفي الآخرة حَسَنةً وقِنا عذاب النار) متفق عليه.

واتە: پەروەردگارمان لەدنیادا چاکەو لەدواڕۆژیش چاکەمان پێ ببەخشە، وە لەئازاری ئاگر - ی دۆزەخ - چەپاڵەمان بدە.

* (أللهُمَّ إني أسألك الهُدىٰ والتّقىٰ والعَفافَ والغِنىٰ) روا مسلم.

واتە: ئەی خوایە من ڕێروونیو پارێزکاریو پاکیو بێنیازییت لێدەخوازم.

* (أللهُمَّ ٱغفرلي وٱرْحَمني وٱهدني وعافني وٱرْزُقني) رواه مسلمٌ عن طارق بن أُشَيم.

واتە: ئەی خوایە لێم ببوورەو بەزەییت پێم دا بێتو ڕێروونییم بکەو سەلامەتم بکەو بژێوو ڕۆزییم بدەیە.

*( أللهُمَّ أَصْلِحْ لي ديني الذي هو عِصْمَةُ أَمري، وأَصْلِـح لي دنيـايَ التي فيها مَعاشي، وأصْلِح لي آخرتي التي فيها مَعادي، وٱجْعَلْ الحياة زيادة لي في كل خيرٍ، وٱجْعَلْ الموت راحَـةً لي مـن كـل شَرٍ) رواه مسلم عن ابي هريرة رضي الله عنه.

واتە: ئەی خوایە ئەو دینداری‌یەمم بۆ چاك بکە کەمایەی ڕاوەستانی کاروبارمە، وە ئەو ژیانە دنیایی‌یەمم بۆ باش بکە کە گوزەرانمی تێدایە، وە ئەو دواڕۆژەمم بۆ چاك بکە کە بۆی دەگەڕێمەوە، وە ژیانم بۆ بگێڕە بەمایەی بەرەو پێش چوونو زیادبوونی هەر خێرو چاکەیـەك، وە مردنیشـم بـۆ بگـێڕە بەمایـەی ئاسـوودەبوونو قوتـاربوونم لەهـەر خراپەو زیانێك.

* (أللهُمَّ إني أعوذُبك مِن الهمّ والحزنِ والعجْزِ والكسـلِ والبُخْـلِ والجُبْـنِ وضَلْـعِ الديـن وغلبـة الرجالِ) رواه البخاري.

واتە: ئەی خوایە من پەنات پێ‌دێنم لەخەفەتو پەژارەو نەتوانینو تەنبەڵیو ڕژدیو ترسنۆکی و قەرزو قۆڵی قورسو ستەمو دەستدرێژی پیاوان.

* (اللهمَّ إني ظَلَمْتُ نَفْسي ظلْماً كثيراً ولايغفِر الذنـوب إلا أنت، فٱغْفرلي مَغْفِـرَةً مـن عنـدك وٱرحمني انك أنت الغفور الرحيم) متفق عليه عن ابي بكر الصديق رضي الله عنه.

واته: ئەی خوایە من ستەمێکی زۆرم لەخۆم کرد بەس تۆش لەگوناحان دەبووری، جا لێم ببوورە بەلێبوردنێکی تایبەت لەلایەن خۆتەوە، وە بەزەییت پێم دا بێت بێگومان بەس تۆی لێبوردەی بە بەزەیی.

* (اللهم آتِ نفسي تَقواها وزَكِّها أنْتَ خير مَنْ زكاها، أنت وليُها ومَولاها) رواه مسلم، واتە: ئەی خوایە پارێزکاری بەنەفسم ببەخشە، وە چاکو پاکی بکەوە تۆ چاکترین کەسی کە تەزکیەی بکەی، تۆ سەرپەرشتو پشتوپەنای وی.

* ( أللهم إني أسالكّ مُوجباتِ رحمتِكَ وعزائِمَ مَغْفِرَتكَ، والسَّلامةَ من كُلَ إثْمٍ والغَنيمة من كل بِرّ والفوز بالجنة والنجاة من النار) رواه الحاكم وقال صحيح على شرط مسلم.

واتە: ئەی خوایە من داوات لێدەکەم کە ئەو کردەوە چاکانەی بەزەییت دابین دەکەنو، ئەو کارە مەزنانەی لێبوردنت مسۆگەر دەکەن بۆم بڕەخسێنی، وەسەلامەتی لەهەر گوناحێكو پشكو بەش لەهەر چاکەیەکت لێداوا دەکەم، وە گەیشتن بە بەهەشتو قوتار بوون لەئاگر - ی دۆزەخ - ت لێدەخوازم.

* (أللهم لك أسْلَمْتُ وبِك آمَنْتُ، وعليك توكّلْتُ واليك أنَبْتُ، وبِك خاصَمْتُ واليك حاكَمْتُ، فأغْفِرْلي ماقدَّمْتُ وماأخَّرْتُ، وماأسْرَرْتُ وماأعْلَنْتُ، أنْتَ المُقَدِّمُ وأنْتَ المُؤَخِّرُ، لا اله إلا أنْتَ) متفق عليه عن ابن عباس رضي الله عنهما.

واتە: ئەی خوایە گەردنم بۆ تۆ کەچ کردوەو بڕوام پێت هێناوە، وەپشتم پێت بەستوەو بۆلای تۆ گەڕامەوە، وە تۆ بەگژ ناحەزانم دا دەکەمو دادوەریم دێنمە لای تۆ، دەجا تۆش لێم ببوورە لەوەی پێشم خستوەو لەوەی دوام خستوە، وە لەوەی کە پەنهانم کردوەو لەوەش کە ئاشکرام کردوە، تۆ پێشخەریو تۆ دواخەری، بێجگە لەتۆ هیچ پەستراو نینە.

## سێیەم: زیکری خوا هەر لەدەمی لەخەو هەڵسانەوە هەتا کاتی نووستن

١-کاتی لەخەوهەستان:

* پێغەمبەر ﷺ کە لەخەوێ هەڵدەستا دەیفەرموو: (الحمدُلله الذي أحيانا بَعْدما أماتَنا وإليْهِ النُشورُ) رواه البخاري ومسلم وغيرهما عن حذيفة والبراء بن عازب وابي ذر.

واتە: ستایش بۆ ئەو خوایەی کە دوای ئەوەی مراندبووینی زیندووی کردینەوەو هەر بۆ لای ئەویش دەگەڕێینەوە.

* هەروەها فەرموویەتی: ئەگەر یەکێکتان لەخەوێ بێداربۆوە با بڵێ: (الحَمــدُلله الذي عافاني في جَسَدي، وَرَدَّ عليَّ روحي، وأذِنَ لي بِذكرِهِ) رواه الترمذي وابن السني عن ابي هريرة رضي الله عنه.

واتە: ستایش بۆ خوایەك كە جەستەمی سەلامەت کردوەو، گیانمی بۆ گەڕاندوومەوەو، مۆڵەتی داوم كەیادی بکەم.

٢-کاتی بەرە بەیان:

* (عن أبي هريرة رضي الله عنه أن النبي ﷺ كــان يُعَلِّـمُ أصْحابَـهُ يقـول: إذا أصْبَحَ أحَدُكُـمْ فَلْيقُلْ: اللهمَّ بكَ أصْبَحْنا وبكَ أمْسَيْنا وبك نَحيا وبك نَموتُ واليك النشورُ) رواه احمد والترمذي وابوداود وابن ماجة وابن حبان والبخاري في الأدب المفرد وهو صحيح.

واتە: پێغەمبەر ﷺ هاوەڵەکانی فێردەکرد دەیفەرموو: ئەگەر یەکێکتان بەیانی کردەوە بابڵێ: ئەی خوایە بەتۆ بەیانیمان کردەوەو بەتۆ ئێوارەمان لێداهاتو، هەر بەتۆ دەژینو بەتۆش دەمرینو گەڕانەوەش هەر بۆ لای تۆیە.

* (عن عثمان بن عفان رَضي الله عنه قال: قال رسول الله ﷺ: مامِنْ عَبْدٍ يقولُ في صباح كـل يَوْمٍ ومَساء كُلَ ليلةٍ: بسم الله الذي لايضرُّ مع اْسْمِهِ شيئٌ في الأرضِ ولا في السماء وهو السميع العليم ثلاث مراتٍ فيضرَّهُ شيئٌ) رواه أصحاب السنن الا النسائي وابن حبان والألباني وهو حديث صحيح.

واتـە: هیـچ بەندەیـەك نیـە كـە لەبەرەبـەیانی هـەر ڕۆژێـك و ئێـوارەی هـەر شـەوێك دا سـێجاران بڵـێ: بـەناوی ئـەو خوایـەی كـە لەگـەڵ نـاوی ویدا هیـچ شـتێك لـەزەویو لەئاسمانێدا زیان ناگەیەنێ، وە ئەو بیسەرو زانایە، وە هیچ شتێك زیانی لێبدات.

٣-کاتی لەماڵ چوونە دەر:

* (انس) خوالێیڕازیبێ گێڕاویەتەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەرکەسێك كـە لـە ماڵی خۆی دەچێتە دەرێ بڵێ: (بسم الله توكلت على الله ولا حَوْلَ ولاقُـوَّة إلاّ بـالله) ئەوە پـێی دەگوترێ: ئەوەندەت بەسە، وەپارێزراوی، وە ڕێپرووی کراوی، وەشـەیطان لـێی دوور دەکەوێتەوە... (أصحاب السنن) گێڕاویانەتەوەو (ألباني) بە (صحيح) ی داناوە.

* (امّ سَلَمة) خوالێیڕازیبێ گێڕاویەتەوە: هەرجارێك پێغەمبەری خوا ﷺ لەژووری مـن چووبایە دەرێ چاوی بەرەو ئاسمان بەرزدەکردەوەو دەیفەرموو: (أللـهمَّ إنـي أعوذبـك أن

أَضِلَّ، أو أُضَلَّ او أزِلَّ او أُزَلَّ او أظلِمَ أو أُظلَم أو أجْهَلَ أو يُجْهَلَ عليَّ) رواه احمد واصحاب السنن وابن السني والحاكم وإسنادهُ صحيح.

واته: ئەی خوایه من پەنات دێنمه بەر که ڕێم لێ تێك بچێ یان ڕێم لێ تێك بدرێ، یان هەڵه بکەم یان هەڵەم پێ بکرێ، یان ستەم بکەم یان ستەمم لێ بکرێ، یان نەفامی بکەم یان نەفامییم لەگەڵ بکرێ.

٤- کاتی تارەت گرتن و دەستنوێژگرتن و خۆشۆردن:

لەبەر ئەوەی لەباسی پاك و خاوێنی (طهارة) دا بەوردی باسی ئەو مەسەلانەمان کردوه لێرەدا دووبارەیان ناکەینەوەو خوێنەر حەواڵەی ئەوێ دەکەین.

٥- کاتی ڕووکردنه مزگەوت:

*(ابن عباس) خوا لەخۆی و بابی ڕازی بێ گێڕاویەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ دوای ئەوەی بانگبێژ بانگی بەیانی دەداو بۆ نوێژ دەچووە دەرێ، دەیفەرموو: (أللهمَّ أجْعَلْ في قلبي نوراً، وفي لساني نوراً، وأجْعَلَ في سَمْعي نوراً، وأجْعَلْ في بصري نوراً، وأجْعَل من خلفي نوراً، ومن أمامي نوراً، وأجْعَلْ من فوقي نوراً ومن تحتي نوراً، أللهمَّ أعْطِنِي نُوراً) رواه مسلم.

واته: ئەی خوایه ڕووناکی بخه دڵمەوه وە ڕووناکی بخه سەر زمانم، وە ڕووناکی بخه بیستنمەوەو ڕوناکی بخه دیتنمەوە، وە ڕووناکی بخه پشتمەوەو ڕووناکی بخه پێشمەوە، وە ڕووناکی بخه سەرروومەوەو ڕووناکی بخه ژێرمەوە، ئەی خوایه ڕووناکییم پێ ببەخشه.

٦- حاڵەتی چوونه نێو مزگەوت و هاتنه دەرو بیستنی بانگ و قامەت:

ئەمانیش لەکاتی توێژینەوەی درووشمی یەکەمی خواپەرستی (نوێژ)دا ڕوون کراونەوەو لێرەدا دووبارەیان ناکەینەوەو دیسان خوێنەر حەواڵەی ئەوێ دەکەین.

٧-کاتی چوونه ماڵەوەو چوونه ژوور:

* (عن جابر رضي الله عنه قال: سَمِعتُ رسول الله ﷺ يقول: إذا دَخَلَ الرَّجُلُ بَيْتَهُ فذكرالله تعالى عِند دخولِهِ وعِندَ طَعامِه، قال الشيطان: لامبيْتَ لكم ولاعَشاءَ وإذا دَخَلَ فَلَم يذكرالله تعالى عند دُخولِه، قال الشيطان: أدركتم المبيْتَ، فاذا لم يذكرالله تعالى عند طعامه، قال: أدركتم المبيت والعَشاءَ) رواه مسلم وابوداود وابن ماجة وابن السني.

واته: هەرکاتێك کابرا چۆوە ماڵەکەی و ناوی خوای بەرزی هێنا لەکاتی چوونه ژوورەوەو لەکاتی خواردنیدا، شەیطان دەڵێ: نه شەومانەوەو نه خواردنی ئێوارەتان بۆ نیه (ئەی شەیطانەکان)، بەڵام ئەگەر چۆوەو لەکاتی چوونه ژووردا ناوی خوای بەرزی نەهێنا، شەیطان دەڵێ: شەومانەوەتان مسۆگەرکردوه، جا ئەگەر لەکاتی خواردنەکەش دا دیسان ناوی خوای بەرزی نەهێنا، دەڵێ: شەومانەوەو خواردنی ئێوارەتان مسۆگەر کردوه.

٨-حاڵەتی جل‌وبەرگ دانان چ بۆ خۆشۆردن یان بۆ خەوتن:

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (سِتْرُ مابَيْن أعين الجِنِّ وعَوْرات بني آدَمَ أن يقول الرجل المسلم إذا أراد أنْ يَطْرَحَ ثِيابه: بسم الله الذي لا اله إلاّ هو) رواه ابن السني.

واتە: پەردەی نێوان چاوی جندانو عەورەتەکانی وەچەکانی ئادەم ئەوەیە کە کابرای مسوڵمان ویستی جلەکانی دابنێ، بڵێ: بەناوی ئەو خوایە کە بێجگە لەوی چ پەرستراو نین.

٩- لەکاتی نووستنی‌دا:

*(حذيفة بن اليمان) خوا لێی‌ڕازی‌بێ گێڕاویەتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك دەیویست بخەوێ دەیفەرموو: (بْاسْمِكَ اللهُمَّ أَمُوتُ وأَحْيا) رواه البخاري، واتە: ئەی خوایە بەناوی تۆ دەمرمو دەژیەم. (چونکە نووستن مردنێکی گچکەو بێداربوونەوەش وەك زیندووبوونەوەیە).

(باسمك ربي وضعتُ جنبي وبك أرفَعُهُ إنْ امسكتَ نفسي فارحَمْها وان أرْسَلْتها فاحفظها بما تحفظ به عبادك الصالحين) متفق عليه عن ابي هريرة.

واتە: پەروەردگارم بەناوی تۆ کەلەکەم دەخەمە سەر زەوی بە تۆش بەرزی دەکەمەوە، جا ئەگەر گیانمت کێشا بەزەییت پێ‌یدابێتەوە وە ئەگەر ناردتەوە بۆ نێو جەستەم ئەوە بەوە کە بەندە چاکەکانتی پێ‌دەپارێزی بیپارێزە.

* (عائشة) خوا لێی‌ڕازی‌بێ گوتوویەتی: کە پێغەمبەر ﷺ هەموو شەوێك کە دەچووە سەر جێگا، هەردووك لەپە دەستی پێکەوە کۆدەکردنەوە پاشان فووی لێ‌دەکردنو (قل هو الله أحَد) و (قل أعوذ بَرَب الفَلَق)و (قل أعوذ برب الناس)ی تێدا دەخوێندنو ئەوەندەی بۆی لوابایە لەپە دەستەکانی بەجەستەی‌دا دەهێنان، لەسەری‌و دەموچاوی‌یەوەو پێشەوەی جەستەیەوە دەستی پێ‌دەکرد، سێ‌جاران وای دەکرد. وەك (احمد و بخاري ومسلم وأصحاب السنن) گێڕاویانەتەوە، جگە لە (ابوداود).

*هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَنْ قَرأَ بالآيَتَيْن مِنْ آخرِ سُورةِ البقرة في لَيْلَة كفَتاهُ) رواه أحمد والبخاري ومسلم وأصحاب السنن إلا النسائي.

واتە: هەرکەسێك لەشەوێك دا دوو ئایەتی کۆتایی سوورەتی (البقرة) بخوێنێ، ئەوە بەسیەتی. ((أبن القيم) گوتوویەتی:[29] واتە بەسنی بۆ پارێزران لەشەڕو زیان).

*(البراء بن عازب) خوا لێی‌ڕازی‌بێ گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم: ئەگەرچوویە سەر جێگای خەوتن، وەك بۆ نوێژ دەیگری دەستنوێژ بگرە، پاشان لەسەر

---

[29] بڕوانە: (الوابل الصَّيب) ص٢٠٥.

لای ڕاستت ڕاکشێ و بڵێ: (أَللهمَّ إني أَسْلمتُ نَفْسي إليك، وَوَجَّهتُ وجَهي إِلَيْكَ، وفَوَّضْتُ أَمْري اليك، وأَلْجاتُ ظهري اليك، رغبة ورهبة اليك، لامَلْجا ولامَنْجىً منك إلا اليك، آمَنتُ بكتابِكَ الذي أَنْزَلْتَ، وبِنَبِيك الذي أَرْسَلْتَ)، واته: ئەی خوایە من خۆمم بەتۆ سپارد، وەڕووی خۆمم کردە تۆ، وە کاروباری خۆمم حەواڵەی تۆ کرد، وەپشتم بەتۆ بەست، خۆشم دەوێ لێت دەترسم، هیچ پەناو جێگای قوتاربوون نین لەچەنگ تۆ مەگەر بۆ لای تۆ، بڕوام بەو کتێبەت هێناوە کەناردوتەتەخوار، وە بەو پێغەمبەرەت کە ڕەوانەت کردوە، (ئنجا فەرمووی) ئەگەر بێت و لەو شەوەت دا بمری ئەوە لەسەر فیترەت ی مسوڵمانەتی مردووی، وە با ئەم دووعایە دوایین قسەت بێ لەسەر جێگا دەیڵێی: (بخاري ومسلم) گێڕاویانەتەوە.

١٠- لەحاڵەتی بێداربوونەوە بەدەم قسە بزڕکاندنەوە:

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەرکەسێك شەوێ کە بەدەم قسە بزڕکاندنەوە بێدار دەبێتەوە بڵێ: (لا اله الا الله وحدَهُ لاشريك لَهُ، لَهُ الملك ولَهُ الحمدُ وهو على كل شيئ قدير، الحمد لله، وسبحان الله، ولا الـه إلا الله، والله أكبر، ولا حول ولاقوة الا بالله) پاشان بڵێ: ئەی خوایە لێم ببورە، یان (بەهەر شێوەیەکی دیکە) بپاڕێتەوە، ئەوە وەڵامی دەدرێتەوە، وە ئەگەر دەستنوێژ بگرێ و نوێژ بکات، نوێژەکەی وەردەگیرێ. (بخاري و أصحاب السنن) گێڕاویانەتەوە لە (عبادة بن الصامت) ەوە خوالێیڕازی بێ.

١١- لەکاتێك دا کە لە خەوێ ڕاچڵەکی بێ و ترسابێ، یان خەونی ناخۆشی دی بێ:

* (عبدالله بن عمرو) خوا لێیان ڕازی بێ گێڕاویەتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەکاتی ترسان و لەخەو ڕاچڵەکین دا ئەم وشانەی فێردەکردن: (أعوذُ بكلمات الله التامَّةِ مِنْ غَضَبِهِ وعِقابِه، وشرِّ عِبادِه، ومِنْ هَمزات الشياطين وأن يَحْضُرون) رواه ابوداود والترمذي وابن السني ومالك في الموطا.

واتە: پەنا دەگرم بەناوە تەواوەکانی خوا لەتووڕەیییەکەی و لەسزایەکەی، وە لەخراپەو زیانی بەندەکانی، وە لەخۆتخوتەو دنەدانەکانی شەیطانەکان و لەوەی کە بێنەلام.

*(عن أبي قتادة رضي الله عنه قال: سَمِعْتُ رسول الله ﷺ يقول: الرؤيا من الله والحُلْمُ من الشيطان، فاذا رأى أحَدُكُمُ الشئ يَكْرَهُهُ فَلْيَنْفُثْ عن يَسارِهِ ثلاث مراتٍ إذا اَسْتَيْقظ وليتعوذ بالله من شرّها، فانها لَنْ تَضُرَّهُ إن شاءالله) متفق عليه.

واتە: خەونی ڕاست لە خواوەیەو زیندە خەون و خەونی ناخۆش لەشەیطانەوەیە، جا هەرکات یەکێکتان شتێکی دی کەپێی ناخۆش بوو هەرکات بێداربۆوە با سێجاران فووی بە تف لەلای چەپی بکات وە پەنا بەخوا بگرێ لەخراپەو زیانی، ئەوە ئەگەرخوا بیەوێ زیانی لێنادات.

**چوارەم: زیکری دوای نوێژە فەرزەکان:**

لەسۆنگەی ئەوەوە کە لەکاتی توێژینەوەی درووشمی یەکەمی خواپەرستی (نوێژ) داو لەباسی (چۆن نوێژ بەرپا دەکەی؟!)دا بەوردی باسی زیکرەکانی پاش نوێژە فەرزەکانمان کردوە، خوێنەر حەواڵەی ئەوێ دەکەین و لێرە دووبارەی ناکەینەوە.

**پێنجەم: زیکری خوا لەسەفەرێدا:**

**١-لەکاتی بەرێکەوتن دا:**

* پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَنْ أَرادَ سَفَراً فَلْيَقُلْ لِمَنْ يُخَلِّفُ: أَسْتَودِعكُمُ اللهَ الَّذي لاتَضيعُ وَدائِعُهُ) رواه احمد وابن السني وحَسَّنه الحافظ ابن حجر.

واتە: هەرکەسێك ویستی بەسەفەر بچێ با بەو کەسانە بڵێ کە بەجێیان دەهێڵێ: بەو خوایەتان دەسپێرم کە پێسپێرراوەکانی نافەوتێن.

بەڵام ئەگەر کەسێکی بۆ سەفەرێ بەرێکرد ئەوە پێغەمبەر ﷺ لەو حاڵەتەدا فەرموویەتی: (أَسْتَودِعُ اللهَ دينكَ وأَمانتكَ وخواتِيمَ عَمَلِكَ) رواه الترمذي وقال: حسنٌ صحيح ورواه احمد وابن ماجة وصححه الحاكم و وافقه الذهبي وصححه الألباني.[30]

واتە: ئایینت و سپاردەت و سەرەنجامی کردەوەکانت بەخوا دەسپێرم.

**٢- لەکاتی سواربوونی وڵاخ یان هەر وەسیلەیەکی دیکەی سەفەردا:**

(عبدالله بن عمر) خوا لێیان ڕازیبێ گێڕاویەتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك سواری حوشترەکەی دەبوو بۆ سەفەرێ، سێجار (الله اكبر) ی دەکرد پاشان دیفەرموو: (سُبْحانَ الَّذِي سَخَّرَ لَنا هَذا وَما كُنَّا لَهُ مُقرِنِينَ، وَإِنَّا إِلَى رَبِّنَا لَمُنقَلِبُونَ) الزخرف:١٣-١٤، واتە: پاك و بێگەردی بۆ ئەو زاتەی کە ئەمەی بۆ ڕام کردووین وە خۆمان توانامان بەسەردا نەدەشکا. وە ئێمەش بەرەو لای پەروەردگارمان دەگەڕێینەوە، (وە دەیفەرموو: )، (أَللهمَّ إنا نَسألك من سَفَرِنا هذا البرَّ والتَّقوى، ومن العَمَلِ ماتَرْضى، أَللهمَّ هَوِّنْ عَلَيْنا سَفَرنا هذا واْطْوِعَنَّا بُعْدَهُ، أَللهمَّ أَنتَ الصاحِبُ في السفرِ والخَليفَةُ في الأهْلِ، أَللَّهم إني أعوذُبك مِنْ وَعْثاءِ السَّفَرِ وكآبَةِ المَنْظَرِ، وسوءِ المُنقَلَبِ في المالِ والأهلِ) رواه مسلم والترمذي وابوداود واحمد.

واتە: ئەی خوایە ئێمە لەم سەفەرەمان دا چاکەکاری و پارێزکارییت لێدەخوازین، وە کردەوەیەك کە پەسەندی بکەی، ئەی خوایە ئەم سەفەرەمان بۆ ئاسان بکەو دووریەکەیمان بۆ بپێچەوە، ئەی خوایە تۆ هاوەڵی سەفەرمان و جێنشین و مشوورگێڕی

---

[30] بروانە: پەراوێزی: (الوابِل الصَّيِّبُ) ص٢٧٢.

نێو ماڵو خێزانمانی، ئەی خوایە من پەنات دێنمەبەرێ لەدەردو ناڕەحەتی سەفەرێو مەینەتباری دیمەنو، خراپ گەڕانەوە بۆ نێو ماڵو خێزان.

بەڵام ئەگەر وەسیلەی سواری کەشتیو بەلەم یان فرۆکە بوو وا پەسەندە ئەم زیکرە بڵێ: (بسم الله مَجْرِيها ومُرْساها أن ربي لغفور رحيم - وما قدروا الله حَقَّ قَدْرِهِ) رواه ابن السني.

واتە: ڕاوەستانو ڕۆیشتنی بەناوی خوایە بێگومان پەروەردگام لێبوردەو بە بەزەیی‌یە، وە وەك بۆ خوا شایستەیە ڕێزیان نەگرتوە.

٣-چۆنیەتی سەفەرو چەند ئەدەبو ڕەوشتێکی:

أ-کاتی دەرچوون:

وا پەسەندە سەفەر بخرێتە ڕۆژی پێنج شەممە چونکە پێغەمبەر ﷺ وای کردوە، وەك لەم دەقەدا دەردەکەوێ: (عن كعب بن مالك رضي الله عنه.. لَقَلَّما كان رسولُ الله ﷺ يخرجُ إلاّ يومَ الخميسِ) متفق عليه.

ب- دەمی بەڕێکەوتن:

وا پەسەندە بەرەبەیانان بکەوێتەڕێ، بە بەڵگەی ئەم دەقە: (عن صَخْرِ بن وداعة الغامديّ رضي الله عنه أن رسول الله ﷺ قال: أللهمَّ باركْ لأمَّتي في بُكورها، وكان إذا بعث سَرِيةً أو جَيشاً بَعَثَهُمْ من أولِ النهار) رواه ابوداوود والترمذي وحَسَّنه.

واتە: ئەی خوایە بەرەکەتو پیز بۆ ئوممەتم بخە بەیانی‌یەکانی‌یەوە، وە (پێغەمبەر ﷺ) عادەتی وابوو کە دەستەیەك یان سوپایەکی دەنارد بەیانیان بەڕێی دەکرد.

ج-دیاریکردنی برا گەورە:

وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (أذا خَرَجَ ثَلاثةٌ في سَفَرٍ فَلْيُؤَمِّروا أَحَدَهُمْ) رواه ابوداود باسناد حسن عن أبي سعيد وابي هريرة رضي الله عنهما.

د- بەتەنیا سەفەر نەکردن:

چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (الراكِبُ شَيْطانٌ والراكبانِ شَيْطانانِ والثلاثة رَكْبٌ) رواه اصحاب السنن الا ابن ماجة.

واتە: ڕێبوارێك شەیطانەو دوو ڕێبوار دوو شەیطانەو سێ ڕێبوار کۆمەڵێکن پێکەوە.

<u>تێبینی:</u> مەبەست لەشەیطان بوونی ڕێبوارێك و دووان ئەوەیە کە کردەوەکەیان لەهی شەیطان دەچێو شەیطان دنەی ئینسان دەدات بۆ کارو ڕەفتاری وا.

ه- هاوکاری کردنی یەکترو یەکدی بەجێنەهێشتن:

(عن جابر رضي الله عنه كان رسول الله ﷺ يَتَخَلَّفُ في المَسيرِ فَيُزْجي الضَّعيف ويُرْدِفُ ويَدْعو لَهُ) رواه ابوداود بأسناد حسن.

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ عادەتی وابوو لەڕۆیشتن دا خۆی دوا دەخستو هانی ئەو کەسەی دەدا کە بێهێزو سست بووایەو لەپشت خۆی سواری دەکردو دووعای بۆ دەکرد.

و- (الله اكبر) کردن لەکاتی سەرکەوتنی بەرزاییەکان داو (سُبْحان الله) کردن لەکاتی شۆڕبوونەوەدا:

لەوبارەشەوە دەق زۆرن بۆ نموونە: (عن جابر رضي الله عنه قال: كُنَّا إذا صَعِدْنا كَبَّرْنـا وإذا نَزَلْنا سَبَّحْنا) رواه البخاري.

ز- لەکاتی ترسان دا لەدوژمن و ناحەزێك:

(ابو موسى الأشعري) خوا لێیڕازیبێ گێڕاویەتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەکاتێك دا کەترس و بیمی لەکۆمەڵێك بووایە دەیفەرموو: (أللهمَّ إنا نَجْعَلُكَ في نُحورِهِـمْ ونَعُوذُ بِـك مـن شُرورِهِمْ) رواه ابوداود والنسائي بأسناد صحيح.

واتە: ئەی خوایە ئێمە تۆیان بەگژدا دەکەین وە لەخراپەو زیانیان پەنات پێ دەبەین.

ح-لەکاتی دابەزین لەمەنزڵگایەك دا:

(خولة بنت حكيم) خوا لێیڕازیبێ گوتوویەتی گوێم لەپێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەرکەسێك لەشوێن و مەنزڵگایەك دابەزێ و بڵێ: (أعوذُ بكلماتِ الله التامات مِـنْ شرّ ماخَلَقَ) هیچ شتێك زیانی پێناگەیەنێ هەتا ئەو شوێن و مەنزڵە بەجێدەهێڵێ، (مسلم) گێڕاویەتەوە.

ط - لەکاتی چوونە نێو ئاوەدانییەك دا:

(صُهَيْب) خوا لێیڕازی بێ گێڕاویەتەوە کە هەرکاتێك پێغەمبەر ﷺ ئاوەدانییەکی دیبایە لەکاتی چوونە نێویدا دەیفەرموو: (أللهمَّ رب السّماوات السّبع وما أظْلَلْنَ و ربَّ الأرضيـنَ السّبعِ وما أقْلَلْنَ، و ربَّ الشياطين وما أضْلَلْنَ، و ربَّ الرِّياحِ وما ذَرَيْنَ، أسالك خيرَ هذه البلدة وخَيْرَ أهلِـها وخَيْرَ مافيها، و أعوذبك مِنْ شرها وشَرِّ أهْلِها وشَرِّ مافيها) رواه النسائي وابن السني وابن حبان والحاكم وصححه و وافقه الذهبي.

واتە: ئەی خوایە پەروەردگاری حەوت ئاسمانەکانو ئەوەی لەژێر سێبەریان دایە، وە پەروەردگاری حەوت زەوییەکانو ئەوەی هەڵیان گرتوە، وە خاوەنی شەیطانەکانو ئەوانەی گومڕایان دەکەن، وە خاوەنی بایەکانو ئەو شتانەی ڕایان دەدەن، چاکەی ئەم وڵاتەو چاکەی خەڵکەکەی و چاکەی ئەوەی کەتێیدا لێت داوا دەکەم، وەپەنات پێدێنم لەخراپەو زیانی و خراپەو زیانی خەڵکەکەی و خراپەو زیانی ئەوەی کە تێیدایە.

٤-چۆنیەتی گەڕانەوە لەسەفەرێ:

أ- وا پەسەندە بابای ڕێبوار پاش تەواوبوونی کاروباری پەلە بکات لەگەڕانەوەدا:

* (عن أبي هريرة رضي الله عنه أن رسول الله ﷺ قال: السَّفَرُ قِطْعَةٌ من العَذابِ يَمْنَعُ أَحَدَكُمْ طَعامَهُ وشرابَهُ ونَوْمَهُ، فاذا قضى أَحَدُكُمْ نَهْمَتَهُ مِنْ سَفَرِهِ فَلْيُعَجِّلْ الى أَهلِهِ) متفق عليه.

واتە: سەفەر پارچەیەکە لە ئازار، خواردنو خواردنەوەو خەو لەیەکێکتان دەگرێتەوە، جا هەرکات یەکێکتان پێویستیی خۆی لەسەفەرێ جێبەجێکرد با پەلە بکات لەگەڕانەوە بۆ لای ماڵو خێزانی.

ب- وە وا چاکە بەڕۆژ بچێتەوە ماڵێ:

* (عن جابر رضي الله عنه أن رسول الله ﷺ قال: إذا طالَ أَحَدَكُمُ الغَيْبَةَ فَلا يَطْرُقَنَّ أَهْلَهُ لَيْلاً) متفق عليه.

واتە: ئەگەر یەکێکتان ماوەیەکی زۆر لەماڵ دوورکەوتەوە با بەشەو نەگەڕێتەوە لای ماڵو خێزانی.

ج- لەکاتی گەڕانەوەدا چ بگوترێ باشە؟!

* (انس) خوا لێیڕازیبێ گوتوویەتی: لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ گەڕاینەوە جا کاتێك گەیشتینە پشت مەدینە فەرمووی: (آيبون تائِبُون عابِدون لِربِّنا حامِدون)

واتە: گەڕاینەوە، تۆبەکارین، پەرستارین بۆ پەروەردگارمان ستایش کارین، (ئەنەس گوتوویەتی: ) وەلەسەر گوتنی ئەوە بەردەوام بوو هەتا گەیشتینەوە مەدینە. (مسلم) گێڕاویەتەوە.

د-هەروەها سوننەتە هەرکەسێك لەسەفەرێدا گەڕایەوە سەرەتا بچێتە مزگەوتو دوو ڕکات نوێژ بکات:

* (عن كعب بن مالكٍ رضي الله عنه أن رسول الله ﷺ كان إذا قَدِمَ مِـن سَفَرٍ بَدأَ بالمَسْجِدِ فركَع فيه ركْعَتَيْنِ) متفق عليه.

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ کە لەسەفەرێك دەگەڕایەوە بەمزگەوت دەستی پێدەکرد دوو ڕکاتی تێدا دەکردن.

## شەشەم: زیکری خوا لەجەنگو جیهاددا:

کۆمەڵە پاڕانەوەیەکی جۆراوجۆر لەپێغەمبەری خواوە ﷺ هاتوون کە لەکاتی جەنگو جیهاددا فەرمووتی بۆ وێنە:

* (أَللهُمَّ مُنزِلَ الكتاب ومُجْرِيَ السَّحابِ وهازِمَ الأحزاب إهْزِمْـهُمْ وانصُرنـا عَلَيـهِمْ) متفق عليه عن عبدالله بن ابي اوفى رضي الله عنه.

واتە: ئەی خوایە نێرەرە خوارەوەی کتێبو ڕۆێنەری هەورو تێکشکێنەری پێڕو تاقمەکان، تێکیان بشکێنەو سەرمان بخە بەسەریان دا.

* (عن أَنَسٍ رضي الله عنه قال: كان رسول الله ﷺ إذا غَزا قال: أللهُمَّ أَنتَ عَضُدي ونَصيْري، بك أَحُولُ وبك أَصُولُ وبك أُقاتِلُ) رواه ابوداود والترمذي وقال: حديث حسن.

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ کە دەچووە جەنگ دەیفەرموو: ئەی خوایە تۆ یاریدەدەرو سەرخەرمی، بەتۆ دەجولێمو بەتۆ هێرش دەبەمو بەتۆ دەجەنگم.

* (عن أبي موسى رضي الله عنه أن النبي ﷺ كان إذا خافَ قَوْماً قال: أللهُمَّ إنـا نجعلُـك في نحورهم ونعوذ بك من شرورهم) رواه ابوداود باسناد صحيح. کەپێشتریش هێنامان.

* هەروەها وا پەسەندە کە لەکاتی بیستنی هەڕەشەو گوڕەشەی دوژمنان دا بگوترێ: (حَسْبُنا اللهُ ونعم الوكيل) واتە: خوامان بەسەو ئەویش چاکترین پشت پێبەستراو و کار پێسپێرراوە، چونکە خوای پەروەردگار هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەری ﷺ مەدح کردوە کە لەکاتی بیستنی هەڕەشەی دوژمنیان دا ئەوەیان گوتوە: (الَّذِينَ قَالَ لَهُمْ النَّاسُ إِنَّ النَّاسَ قَدْ جَمَعُوا لَكُمْ فَاخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَانًا وَقَالُوا حَسْبُنَا اللَّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ، فَانْقَلَبُوا بِنِعْمَةٍ مِنْ اللَّهِ وَفَضْلٍ لَـمْ يَمْسَسْهُمْ سُوءٌ وَاتَّبَعُوا رِضْوَانَ اللَّهِ وَاللَّهُ ذُو فَضْلٍ عَظِيمٍ) آل عمران: ١٧٣-١٧٤،

واتە: ئەو کەسانەی کە خەڵکێك پێیان گوتن: کە سانێك بۆتان خڕبوونەوە جا لێیان بترسن! کەچی ئەوە بڕوای زیادکردنو گوتیان: خوامان بەسەو باشترین کارپێسپێرراویشە. سەرەنجام بەچاکەو بەخششی خواوە گەڕانەوەو هیچ ناگوزووری‌یەکیان تووش نەبوو، وەکەوتنە دوای ڕەزامەندی خوا، وە خواش خاوەن بەخششی مەزنە.

* وە پاڕانەوە لەگەرمەی تێك ڕژانی سوپای ئیسلام و سوپای دوژمن دا چاك گیرا دەبێت وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (ثِنْتانِ لاتُرَدّان أو قَلَّما تُرَدّانِ الدعـاءُ عنـد النـداءِ وعنـد

الباسِ حين يَلْحمُ بَعْضُهمْ بَعضاً) رواه ابوداود باسناد صحيح، واتـه: دوو جـۆره پاڕانـەوه ڕەد ناكرێنەوه يان كەم وايه ڕەد بكرێنەوه: پاڕانـەوه لـەكاتى بـانگ دا وه لـەكاتى جـەنگ دا كاتێك كه هەندێكيان لەگەڵ هەندێكيان دا دەستەويەخە دەبن.

*** كۆتايى ئەم باسەش بەم فەرموودە سەرسووڕهێنەرە دێنين:**

(براء) خوا لێىڕازىبێ گوتوويەتى: لـەڕۆژى جـەنگى ئـەحزاب دا پێغەمبـەرى خـوام ﷺ بينى كه لەگەڵ ئێمه گڵو خۆڵـى لادەبرد، جا لـەكاتێك دا كه زگى بەخۆڵێ داپۆشرابوو دەيفەرموو: (أَللهُمَّ لَوْلا أنت مااْهْتَدَيْنا، ولاتَصَدَّقْنا ولاصَلَّينا، فاَنْزِلَنْ سَكِينةً عَلَيْنا، وثَبِّتِ الأقْدام إن لاقَيْنا، إن الأولىٰ قَدْ بَغَوا عَلَيْنا، إذا أرادوا فِتْنةً أبَيْنا) متفق عليه.

واتـه: ئـەى خوايه ئەگەر تـۆ نـەباى ڕێى ڕاستمان نـەدەگرت، وه خێرمـان نـەدەكردو نوێژمان نەدەكرد، جا ئارامىمان بڕژێنه سەر، وه ئەگەر بەرەنگارى دوژمنانمان بووين پێيەكانمان بچەسپێنه، بێگومان ئەوانه ستەميان لێمان كردوه، جا ئەگەر بيانەوێ لەڕێى خوا لامان بدەن مل نادەين.

خوايەگيان گـەر تـۆ نـەباى، لـە ڕاستەڕێ بـەدوور دەبووين
نەچاكەمان دەكرد نه نوێژ، لەسەر گومڕايى سوور دەبووين
جا فـەى خوداى بـه بـەزەيى، ئارامى مان بڕژێنه سـەر
كه ڕوو بـەرووى دوژمن بووين ڕاگيرمان كـه لـەنێو سـەنگەر
چونكـه فـەى خوايـه ئەوانـه لەئێمـه دەكـەن زوڵـم وسـتەم
ئەگـەر بيانـەوێ لامـان دەن، مليان بۆ نادەين بەعاستەم[٣١]

---

[٣١] ئەم چەند دێره شيعره تەرجەمەى فەرموودەكەن كاك مەلا محمدى شاعير ناسراو به (هێواش) داينـاون، كه ئەوكاته پێشمەرگەى هێزى حەمزه بوو لەبنارى قەنديل، گوندى: قەڵاتووكان.

## حەوتەم: زیکری خوا لەکاتی خواردنو خواردنەوەدا:

خوای پەروەردگار فەرموویەتی: (يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُلُوا مِنْ طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ وَاشْكُرُوا لِلَّهِ إِنْ كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ) البقرة: ١٧٢.

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە لەو ڕۆزی‌یە پاكو چاكانە كەپێمان داون، بخۆن، وە ئەگەر دەتانەوێ تەنیا خوا بپەرستن سوپاسگوزاری بۆ بكەن.

*ئەمەش چەند دەقێكی سوننەت دەربارەی زیكرەكانی كاتی خواردن و خواردنەوە:*

* (عن عمر بن ابي سَلَمة رضي الله عنهما قال: قال لي رسـول الله ﷺ: يـابُنَيَّ! سَـمِّ الله وكُـلْ بِيَمِيْنِكَ، وكُلْ مِمَّا يَلِيْكَ) متفق عليه، واتە: ئەی كوڕیژگەم ناوی خوا بهێنەو بەڕاستەت بخۆ، وە لەپێش خۆتەوە بخۆ.

* (عائشة) خوالێیڕازیبێ گوتوویەتی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر یـەكێكتان خواردنی خوارد با نـاوی خـوای بـەرز لەسـەرەتایەوە بێنـێ، جـا ئەگـەر لـەبیری‌چوو كـە لەسەرەتایەوە ناوی خوای بەرز بهێنێ با بڵێ: (بِسْمِ اللهِ أَوَلَهُ وآخِـرَهُ) رواه الترمذي وابوداود وابن حبان وقال الترمذي: حسن صحيح، واتە: بەناوی خوا لەسەرەتاو كۆتایی‌یەوە.

شایانی باسیشـە كـە وەك لـە فـەرموودەكان دا دەبیـنرێ زیـاتر گوتنـی (بِسْـمِ اللهِ) سوننەتەو (الرحمن الرحيم) ی لەم شوێنەدا لەگەڵ نیە.

* هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إن الله لَيَرْضىٰ عن العَبْـدِ أَنْ يـأكُلَ الأكْلَـةَ فَيَحْمَـدُهُ عَلَيْها، ويَشْرَبُ الشَّرْبَةَ فَيَحْمَدُهُ عَلَيْها) رواه مسلم واحمد والترمذي عن انس.

واتـە: خـوا بەوەنده لە بەندەكەی ڕازی دەبێ كە خواردنێك بخواتو ستایشـی بكـات لەسەری، وە خواردنەوەیەك بخواتەوەو ستایشی بكات لەسەری.

* هەروەها فەرموویەتی: (مَنْ أكَلَ أو شرِبَ فقال: الحمدُلله الذي أطعمني هذا الطَّعامَ ورزَقنيه من غَيْرِ حَوْلٍ مني ولاقُوةٍ، غُفِرَ لَهُ ماتقدمَ من ذَنْبِه) رواه احمد والترمذي وابوداود وابن ماجة وابن السني والحاكم، وحَسّنُه الحافظ ابن حجر والألباني.

واتە: هەركەسێك بخوات یان بخواتەوەو بڵێ: ستایش بۆ ئەو خوایەی كە ئەم خۆراكەی دەرخوارد دامو پـێی بەخشـیم بـەبێ جووڵـەو هـێزێك لەمنـەوە، ئـەوە هـەرچی گونـاحی پێشوویەتی دەپۆشرێن.

* وە (أبـو سـعيد الخـدري) خـوا لێیڕازیبـێ گێڕاویەتـەوە كەپێغەمبـەر ﷺ لـەخواردنێ دەبۆوە، دەیفەرموو: (الحَمْدُلله الذي أطْعَمنا وسقَانا وجَعَلَنا مُسْـلمين) رواه احمد و ابوداود والترمذي وابن ماجة وحسنهُ الحافظ في (تخريج الأذكار).

*هەروەها (أبو أمامة) خوا لێی ڕازی بێ گێڕاویەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ کاتێك خوانو سفرەکەی هەڵدەگیرا دەیفەرموو: (الحمدلله كثيراً طيباً مباركاً فيه، غَيْرَ مَكْفيٍ ولا مُوَدَّعٍ ولامُسْتَغْنىً عَنهُ، رَبَّنا) رواه البخاري وأحمد وأصحاب السنن إلا النسائي.

واتە: ستایشێك بۆ خوا زۆر، پاكوچاك، پیتو پیرۆزدار، خوایەکی بێنیازو واز لەستایش بۆکرانی نەهێنراوو هیچ کات لێبێنیاز نەبوو بۆ بەندەکانی، بەس ئەو پەروەردگارمانە.[٣٢]

*وە سوننەتە ئەگەر یەکێك دەعوەتی بۆکرد، دوای خواردن دووعایان بۆ بکاتو بڵێ: (أَللهُمَّ بارِكْ لَهُمْ فيما رَزَقْتَهُمْ، وآغْفِرْ لَهُمْ وآرحَمْهُم) واتە: ئەی خوایە پیتو پیز بخەرە ئەوەوە کە پێت داون، وە لێیان ببوورەو بەزەییت پێیان دا بێت،چونکە پێغەمبەر ﷺ بەو جۆرە بۆ ماڵی (عبدالله بن بُسْر) خوالێیان ڕازیبێ پاڕایەوە، وەك لە (الجامع الصحيح) ی (مسلم) دا هاتوە.

تێبینی: پێغەمبەری خوا ﷺ هەرگیز عەیبو ڕەخنەی لەخواردن نەگرتووەو ئەگەر حەزی لێکردبێ خواردوویەتی ئەگەرنا بەبێ دەنگی وازی لێهێناوە، (ابو هريرة) خوالێی ڕازی بێ لەوبارەوە گوتوویەتی: (ما عابَ رسولُ الله ﷺ طعاماً قط، إن إشتهاهُ أَكَلَهُ وإلاّ تَرَكَهُ) متفق عليه.

## هەشتەم: زیکری خوا لەچەند حاڵەتێکی جیا جیادا

لەوەسفی پێغەمبەری خوادا ﷺ گوتراوە: (كان رسول الله ﷺ يَذكُرُ اللهَ على كُلِّ أَحْيانِه) رواه مسلم عن عائشة رضي الله عنها، واتە: پێغەمبەری خوا عادەتی وابوو لەهەموو حاڵەتێك دا یادی خوای دەکرد، جا ئێمەش خوا یاربێ لەم خاڵەدا هەوڵ دەدەین لەچەند برگە (فقرة) یەکی کورت دا زۆربەی هەرەزۆری ئەو زیکرانە بخەینەڕوو کەپێغەمبەری پێشەواو سەروەرمان ﷺ لەحاڵەتە جیاجیاو جۆراوجۆرەکانی ژیانو گوزەرانیدا فەرموو ونی:

---

[٣٢] بروانە: (فتح الباري) ج١٠ص٧٢٦تا٧٢٨، کە ئەو فەرموودەیەی شیکردۆتەوەو لەڕاستیدا ئەو فەرموودەیە زۆر مانایان هەڵدەگرێو زانایان زۆر قسەیان لەسەر کردوون هەرچەندە (الحافظ ابن حجر) زۆر بەکورتی هێناویەتی، ئەو مانایەش کەمن هێناومە بە چاکترینیانم داناوە، هەرچەندە تێگەیشتنی وردبوونەوەیەکی دەوێو تەعبیرەکەیشیم زۆر بەدڵ نییە بەڵام لەوە چاکترم بۆ نەهات.

یەك: بەیانیان و ئێواران:

هەرچەندە پێشتریش ئاماژەیەکمان پێکردوە بەڵام تەنها باسی زیکری بەیانیانمان کردوە ئەویش بەکورتی، جا لەبەرئەوەی هەم خوای پەروەردگار لەقورئانیدا هەم پێغەمبەر ﷺ لەسوننەت دا زۆر داکۆکی‌یان لەسەر زیکری خوا کردوە لەو دوو کاتە سەرنج ڕاکێشەدا بەپێویستم زانی ئێمەش هەقی خۆی بدەینێ:

أ-خوای پەروەردگار فەرموویەتی:(وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ غُرُوبِهَا) طه:١٣٠، واتە: بەر لە ڕۆژهەڵهاتن‌و پێش ئاوابوونی پەروەردگارت بەپاك بگرەو ستایشی بکە.

هەروەها فەرموویەتی: (وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ بِالْعَشِيِّ وَالْإِبْكَارِ) غافر: ٥٥، واتە: وە ئێواران‌و بەیانیان پەروەردگارت بەپاك بگرەو ستایشی بکە.

ب-پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: (مَنْ قال حين يُصْبحُ وحين يُمْسي: سُبْحان الله وبحَمْدِه مائة مَرة، لَمْ يأتِ أحدٌ يومَ القيامة بأفضَلَ مِما جاءَ به إلا أحدٌ قال مثل ما قالَ اوزاد) رواه مسلم.

واتە: هەرکەسێك کاتێك بەیانی دەکاتەوەو کاتێك ئێوارە دەکاتەوە سەد (١٠٠) جار بڵێ: پاکی بۆ خواو ستایش بۆ وی، ئەوە لەڕۆژی دوایی‌دا هیچ کەس کردەوەیەکی لەهی ئەوی چاکتر ناهێنێ، مەگەر کەسێك وەك وی گوتبێ یان زیاتریش.

* وە (عبدالله بن مسعود) خوالێی‌ڕازی‌بێ گووتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ کە ئێوارەی لێ‌دادەهات دەیفەرموو: ((أمْسَيْنا وأمْسى الملك لله والحمدُلله، لا اله الا الله وحده لاشريكَ لَهُ لَهُ الملكُ ولَهُ الحَمدُ وهو على كل شيء قدير، ربِّ أسْألك خيرَ مافي هذه الليلةِ وخَيْرَ مابَعْدها، وأعوذبك من شرِّ هذه الليلة وشرِّ مابَعْدها، رب أعوذبك من الكَسَل وسوءِ الكِبر، رب أعوذبك مِنْ عذابٍ في النار، وعَذابٍ في القَبْر)) وە کاتێك بەیانی دەکردەوە دیسان ئەوەی دەفەرموو: (أصْبَحنا وأصْبَحَ الملكُ لله..) رواه مسلم وابوداود والترمذي.

واتە: ئێوارەمان کردەوەو وەهەرچی موڵکە هی خوایە، وە ستایش بۆ خوا، جگە لەخوا هیچ پەرستراوێك نین تاکەو هیچ هاوبەشی نین، موڵك‌و ستایش هەر بۆ ویە، وە ئەو لەسەر هەموو شتێك بەتوانایە، پەروەردگارم داوای خێرو چاکەی ئەمشەوەو خێرو چاکەی دواییشی لە تۆ دەخوازم، وەپەنات پێ‌دێنم لەخراپەو زیانی ئەمشەوەو خراپەو زیانی دوایی، پەروەردگارم پەنات پێ‌دەگرم لە تەنبەڵی‌و خراپ پیر بوون، پەروەردگارم پەنات پێ‌دێنم لە ئازارێك کە لەنێو ئاگری دۆزەخ دایە، وە لە ئەشکەنجەیەك کە لەنێو گۆڕدایە.

دیارە لەبەیانی‌یەکانیش دا بەهەمان شێوە ئەم زیکرە دەگوترێ، بەڵام وشەی (أمسَينا) بە (اصْبَحْنا) دەگۆڕێ، وەك لەدەقی فەرموودەکەش دا هاتوە.

*هەروەها (أبوهريرة) خوالێیڕازیبێ گێڕاویەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ هاوەڵەکانی فێردەکرد دەیفەرموو: (إذا أصبحَ أحدكم فَليَقُلْ: أللهم بكَ أَصْبَحْنا وبكَ أَمْسَيْنا وبك نَحْيا وبك نَموتُ و اليكَ النشورُ، و إذا أمْسى فَلْيَقُلْ، أللهمَّ بك أمْسَيْنا وبك أَصْبَحْنا وبك نَحْيا وبك نموتُ واليكَ المَصيرُ) رواه الترمذي وأبوداود وابن ماجة والبخاري في الأدب المفرد وأحمد وصححه الترمذي والحافظ ابن حجر والألباني.

واتە:ئەگەر یەکێکتان بەیانی کردەوە بابڵێ: ئەی خوایە بەتۆ بەیانیمان کردەوەو بەتۆش ئێوارەمان لێداهات، وە بەتۆ دەژینو بەتۆ دەمرینو گەڕانەوەو زیندووکرانەوەش هەر بۆلای تۆیە، وەئەگەر ئێوارەی لێداهات بابڵێ: ئەی خوایە بەتۆ ئێوارەمان لێداهاتو بەتۆش بەیانیمان کردەوە، وە بەتۆ دەژینو بەتۆش دەمرینو سەرەنجامیش هەر بۆلای تۆیە.

* (عبدالله بن خُبيب)یش خوا لێیڕازیبێ گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووم: (أقرأْ قل هو الله أحدٌ، والمُعَوذَتَيْنِ حين تُمسي وحين تُصْبِحُ ثلاث مَراتٍ تكفيك من كُلِ شيٍ) رواه اصحاب السنن الا ابن ماجة وهو صحيح.

واتە: سوورەتەکانی: (قل هو الله أحد) و هەردووك (قل أعوذ برب الفلق و قل أعوذ برَبّ الناس)ەکان هەموو ئێوارەیەكو بەیانییەك سێجاران بخوێنە بۆ پارێزران لە زیانی هەموو شتێك بەستن.

دوو: لەکاتی خەمو خەفەتو گرفتاریدا:

* (عبدالله بن عباس) خوالێیان ڕازیبێ گێڕاویەتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەکاتی خەمو نارەحەتیدا دەیفەرموو: (لا اله إلا الله العظيم الحليم، لا اله إلا الله رَبُّ العرشِ العَظيم، لا اله إلا الله ربُّ السَّماوات وربُّ الأرض رَبُّ العَرْش الكريم) متفق عليه.

واتە: جگە لەخوای مەزن و هێدی هیچ پەرستراونین، جگە لەخوای خاوەن بارەگای مەزن هیچ پەستراونین، جگە لەخوا هیچ پەرستراونین، خاوەنی ئاسمانەکانو خاوەنی زەوی، خاوەنی بارەگای بەرێزو حورمەت.

* وە ئەنەس خوالێیڕازی بێ گێڕاویەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ کاتێك بەهۆی کارێکەوە زۆری بۆ دەهات دەیفەرموو: (ياحَيُّ ياقَيُّومُ بِرَحْمتك أَسْتَغيْثُ) رواه الترمذي والحاكم وهو حديث حسن،

واتە: ئەی زیندوو ئەی مشوورگێڕ هاوارم دەبەزەیی تۆ بەست!

* وە (سعد بن أبي وقاص) خوالێیڕازیبێ گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی پارانەوەی (ذي النون) کە لەحاڵێك دا لەزگی نەهەنگ دا بوو فەرمووی:

(لا اله ألاّ أنت سُبْحانَكَ إني كنتُ من الظّالمين) هچ كاتێك كابرایەكی مسوڵمان دەربارەی شتێك پــێ‌ی ناپاڕێتــەوە مەگــەر خــوا بەدەنگی‌یــەوە بێــت. (ترمــذي و احمــد حــاكم) گێڕاویانەتەوەو (الحافظ ابن حجر والباني)یش بە (صحیح)یان داناوە.

* هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر بەندەیەك خەمو پەژارەیەكی تووش بێ‌و ئەم زیكرو دووعایە بڵێ ئەوە مسۆگەر خوا خەمو پەژارەكەی لادەباتو لەشوێنی ئەوە دڵی خۆش و شاد دەكات: (أللهمَّ إني عَبْدُكَ إبْنُ عَبْدِكَ ابنُ أَمَتِكَ، ناصيتي بِيَدِك ماضٍ فِيَّ حُكْمـكَ، عَدْلُ فيَّ قَضاؤكَ، أسألكَ بكل آسمٍ هو لك، سَمَّيْتَ بِهِ نَفْسك، أو أنْزَلْتَهُ في كتابك أو عَلَّمْتَهُ أحداً من خَلْقك، أو آسْتأثرْتَ بهِ في علمِ الغَيْبِ عِندك، أن تجعَلَ القرآن ربيع قَلْبي ونورَ صَدْري وجلاءَ حُزْنــي وذهابَ غَمي) (رواه احمد وابن حبان وصححه الألباني في سلسلة الأحاديث الصحيحة) رقم: ١٩٩.

واتە: ئەی خوایە من بەندەتم ڕۆڵەی بەندەت، ڕۆڵەی بەندەی مێینەتم، پێشە سەرم بە دەست تۆوەیە، بڕیاری تۆ لەمن دا جێ‌بەجێ‌یە، هەرچی تۆ لەگەڵم بكەی ڕەوایە، بەهەر ناوێك كە هی تۆیە داوات لێ‌دەكەم، چی خۆتت پێ‌ناو نابێ، یان لە كتێبەكەت دا ناردبێتتەخوار، یان فێری یەكێك لەدروست كراوانی خۆتت كردبێ، یان هەر لەزانیاری پەنهانی خۆت دا هەڵت گرتبێ: كە قورئان بكەیە بەهاری دڵو دەروونمو ڕووناكی سینەمو لابەری پەژارەمو ڕەوێنەرەوەی خەمو خەفەتم.

سێ: لەكاتی بەڵاو ناڕەحەتی و تاقی‌كرانەوەدا:

* (اُمّ سلمة) خوالێی‌ڕازی‌بێ گوتوویەتی: گوێم لەپێغەمبەری خوا بوو ﷺ دەیفەرموو: هەر بەندەیەك بەڵایەكی تووش بێ‌و بڵێ: (إنّـا لله وإنّـا أليـه راجعون، أللهُمَّ أجُرْنـي في مُصيبـتي وأخْلِفْ لي خيراً مِنْها) واتە: ئێمە هی خواینو ئێمە بۆ لای وی دەچینەوە، ئەی خوایە لەو بەڵاو گرفتاری‌یەم دا پاداشتم بدەوە وە بەچاكتر بۆم پڕبكەوە، ئەوە حەتمەن خوای بەرز پاداشتی دەداتەوە لەو بەڵایەدا، وە بەچاكتر شوێنی دەگرێتەوە.

چوار: لەكاتی وە زەحمەت كەوتنی كارێك دا:

* پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَنْ لَزِمَ الأسْتغفار جَعَلَ اللهُ لَهُ منْ كلِّ هَمٍ فَرَجاً ومن كل ضِيْقٍ مَخرجاً ورزقـهُ مـن حَيْـث لايَحْتَسِـبُ) رواه احمد وابوداود وابن ماجة وصحح اسناده احمد شاكر وضَعفهُ الألباني، والحديث عن ابن عباس رضي الله عنهما.

واتە: هەركەسێك لەسەر داوای لێبوردن كردن لەخوا بەردەوام بێت، خوا بۆ هەر خەفەتێك فەرجانی‌یەكو لەهەر تەنگانەیەك دا دەروویەكی لێ‌دەكاتەوەو بەشێوەیەك كە چاوەڕوانی ناكات ڕۆزی بۆ دەنێرێ.

*هەروەها فەرموویەتی: (أللهُمَّ لاسَهْلَ إلاّ ما جَعَلْتَهُ أنت سَهْلاً، وأنـت تَجْعَـلُ الحَـزنَ اذا شئت سَهْلاً) رواه ابن السني عن أنس رضي الله عنه.

واتە: ئەی خوایە هەر شتێك تۆ ئاسانی نەكەی ئاسان نیە، وە تۆ ئەگەر بتەوێ شتی زەحمەتیش سێنا دەكەی.

پێنج: لەكاتی قەرزداریو قەرز پێ نەدرانەوەدا:

عەلی خوالێیڕازیبێ گێڕاویەتەوە كە پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەو حاڵەتە ئەم زیكرەی فێركردوە: (أللهُمَّ أكْفِني بِحَلالِك عَنْ حَرامِك وأغْنِني بِفَضْلِـكَ عَمَّـنْ سِواكَ) رواه احمد والترمذي وحَسَّنَهُ وحسنه الحافظ ابن حجر والألباني ايضاً.

واتە: ئەی خوایە بەهۆی ڕۆزی حەڵاڵتـەوە بێنیـازم بكە لـەهی حـەڕامت، وە بـەهۆی بەخششی خۆتەوە لەغەیری خۆت بێمنەتم بكە.

تێبینی: دیارە ئەم زیكرو دووعایانە بەدیلی كاروكاسبی و ڕەنجدانو كۆشش كردن نین.

شەش: لەكاتی خوتخوتەو دنەدانی شەیطان دا:

خوای پەروەردگار فەرموویەتی: (وَإمَّا يَنْزَغَنَّكَ مِنَ الشَّيْطَانِ نَزْغٌ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ) فصلت: ٣٦، واتە: وە ئەگەر لەلایەن شەیطانەوە خوتخوتەیەكت تووش بوو ئەوە پەنا بەخوا بگرە چونكە بێگومان ئەو بیسەرو زانایە.

* پێغەمبەری خواش ﷺ فەرموویەتی: (شەیطان دێتە لای یەكێكتانو پێی دەڵێ: كێ ئەمەی دروست كردوە؟ كێ ئەمەی دروست كردوە؟ هەتا دەڵێ: كێ پەروەردگاری دروست كردوە؟ جا ئەگەر گەیشتەوێ با پەنا بەرێتە بەر خوا (واتە بڵێ: أعوذ بالله من الشيطان الرجيم) وە با چی دی وەدوای نەكەوێ) (بخاري ومسلم) گێڕاویانەتەوە.

* هەروەها لەكاتێك دا (عثمان بن العاص) خوالێیڕازیبێ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ شەیطان نوێژو قورئان خوێندنەكەمی شێواندو لێیتێكـەڵ كـردم، پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویەتی: (ذلك شَيْطانٌ يُقالُ لَهُ خَنْزَبٌ فاذا أحْسَسْتَهُ فَتَعَوَّذْ بالله منه وآتْفُلْ عن يَسارِكَ ثَلاثاً) رواه مسلم، واتە: ئەوە شەیطانێكە پێی دەگوترێ خینزەب، جا ئەگەر هەستت پێیكرد پەنای لێبەخوا بگرەو سێجار تف لەلای چەپت بكە. (دیارە مەبەست وردە تفە وێڕای فووكردن).

حەوت: لەکاتی مەترسی هەبوون لەشەیطان و جرو جانەوەرو چاوی پیس دا:

*(عبدالله بن عباس) خوا لێیان ڕازیبێ گوتوویەتی پێغەمبەر ﷺ دووعای پاراستنی بەسەر حەسەن و حوسەین دا خوالێیان ڕازیبێ دەخوێندو دەیفەرموو: (أُعيذُكُما بِكلماتِ الله التامَّة مِن كُلِّ شَيْطانٍ وهامَّةٍ ومن كل عين لامَّةٍ) رواه البخاري.

واتە: پەناتان پێدەبەمە بەر ناوە تەواوەکانی خوا، لەهەموو شەیطان و جانەوەرێك وە لەهەموو چاوێکی پیس.

هەشت: بۆ کاتی سەردان و هەواڵپرسینی نەخۆش:

* پێغەمبەر ﷺ کاتێك سەردانی نەخۆشێکی دەکرد دەیفەرموو:

(لابَأْسَ طَهورٌ إنْ شاءالله) رواه البخاري، واتە: هیچ نیە، ئەگەر خوا حەز بکات پاککەرەوەیە.

* وە جارێك پێغەمبەر ﷺ دووعای بۆ یەکێك لەهاوسەرەکانی خوێند، دەستی ڕاستی پێداهێناو فەرمووی: (أَللهُمَّ رَبَّ الناسِ أَذْهِبِ البَأسَ، وَاشْفِ أَنْـتَ الشـافي. لاشِـفاءَ إلا شِـفاؤُك، شِفاءً لايُغادِرُ سَقَماً) رواه البخاري ومسلم عن عائشة رضي الله عنهما، واتە: ئەی خوایە پەروەردگاری خەڵکی ئازار لابەرە، وەچاك بکەوە هەرتۆ چاککەرەوەی، جگە لەشیفای تۆ شـیفا نیـە، چاککردنەوەو شیفایەك کەهیچ دەردو نەخۆشی نەهێڵێ.

* عائشە خوا لێی‌ڕازیبێ گوتوویەتی: ئەگەر ئینسانێك ئازارێکی ببوایە یان دوومەڵ یان برینێکی لێبوایە پێغەمبەر ﷺ پەنجەی ئاوا لێدەکرد،

سـوفیانی کوڕی [٣٣] عویەینـە قـامکی گـەیاندە خـاك و پاشـان بـەرزی کـردەوە، وە دەیفەرموو: (بِسم الله، تُربَةُ أَرْضِنا بِرِيقَةِ بَعْضِنا، يُشْفى بِهِ سَقِيْمُنا، بِأذنِ رَبِّنا) متفق عليه.

واتـە: بـەناوی خـوا، خۆڵـی خاکمـان بـەتفی یـەکێکمان بەفـەرمانی پـەروەردگارمان نەخۆشمانی پێ چاك دەبێتەوە.

* وە (ابن عباس) خوا لێیان ڕازیبێ لەپێغەمبەرەوە گێڕاویەتـەوە ﷺ کـە فەرموویـەتی: هەرکەسێك سەردانی نەخۆشێك بکات کە کاتی مردنی نەهاتبێ و حەوت جاران لەلای بڵێ: (أسألُ اللهَ العَظيـم، رَبَّ العَـرْشِ العَـظيـم، أنْ يشْـفيك) ئـەوە مسـۆگەر خـوای بـەرز چـاکی دەکاتەوە، (ابوداود وترمذي وأحمد) گێڕاویانەتەوەو (ترمذي) بە (حسن) ی داناوە.

تێبینی: بێگومان لێرەدا مەبەستی پێغەمبەر ﷺ نە هەموو جۆرە نەخۆشێك و نە هەر جۆرە دووعا خوێنێکیشە، واتە: هەرچەندە بەگشتی فەرموویەتی بەڵام مەبەستی پێ چەند کەس و حاڵەتێکی تایبەتی‌یە.

---

[٣٣] واتە: (سفيان بن عيينة) چۆنیەتی ئەو پەنجە لەزەوی دانەی پێغەمبەری ﷺ ڕوون کردەوە.

*هەروەها (أبوسعيد الخدري) خوا لێیان ڕازیبێ گێڕاویەتەوە کە پیاوێك لەهاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ خوا لێیان ڕازیبێ دووعای بۆ کابرایەکی پێوەدراو (لدیغ) خوێندو سوورەتی (الحمد لله رب العالمین)ی بەسەردا خوێندو، وا چاك بوو وەك لەپەتێك بەرهەڵدا بووبێ و دەردی لێنەما، وەك (بخاري و مسلم) گێڕاویانەتەوە.

* وە جارێکیان (عثمان بن ابي العاص) خوا لێی ڕازیبێ باسی ئازارێکی خۆی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ کرد کە لەوەتی مسوڵمان بووە لەجەستەیدا هەستی پێدەکات، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: دەستت بخەرە سەر ئەو شوێنەی کە لەجەستەتدا ئازاری هەیەو سێجاران بڵێ: (بِسْمِ اللهِ) وە حەوت جاران بڵێ: (أَعُوذُ بِاللهِ وَقُدْرَتِهِ مِنْ شَرِّ مَا أَجِدُ وَأُحَاذِرُ) رواه احمد ومسلم واصحاب السنن الا النسائي، واتە: پەنا بەخواو بەتوانای وی دەگرم لەخراپەو زیانی ئەو ئازارەی کە هەمەو مەترسییم لێی هەیە.

* وە سوننەتە بۆ کەسێك کە دڵنیا بووە لەوەی دەردی کارییەو بەرەو مەرگە ئەم زیکرە بخوێنێ: (لا اله الا الله والله اكبر، لا اله الا الله وحدَهُ، لا اله الا الله وحدَهُ لاشريك له، لا اله الا الله له الملك ولَهُ الحمد، لا اله الا الله ولا حول ولاقوة الا بالله) رواه الترمذي وابن ماجة وصححه الالباني.[٣٤]

*هەروەها سوننەتە بۆ کەسێك کە لەلای نەخۆشێکە کە لەسەرە مەرگ و گیانەڵا دایە وشەی (لا اله الا الله) ی پێبڵێ و بۆی دووبارە بکاتەوە، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لَقِّنُوا موتاكُمْ: لا اله إلا الله) رواه مسلم عن ابي سعيد الخدري رضي الله عنه، هەروەها فەرموویەتی: (مَنْ كان آخِرُ كلامِهِ: لا اله الا الله، دَخَلَ الجنة) رواه ابوداود والحاكم وقال النووي: صحيح الأسناد،[٣٥] واتە: هەرکەسێك دوایین قسەی بریتی بێ لەگوتنی: بێجگە لەخوا هیچ پەرستراو نیین، دەچێتە بەهەشتێ.

نۆ: لەکاتی دیتن و ڕووبەڕووبوونەوەی دیاردە سروشتییەکان دا:

ا- هەڵکردنی باوگێژەڵووکەی بەهێز:

* عائیشە خوا لێی ڕازی بێ گوتوویەتی: پێغەمبەر ﷺ کاتێك با هەڵیدەکرد، دەیفەرموو: (أللهُمَّ إني أسألُك خَيْرها وخير مافيها وخَيْرَ ماأُرسِلَتْ بِهِ، و أعُوذُ بك من شرِّها وشَرِّ ما فيها وشَرِّ ما أُرسِلَتْ بِهِ) متفق عليه.



[٣٤] بروانە: (حِصْن المسلم من اذكار الكتاب والسنة) ص٨٥، سعيد بن علي بن وهف القحطاني.

[٣٥] بروانە: (رياض الصالحين) ص٣٠٠، باب، تلقين المحتضر: لا اله الا الله.

واتە: ئەی خوایە من سوودو کەڵکی و سوودی ئەوەی کەتێیدایەو قازانجی ئەوەی کە پێی نێرراوە لێت دەخوازم، وە لەخراپەو زیانی و زیانی ئەوەی تێیدایەو زیانی ئەوەی کەپێی نێرراوە پەنات دێنمەبەر.

ب– برووسکەو هەورەتریشقە:

(عبدالله بن الزبیر) خوا لێیڕازیبێ کاتێك گوێی لەهەورە تریشقە دەبوو وازی لەقسان دەهێناو دەیگوت: (سُبْحان الذي يُسَبِحُ الرَّعْـدُ بِحَمْـدِهِ والملائكـة مـن خِيفَتِـه) رواه مالك في الموطأ والبخاري في الأدب المفرد وصححه النووي في الأذكار والحافظ ابن حجر في تخريج الأذكار.

واتە: پاكو بێگەردە ئەو زاتەی کە هەورەتریشقە بەپاکی دەگرێو ستایشی دەکاتو فریشتەکان لێی دەترسن و پاکی ڕادەگەیەنن و ستایشی دەکەن.

ج– باران بارین:

عائیشە خوالێیڕازیبێ گوتوویەتی: پێغەمبەر ﷺ کاتێك بارانی دەبینی، دەیفەرموو: (صَيباً نافِعاً) رواه البخاري، واتە: خوایە با ئەم بارانە بارانێکی بەکەڵك بێ.

د–مانگی نوێ:

(عبدالله بن عمر) خوا لێیان ڕازیبێ گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك مانگی یەك شەوە (هِلال)ی دەدی دەیفەرموو: (أَللهُ أَكْبَرُ، اللهمَّ أَهِلَّهُ عَلَيْنا بالأمْنِ والأيمانِ والسَّلامةِ والأَسْلامِ والتوفيقَ لما تُحِبُّ وتَرْضى ربُّنا وربُّك الله) رواه الترمذي و رواه الدارمي وابن حبان في صحيحه وحَسَّنَهُ الألباني.[36]

واتە: خوا گەورەترە،[37] ئەی خوایە بەئاسایشو ئیمانو سەلامەتیو ئیسلامەوە ئەم مانگەمان لێنوێبکەوە، وە هەر شتێك کە خۆشت دەوێو پەسەندتە بۆمان ئاسان بکە، پەروەردگارو خاوەنی ئێمەو تۆ (ئەی مانگ) خوایە.

هـ– بیستنی دەنگی چەند گیاندارێك:

(ابوهریرة) خوا لێیڕازیبێ گوتوویەتی: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إذا سَمِعتُم نُهاقَ الحَمير فَتعوَّذوا بالله من الشيطان فأنَّها رأَتْ شيطاناً، وإذا سمِعتم صياح الديكةِ فَسَلوا الله مـن فَضْلِـه فأنَّها رأَتْ مَلَكاً) متفق عليه.

واتە: ئەگەر زەڕەی کەرانتان بیست پەنا بەخوا بگرن لەشەیطان چونکە بێگومان شەیطانیان دیوە، وە ئەگەر قووقەی کەڵەبابتان بیست لەبەخششی خوا داوا بکەن چونکە مسۆگەر فریشتەیان بینیوە.

---

[36] بڕوانە: (سلسلة الأحاديث الصحيحة) رقم: ١٨١٦.

[37] لەڕیوایەتی (ترمذي)دا (الله اكبر)ی تێدا نیە.

هەروەها فەرموویەتی: (إذا سَمِعتُمْ نُباحَ الكلابِ ونَهيق الحمير بالليل فَتعوَّذوا باللهِ مِنْهُنَّ فإنَّهنَّ يَرَوْنَ مالاتَرَوْنَ) رواه أحمد وأبوداود والبخاري في الأدب المفرد وابن حبان وابن السني وهو صحيح.[38]

واتە: ئەگەر وەڕینی سەگان‌و زەڕینی کەرانتان بەشەویّ بیست ئەوە لەبەر وان پەنا بەخوا بگرن، چونکە ئەوان شتی وا دەبینن کە ئێوە نایبینن.

و- تەماشا کردنی ئاسمان لەشەویّدا کاتێك بۆ شەونوێژ هەڵدەستی:

سوننەتە ئینسان کەشەویّ بێداربۆوە بۆ شەونوێژ تەماشای ئاسمانیّ بکات‌و دە (١٠) ئایەتی کۆتایی سوورەتی (آل عمران) بخوێنیّ ئەوجار دەستنوێژ بگریّ، چونکە (بخاري ومسلم وأصحاب السنن) لە (ابن عباس) یان گێڕاوەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ وای کردوە.[39]

دە- سەلام کردن‌و بەرو مەجلیس:

* (عبدالله بن عمر) خوا لێیان ڕازی‌بیّ گێڕاویەتەوە کە پیاوێك لەپێغەمبەری خوای ﷺ پرسی: (أيُّ الأسلام خَيْرٌ) چ جۆرە ئیسلامەتی‌یەك چاکترە؟ فەرمووی: (تُطْعِمُ الطعـام وتَقْرأُ السَّلام على مَنْ عَرَفْتَ ومَنْ لَمْ تَعْرِفْ) متفق عليه.

واتە: خواردن دەرخواردی خەڵکی هەژارو برسی بدەی، وەسەلام بکەی لەخەڵکی (کە بەلایان دا ڕەد دەبی) چ بیانناسی چ نەیانناسی.

شایانی باسیشە کە سەلام کردن هەم بۆچوونە کۆڕو مەجلیس‌و هەم بۆ بەجیّهێشتنیشی سوننەتە، وەك لەم دەقەدا دەبینریّ:

* (عن أبي هريرة قال رسول الله ﷺ : إذا انْتَهى أحدكُمْ الى المَجْلِسِ فَلْيُسلِّمْ فـان بدالَهُ أنْ يَجْلِسَ فَلْيَجْلِسْ، ثم إذا قامَ فَلْيُسَلِّمْ فَلَيْسَتِ الأولى بـأحق مـن الآخـرةِ) رواه أبوداود والترمذي وحسنه وصححه الحاكم وابن حبان.

*(ابوهريرة) خوالێی‌ڕازی‌بیّ گێڕاویەتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەسێك لەکۆڕێك دا دابنیشیّ کە غەڵبە غەڵبی زۆر تێدا بووبیّ، جا بەر لەوەی ئەو کۆڕەی بەجیّبهێڵیّ بڵیّ: (سُبْحانَكَ اللّهمَّ وبحَمْـدِكَ أشْـهدُ أن لا الـه إلا أنْـتَ، أسْتَغْفِرُكَ وأتـوبُ إليـك) ئەوە هەرچی لەو کۆڕەی‌دا بوویەتی لیّی دەسڕێتەوە. (أحمـد وترمذي و ابـن حبـان و الحاكم) گێڕاویانەتەوە.

---

[38] بڕوانە: (الوابل الصيِّبْ) ص٢٩٧، پەراوێزی (محقق ومُخرج).

[39] بڕوانە: (تفسير ابن كثر) ج١ص٤٤٠.

یازده: پژمین و باوێشك:

*ابوهریره خوالێی ڕازی بێ گێڕاویەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إنَّ الله يُحِبُّ العُطاسَ ويَكْرَهُ التَثاؤبَ، فاذا عَطَسَ أحدكُمْ وحَمِدَالله ، كان حَقاً على كل مُسْلم سَمِعَهُ أن يقول: يَرْحَمُكَ الله، وأمّا التثاؤبُ فانَّما هو من الشيطان، فاذا تساءبَ أحَدُكُمْ فَلْيَرُدَّهُ ماآسْتطاع فـان أحدكُمْ إذا تثائبَ ضَحِك الشيطان منه) متفق عليه.

واتە: بێگومـان خـوا پژمینـی خـۆش دەوێ و ڕقـی لەباوێشـکە، جـا ئەگـەر یـەکێکتان پژمی و ستایشی خوای کرد، ئەوە لەسەر هەر مسوڵمانێك کە دەیبیستێ پێویستە کە بڵێ: خوا ڕەحمت پێ بکات، بەڵام باوێشك ئەوە بێگومان لەشەیطانەوەیە، جا ئەگەر یەکێکتان باوێشـکیدا بـا ئـەوەندەی دەتوانـێ بیگێڕێتـەوە چونکـە یـەکێکتان کـە باوێشـك دەدات شەیطان پێی پێدەکەنێ.

*هەروەها فەرموویەتی: ئەگەر یەکێکتان پژمی با بڵێ: (الحمدُلله) وە با برایەکـەی یان هاوەڵەکەی پێی بڵـێ: (يَرحمك الله) جا ئەگـەر پـێی گوت (يرحمك الله) با ئـەویش بڵـێ: (يَـهْديكم الله ويُصلِـحُ بـالكم) رواه البخـاري، واتـە: خـوا ڕێڕوونیتـان بکـاتو حـاڵو باڵتـان چاك بکات.

*بەڵام ئەگەر بابـای پژمیـو (الحمدلله) ی نـەکرد، ئەوە (يَرْحَمُك الله) گوتـن پێویسـت ناکات، وەك لەم فەرموودەیەدا دەبینرێ: (عن أبي موسى الأشعري رضي الله عنه: سَمِعْتُ رسولَ الله ﷺ يقول: إذا عَطَسَ أحدكُم فَحَمِدَالله فَشَمِّتوهُ فانَ لَمْ لم يَحْمِدالله فلا تشمّتوه) رواه احمد ومسلم.

<u>تێبینی:</u> وشەی (تَشْميتْ) واتە: گوتنی (يَرْحمك الله) بەبابای پژمیو.

دوازدە: چوونە سەر گۆڕستانو سەرەخۆشی کردن:

* سوننەتە کە لەکاتی جەنازە خستنەنێوگۆڕدا بگوترێ : (بسم الله وعلـى مِلَّـة (أو سنة) رسول الله) رواه ابوداود واحمد بسند صحيح.

واتە: بەناوی خواو لەسەر ئایینی (یان ڕێبازی) پێغەمبەری خوا ﷺ.

* وە سوننەتە پاش خستنەگۆڕی و داپۆشینی ماوەیەك لەسەر گۆڕەکەی بمێننـەوەو بۆی بپاڕێنەوە، وەك لەم فەرموودەیەدا دەردەکەوێ: (عن عثمان بن عفان رضي الله عنه قـال: كان النبيُّ ﷺ إذا فرغ مِنْ دَفْنِ المَيت وقَفَ عليه وقال: إسْتَغْفِروا لأخيكم وسَلُوا لَهُ التثبيتَ فانه الآن يُسْأَلُ) رواه ابوداود والحاكم وصححه ووافقه الذهبي، واتـە: پێغەمبـەر ﷺ کە لـە بەخـاك سـپاردنی مردوو دەبـۆوە لەسـەری دەوەسـتاو دەیفـەرموو: بـۆ برایەکـەتان (یـان بـۆ خوشـکەکەتان) داوای لێبوردن لەخوا بکەنو چاك وەڵام دانەوەو دامەزراوی بۆ داوا بکەن، چونکە ئێستاکە پرسیاری لێدەکرێ.

* هەروەها لەکاتی ناشتنی مردوودا و لەسەر گۆڕستان وا باشە ئامۆژگاری مسوڵمانان بکرێ، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ وای کردوە، وەك لەو فەرموودەیەدا دەردەکەوێ کە (بخاري ومسلم) لە (علي بن أبي طالب) خوالێیڕازیبێ گێڕاویانەتەوەو سەرەتایەکەی ئاوا دەست پێدەکات: (كُنا في جنازةٍ في بقيع الغَرقد، فأتى رسول الله ﷺ فَقَعَدَ وقَعَدْنـا حولَـهُ، ومَعَـهُ مِخْصرةٌ فنكَسَ وجَعَلَ ينكُتُ بِمَخْصَرَتِهِ ثم قال: مامنكم من أحدٍ الا وقدْ كُتبَ مَقْعَدُهُ من النارِ ومَقْعَدُهُ من الجنة... الخ)

واتە: لەگەڵ جەنازەیەك بووین لە (بقیع الغردق) جا پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە لامان دانیشت ئێمەش لەدەوری دانیشتین، وە گۆچانێکی گچکەی پێبوو، جاسەری بەرەو زەوی شۆڕکردەوەو گۆچانەکەی لەزەوییەوە دەژەنی، ئنجا فەرمووی: هیچ کام لەئێوە نیە مەگەر شوێنتان لەئاگر ی دۆزەخ دا یان لەبەهەشت دیاری کراوە.. هتد.

وە (نووي) لە (رياض الصالحين) دەکەیدا باسێکی لەوبارەوە هێناوە بەناوونیشانی: (باب الموعظة عند القبْرِ).[40]

شایانی باسیشە کە ئەوجۆرە تەڵقین دانەی مردوو کە لەسەر گۆڕستان دەکرێو لەکوردستانو چەند شوێنێکی دیکەش باوە بەوشێوەو چۆنیەتیە سوننەت نیەو هیچ دەقێکی ڕاست (صحيح) ی سوننەت لەو بارەوە نیەو وەك لەم فەرموودانەدا دەردەکەوێ کە هێنامانن، ئەسڵ لەو بارەوە پاڕانەوەو داوای لێبوردن بۆکردنو گەردن ئازادکردنی مردووەکەو، ئنجا ئەگەر هەلومەرجیش گونجاوو لەباربوو ئامۆژگاری کردنی خەڵکەکەش چونکە لەوکاتەدا دڵیان نەرمترو بێدارترە بۆ وەرگرتنی قسەی باش.

*دیارە سەرەخۆشی لێکردنو دڵدانەوەی بابای خاوەن مردووش، وە کەسوکاری بەگشتی سوننەتە، چونکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَنْ عَزّى مُصاباً فَلَـهُ مِثْلُ أجْرِهِ) رواه الترمذي والبيهقي، واتە: هەرکەسێك بەلا بەسەرهاتوویێك ئارام بکاتەوەو دڵیبداتەوە ئەوە بارتەقای وی پاداشتی هەیە.

ئنجا (نووي) لەبارەی چۆنیەتی دڵدانەوەو سەرەخۆشی لێکردنەوە گوتوویەتی:[41] {ئەو وشانەی کە بۆ دڵدانەوە بەکاردێن دیاری نەکراونو هەر قسەیەك ببێتە مایەی دڵخۆش کردنو ئارام کردنەوەی خاوەن مردوو دروستو بەجێیە، بەلام زانایانی شافیعی مەزەب ئەم جۆرەیان بە پەسەند زانیوە: (أعْظَم الله أجرَكُمْ وأحسن عزاءكم وغَفَـر لميتكـم)} واتە: خوا پاداشتی مەزنت بداتەوەو، چاك دڵت ئارام بکاتو، لەمردووشتان ببورێ.

---

[40] بڕوانە: ص٣٠٧، تحقيق : عبدالله احمد ابوزينه، الناشر: دار القلم.

[41] بڕوانە: (الأذكار) للنووي ص١٣٥، ١٣٦.

پێغەمبەریش ﷺ لەکاتی سەرخۆشی لێکردن و دڵدانەوەی یەکێك لەکچەکانی کە منداڵێکی مردبوو فەرمووی: (إِنَّ للهِ ماأَخَذَ، ولَهُ ما أعطى، وكُل شيءٍ عِندهُ بِاجلٍ مُسَمًّى.. فَلْتَصْبِرْ ولْتَحسَبْ) متفق عليه.

واتە: خوا هەقی خۆیەتی ئەوەی وەری بگرێتەوەو ئەوەی ببەخشێ، وە هەموو شتێك لای وی کات و سنووری دیاریکراوی هەیە... جا با (کچەکەم) ئارام بگرێ و با پاداشتی لەخوا بوێ.

* هەروەها سوننەتە کەسێك کە دەچێتە سەر گۆڕستان یان بەلای دا تێپەڕدەبێ، بڵێ: (السَّلام عليكم أهل الدِّيار من المؤمنين والمسْلمين، وإنّا أنْ شاءالله بكم لاحقون، نَسْأَلُ الله لَنا ولكم العافية) رواه مسلم وأحمد والنسائي وابن ماجة عن بُرَيْدَة بن الحصَيب رضي الله عنه عن النبي ﷺ.

واتە: سەلامتان لێبێ خاوەن ماڵەکان لە بڕواداران و مسوڵمانان، وە ئێمەش هەرکات خوا بیەوێ پێتان دەگەین، سەلامەتی و بێبەڵایی بۆ خۆمان و ئێوەش لەخوا داوا دەکەین.

یان بڵێ: (السلام عليكم دار قومٍ مؤمنين أنتمْ لَنا فَرَطٌ وانا بكم لاحِقون اللهم لاتَحْرِمْنـا أجْرَهُمْ ولاتفتنا بَعْدَهُمْ) رواه أحمد وابن ماجة وابن السني وحسنه الحافظ العسقلاني في تخريج الأذكار والحديث عن عائشة رضي الله عنها عن النبي ﷺ.

واتە: سەلامتان لێبێ ماڵی کۆمەڵێکی بڕوادار، ئێوە پێشمان کەوتوون و ئێمەش پێتان دەگەین، ئەی خوایە لەپاداشتیان بێبەشمان مەکەو لەدوای وان تووشی بەڵاو گرفتاریمان مەکە.

سێزدە: چەند وردە مەسەلەیەکی پەیوەست بەماڵ و خێزانەوە:

ا- پیرۆزبایی لێکردن بە بۆنەی ژن هێنانەوە:

(أبوهريرة) خوالێیڕازیبێ گوتوویەتی: پێغەمبەر ﷺ کاتێك پیرۆزبایی لەکەسێك دەکرد بەبۆنەی ژن هێنانی‌یەوە (پێش گواستنەوەو دوای گواستنەوەش) دەیفەرموو: (بارك الله لك، وبارك عليك، وجَمَعَ بينكما في خَيرٍ وعافيةٍ) رواه ابوداود والترمذي و ابن ماجة وأحمد وليس في رواية الترمذي كلمة (عافية) وصححه الحاكم و وافقه الذهبي وصححه ابن حبان.

واتە: خوا لێت پیرۆز بکات و پیت و پێزت بڕێژێتە سەر وە لەسەر چاکەو سەلامەتی پێکەوە کۆتان بکاتەوە.

ب- دووعا لەسەر خوێندنی مێرد بۆ ژنەکەی لەشەوی یەکەم دا:

*(اللهم إني أسألك خَيْرها وخَيْرَ ماجَبَلْتها عَلَيه، وأعوذُبك مِنْ شَرِّها وشَرِّ مـا جبَلْتَها عليه) رواه ابوداود وابن ماجة والحاكم وصححه و وافقه الذهبي.

واتە: ئەی خوایە من چاکەو خێری و چاکەو خێری ئەوەی کە ئەمت لەسەر سروشتاندوە لەتۆ دەخوازم، وە لەخراپەی و خراپەی خوو خدەو سروشتی پەنات دێنمە بەر.

ج- لەکاتی سەرجێیکردنی ژن و مێرددا:

*پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (لَوْ أَنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا أَتَى أَهْلَهُ قَالَ: بسم الله، اللهمَّ جَنِّبْنَا الشيطان وجَنِّبِ الشيطان مارزقْتَنا، فَقُضيَ بينهما ولَدٌ لم يَضُرَّهُ الشيطان أبداً) متفق عليه عن ابن عباس رضي الله عنه.

واتە: ئەگەر لەکاتێك دا کە یەکێکتان دەچێتە لای خێزانی بڵێ: بەناوی خوا، ئەی خوایە شەیطانمان لێدووربخەوە، وەشەیطان لەوە دووربگرە کەپێمان دەبەخشی، ئەوە ئەگەر منداڵێکیان لەنێوان دا ببێ، هەرگیز شەیطان زیانی لێنادات.

د- بانگ و قامەت بەگوێی ڕاست و چەپی منداڵی تازە لەدایك بوودا دان:

*پێغەمبەر ﷺ لەوبارەوە فەرموویەتی: (مَنْ وُلِدَ لَهُ مَوْلُودٌ فَأَذَّن في أُذُنِه اليُمْنى وأقامَ في أُذُنِه اليُسرى، لَمْ تَضُرَّهُ أُمُّ الصبيان) رواه ابن السني عن الحسين بن علي رضي الله عنهما واسنادُهُ ضعيف جداً.

واتە: هەرکەسێك منداڵێکی بۆ پەیدابێ و بانگ بەگوێی ڕاستیداو قامەت بەگوێی چەپیدا بدات، ئەوە (أم الصبيان)[42] زیانی لێنادات.

*هەروەها (ابورافع) خوالێیڕازیبێ دەڵێ: پێغەمبەری خوام ﷺ بینی کە لە کاتێك دا کە (فاطمة) حەسەنی کوڕی عەلی خوا لێیان ڕازیبێ بوو بانگی نوێژی بەگوێیدا دا. وەك (ابو داود وترمذي وأحمد و بيهقي) گێڕاویانەتەوەو (ترمذي) بەڕاست (صحيح) ی داناوە.

چواردە: چەند وردە حاڵەتێکی جۆراوجۆر:

أ- لەکاتی توورەبوون دا:

* (سليمان بن صُرد) خوالێیڕازی بێ گوتوویەتی: لەلای پێغەمبەر ﷺ بووم دوو پیاو قسەیان بەیەکتری دەگوت، یەکێکیان ڕووی سوور هەڵگەڕابوو و دەمارەکانی لاملی هەستابوو، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: من وشەیەك دەزانم ئەگەر بیڵێ ئەو حاڵەتەی هەیەتی نامێنێ، ئەگەر بڵێ: (أعوذُ بالله من الشيطان الرجيم) ئەوەی هەیەتی نامێنێ. (بخاري و مسلم) گێڕاویانەتەوە.

ب- لەکاتی دیتنی بابایەکی بەڵادار (مُبْتَلی)دا:

* (ابو هريرة) خوا لێیڕازیبێ گێڕاویەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەرکەسێك بەڵادارێك ببینێ و بڵێ: (الحمدلله الذي عافاني مما ابْتَلاك بِهِ وفَضَّلَني على كثيرٍ مِمَّنْ خلق تفضيلاً)[43] ئەوە ئەو بەڵایەی تووش نابێ، (ترمذي) گێڕاویەتەوەو بە (حَسَنْ) دادەنرێ.

---

[42] لە کوردەواریدا (شەوە)ی پێدەڵێن و ئەفسانەی زۆری لەبارەوە هەڵبەستراون.

ج- لەکاتی چوونە بازاڕدا:

* عومەری کوڕی خەتتاب خوالێیڕازیبێ گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەرکەسێك کە چووە بازاڕەوە بڵێ: (لا الە الا اللە وحدە لاشریك لَهُ، لَهُ الملك ولە الحمدُ يُحي ويميتُ وهو حَيٌ لايموت بيدە الخير وهو على كل شيء قدير) خوا هەزار هەزار (١٠٠٠،٠٠٠) چاکەی بۆ دەنووسێ و هەزار هەزار خراپەی لێدەسڕێتەوەو هەزار هەزار پلەی بۆ بەرز دەکاتەوە، (ترمذي وابن السني والحاكم) گێڕاویانەتەوەو بە (حَسَن) دادەنرێ.

د- لەکاتی هەڵەنگوتنی وڵاخ دا:

* (أبو المليح) لەپیاوێکەوە گێڕاویەتەوە گوتوویەتی: لەپشت پێغەمبەرەوە ﷺ سوار بوو بووم، وڵاخەکەی هەڵەنگوت، گوتم: (تَعِسَ الشيطان) شەیطان لەبەین بچێ، ئەویش فەرمووی: مەڵێ شەیطان لەنێوبچێ چونکە ئەگەر وا بڵێی خۆی زل دەکات هەتا هێندەی ژوورێکی لێدێ، بەڵام بڵێ: (بسم اللە)، جا ئەگەر ئەوەت گوت گچکەو نابووت دەبێتەوە هەتا هێندەی مێشێکی لێدێ.

هـ- لەکاتی مەترسی چاوێنی کردنی شتێك دا:

* پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إذا رأى أحدكُمْ مايُعْجِبُهُ في نَفْسِهِ أو مالِهِ فَلْيُـبَرِّكْ عليه فأن العين حَقٌ) رواه أحمد والحاكم وابن السني عن سهل بن حنيف وهو صحيح.

واتە: ئەگەر یەکێکتان لەخۆیدا یان لەماڵو سامانیدا شتێکی وای دی کەپێی سەرسام بێت، با داوای پیتو پێزی بۆ لەخوا بکات، چونکە کاریگەریی چاو ڕاستە.

وە (أبو سعيد الخدري) خوالێیڕازیبێ گوتوویەتی: (كان رسول اللە ﷺ يَتعَوَّذُ من الجانِ وعَيْنِ الأنس، حتى نزلَت المعوذتانِ، فلما نزلَتا أخذ بهما وترك ماسواهُما) رواه النسائي والترمذي وابن ماجة وهو حديث حسن.

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ (بەچەند دووعا خوێندنێك) لەبەر جندو چاوی مرۆڤ پەنای بەخوا دەگرت، تا دوو پەنا پێبەرەکان (سووڕەتی (الفلق) و (الناس) ) هاتنە خوار جا کە ئەوان هاتنە خوارێ ئەوانی بەکارهێناو وازی لە دووعایەکانی دیکە هێنا

---

[٤٢] واتە: ستایش بۆ ئەو خوایەی کەسەلامەتی کردووم لەوەی تۆی پێتاقیکردۆتەوە، وە بەسەر زۆر لەدروست کراوەکانیدا هەڵی بژاردووم.

تێبینی ناشکرایە کەنابێ ئەو قسەیە بەدەنگی بەرز بکات، کە بابای دەردەدارو بەڵادار گوێی لێبێ و پێی نیگەران بێت، چونکە ئەوە حەرامەو گوناحە.

و- له كاتى ڕوودانى شتێكى ناخۆشدا كه تازه له دەست چووه:

* (عن أبي هريرة رضي الله عنه قال النبي ﷺ : المؤمنُ القَويُّ خَيرٌ وأَحَبُّ الى الله مـن المؤمِـنِ الضَّعيف وفي كلٍ خَيْرٌ، إِحْرِصْ على ما يَنْفَعُكَ وآسْتَعِنْ بالله ولاتَعْجَزْ، وإن أصابك شيئٌ فلا تَقُـلْ: لَـوْ أني فعَلتُ كذا كان كذا وكذا ولكن قُلْ: قدَّر اللهُ وما شـاء فَعَـلَ، فـأن لَـوْ تَفْتَحُ عمـل الشـيطان) رواه احمد ومسلم وابن ماجة.

واته: بڕواداری بەهێز چاكترەو لەلای خواش خۆشەويست تره لەبڕواداری بێهێز، هەردووك لاشيان خێردارن، جا شتێك كه سوودت پێدەگەيەنێ لەسەری سووربەو پشت بەخوا ببەستەو دەسته پاچه مەبه، وه ئەگەر شتێكت تووش بوو مەڵێ: ئەگەر وام كردبايه واو وادەبوو بەڵكو بڵێ: خوا وای بڕيار دابوو وه هەرچی بيەوێ دەيكات، چونكه (ئەگەر) دەرگای كردەوەی شەيطان (كه خوتخوتەی خراپو دڵ ناڕەحەت كەره) دەكاتەوه.

ز-لەكاتی سەرسام بوون بەشتێك دا:

(بخاري) گێڕاويەتەوه كه جارێكيان پێغەمبەری خوا ﷺ به (ابو هريرة)ی فەرمووه، ئەوه لەكوێ بووی ئەی (أبو هريرة)؟! ئەويش گوتوويەتی: ئەی پێغەمبەری خوا لەكاتێك دا تووشم بووی لەش پيس بوم، جا حەزم نەكرد هەتا خۆم نەشۆم لەگەڵت دابنيشم، ئەويش فەرمووی: (سُبْحانَ الله!) بێگومان بڕوادار پيس نابێ.

هەروەها هەر (بخاري) هێناويەتی كه پێغەمبەری خوا ﷺ لەو حاڵەتەدا فەرمووويەتی: (الله أكْبَرُ).

ح- لەكاتی خۆشیو ناخۆشیدا:

پێغەمبەری خوا ﷺ كه حاڵەتێكی دڵخۆشكەری بۆ دەهاته پێش دەيفەرموو: (الحَمدُلله الذي بِنِعْمَته تَتِمُّ الصالِحاتُ)

واته: ستايش بۆ ئەو خوايەی كه بەهۆی چاكەی وی‌يەوه كردەوەو شته چاكەكان تەواو دەبنو پێك دێن، بەڵام ئەگەر حاڵەتێكی ناخۆشو ناپەسندی بۆ پەيدابووبايه دەيفەرموو: (الحمدالله علـى كُـل حـالٍ). (ابن السني والحاكم) گێڕاويانەتەوەو (ألباني)يش به (صحيح) ی داناوه.[44]

---

[44] بڕوانه: (حُصن المُسلم من أذكار الكتاب والسنة) ص١٢٠.

ط- لەکاتێك دا یەكێك پێت بڵێ لەبەر خوا خۆشم دەوێی:

لەوكاتەدا وا پەسەندە بڵێی: (أَحَبَّكَ اللهُ الذي أَحْبَبْتَني لَهُ) رواه ابوداود بأسناد صحيح.

واتە: ئەو خوایەی كە منت لەبەر وی خۆشویستوە خۆشی بوێی.

ی- لەكاتی چاكە لەگەڵ دا كران دا:

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَنْ صُنِعَ إِلَيهِ مَعْرُوفٌ، فقال لِفاعلِه، جزاكَ اللهُ خَيراً، فَقَدْ أَبْلَغَ في الثَناءِ) رواه الترمذي وصححه الألباني [45].

واتە: هەركەسێك چاكەیەكی لەگەڵ بكرێو بەئەنجامدەرەكەی بڵێ: خوا بەچاكە پاداشتت بداتەوە، ئەوە زۆر چاك مەدحی كردوە.

ك- لەكاتی سەرنج دانی خۆدا لەئاوێنەدا:

پێغەمبەر ﷺ كاتێك تەماشای ئاوێنەی دەكرد دەیفەرموو: (الحَمْدُللهِ أَللّهُمَّ كَما حَسَّنْتَ خَلْقي فَحَسِّنْ خُلُقي) رواه ابن السني.

واتە: ستایش بۆ خوایە، ئەی خوایە وەك چۆن دیمەنت جوان كردووم ڕەوشتیشم چاك بكە.

ل- لەكاتی سوێند خواردن دا بەغەیری خوا:

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (مَنْ حَلَفَ منكم فقال في حلِفِهِ: واللاتِ والعزى فَلْيَقُلْ: لا اله إلا الله) متفق عليه.

واتە: هەركەسێكتان سوێندی خواردو لەسوێندەكەیدا گوتی: بەلاتو عوززا، [46] با بڵێ: جگە لەخوا هیچ پەرستراو نین. (واتە: گوتنی (لا اله إلا الله) دەبێتە كەفارەتی).



---

[45] هەمان سەرچاوە، ص١٠٨.

[46] دیارە سوێند بەهەر شتێكی دیكەش جگە لەخواو سیفەتەكانی هەمان حوكمی هەیەو مەرج نیە بەس ناوی لاتو عوززا بێنێ.

## نۆیەم: چەند زیکرێکی گەورەو گرنگ

خوا پشتیوان بێ لەم خاڵەدا هەوڵ دەدەین ئەوجۆرە زیکرانەی کە بەگەورەتر و گرنگتر دانراون وە تایبەتیش نین بەحاڵەتو کاتێکی دیاریکراوەوە، بخەینەڕوو:

یەک: چاکترین زیکر:

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی (... وأفْضَلُ الذكْرِ: لا اله إلاّ الله) رواه النسائي والترمذي و ابن ماجة وصححه الحاكم ووافقه الذهبي، والحديث من رواية جابر بن عبدالله رضي الله عنه.

دوو: چاکترین پاڕانەوە:

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إنَّ أَفْضَلَ الدُّعاءِ: الحَمْدُلله) نفس رواية الحديث السابق. زانایان گوتوویانە:[47] مەبەست لەچاکترین پاڕانەوە بوونی (الحمدالله) ئەوەیە کە هەر پاڕانەوەیەک بەستایشو مەدحو ثەنای خوا دەست پێبکات باشتر گیرا دەبێ.

سێ: چاکترین فەرمایشتی پێغەمبەران:

پێغەمبەری کۆتاییمان ﷺ فەرموویەتی: (وأفضَلُ ماقُلْتُهُ أنا والنَّبِيون مــن قَبْلـي: لا الـه إلاّ وحْدَهُ لاشريك لَهُ) رواه مالك والترمذي والبيهقي.

هەروەها فەرموویەتی: (مَنْ قال: لا اله الا الله وحْدَهُ لاشريك لهُ،لَهُ الملك ولَهُ الحَمْدُ وهو على كل شيئ قدير عَشْرَ مِرارٍ،كان كَمَنْ أَعْتَقَ أربعة أنْفُسٍ من وَلَـدِ إسمـاعيل) متفق عليه عن ابي ايوب الأنصاري رضي الله عنه.

واتە: هەرکەسێك دە جاران بڵێ: بێجگە لەخوا هیچ پەرستراونێن تاکەو هاوبەشی نین، موڵك هەر هی ویەو ستایش هەر بۆ ویە، وە ئەو لەسەر هەموو شتێك بەتوانایە، ئەوە وەك کەسێك وایە کە چوار کەسی لەنەوەی ئیسماعیل ئازاد کردبێ.

چوار: چوار وشەی خۆشەویست ترین لەلای خواو چاکترین قسە لەدوای قورئان:

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (أَحَبُّ الكلامِ إلى الله تعالى أَرْبَعُ لايَضُرُّكَ بِأَيِّـهِنَّ بَـدَأتَ: سُبْحان الله، والحمدُلله، ولا اله الا الله، والله أكبر) رواه مسلم.

هەروەها فەرموویەتی: (أفْضَلُ الكلام بعد القرآن أربعٌ وهُنَّ من القرآن، سُبحان الله والحمدالله ولا اله الا الله والله أكبر) رواه مسلم.

هەروەها فەرموویەتی: (لأن أقول: سبحان الله و الحمدالله ولا اله الا الله والله اكـبر أحَبُّ الى ممّا طلعت عليه الشَمس) رواه مسلم.

واتە: ئەگەر بڵێم: پاکو بێگەردی بۆ خواو ستایش بۆ خوایەو، جگە لەخوا هیچ پەرستراو نینو خوا گەورەترە، لەلام لە هەموو ئەو شتانەی خۆشەویست ترە کە خۆریان بەسەردا هەڵهاتوە.

---

[47] بڕوانە: (كشف الخفا ومزيل الألباس..) للعجلوني، ج١ص١٧٢.

پێنج: زیکرێک کە گوناحەکان ڕادەماڵێ:

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَنْ قال: سُبحان الله وبَحَمْدِهِ في يومٍ مائة مَـرّة حُطَّتْ خطاياهُ ولَوْ كانت مثل زَبَدِ البَحْرِ) متفق عليه عن ابي هريرة رضي الله عنه.

واتە: هەرکەسێك لەڕۆژێك دا سەد جار بڵێ: خوا پاكو بێگەردەو ستایش بۆوی، ئەگەر گوناحەکانی هێندەی کەفی دەریاش بن لـێی دەکەونە خوار.

شـەش: دوو وشـەی لەسـەر زمـان سـووكو لەتـەرازودا قـورسو لـەلای خـوا خۆشەویست:

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (كلمتـان خَفيفَتـانِ علـى اللّسـانِ، ثقيلتـانِ في الميزان، حَبِيْبَتانِ الى الرحمن، سُبحانَ الله وبِحَمْدِه، سُبْحان الله العظيم) متفق عليه عن ابي هريرة رضي الله عنه.

حەوت: چوار وشەی سێجار دووبارەکراوە بارتەقای زیکری ڕۆژێکن:

(جُوَيرِيَةَ) خوا لێی ڕازی بێ کە یەکێکە لەدایکانی بڕواداران گێڕاویەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ پـێی فەرمووە: دوای تۆ چوار وشـەم سێجاران گوتـن ئەگـەر بـەوەی بـەدرێژایی ئـەمڕۆ گوتووتە بکێشرێن بارتەقایان دەبن: (سُبْحان الله وبِحَمْدِهِ عَدَدَ خَلْقِه، سُـبحان الله رِضـيٰ نَفْسِـهِ، سبحان الله زِنَةَ عَرْشِهِ، سُبْحان الله مِداد كلماته) رواه مسلم واصحاب السنن.

واتە: پاکی بۆ خواو ستایش بۆ وی بەژمارەی دروست کراوەکانی، پاکی بۆ خوا هەتا نەفسی ڕازی دەبێ پاکی بۆ خوا بەئەندازەی کێشی عەرشەکەی، پاکی بۆ خوا هێندەی ژمارەی وشەکانی؛ وە ئەم فەرموودەیە هەر (مسلم) بەم جۆرەش هێناویەتی:[48] (سُبحان الله وبَحَمْدِهِ عَدَدَ خَلْقِهِ ورِضا نَفْسِه وزِنَةَ عَرْشِهِ ومداد كلماته).

هەشت: زیکرێک کە خەزنەیەکە لەخەزنەکانی بەهەشت:

(عبدالله بن قيس) خوا لێی ڕازی بێ گوتوویەتی پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (يـا عبـدالله بـن قَيْسٍ ألا أدلك على كنْز من كنـوز الجنـة؟! فقلـت: بلـىٰ يـا رسـول الله، قـال قُـلْ: لا حَـوْلَ ولاقوَّة إلاَ بالله) متفق عليه.

واتە: ئەی عەبدوڵڵای کوڕی قەیس ئایا خەزنەیەك لەخەزنەکانی بەهەشتت پێ بڵێم؟ منیش گوتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: بڵێ: جووڵانو توانا نیە مەگەر بەخوا، یان: لادان لەهەڵەو خراپەو توانا بۆ خێرو چاکە نیە مەگەر بە خوا.

---

[48] بڕوانە: (الأذكار) للنووي، ص٥١، ٥٢.

نۆ: زیکرێک کە پێغەمبەر ﷺ بۆ مشت‌ومالی دەروونی فەرموویەتی:

پێغەمبەری کۆتایی ﷺ فەرموویەتی: (إِنَّهُ لَيُغَانُ على قَلْبي وإني لأَستغفِرُالله في اليَـوْمِ مائة مَرَّةٍ) رواه مسلم عن الأغر المُزني.

واتە: دڵم گەرد دەگرێ هەتا ڕۆژانە سەد (١٠٠) جار داوای لێبوردن لەخوا دەکەم. (ابن الاثير) گوتوویەتی:[٤٩] (لَيُغانُ على قلبي) أي يُغَطُّ ويُغْشى والمراد به: السَهوُ، لأنه كان لايزال في مَزِيْدٍ من الذكر والقُربَةِ ودوام المراقبة فاذا سَها عن شيئ منها في بعضِ الأوقات او نسي، عَدَّهُ ذَنْباً على نَفْسِهِ ففزع الى الأستغفار)

واتە: مەبەست لە (ليغان على قلبي) یانی دادەگیرێ‌و دادەپۆشرێ‌و مەبەست پێ‌ی: بێ‌ئاگابوونە، چونکە ئەو بەردەوام لەزێدەکردن دا بووە لەیادی خواو نیزیک بوونەوەو چاودێری کردنی خوا، جا ئەگەر لەهەندێکی بێ‌ئاگابووبێ لەهەندێک حاڵان دا یان لەبیری چووبێ، ئەوە بەگوناحی داناوە بۆ خۆی وەپەنای بردۆتەبەر داوای لێبوردن کردن لەخوا.

هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَنْ قال: أَستَغفِرُالله الذي لا اله الاَ الحيُّ القَيومُ وأتوبُ إليه، غفرالله لَهُ و إن كان فَرَّ من الزَّحْفِ) رواه ابوداود والترمذي والحاكم وصححه ووافقه الذهبي وصححه الألباني، واتە: هەرکەسێك بڵێ: داوای لێبوردن لەو خوایە دەکەم کە جگە لەوی هیچ پەرستراونین، زیندوو و مشوورگێڕەو بۆلای وی دەگەڕێمەوە، ئەگەر لەکاتی هێرش هێنانی دوژمنیش دا ڕای کردبێت خوالێی دەبووری.

کۆتایی ئەم بڕگەی نۆیەمەش کە بڕگەی کۆتایی خاڵی نۆیەمە، بەم فەرموودەیە دێنین کە پێغەمبەری پێشەوامان گەورەترین جۆری داوای لێبوردن لەخواکردن (سيدُ الأستغفار) مان فێر دەکات: فەرمویەتی: (سَيدُ الأستغفار أن يقـول العَبـدُ: أللّـهُمَّ أنتَ رَبـي لا الـه إلا أنـتَ خَلَقْتني وأنا عَبْدُك، وأنا على عَهدِك و وعدِكَ ما آستَطَعْتُ، أعوذُ بكَ مِنْ شـرّ مـا صَنَعْـتُ، أبـؤُ لـك بنعمتكَ عليَّ، وأبؤُ بِذَنْبي، فَآغفِرْلي، أنَّهُ لايَغْفِرُ الذنوب إلا أنْتَ) رواه البخاري واحمد والنسائي والترمذي.

واتە: گەورەو سەروەری داوای لێبوردن لەخوا کردن ئەوەیە کە بەندە بڵێ: ئەی خوایە تۆ پەروەردگارمی، جگە لەتۆ هیچ پەرستراو نین، دروستت کردووم‌و منیش بەندەتم، وە من هەتا لەتوانام دایە هەر لەسەر پەیمان‌و بەڵێنی تۆم، لەچنگ خراپەی ئەوە کە کردوومە پەنات بۆ دێنم، دان بەچاکەی تۆدا دێنم لەسەر خۆم، وەپێ لەگوناحەکانم دەنێم، جا لێم ببوورە بێگومان جگە لەتۆ هیچ کەس لەگوناحان نابووری.[٥٠]

---

[٤٩] بڕوانە: (جامع الأصول) ج٤ص٣٨٦، لە: (حِصنُ المسلم..) ص١٣٩.

[٥٠] لەکتێبی: (ڕێگای صالح بوون‌و بەرەو خواچوون)دا ئەو فەرموودەیە چاك توێژراوەتەوە.

## دەیەم: صەڵاتو سەلام ناردن بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ

بێگومان صەڵاتو سەلام ناردن بۆ پێغەمبەر ﷺ وێڕای جێبەجێکردنی بەشێك لەئەرکی سەرشان بەرامبەر بەو بەندە هەرە پایە بەرزەی خوای بێوێنە، جۆرێکیشە لە جۆرە گرنگەکانی یادی خوا کردن، جا لەسۆنگەی ئەوەوە کەئێمە ستایشو سوپاس بۆ خوا لەباسی نوێژدا بەوردی باسی ماناو چەمکی صەڵاتو سەلامو چۆنیەتیو حوکمی صەڵاتو سەلام ناردن بۆ پێغەمبەرمان ﷺ کردوە، لێرەدا دووبارەی ناکەینەوەو بەهێنانەوەی ئەم چەند دەقەی قورئانو سوننەت واز دێنین:

یەك: خوای بەخشەر فەرموویەتی: (ان الله وملائكته يصلون على النبي ياأيها الذين آمنوا صلوا عليه وسلموا تسليماً)

واتە: خواو فریشتەکانی صەڵەوات لەسەر پێغەمبەر دەدەن، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە صەڵەواتی لەسەر بدەنو سەلامی بۆ بنێرن.

دوو: پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: (مَنْ صَلَّى عَلَيَّ صَلاةً صَلَّى اللهُ بها عليه عَشْراً) رواه مسلم.

واتە: هەرکەسێك یەك صەڵاتم لێبدات، خوا بەو صەڵاتە دە صەڵاواتی لێ دەدات.

جا بالێرەدا سەرنج بدەین!

خوای پەروەردگار فەرموویەتی:

(يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اذْكُرُوا اللَّهَ ذِكْرًا كَثِيرًا، وَسَبِّحُوهُ بُكْرَةً وَأَصِيلًا، هُوَ الَّذِي يُصَلِّي عَلَيْكُمْ وَمَلَائِكَتُهُ لِيُخْرِجَكُمْ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ وَكَانَ بِالْمُؤْمِنِينَ رَحِيمًا) الاحزاب: ٤١-٤٣،

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە بە یاد کردنێکی زۆر یادی خوا بکەن. وە بەیانیانو ئێواران بەپاکی بگرن، ئەو کەسەی کە خۆی و فریشتەکانی صەڵەواتتان بۆ دەنێرن تاکو لەتاریکییەکان قوتارتان بکاتبەرەو ڕووناکی، وە خوا بە بەزەییە دەربارەی بڕواداران.

وەك دەبینین خوای بەخشەر ڕای دەگەیەنێ کەخۆیو فریشتەکانی صەڵەواتمان لێدەدەن بۆئەوەی لەتاریکییەکان بێینەدەرو بچینە نێو ڕوناکییەوە! کەواتە هەرکەسێك خوای بەبەزەیی صەڵەواتی لێبدات لەتاریکییەوە بەرەو ڕووناکی دەچێ، ئنجا پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی کە هەرکەسێك صەڵەوات لەپێغەمبەر ﷺ بدات خوای پەروەردگار دەقات صەڵەواتی لێدەدات، کەواتە: صەڵاتو سەلامی ئێمە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دەبێتە مایەی داباریینی ڕەحمەتو بەخششی خوا بۆ سەرمانو قوتاربوونمان لە هەموو جۆرە تاریکییەکانو گەیشتنمان بەڕووناکی هەمەلایەنە.

شایانی باسیشه کە خوای کاربەجێو بەخشەر بەرلەوەی ڕای بگەیەنێ کەخۆیو فریشتەکانی صەڵەواتمان لێدەدەن فەرمانی پێکردووین کە زۆر یادی بکەینو بەیانیانو ئێواران بەپاکی بگرین، ئەمەش ئەوەی لێدەفامرێتەوە کە لەئەنجامی زۆر یادی خواکردن دا ئینسانی مسوڵمان شایستەیی ئەوە پەیدا دەکات کە خوا صەڵەواتی بنێرێتە سەر، *کەواتە:*

یەکەم: بەدەقی قورئان زۆر یادی خوا کردنو بەپاکگرتنی زەمینە سازکەری صەڵەواتی خواو فریشتەکانیەتی بۆ بڕواداران.

دووەم: وە بەدەقی سوننەتیش صەڵەوات دانمان لەسەر پێغەمبەر ﷺ هۆی صەڵەواتی دە چەندانەی خوایە بۆمان، وە صەڵەواتی خواش بەرهەمەکەی لەتاریکییەکان قوتاربوونو بەڕووناکی شادبوونە.

*کەواتە:* با بزانین بۆچی پێغەمبەری پێشەوامان ﷺ هێندە جەختی لەسەر ئەوە کردوە کە ئێمەی ئۆممەتی صەڵاتو سەلامی بۆ بنێرین! بێگومان لەبەر خێرو قازانجو بەرژەوەندی خۆمانی بووە، ڕووحم فیدای یەکێك لەسوننەتو فەرمایشتەکانی بێت، بەڵێ پێغەمبەری خوا ﷺ کە دەزانێ ئێمەی مسوڵمانو شوێن کەوتووی بەهۆی صەڵاتو سەلام بۆ ناردنییەوە شایستەی صەڵاتی خوای بێوێنەو فریشتە بێهەڵەو پەڵەکانی دەبینو، لەئاکامی ئەوەش دا بەرەو ڕۆشنایی دەچینو لە تاریکییەکان قوتار دەبین، ئاوا بەجەخت کردنو هاندانەوە فەرمانی پێکردووین کەصەڵاتو سەلامی زۆری بۆ لەخوای بە بەزەییو بەخشەر بخوازین، وەك لەم چەند فەرموودەیەی دیکەش دا بەڕاشکاوی دەردەکەوێ:

سێ: أ– (أَوْلى الناسِ بي يوم القيامةِ أكثرهم علي صلاةً) رواه الترمذي عن ابن مسعود رضي الله عنه وحسنه.

واتە: کێ زیاتر صەڵەواتم لێبدات ئەو کەسە لەڕۆژی دوایی لەهەموو کەس لێم نیزیکتر دەبێ.

ب– (البَخيْلُ مَنْ ذُكِرْتُ عِنْدَهُ فَلَمْ يُصَلِّ عَلَيَّ) رواه الترمذي عن علي رضي الله عنه وقال: حسن صحيح وصححه الألباني،

واتە: ئەو کەسە ڕژدە کە منی لەلای باس دەکرێم بەڵام صەڵەواتم لەسەر نادات.

ج– (لاتَجْعَلوا قبْري عيْداً وصَلُّوا عليَّ فأن صلاتكُمْ تَبْلُغُني حيث كُنْتُمْ) رواه ابوداود عن أبي هريرة باسناد صحيح، واتە: سەر گۆڕەکەم وەك ڕۆژی جەژن قەڵەبالغ مەکەن، بەڵام صەڵەواتم لێبدەن چونکە لەهەر شوێنێك بن صەڵاتەکانتانم پێدەگات.

## ٤-چۆن زیکری خوا بکەین؟!

بەسەرنج دانی دەقەکانی قورئانو سوننەت بۆمان دەردەکەوێ کە زیکری خواکردن وەك چۆن بازنەو مەیدانەکەی یەکجار بەرینو فراوانەو هەموو رووبەرو پانتایی ژیانی ئینسان دادەگرێ، خوای کاربەجێ شێوازو چۆنیەتی زۆرو جۆراوجۆریشی بۆ داناون، بۆئەوەی بتوانێ لەهەموو حاڵەکانیدا یادی خوا بکات، وەك لەوەسفی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە: (کان یذکر الله علی کلّ أحْیانِه) رواه مسلم عن عائشة رضي الله عنها.

جا ئێستا با رامێنین:

یەکەم: بێگومان ئینسان لەرووی قیافەی جەستەیی‌یەوە لەهیچ کاتێك دا لەسێ شێوە بەدەر نیە:



*ا- راوەستان (قیام).*

*ب-دانیشتن (قعود).*

*ج-راکشان و پاڵکەوتن.*

جا خوای کاربەجێ فەرمانی کردوە کە لەهەر سێك حاڵەتەکان دا یادی بکەین، وەك فەرموویەتی: (فَإِذَا قَضَيْتُمْ الصَّلَاةَ فَاذْكُرُوا اللَّهَ قِيَامًا وَقُعُودًا وَعَلَى جُنُوبِكُمْ) النساء: ١٠٣، واتە: جا ئەگەر نوێژتان تەواوکرد یادی خوا بکەن بەپێوەو بەدانیشتنەوەو لەسەر تەنیشت تان.

وەك خوای زاناو توانا رای گەیاندوە کە بەوجۆرە زیکری خواکردن پیشەی بەندە ژیر وتێگەیشتووەکانی خوایە: (إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لَآيَاتٍ لِأُولِي الْأَلْبَابِ، الَّذِينَ يَذْكُرُونَ اللَّهَ قِيَامًا وَقُعُودًا وَعَلَى جُنُوبِهِمْ) آل عمران: ١٩٠-١٩١، کەپێشتریش هێناومانە.

دووەم: وە لەرووی دەرخستنو دەرنەخستنەوە ئینسان دوو حاڵەتی هەن:

ا- بەئاشکرا یادی خوا کردن (ذِكْرُ الله علانية).

ب-بەپەنهانی یادکردنی (ذكرهُ سِراً).

وە بێگومان لەو رووەوە حاڵەتێکی دیکەی سێیەمی نیە، جا خوای بەرزو مەن هەردووك حاڵەتی پەنهانو ئاشکرای دیاریکردوون وەك لەم فەرموودە قودسی‌یەدا دەبینرێ: (عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: قال رسول الله ﷺ: يقولُ الله تبارك وتعالى: أنا عند ظنَ عبدي، بي، وأنا مَعَهُ إذا ذكرني، فأنْ ذكرني في نَفْسه ذكرتُهُ في نَفْسي، وإن ذكرني في مَلأٍ ذكرتُهُ في مَلأٍ خيرٍ منهم..) رواه أحمد والبخاري ومسلم والترمذي وابن ماجة.

واتـه: خـوای بـەپیت و پـێز و بـەرز دەفـەرموێ: مـن بـەپێی بۆچوونـی بەندەکـەمم لەبارەمەوە، وە من هـەر لەگەڵمی هەتا یادم بکات، جا ئەگەر لەدڵی خۆیدا (بەپەنهانی) یادم بکات منیش لەبەر خۆمەوە یادی دەکەم، وە ئەگەر لەنێو کۆمەڵێك دا (بەئاشکرا) یادم بکات منیش لەنێو کۆمەڵێکی باشتر لەوەی وی یادی دەکەم..

سێیەم: وە لەرووی دەنگەوە ئینسان لەسێ حاڵان بەولاوە نیە:

ا- دەنگ بەرزکردنەوە (رفع الصوت).

ب- دەنگ کپ کردن و نزم کردن (خفض الصوت).

ج- میانجی (وسَط).

جا لەو بارەشەوە خوای پەروەردگار و پێغەمبەری سەروەر ﷺ فەرمانیان پێکردووین و رێپرووونییان کردووین کە بەهەرسێك جۆری دەنگ یادی خوا بکەین، جا ئێمە سەرەتا باسی جۆری دووەم و سێیەم دەکەین و دواییش باسی جۆری یەکەم (دەنگ بەرزکردنەوە) دەکەین، چونکە تۆزێك مشتومڕی لەسەر هەیە:

*ا- یاد کردنی خوا بەدەنگی نزم:*

خوای پەروەردگار فەرموویەتی: (وَاذْكُرْ رَبَّكَ فِي نَفْسِكَ تَضَرُّعًا وَخِيفَةً وَدُونَ الْجَهْرِ مِنَ الْقَوْلِ) الأعراف: ٢٠٥، واتـه: وە لەبـەر خۆتـەوە و بەلالأنـەوە و گـەردن کـەچی و تـرس و بیمـەوە بەبێ دەنگ بەرزکردنەوە یادی پەروەردگارت بکە...

هەروەها فەرموویەتی: (ادْعُوا رَبَّكُمْ تَضَرُّعًا وَخُفْيَةً إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ) الأعراف: ٥٥، واتـه: بەکرووزانەوە و گەردن کەچی و بەپەنهانی لەپەروەردگارتان بپاڕێنەوە، بێگومان ئەو لەڕێ لادەرانی خۆش ناوێن.

*ب- یادکردنی خوا بەدەنگی نە بەرز نە نزم (میانجی):*

خوای پەروەردگار لەوبارەوە فەرموویەتی: (قُلِ ادْعُوا اللَّهَ أَوِ ادْعُوا الرَّحْمَانَ أَيًّا مَا تَدْعُوا فَلَهُ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَى وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتْ بِهَا وَابْتَغِ بَيْنَ ذَلِكَ سَبِيلًا) الأسراء: ١١٠، واتـه: بڵـێ لەخوا یان لە ڕەحمان بپاڕێنەوە، بەهەر ناوێك بانگی بکەن، خاوەنی ناوە هـەرە چاکەکانـە، وە پاڕانەوەکەت نە بەدەنگی بەرز نە بەکپی مەکەو لەنێوانیان دا ڕێیەك بدۆزەوە.

ئاشکراشە کە مەبەست لە (بِصَلَاتِكَ) لێرەدا پاڕانەوە (دعاء) یە چونکە هـەم لەئەسڵ دا (صلاة) بەمانای پاڕانەوەیەو[٥١] هەم سیاقی ئایەتەکەش هەرئەوەی لێوەردەگیرێ.[٥٢]

---

[٥١] بڕوانە پێناسەی نوێژ (صلاة) لەباسی نوێژ بەرپاکردن دا.

## ج- يادكردنی خوا بەدەنگی بەرز

هەندێك كەس پێیان وایە كەزیكركردن بەدەنگی بەرز دروست نیەو بیدعەتە بەڵام لەڕاستیدا وانیەو، وەك لەدەقەكانی سوننەت دا دەردەكەوێ پێغەمبەری خوا ﷺ بەهەرسێك شێوەكانی دەنگ (نزم، ميانجی، بەرز) زیكرو پاڕانەوەی كردوە، ئەمەش چەند بەڵگەیەك لەوبارەوە:

أ-وەك پێشتر باسمان كرد قورئان خوێندن جۆرێكە لەجۆرەكانی زیكرو گەورەترین جۆریشیەتی، دەجا ئاشكراشە كە قورئان خوێندن بەهەموو شێوە دەنگەكان دروستە (نووي) لەوبارەوە گوتوویەتی: [٥٣](جاءتْ آثار بِفَضيلـة رفـع الصَّوت بـالقرآن، وآثـارٌ بفضيلـة الأسرار، قال العلماءُ، والجمع بينهما أن الأسرار أبعد من الرياء فـهو أفْضَـلُ في حـق مَـنْ يَخـافُ ذلك، فأن لم يخف الرياءَ فالجهرُ أفضَلَ بشرطِ أن لايؤذي غيرهُ منْ مُصَلٍّ أو نائمِ أو غيرهما..)

واتە: چەند شوێنەوارێك هاتوون كە دەنگ بەرزكردنەوە بەقورئان بەچاكتر دادەنێن‌و، هەندێكیشیان دەنگ نزم كردنەوە بەباشتر دادەنێن، زانایان گوتوویانە: ئەو دەقانە بەوە كۆدەكرێنەوە كە بگوترێ: كەسێك لەڕیابازی بترسێ دەنگ نزم كردنەوەی بۆ چاكترە، بەڵام كەسێك ئەو ترسەی نەبێ دەنگ بەرزكردنەوەی بۆ چاكترە بەمەرجێك ئازاری غەیری خۆی نەدات لەنوێژكەرو خەوتوو و هیدیكەش..

ب- هەموو ئەوجۆرە زیكرو پاڕانەوانەی كە لەپێغەمبەرەوە ﷺ گێڕراونەوە دیارە هەندێك جاران دەنگی پێیان بەرزكردۆتەوە ئەگەرنا خەڵك گوێبیستیان نەدەبوون‌و لێی نەدەگێڕرانەوە.

ج-(عبدالله بن عباس) خوا لێیان ڕازیبێ ئەم دەقەی دەربارەی پاڕانەوەی پێغەمبەر ﷺ لەجەنگی بەدردا گێڕاوەتەوە:

(قال النبي ﷺ وهو في قُبَّته: أللهمَّ إني أَنْشُدُك عهدك ووعدك، أللهمَّ إنْ شئتَ لَمْ تُعبَدْ بعد اليوم، فاخذ أبوبكر رضي الله عنه بِيَد رسُول الله ﷺ، فقال: حَسْبُك يارسول الله، فَقَدْ أَلحَحْتَ علـى رَبِّك...) متفق عليه وهذا لفظ البخاري، وفي لفظ مسلم: (إستقبل نبيُّ الله ﷺ القبلة ثـم مَـدَّ يَدَيْـه فَجَعَـلَ يَهْتِفُ بِربِه يقول: أللهمَّ أنْجِزْلي ما وعدْتَني..)



---

[٥٢] (عائشة)ش گوتوویەتی: ئەو ئایەتە لەبارەی پاڕانەوەوە هاتوە، وەك (بخاري و مسلم) گێڕاویانەتەوە بڕوانە: (الأذكار) للنووي، ص٤٠، ط١ ١٩٨٣، دار الفكر.

[٥٣] بڕوانە: (الأذكار) ص٣١١، ط١، ١٩٨٣، تحقيق: احمد رابت حمدش.

واته: پێغەمبەر ﷺ لەکاتێك دا کە لەچادرەکەی‌دا بو فەرمووی: ئەی خوایە من پەیمان‌و بەڵێنەکەتت لێ‌داوادەکەم، ئەی خوایە ئەگەر بتەوێ (ئەم کۆمەڵە مسوڵمانە بفەوتێنی) لەئەمڕۆ بەدواوە ناپەرسترێی، ئنجا ئەبووبەکر خوالێی‌ڕازی‌بێ دەستی پێغەمبەری خوای گرت‌و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەستە چونکە زۆر داکۆکیت لەپەروەردگارت کرد، ئەمە ڕیوایەتی (بخاري)یە.

وە لەڕیوایەتی (مسلم)دا: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕووی کردە قیبلە پاشان دەستەکانی (بەرەو ئاسمان) درێژکردن‌و بەدەنگی بەرز هاواری دەکردە پەروەردگاری‌و دەیفەرموو: ئەی خوایە ئەوەی بەڵێنت پێ‌داوم بۆم جێ‌بەجێ بکە.

(نووي) گوتوویەتی:[٥٤] (قلت يَـهْتِفُ: بفتح أوله وكَسْر ثالثِه ومَعْناهُ: يَرْفَعَ صوتَهُ بالدعاء) واتە: گوتم: (يَهْتِفُ) بەسەری پیتی یەکەمی‌و ژێری پیتی سێیەمی‌یەتی، وە ماناکەشی: دەنگی بەپاڕانەوەوە بەرز دەکردەوە.

د- لەزیکری دوای نوێژەکان دا ئەم فەرموودەیەمان هێناوەتەوە:

*(عن عبدالله بن الزبير رضي الله عنهما أن رسول الله ﷺ كان يُهَلِّل دُبُرَ كل صَلاة حين يُسلِّمُ بهؤلاءِ الكلمات: لا اله الا الله وحدهُ لاشريك لَهُ، لَهُ الملك ولَهُ الحَمْدُ، وهو على كل شيء قدير، لا حول ولا قوة الا بالله، ولا نَعْبدُ الا إياهُ، لَهُ النعمة ولَهُ الفضْلُ ولَهُ الثناء الحَسَنُ، لا اله الا الله مخلصين لَهُ الدين ولَو كره الكافرون) رواه مسلم والنسائي وابوداود واحمد. کە لەشوێنی ناوبراودا مانامان کردوە.

جا وشەی (يُهَلِّلُ) یانی: دەنگی هەڵدەهێناو بەرزی دەکردەوە.

هـ- وە (بخاري و مسلم) لە (ابن عباس)ەوە گێڕاویانەتەوە کە گوتوویەتی: (ماكُنا نَعْرِفُ انقضاء صلاةِ رسول الله ﷺ إلا بالتكبير)[٥٥] واتە: بەس بەهۆی (الله اكبر) کردنەوە بەتەواوبوونی نوێژی پێغەمبەری خوامان ﷺ دەزانی.

و- هەروەها (ابو معبد) گێڕاویەتەوە کە (ابن عباس) خوالێیان ڕازی‌بێ هەواڵی پێ‌داوە کە دەنگ بەرزکردنەوە بەزیکرکردن لەکاتێك دا کە خەڵك لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ لەنوێژی فەرز دەبوونەوە باو بووە، وە (ابن عباس) گوتوویەتی: بەهۆی ئەو زیکرەوە دەمزانی کەنوێژیان تەواوکردوە، وەك (بخاري ومسلم) گێڕاویانەتەوە.[٥٦]

---

[٥٤] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[٥٥] بەڵام لەلای (بخاري) وشەی (كُنْتُ)یە لەجیاتی (كنا) بڕوانە: (الأذكار) ص ١٣٠.

[٥٦] کە ئەمە دەقەکەیەتی: (عن ابن عباس رضي الله عنهما: أن رفع الصوت بالذكر حين ينصرفُ الناسُ من المكتوبة كان على عهد رسول الله ﷺ وقال ابن عباس: كنت أعلم اذا انصرفوا بذلك إذا سمعته) بڕوانە: (الأذكار) ص١٣٠.

ز-(بخاري) له (جابر بن عبدالله)ی گێڕاوەتەوە خوالێیڕازیبێ کە گوتوویەتی: (كُنا إذا صَعِدْنا كبرَّنا وإذا نزَلْنا سبَّحْنا) وەك پێشتریش هێناومانە.

هەروەها هەمان قسە (ابوداود) لە (ابن عمر)یشی گێڕاوەتەوە خوا لێیان ڕازیبێ، ئێستاش با سەرنجێکی قسەی ئەوانە بدەین کە پێیان وایە دروست نیە کە دەنگ بەزیکرو پاڕانەوە بەرز بکرێتەوە:

ئەوەندەی سەرنجی قسەکانی ئەوجۆرە کەسانەم داوە تەنیا ئەم سێ بەڵگەیەم بینیون کە بۆ پشتگیری ڕایەکەیان دەیان هێننەوە:

یەك: خوای پەروەردگار فەرموویەتی: (ادْعُوا رَبَّكُمْ تَضَرُّعًا وَخُفْيَةً إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ) الاعراف: ٥٥، جا ئەوانە دەڵێن: مەبەست لە (اعتداء) کە لەڕستەی: (انه لايحب المعتدين) دا ئاماژە پێکراوە: دەنگ بەرزکردنەوەیە!

بەڵام:

یەکەم: هیچ بەڵگەیەگ لەو بارەوە نیەو توێژەرەوانیش گوتوویانە مەبەست بێئەدەبی نواندنە لەگەڵ خوادا، وەك داوای شتی مەحاڵ، یان تووك‌و نزای خراپ.

دووەم: ئەگەر گریمان مەبەست لە (إعتداء) دەنگ بەرزکردنەوەش بێت، مادام لەفەرموودەی ڕاست (صحيح) دا پێمان گەیشتوە کە جاری وابووە پێغەمبەر ﷺ بەدەنگی بەرزیش پاڕاوەتەوە، ناچارین بڵێین: مەبەست لێرەدا زیادەڕۆیی کردنە لەدەنگ هەڵێنان دا، یان مەبەست لەحاڵەتی پاڕانەوەیە بەتەنیا، هەرچەندە ئەم حاڵەتەش دیسان هەڵاواردن (إستثناء) ی تێدایە چونکە لەجەنگی بەدردا پێغەمبەر ﷺ تەنیا خۆی پاڕاوەتەوە.

دوو: هەروەها خوای بەخشەر فەرموویەتی: (وَاذْكُرْ رَبَّكَ فِي نَفْسِكَ تَضَرُّعًا وَخِيفَةً وَدُونَ الْجَهْرِ مِنَ الْقَوْلِ.. ..) الاعراف: ٢٠٥، بەڵام لەوەڵامی ئەم بەڵگەیەشیان دا دەڵێین: مادام لەدەقە ڕاست‌و ڕاشکاوەکانی سوننەت دا هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ بەدەنگی بەرز زیکرو دووعای کردوە، وەك دوای نوێژە فەرزەکان‌و گەرمەی جەنگ‌و سەرکەوتن بە بەرزاییان داو شۆڕبوونەوە بەنشێوان دا، ناچارین بڵێین: دیارە مەبەست لەو یادکردن (ذکر) ە کە لەم ئایەتەدا هاتوە جۆرە یادکردنێکی تایبەتیە وەك ئەوەی مرۆڤ لەبەر خۆیەوەو بەتەنیا زیکری خوا بکات.

سێ: بەڵگەیەکی دیکەشیان ئەم فەرموودەیەیە کە (أبو موسى الأشعري) دەیگێڕێتەوەو دەڵێ: جارێکیان ئێمە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بووین جا کاتێك (لە هەورازێك) سەردەکەوتین‌و بەسەرنشێوێك دا دەمانڕوانی: (لا الە الا الله) و (الله اکبر) مان دەکردو دەنگمان بەرز دەبۆوە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ( يا أيها الناسُ أرْبعوا على أنفسكُم فـإنكم لاتدعون أصمَّ ولا غائباً، إنه معكم سَمِيْعٌ قريـبٌ) متفق عليه، واتە: ئەی خەڵکان ڕەحم بەخۆتان بکەن! چونکە ئێوە نە بانگی زاتێکی کەڕ دەکەن نە نادیارو دوور، بێگومان خوا لەگەڵتانەو بیسەرو نیزیکە.

بەلاّم لێرەش دیسان وەك (نووي) یش گوتوویەتی:[57] مەبەست موتڵەقی دەنگ بەرزکردنەوە نیە، بەڵکو مەبەست زیادەڕۆیی (مبالغة) تێدا کردنیەتی، چونکە، ناگونجێ فەرمایشتەکانی پێغەمبەر ﷺ دژایەتی (تناقض) و ناکۆکییان لەنێوان دا هەبێت‌و هەر جارێك شتیوا بینرا، ئەوە بەهۆی سەرکێڵ (سَطْحي) ڕوانین‌و وردنەبوونەوەو قووڵ نەبوونەوەوەیەو بەهۆی ئەوەوەیە کە هەرکام لەدەقەکان لەشوێنی سروشتی‌و پڕبەپێستی خۆیان دا ڕۆنە نراون، چونکە هەم لەقورئان‌و هەم لەسوننەتیش دا جاری وایە چەند دەقێکی جیا جیا هەن دەربارەی مەسەلەیەك کە بەڕواڵەت دژو پێچەوانەی یەکن، بەلاّم لەڕاستی‌دا وا نیەو هەرکامێکیان بۆ حاڵەت‌و ڕووێکی جیایەو، سەرجەمیان بەسەر حاڵەت‌و لایەنە جیاوازەکانی ئەو مەسەلەیەدا دابەش دەبن.

چوارەم: وە لەڕووی تەنیایی‌و تێکەڵی‌یەوە مرۆڤ دوو حاڵەتی هەن:

أ-تەنیایی ( إنفراد)

ب-تێکەڵی‌و کۆمەڵ بوون ( الأختلاط والأجتماع).

جا لە هەردووك حاڵەتی تەنیایی‌و کۆمەڵ بوونیش دا دیسان مسوڵمان فەرمانی پێ کراوە کە زیکری خوای بێوێنە بکات، جارێ بۆ حاڵەتی تەنیایی ئەوە بێگومان حاڵەتی ئەسڵی‌و ئاسایی زیکری خواکردنەو پێویست بەڵگەی لەسەر هێنانەوە ناکات.

بەڵگەی ڕەوابوون بگرە سوننەت‌و پەسەندبوونی زیکری بەکۆمەڵیش یەکجار زۆرن، بۆ وێنە:

*(عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: قال رسول الله ﷺ: إنَّ للهِ مَلائِكةً فُضُلاً عن كتابِ الناس، يطوفـون في الطرق يَلْتَمِسون أهلِ الذكر، فأذا وجدوا قوماً يذكرون الله تعـالى، تنـادوا: هَلُمـوا الى حـاجتكُمْ، قـال: فَيَحُفونَهُم بأجنحتِهِمْ الى السماء الدنيا..) رواه البخاري وهذا لفظه، ومسلم دون جملة (عن كتاب الناس) والترمذي وأحمد.

---

[57] بڕوانە: (الأذكار) ص٣٣٠، ٣٣١، ط١ دار الفكر، ١٩٨٣، تحقيق: احمجد راتب حموش.

واتە: خوا چەند فریشتەیەکی هەن کە لەنووسینی کردەوەکانی خەڵکی زێدەن، جا بە ڕێو بانان دا دەگەڕێن لەئەهلی زیکر دەگەڕێن، جا هەر کات کۆمەڵێکیان دۆزینەوە کە یادی خوای بەرز بکەن، یەکسەر بانگی یەکتر دەکەن، وەرن بۆئەوەی لێی دەگەڕان فەرمووی: جا بەباڵەکانیان دەوریان دەدەن هەتا سنووری ئاسمانی یەکەم.

*(ابو سعيد الخدري) خوالێیڕازی بێ گێڕاویەتەوە کە ڕۆژێکیان موعاویە بەلای بازنەیەك (لە ئەهلی زیکر) لەمزگەوت دا ڕەدبوو، گوتی: بۆچی دانیشتوون؟! گوتیان: دانیشتووین یادی خوای بەرز دەکەین، گوتی: تووخوا بەس بۆ ئەوە دانیشتوون؟! گوتیان بەخوا بەس بۆ ئەوە دانیشتووین، گوتی: ئاگاداربن من لەبەرئەوە سوێندم نەدان کە متمانەتان پێنەکەم، هیچ کەسێکیش لەو پلەیەی من دا بۆ نیزێکی لەپێغەمبەرەوە ﷺ لەمن کەمتر فەرموودەی لێنەگێڕاونەوە، وە پێغەمبەری خوا ﷺ جارێك بەلای کۆڕێك لەهاوەڵانیدا رابرد، فەرمووی:

(ما أجْلَسَكُم؟ قالوا: جَلَسْنا نذكرالله تعالى ونَحْمدُهُ على ما هدانا للأسلامِ ومَنَّ بِـهِ عَلَيْنا، قال: آلله ما أجلسكم الا ذاك؟! قالوا: والله ماأجْلَسَنا إلا ذاك، قال: أما إنـي لَـمْ أَسْتَحْلِفْكُمْ تُهْمـةً لكـم، ولكنه أتاني جبرئِلُ فأخبرني: أن الله تبارك وتعالى يباهي بكمُ الملائكة) رواه مسلم والنسائي واحمد.

واتە: بۆچی دانیشتوونو کۆبوونەتەوە؟ گوتیان: دانیشتووین یادی خوای بەرز دەکەینو ستایش دەکەین کە ڕێروونی کردووین بۆ ئیسلامو بەهۆی ئەوەوە منەتو چاکەی خستۆتە سەرمان. فەرمووی: تووخوا بەس بۆئەوە کۆبوونەتەوە؟! گوتیان: بەخوا بەس بۆئەوە دانیشتووین، فەرمووی: بزانن لەبەر بێمتامەنەییم پێتان سوێندم نەدان، بەڵام جوبرائیل هاتە لامو هەواڵی دامێ کە خوای بەپیتو پێزو بەرز شانازییتان پێوە دەکات بەسەر فریشتەکانەوە.

ئنجا شایانی باسیشە کە زیکر لەهەموو ئەو حاڵەتانەداو بەهەموو ئەو شێوازانە سێجۆری هەن:

أ- بەدڵو بەزمان.

ب- تەنیا بەدڵ.

ج-تەنیا بەزمان.

کە بێگومان هەرە چاکیان یەکەمیانەو دووەمیشیان نێوەنجییەو، سێیەمیشیان لەخوار هەموویانەوەیە، وەك زانایان گوتوویانەو شتێکی ئاشکراشە.[58]

---

[58] بڕوانە: (الأذكار) ص٣٩.

کۆتایی ئەم بەندی چوارەمەش بەچەند ئەدەبو ڕەوشتێکی بەرز دێنین کە پەسەندە بابای خوا یادکەر چەندو لەکاتی زیکرکردنەکەی خۆییان پێ برازێنێتەوەو ڕەچاویان بکات:[٥٩]

یەك: هەرچەندە وا پەسەندە بابای زیکرکەر لەش پاك‌و بەدەستنوێژ بێت، بەلام جگە لەقورئان خوێندن هەموو جۆرەکانی دیکەی زیکر، ئەگەر بەئایەتی قورئانیش بن بۆ بابای لەش پیسیش هەر دروستن بەمەرجێك بەمەبەستی قورئان خوێندن نەبن.

دوو: وا پەسەندە بابای خوا یادکەر لەکاتی زیکرکردن دا ئەگەر دانیشتوو بوو ڕووەو قیبلە بێت، وە لەهەموو حاڵان دا بەئارامی‌و گەردن کەچی‌و ڕێزو ویقار لەخوا گرتنەوە یادی خوا بکات.

سێ: هەروەها واپەسەندە کە شوێنی خوا تێدا یادکردن پاك‌و خاوێن بێت، وە واپەسەندە کە زارو زمانیشی پاك‌و بۆنخۆش بن‌و، ئەگەر تام‌و بۆنی زاری گۆڕابوو سیواك بکات‌و بیشوات.

چوار: هەروەها شتێکی یەکجار پەسەندو باشە کە ئەوەندەی بۆی دەکرێ بەهۆشیاری‌و بێداری‌و بیرکردنەوەوە زیکرەکانی بخوێنێ، چونکە بێگومان ڕووح‌و جەوهەری زیکر ئەو هۆشیاری‌و بێداری‌و ئاگا لەخۆبوون‌و وردبوونەوەو ڕامانەیە، وە لەڕاستی‌دا زیکرێك وانەبێ پێچەوانەی ناوەکەشیەتی چونکە وەك لەپێناسەی زیکردا گوتمان (ذکر) پێچەوانەی (غفلة) و (نسیان) ە!!

پێنج: بەلام لەچەند حاڵێك یادی خوا کردن (ذکرالله) بەزمان ئەگەر حەرامیش نەبێ بێگومان شتێکی ناپەسەند (مکره)، وەك:

کاتی تارەت گرتن،[٦٠] کاتی لەگەڵ هاوسەردا جووت بوون،[٦١] کاتی گوێگرتن لەوتاری دواندەر (خطیب)، کاتی هەڵسان بۆ نوێژی فەرز، کاتی خەواڵوویی‌و وەنەوزدان، بەلام لەڕێگاداو لەگەرماودا ناپەسەند نیە.

---

[٥٩] بڕوانە سەرچاوەی پێشوو ص٤٢تا ٤٦.

[٦٠] دیارە ئەو زیکرانەی کە بۆ کاتی تارەت گرتن‌و جیماع کردن دانراون دەبێ بخرێنە پێشیانەوە، واتە پێش دەست پێکردنیانە.

**شەش:** لەچەند حاڵەتێك دا پەسەندە زیکر ببڕێ‌و پاشان دەستی پێبکرێتەوە، وەك: وەڵامدانەوەی سەلام، ئەگەر كەسێكی لەلا پژمی‌و (الحمدالله) ی كرد، (يَرحَمُكَ الله) ی پێدەڵێت، پاشان دەست بەزیکرەكەی دەكاتەوە، هەروەها لەكاتی بیستنی بانگ دا وەڵامی دەداتەوەو دوایی دەست پێدەكاتەوە، هەروەها لەكاتی دیتنی ناشەرعی (منكر)یەك دا كە پێویست بەلابردن بكات، یان چاكە (معروف)ێك كە پێویست بەچەسپێنران بكات، وە لەكاتی پرسیاركردنی كەسێك یان داوای ئامۆژگاری كردنی‌داو.. هتد.[٦٢]

**حەوت:** زیكری خواكردن هەرچەندە لەمیانەی ئەنجام دانی زۆربەی خواپەرستی‌یەكان‌و كردەوە باشەكان دا دەكرێ‌و لەگەڵیان تێك ناگیرێ، وە وەك پێشتر باسمان كرد ئامانج‌و كاكڵەو جەوهەری سەرجەم خواپەرستی‌یەكانە،[٦٣] بەڵام دیسان زیكری خوای بێوێنەو تاك‌و پاك بەدیلی ئەرك‌و كارو چالاكی‌یەكانی دیكەی بەندایەتی بۆ خواكردن‌و مسوڵمانەتی نیەو، كەلێنی ئەوان پڕ ناكاتەوە، بەكورتی زیكری خوا كردن زۆر گەورەو گرنگە بەڵام هەموو شتێك نیەو تەنیا شتێكە لەشتەكانی ئیسلامەتی، وەك باقی ئەركەكانی دیكەی ئیسلام.

كەواتە كەسانێك كەپێیان وایە تەنیا بەزیكر كردن مەداریان سازدەبێ‌و بەرەی خۆیان لەئاوێ دەردێنن خراپ تێگەیشتوون‌و هیچ كام لەئەرك‌و كارە گەورەو گرنگەكانی ئیسلام جێدار (بدیل) و كەلێن پڕ كەرەوەی شتەكانی دیكەنین‌و هەركامیان وەك كەرەسەی بینایەك دەبێ لەشوێنی تایبەتی‌و شیاوی خۆی‌دا بەكاربێت‌و لەقەبارەی سروشتی خۆیشی زلتر نەكرێ، چونكە گەورەكردنی هەركام لەئەرك‌و كارەكانی دینداری حەتمەن لەسەر حیسابی لایەكانی دیكەیەتی.

ئنجا بەڕاستی زۆر جێی سەرنج‌و رامانە كە دەبینین خوای كاربەجێ پاش خستنەڕووی زیكرو فیكری قووڵ‌و ڕازو نیازو پاڕانەوەی گەرم‌و بەكوڵی بەندە ژیرو عاقڵمەندەكانی خۆی كە داوای بەخشران‌و بەهەشتی بەرینی لێدەكەن، بەدەم وەڵامدانەوەیانەوە سەرنجیان بۆئەوە ڕادەكێشێ كە زیكرو فیكرو پاڕانەوەو لالانەوەی ڕووت بەس نیە! یان بەتەعبیرێكی ڕاست تر:

---

[٦١] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[٦٢] بڕوانە: (الأذكار) ص ٤٦، ٤٧.

[٦٣] بۆ وێنە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إنما جُعِلَ الطوافُ بالبيتِ وبَيْن الصفا والمروة ورمي الجمار لأقامة ذكرالله تعالى) رواه ابوداود والترمذي وقال حسن صحيح، وقال الألباني اسناده ضعيف، بروانه: (الوابل الصيب) ص١٥٢.

زیکرو فیکرو پاڕانەوەو ڕازو نیازو کڕووزانەوەیەك لەلای خوای دادگەر شیاوی وەرگرتنو ئیعتبار پێکردنو ڕێزگرتنە کە:

*أ- کردەوەی چاك بەگشتی.*

*ب- کۆچ کردنو ئاوارەیی و ئازارو کوشتنو کوژران بەتایبەتی، بەدوادا بێت!*

ئێستاش ئەوەی گوتمان با لەم چەند ئایەتەی کۆتایی سوورەتی (آل عمران)دا بەختی درشتو ڕوون بیخوێنینەوە:

(إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لَآيَاتٍ لِأُولِي الْأَلْبَابِ، الَّذِينَ يَذْكُرُونَ اللَّهَ قِيَامًا وَقُعُودًا وَعَلَى جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَذَا بَاطِلًا سُبْحَانَكَ فَقِنَا عَذَابَ النَّارِ، رَبَّنَا إِنَّكَ مَنْ تُدْخِلِ النَّارَ فَقَدْ أَخْزَيْتَهُ وَمَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ أَنْصَارٍ، رَبَّنَا إِنَّنَا سَمِعْنَا مُنَادِيًا يُنَادِي لِلْإِيمَانِ أَنْ آمِنُوا بِرَبِّكُمْ فَآمَنَّا رَبَّنَا فَاغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَكَفِّرْ عَنَّا سَيِّئَاتِنَا وَتَوَفَّنَا مَعَ الْأَبْرَارِ، رَبَّنَا وَآتِنَا مَا وَعَدْتَنَا عَلَى رُسُلِكَ وَلَا تُخْزِنَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّكَ لَا تُخْلِفُ الْمِيعَادَ، فَاسْتَجَابَ لَهُمْ رَبُّهُمْ أَنِّي لَا أُضِيعُ عَمَلَ عَامِلٍ مِنْكُمْ مِنْ ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَى بَعْضُكُمْ مِنْ بَعْضٍ فَالَّذِينَ هَاجَرُوا وَأُخْرِجُوا مِنْ دِيَارِهِمْ وَأُوذُوا فِي سَبِيلِي وَقَاتَلُوا وَقُتِلُوا لَأُكَفِّرَنَّ عَنْهُمْ سَيِّئَاتِهِمْ وَلَأُدْخِلَنَّهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ ثَوَابًا مِنْ عِنْدِ اللَّهِ وَاللَّهُ عِنْدَهُ حُسْنُ الثَّوَابِ) آل عمران: ١٩٠-١٩٥.

**واتە:** بێگومان لەدروست کرانی ئاسمانەکانو زەوی و جیاوازی (یان جێگۆڕکە)ی شەووڕۆژدا نیشانە گەلێك هەن بۆ خاوەن عەقڵان، ئەوانەی کە بەپێوەو بەدانیشتنەوەو لەسەر تەنیشتیان یادی خوا دەکەن، وە لەدروستکرانی ئاسمانەکانو زەوییەوە ڕادەمێنن:

(دەڵێن:) پەروەردگارمان ئەمەت بەهەوەنتە دروست نەکردوە، پاکی بۆ تۆ، جا لە ئازاری ئاگر بمانپارێزە، پەروەردگارمان تۆ هەرکەسێك بخەیە ئاگرەوە ئەوە بێگومان زەبوونت کردوە وەهیچ پشتیوانێك بۆ ستەمکاران نیە. پەروەردگارمان ئێمە دەنگی بانگ کەرێکمان بیست کە بۆ ئیمان بانگی دەکرد کە بڕوا بە پەروەردگارتان بهێنن ئێمەش بڕوامان هێناوە. پەروەردگارمان لە گوناحەکانمان ببوورەو خراپەکانمان لێ بسڕەوەو لەگەڵ چاکەکاران دا بمانمرێنە. پەروەردگارمان وە ئەوەی کە لەسەر زمانی پێغەمبەرانت بەڵێنت پێداوین پێمان ببەخشە، وە ڕۆژی هەڵسانەوە ڕیسوامان مەکە بێگومان تۆ بەڵێنت پێچەوانە نیە. جا پەروەردگاریان وەڵامی دانەوە کە من کردەوەی هیچ بکەرێك لەئێوە نێر بێ یان مێ کە هەندێکتان لەهەندێکتانن بەزایە نادەم، جا کەسانێك کە کۆچیان کردوە وە لەماڵو حاڵیان وەدەرنراونو لەڕێی من دا ئازار دراونو جەنگاونو کوژراون، بێگومان خراپەکانیان لێ دەسڕمەوەو مسۆگەر دەیانخەمە باغاتێکەوە کە ڕووباریان بەژێردا دەڕۆن، کە پاداشتە لەلایەن خواوە، وە خوا چاکترین پاداشتی لەلایە.

ئا لێرەش دا کۆتایی بەم بەندی چوارەمە دێنینو دەچینە سەر توێژینەوەی بەندی پێنجەمو کۆتایی (بەرهەمی زیکرەکانی خوا).

## ٥- بەرهەمی زیکرکردنی خوا

خوێنەری بەڕێزو خۆشەویستم ! بێگومان زیکرو یادی خواکردن سوودو بەرهەمی نۆرو جۆراوجۆری هەن‌و خستنەڕوویان پێویستی بەشوێنێکی سەربەخۆو تایبەت دەکات، بەڵام خوا پشتیوان بێ هەوڵ دەدەین کە لەدوو توێی ئەم بەندە چەند لاپەڕەیی‌یەدا پوختەو گوشراوی زادەو بەرهەمی بەپێزی زیکری خوا بخەینەڕوو.

شایانی باسیشە کە بێجگە لە تێوەڕامانم‌و وردبوونەوەم لەدەقەکانی قورئان‌و سوننەت بۆ نووسینی ئەم باسە پشت بەدوو سەرچاوان دەبەستم:

یەکەم: (الوابل الصَّيِّب ورافع الكلم الطَّيِّب) ی (إبن قيم الجوزية)، کە حەفتاو سێ (٧٣) سوودو کەڵکی زیکری خوای نووسیوە، بەڵام هەم دووبارەیان تێدایەو هەم زۆریشیان دەگونجێ بخرێنە نێو یەکتر.

دووەم: (یادی خودا: گرنگی یادی خودا لەژیانی مرۆڤ دا) کە یازدە (١١) بەرهەمی گەورەی یادی خودای تێدا خراونەڕوو.[٦٤]

جا ئێمە لەم حەوت خاڵەی خوارەوەدا کە هەرکامێکیان بۆ بوارێکی تایبەت تەرخان کراوە زیاتر لەسی (٣٠) بەرهەمی زیکری خواکردن دەنووسین:

یەك: لەبواری پەیوەندی لەگەڵ خوادا جل جلاله.

دوو: لەبواری پەیوەندی لەگەڵ پێغەمبەرو ﷺ فریشتان دا.

سێ: لەبواری فەرمانبەری خواو گوناح نەکردن دا.

چوار: لەبواری خزمەت کردنی دڵ‌و عەقڵ‌و جەستەدا.

پێنج: لەبواری بەرەنگاریکردنی شەیطان‌و دوژمنان‌و پیاوێرانیان دا.

شەش: لەبواری برایەتی‌و یەکریزی مسوڵمانان دا.

حەوت: لەبواری دروست بوونی کەسایەتی‌یەکی ساغو سەلامەت‌و تێرو تەواودا.

جا هەرچەندە من هەوڵم داوە کە سوودو بەرهەمەکانی زیکر لەو حەوت بوارەو سی‌و ئەوەندە خاڵەدا بخەمەڕوو - بەگوشراوی - ، بەڵام دەگونجێ زۆر شتی دیکەش لەوبارەوە بنووسرێ‌و گەلێك گەوهەرو مرواری دیکەی گران بەها لەدەریای دەوڵەمەندی یادی خوا (سبحانه وتعالى) دەربهێنرێن.

---

[٦٤] نووسراوی بەندە چاپی یەکەم ١٩٨٥.

یەك: بەرهەمی یادی خوا لەبواری پەیوەندی لەگەڵ خوادا:

١-یەکەمین بەرهەمی زیکری خوای پەروەردگار لەبواری پەیوەندی مرۆڤی مسوڵمان لەگەڵ خوادا ئەوەیە کە خوای بەخشەر بەهۆی یادکردنی خواوە لێی ڕازی دەبێ و ئاشکراشە کە ڕەزامەندی خوا لەهەموو شتێك گەورەترو چاکترە تەنانەت لە بەهەشتی ڕازاوەو نەبڕاوەش وەك فەرموویەتی: (وَعَدَ اللَّهُ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَمَسَاكِنَ طَيِّبَةً فِي جَنَّاتِ عَدْنٍ وَرِضْوَانٌ مِنَ اللَّهِ أَكْبَرُ ذَلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ) التوبة: ٧٢،

واتە: خوا بەڵێنی بەپیاوانی بڕوادارو ئافرەتانی بڕوادار داوە کە بیانخاتە چەند بەهەشتێکەوە کەڕووباریان بەژێردا دەڕۆن تێیان دا هەمیشەیین، وە چەند خانوو و بەرەیەکی خۆش لەچەند باغێکی هەمیشەییدا، وە ڕەزامەندییەك لەخواوە (لەوانەی گوتران) گەورەترە، ئا ئەوەیە بردنەوەو سەرفرازی مەزن.

بەڵگەی ئەوەش کە زیکری خوا مایەی ڕەزامەندی خوایە زۆرن، بۆ وێنە: (إِنَّ الْمُسْلِمِينَ وَالْمُسْلِمَاتِ وَالْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ وَالْقَانِتِينَ وَالْقَانِتَاتِ وَالصَّادِقِينَ وَالصَّادِقَاتِ وَالصَّابِرِينَ وَالصَّابِرَاتِ وَالْخَاشِعِينَ وَالْخَاشِعَاتِ وَالْمُتَصَدِّقِينَ وَالْمُتَصَدِّقَاتِ وَالصَّائِمِينَ وَالصَّائِمَاتِ وَالْحَافِظِينَ فُرُوجَهُمْ وَالْحَافِظَاتِ وَالذَّاكِرِينَ اللَّهَ كَثِيرًا وَالذَّاكِرَاتِ أَعَدَّ اللَّهُ لَهُمْ مَغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا) الأحزاب: ٣٥.

چونکە بێگومان خوا لەکەسانێك خۆش دەبێ و پاداشتی مەزنیان دەداتەوە کە لێیان ڕازی بێ.

شایانی باسیشە کە خوای پەروەردگار وەك چۆن فەرموویەتی: (ورضوان من الله اكبر) فەرمووشیەتی (وَلَذِكْرُ اللَّهِ أَكْبَرُ) العنكبوت: ٤٥،

بەڵێ (زیکر) کە لەهەموو طاعەتێك گەورەترە تەنانەت لەنوێژ بەرپاکردنیش،[٦٥] پاداشتی پڕ بەپێستیشی ڕەزامەندی خوایە کە ئەمیش لەهەموو پاداشتێك گەورەترە تەنانەت بەهەشتی ڕازاوەو نەبڕاوەش.

٢-گومانی تێدا نیە کە هەست کردنی مرۆڤ بەوە کە خوای پەنهان بین هەمیشە ئاگاداریەتی و چاودێری دەکات گەورەترین کاریگەری هەیە لەسەری بۆ ڕێك و ڕاست

---

[٦٥] چونکە ئایەتەکە ئاوایە (اتْلُ مَا أُوحِيَ إِلَيْكَ مِنَ الْكِتَابِ وَأَقِمِ الصَّلَاةَ إِنَّ الصَّلَاةَ تَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنْكَرِ وَلَذِكْرُ اللَّهِ أَكْبَرُ وَاللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَصْنَعُونَ) العنكبوت: ٤٥.

بوونیوزیاتر بەرەو خواچوونی، دەجا بێگومان بەردەوام بوونی ئینسان لەسەر یادی خواو لەهەموو حاڵەتە جۆراوجۆرەکان دا، ئەو هەستو نەستی چاودێری (مراقبة) خوا بەسەرخۆوە دیتنەی تێدا پەیدا دەکات، پێغەمبەریش ﷺ لەوەڵامی جوبرائیل دا کە دەربارەی (الأحسان) پرسیاری لێکردوە، فەرموویەتی: (أَنْ تَعْبُدَالله كأنك تراهُ فأن لم تكن تراهُ فأنّه يَراكَ) رواه مسلم.

٣-بەرهەمێکی دیکەی یادی خوا بریتیە لەزیادبوونو گەشەکردنی ئیمان، چونکە مسۆگەر زۆر باس کردنو یادکردنی خوا دەبێتە مایەی زیاتر خۆشویستنو چاکتر ناسینو پێئاشنابوونی، چونکە یادی خوا هەر بەهۆی ناوو سیفەتە بەرزو چاکەکانییەوە دەبێ، ئاشکراشە کە زۆر باسو یادکردنی ناوو سیفەتەکانی خوای پەروەردگاریش مایەی زیادبوونی خۆشویستنو ناسینو پەیپێبردنو ئاشنابوونیەتی، خوای پەروەردگار لەوبارەوە فەرموویەتی: (إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ اللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ آيَاتُهُ زَادَتْهُمْ إِيمَانًا وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ) الانفال: ٢، واتە: بڕواداران تەنیا ئەو کەسانەن کە کاتێك یادی خواکرا دڵیان ڕادەچڵەکێ، وە کاتێك ئایەتەکانییان بەسەردا خوێندرایەوە ئیمانیان زیاد دەکات، وەپشت بە پەروەردگاریان دەبەستن.

٤-بەرهەمێکی دیکەی یادی خوا سبحانە وتعالی ئەوەیە کە دەبێتە مایەی صەلات ناردنی خواو فریشتە بێهەڵەو پەڵەکانی بۆ بەندە خوا یادکەرەکانی، وەك فەرموویەتی:

(يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اذْكُرُوا اللَّهَ ذِكْرًا كَثِيرًا، وَسَبِّحُوهُ بُكْرَةً وَأَصِيلًا، هُوَ الَّذِي يُصَلِّي عَلَيْكُمْ وَمَلَائِكَتُهُ لِيُخْرِجَكُمْ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ وَكَانَ بِالْمُؤْمِنِينَ رَحِيمًا) الاحزاب: ٤١-٤٣.

کەپێشتر باسمان کردو ڕوونمان کردەوە کە صەلاتی خواو فریشتەکانیشی دەبێتە هۆی قوتاربوونی ئینسان لە تاریکییەکانو گەیشتنی بەڕووناکی.

٥-بەرهەمێکی دیکەی زیکر ئەوەیە کە خوای بێ وێنەش یادی ئەو کەسە دەکات کەیادی دەکات: (فَاذْكُرُونِي أَذْكُرْكُمْ وَاشْكُرُوا لِي وَلَا تَكْفُرُونِ) البقرة: ١٥٢.

دیارە یادکردنی هەرکام لەخواو بەندەش لەقەدەر خۆیانەو جیاوازییەکەیان زۆر لەوەش گەورەترە کە بڵێین: نێوانیان ئاسمانو ڕیسمانە!

٦-وە بەهۆی یادکردنی خواوە خوای بەدەنگەوە هاتوو دە فریای ئینسان دێتو لەکاتی تەنگانەو لێقەومان دا دەستی دەگرێ، پێغەمبەر ﷺ لەوبارەوە فەرموویەتی:

(.. تَعَرَّفْ الى الله في الرَّخاءِ يَعْرِفْكَ في الشدَّةِ) رواه احمد عن ابن عباس وهو حديث صحيح.

واتە: لەکاتی خۆشیدا خوا بناسە ئەویش لەتەنگانەو سەغڵەتیدا لەفریات دێ.

٧- وه هەر كەسێك ئەهلی زیكر بێت‌و بەڕاستی‌و ساغی یادی خوا بكات، خوای بەخشەر چاكترو زیاتر لەوەی پێ‌دەبەخشێ كە بەو كەسانەی دەبەخشێ كە لێی دەپاڕێنەوە، وەك خوای پەروەردگار لەفەرمایشتێكی قودسی‌دا فەرموویەتی: (مَنْ شَغَلَهُ ذِكْرِي عن مَسْئَلَتي أَعْطَيْتُهُ أفْضَلَ ما أُعْطي السَّائلين) رواه البخاري والترمذي والدارمي والبيهقي وقال الترمذي: حَسَنٌ غريب، و ضَعَّفَهُ الالباني.[٦٦]

٨- وە بەرهەمێكی دیكەی یادی خوا ئەوەیە كەخوای بەخشندە خاوەنەكەی لەڕۆژی دوایی‌دا لەكاتێك دا كە جگە لەسێبەرو پەنای وی هیچ سێبەرو پەنایەكی دیكە نیە، دەخاتە ژێر سێبەری خۆیەوەو پەنای دەدات، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (سَبْعَةٌ يُظِلُّهُمُ اللهُ في ظِلِهِ يوم لاظِلَّ إلا ظِلَّهُ ... ورجُلٌ ذكر اللهَ خالياً ففاضت عَيْناهُ) متفق عليه، واتە: حەوت جۆرە كەس خوا لەڕۆژێك دا كە بێجگە لەسێبەرو پەنای وی هیچ سێبەرو پەنایەكی دیكە نیە، دەیانخاتە ژێر سێبەری خۆیەوە.... وە كابرایەك كە لەشوێنێك دا كەسی لەلا نیە یادی خوا بكات‌و چاوی فرمێكسیان پێ‌دابێت.

دوو: بەرهەمی یادی خوا لەبواری پەیوەندی لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ و فریشتەكان دا.

١-خۆشویستنی پێغەمبەری خوا ﷺ و شوێن كەوتنی لەسەر هەموو مسوڵمانان فەرزەو خوای كاربەجێ كردوویەتی بە بەڵگەو نیشانەی بڕوای‌بوون‌و خۆشویستنی خۆی، وەك فەرموویەتی: (قُلْ إِنْ كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ) آل عمران: ٣١، واتە: بڵێ: ئەگەر ئێوە خواتان خۆش دەوێ شوێنم بكەون خواش خۆشی دەوێن وە لەگوناحەكانتان دەبووری وە خوا لێبوردەو بە بەزەیی‌یە.

دەجا ئاشكرایە كە ئەگەر ئینسان لەهەموو حاڵەتە جۆراوجۆرەكانی ژیان‌و گوزەرانی‌دا ئەو زیكرانە بخوێنێ كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموونی‌و دیاری‌كردوون، ئەوە شوێن پێغەمبەر كەوتوەو هەمیشەش ئەو زاتە بەڕێزەی -ڕووحم فیدای ڕێبازەكەی بێت- لەبەرچاو دەبێت‌و لەخزمەتی‌دا دەبێت‌و، بێگومان بەئەندازەی نزیكیش لەو خۆشەویستەی خوا، مرۆڤ لەخوا نیزیك‌و لەلای خۆشەویست دەبێ.

٢-هەروەها لەسۆنگەی یادی خوا كردنەوە ئینسان دەبێتە هاودەم‌و هاونشینی فریشتە بەڕێزو پاكەكانی خوای پەروەردگار، وەك فەرموویەتی: (إِنَّ الَّذِينَ قَالُوا رَبُّنَا اللَّهُ ثُمَّ اسْتَقَامُوا تَتَنَزَّلُ عَلَيْهِمُ الْمَلَائِكَةُ أَلَّا تَخَافُوا وَلَا تَحْزَنُوا وَأَبْشِرُوا بِالْجَنَّةِ الَّتِي كُنتُمْ تُوعَدُونَ) فصلت: ٣٠،

---

[٦٦] بڕوانە: (الوابل الصيب) ص٨٩، پەراوێزی (محقق و مخرج).

واتە: بێگومان ئەوانەی دەڵێن: پەروەردگارمان خوایە، پاشان ڕاوەستاو دەبن، فریشتەکان دادەبەزنە لایان (و پێیان دەڵێن:) کە مەترسن و پەژارەتان نەبێ، وە موژدەتان لێبێ بەو بەهەشتەی کە بەڵێنتان پێدەدرا.

پێشتریش ئەو فەرموودەیەمان هێنا کە باسی فریشتەکان و کۆڕو مەجلیسەکانی زیکری تێدابوو، بەڵام تەنیا پێشەکییەکەیمان هێناو ئێستا بەتەواوی دەیهێنین، بەڵام لەبەرئەوەی زۆرە یەکسەر تەرجەمە کوردییە دەقاودەقەکەی دێنین:

{پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: خوا چەند فریشتەیەکی هەن کە لەنووسینی کردەوەی بەندەکان زیادن، لەڕێو بانان دەگەڕێن و هەوڵی دۆزینەوەی ئەهلی زیکر دەدەن، جا کاتێک کۆمەڵێکیان دیتنەوە کەیادی خوای بەرز بکەن، بانگی یەکتر دەکەن: وەرن بۆئەوەی مەبەست تان بوو، (فەرمووی: )[٦٧] جا بە باڵەکانیان هەتا ئاسمانی نیزیك (دنیا) دەوریان دەدەن، (فەرمووی: ) جا پەروەردگاری بەرزیان کەخۆیشی لەوان چاکتر دەزانێ لێیان دەپرسێ: ئەوە بەندەکانم چی دەڵێن؟ (فەرمووی: ) دەڵێن: بەپاکت دەگرن و بەگەورەت دەگرن و ستایشت دەکەن و پایە بەرزیت ڕادەگەیەنن، (فەرمووی: ) جا دەفەرموێ: ئایا منیان بینیوە؟ (فەرمووی: ) دەڵێن: نەو بەخوا نەیان بینیوی، (فەرمووی: ) دەفەرموێ: ئەدی ئەگەر دیتبایانم؟ (فەرمووی: ) دەڵێن: ئەگەر دیتبایانی چاکتر بەندایەتییان بۆ دەکردی و باشتر ستایشیان دەکردی و پایە بەرزیتیان ڕادەگەیاند، وە زیاتر بەپاکیان دەگرتی، (فەرمووی: ) جا دەفەرموێ: ئایا چیم لێداوا دەکەن؟! دەڵێن: بەهەشتت لێداوا دەکەن، (فەرمووی: ) دەفەرموێ: جا ئایا دیتوویانە؟ (فەرمووی:) دەڵێن: نە بەخوا ئەی پەروەردگار نەیان دیوە، (فەرمووی: ) دەفەرموێ: ئەدی ئەگەر دیتبایان؟ (فەرمووی: ) دەڵێن: ئەگەر دیتبایان زیاتر لەسەری سوور دەبوون و چاکتر داوایان دەکردو دڵ پێداچوونیان بۆی گەورەتر دەبوو، (فەرمووی:) دەفەرموێ: ئەدی لەچی پەنا دەگرن؟! دەڵێن لەئاگر، (فەرمووی:) دەفەرموێ: جا ئایا دیتوویانە؟ (فەرمووی: ) دەڵێن، نە بەخوا ئەی پەروەردگار نەیان بینیوە، (فەرمووی: ) دەفەرموێ: ئەی ئەگەر دیتبایان؟ (فەرمووی:) دەڵێن: ئەگەر دیتبایان چاکتر ڕایان دەکرد لێی وە زیاتر لێیدەترسان، (فەرمووی: ) دەفەرموێ: دەجا ئێوە بەشایەد دەگرم کە ئەوە من لێیان خۆش بووم، (فەرمووی: ) جا یەکێك لەفریشتەکان دەڵێ: فلانەکەسیشیان لەنێودایە کە لەوان نیە، بەڵکو پێویستییەکی هەبووەو هاتوە بۆ ئەوێ، فەرمووی: ئەوانە کۆڕێکن هەرکەسێك هەر لەگەڵیشیان دابنیشێ بێبەش نابێ}.

(بخاري و مسلم) لە (ابو هريرە) گێڕاویانەتەوە.

---

[٦٧] ئەو وشەی: فەرمووی (قال) نۆزدە (١٩) جاران دووبارە بۆتەوەو بەزیادیش دێتە بەرچاو.

## سێ: بەرهەمی یادی خوا لەبواری فەرمانبەری (الطاعة) دا

١- یەکەمین بەرهەمی یادی خوا لەبواری فەرمانبەری خوادا ئەوەیە کە دەبێتە چاکە بۆ نووسران و خراپە لێ لابران و پلە بۆ بەرزکرانەوەو لەوبارەوە چەندان دەق هەن، بۆ وێنە:

*(ابوهریرة) خوالێیڕازیبێ لەپێغەمبەری خواوە ﷺ گێڕاویەتەوە کە فەرموویەتی:

(هەرکەسێك لەڕۆژێك دا سەد جار بڵێ: (لا الـه الا الله وَحدَهُ لاشریك لَـهُ لَـهُ الملك ولَـهُ الحمدُ وهو علـى كل شيءٍ قدير) ئەوە بۆی بە بارتەقای پاداشتی ئازادکردنی دە کۆیلە دادەنرێ و، سەد (١٠٠) چاکەی بۆ دەنووسرێ و، سەد خراپەی لێ دەسڕدرێتەوەو لەو ڕۆژەیدا هەتا ئێوارە بۆیدەبێتە پەناو پارێزەر لەشەیطان...) (بخاري و مسلم) گێڕاویانەتەوە؛ پێشتریش چەند فەرموودەیەکمان لەوبارەوە هێنایەوە.

٢- بەرهەمێکی دیکەی یادی خوا بریتیە لەوە کە خاوەنەکەی لەگوناح و تاوان دەپارێزێ، وەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی: (إِنَّ الَّذِينَ اتَّقَوْا إِذَا مَسَّهُمْ طَائِفٌ مِنَ الشَّيْطَانِ تَذَكَّرُوا فَإِذَا هُمْ مُبْصِرُونَ) الأعراف: ٢٠١، واتە: ئەوانەی کە پارێزکاری دەکەن هەرکاتێك خوتخوتەیەکی شەیطانیان گەیشتێ، خوایان دێتەوە یادو یەکسەر دەبینن.

بەڵێ یادی خوا بەرچاوڕوونی لەئینسان دا پەیدا دەکات و وای لێ دەکات کە هەست بەفێڵ و پیلانەکانی بکات و دووچاری هەڵەو پەڵەی نەکات.

دیسان بەهۆی بەردەوام بوون لەسەر زیکر ئینسان دڵ و زمانی بەچاکەو طاعەتەوە ڕادێت و دڵ و مێشکی لەبیرو خەیاڵی پیس و بەدو زمانی لەغەیبەت و درۆ.. هتد پارێزراو دەبێ.

٣- هەروەها زیکری خواکردن جێگای زۆر لەکردەوە چاکەکان دەگرێتەوە، بەڵام ئەوان کەلێنی ئەم پڕ ناکەنەوە، چەند فەرموودەیەك بەڵگەی ئەوەن کە گوتمان، بۆ وێنە:

*(عن عبدالله بن بسر أن رجلاً قال: يا رسول الله إنَّ أبواب الخَيْر كثيرة ولا أستطيعُ القيام بكلها فاخبِرْني بشيء أَتَشبَّثُ بهِ، ولاتُكثِرْ عليَّ فأنُسى، قال: لايَزالُ لِسانك رَطْباً بذكرالله تعالى) رواه الترمذي واحمد وابن ماجة وصححه ابن حبان والحاكم و وافقه الذهبي.[68] کەپێشتر هێناومانەو تەرجەمەمان کردوە.

*ئەو فەرموودەیەی کە (بخاري و مسلم) لە (ابوهريرة) یان گێڕاوەتەوەو نێوەڕۆکەکەی ئەوەیە کە هەژارە کۆچکەرەکان (فقراء المهاجرين) دەچنە لای پێغەمبەر ﷺ و سکاڵای ئەوەی لەلادەکەن کە خاوەن ماڵ و سامانەکان (اهل الدثور) پلە بەرزەکانی بەهەشت بۆ خۆیان دابین دەکەن چونکە وێڕای نوێژو ڕۆژوو کە هەژارو دەوڵەمەند تێیان دا بەشدران، ئەوان ماڵ و سامانیشیان هەیە کە حەج و عومرەی پێدەکەن و جیهادی پێدەکەن و خێراتی پێدەکەن! ئەویش پێیان دەفەرموێ: (ألا أُعَلمكُمْ شَيْئاً تُدْرِكون به مَنْ سَبَقَكُمْ وتَسْبِقون بـهِ مَـنْ

---

[68] بڕوانە: (الوابلُ الصَّيِّبُ) ص٧٦، پەراوێزی (محقق ومخرج).

بعدكُمْ ولايكون أفضل منكم إلا مَنْ صَنَعَ ماصَنَعْتُمْ؟) ئایا شتێکتان پێ بڵێم که پێی دەگەنەوە ئەوانەی پێشتان کەوتوونەوەو پێشی پێش ئەوانە دەکەونەوە کە لەدواتانەوەن، وە هیچ کەس لەئێوە چاکتر نابێ مەگەر یەکێك کە وەك ئێوە بکات؟! گوتیان: با ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی، دوای هەر نوێژێك ی فەرز (سُبحان الله) و (الحمدلله) و (الله اکبر) بکەن.

٤-وە یادی خوا کردن ڕووح و ئامانجی سەرجەم خواپەرستییەکانە وەك پێشتریش ڕوونمان کردۆتەوەو چەند دەقێکمان لەسەر هێناونەوە، وەك:

(وَأَقِمْ الصَّلَاةَ لِذِكْرِي) طه: ١٤، وە مایەی سەرفرازیو بەختەوەرییە لەدنیاو دوا ڕۆژدا: (... واذكروا الله كثيراً لعلكم تفلحون).

٥-هەروەها یادی خوا بناغەی دۆستایەتیکردنی خوای پەروەردگارو فەرمانبەری بۆکردنیەتی، چونکە بەندە هەتا خوای خۆش نەوێت یادی ناکاتو، لەئەنجامی نەبوونی یان کەم بوونی خۆشەویستییەوەش لەبیری دەکاتو لێی بێئاگا دەبێت.

٦- وەیادی خوا طاعەتێکە کەئینسانی مسوڵمان بەهۆی وییەوە پێش خەڵکی دەکەوێتەوە وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (سَبَقَ المفردون، قالوا: وما المفرَّدون يا رسول الله؟! قال: الذاكرون الله كثيراً والذاكرات) رواه مسلم والترمذي، کەپێشتریش هێناومانەو تەرجەمەشمان کردوە.

٧- بەرهەمێکی دیکەی یادی خواکردن لەبواری فەرمانبەریکردنی خوای بەخشندەدا ئەوەیە کە خاوەنەکەی دڵنیا دەکات لەوە کە مۆری دەغەڵی (نفاق)ی بەنێوچاوانەوە بنرێ چونکە خوای کاربەجێ دەربارەی دەغەڵەکان فەرموویەتی: (إِنَّ الْمُنَافِقِينَ يُخَادِعُونَ اللَّـهَ وَهُوَ خَادِعُهُمْ وَإِذَا قَامُوا إِلَى الصَّلَاةِ قَامُوا كُسَالَى يُرَاءُونَ النَّاسَ وَلَا يَذْكُرُونَ اللَّـهَ إِلَّا قَلِيلًا) النساء: ١٤٢، واتە: بێگومان دەغەڵەکان دەیانەوێ خوا بخەڵەتێنن! بەڵام ئەو فریویان دەدات، وەکاتێك بۆ نوێژ هەڵدەستن بەتەنبەڵی هەڵدەستن، وە بەکەمی نەبێ یادی خوا ناکەن.

٨- هەروەها بەرهەمێکی دیکەی یادی خواکردنو زۆر خوا لەیادبوون ئەوەیە کە خاوەنەکەی لەڕۆژی دواییدا دووچاری پەشیمانیو خەفەت خواردن نابێت، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَنْ قَعَدَ مَقْعداً لم يذكرالله فيه كانت عليه من الله تِرَةٌ، وَمَنْ إضْطَجَعَ مَضْجِعاً لَمْ يذكر الله فيه كانَتْ عليه من الله تِرَةٌ) وفي رواية: (وكان لهم حَسْرَةٌ) رواه ابوداود واحمد وهو صحيح.

واتە: هەرکەسێك لەشوێنێك دابنیشێو یادی خوای تێدا نەکات ئەوە خوا بەبواردنو کەموکووڕی لەسەری حیساب دەکات،وە هەرکەسێك لەجێیەك دا ڕابکشێ کە یادی خوای تێدا نەکات خوا بە بواردنو کەمو کووڕی لەسەری حیساب دەکات.

وشەی (حَسْرَة) یش بەمانای خەفەتو داخو پەشیمانی دێ.

چوار: بەرهەمی یادی خوا لەبواری خزمەت پێکردنی عەقڵو دڵو جەستەدا:

١-یەکەمین بەرهەمی یادی خوا لەبواری خزمەت پێکردنی دڵو دەروونو عەقڵو جەستەدا، ئەوەیە کە دەبێتە مایەی ئۆخژن و ئارامی دڵو دەروون، وەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی:

(الَّذِينَ آمَنُوا وَتَطْمَئِنُّ قُلُوبُهُمْ بِذِكْرِ اللَّهِ أَلَا بِذِكْرِ اللَّهِ تَطْمَئِنُّ الْقُلُوبُ) الرعد: ٢٨،

واتە: ئەو کەسانەی کە بڕوایان هێناوەو بەیادی خوا دڵیان ئارام دەگرێ، بزانن کە تەنیا بەیادی خوا دڵان دادەمرکێنو ئارام دەگرن.

بەڵێ ئەو شتەی کە بەڕاستی ئۆخژنو تەسەللای دڵی مرۆڤ دێنێ تەنیاو تەنیا بەندایەتی بۆ خوایە کە یادکردنیو هەمیشە دڵ پێوە پەیوەست بونی گرنگترینو سەرەکیترین حاڵەتو شێوەی دەرەوشانەوەو بەرجەستە بوونیەتی.

وە بێگومان لەکاتێك دا ئینسان دڵ بەغەیری خوا دەبەستێو هۆگری دەبێو دەبێتە خولیاو ئاواتو هیوای ئەوە لەحاڵەتێکی نەخۆشو پەشێوی دەروونی دایەو دووچاری لادان (إنحراف) بووە، وەك خوای پەنهان بین لەبارەی بێبڕواکانەوە فەرموویەتی:

(إِنَّ الَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَاءَنَا وَرَضُوا بِالْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَاطْمَأَنُّوا بِهَا وَالَّذِينَ هُمْ عَنْ آيَاتِنَا غَافِلُونَ، أُولَئِكَ مَأْوَاهُمُ النَّارُ بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ) یونس: ٧-٨، واتە: بێگومان ئەوانەی ئومێدەواری دیدارمان نینو ژیانی دنیایان پەسندکردوەو دڵیان پێ بەستوەو ئەوانەی کە لە ئایەتەکانمان بێئاگان. ئەوانە جێگایان ئاگر - ی دۆزەخ - ە بەهۆی ئەوجۆرە هەوڵو تەقەللایانەیانەوە کە داویانەو ئەو بەرهەمەی کە دەستیان خستوە.

بەڵێ خوێنەری بەڕێز ! هەروەك چۆن کرمی ئاوریشم هەریەلیکی خۆی بەدەوری خۆیدا قۆزاخەیەك دەچنێو دروست دەکات کە پاشان تێیدا دەمرێو بۆی دەبێتە گۆڕو حەپس خانە، بێبڕوایانیش هەر بەو هەوڵو ڕەنجە زۆرو بێکاکڵەی کە داویانە ڕەنجەڕۆ دەبنو هەر ئەو دەستکەوتەیان دەبێتە مایەی مەینەتیو نەگبەتییان!!

٢- بەرهەمێکی دیکەی یادی خواش لەبواری ناوبراودا ئەوەیە کە بابای خوا لەیاد بەئەندازەی خوا لەیادبوونەکەی هەم دڵو دەروونیو هەم ڕوو و دیمەنی ڕۆشن دەبێ، جارێ بۆ ڕۆشن بوونەوەی دڵو دەروون بەهۆی زیکرەوە ئەوەندە بەڵگەیە بەسە کە خوای پەروەردگار ناوی لەشەیطانی خوتخوتەکەر (الوسواس) ناوە خۆپەنهانکەر (الخنّاس)، چونکە وەك لەوەسفیدا گوتراوە:[٦٩] (اذا غَفَلَ وسوس واذا ذكَرالله خنَسَ)

---

[٦٩] عن ابن عباس عن النبي ﷺ انه قال: (الشيطان جاثمٌ على قلب ابن آدم فاذا ذكرالله تعالى خَنَسَ واذا غَفَلَ وسوس) رواه البخاري معلقاً، بڕوانە: (في ظلال القرآن) ج٨ ص٧١٣.

واته: هەرکاتێك ئینسان لەخوا بێئاگابوو خوتخوتەی بۆ دەکات، بەڵام ئەگەر یادو باسی خوای کرد خۆی پەنهان دەکات! کەواتە شەیطان دزو ماڵبڕێکە کە دەرفەتی لە تاریکی وەردەگرێو بەهۆی ڕۆشنایی و ڕووناکی‌یەوە دزی‌و ماڵبڕینەکەی سەرناگرێ!

دەربارەی گەش‌و ڕوون بوونی دیمەن‌و ڕووش بەهۆی یادی خواوە هەم شتێکی بەرهەست (محسوس) و تەجرەبە کراوەو هەم چەند دەقێکیش ئاماژەی پێ‌دەکەن، بۆ وێنە: (سِيمَاهُمْ فِي وُجُوهِهِمْ مِنْ أَثَرِ السُّجُودِ) الفتح: ٢٩، جا وەك چۆن سەجدە بۆ خوا بردن نیشانە لەدەم‌وچاوی بڕواداران دا پەیدا دەدات زیکری خواو هەر طاعەتێکی دیکەش هەر وایە.

هەروەها لەفەرموودەیەکی (مُرْسَلْ)دا لەپێغەمبەرەوە ﷺ هاتوە: (مَنْ قال كُلَّ يومٍ مائةَ مَرَّةٍ: لا اله الا الله وحده لاشريك لهُ، لهُ الملك ولهُ الحَمْدُ يحي ويميت بيده الخير وهُوَ عَلى كُل شيئ قدير، أتى الله تعالى يوم القيامة و وجهه أشد بياضاً من القمرِ ليلة البدرِ)[٧٠]

٣-هەروەها یادی خوا خۆراك‌و بژێوی دڵ‌و گیانە، چونکە خوای بەدیهێنەر ڕوونی کردۆتەوە کە ئینسانی لەخاك (تراب) و گیان (روح)یێك کە تایبەتە بەخۆیەوە دروست کردوە، وەك فەرموویەتی: (إِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَائِكَةِ إِنِّي خَالِقٌ بَشَرًا مِنْ طِينٍ، فَإِذَا سَوَّيْتُهُ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِنْ رُوحِي فَقَعُوا لَهُ سَاجِدِينَ) ص:٧١-٧٢.

جا ئەو بەشەی مرۆڤ کە لە خاك دروست بووە کە جەستەکەیەتی خۆراك‌و بژێوەکەیشی هەر لەخاك پەیدا دەبێ بەڵام ئەو بەشە کە لەخواوەیەو پەیوەندی‌یەکی تایبەتی بەخواوە هەیە، ئەوە بێگومان خۆراك‌و بژێوەکەیشی هەروەك خۆیەتی .

٤- وە زیکری خواکردن مایەی هێزو پێزی مەعنەوی‌و ماددی‌یە لەڕووح‌و جەستەی ئینسان دا، کە ئەم مەسەلەیەش وێڕای هەست پێ‌کران‌و تەجرەبەکرانی چەند دەقێکی سوننەتیش ئاماژەی پێ‌دەکەن بۆ وێنە:

*ئەو فەرموودەیەی کە (بخاري و مسلم و ابوداود و ترمذي واحمد) لە (علي بن أبي طالب)یان خوالێی‌ڕازی‌بێ گێڕاوەتەوە، کە کاتێك خۆی‌و (فاطمة)ی هاوسەری خوالێی‌ڕازی‌بێ داوای دابین کردنی خزمەتکار (خادم) یکیان لەپێغەمبەر ﷺ کرد کە بۆ ئیش‌وکاری ماڵێ یارمەتی‌یان بدات چونکە عەلی بەئاوهەڵهێنجان‌و فاطیمە بەدەستاڕ بادان‌و خزمەتی ماڵ ماندوو بوو ون! پێغەمبەر ﷺ پێی فەرموون کە هەر شەوێك چوونە سەر جێگا سی‌وسێ (٣٣)جار (سبحان الله) و سی‌و سێ‌جار (الحمدالله) و سی‌وسێ‌جار (الله اكبر) بکەن، وە فەرمووی: (إنه خيرٌ لكما من خادمٍ) ئا ئەوە بۆ ئێوە لەخزمەتکار چاکترە.

---

[٧٠] بڕوانە: (الوابل الصَّيب) ص ١٦٥، فەرموودەی (مُرْسَلْ)یش ئەوەیە کە ئەو هاوەڵ (صحابی)ەی کە لەپێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاویەتیەوە ناوی نەهاتبێ.

دیاره ئەم فەرموودەیە بەئاشکرا ئەوە دەگەیەنێ کە زیکری خوا دڵو دەروونو جەستەی ئینسان لەئاقار گرفتاریو ڕەنجو ماندووبوون بەهێزو پتەو دەکات.

٥-سەرجەم زاناو پسپۆڕانی بواری تەزکیەو عیرفان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە دڵو دەروونی ئینسانیش وەك ئاسنو مسو کانزایەکانی دیکە ژەنگ دەگرێو ژەنگ و ژارەکەیشی وەك (ابن القیم) گوتوویەتی:[٧١] بەهۆی دوو شتانەوەیە:

ا- گوناح کردن     ب-بێئاگایی لەخوای بێوێنە،

خوای بەرزو مەزنیش فەرموویەتی: (وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِلْمُكَذِّبِينَ، الَّذِينَ يُكَذِّبُونَ بِيَوْمِ الدِّينِ، وَمَا يُكَذِّبُ بِهِ إِلَّا كُلُّ مُعْتَدٍ أَثِيمٍ، إِذَا تُتْلَى عَلَيْهِ آيَاتُنَا قَالَ أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ، كَلَّا بَلْ رَانَ عَلَى قُلُوبِهِمْ مَا كَانُوا يَكْسِبُونَ) المطففين: ١٠-١٤،

واتە: سزای سەخت لەو ڕۆژەدا بۆ بەدرۆزانان، ئەوانەی کەڕۆژی سزاو پاداشت بەدرۆ دەزانن، وە جگە لەهەموو لەڕێلادەرێکی گوناحکار کەس بەدرۆی نازانێ. کاتێك ئایەتەکانمانی بەسەردا بخوێندرێتەوە دەڵێ: ئەفسانەی پێشینانە! نەخێر بەڵکو کردەوە (خراپە) کانیان ژەنگو کەمرەی لەسەر دڵیان پەیدا کردوە.

ئاشکراشە کە چارەسەری گوناحەکان تۆبەیەو هی بێئاگایی (غفلة)یش بریتیە لەیادکردنی خوای تاكو پاك.

هەروەها لەپێغەمبەریش ﷺ گێڕراوەتەوە[٧٢] کە فەرموویەتی: (لكلّ شيئٍ صِقالَةٌ وإنَّ صِقالَةَ القلوبِ ذكرالله عز وجلّ) رواه البیهقي عن عبدالله بن عمرو بن العاص مَرفوعاً، واتە: هەموو شتێك (کەژەنگ دەگرێ) صاف کەرەوەیەکی هەیە، جا صافو ڕوون کەرەوەیی دڵانیش یادی خوای زاڵو پایەدارە.

٦-هەروەها بەهۆی زیکرەوە ئینسان لەبێئاگابوون لەخوا دەپارێزرێ، کە بێگومان لەخوا بێئاگابوونو خوا لەبیرچوون سەرچاوەو ماکی کوفرو نیفاقو گوناحو تاوانەکانە هەربۆیەش خوای کاربەجێ ڕایگەیاندوە کە لەخوا بێئاگابوونو فەرامۆش کردنی پیشەی دەغەڵو بێبڕوایانەو زادەو دەستکەوتی شوومی بەسەر ئینسان دا زاڵبوونی شەیطانە، وەك فەرموویەتی: (الْمُنَافِقُونَ وَالْمُنَافِقَاتُ بَعْضُهُمْ مِنْ بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِالْمُنْكَرِ وَيَنْهَوْنَ عَنْ الْمَعْرُوفِ وَيَقْبِضُونَ أَيْدِيَهُمْ نَسُوا اللَّهَ فَنَسِيَهُمْ إِنَّ الْمُنَافِقِينَ هُمْ الْفَاسِقُونَ) التوبة: ٦٧.

---

[٧١] بڕوانە: (الوابل الصَّیبْ) ص٨٢.

[٧٢] هەمان سەرچاوە، ص٨١، بۆیەش بەتەعبیری (گێڕراوەتەوە – رُوِيَ) هێناومە چونکە فەرموودەکە لاوازە (ضعیف) ەو زانایانیش ئەوجۆرە تەعبیرەیان بۆ فەرموودەی بێهێز داناوە.

واته: مونافیقە نێرو مێیەکان هەندێکیان لەهەندێکیانن فەرمان بەخراپە دەکەنو ڕێ لەچاکە دەگرن وە دەستیان لەچاکەو خێر دەگرنەوە، خوایان لەیاد کردوەو خواش فەرامۆشی کردوون بێگومان دەغەڵەکان لەڕێ دەرچوانن.

دیسان خوای دادگەر لەسیاقی ئەو ئایەتانەدا کە لەبارەی ئەو مونافیقانە دەدوێن کە لەگەڵ جوولەکەکان (قوماً غَضِبَ اللهُ علیهم) دا کەینو بەینیان دژی ئەهلی ئیسلام هەبووە فەرموویەتی: (...اسْتَحْوَذَ عَلَيْهِمْ الشَّيْطَانُ فَأَنسَاهُمْ ذِكْرَ اللَّهِ أُوْلَئِكَ حِزْبُ الشَّيْطَانِ أَلَا إِنَّ حِزْبَ الشَّيْطَانِ هُمُ الْخَاسِرُونَ) المجادلة: ١٩.

واتە: شەیطان خستوونیەتە ژێر ڕکێفی خۆیەوەو یادی خوای لەبیر بردوونەتەوە، ئەوانە پێڕی شەیتانن، بزانن کەپێڕی شەیطانن زیانباران.

لەو ئایەتانەشەوە دەفامرێتەوە کە وەك چۆن یادو باسی خوای پەروەردگار خەسڵەتو درووشمو نیشانەی مسوڵمانانو کۆمەڵی خوایە، خوا لەبیرچوون لەخوا بێئاگابوونیش خەسڵەت و نیشانەی کافرو مونافیقەو دەستەو تاقمی شەیطانە.

٧- بەرهەمێکی دیکەی یادی خواش بریتییە لە وەدەست هێنانو بەهێزکردنی خەسڵەتی ناوبراوکە ڕۆڵێکی یەکجار گرنگ دەگێڕی لەژیانی مرۆڤدا و بەپێچەوانەوەش نەبوونو لەدەست دانی کاریگەرییەکی یەکجار سەلبی هەیە.

دکتۆر (أحمد عزت راجح) دەربارەی نەخۆشی بیرو زەین بڵاوی و پەرت بوون کە پێچەوانەی بیر چەسپاندنە گوتوویەتی:[٧٣] {پێویست بەڕوونکردنەوە ناکات کەزەین بڵاویو بیر پەرت بوون ئەگەر بوو بە خوویەکی چارەسەر نەکراو چەندان شوێنەوارو ئەنجامی بەدو دڵتەزێنی دەبن، وە زۆر لەخوێندکاران دەڵێن: ئەو نەخۆشییە هۆیەکی سەرەکیو بنەڕەتی بووە لەدواکەوتنو کەوتن (رسوب) ی جار لەدوای جاریان، ئەمەو جگە لەوەش خووی گۆڕین دەبێتە هۆی هەست کردن بەناتەواویو هەست کردن بەدەستەوەستانی لەئاقار خۆ چارەسەرکردن دا، بگرە تەنانەت ڕق لەخۆ هەستانیش }

ئنجا ئایا چۆن چۆنی یادی خوا تبارك وتعالی دەبێتە هۆی چارەسەری نەخۆشی بیرپەرتیو زەین بڵاوی؟ ئەوە دیسان دکتۆر (عزت احمد راجح) دەڵێ:[٧٤] {ئەوانەی کە سەبارەت بە کەم توانایی بیر چەسپاندنو وریایی سکاڵا دەکەن، جا قوتابی بن یان نا، گیروگرفتیان ئەوە نیە کە یەکجاری بێدەستەڵات بنو نەتوانن بیریان کۆبکەنەوە بەڵکو

---

[٧٣] بڕوانە: (أصول علم النفس) ص١٨٤، ط: مزيدة ومنقحة.

[٧٤] هەمان سەرچاوە، ص١٨٣.

گرفتەکەیان ئەوەیە که بیرو زەینیان دەڕوات,دڵغە بە چەند شتێکەوە لێ‌دەدەن کە لەلایان لەو شتەی لەبەردەمیانەو دەیانەوێ بیری خۆیانی لەسەر کۆبکەنەوە خۆشەویست ترن، وە هیچ شتێك کە یارمەتی زەین چەسپاندنو بیرکۆکردنەوە بدات بۆ بابەتێکی دیاری‌کراو، وەك هەبوونی مەیلو ئارەزوو و بایەخ پێدانو خۆشەویستی لەدڵ دا دەربارەی بابەتەکە}.

ئنجا ئاشکراشە کە هەموو ئەو هۆکارو پاڵنەرانە بەچاکترین شێوە لەزیکری خوادا هەن.

(ولیم مۆلتۆن)یش دەربارەی شێوازو میکانیزمی دەستگیرکردنی خەسڵەتی ناوبراودا گوتوویەتی:[٧٥] (وە پەیداکردنی توانای بیر چەسپاندن پێویستی بەڕاهێنانو پلە پلەیی هەیە، خۆڕاهێنانیش پێویستی بەپشوو درێژیو خۆڕاگری هەیە، چونکە قوتاربوون لەزەین بڵاویو بیر کۆکردنەوەو چەسپاندن بەرهەمی هەوڵو ڕەنج کێشانێکی زۆرو بەردەوامە، جا ئەگەر بتوانی پەنجا کەڕەت سەد کەڕەت زەینت بگێڕیەوە سەر ئەو بابەتەی بڕیاری چارەسەرکردنیت داوە جار لەدوای جار، دەبینی ئەو داڵغەو خەیاڵانەی کە لەمێشکت دا چەنگە پرچەیان بوو و دەهاتنو دەچوون، زۆر ناخایەنێ شوێنی خۆیان چۆڵ دەکەن بۆ ئەو مەبەستو بابەتەی کە هەڵت بژاردووەو بڕیارت لەسەر داوەو مشوورت لێی خواردوە. ئنجا دەبینی وات لێ‌هاتوە کە هەر کاتێك بتەوێ بیرت بچەسپێنی بەگوێرەی ویستی خۆت دەتوانی).

وەك دەبینین بەپێی قسەی زانایانی دەروونناس بۆ پەیدابوونی خەسڵەتی بیرو زەین کۆکردنەوەو چەسپاندن دوو شت پێویستن:

*أ- هەبوونی ڕەغبەتو خۆشەویستیو بایەخ پێدان.*

*ب-خۆڕاهێنانو بەردەوامی دووبارەو چەند بارە کردنەوەی گێڕانەوەی بیرو زەین بۆ سەر مەبەستی دیاری‌کراو.*

دەجا بێگومان هەرکام لەو دوو مەرجەش لەزیکری خوادا هەن، چونکە، یەکەم: یادی خواکردن زادەو بەرهەمی زێدە خۆشویستن و بەگەورەو پاكوبەرزو مەزن گرتنی خوای پەروەردگارە، دووەم: ئامادە بوونی بیرو زەینو دڵ بێداری (حضور القلب) دووبارەکردنەوە (تکرار) یش پێکهێنەری هەرە گرنگو بنەڕەتی‌یەتی.

---

[٧٥] بڕوانە: (روح الصلاة) عفيف عبدالفتاح طبارة، ص٣٢، ط١١. وە بۆ هەرسێکیان بڕوانە: (یادی خودا) بەرگی یەکەم، لاپەڕە ١٦٧تا ١٧٢.

٨- وه لەكۆتاییدا بەرهەمێكی زێدە گەورە و گرنگی یادی خوا كردن بریتییە لەپارێزرانی خاوەنەكەی لەزۆربەی زۆری دەردو نەخۆشییە عەقڵیو دەروونیو جەستەیییەكان، وەیارمەتیدانی بۆ چارەسەرو لێقوتار بوونیان ئەگەر پێیانەوە گیرۆدە بووبێ، خوای دادگەر لەوبارەوە فەرموویەتی: (.. فَمَنْ اتَّبَعَ هُدَايَ فَلا يَضِلُّ وَلا يَشْقَى، وَمَنْ أَعْرَضَ عَنْ ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنكًا) طه:١٢٣-١٢٤، واتە: جا هەر كەسێك بكەوێتە شوێن هیدایەتی من ئەوە نەلەرێ ون دەبێت نە ژینتاڵ دەبێ، وە هەركەسێك پشت لەیادی من بكات ئەوە بێگومان ژیانێكی تەنگو تاڵی دەبێ...

دیارە ئەو ژیانو گوزەرانە (سەختو تەنگو دژوار)[٧٦] ە كە بابای بێدینو لاڕێو پشت لە بەرنامەو زیكری خوا كردوو تووشی دەبێ سێ شتان هەڵدەگرێ:

*ا- نا ئارامی دڵو دەروونو هەست نەكردن بەئاسوودەییو ئۆخژن.*

*ب- خۆرانەگرىو پشوو سواربوونو تێشكان لەبەردەم گرفتو نارەحەتییەكان دا.*

*ج- پەیدابوونو سەرهەڵدانی چەندان نەخۆشی دەروونیو عەقڵی كە بەهۆی وانیشە جەستە دووچاری چەندان دەردو نەخۆشی دەبێت.*

ئنجا لەراستیدا ئەم سێ شتانەش زۆر پێكەوە پەیوەستنو، وەك چۆن سێیەم زادەو ئەنجامی دووەمە، دووەمیش بەهۆی یەكەمەوە سەرهەڵدەدات.

جا هەرچەندە ئەوەی گوترا زۆر ئاشكراو روونە بەلام با بۆ دڵنیایی زیاتریش چەند قسەیەكی دەروونناسانیش لەوبارەوە بنێینەوە:

__یەكەم:__ (ویلیام جیمز) مامۆستای فەلسەفە لەزانكۆی (هارفارد) گوتوویەتی:[٧٧]

(كاریگەرترین دەرمانی سارێژكردنی خەمو پەژارەو نیگەرانی، بریتییە لەو عەقیدەو بڕوایەی كەئایین فەرمانی پێدەكات).

__دووەم:__ (دایل كارنیجی) گوتوویەتی:[٧٨] (ئەمڕۆ نوێترین زانیاری، واتە زانیاری دەروونناسی (علم النفس) ئەو رێڕونییانە فێری خەڵكی دەكات كە پێغەمبەران عليهم الصلاة والسلام رایان دەگەیاندن، بۆچی؟ چونكە دەروونناسان بۆیان دەركەوتوە كەپارانەوەو

---

[٧٦] بروانە: تەفسیری (البیضاوي) ج٢ص٦٤، كە (ضَنْكاً)ی ئاوا لێك داوەتەوە.

[٧٧] بروانە: (یادی خوادا) بەرگی یەكەم، لاپەرە: ١٠٨، ١٠٩.

[٧٨] بروانە: (یادی خودا) بەرگی یەكەم، لاپەرە: (١٠٩-١١٠).

نوێژو بڕوای پتەو بەئایین، خەمو پەژارەو زەین بڵاویو هەڵچوونو ترس.. لەدڵو دەروونی مرۆڤ دا ناهێڵێت).

**سێیەم:** (بوول ئەرنست ئەدۆلف) مامۆستای یاریدەدەر لەتوێکاری (تشريح)دا لەزانکۆی (سانت جۆنس) یش لەوبارەوە دەڵێ:[79] (... من لەماوەی کارکردنم لە بواری پزیشکیدا بۆم دەرکەوتوە کە چەکدار بوونم بەلایەنی مەعنەوی وێڕای شارەزاییم لەچارەسەرکردنی هەموو نەخۆشییەکان دا یاریدەم دەدات، بەچارەسەرێکی وا کە پیتو فەڕی پێوە دیارە، بەڵام ئەگەر بێتو مرۆڤ پەروەردگاری فەرامۆش بکات، ئەوە ڕەنجو هەوڵەکان نیوەچڵ بگرە کەمتریش دەبن.

زۆربەی نەخۆشییەکانی گەدە پەیوەندییان بەو شتانەوە کە ئینسان دەیانخوات بەڵکو پەیوەندییان بەو شتانەوەیە کە دڵو دەرونی دەیانخوات، بۆیە پێویستە ئەو جۆرە نەخۆشانە بەر لەهەر شتێك ڕقو قینو خەمو ناسۆرو پەژارەکانیان کە لە دڵو دەروونیان دان چارەسەر بکرێن، با چاو لەو پێغەمبەرانە بکەین کە دووعایان بۆ ناحەزەکانیان دەکرد، چونکە هەرکاتێك دڵو دەروونیان پاكو ساف بۆوە، ئەوە مسۆگەر ڕێی چارەسەر دەگرنە بەر.. جا ئەگەر بێتو ترسو دوو دڵیو دڵە ڕاوکە (قلق) لەسەر بنچینەی پتەوکردنی بڕوا بەخوا بوونی ئینسان چارەسەر بکرێن، ئەوە چاکبوونەوەو تەندروستی بۆ گەڕانەوەی ئینسان بەجۆرێکیوا ڕوودەدات، لەزۆر حاڵان دا وەك جادوو (سحر) دەچێ.. جەستەی مرۆڤ لەکاتێك دا لەگەڵ بەدیهێنەرو پەروەردگاریدا پەیوەندییەکی ڕێكو پێکی دەبێت لەباشترین حاڵ دا دەبێ، بەڵام بەبێ ئەوە تێکچوونو دەردەدارییمان تووش دەبێت).



**چوارەم:** چەند زانایەکی پسپۆڕی دەروونناس تێکڕای ئەم تێکچوونو نەخۆشییانەی خوارەوە بە زادەو هەڵقوڵاوی حاڵەتە دەروونییە ناتەواوەکانو نەخۆشییەکانی دەزانن:

١-تێکچوونی کۆئەندامی سووڕی خوێن.

٢-بەرزبوونەوەی پەستانی خوێن (إرتفاع ضغط الدم).

٣-سەرئێشەی نیمچەیی (الصداع النصفي).

---

[79] سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە: (١١١، ١١٢).

٤-تێکچوونی کۆئەندامی هەرس ( إضطراب جهاز الهضم).

٥-قەڵەوی.

٦-خواردن پێنەخوران.

٧- برینداری گەدە (قرحة المعِدة).

٨-تێکچوونی کۆئەندامی هەناسەدان.

٩-تێکچوونی کۆئەندامی ئێسکی و ماسوولکەیی، ڕۆماتیزمی جومگەکان، ئازاری پشت، ماسوولکە گرژبوون (تشنج العضلات).

١٠- تێکچوونی کۆئەندامی دەمار (الجهاز العصبي).

١١-تێکچوونی کۆئەندامی زاووزێ.

١٢- نەخۆشی‌یەکانی پێست (الأمراض الجلدية).

١٣-نەخۆشی شێرپەنجە.

١٤- نەخۆشی ڕیخۆڵەی گەورە.

١٥-تێکچوونی لوو (ڕژێن)ەکانی نێوەوەی لەش.[٨٠]

کەواتە: بەڵێ ڕاستە پارێزرانی ئینسان لەدەردو نەخۆشی‌یە دەروونی‌و عەقڵی‌و جەستی‌یەکان یەکێکی دیکەیە لەزادەو بەرهەم‌و دەستکەوتە گەورەو گرنگەکانی زیکری خوا تبارك وتعالى.



[٨٠] بڕوانە: (الأنسان ذلك المجهول) الكسيس كاريل، ص١١٧، وە: (النفس: إنفعالاتها، أمراضها، علاجها) د. علي كمال، ص٣٦٩، وە: (أصول علم النفس) ص١٦٩، ١٧٠، وە: (الله يتجلى في عصر العلم) ص١٣٨، وە: (ارامش رواني ومذهب) ص١٦٧، د. صفدر صانعي. وە: (بهترين راه غلبه برنيگرانيها) ص٢٠٦، نگارش و إقتباس: محمد جعفر ، وە بڕوانە: (روح الدين الأسلامي) ص١٧٥، ط ١٨، عفيف عبدالفتاح طبارة، وە: (جَدِّدْ حياتك) محمد الغزالي ص٣٦.

پێنج: بەرهەمی یادی خوا لەبواری لەبەرانبەر شەیطان و دوژمنان دا وەستان و پێوێرانیان دا:

١-یەکەمین زادەو بەرهەمی زیکری خوای بەرزو بێوێنە لەم بوارەدا ئەوەیە کە شەیطان زەفەر بەدڵ و دەروونی کەسێك نابات کەبەڕووناکی ئیمان ڕۆشن بۆتەوەو بەیادی خوا ئاوەدان کراوەتەوە، وەك پێشتریش ئاماژەمان پێکرد، خوای پەروەردگار بەشەیطانی فەرمووە لەوەڵامی هەڕەشەو گوڕەشەکردنی‌دا لەبەندەکانی: (إِنَّ عِبَادِي لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَانٌ وَكَفَى بِرَبِّكَ وَكِيلاً) الاسراء: ٦٥، واتە: بێگومان تۆ بە بەندەکانی من ناوێری هەروەها فەرموویەتی: (فَإِذَا قَرَأْتَ الْقُرْآنَ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ، إِنَّهُ لَيْسَ لَهُ سُلْطَانٌ عَلَى الَّذِينَ آمَنُوا وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ) النحل: ٩٨-٩٩.

واتە: جا هەرکات قورئانت خوێند لەبەر شەیطانی نەفرین لێکراو پەنا بەرە بەرخوا، چونکە بێگومان ئەو دەستەڵاتی بەسەر ئەوانەدا نیە کەبڕوایان هێناوەو پشتیان بە پەروەردگاریان بەستوە.

٢- هەروەها زیکری خوا دەبێتە هۆی ئەوە کەشەیطان خۆراك و شوێنی حەوانەوەو خەوتنی لەلای ئینسانی خوا لەیاد چنگ نەکەوێ، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (إذا دَخَلَ الرجلُ بَيْتَهُ فذكر الله تعالى عند دُخُولِه وعند طَعامِه، قال الشيطانُ: لا مَبِيْتَ لكم ولاعَشاءَ...) رواه مسلم وابوداود وابن ماجة واحمد عن جابربن عبدالله رضي الله عنه. کە پێشتر هێناومانەو تەرجەمەشمان کردوە.

٣- وە زیکری خوا دەبێتە مایەی خۆڕاگری و پێچەسپان و بەدوژمن وێران لەکاتی ڕووبەڕووبوونەوەو جەنگ دا، وەك خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی: (يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا لَقِيتُمْ فِئَةً فَاثْبُتُوا وَاذْكُرُوا اللَّهَ كَثِيرًا لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ) الأنفال: ٤٥.

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە هەرکات بەرەنگاری کۆمەڵێك (لەدوژمنانتان) بوون چەسپاوو خۆڕاگرین، وە زۆر یادی خوا بکەن بۆئەوەی سەرکەوتوو و سەرفرازبن.

**شەش: بەرهەمی یادی خوا لەبواری برایەتی و یەکریزیدا**

١-هیچ گومانی تێدا نیە کە کەسانێك هەمیشە یادی خوا ویردی سەر زمانیان بێتو دڵیان بەیادی وی ئاوەدانو درەوشاوە بێت ناتوانن بەندە دڵسۆزو دۆستە نیزیکەکانی خوایان خۆش نەوێتو ئەرکو مافەکانی برایەتییان لەگەڵ دا جێبەجێ نەکەن!

خوای کاربەجێو بە بەزەیی لەوبارەوە بەپێغەمبەری کۆتایی ﷺ فەرمووە: (وَاصْبِرْ نَفْسَكَ مَعَ الَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ بِالْغَدَاةِ وَالْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُ وَلَا تَعْدُ عَيْنَاكَ عَنْهُمْ تُرِيدُ زِينَةَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَلَا تُطِعْ مَنْ أَغْفَلْنَا قَلْبَهُ عَنْ ذِكْرِنَا وَاتَّبَعَ هَوَاهُ وَكَانَ أَمْرُهُ فُرُطًا) الكهف: ٢٨،

واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ ئارام بگرەو لەگەڵ ئەوانەدا بمێنەوە کە بە بەیانیانو ئێواران لەپەروەردگاریان دەپاڕێنەوەو ڕوو (دیدار)ی وییان دەوێ، وە چاوتیان لێلامەدەو جوانیی ژیانی دنیات مەبەست بێ! وە بەقسەی کەسێك مەکە کە دڵیمان لەیادی خۆمان بێئاگا کردەوەو بەدوای ئارەزووی خۆی کەوتوە، وە کاری لەکار ترازاوە.

پێغەمبەریش ﷺ لەوبارەوە فەرموویەتی: (لَيَبْعَثَنَّ اللهُ أقواماً يوم القيامة في وجوهِهِمْ النورُ على منابرِ اللؤلؤ، يَغْبِطُهُمْ الناسُ، لَيْسوا بأنبياءَ ولا شُهداءَ، قال فَجثى أعرابيٌّ على رُكْبَتَيه، فقال يا رسول الله صفْهُمْ لَنا نَعْرِفَهُمْ، قال: المتحابُّونَ في الله من قبائل شَتىً وبلادٍ شتىً يَجْتَمِعون على ذكرِ الله يذكرونَهُ) اخرجه الطبراني في الكبير باسنادٍ حسنٍ.[81]

خوا لەڕۆژی قیامەتیدا چەند کۆمەڵێك زیندوو دەکاتەوە کە دەموچاویان ڕووناکی تێدایە لەسەر چەند دوانگەیەکی گەوهەری دادەنیشن، خەڵکی خۆزگەیان پێدەخوازن، نە پێغەمبەرانو نەشەهیدانیشن، ڕاوی دەڵێ عارەبێکی خێڵەکی لەسەرچۆکان دانیشتو گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا بۆمانیان وەسف بکە تاکو بیانناسین! فەرمووی: ئەوانەن کە لەپێناوی خوادا یەکتریان خۆشویستوە لەتیرەو هۆزی جیا جیان وڵاتانی جۆراوجۆرن، لەسەر زیکری خوا کۆدەبنەوەو یادی دەکەن.

پێشتریش ئەو فەرموودەیەمان هێنایەوە[82] کە (بخاري و مسلم) لە (ابوهريرة) وە گێراویانەتەوە باسی گەورەییو گرنگی کۆڕو مەجلیسەکانی زیکرو بەرزی پلەو پایەو پاداشتی کۆبووەوان لەسەر طاعەتو زیکری خوا دەکاتو لەکۆتاییەکەی باسی ئەوە دەکات کە تەنانەت کەسێك بەکارێکی شەخسیو تایبەتی خۆیشی ڕێی لەو کۆڕو

---

[81] بڕوانە: (تربيتنا الروحية) سعيد حوى.

[82] بەڵام (التاج الجامع للأصول) ج٥ص٨٦، ٨٧، کە ئەو فەرموودەیەی هێناوە ڕێکتر هێناویەتیو وە ئەو فەرمووی (قال)انەی کە وەك پێشتر ئاماژەم پێکردن تێیدا نین.

مەجلیسانە کەوتبێ خوا لەبەر ڕێزو حورمەتی ئەو یادی خوا کردنو کۆڕو کۆمەڵە هەر دەیبەخشێ!!

٢-هەروەها زیکری خوا کردنو ناوی خوا هێنانو بەرزکرنەوەو بەرز ڕاگرتنی ناوونیشانی لەهەموو کاتو حاڵێك داو بەتایبەت لە بۆنەکانی وەك: بانگ دانو قامەت خوێندنو ڕۆژی جومعەو ڕۆژانی جەژنەکانو کاتی حەجو عومرەو..هتد دروشمو نیشانەی هەرە بەرزو زەقی کۆمەڵو کۆمەڵگای مسوڵمانە.

چونکە شتێکی ئاشکرایە کە هەموو پێڕو کۆمەڵێك دروشمو شیعارێکی هەیە کەپێیەوە دەناسرێو، هەتا ڕاددەیەکی زۆر دەبێتە پێناسو دەرخەری ماهیەتو حەقیقەتی، بۆ وێنە بابایەکی نەتەوەو نیشتیمان پەرست ویردی سەر زمانی باسو خواسی گەلو نیشتیمانو ئەو مەسەلەو بابەتانەیە کە پێیەوە پەیوەستن،[٨٣] وە بابایەکی کۆمۆنیستو مارکسی دروشمو نیشانەی پێناسرانیو ویردی سەر زمانی باسی ماددەو گۆڕانو پەرەستاندنی کۆمەڵگا بەهۆی ئامێرو ئامرازەکانی بەرهەم هێنانو بەرەوپێش چوونی حاڵەتی ئابووریو. هتدەو باسو یادی مارکسو ئەنگلزو لینینو ماوتسی تۆنگو ...هتدە!

بەڵام مرۆڤی مسوڵمانو کۆمەڵگای مسوڵمان لەسۆنگەی ئەوەوە کە خوای بەرزو مەزن بەگەورەترین ڕاستیو پەروەردگارو پەرستراوی خۆیان دەزانن و ڕازیکردنی بە بەرزترین مەبەستی خۆیان دەزانن، لەنێویان دا باس هەر باسی خوای تاكو پاكو پێغەمبەرەکەی ﷺ و ئایینو بەرنامەی خواو بەها بەرزەکانیەتیو هەر بابەتو مەسەلەیەکی دیکەش باس بکرێ هەر لەبەر تیشكو ڕۆشنایی ڕێساو یاساکانی ئایینو بەرنامەی خوادا باس دەکرێ،

بەکورتی: لەکۆمەڵگایەکی ئیسلامیدا خوای پەروەردگار چەق (مرکز)ی بەدەورەدا سووڕانەوەی سەرجەم قسەو باسو خولیاو ئاواتو جموجۆڵو چالاکیەکانی تێکڕای ئەندامو توێژەکانیەتی.

وە لەڕاستیدا چ لەسەر ئاستی تاكو چ لەسەر ئاستی کۆمەڵیش خاڵو سنووری لەیەك جیاکردنەوەی ئیسلامو نەفامێتی (الأسلام والجاهلية) و ئیمانو کوفرو خوا بەیەك گرتنو هاوبەش بۆ خوا پەیداکردن (توحيد الله و الأشراك بالله) ، خوای پەروەردگارو بەندایەتی

---

[٨٣] بۆ لەیەك جیاکردنەوەی نەتەوە پەرستیو نیشتمان پەرستی لەلایەکەوەو سۆزی نەتەوایەتیو خۆشویستنو خزمەت پێکردنی گەلو نیشتمان بڕوانە: (سۆزی نەتەوایەتیو بیری ناسیۆنالیزم) چاپی دووەم.

بۆ كردن یان بۆ نەكردنیەتیو، شتەكانی دیكە سەرجەم لق و پۆپ و بەرهەمو دەرەنجامی ئەم مەسەلەیەن، هەربۆیەش خوای كاربەجێ بەپێچەوانەی مسوڵمانانەوە كە بەیادو باسی خوا دڵیان ئۆقرەو ئارام دەگرێ: (الَّذِينَ آمَنُوا وَتَطْمَئِنُّ قُلُوبُهُمْ بِذِكْرِ اللَّهِ أَلَا بِذِكْرِ اللَّهِ تَطْمَئِنُّ الْقُلُوبُ) الرعد: ٢٨، وەسفی بێبڕوایانی بەوە كردوە كە بەیادو باسی خوا دڵیان دەگوشرێو بێزار دەبن! وەك چۆن قالۆنچە ڕەشە كەیفی بەتەرس و ریخ دێتو دەڵێن بە بۆنی گوڵ گێژ دەبێ: (وَإِذَا ذُكِرَ اللَّهُ وَحْدَهُ اشْمَأَزَّتْ قُلُوبُ الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ وَإِذَا ذُكِرَ الَّذِينَ مِنْ دُونِهِ إِذَا هُمْ يَسْتَبْشِرُونَ) الزمر ٤٥، واتە: وە كاتێك بەتەنیا باسو یادی خوا بكرێ ئەوانەی بڕوایان بەرۆژی دوایی نیە دڵیان دەگوشرێ ( و بێزارو نارەحەت دەبن) وەكاتێك باسی غەیری خوا بكرێ دڵیان خۆشو گەش دەبێ.

هەروەها هەر بۆیەش لەكاتێك دا بڕواداران بەوە وەسف كراون كە زۆر یادی خوا دەكەن: (وَالذَّاكِرِينَ اللَّهَ كَثِيرًا وَالذَّاكِرَاتِ) الأحزاب: ٣٥، دەبینین دەغەڵو دوو ڕووەكان (المنافقون) بەوە وەسف كراون كەخوایان هەر لەبیر نیەو یادی ناكەن: (الْمُنَافِقُونَ وَالْمُنَافِقَاتُ بَعْضُهُمْ مِنْ بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِالْمُنْكَرِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمَعْرُوفِ وَيَقْبِضُونَ أَيْدِيَهُمْ نَسُوا اللَّهَ فَنَسِيَهُمْ إِنَّ الْمُنَافِقِينَ هُمُ الْفَاسِقُونَ) التوبة: ٦٧، یان زۆر بەكەمیو بەدەگمەن یادی دەكەن ئەویش بۆ ڕووپامایيو چەواشەكردنی خەڵكی: (إِنَّ الْمُنَافِقِينَ يُخَادِعُونَ اللَّهَ وَهُوَ خَادِعُهُمْ وَإِذَا قَامُوا إِلَى الصَّلَاةِ قَامُوا كُسَالَى يُرَاءُونَ النَّاسَ وَلَا يَذْكُرُونَ اللَّهَ إِلَّا قَلِيلًا) النساء: ١٤٢.

ئنجا پێویستە ئەوەش بگوترێ كە مەرج نیە كەم یادی خوا كردن تەنیا خەسڵەتی ئەهلی كوفرو نیفاقو شیرك بێت، بەڵكو كەسانێكی مسوڵمانیش كەهێندەی باسو خواسی: پارەو زێرو خواردنو خواردنەوەی بەتامو لەززەتو، بەرگو پۆشاكی گرانو بەقیمەتو، شمەكو كەلوپەلو كۆشكو تەلارو زەوی و زار، یان سەركردەو دەمڕاستی ملهوڕو زۆردارو ڕێچكەی خوارو پێڕو دەستەی كرێگرتەو بێبارو بێبەندو بار دەكەن، نیو ئەوەندەش باسی خواو پێغەمبەر ﷺ و ئیسلام و مسوڵمانان ناكەن، هەنو پێشیان وایە بەهەشت لەبەر وان وەبەر كەس ناكەوێ!

كەواتە: ڕاستە یادی خوای پەروەردگار درووشمو نیشانەی مسوڵمانانەو سنووری نێوان ئەهلی كوفرو نیفاقو ئەهلی ئیمانەو، پێوەرو تەرازووی ئاستو ئەندازەی دینداریو مسوڵمانەتی مسوڵمانانیشە.

جا ئەگەر بمانەوێ برایەتیو ڕیزمان پتەوترو پێكەوە جۆشدراوتر بێتو خۆشەویستیو پەرۆشو ڕێزو دڵسۆزیمان بۆ یەكتر چاكترو زیاتر بێت، وە نیشانەو سیمای دینداریو مسوڵمانەتیمان تێدا تۆختر و پێوە دیارتر بێت، دەبێ هەوڵ بدەین دڵو دەروونمان بەیادی خوا ئاوەدان ترو زارو زمانمان بەزیكری وی پاراوتر بێت.

**حەوت: بەرهەمی یادی خـوا لـەبواری دروسـت بوونـی کەسـایەتی‌یەکی سـاغ‌و سەلیم‌و تێرو تەواودا**

١-هیچ گومان لـەوەدا نیە کـە ئـەو بەرهـەم‌و سـوودو بەهرانـەی کـە لەشـەش بـواری پێشوودا ڕابردن دەبنە مایـەی زەمینـە ڕەخسـاندن بـۆ دروسـت بـوون‌و پـەروەردەبوونی کەسایەتی‌یەکی مسوڵمانی ساغ‌و سەلامەت‌و تێر و تەواو و پتەوو دامەزراو، بۆ ئینسانی خوا یادکەر، بەڵام بەمەرجێك بەوشێوەو چۆنیەتی‌یە ئەنجام بدرێ کەشەرع دیاری‌کردوە، ئەگەرنا زیکریش وەك هەر ئەرکێکی دیکەی ئیسلامی ئەگەر بێت‌و بەو شێوەو چۆنیەتی‌یە شـەرعی‌یەی خـۆی نـەبێت، ئـەوە بێگومـان بـە ئـەندازەی کـەم بوونـەوەی مەرجـە شەرعی‌یەکان‌و لادرانی، ئەو کاکڵ‌و جەوهەرەی خۆی لەدەست دەدات‌و، لەئاکامی ئەوەش دا بەرهەم‌و بەهرەکانیشی کەم و کورت دەبن، یان هەر نابن.

هەربۆیەش پێغەمبەری پێشەوامان ﷺ فەرموویەتی: (**إن العَبْدَ لَيُصلي الصَّلاة مـايكْتَبُ لَـهُ منها إلا عُشْرُها، تُسْعُها، ثُمْنُـها، سُـبْعُها، سُدْسُـها، خُمْسُـها، رُبْعُـها، ثُلْثُها، نِصْفُـها**) رواه احمد وابوداود والبيهقي في طريقين صحح احدهما العراقي واخرجَهُ ابن حبان في صحيحه وصححه الألباني.[٨٤]

واتە: بەندە جاری وا هەیە نوێژ دەکات بەڵام تـەنیا دەییـەکی، نۆییـەکی، هەشتیەکی، حەوتیـەکی، شەشـیەکی، پێنـج یـەکی، چواریـەکی، سـێ‌یەکی، نیـوەی لـەو نوێـژە بـۆ دەنووسرێ!!

بـەڵێ خوێنـەری بـەڕێز ! خودی زیکرکردن چەندە گرنگ‌و گەورەیە بـەپێی شـەرع کردنی‌و لانەدانیشی هێندە گرنگ‌و گەورەیە، چونکە خواپەرستی (عبادة) دوو شادەماری هەن‌و بێ‌هەرکامێکیان وەرناگیرێ‌و بەکەڵکی هیچ نایەت:

أ- تەنیا خواپەرستن (الاّ نَعبد إلا الله).

ب- پەرستنی خوا بەگوێرەی شەرعی خوا (الاّ نعبد الله الاّ بما شَرعه لنا).

کەواتـە: ئەوانەی کە بەحیساب یـادی خـوا دەکـەن.. بەتایبـەت لەئـەهلی تەریقـەت‌و تەصـەووف بـەڵام بەناشـارەزایی لەشـەرع کارەکـەیان ئـەنجام دەدەن‌و خـۆیـان دووچـاری چـەندان بیدعـەت‌و شـتی ناشـەرعی دەکـەن کـە هـەندێکی هـەر بیدعـەت‌و ناشـەرعی‌یەو خاوەنەکەی بەس گوناحبار دەبێ، بەڵام هـەندێکی لـەوەش بەولاوەترەو شیرك‌و کوفریشە

---

[٨٤] بڕوانە: (صلاة التراويح) ص١٠٤، ط٤، ناصرالدين الألباني.

وەك: هاوارکردنە غەیری خواو سەجدەو ڕکووع بۆ بردنیو سیفەتی خوا پاڵدانە لای!! ئەوە ئەوجۆرە کەسانە بەرهەمو کەڵك هیچ بەڵام زۆریش لەسەر ئەو بەناو زیکرکردنە قەرزدار دەبنەوەو.. هتد.

٢-ئنجا بەرهەمێکی دیکەی یەکجار گەورەو گرنگی زیکری خوا کە کاریگەرترین دەوری هەیە لەسەر کەسایەتی ئینسان ئەوەیە کە وا لەخاوەنەکەی دەکات ڕوو بکاتە یەك لووتکەی ئامانج کە بریتیە لە وەدەست هێنانی بەخششو ڕەزامەندی خوای پەروەردگار، وە بەوەش ئینسان لە ڕاڕاییو پرژو بڵاویو بێئامانجی قوتاری دەبێ، وەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی: (ضَرَبَ اللَّهُ مَثَلًا رَجُلًا فِيهِ شُرَكَاءُ مُتَشَاكِسُونَ وَرَجُلًا سَلَمًا لِرَجُلٍ هَلْ يَسْتَوِيَانِ مَثَلًا الْحَمْدُ لِلَّهِ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ) الزمر: ٢٩، واتە: خوا وێنەیەکی هێناوەتەوە: پیاوێك کە هی چەند هاوبەشێکی پێکەوە ناکۆکەو پیاوێکیش کە بۆ پیاوێك یەکلاو ساغ بۆتەوە، ئایا حاڵیان وەك یەك دەبێ؟ ستایش بۆ خوا بەڵکو زۆربەیان نازانن!

ئاشکرایە کە خوای کاربەجێ لەم ئایەتەدا وێنەی بەکۆیلەیەك کەچەند خاوەنێکی هەنو کۆیلەیەك کە تەنیا هی یەك کەسە، هێناوەتەوە، بۆ ڕوون کردنەوەی حاڵو باڵی بابای هاوبەش بۆ خوا دانەر (مُشْرِكْ) و خوا بەیەکگر (مُوَحِّدْ)، کە بێگومان زۆر لە یەك جیاوازن، چونکە بابای خوا بەیەکگر بەهۆی خۆ یەکلاو ساغ کردنەوەیەوە بۆ خواو، تەنیا بەندایەتیکردنی بۆ وی، ڕووی کردۆتە یەك ئامانجو هەموو هێزو وزەکانی خۆی ئاڕاستەی وی کردوە، بەڵام بابای هاوبەش دانەر خۆی دووچاری ئەوە کردوە کە ببێتە شەرگەو شوێنی گوریس پچڕکێنەی ئەو هاوبەش (شریك) و خاوەنانەی کە تێیدا بەشدارنو هەرکامێکیان دەیەوێ بەلای خۆیدا ڕایکێشێو بیکاتە هی خۆی!

جا بێگومان هەرکاتێك ئینسان لەسەر ئەو جۆرە زیکرانە بەردەوام بێت کە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ دوای نوێژە فەرزەکانو بەیانیانو ئێوارانو حاڵەتە جۆراوجۆرەکانی ژیانو گوزەران دیاری کردوون، ئەوە مسۆگەر دەبنە مایەی قووڵ بوونەوەی ئیمانو عەقیدەی خوا بەیەکگرتن (عقیدة التوحید) و پاك کردنەوەی دڵو مێشکی مرۆڤ لەخڵتەو خاڵو ژەنگو ژاری شیركو نیفاق بەهەموو جۆرو شێوەکانی گەورەو گچکەیانەوە، ئنجا هیچ گومانیشی تێدا نیە کە قوتاربوونی ئینسان لەو دوو نەخۆشییە کوشندەو بێڕەزایەی شیرك (کە بریتیە لەبوونە کۆیلەی ئینسان بۆ شتەکان)، وە نیفاق (کە بریتیە لە دەغەڵیو

دوو ڕوویی‌و لەیەك جیایی ڕواڵەت‌و پەنهان‌و دڵ و زمان)، وە خۆڕازاندنەوە بەخەسڵەتی بەرزو پیرۆزی خوا بەیەکگرتن، دەبێتە مایەی وەدەست هێنانی کەسایەتیەکی پاك‌و چاك‌و ئامانج دارو پایەدارو دامەزراوو نەلەخشاوو تێرو تەواو.[٨٥]

کۆتایی ئەم باسەش بەم چەند دێڕە شیعرە دێنم کەهی یەکێکن لەو جۆرە کەسانەی کە لەسایەی بەندایەتی بۆ خواکردن‌و خوا بەیەکگرتنــەوە لـەدنیاو لەئـەهلی دنیـا بێ‌منـەت بووەو ئازادیی ڕاستەقینەی لەسایەی تـەنیا بـەندەی خـوا بـوون دا وەدەسـت هێنـاوەو بەرەی خۆی لەئاوێ دەرهێناوە:

فَلَيْتك تَحْلُو والحياةُ مَرِيْرَةٌ    ولَيْتك تَرْضى والأنامُ غَضابٌ
ولَيْتَ الذي بيني وبينك عامرٌ    وبيني وبَينَ العالمينَ خَرابٌ
إذا صَحَّ منك الوُدُّ فالكل هَيِّنٌ    وكُلّ ما فَوقَ الترابِ ترابٌ

واتـە: ئـەی خوایـە خۆزگـە یـادی تـۆم لـەلا شـیرین دەبـوو و ژیـان‌و گـوزەرانم سـەر لەبەر تاڵ‌و تفت دەبوو، وە خۆزگە تۆم لـێ‌ڕازی‌بای، با سەرجەم خەڵکی لێم تووڕەبن، وە خۆزگە نێوانم لەگەڵ تۆدا خۆش دەبوو، با نێوانم لەگەڵ هـەموو جیهانیان دا تێك بچێ، ئەگەر تۆ خۆشت بوێم هەموو شتێکم لەلا ئاسانەو هەرچی لەسەر گڵیش بێ هەر گڵە.







[٨٥] لە (یادی خوادا) بەرگی یەکەم: بەشی دەیەم، لاپەڕە، ١٧٣تا١٨٦دا، چەند قسـەیەکی زۆر بـەنرخم لەزانای دەروونـاس‌و کۆمـەڵناس (ئـەریك فـرۆم)ەوە هێنـاون کـە لـەکتێبی (جامعة سـالم)دا هێنـاونی‌و لەشوێنی ناوبراودا دەتوانـی سـەرنجیان بـدەی، دیـارە (جامعة سـالم) کۆمەڵگایـەکی سـاغ تـەرجەمـەی فارسـی‌و ناوونیشـانی کتێبەکەیـەتی، بڕوانـە: لاپـەڕەکانی: ٤٧، ٤٨، ٤٩، وە: ١٥٠، ١٥١ لەتەرجەمە فارسیەکیدا.

## دوا قسەم

خوێنەری بەڕێزو خۆشەویستم ! ستایشی بێپایان بۆ خوای پەروەردگار (الحمدلله الذي بنعمة تتم الصالحات) کە لوتفو کەرەمی لەگەڵ کردمو هیدایەتی دام بۆ نوسینو تەواوکردنی بەشی دووەمی (مسولمانی کامڵ) کە "خواپەرستیی مسولمان" ەو، لەڕاستیدا ئەو باسو بابەتانەی کە لەکتێبە شەرعیەکان دا لەژێر ناوونیشانی فیقهی خواپەرستییەکان (فقە العبادات) دا نووسراون، سەرجەمیانو گەلێك باسو بابەتی دیکەشی گرتوونە خۆ.

هیواداریشم تۆش لەکاتی خوێندنەوەو موتالای ئەم بەرهەمەدا کە بەری ڕەنجو شەونخوونی چەندان هەفتەو مانگی بێپسانەوەیە، هەقی خۆی بدەیەو چاك چاك لێی تێبگەیو هەزمی بکەی، بۆئەوەی بتوانی هەم بۆ خۆت بەوردی ڕەفتاری پێبکەیو، هەم براو خوشکانی مسوڵمانی دەوروبەریشتی پێ ئامۆژگاری بکەیو، لەسەر پەروەردە بکەی.

بەڵام دەبێ وریاو هۆشیار بی نە بەهۆی ئەم کتێبەو نە بەهۆی هیچ کتێبو بەرهەمێکی دیکەشەوە، خۆت دووچار و گرفتاری دەردی کوشندەو سەختی دەمارگیری (تَعَصُّبْ) و دیدتەنگی نەکەیو، هەق پێبوونو پێکان (إصابة) و چاك تێگەیشتن لەسەر خۆت تاپۆ نەکەی، چونکە وەك لەبابەتی دووەم (بنچینە گرنگەکانی هەڵسوکەوتی شەرعیانەو ژیرانە لەگەڵ وردە بابەتە خیلافییەکان) دا گوتوومانە: خوای کاربەجێ تبارك وتعالی و پێغەمبەری لێزان ﷺ گەلێك لە مەسەلەکانی خواپەرستییەکانیان[٨٦] - لەڕووی چەندان حیمکەتو سوودو بەرژەوەندی جۆراوجۆرەوە کە یەکێکیان ئاسانکاری (تَیْسیر) یە وا هەڵخستوون کە بگونجێ بەچەند شێوەی جیا جیا ئەنجام بدرێنو هەمووشیان هەر پەسەندو چاکنو ئەوپەڕی پەسەندو پەسەندتر یان ڕاستو ڕاست ترن و مەگەر بەدەگمەن دەنا ناگەنە نێو بازنەو خانەی ڕاستو هەڵە.

وە هیواداریشم کە لەخواپەرستییەکانمانو بەندایەتیکردنمان دا بۆ خوا بەگشتی وێڕای فەرامۆش نەکردنی وردە بابەتەکانو لایەنی ڕواڵەتییان زیاترو زیاتر جێی سەرنجو بایەخ پێدانمان بابەتە گرنگو بنەڕەتییەکانی خواپەرستیو دیوی پەنهانو جەوهەرو کاکڵەی بێت، کە بێگومان فەرزکرانی خواپەرستییەکانیش هەر بۆ وەدەست هێنانی ئەو کاکڵو جەوهەرو ڕووحەیە.

---

[٨٦] مەبەستم خواپەرستییە ڕووتەکان (العبادات المحضة) ە کە من لەژێر ناوونیشانی: (پێنج دروشمەکانی خواپەرستی) دا تیشکم خستۆتە سەر... [illegible]

# نێوەرۆك

## ئەم كتێبە

 **خوێنەری بەڕێز و خۆشەویستم:**

ستایشی بێپایان بۆ خوای پەروەردەگار (الحمد الله الذي بنعمة تتم الصالحات) کە لوتف و کەرەمی لەگەڵ کردم و هیدایەتی دام بۆ نوسین و تەواوکردنی بەشی دووەمی (مسوڵمانی کامڵ) کە "خواپەرستیی مسوڵمانان" ە، لەڕاستیدا ئەو باس و بابەتانەی کەلەکتێبە شەرعییەکان دا لەژێر ناونیشانی فیقهی خواپەرستییەکان (فقه العبادات) دا نووسراون، سەرجەمیان و گەلێك باس و بابەتی دیکەشی گرتوونە خۆ.

هیواداریشم تۆش لەکاتی خوێندنەوەو موتاڵای ئەم بەرهەمەدا کە بەری ڕەنج و شەونخوونی چەندان هەفتەو مانگی بێ پسانەوەیە، هەقی خۆی بدەیەو چاك چاك لێی تێبگەی و هەزمی بکەی، بۆ ئەوەی بتوانی هەم بۆ خۆت بەوردی ڕەفتاری لەسەر پێ بکەی و، هەم براو خوشکانی مسوڵمانی دەوروبەریشتی پێ ئامۆژگاری بکەیو، لەسەر پەروەردە بکەی.

ژمارەی سپاردنی (٢٤٨) ی ١٩٩٧ای دراوەتێ